# رِيَاضُ الصَّالِحِينَ

مِنْ كَلَامِ سَيِّدِ المُرْسَلِينَ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

باخچەی پیاوچاکان لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ)

دانراوی

ئیمامی نەووی (شرف الدین یحیی)

وەرگێڕانی

نووری فارس حەمەخان

محمود أحمد محمد

پێیدا چوونەوە و سەرپەرشتی لەچاپدانی کردووە

١ - ٢

# رياض الصالحين

من كلام سيد المرسلين ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم )

باخچەی پیاوچاکان لەفەرموودەکانی پێغەمبەر ( د.خ )

دانراوی:

## ئیمامی نەوەوی ( شرف الدین یحیی )

وەرگێڕانی

## نوری فارس حەمە خان

محمود أحمد محمد

پێیدا چۆتەوەو سەرپەرشتی لەچاپدانی کردووە

١ / ٢

بەرگی یەکەم – چاپی سێهەم



.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★

📖 ناوی کتێب: ﴿ رياض الصالحين﴾

📖 دانراوی: ئیمامی نەوەوی

📖 وەرگێڕانی: نوری فارس حەمە خان

📖 پێداچوونەوەو سەرپەرشتی لەچاپدانی: محمود أحمد محمد

📖 تیراژ: ٣٠٠٠ دانە

📖 ژمارەی سپاردن: ( ١٧٥- ساڵی ٢٠٠٦ز )

📖 چاپو دیزاین: ( رویار حسین ).

📖 ساڵی چاپ: ١٤٢٧ ك -٢٠٠٦ز

## پێشەكی

الحمد لله رب العالمين، احمده حمدا كثيرا طيبا مباركا فيه واشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له، واشهد ان محمدا عبده ورسوله، صلوات الله وسلامه عليه وعلى سائر الانبياء والمرسلين، والى كل وسائر عباد الله الصالحين.

لەپاش حەمدو سوپاسو ستایشی خودای گەورەو، ناردنی سەلامو درودی زۆری بێ پایانی بێ شومار بۆسەر گیانی پیرۆزی پێغەمبەرو یارانی، عەرزم ئەمەیە لەخزمەتتاندا: ئەم نامە پیرۆزە كەواین لە خزمەتیدا، كە خواناسی هەرە گەورە، دیاری عیلمو تەقوا، دانای فرە زانا، گەورەو سەروەری پایە بەرزمان ئیمامی نەوەوی یەحیای كوری شەرەف-رەزای خودای گەورەی لێبێت- داینــاوەو نـاوی نـاوە (رياض الصالحين من كلام سيد المرسلين) ئەم نامـە پیرۆزە بەڕاستی نامەیەكە لە نامەكانی بەهەشتو پڕە لەجوانترین گوڵو گوڵزار، بەدەگمەن ڕێدەكەوێ كە كتێبێكی ئاوا جوانی ڕێكو پێكو شاكارێكی ئاوا نایابو بەسودو دانراوێكی ئاوا بە پیتو فەڕو بەرەكەت دابنرێ، مەگەر هەر زاتیكی پێشەوای وەك حەزرەتی ئیمامی نەوەوی (رەزای خوای لێ بێ) بتوانێ بە خامەی ڕەنگینی خۆی تابلۆیەكی نەخشینی ئاوا جوانو ڕازاوەو قەشەنگو ڕەنگامە لە سەر ئەم شێوە نازدارە ئاوا ڕەنگ ڕێژی بكا.

ئەم نامەیە لەبەر پیتو بەركەتو پیرۆزی خۆیو دانەری وەك ئەستێرەی ئاسمان پەخشو بڵاو بۆتەوە بەناو وڵاتی ئیسلامدا، وەك گوڵی كوێستان ناسكو نازدارەو وەك چیای كوردستان بەرزو بەڕێزو ناودارە، كەم شوێن هەیە ئەم نامەیەی لێ نەبێ، مەگەر مەلاو مزگەوتو فەقێو ئەمانەی لێ نەبێ، چونكە بێگومان بۆ مرۆڤی موسوڵمان هەم كلە بۆ چاوی هەم هێزە بۆ هەناوی، هەم خۆراكە بۆ گیانی، هەم مایەی خۆشیو هۆی ئارامو ئاسایشە بۆ هەردوو ژیانی، خودا بەكەرەمی خۆی، لەبەر خاتری پێغەمبەری خۆشەویستی خۆی، بەبەرەكەتی ئەم كتێبە پیرۆزە، بە جاهو خاتری دانەرەكەی لەلای خوداو پێغەمبەری خودا، لە پیتو بەرەكەتی ئەم نامەیە بێ بەشنەبینو لە هەردوو جیهاندا بەشی باشمانی تێبكەوێ خۆمانوماڵو مناڵمان. ئامین.

بەراستی خوێنەرەوەی خودا پێداوی ئەم پارچە نووره واهەسەت دەکا کەوا لەناو باخو بۆلاخی بەهەشتدا گەشت دەکا، کەوا لەخزمەتی حەزرەتدا (ص) لەبادەی حەوزی کەوثەر خۆی مەست دەکا، یا وا لەناو کۆری دانیشتنی یارانیدا، دەڵێی بەگوێی خۆی ئەم، فەرماییشتو فەرموده پیرۆزانە، لە زاری حەزرەتو یارانی دەژنەوێ (درودی خودا لەسەر خۆیو رەزای خودای گەورەو مەزن لەسەر یارانی بێ) وەبۆنو بەرامەی ئەم باخچە گەلەی بەهەشتە دەچێ بەسەریداو دڵو دەروونو چاوو هەناوی بەنوورو تیشکیان رۆشنو فێنك دەبێتەوەو مێشكو هەستی لە بۆنو بەرامەی خۆشو خەستیانو لە رەنگو بۆی ناسكو نازداریان مەست دەبێ، چونكی ئەوەی چاوو دڵی موسوڵمانی لە هەردوو جیهاندا پێ رۆشن ببێتەوە، لە گوتاری شیرین لە کرداری رەنگین، لە رەفتاری زێرین، لە مایەی رەزای خودای مەزن، لە هۆی خۆشەویستیو پەیرەوی پێغەمبەرو هاوڕێیانی کە هەموویان وەك ئەستێرەی ئاسمان بەرزو بەڕێزو پیرۆزن، لە دەستورو شێوەی ژیانو سازان لەگەڵ دۆستو دوژمن، لە عەقیدەو بیرو باوەر، لە عیبادەتو بەندەگی کردنی ساغ بۆ خودای گەورەو سەروەر، لە باسو خواسی پێشینانو پاشینان، لە دەنگوباسی قەبرو قیامەتو ئاخر زەمان، لە رونکردنەوەی پێنج روکنەی ئیسلام، ئەمانە هەموویان بەزیادەو لەسەر شێوەیەکی شیرنی بەچێژو بەتام، لە ناو ڕوپەڕەکانی ئەم نامە پیرۆزەدا، زۆر بەجوانی باس کراوە، باس لەگەڵ باسی وەك دانەی برنجی سەیری دانار دانار وەستاوە! جابۆیە بەندەی بێ ئایەو مایە، کەزانیم حاڵەکە وایە، قەڵەمم دەست دایە، هەتا ئەم گەوهەرەی شەو چرایە، ئەم چرای رۆشنی دینو دنیایە، بۆ هەردوو ژیانم بکەم بەدەست مایە، خودای میهرەبان بۆ منیشو بۆ خوێنەری ئازیزیش لە هەردو جیهاندا بۆم بکا بەباشترین سەرمایە.

(ئەی خودای هەموان! ئەی کەسی بێ کەسان! هەرچی هەم بەندەی خۆتم، زادەی خواستو ویستی خۆتم، بەری باخی دەست نێژی خۆتم، بە میهری خۆت نەك بەچاکی خۆم، لە پەنای قورئانا، لە پەنای ئەم حەدیثو فەرمودەگەلەی سەروەری هەردوو جیهانا، پەنامان بدە لە هەردوو جیهانا، پەنامان بدە لە هەردوو ژیانا، خودایە! خۆت ئاگات لێیە، کە دایكو باوکم چەندە ئاشقی ئەم دینی تۆیە بوون، لە کوێرە دێیەکی وەكو برایماوای سەر بە قەراغ، لە پارێزگای سلێمانی، ژنێکی نەخوێندەواری وەکوو ئامینەی دایکم لە نەخۆشینی سەرە مەرگا وەسیەتی ئەوە بووە کە باوکم من تەرخان بکا بۆ خزمەتی قورئانو، بمکا بە مەلا!

سا تۆش ئەی خودایە! پاداشتی چاکەیان بدەرەوە، گۆڕیان گوشاد بفەرموو، رەحم بە حاڵیان بکە، دووعای خوێنەرێکی لە خودا ترسیان بۆ بخەرە کارو لە گوناهیان خۆشبەو بەهەشتیان بە نەصیب بفەرموو. گەلێ منداڵ بووم بەلام بە باشی لەیادمە، لە گوندی برایماوە، کە قورئانەکەم دەنایە بن دەستمو بەلای کانی ژناندا ڕا دەبووردمو دەچووم بۆسەر گۆڕی دایکم، ژنەکان پێیان دەگوتم: خۆزگەمان بە دادامین، بەڕاستی ئاواتەکەی هاتە دی! ئەوەتا نوری قورئانی لەسەر دەخوێنێ، ئەوەی منداڵێکی قورئان خوێنی نەبێ وەك وەجاخ کوێر وایە!).

بەڵێ من لێم روونە ئەگەر لەم کۆششە پیرۆزەدا، بە فەرمانی خودا سەرکەوتوو بم ئەوە لە سایەی خوداوەوەیەو لە دوای ئەوە بەهۆی دڵ سافیو لە بەرەکەتی نیازی پاكو نزای باشی باوكو دایکمەوەیە، رەحمەتی خودایان لێ بێ، دەنا من بەش بەحاڵی خۆم ئەوەندە باشو موبارەك نیم کەشتی وا لەمن بوەشێتەوە!

بۆیە گەلێ جار ئەم فەرمایشتەم بیردەکەوێتەوە کەدەفەرموێ: (لو تکاشفتم ما تدافنتم): ئەگەر بەرازو نهێنی یەکتریتان دەزانیو ئاگاتان لە حاڵی یەکتری دەبوو تەرمی یەکتریتان نەدەناشت! کاتێ ئەمەم یاد دەکەوێتەوە خۆم بە خۆم دەڵێم: حەمدو سوپاسی خودا بکە، کە بە پەردەی ستری خۆی تاوانەکانی پۆشیوی، دەنا سەگی سەر کۆڵان سەلکی دەکردیت بە کەللەپارچەی خۆی!

بەهەر حاڵ لە خودا بەزیاد بێ، خودا تەوفیقی دام ئەم کتێبە بێ وێنەو بێ هاوتایەم لە دەوروبەری ساڵی١٩٧٢ی زایینی دا وەرگێڕایە سەر زمانی شیرینی کوردی- خودا بیپارێزێ لە چەپۆڵەی رەشی رۆژگارو گەشەی پێبکاو بیکا بەزمانی دینو دنیامان- بەلام ئەم گەلاڵەی تەرجەمەیە لەو ساکەوە هەتا ئێستا هەروا مایەوە، هەتا لەم ڕۆژانەدا هاوڕێی بەرزی بەڕێزم، برای موسوڵمانی پاك، کوردی مەردی چاك، لاوی هۆشمەندی رۆشنبیری رۆشن ئایین، جەنابی مامۆستا-مەحموود احمد موحەممەد- کە ئێستا مودیری مەکتەبی ئەقافی مەرکەزییە لەشاری سلێمانی، خودا بیکا بە پایتەختو شاری ئایینو زانین بۆمان،-پێی وتم-:

(برادەران داوای (ریاض الصالحین)ە کەمان لێ دەکەن، ئەگەر ئامادەی بکەی بەپشتی خودا من سەرپەرشتی چاپکردنی ئەویش وەك تاجول ئوصوول دەکەم!).

ئیتر ئەمە بۆ من بوو بە مژدەیەکی زۆر خۆش، چونکە من چیم دەوێ جگە لەوەی کە ئەم هەموو ئەركو زەحمەتەی کە کێشاومە لەگەڵ ئەم نامە پیرۆزانەدا بەزایە نەڕواو خوانەخواستە ئەم ئەنەرو یادگاریانەم لە پاش مردنی خۆم لە پێچو

پەنای کەنواندا مشكو مار نەیانخۆن، سا بەڵکوو لە ڕەحمەتی خوداوەو بە هیممەتی مەردێ پەخشو بڵاو ببنەوە بەناو موسوڵماناندا و بەهۆی نزای پیرۆزی خوێنەرانەوە خودا بە کەرەمی خۆی ئەم کارەمان لێ قوبوڵ بکا. ئەوە بۆ من گەورەترین خەڵاتەو لەهەموو سامانو موڵکو سەڵتەنەتی دنیا چاکترە، لە کەرەمو بەخششی خودای بەخشندەی میهرەبانی مەزن بە زیاد بێو، رووی رەحمەتی لە گەڵماندا هەتا سەربێ، ئەوا بە چاوی خۆم چاوم پێکەوت کە کەسێ بەرگی تەرجەمەی تاجی پیرۆز لە چاپ دراوە بەرگێ دوانی تریشی بەرەو دوا لە چاپ دەدرێن، وە بە پشتی خودا وا دەستیش دەکەین بە لە چاپدانی بەرگەکانی (رياض الصالحين)ی پیرۆزیش*.

جا دەبێ لەم کاتو دەمەدا فەرمایشتێکی وا کە باشترین وەصف بێ بۆ حاڵێکی وا، واتە: چاکترین تەعبیرو پێناسە بێ هەم بۆ گوڵو گوڵزاری خەملیوی ئەم باخچەی بەهەشتەو، هەم بۆ باراناوی فرمێسکی شادی من چیتر بێ بێجگە لەم تاکە شیعرە ناسکەی حەزرەتی مەولەوییە(ڕەزای خودای لەسەر بێ) کە دەفەرموێ:

**گوڵ چوون ڕووی نازیز نەزاکەت پۆشان**
**بەفراوان چون سەیل دیدەی من جۆشان!**

لە خودای میهرەبان داوا دەکەم کە ئەم (اقتران النيرين)ەی بەندەش وەکوو (مجمع البحرين)ەکەی گەورەو سەروەرمان جەنابی مامۆستا مەلا رەشید بەگی بابان (ڕەزای خوای لێ بێ) برەو پێبداو بیانکا بە چراگەلێکی گەشو رۆشنو کونو قوژبنی ئەم کوردستانەیان پێ رۆشن بکاتەوەو بیانکا بە هۆی رزگاری دینو دونیای هەموو کوردێکی مەردی موسوڵمانی پاکی باش. جا با لەم دەمی شادیو چاوەنواڕیو ئومێدو نزاو پاڕانەوەیەدا، تا خودا چاوو دڵمان بە شنۆی رەحمەتو بە سۆزە بای میهری خۆی، بە تەواوی ڕۆشنو فێنك دەکاتەوە، ئەم شیعرەی وەفایی (ڕەزای خوای لێ بێ) بکەین بە سروودو ویردی سەر زمانمان:

**چاوەڕێی مۆژدەی نەسیمم، تا لە گوڵشەن دێتەوە**
**بەڵکوو فەرمایش بکا گوڵ: بولبولم با بێتەوە!!**

---

* سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە ئێستا نۆ بەرگ لە (تاج) چاپ بووە، یەك بەرگی ماوە لەژێر چاپدایە، ریاضیش بە چوار بەرگ چاپ بووە، ئێستا بەرگی یەکەمی تەجریدی بوخاری وا لەژێر چاپدا، سوپاسو ستایش بۆ خودا.١٩٩٨/٥/٩. (وەرگێڕ)



(دڵنیام ئەو موسوڵمانەی ڕێی بکەوێتە مزگەوتی(اخوان) لە شاری کەرکوك، وە گوێی لە خوتبەی جومعەی جەنابی مامۆستا مەلا عارف بگرێ، کە چۆن بە فەرمایشتی شیرینی، بە دەنگی پڕ لە سۆزی پڕ لە لەرەو گرینی، بە ڕەگ و ڕواڵەتی نوورینی ئەو هەموو خەڵکە موسوڵمانە وەکوو داری بەری دەهەژێنێ هەتا بەرە بەرە سۆزی دڵ وەك سووره گوڵ، فرمێسکی سوور، بەسەر ڕیشی لە خودا ترساندا هەڵدەوەرێنێ، یا ڕێی بکەوێتە مزگەوتی گەورەی سلێمانی، ئەو هەموو حافظو نوێژکەرو زیارەتکەرو فەقێو مەلاو تەپڵو دەفو دەروێشو کۆڕی زیکرە بەچاوی خۆی ببینێ وە بۆنو بەرامەی مەرقەدی حاجی کاکە ئەحمەدی شێخ (ڕەزای خوای لێ بێ) بچێ بەسەریدا، یاخود هەر موسوڵمانێ مزگەوتی گەورەی ئامێدی (عەمادییە) ببینێ، کە چۆن ئەو کوردە موسوڵمانە پاکانە لەو بەردە ڕەقو تەختو سەختە ئەو مزگەوتە گەورەو پاكو جوانو ڕێكو پێکەیان وەك سندوقی مەڕمەڕ داتاشیوە، دڵنیام ئەو موسوڵمانەی ئاوا دیمەنێکی نوورانی لەم گەلە ئیسلام دۆستە قورئان پەروەرە خودا پەرستە ببینێ یەکسەر بەبێ پەروا دەڵێ:

رەبی! سووی لێ بێ زمانی پەنجەکانی هەڵوەرێ
هەرکەسێ گوڵشەن بە دەردی گوڵخەنی دۆزەخ بەرێ!

ئەمەی عەرزی ئێوەی ئازیز کرا، قسەیێ بوو کرا، بەڵام با بزانین دانەری ئەم کتێبە پیرۆزە، گەورەو سەروەرمان، ئیمامی نەوەوی شافیعی دووەم (ڕەزای خوای لێ بێ) خۆی لە وەسفو مەدحی ئەم کتێبەدا چی دەفەرموێ، ئەو کێوی نوورو عیلمو عیرفانە لە پێشەکیەکەیدا دەفەرموێ: (.....ئیتر وام بە باش زانی کەلەو حەدیسە صەحیحانەی کەوان لە کتێبە ناودارو مەشهورەکانی حدیثی حەزرەتدا (صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَم) دەستە گوڵێکی کەمێ کورت کۆبکەمەوەو بیکەم بە کتێبێکی وا کە ببێ بە مایەی ڕێگەی ڕزگاری دواڕۆژ بۆ خاوەنی، وەئەوەی پێویست بێ بۆ وێڵو ڕەوشو ڕەفتاری باشی دنیاو قیامەتی تیایا هەبێو لە هەمان کاتدا بۆی فەراهەم بێنێ......).

مایەوە سەر ئەوە کە عەرزتان بکەم: لە پاکنووسی ئەم تەرجەمەیەدا بەهرەم لە تاج خۆیو سەرچاوەکانی تەرجەمەکەی وەرگرتووە لەبەرئەوە لەم بارەیەوە لەمە زیاتر ناڵێم.

دیارە دووعاو نزاو پاڕانەوەیش کاتو ساتو جێگاو باردۆخی تایبەتی خۆی هەیە، کەواتە بە بەرەکەتی ئەم کتێبە پیرۆزە لە خودا داوا دەکەم کە بە کەرەمی

خۆی هەموو ئاواتێکمان بهێنێتە دیو وەسەربەرزیی دینو دنیامان بە نصیب بفەرموێ، بە تایبەتی ئەم دوعایەمان گیرا بفەرموێ، کە دەیکەین بۆ ئەم گەلی کوردە، کە لە کۆنو نوێدا بە کوڵو بەدڵ خزمەتی چاکی ئیسلامیان کردووە، وە دەشتو دەرو شارو دێی ئەم کوردستانە رەنگینەیان بە مزگەوتو مەدرەسەو حوجرەی فەقێو تەکیەو شوێنی پیرۆزی تر-نەخشاندووە، دیارە ئەم جۆرە نزاو پارانەوەیەش لە حاڵی وادا سوننەتە چونکە پێغەمبەرو پیاو چاکان بۆ زۆر وڵاتی وا کە خزمەتی دینی خودایان کردووە،دوعای خێرو حیفظو بەرەکەتیان کردووە، کەوایە ئەی خوێنەری ئازیز! خوانەخواستە گومانی شتی ترمان پێ نەبەی. بەڵکوو ئادەی بەسۆزی دڵ بەسینەی ساف روو لە بارگەی خوداکەو لە گەڵ بەندەدا بفەرموو:

خودا! بەم کوردە ئەم نەختە عەردە
بە زۆر نەزانی لەم ناو چار بەردە
بۆ سەرو ماڵو ناموسو دنیامان
بیکەی بە سەنگەر تا ئاخیر زەمان
خودای تەوانا خۆی خەفەریان بێ
سێبەری قورئان چەتری سەریان بێ
شاخی کوردستان نزیەی بەریان بێ
ناحەزی خۆیان بە نۆکەریان بێ

نوری فارس حمە خان

١٩ رەجەب ١٤١٠هـ

١٩٩٠/٢/١٤

کەرکوک دور الضباط رقم الدار ١٧٦

## بسم الله الرحمن الرحيم

## ١- باسی نیازو نیاز پاکی‌و نیبه‌تهێنان له هه‌موو کردارو گوتارو کاروبارێکی ئاشکراو نهێنیدا (باب الأخلاص في جميع الأعمال والأقوال ء الأحوال البارزة والخفية)

**قال الله تعالى:** {وَمَا تَفَرَّقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ إِلاَّ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمْ الْبَيِّنَةُ (٤) وَمَا أُمِرُوا إِلاَّ لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ وَيُقِيمُوا الصَّلاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ} (البينة-٥).

**واته:خودای گه‌وره‌و مه‌زن ده‌فه‌رموێ: به‌نده‌کان ته‌نها فه‌رمانی ئه‌وه‌یان پێ کراوه که به‌س خودای مه‌زن بپه‌رستن‌و یه‌زدان په‌رست بن، به دڵێکی پاك‌و نیازێکی بێ گه‌رده‌وه ئایینداری‌و دینداری بۆ خودا بکه‌ن، وه لابده‌ن له هه‌موو بیرو باوه‌ڕێکی خوارو خێچ، وه به ڕێك‌و پێکی نوێژبکه‌ن‌و به جوانی زه‌کات بده‌ن، وه ئه‌مه‌یه دینی میلله‌تی ڕاستی خودا پێداو.**

**وقال تعالى:** { لَنْ يَنَالَ اللَّهَ لُحُومُهَا وَلا دِمَاؤُهَا وَلَكِنْ يَنَالُهُ التَّقْوَى مِنْكُمْ } **(الحج-٣٧).**

**واته: گۆشت‌و خوێنی ئه‌و قوربانی‌و خێرانه‌ی که ده‌یانکه‌ن ئه‌وه ناگا به خودا، به‌ڵام ئه‌وه‌ی که ده‌گاته‌وه به‌خوداو پێی خۆشه ته‌قواو کرده‌وه‌ی چاکی پاکی بێگه‌ردتانه که مه‌به‌ست لێی ڕه‌زای خودایه.**

**وقال تعالى:** { قُلْ إِنْ تُخْفُوا مَا فِي صُدُورِكُمْ أَوْ تُبْدُوهُ يَعْلَمْهُ اللَّهُ } (آل عمران-٢٩).

**واته: ئه‌ی موحه‌ممه‌د! ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویستی من! بفه‌رموو: هیچ شتێ له خودا ون نابێ، ڕازی ناو ده‌روونتان‌و قسه‌ی ناو دڵتان‌و گوتاری سه‌ر زارتان لای خودا چوون یه‌که خودا هه‌موو شتێ چوون یه‌ك ده‌زانێ.**

١/ وعَنْ أَميرِ الْمُؤْمِنِينَ أَبي حفصٍ عُمرَ بن الْخَطَّابِ بْن نُفَيْل بْنِ عَبْد الْعُزَّى بـن رياح بْـن عبـدِ اللَّهِ بْن قُرْطِ بْن رزاح بْن عَدِيِّ بْن كَعْبِ بْن لُؤَيِّ بن غالبٍ القُرَشِيِّ العدويِّ. رضـي الله عنـه، قـال: سَمِعْتُ رَسُولَ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يقُولُ (إنَّما الأَعمالُ بالنِّيَّات، وإنَّمَا لِكُلِّ امرئٍ مَا نـوَى، فمـنْ كانَتْ هجْرَتُهُ إِلَى اللهِ ورَسُولِهِ فهجرتُه إلى الله ورسُولِهِ، ومنْ كانْت هجْرتُـه لـدُنْيَا يُصَـيبُها، أَو امـرَأَةٍ يَنْكحُها فهْجْرَتُهُ إلى ما هَاجَر إليْهِ) متَّفَقٌ على صحَّتِه. رواهُ إماما الْمُحَدِّثِين: أَبُـو عَبْـدِ الله مُحَمَّـدُ بـنُ إِسْمَاعِيل بْن إبْراهيمَ بْن الْمُغيرة بْن بَرْدِزْبَهْ الْجُعْفِيُّ الْبُخَارِيُّ، وَأَبُو الْحُسَيْنِ مُسْلمُ بْـن الْحَجَّـاجِ بـن مُسلمٍ الْقُشَيْرِيُّ النَّيْسَابُورِيُّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا في صَحيحيهِما اللَّذَيْنِ هما أَصَحُّ الْكُتُبِ الْمُصَنَّفَةِ[١].

---

١ بوخاری(١)، موسلیم(١٩٠٧)، ئه‌بوداوود(٢٢٠١)، تیرمذی (١٦٤٧)، نه‌سائی(١/٥٩،٦٠).

فەرمان ڕەوای موسوڵمانان، ئەمیرولموئمینین عومەری کوری خەطاب (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: لە پێغەمبەرم بیست (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: هەموو کارو کردەوەیێ بە پێی نیازو نیەتەکەیەتیو هیچ کارێ بە بێ نیازو خواستی دڵ دانامەزرێ، وە هەموو کەسێکیش بە پاداشی نیازو نییەتی خۆی دەگا(چ چاك چ خراپ) کەوابوو هەرکەسێ مەبەستی لە کۆچکردنو هیجرەتەکەی لە مەککەوە بۆ مەدینە ڕەزای خوداو پێغەمبەر بێ ئەوە کۆچکردنەکەی قەبوڵە بە پاداشتی گەورە دەگا، وە هەر کەسێکیش کۆچکردنەکەی لەبەر کارێکی دنیایی بێ کەدەستی بکەوێ، یا خۆ لەبەر ئافرەتێ بێ کە مارەی بکا ئەوە کۆچکردنەکەی بە پێی نیازەکەیەتیو هیچ خێری ناگا لەسەری (متفق علیە. واتە: ئەم حەدیسە پیرۆزەیە ئەم دوو ئیمامو پێشەوا گەورانە گێڕاویانەتەوە، ئیمامی بوخاری لە صحیحی بوخاریداو ئیمامی موسلیم لە صحیحی موسلیمدا، وە ئەم کتێبەی ئەم دوو پێشەوایەش جوانترینو ڕاسترین کتێبن کە لە بابەتی سوننەتو حەدیثو فەرموودەی پێغەمبەردا دانراون، ڕەزای خودایان لێ بێ، خودا بە کەرەمی خۆی لە پەنای ئەم مەردانەدا پەنامان بدا. ئامین).

٢/٢[٢] وَعَنْ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ أُمِّ عَبْدِ اللَّهِ عَائِشَةَ رَضيَ الله عنها قالت: قال رسول الله صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّم: «يَغْزُو جَيْشٌ الْكَعْبَةَ فَإِذَا كَانُوا بِبَيْداءَ مِنَ الأَرْضِ يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِم وَآخِرِهِمْ». قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ يُخْسَفُ بَأَوَّلِهِم وَآخِرِهِمْ وَفِيهِمْ أَسْوَاقُهُمْ وَمَنْ لَيْسَ مِنهُمْ، ؟ قَالَ: «يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِم وَآخِرِهِمْ، ثُمَّ يُبْعَثُون عَلَى نِيَّاتِهِمْ» مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: هذا لَفْظُ الْبُخَارِيِّ.

عائیشە، خێزانی حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) کچی ئەبو بەکری صدیق، کە ئوموڵموئمنینودایکی موسوڵمانانەو نازناوی ئوممو عەبدوڵلایە، دەفەرموێ: حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەشکرێ دێن بدەن بەسەر کابەدا، کە دەگەنە بەیدا، کە ناوی بیابانێکی چۆڵە لە ناوەندی مەککەو مەدینەدا لەوێ هەموویان ڕۆدەچن بە ناخی زەویدا) منیش گوتم: قوربان! ئەی ڕەوانەکراوی خودا! چۆنو بۆچی گشتیان چون یەك ڕۆدەچن، خۆ هەیانە بۆ شەر نەهاتووەو تەنیا بازاریان بۆ

٢ بوخاری (٢١١٨)، موسلیم(٢٨٨٤).

ساز دەكا، یاخود بەردەستیان دەكاو ولاخیان بۆ لێ دەخورێ، وە هەشیانە لەوان نیەو بەزۆر هێناویانە؟ فەرموی (دروودی خودای لەسەر بێ): هەمویان وەك یەك رۆدەچن بە ناخی زەویدا بەلام لە پاشا هەركەسەیان لەسەر نیازی خۆی زیندو دەكرێتەوەو چاكیان بە چاك پاداشتی دەدرێتەوەو خراپیان بە خراپ (ش= متفق علیه).

٣/٣[٣] وعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ الله عنهَا قَالَت قالَ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «لا هِجْرَةَ بَعْدَ الْفَتحِ، وَلكنْ جِهادٌ وَنِيَّةٌ، وَإِذَا اسْتُنْفرتُمْ فانْفِرُوا» مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَمَعْنَاهُ: لا هِجْرَةَ مِنْ مَكَّةَ لأَنَّهَا صَارَتْ دَارَ إِسْلامٍ.

دیسان عائیشە (رەزای خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: سەبارەت بە هیجرەت پرسیار كرا لە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئیتر ئەوا مەككەی پیرۆزیش لە پاش فەتح كردنو ئازاد كردنی بوو بە ولاتی ئیسلامو كۆچكردن لە مەككەوە بۆ مەدینە ئەو خێرو پاداشەی پێشوی نەما، بەلام خەبات گێرانو نیازی پاك-كە هەموو كاتێ دەبن بە هۆی پاداشی گەورە- هەتا هەتایە هەر دەمێنن، وە هەركاتێ بانگ كرانو داواتان لێ كرا كە بچن بۆ غەزاو خەبات برۆن(ش).

٤/٤[٤]- وعَنْ أبي عَبْدِ اللَّهِ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيِّ رضِيَ الله عنهُمَا قَالَ :كُنَّا مَع النبي صَلّي اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم في غَزَاة فَقَالَ: «إِنَّ بِالْمَدِينَةِ لَرِجَالاً مَا سِرْتُمْ مَسِيراً، وَلاَ قَطَعْتُمْ وَادِياً إِلاَّ كانُوا مَعكُم حَبَسَهُمُ الْمَرَضُ» وَفِي روايَةِ: «إِلاَّ شَركُوكُمْ فِي الأَجْرِ» رَواهُ مُسْلِمٌ.

ورواهُ الْبُخَارِيُّ عَنْ أَنَس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ :رَجَعْنَا مِنْ غَزْوَةِ تَبُوكَ مَعَ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم فَقَالَ: «إِنَّ أَقْوَاماً خلْفَنَا بالمدِينةِ مَا سَلَكْنَا شِعْباً وَلاَ وَادِياً إِلاَّ وَهُمْ مَعَنَا، حَبَسَهُمْ الْعُذْرُ».

ئەبو عەبدوللا جابیری كوڕی عەبدوللای ئەنصاری (خۆشنودی خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: لە غەزایەكا، لە خزمەتی حەزرەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) بووین، فەرمووی: لە شاری مەدینە پیاو گەلێ لە خۆمان بە جێماون پێ بە پێی ئێوە خێریان بۆ دەنوسرێ، وەكوو ئەوە بۆ هەركوێ برۆن ئەوانیشتان لە گەلّ بێ، ئاوایە، چونكە بە

---

٣ بوخاری (٢٨٢٥) لە ئیبن و عەباسەوە (رەزای خودای لەسەر بێ) موسلیم(١٨٦٤).

٤ بوخاری(٢٨٣٩)، موسلیم(١٩١١).

دڵ لە گەڵتانن، بەڵام نەخۆشی پەكی خستون‌و گلی داونەتەوە لە ماڵەوە(مسلم)،ئیمامی بوخاری بەم شێوەیە دەیگێڕێتەوە: لە ئەنەسەوە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: لە خزمەتی حەزرەتدا بووین (درودی خودای لەسەر بێ) لە غەزای تەبوك دەگەڕاینەوە، فەرموی (درودی خودای لەسەر بێ): چەند كەسێ لە پاش ئێمە لە مەدینە ماونەوەو نەهاتوون لە گەڵمان بۆ ئەم غەزایە لەگەڵ ئەوەشا ئێمە بۆ هەر كوێ چووین‌و هەر شیوو دۆڵێكمان بڕی ئەوانیش بە دڵ لەگەڵمان بوون، لەبەر ئەوە لە پاداشیشا هاوبەشمانن، ئەوانەش بەهانەی رەها لە ماڵەوە گلی داونەتەوە.

٥/٥[٥]- وَعَنْ أبي يَزِيدَ مَعْنِ بْن يَزِيدَ بْنِ الأَخْنسِ رضي الله عَنْهمْ، وَهُوَ وَأَبُوهُ وَجَدّهُ صَحَابِيُّونَ، قَال: كَانَ أَبي يَزِيدُ أَخْرَجَ دَنَانِيرَ يَتصَدَّقُ بِهَا فَوَضَعَهَا عِنْدَ رَجُلٍ فِي الْمَسْجِدِ فَجِئْتُ فَأَخَذْتُها فَأَتَيْتُهُ بِهَا. فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا إِيَّاكَ أَرَدْتُ، فَخاصمْتُهُ إِلَى رسول اللَّهِ صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم فقَالَ: «لَكَ مَا نويْتَ يَا يَزِيدُ، وَلَكَ مَا أَخذْتَ يَا مَعْنُ» رواه البخاريُّ .

ئەبو زەید (مەعنی كوری یەزیدی كوری ئەخنەس)رەزای خودایان لێ بێ، كە خۆی‌و باوك‌و باپیرەی لە هاوڕێیانی پێغەمبەر بوون (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: باوكم چەند دینارێكی زێڕ لەلای پیاوێ لە مزگەوت دادەنێ كە بۆی بكا بەخێر، منیش چووم پارەكم برد بۆ خۆم‌و هێنام بۆ لای باوكم، باوكم فەرمووی: بە خوا نابێ، من مەبەستم تۆ نەبووە، منیش بۆ دادخوای‌و سكاڵاكردن بردم بۆ لای حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: تۆ بە نیازی خۆت گەیشتیت ئەی یەزید! وە تۆش ئەوەی بردوتە هی خۆتە ئەی مەعن!(بوخاری).

٦/٦[٦]- وَعَنْ أبي إِسْحَاقَ سعْدِ بْنِ أبي وَقَّاص مَالك بن أُهَيْبِ بْنِ عَبْدِ مَنَافِ بْنِ زُهرةَ بْنِ كِلابِ بْن مُرَّةَ بْنِ كَعْبِ بنِ لُؤىّ الْقُرشِيِّ الزُّهَرِيِّ رضِي اللَّهُ عَنْهُ، أَحدِ الْعَشرةِ الْمَشْهودِ لَهمْ بِالْجَنَّة، رضِي اللَّهُ عَنْهُم قال: (جَاءَنِي رسولُ الله صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يَعُودُنِي عَامَ حَجَّة الْوَداعِ مِنْ وَجعٍ اشْتدَّ بِي فَقُلْتُ: يا رسُول اللَّهِ إِنِّي قَدْ بلغَ بِي مِن الْوجعِ مَا تَرى، وَأَنَا ذُو مَالٍ وَلاَ يَرِثُنِي إِلاَّ ابْنَةٌ لِي، أَفأَتَصدَّق بثُلُثَىْ مالِي؟ قَالَ: لا، قُلْتُ: فالشَّطْر يَارسُولَ الله ؟ فقالَ: لا، قُلْتُ فَالثُّلُثُ يا رسول اللَّه؟ قال: الثُّلثُ والثُّلُثُ كثِيرٌ أَوْ

---

٥ بوخاری(١٤٢٢)

٦ بوخاری (١٢٩٥)، موسلیم(١٦٢٨).

كَبِيرٌ إنَّكَ إنْ تَذرَ وَرَثتك أغنِياءَ خَيْرٌ مِن أَنْ تذرهُمْ عالَةً يَتكفّفُونَ النَّاس، وَإنَّكَ لَنْ تُنفِق نَفقةً تبْتغِي بِهَا وجْهَ الله إلاّ أُجرْتَ عَلَيْهَا حَتَّى ما تَجْعلُ في امْرَأتكَ قَال: فَقلْتَ: يَا رَسُولَ الله أُخَلَّفَ بَعْدَ أَصْحَابِي؟ قَال: إنَّك لن تُخلَّفَ فتعْمَل عَمَلاً تَبْتغِي بِهِ وَجْهَ الله إلاّ ازْددْتَ بِهِ دَرجةً ورِفعةً ولعَلَّك أَنْ تُخلَّف حَتَى ينْتفعَ بكَ أَقوامٌ وَيُضرَّ بك آخرُونَ. اللّهُمَّ أَمْض لأصْحابِي هجْرتَهُم، وَلاَ تردَّهُمْ عَلَى أعْقَابِهم، لَكن الْبائسُ سعْدُ بْنُ خوْلَةَ (يرْثى لَهُ رسولُ الله صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم» أَن مَاتَ بمكَّةَ) متفقٌ عليه.

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (ڕەزای خودای لەسەر بێ) — کە یەکێکە لەو دە کەسە، لە یارانی حەزرەت، کە مژدەی بەهەشتیان پێ دراوە، وە ناودارن بە عەشەرەی موبەششەرە- فەرموو: ساڵی حەجی ماڵ ئاوایی، کە مەشهورو ناودارە بە حەججەتولوەداع، زۆر نەخۆش بووم، پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هات بۆ سەردانم بۆ سەرخۆشی لێ کردنم.

عەرزیم کرد: قوربان! دەبینی کە نەخۆشی، چی لێکردووم، ماڵێکی زۆریشم هەیە، تاقە کچێکم هەیە کە کەلەپورو میراتم لێ بگرێ، دەمەوێ دوو بەش لە سێ بەشی ماڵەکەم بکەم بە خێرو وەسێتو راسپێری، فەرمانت چییە؟

فەرمووی: نابێ. گوتم: دە نیوەی؟ فەرمووی: نابێ. گوتم: دە سێ یەکێکی؟ فەرمووی: سێیەك دەبێ، سێیەکیش زۆرە، کەمتر بێباشترە، چونکە تۆ میرات بەرەکانت بە دەوڵەمەندی بە جێبهێڵی ئەوە گەلێ باشترە لەوەی کە بە هەژاری بە جێیان بهێڵی لەپ لەمو لەو پان بکەنەوەو چاویان لە دەستی مەردوم بێ! ئەوەش بزانە هەرچی بەخت بکەیتو ببەخشیتو نیازت لێی رەزای خودابێ پاداشی باشی لە سەر وەردەگریت، تەنانەت ئەوەشی کە دەیکەیت بە دەم ژنو خێزانی خۆشتەوە، بەمەرجێ بە نیازی پاك بێ، فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! دەترسم لە هاوڕێکانم بەجێ بمێنمو لەم نەخۆشیەدا لە مەککە بمرمو نەگەڕێمەوە لەگەڵ ئێوەدا بۆ ڕەوگەی کۆچو داری هیجرەتم؟! فەرمووی: با بەجێش بمێنی، گرنگ ئەوەیە تۆ بە نیازی پاکی خۆت دەگەی، هەرکارێ بکەی، لە هەر کوێ بی، بە مەرجێ مەبەستت رەزاو خۆشنودی خوا بێ پێی، ئەوە پایەو پلەت پێی بەرز دەبێتەوە، ئومێد دەکەم کە جارێ نەمریو بمێنیو خوا بتکا بە مایەی خێرو خۆشی بۆ گەلی موسوڵمانانو ببی بە هۆی زیانو شکستی بۆ هۆزی کافران، ئەی



خودایە! کۆچ و هیجرەتی هاوڕێکانم گیرا بکەو پاشگەزیان مەکەرەوەو ئاخر شەڕیان مەکە، بەڵام داخەکەم هەژار سەعدی کوری خەولە لە مەککە مرد، بۆیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەزەیی پیایدا هاتەوەو دڵی پێی سوتا (متفق علیه-ش). ئەم سەعدە جیایە لە سەعدی کوری ئەبی وەقاص.

٧/٧[٧]- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرة عَبْدِ الرَّحْمن بْنِ صخْرٍ رضي الله عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «إِنَّ الله لا يَنْظُرُ إِلى أَجْسامِكُم، وَلا إِلى صُوَرِكُمْ، وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعمالِكُمْ» رواه مسلم.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لەسەر بێ) —کەناوی عەبدورڕەحمانی کوری صەخرە- دەفەرموێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: خودا تەماشای جەستەو شکڵو شێوەو ماڵتان ناکات، بەڵام تەماشای نیازی دڵو دەروونو کردەوەی پاکتان دەکا (موسلیم- تاج. واتە ئەم فەرموودە پیرۆزەیە موسلیم ریوایەتی کردووەو لە تاجول ئوصولێشدا هەیە، زیادەکانی تەرجەمەکە لە ریوایەتەکەی تاج وەرگیراوە، خوا یار بێ ئەم زیادە سودانە لە سەراسەری کتێبەکەتدا لەسەر ئەم شێوەیە ئامـاژەو ئیشارەتی بۆ دەکرێ).

٨/٨[٨]- وعَنْ أَبِي مُوسَى عبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ الأَشعريِّ رضِي الله عنه قالَ: سُئِلَ رسول الله صَلّي اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم عَنِ الرَّجُلِ يُقاتِلُ شَجَاعَةً، ويُقَاتِلُ حَمِيَّةً ويقاتِلُ رياءً، أَيُّ ذلِك في سَبِيلِ اللَّهِ؟ فَقَالَ رسول الله صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «مَنْ قاتَلَ لِتَكُون كَلِمةُ اللَّهِ هِي الْعُلْيَا فهُوَ في سَبِيلِ اللَّهِ» مُتَّفَقٌ عليه

ئەبو موسای ئەشعەری (رەزای خودای لەسەر بێ) (کەناوی عەبدوڵڵای کوری قەیسە) فەرمووی: عەرزی حەزرەتیان کرد: پیاوی وا هەیە لە شەردا خۆی دەنوێنێ تا بڵێن ئازایە، هەیە دەجەنگێ چونکە غیرەت دەیگرێ، هەیە بۆ ناوو چاوەو روپایی دەجەنگێ جا ئەمانە کامیان لە رێگەی خودادایە؟ فەرمووی: ئەوەی لە پێناو بەرزەوە بوونی شەریعەتی خودادا جەنگ بکا، تەنیا ئەوە بۆ رەزای خودایەو بەس(ش).

---

٧ موسلیم(٢٥٦٤) (٣٣) بەم شێوەیەی تریش موسلیم گێراویەتەوە (٣٤)؛ واتە: (خودای گەورە تەماشای شکڵو شێوەو سامانتان ناکا، بەڵکو تەماشای نیازی دڵتانو کردەوەی پاکتان دەکا).

٨ بوخاری (١٢٣)، موسلیم (١٩٠٤)و (١٥٠).

٩/٩[٩]- وعن أبي بَكْرَة نُفيْع بْنِ الْحارِثِ الثَّقفِي رَضِي الله عنه أنَّ النبي صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم قال: «إذَا الْتقَى الْمُسْلِمَان بسيفيْهمَا فالْقاتِلُ والمقْتُولُ في النَّار» قُلْتُ: يَا رَسُول اللّهِ، هَذَا الْقَاتِلُ فمَا بَالُ الْمقْتُولِ؟ قَال:«إنَّهُ كَانَ حَرِيصاً عَلَى قَتْلِ صَاحِبِهِ» متفقٌ عليه.

ئەبوبەکرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) (کەناوی نوفەیعی کوڕی حاریثی ثەقەفییە) فەرمووی: حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ کە دوو موسوڵمان دەستەو شمشێر بەرابەر لە یەك دەگرن ئەوە کوژەرو کوژراو هەردووکیان جێگەیان دۆزەخە، عەرزیم کرد: قوربان! بکوژەکە جێی خۆیەتی کە دۆزەخیە، ئەی کوژراوەکە بۆچی؟ فەرمووی: چونکە ئەویش قرمی خۆش کردووە لە کوشتنی براکەی!(ش).

١٠/١٠[١٠]- وَعَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ الله عنه قال: قال رسول الله صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم: «صَلاَةُ الرَّجُلِ في جَماعةٍ تزيدُ عَلَى صَلاَتِهِ في سُوقِهِ وَبَيْتِهِ بضْعاً وعِشْرِينَ دَرَجَةً، وذلِكَ أنَّ أحَدَهُمْ إذا تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ أَتَى الْمَسْجِد لا يُرِيدُ إلاَّ الصَّلاَةَ، لا يَنْهَزُهُ إلاَّ الصَّلاَةُ، لَمْ يَخطُ خُطوَةً إلاَّ رُفِعَ لَهُ بِها دَرجةٌ، وَحُطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةٌ حتَّى يَدْخلَ الْمَسْجِدَ، فَإذَا دخل الْمَسْجِدَ كانَ فِي الصَّلاَةِ مَا كَانَتِ الصَّلاَةُ هِيَ التي تحبِسُهُ، وَالْمَلائِكَةُ يُصَلُّونَ عَلَى أَحَدكُمْ ما دام في مَجْلِسهِ الَّذي صَلَّى فِيهِ، يقُولُونَ: اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ تُبْ عَلَيْهِ، مالَمْ يُؤْذِ فِيهِ، مَا لَمْ يُحْدِثْ فِيهِ» متفقٌ عليه، وهَذَا لَفْظُ مُسْلمٍ. وَقَوْلُهُ صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم: «ينْهَزُهُ» هُوَ بِفتحِ الْياءِ وَالْهاءِ وَبالزَّاي: أَي يُخْرِجُهُ ويُنْهضُهُ.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموی: نوێژی پیاو بە کۆمەڵی- واتە: بە جەماعەت- بیست و پێنج جار پاداشت و خێری زۆرترە لە نوێژی ماڵەوەو بازاری، کە بەتەنیا خۆی دەیکا، ئەوەش لەبەر ئەمەیە چونکە هەرکاتێ کەدەستنوێژێکی جوان بگرێ و دەرچێ و بچێ بۆ مزگەوت و لەو چونەی تەنیا مەبەستی نوێژ بێ ئەم بەهرە گەورەیەی بۆ هەیە: ئەوە هەتا دەچێتە ناو مزگەوت هەر هەنگاوێ دەنێ پلەیێ پێی بەرز دەبێتەوەو گوناهێکی پێ هەڵدەوەرێ لێی، نوێژکەریش کە دەستی کرد بە نوێژ ئیتر فریشتەکان هەر دووعاو

---

٩ بوخاری(٣١) و(٧٠٨٣)، موسلیم(٢٨٨٨).

١٠ بوخاری(٤٧٧)، موسلیم(٦٤٩)،(٢٧٢).

نزاو خێری بۆ دەکەن‌و ڕەحمەتی لێ دەکەن، هەتا لەو شوێنەدا بێ کە نوێژی تیا دەکا، هەتا دەستنوێژەکەی دەشکێ، فریشتەکان خۆش خۆش دەڵێن: خودایە! ڕەحمەت بڕێژە بە سەریا، خودایە! میهری لەگەڵ بنوێنە، وە ئێوە هەتا چاوەنواری نوێژ بکەن بە ئیعتیبار لەناو نوێژدان‌و پاداشی باشی نوێژکردنتان بۆ حلێبە(ش-تاج).

١١/١١[١١]- وَعَنْ أبي الْعَبَّاسِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلب رَضِي الله عنهمـا، عَـنْ رسول الله صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم ، فِيما يَرْوِى عَنْ ربِّهِ، تَبَارَكَ وَتَعَالَى قَالَ: «إنَّ الله كتَبَ الْحسناتِ والسَّيِّئاتِ ثُمَّ بَيَّنَ ذلك: فمَنْ همَّ بِحَسَنةٍ فَلمْ يعْمَلْهَا كتبَهَا اللَّهُ عِنْدَهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى عِنْدَهُ حسنةً كامِلةً وَإنْ همَّ بهَا فَعمِلَهَا كَتَبَهَا اللَّهُ عَشْر حَسَنَاتٍ إلَى سَبْعِمَائِةِ ضِعْفٍ إلَى أَضْعَافٍ كثِيرةٍ، وَإنْ هَمَّ بِسيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبهَا اللَّهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كامِلَةً، وَإنْ هَمَّ بِها فعَمِلهَا كَتَبهَا اللَّهُ سَيِّئَةً وَاحِدَةً» متفقٌ عليه.

ئەبولعەباس، کە ناوی عەبدوللای کوڕی عەباس کوری عەبدولموطلیبەو ئامۆزای پێغەمبەرەو مەشهورە بە ئیبن‌و عەباس-ڕەزای خودایان لێ بێ- فەرمووی: لە فەرموودەیەکی قودسیدا کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیگێڕێتەوە لە خودای گەورەو پیرۆزەوە، حەزرەت فەرمووی: خودا هەموو چاکەیەك‌و هەموو خراپەیەکی لە (لوح المحفوظ) نوسیوەو بەم شێوەیە ڕوونی کردۆتەوە بۆ هەموو کەسێ: ئەگەر کەسێ ویستی چاکەیێ بکاو بۆی نەکرا، ئەوە خودا لەلای خۆی چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنوسێ، وە ئەگەر کەسێ قەصدی چاکەیەك بکاو لە هەمان کاتدا کردی ئەوە خودای سەردارو سەروەر لەلای خۆی لە دە چاکەوە تا حەوسەد چاکە، تا ئەوەندەی خودا خۆی حەز دەکا چاکەی بۆ دەنوسێ وە ئەگەر کەسێ ویستی خراپەیێ بکا بەڵام نەیکرد ئەوە خودا لەلای خۆی چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنوسێ، وە ئەگەر کەسێ ویستی خراپەیێ بکا وەکردی، ئەوە خودا بەیەك خراپە دەینوسێ لەسەری(ش-تاج).

---

١١ بوخاری (٦٤٩٠)، موسلیم(١٣١).

١٢/١٢[١٢]- وعن أبي عَبْد الرَّحْمَن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الْخطَّابِ، رضي الله عنهما قال: سَمِعْتُ رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يَقُولُ: «انْطَلَقَ ثَلاثَةُ نفر مِمَّنْ كَانَ قَبْلَكُمْ حَتَّى آوَاهُمُ الْمبِيتُ إِلَى غَارٍ فَدَخَلُوهُ، فانْحَدَرَتْ صَخْرَةٌ مِنَ الْجبلِ فَسَدَّتْ عَلَيْهِمْ الْغَارَ، فَقَالُوا: إِنَّهُ لا يُنْجِيكُمْ مِنْ الصَّخْرَةِ إِلاَّ أَنْ تَدْعُوا الله تعالى بصالحِ أَعْمَالكُمْ.

قال رجلٌ مِنهُمْ: اللَّهُمَّ كَانَ لِي أَبوان شَيْخَان كَبِيران، وكُنْتُ لا أَغبِقُ قبْلَهما أَهْلاً وَلا مالاً فنأَى بي طَلَبُ الشَّجرِ يَوْماً فَلمْ أُرِحْ عَلَيْهِمَا حَتَّى نَامَا فَحَلبْت لَهُمَا غبُوقَهمَا فَوَجَدْتُهُمَا نَائِميْنِ، فَكَرِهْت أَنْ أُوقظَهما وَأَنْ أَغْبِقَ قَبْلَهُمَا أَهْلاً أَوْ مَالاً، فَلَبِثْتُ وَالْقَدَحُ عَلَى يَدِي أَنْتَظِرُ اسْتِيقَاظَهُما حَتَّى بَرَقَ الْفَجْرُ وَالصِّبْيَةُ يَتَضَاغَوْنَ عِنْدَ قَدَمي فَاسْتَيْقَظَا فَشَرِبَا غَبُوقَهُمَا. اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتُ فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ فَفَرِّجْ عَنَّا مَا نَحْنُ فِيهِ مِنْ هَذِهِ الصَّخْرَة، فانْفَرَجَتْ شَيْئاً لا يَسْتَطيعُونَ الْخُرُوجَ مِنْهُ. قَال الآخر: اللَّهُمَّ إِنَّهُ كَانتْ لِيَ ابْنَةُ عمّ كانتْ أَحَبَّ النَّاسِ إِلَيَّ) وفي رواية: (كُنْتُ أُحِبُّهَا كَأَشد مَا يُحِبُّ الرِّجَالُ النِّسَاءِ، فَأَرَدْتُهَا عَلَى نَفسهَا فَامْتَنَعَتْ مِنِّي حَتَّى أَلَمَّتْ بِهَا سَنَةٌ مِنَ السِّنِينَ فَجَاءَتْنِي فَأَعْطَيْتُهَا عِشْرينَ وَمِائَةَ دِينَارٍ عَلَى أَنْ تُخلِّيَ بَيْنِي وَبَيْنَ نَفْسِهَا ففعَلَت، حَتَّى إِذَا قَدَرْتُ عَلَيْهَا) وفي رواية: (فَلَمَّا قَعدْتُ بَيْنَ رجلَيْهَا، قَالتْ: اتَّقِ الله ولا تَفُضَّ الْخَاتَمَ إِلاَّ بِحَقِّهِ، فانْصَرَفْتُ عَنْهَا وَهِيَ أَحبُّ النَّاسِ إِليَّ وَتركْتُ الذَّهَبَ الَّذي أَعْطَيْتُهَا، اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتُ فَعلتُ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ فافْرُجْ عَنَّا مَا نَحْنُ فِيهِ، فانفرَجَتِ الصَّخْرَةُ غَيْرَ أَنَّهُمْ لا يَسْتَطِيعُونَ الْخُرُوجَ مِنْهَا. وقَالَ الثَّالِثُ: اللَّهُمَّ إِنِّي اسْتَأْجَرْتُ أُجراءَ وَأَعْطَيْتُهم أَجْرَهُمْ غَيْرَ رَجُلٍ وَاحِدٍ تَرَكَ الَّذي له وذهب فثمَّرت أجره حتى كثرت منه الأموال فجائني بعد حين فقال يا عبد الله أَدِّ إِلَيَّ أَجْرِي، فَقُلْتُ: كُلُّ مَا تَرَى منْ أَجْرِكَ: مِنَ الإِبِلِ وَالْبَقَرِ وَالْغَنَم وَالرَّقِيق فقال: يا عَبْدَ اللَّهِ لا تَسْتَهْزِيْ بي، فقُلْتُ: لاَ أَسْتَهْزِيُ بك، فَأَخَذَهُ كُلَّهُ فاسْتَاقَهُ فَلَمْ يَتْرُكْ مِنه شَيْئاً، اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتُ فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتغاءَ وَجْهِكَ فافْرُجْ عَنَّا مَا نَحْنُ فِيهِ، فَانْفَرَجَتِ الصَّخْرَةُ فخرَجُوا يَمْشُونَ) متفقٌ عليه.

---

١٣ بوخاری(٣٤٦٥)، موسلیم(٢٧٤٣)، ئەم فەرمودەیە نیشانەی ئەوەیە کە لەکاتی سەختڵەتیو تەنگانەو هەموو کاتێکی تردا نزاو پاڕانەوە سوننەتە، وە دروستە کە کاری باش بکرێ بە دەسکەلاو هۆکار بۆ شادبوون بە نیازو مراز لەلای خودا، هەروەها بەڵگەی گەورەیی چاکە کردنە لەگەڵ دایكو باوکداو، بەڵگەی دەروون پاکیو دەست پاکییە.

ئەبو عەبدوڕڕەحان، عەبدوڵڵای کوری عومەری کوری خەططاب مەشهور بە ئیبنوعومەر(رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: جارێ سێ کەس-لە پێشینان- بە ڕێگایەکا دەڕۆیشتن باران دایگرتن، جا شەوێ پەنایان بردە بەر ئەشکەوتێ لە کێوێ، تاوێرێ لە کێوەکەوە گل بوەوەو دەرگای ئەشکەوتەکەی قەپات کرد، جا لەناو خۆیانا گوتیان: سەیر بکەن بزانن چی کردەوەیەکی باشتان کردووە بەو کردەوانە لە خودا بپاڕێنەوە سا بەشكو بە هۆی ئەو کردەوە باشانەوە خودا دەروتان لێ بکاتەوەو لەم تاوێرە رزگارمان بکا، یەکێکیان گوتی: خودایە! خۆت ئاگاداری کە من باوكو دایکێکی ئیختیارم هەبوون، لەگەڵ چەند منداڵێکی وردا، شوانیم بۆیان دەکردو بە شوانی بەخێویانم دەکرد، هەموو جارێ کە دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە رانەکەم دەکردە پەچەوەو شیرم دەدۆشیو لە پێشدا دەرخواردی باوكو دایکمم دەدا ئەوجا بەشی منداڵەکانیشم دەدا، تا رۆژێ بە شوێن لەوەڕی باشدا دوورکەوتمەوەو درەنگم بەسەرهاتو کە هاتمەوە شەو بوو، رووانیم باوكو دایکم خەوتوون، منیش وەك جاران شیرم دۆشیو بۆم بردنو بەدیار سەریانەوە راوەستام تاکەی خەبەریان بۆوە شیرەکەیان بخۆنەوە، بەڵام حەزم نەکرد خەبەریان بکەمەوەو پێشم ناخۆش بوو کەلەبەر ئەوان شیر بدەم بە منداڵەکان، منداڵەکانیشم لەو ماوەیەدا لەبەر پێما لە برساندا هەر دەزروکانەوە تا شەبەقی دا ئەمە حاڵمان بوو، جا ئەی خودایە! تۆ دەزانی ئەگەر ئەمەم لەبەر رەزامەندیی تۆ کردووە ئەوا دەرویەکمان لێ بکەرەوەو کەلەبەرێکمان بۆ بکەرەوە کە ئاسمانی لێوە ببینین! جا خودا کەلەبەرێکی بۆ کردنەوەو ئاسمانیان لێوە دیو تاوێرەکە تۆزێ خزا بەڵام نەیان توانی دەربچن، یەکێکی تریان گوتی: خودایە! خۆت ئاگاداری کە کچێکی ئامۆزام هەبوو، چەندە پیاو حەز لە ئافرەت دەکا ئەوندە حەزم لێی بوو، کە داوای ئیشی خراپەم لێ کرد خۆی نەدا بەدەستەوە، هەتا ساڵێکیان دووچاری گرانیو قاتو قڕی بوو، وە بە ناچاری هات بۆ لام، سەدو بیست دیناری زێڕم دا پێی لەباتی ئەوەی کە خۆیم تەسلیم بکا، ئەویش وای کرد، جا کاتێ دەستم لێی گیربوو، وە لەناو کۆشیا دانیشتمو ویستم بە دەستی بگرم، کچەکە گوتی: ئەی عەبدوڵڵا! ئەی بەندەی خوا! لە خودا بترسەو ئەم مۆرە بەنارەوا مەشکێنە، ئیتر منیش هەڵسامو وازم لێ هیناو پارەکەشیم دایە بە خۆرایی بۆ خۆی، وە لەو

حاڵەتەیشدا زۆر حەزم لێی بوو، جا ئەی خودایە! تۆ دەزانی ئەگەر ئەمەم لەبەر رەزامەندی تۆ کردووە ئەوا دەرویەکمان لێ بکەرەوە لەم سەخڵەتییە، ئیتر خودا دەرویەکی تری لێ کردنەوەو تا دوو بەشی تاوێرەکە لەسەر دەرگاکە لاچوو، سێهەمیان گوتی: ئەی خودایە! تۆ خۆت ئاگات لێیە کەمن جارێ بە قزناخێ برنج کرێکارێکم بە کرێ گرت، کە ئیشەکەی تەواو کرد، گوتی: کرێکەم بدەرێ، منیش گوتم: کرێکەت ئەوەتانێ، کەچی بە دڵی نەبوو، وەری نەگرت، منیش کە ئەو رۆیی پارەو کرێی کرێکارەکانی ترم هەمووی دا، وە چەڵتوکەکەی ئەویشم هەموو وەرزێ دەچاندو بەرهەمم دەهێناتا وا زۆر بوو گاگەلێك و وشترو مەڕو چەند بەندەیەکی شوانم پێی کڕی، تا ڕۆژێ کرێکارەکە هاتەوە بۆ لام گوتی: لە خودا بترسە کرێکەم بدەرێ، منیش گوتم: بڕۆ ئەو رانە وشترو گاگەل و رانە مەڕو شوانەکانیان ببە بۆ خۆت، هەمووی هی کرێکەتە، گوتی: ئەی عەبدی خودا! لە خودا بترسە گاڵتەم پی مەکە، منیش گوتم: بەراستمە، گاڵتەت پێ ناکەم هەمووی هی خۆتە ببیە، ئیتر ئەویش هەمووی برد بۆخۆی. جا ئەی خودایە! تۆ دەزانی ئەگەر ئەمەم لەبەر خاتری تۆ کردووە ئەوا دەرگای ئەشکەوتەکەمان بە تەواوی بۆ بکەرەوە، جا خودا دەرگاکەی تەواو بۆ کردنەوەو تاوێرەکە خزاو هاتنە دەرەوەو رۆشتن(ش-تاج).

## ٢- باسی تەوبەو پەشیمانی(باب التوبة)

قال العلماء: التوبة واجبة من كلّ ذنب، فان كانت المعصية بين العبد و بين الله تعالى لا تتعلق بحق آدمي، فلها ثلاثة شروط: احدها: أن يقلع عن المعصية، والثاني: ان يندم على فعلها، الثالث: أن يعزم أن لا يعود اليها ابدا. فإن فقد احد الثلاثة، لم تصح توبته.

و إن كانت المعصية تتعلق بآدمى، فشروطها اربعةِ، هذه الثلاثة وأن يبرأ من حق صاحبها، فإن كانت مالا أو نحوه رده اليه، وإن كانت حد قذف ونحوه مكنه منه أو طلب العفوه، وإن كانت غيبة استحله منها، ويجب أن يتوب من جميع الذنوب، فإن تاب من بعضها صحت توبته هند اهل الحق من ذلك الذنب، وبقي الباقي،وقد تظاهرت دلائل الكتاب والسنة واجماع الأمة على وجوب التوبة، قال الله

**تعالى:﴿وتوبوا الى الله جميعا ايها المؤمنون لعلكم تفلحون﴾، وقال تعالى: ﴿إستغفروا ربكم ثم توبوا إليه﴾، وقال تعالى:﴿يا ايها الذين آمنوا توبوا الى الله توبة نصوحا﴾.**

**دانەری ریاض الصالحین، شێخی نەوەوی** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: زاناکان دەفەرموون: تەوبەو پەشیمان بوونەوە لە هەموو گوناهێ، پێویستەو فەرزە، جا ئەگەر ئەو گوناهە لە بەینی بەندەو خودای گەورەدا بێ‌و پەیوەندی بە ئادەمیزادەوە نەبێ، ئەوە تەوبەو گەڕانەوە لەو گوناهە بەم سێ مەرجە دروستە:**

**یەکەم: کە بەیەکجاری وازی لێ بێنێ، دووەم: لە کردنەکەی پەشیمان بێ، سێیەم: بڕیار بدا کە ئیتر هەتا هەتایە نەیکاتەوە. جا ئەگەر یەکێ لەم سێ مەرجانە نەهاتە جێ ئەوە تۆبەکەی دروست نییەو دانامەزرێ، بەڵام ئەگەر گوناه پەیوەندی بە ئادەمیزادەوە هەبوو، ئەوە بە چوار مەرج دادەمەزرێ، بەم سێ مەرجەو بە مەرجی ئەوەیش: کە گەردنی خۆی پێ ئازاد بکاو خاوەن هەقەکە لە خۆی رازی بکا،**

**یا ئەگەر ماڵ‌و شتی وابوو بیداتەوە پێی یا لێی خۆشبێ یا ئەگەر حەددی بوختان‌و شتی وابوو دەبێ خۆی بدا بەدەستەوە کەئەو حەددەی لێ بدا، یا داوای لێبوردنی لێ بکا، یا ئەگەر غەیبەت بوو گەردنی خۆی پێ ئازاد بکا. پێویستە ئادەمیزاد لە هەموو گوناهێ تەوبە بکا، لە هەموو تاوانێ گەڕانەوەو پەشیمانی گەرەك‌و پێویستە،بەڵام تەوبەکردن لە هەندێ گوناهیش بەتایبەتی‌وەك تەوبەکردن لە بادەنۆشی‌دروستەو دەبێ، ئەهلی حەق‌و هەقناسەکان لەسەر ئەومن کەشتی وا دروستەو ئەوەی لە کۆڵ دەکەوێ‌و ئەوانی تری لەسەر دەمێنێ.**

**بەلگەو دەلیل لە قورئان‌و سوننەتی پێغەمبەردا گەلێ زۆرە سەرڕای ئەومیش قسەی زانایانی گەلی مسوڵمانیش یەکە لەسەر ئەوە گەڕانەوەو تەوبەکردن پێویستە. ئەوەتا خودای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: ﴿وتوبوا الى الله جميعا ايها المؤمنون لعلكم تفلحون﴾ النور/٣١. واتە ئەی دەستەی بڕواداران! ئەی موسوڵمانان! بگەڕێنەوە بۆلای ڕەحمەتی خودا، هەموو بەگشتی، سابەشکو بگەن بە مایەی سەرفرازی‌و بەختیاری خۆتان، هەمدیسان یەزدان دەفەرموێ: ﴿إستغفروا ربكم ثم توبوا إليه﴾ (هود/٣). واتە: لە خودای پەروەردگارتان بە کوڵی دڵ بپاڕێنەوەو داوای لێخۆشبوونی لێبکەن‌و ئینجا تەوبەشی لەسەر دەست بکەن.**

دیسـان دەفـەرموێ: ﴿یـا ایهـا الـذین آمنـوا توبـوا الی الله توبـة نصـوحا﴾ (التحـریم/٨). واتـە: ئـەی کەسـانێ کـە ئیمانـدارن‌و باوەڕتـان هێنـاوە تەوبەیـەکی ڕاست‌و دروستی ئێجگاری لەسەر دەستی خودادا بکەن.

١٣/١[١٣] – وعَنْ أبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال: سمِعتُ رسول الله صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَـلَّم يَقُولُ: (واللَّه إنِّـي لأَسْـتَغْفرُ الله، وَأَتُـوبُ إلَيْـه، فِي اليَـوْمِ، أَكثـر مِـنْ سَـبْعِين مـرَّةً) رواه البخاري.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: لـەزاری حـەزرەتم بیسـت دەیفـەرموو: بەخودا، بەیەزدانی پاك، من بەش بەحاڵی خۆم ڕۆژی وا هەیە حەفتا جار زیاتر لە خودا دەپاڕێمەوەو داوای لێخۆشبوونی لێدەکەم، وە تەوبەی لە خزمەتدا دەکەم(ب).

١٤/٢[١٤]- وعن الأغَرِّ بْن يَسار المُزنِيِّ رضي الله عنه قال: قال رسول الله صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم: (يا أَيُّها النَّاس تُوبُوا إلى اللَّهِ واسْتغْفِرُوهُ فإني أَتوبُ في اليَوْمِ مائة مَرَّة) رواه مسلم.

ئەغەڕی موزەنی (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسەر بێ) فـەرمووی: بێ گومان منیش هەندێ جار گـەرد لـە دڵـم دەنیشێ‌و دڵـم گـەرد دەگرێ جابۆیـە هـەموو ڕۆژێ سـەد جـار، بگـرە پتریـش دەپاڕێمـەوە لـە خـوداو داوای لێبـوردنی لێ دەکەم، کەوایە ئێوەیش بگەڕێنەوە بۆلای خوداو داوای چاو پۆشی‌و تاوان پۆشی لـە خودا بکەن هەمیشە تەوبە لە خزمەت خودادا تازە بکەنەوە!

١٥/٣[١٥]– وعنْ أبي حَمْزَةَ أَنس بن مَالِكٍ الأَنْصَاريِّ خَادِمِ رسول الله صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، رضِي الله عنه قال: قال رسول الله صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: للَّهُ أَفْرحُ بتْوبةِ عَبْدِهِ مِنْ أَحَدِكُمْ سقطَ عَلَى بعِيرِهِ وقد أَضلَّهُ في أَرضٍ فَلاةٍ. متفقٌ عليه.

وفي رواية لُمسْلمٍ: (للَّهُ أَشدُّ فرحاً بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ حِين يتُوبُ إلْيهِ مِنْ أَحَـدِكُمْ كـان عَلَـى راحِلَتِهِ بِأَرْضٍ فلاةٍ، فانْفلتتْ مِنْهُ وعلَيْها طعامُهُ وشرَابُهُ فأَيِسَ مِنْهَا، فأَتَى شَجَرةً فاضْطَجَعَ في ظِلِّهَا، وقدْ أَيِسَ مِنْ رَاحِلتِهِ، فَبيْنما هوَ كَذَلِكَ إذْ هُوَ بِها قَائِمة عِنْدَهُ، فَأَخـذ بِخطامِهَـا ثُمَّ قَالَ مِنْ شِدَّةِ الفَرحِ: اللَّهُمَّ أَنت عبْدِي وأَنا ربُّكَ، أَخْطَأَ مِنْ شِدَّةِ الفرح).

---

١٣ بوخاری (٦٣٠٧)، تیرمذي(٣٢٥٥).

١٤ موسلیم(٢٧٠٢)، ئەبوداوود(١٥١٥).

١٥ بوخاری(٦٣٠٨)، موسلیم(٢٧٤٧).

ئەبو حەمزە، ئەنەسی کوری مالیکی ئەل-ئەنصاری، کە خزمەتکاری پێغەمبەر بوو، (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەر بێ‌و ڕەزای خودا لەسەر ئەو)، فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: خودا بە تەوبەی بەندەی خۆی کاتێ کە تەوبە دەکا زیاتر شادمان دەبێ، هەتا ئەو کەسە کە وشترەکەی لە چۆڵەوانیەکا بزردەکاو لە ناکاو دەچێ بەسەریاو دەیدۆزێتەوە(ش=ب/م)لە گێڕانەوەیەکی موسلیمدا: خودا پتر شادمان دەبێ بە تەوبەی بەندەی خۆی کە پەشیمان دەبێتەوەو دەگەڕێتەوە بۆلای خودا، هەتا ئەو کەسەتان لە بیابانێکا بەسواری وڵاخەکەی ڕێ دەکا، لە پڕ ناگەهان وڵاخەکەی بەلەسە دەبێ‌و نان‌و ئاوەکەشی دەفڕێنێ، جا کاتێ کەلێی نائومێد دەبێ دەچێتە بن درەختێ، بە نائومێدی لە سێبەرەکەیدا پاڵ دەکەوێ، جا لەم حاڵی لێقەوەمان‌و نائومێدییەدا لە پڕ کابرا تەماشا دەکا کەوا وڵاخەکەی – بە تفاق‌و نان‌و ئاوەکەیەوە- لەلایا بەدیاریەوە ڕاوەستاوە! ئەویش پەلاماری جڵەوەکەی بداو جڵەوەکەی بگرێ‌و لە خۆشیانا بپەشۆکێ‌و لە باتی ئەوەی بڵێ خودایە! تۆ خودای منی‌و من بەندەی تۆم، کەچی بڵێ: خودایە! تۆ بەندەی منی‌و من خودای تۆم(م/تاج).

١٦/٤[١٦]- وعن أبي مُوسى عَبْدِ اللّهِ بن قَيْسٍ الأَشْعَرِيِّ، رضِي الله عنه، عن النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (إن الله تعالى يبْسُطُ يدهُ بِاللَّيْلِ لِيتُوب مُسيءُ النَّهَارِ وَيبْسُطُ يَدهُ بالنَّهَارِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ اللَّيْلِ حتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِن مغْرِبِها) رواه مسلم.

ئەبو مووسا (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: خودای گەورە لە شەوا دەستی خۆی رادەهێڵێ بۆ ئەوانەی لە ڕۆژدا، خراپەیان کردووەو تاوانباری ڕۆژن هەتا تەوبە بکەن‌و لەسەر دەستی خودادا لە تاوانیان پەشیمان ببنەوە، هەروەها لە ڕۆژدا دەستی خۆی درێژ دەکا بۆ ئەوانەی لە شەودا کاری خراپەیان کردووەو خراپەکاری شەون هەتا لەسەر دەستی خودادا تەوبە بکەن‌و لە تاوانیان پەشیمان ببنەوە، ئەم مەرحەمەت‌و قوبوڵی تەوبەیە هەر بەردەوام دەبێ دەمێنێ هەتا نزیکی قیامەت کە خۆر دەگەڕێتەوەو لەباتی لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕۆژ هەڵبێ لە ڕۆژئاواوە هەڵ دێ ئیتر ئەو کاتە دەرگای تەوبە دادەخرێ(م/تاج).

---

١٦ موسليم(٢٧٥٩).

١٧/٥[١٧] - وعَنْ أبي هُرَيْرةَ رضي الله عنه قال: قال رسول الله صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (مَنْ تاب قَبْلَ أَنْ تطلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مغْرِبِهَا تَابَ اللهُ علَيْه) رواه مسلم.

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: هەرکەسێ لە پێش ئەو کاتەدا کە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵ دێ تەوبە بکا خودا تەوبەی گیرا دەکا(م).**

١٨/٦[١٨] - وعَنْ أبي عَبْدِ الرَّحْمن عَبْدِ اللّهِ بن عُمرَ بن الخطّاب رضي الله عنهما عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: «إِنَّ الله عزَّ وجَلَّ يقْبَلُ توْبَة العبْدِ مَالَم يُغرْغرِ» رواه الترمذي وقال: حديث حسنٌ.

**ئیبنو عومەر** (رەزای خودای لەسەر بێ) **لە پێغەمبەرەوە** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: خودای سەردارو سەروەر تەوبەو پەشیمانی بەندە گیرا دەکا بە مەرجێ نەکەوتبێتە حاڵی گیانەڵا(ت:ح/ح=ترمذی وتویەتی فەرموودەیەکی جوانە).**

١٩/٧[١٩] - وعَنْ زرِّ بْنِ حُبَيْشٍ قَال: أَتيْتُ صفْوانَ بْنِ عسَّالٍ رضِي الله عنْهُ أَسْأَلُهُ عن الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ فقال: مَا جاءَ بِكَ يَا زِرُّ ؟ فقُلْتُ: ابْتغَاءُ الْعِلْمِ، فقَال: إنَّ الْملائِكَةَ تَضعُ أَجْنِحتِها لِطَالِبِ الْعِلْمِ رِضاء بمَا يَطلُبُ، فَقلْتُ: إنَّه قدْ حَكَّ في صدْري الْمسْحُ عَلَى الْخُفَّيْن بَعْدَ الْغَائِطِ والْبوْل، وكُنْتَ امْرَءاً مِنْ أَصْحاب النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، فَجئْت أَسْأَلُكَ: هَلْ سمِعْتَهُ يذْكرُ في ذَلِكَ شيْئاً ؟ قال: نعَمْ كانَ يأْمُرنا إذا كُنا سفراً أوْ مُسافِرين أَن لا ننْزعَ خفافَنا ثلاثة أَيّامٍ ولَيَالِيهنَّ إلاَّ مِنْ جنَابةٍ، لكِنْ مِنْ غائطٍ وبْولٍ ونْومٍ. فقُلْتُ: هَل سمِعتهُ يذكُر في الْهوى شيْئاً ؟ قال: نعمْ كُنَّا مَع رسول الله صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم في سفر، فبيْنا نحنُ عِنْدهُ إذ ناداهُ أَعْرابي بصوْتٍ له جهوريّ: يا مُحمَّدُ، فأَجَابهُ رسولُ الله صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم نحْوا مِنْ صَوْتِه: «هاؤُمْ» فقُلْتُ لهُ: وَيْحَكَ اغْضُضْ مِنْ صَوْتِكَ فإنَّك عِنْد النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم وقدْ نُهيت عَنْ هذا، فقال: واللّه لا أَغضُضُ: قَالَ الأَعْرابِيُّ: الْمَرْءُ يُحِبُّ الْقَوم ولَمَّا يلْحق بِهِمْ؟ قال النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «الْمرْءُ مع منْ أَحبَّ يَوْمَ الْقِيامةِ» فما زَالَ يُحدِّثُنا حتّى ذكر باباً من الْمَغْرب مَسيرةُ عرْضِه أوْ

---

١٧ موسليم (٢٧٠٣).

١٨ تيرمذي(٣٥٣١)

١٩ تيرمذي (٣٥٢٩)و(٣٥٣٠) له طهارەتيش دا (٩٦).

يسِيرِ الرَّاكِبُ فِي عرْضِهِ أَرْبَعِينَ أَوْ سَبْعِينَ عَاماً. قَالَ سُفْيانُ أَحدُ الرُّوَاةِ. قِبل الشَّام خلقَهُ اللّٰهُ تعالى يوْم خلق السموات والأَرْضَ مفتوحاً لِلتَّوبة لا يُغلقُ حتَّى تَطلُعَ الشَّمْسُ مِنْهُ) رواه التِّرْمذي وغيره وقال: حديث حسن صحيح.

زیڕی کوڕی حوبەیش (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: چووم بۆ خزمەتی صەفوانی کوڕی عەسسال (ڕەزای خودای لەسەر بێ) کە باسی مەسحی خوففی لێ بپرسم، کە چۆن دەستی تەڕ دەهێنرێ بەسەر خوفدا لە کاتی دەستنوێژ گرتندا لەباتی شۆردنی پێ، فەرمووی: ئەی زیڕ! چی هێناوتی؟ گوتم: بەشوێن زانینا وێڵم و منەیی عیلم دەکەم. فەرمووی: فریشتەکان کاتێ فەقێیێ، واتە فێرخوازێ لە شوێنێ دەبینن، باڵیانی بۆ ڕادەخەن و لە خۆشی ئەو قوتابییە دەنیشنەوەو دەورەی لێ دەدەن! ئەوەندە لە پیشەکەیان ڕازین. ئنجا گوتم: لەبابەت مەسحی خوففەوە، لە پاش پێشاو، چ پیسی چ میز، کەمێ دوودڵم و تۆیش پیاوێکی لە پیاوانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) جا هاتووم پرسیارت لێ بکەم: کە ئایا لەم بارەیەوە هیچت لە پێغەمبەر بیستووە؟ فەرمووی: بەڵێ کە جاران لە سەفەردا بووینایە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێمانی دەگوت کە هەتا ماوەی سێ ڕۆژ مەسحی خوففەکانمان بکەین و لەو سێ ڕۆژانەدا دایان نەکەنین نە بۆ پیسی و نە بۆ گمێزو نە بۆ خەو، مەگەر بۆ لەش پیسی. جاگوتم: ئایا لە بارەی خۆشەویستی ڕەواوە هیچت لە بیر ماوە کەلە پێغەمبەرت بیستبێ؟ فەرمووی: بەڵێ، لە سەفەرێکا لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین (درودی خودای لەسەر بێ) کابرایەکی عەرەبی دەشتەکی لووت وشکی کەللە بۆش، کە لەدوای خەڵکەکەوە بوو، لەلای خۆیەوە بە دەنگێکی گڕی گەورەی بەرز بانگی حەزرەتی کرد گوتی: ئەی موحەممەد! ئێمەیش تێمان خوڕی: خانە خراپ شتی وامەکە، دەنگ بەرز مەکەرەوە، تۆ لە خزمەتی پێغەمبەردای، دەبێ بەڕێزو بە قەدەرەوە بانگی حەزرەت بکرێ، شتی وا لەتۆو لە هەموو کەسێ قەدەغەیە! کەچی گوتی: بەخوا دەنگم نزم ناکەمەوە، حەزرەتیش (درودو سەلام و صەلاتی خودای لەسەر بێ و سەرو ماڵ و منداڵ بەقوربانی بێ) فەرمووی: ئادەی بڵێ گوێم لێتە، جا پیاوەکە گوتی: پیاوی وا هەیە کۆمەڵێکی خۆش دەوێ بەڵام بە کردەوەی باش بەوانا ناگا، ئایا پایەی ئەم پیاوە چییە؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پیاو لە قیامەتدا لەگەڵ خۆشەویستی خۆیدا دەبێ، ئیتر صەفوان گەلێ فەرموودەی

حەزرەتی گێرایەوە بۆمان هەتا هاتە سەر ئەو فەرموودەیە کە دەفەرموێ: خودا لە رۆژئاوادا دەرگایەکی دروستکردووە بۆ تەوبە، حەفتا ساڵە رێ پانە، یا فەرمووی: چل ساڵە رێ پانە، ئەو دەرگایە داناخرێ هەتا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵنەیێ، لەو رۆژەوە خودای گەورە دەرگای ئاسمانەکانو زەوی دروستکردووە ئەم دەرگایە دروست کراوە بۆ تەوبە،یا فەرمووی: سوار چل ساڵ، یا حەفتا ساڵ بەناو پانیەکەیدا دەروا. سوفیان-کە یەکێکە لە راویەکانی ئەم فەرموودەیە- دەڵێ: ئەم دەرگایە لەلای شامەوەیە(ت:ح/ح/ص-تاج).

٨/٢٠[٢٠] – وعنْ أبي سعِيدٍ سَعْد بْنِ مالك بْن سِنان الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه أَن نَبِيَّ الله صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قَال: (كان فِيمنْ كَانَ قَبْلكُمْ رَجُلٌ قتلَ تِسْعةً وتِسْعين نفْساً، فسأَل عن أَعلَم أَهْلِ الأَرْضِ فدُلَّ على راهِبٍ، فَأَتَاهُ فقال: إِنَّهُ قَتَل تِسعةً وتسعِينَ نَفْساً، فَهلْ لَهُ مِنْ توْبَةٍ ؟ فقَال: لا فقتلَهُ فكمَّلَ بِهِ مِائةً ثمَّ سأَلَ عن أعلم أهلِ الأرضِ، فدُلَّ على رجلٍ عالمٍ فقال: إنهَ قَتل مائةَ نفسٍ فهلْ لَهُ مِنْ تَوْبَةٍ ؟ فقالَ: نَعَمْ ومنْ يحُولُ بيْنَهُ وبيْنَ التوْبَة ؟ انْطَلِقْ إِلَى أَرْضِ كذا وكَذا، فإِنَّ بها أُناساً يعْبُدُونَ الله تعالى فاعْبُدِ الله مَعْهُمْ، ولا تَرْجعْ إِلى أَرْضِكَ فإِنَّهَا أَرْضُ سُوءٍ، فانطَلَق حتَّى إِذا نَصَف الطَّرِيقُ أَتَاهُ الْموْتُ فاختَصمتْ فيهِ مَلائِكَةُ الرَّحْمَةِ وملاكَةُ الْعَذابِ. فقالتْ ملائِكَةُ الرَّحْمَةَ: جاءَ تائِباً مُقْبلا بِقلْبِهِ إِلى اللَّهِ تعالى، وقالَتْ ملائكَةُ الْعذابِ: إِنَّهُ لَمْ يَعْمَلْ خيْراً قطُّ، فأَتاهُمْ مَلكٌ في صُورَةِ آدمي فجعلوهُ بيْنهُمْ أَي حكماً فقال قيسوا ما بيْن الأَرْضَين فإِلَى أَيَّتهما كَان أَدْنى فهْو لَهُ، فقاسُوا فوَجَدُوه أَدْنى إِلَى الأَرْضِ التي أَرَادَ فَقبَضْتهُ مَلائِكَةُ الرَّحمةِ) متفقٌ عليه.

وفي روايةٍ في الصحيح: (فكَان إِلَى الْقرْيَةِ الصَّالحَةِ أَقْربَ بِشِبْرٍ، فجُعِل مِنْ أَهْلِها) وفي رِواية في الصحيح: (فأَوْحَى اللَّهُ تعالَى إِلَى هَذِهِ أَن تَبَاعَدِي، وإِلى هَذِهِ أَن تَقرَّبِي وقَال: قِيسُوا مَا بيْنهمَا، فَوجدُوه إِلَى هَذِهِ أَقْربَ بِشِبْرٍ فَغُفِرَ لَهُ). وفي رِوايةٍ: (فنأَى بِصَدْرِهِ نَحْوهَا).

---

٢٠ بوخاری (٢٤٧٠)، موسلیم(٢٧٦٦)، ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێ: کەدەرگای تەوبە هەمیشە کراوەیە، وەتەوبەکاری راست تەوبەکەی قەبووڵە، با گوناهی زۆریشی کردبێ، یا گەورەترین تاوان کە شیرکەو کفرە کردبێتی.

ئـەبو سـەعیدی خـوردی (ڕەزای خـودای لەسـەر بێ) فـەرمووی: حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بێ) فەرمووی: پیاوێ لە نەتەوە پێشینەکان نەوەدو نۆ کەس دەکوژێ، ئینجا دەپرسـێ: کێ زاناترین کەسە لە ولاتدا، دەڵێن: فیسارە سۆفیلکە، جا کابراکە دەچـێ بـۆ لایو پێی دەڵێ: من نەوەدو نۆ کەسم کوشتووە، ئایا تەوبەم بۆ هەیە؟ خودا ناسەکە دەڵێ نەء، جا کابرا ئـەویش دەکوژێو دەیکا بـە سـەدی تـەواو، جا دیسان دەست دەکاتەوە بە پرسیارو دەڵێ: کێ زاناترین کەسە لە ولاتدا؟ ئەم جارە پیاوێکی زانای نیشان دەدەن، جا دەچێ بۆ لایو پێی دەڵێ: من سەد کەسم کوشتووە. ئایا تەوبەم بۆ هەیە؟ زاناکە دەڵێ: بەڵێ، وە کەس ناتوانێ ڕێگەی تەوبەت لێ بگرێ، تەوبە هەموو کاتێ لە هەمو کەسێ قەبووڵ دەکرێ، بەڵام لێرە مەمێنەو بـرۆ بـۆ فیسارە ولات لەوێ تاقمێ خواناسی باشی لێیە، خەریکی خودا پەرستیو عیبادەت کردنن، برۆ لەوێ تۆیش لەگەڵ ئەواندا خواناسی بکەو مەچۆرەوە بۆ ولاتی خۆت، چونکە خاکێکی شومو بەدە، پیاوەکەش دەکەوێتە رێ بۆ ئەو ولاتە، دەروا تا دەگاتە نیوەی رێ، لەوێ دەمرێ! جا فریشتەی رەحمەتو فریشتەی عـەذاب لەسـەر تەرمەکەی حازر دەبنو لەسەری دەبێ بە کێشمە کێشمییان: فریشتەی رەحمەت دەڵێن: ئەمـە بۆ تەوبە هاتووەو بە کوڵی دڵ ڕووی لە خودای گـەورە بـووە کەواتـە ئەمـە دیاری دەستی ئێمەیەو دەیبەین بـۆ بەهەشت! فریشتەی سزایش دەڵێن: ئەمـە هـەرگیز کـردەوەی چاکەی نـەکردووە کەواتـە نێچیری خۆمانـەو دەیبـەین بـۆ دۆزەخ! جا بەفەرمانی خودا، فریشتەیێ لەشێوەی ئادەمیزاد دا دەچێ بۆ لایان، هـەردوولا ئـەو فریشتەیە دەکەن بە حەکەمو فەرمان رەوا، حەکەمەکە دەفەرموێ: نێوانی هەردوو شوێنەکە بپێون، ولاتەکەی خۆیو ولاتەکەی کە بـۆی دەچـوو، جا لـە کام لایانـەوە نزیکتر بوو ئەوە هی ئەوەیانە،کە دەیپێون دەروانن لەو جێگەیەوە نزیکتر دەبێ کە بۆی دەچێ، ئیتر فریشتەی ڕەحمەت وەری دەگرن!(ش/تاج).

لە گێرانەوەیەکی صەحیحدا: بە بستێ لە دێ باشەکەیانەوە نـزیکتر بـوو، ئـیتر کرا بەخەڵکی ئەوێ. لـە گێرانەوەیـەکی صـەحیحی تـردا: خـودای گـەورە نیگـای بـۆ هەردوو لایان کرد: بەم گونـدەیانی فـەرموو: تـۆ تـۆزێ نزیـك بـەرەو وە فـەرمووی: ئینجا بەینی هەردوو گوندەکە بپێـون، روانیـان بـەلای گونـدە باشـەکەدا بـە بسـتێ نـزیکترە، ئـیتر خـوا لێـی خـۆش بـوو، لـە گێرانەوەیـەکی تـردا: سـنگی بـەلای دێ باشەکەدا کەوتبوو!

سەرگوزشتەیەی بۆ گێرایەوە، ئەویش پێی گوت: کوڕەکەم! ئەمڕۆ تۆ لەمن باشتریت، ئەوەتا گەیشتویتە ئەم پایەیە، وەتۆ تاقی دەکرێیتەوەو توشی دەردی سەری دەبی ئەگەر تووشی تاقیکردنەوە بووی، راستی لەمن مەڵێ.

کوڕەکە وای لێهات کوێری سِکماك و بەڵەکی چاك دەکردەوە، وە دەرمانی گشت دەردێکی تری مەردوومی دەدا، هاودەمێکی پاشا هەبوو کوێر بوو، ئەمە دەژنەوێ، بە دیارییەکی زۆرەوە دەچێ بۆ لای و دەڵێ: ئەم هەموو دیارییەم هێناوە بۆت ئەگەر چاکم بکەیتەوە هەمووی بۆ خۆت. ئەویش دەڵێ: من کەس چاك ناکەمەوە، بەس خودای مەزن چارەو شیفا دەدا، بەڵام ئەگەر موسوڵمان ببیت و باوەڕ بکەیت بەخودای گەورە ئەوا منیش بۆت دەپاڕێمەوەو خودایش چاکت دەکاتەوە.

هاونشینەکەش بڕوای هێناو خودایش چاکی کردەوەو وەك جاری جاران چوو لە کۆڕو مەجلیسی پاشادا دانیشت. پاشاش پێی گوت: کێ چاوتی چاك کردەوە؟ گوتی: خوداکەم. گوتی: بۆ تۆ، جگە لە من خوای کەشت هەیە؟ گوتی: خوای من و خوای تۆ هەر یەك کەسەو ئەویش یەزدانە، تۆیش عەبدو بەندەیەکی وەك من! پاشاش پیاوەکەی گرت و زۆر ئازارو ئەشکەنجەی دا تا راستی لە کوڕەکە دا.

کوڕەکەیان هێناو پاشاپێی گوت: ئەی کوڕم! چۆن جادووگەرێکت لێ دەرچووە! ئەوەتا کوێری سکماك و گول چاك دەکەیتەوە، وە واو وا دەکەی!!

کوڕەکەش گوتی: من کەس چاك ناکەمەوە، هەر خوای گەورە هەموو کەس چاك دەکاتەوە، ئیتر ئەویشی گرت و هەر ئازارو ئەشکەنجەی دا هەتا راستی راهیبەکەی درکاند! سۆفیلکەکەشیان هێنا، پێیان گوت: لە ئایینەکەت پەشیمان ببەرەوە، رازی نەبوو، جا مشاریان هێناو دەمی مشارەکەیان لەسەر تەوقی سەری داناو بە شەقە مشار لە تەپڵی سەریەوە دایان هێناو کردیان بە دوو لەتەوەو کەرتەکانی کەوتن بەم لاو لادا، ئینجا کوڕەکەیان هێناو پێیان گوت: لەئایینەکەت پەشیمان بەرەوە، ئەویش رازی نەبوو، جا دایە دەست چەند کەسێ و پێی گوتن: ببەن بۆ فیسارە کێو، کە چوونە سەر لوتکەی چیاکە ئەگەر پاشگەز نەبۆوە ئەوە لەوێوە بەری بدەنە خوارەوە، کە بردیان سەر کێوەکەیان خست، کوڕەکە گوتی: ئەی خودایە! ئەمانەم لە کۆڵ خە، چۆن خۆت بە چاکی دەزانی. ئیتر شاخەکە لەرزی و هەموویان کەوتنە خوارەوەو هەڵدێران و خۆشی بە بێوەی گەڕایەوە بۆلای پاشا، پاشا پێی گوت: هاوڕێکانت کوان، لەکوێن؟ گوتی: خودای گەورە لە کۆڵمی خستن! دیسان سپاردییەوە بەدەستی تاقمەیەکی تر لە دەست و پێوەندەکەی و گوتی: بە

پاپۆڕ ببیەن تا دەیگەیەننە ناوەڕاستی دەریا، ئەگەر پەشیمان بۆوە باشە، دەنا هەڵی بدەنە ناوەڕاستی دەریاکەوە. ئەوانیش بردیان و کوڕەکەش گوتی: ئەی خودایە! ئەمانەم لە کۆڵبخەو لەباتی من چاریان بکە، چۆن خۆت بەباشی دەزانیت! پاپۆڕەکەیان وەرگەڕاو دەمەو نووخون بووەوەو هەموو نوقم بوون و خۆی هاتەوە بۆ لای پاشاو پاشا پێی وتەوە: ئەی هاوڕێکانت کوان و چیان بەسەرهات؟ گوتی: خوای گەورە لە کۆڵمی کردنەوەو لەجیاتی من خۆی چارەی کردن. ئینجا بە پاشای گوت: تۆ بەم شێوەیە منت بۆ ناکوژرێ، تا ئەوەی من پێت دەڵێم نەیکەی.

گوتی: گشت خەڵکی شارەکە لە مەیدانێکا کۆبکەرەوەو من بە لقی دارخورمایەکا، هەڵواسەو تیرێ-لە تیردانەکەی خۆم- دای بنێ لە ناو کەوانەکەداو بڵێ: بە ناوی خودای ئەم کوڕە، لەپاشا تیرەکەم تێ بگرە، ئەگەر وابکەی دەم کوژیت! پاشاش کوڕەکە چۆنی گوت ئاوای کرد، کە پاشا تیرەکەی گرتە کوڕەکە دای لە بناگوێی و کوڕەکە دەستی نایە سەر لاجانگی و مرد.

خەڵکەکەش گوتیان: بڕوامان هێنا بەخودای ئەم کوڕە! چوون بۆ لای پاشاو پێیان گوت: ئەوەی تۆ لێی دەترسای بە خوا وا روویدا، ئەوا خەڵکەکە ئیمانیان هێنا. پاشاش فەرمانی دەرکردو لەسەری کۆڵانەکان چاڵ و خەندەکیان هەڵکەندو ئاگریان تیا کردەوە. پاشا گوتی: ئەوەی لە دینەکەی پەشیمان نەبێتەوە بیخەنە ئەم چاڵە ئاگرانەوە! ئەوانیش وایانکرد، هەر خەڵکیان هەڵدەدایە ناو ئاگرەکەوە، تا سەرە هاتە سەر ئافرەتێ، کوڕێکی ساوای پێ بوو، ژنەکە ڕاماو داماو ترساو ڕاوەستا، منداڵەکەی پێی گوت: دایەگیان! ددان بەخۆتا بگرە، تۆ لەسەر هەقی، ئیتر لەچی دەترسیت؟ یا بۆ سڵ لە گرتنی ڕێگەی هەق دەکەی!! (م).

٧/٣١–[٧] وَعَنْ أَنَسٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: مَرَّ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم بِامْرَأَةٍ تَبْكِي عِنْدَ قَبْرٍ فَقَال: «اتَّقِي الله وَاصْبِرِي» فَقَالَتْ: إِلَيْكَ عَنِّي، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَبْ بمُصِيبتي، وَلَمْ تعْرِفْهُ، فقِيلَ لَها: إِنَّه النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، فَأَتتْ بَابَ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، فلَمْ تَجِد عِنْدَهُ بَوَّابينَ، فقالتْ: لَمْ أَعْرِفْك، فقالَ: «إِنَّما الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الأولَى» متفقٌ عليه. وفي رواية لمُسْلمٍ: «تَبْكِي عَلَى صَبِيّ لَهَا».

ئەنەس (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئافرەتی لەسەر گۆڕی منداڵێکی خۆی دەگریا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەلایەوە رەت بوو پێی فەرموو: لە خودا بترسەو ددان بە

٧ بوخاری (١٢٨٣)، موسلیم(٩٢٦).

خۆتـدا بگـرەو لەبـەر بـاری خـودادا ئـارام بگـرە، ژنەكـەیش نەیناسـی كـە ئـەوە پێغەمبەرە، لەبەر ئەوە گوتی: دەبڕۆ بەو لاوە! تۆ ئاگات لەدەردی من نییە، لە پاشا پێیان گوت: كە ئەوە پێغەمبەر بوو (درودی خودای لەسەر بێ) كچێ! تۆ بۆ وات گوت! ژنەكـەش چـوو بـۆ مـاڵی پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) روانـی دەركـەوانی لێ نییـە، گـوتی: ئـەی پێغەمبەری خوا! لێم مەگرە، كەئـەو قسـە زەقورەقـەم لـەرووی تـۆدا كـرد، چونكە نەم ناسیت، فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): ئـەو صـەبرو ئـارامو خۆراگرتنـەی كـە خـودا پێی خۆشە دەشێ لەسەرەتای خورپە لێ كەوتنەوە بێ! (ش/تاج).

٣٢/٨-[٨]- وَعَنْ أَبي هَرَيرَةَ رَضي اللّٰه عنه أَنَّ رَسُولَ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم قـالَ: (يَقولُ اللّٰهُ تَعَالَى: مَا لِعَبْدِي المُؤْمِنِ عِنْدِي جَزَاءٌ إِذَا قَبضْـتُ صَـفِيَّهُ مِـنْ أَهْـلِ الـدُّنْيَا ثُـمَّ احْتَسَبهُ إِلاَّ الجَنَّة) رواه البخاري.

ئەبو هـورەیرە (رەزای خودای لەسەر بێ) لـە حـەزرەتـەوە دەفـەرموێ (درودی خودای لەسەر بێ) خـودای گـەورە دەفـەرموێ: كاتـێ لەبەنـدەی موسـوڵمانی خـۆم، خۆشەویسـتەكەیی لێ دەسەنمەوە، كە خۆشەویستی دنیایەتی، وە ئارامو سەبری لەسەر دەگرێو ناشكوری ناكـاو دەیكـا بـە توێشووی قیامـەتی، ئـەوە لـە پاداشـی ئـەوەدا بەهەشـتی دەدەمـێ (بوخاری).

٣٣/٩-[٩]- وعَنْ عائشَةَ رضي اللّٰهُ عنها أَنهَا سَأَلَتْ رسولَ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم عَن الطَّاعون، فَأَخبَرَهَا أَنَهُ كَانَ عَذَاباً يَبْعَثُهُ اللّٰه تعالى عَلَى منْ يَشَـاءُ، فَجعَلَـهُ اللّٰـهُ تعـالَى رحْمةً للْمُؤْمنِينَ، فَلَيْسَ مِنْ عَبْدٍ يَقعُ فِي الطَّاعُون فَيمْكُثُ في بلَدِهِ صَابِراً مُحْتَسِباً يَعْلَمُ أَنَّـهُ لاَ يُصِيبُهُ إِلاَّ مَا كَتَبَ اللّٰهُ لَهُ إِلاَّ كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِ الشَّهِيدِ) رواه البخاري.

عائیشە (رەزای خودای لەسەر بێ) گـوتی: باسـی پـەتای تـاعونم لـە حـەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) پرسی، فەرمووی پێم: ئەوە سزایەكە خودای گـەورە دەینێـرێ بـۆ سـەرئەوانەی كـە خـۆی ئـارەزوی بكـا، بـەلام بـۆ موسـوڵمانان دەیكـا بـە مایـەی رەحمـەت، جـا هـەر بەندەیێ پەتای تاعوون لە شارەكەیدا دەركەوت، وەلێ ددانی بەخۆیدا گـرتو لەبـەر باری خودادا ئارامی گرت، وە پاداشی باشی خـۆی لەسـەر ئـەوەی كـە دێتـە رێی لـە خودا داوا بكا، وەبڕوای وابێ هەرچی خودا لەچارەی نەنووسیبێ نایەتە رێی، ئەوە ئەو بەندەیە خودا بەقەد شەهیدێ پاداشتی بۆ دادەنێ (بوخاری).

---

٨ بوخاری(٦٤٢٤).

٩ بوخاری(٥٧٣٤).

٣٤/١٠-[١٠]- وعَنْ أَنسٍ رضي اللّه عنه قال: سَمِعْتُ رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم يقولُ: (إنَّ اللّه عَزَّ وجَلَّ قَالَ: إِذَا ابْتَلَيْتُ عَبدِي بحبيبتَيْهِ فَصبرَ عَوَّضْتُهُ مِنْهُمَا الْجنَّةَ) يُريدُ عينيْه، رواه البخاريُّ.

ئەنەس (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: بەگوێی خۆم لە زاری پیرۆزی حەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): خودای گەورەو خاوەن شکۆ دەفەرموێ: کاتێ بەندەی خۆم تاقی دەکەمەوەو هەردوو چاوە نازدارەکانی لێ دەسەنمەوەو ئەویش وەك مەردانی خودا لەبەر باری مندا ئۆقرە دەگرێو بە بەشی من ڕازی دەبێ، منیش تۆڵەی ئەوەی بۆ دەکەمەوەو لەباتی چاوەکانی بەهەشتی پێ دەدەم. (ب).

٣٥/١١-[١١]- وعنْ عطاءِ بْن أَبِي رَباحٍ قالَ: قالَ لِي ابْنُ عبَّاسٍ رضي اللّهُ عنهُمَا ألا أريكَ امْرَأَةً مِن أَهْلِ الجَنَّة ؟ فَقُلت: بلَى، قَالَ: هذهِ الْمرأَةُ السوْداءُ أَتَتِ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم فقالَتْ: إنّي أُصْرَعُ، وإنّي أَتكَشَّفُ، فَادْعُ اللّه تعالى لِي قَالَ: (إن شئْتِ صَبرْتِ ولكِ الْجنَّةُ، وإنْ شِئْتِ دعَوْتُ اللّه تعالَى أَنْ يُعافِيَكِ) فقَالتْ: أَصْبِرُ، فَقالت: إنّي أَتكشَّفُ، فَادْعُ اللّه أَنْ لا أَتكشَّفَ، فَدَعَا لَهَا. متَّفقٌ عليْهِ.

عەطای کوری ڕەباح (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئیبنوعەباس (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) پێی فەرمووم: با ئافرەتێکی بەهەشتیت نیشان بدەم! گوتم: ئادەی بفەرموو: فەرموی: ئەم ئافرەتە ڕەشە کاتی خۆی هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێی گوت: قوربان! فێم لێ دێو جەستەم دەردەکەوێ لە خوای گەورە بۆم بپاڕێرەوە کە چاکم بکاتەوە.

فەرمووی: ئەگەر حەز دەکەی ئارام بگرەو بەهەشت جێگەت بێ، ئەگەر حەزیش دەکەی لە خودای گەورە بۆت دەپاڕێمەوە کە چاکت بکاتەوە؟ ئەویش گوتی: باشە ئارام دەگرم، بەلام لەخودا بۆم بپاڕێرەوە کەلەشم دەرنەکەوێ، حەزرەتیش بۆی پاڕایەوە کە ئیتر لەکاتی لێهاتنی خووەکەدا جەستەی دەرنەکەوێ(ش).

٣٦/١٢-[١٢]- وعنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمنِ عَبْدِ اللّه بنِ مسْعُودٍ رضيَ اللّه عنه قَال: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلى رسولِ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم يَحْكِي نَبيّاً منَ الأَنْبِياءِ، صلواتُ اللّهِ وسَلاَمُهُ علَيْهم،

---

١٠ بوخاری (٥٦٥٣).

١١ بوخاری (٥٦٥٢)، موسلیم(٢٥٧٦).

١٢ بوخاری (٣٤٧٧)، موسلیم(١٧٩٢).

ضَرَبُهُ قَوْمُهُ فَأَدْمَـوْهُ وهُو يَمْسحُ الدَّم عنْ وجْهِهِ، يقُـولُ: (اللَّهـمَّ اغْفِـرْ لِقَـوْمي فـإِنَّهُمْ لا يعْلمُونَ) متفقٌ عَلَيْه.

ئیبن‌و مەسعود (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: هەر لەبەرچاومە کە چۆن پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لاسکایی حاڵی پێغەمبەرێکی دەکردەوە-درودی خوا لەسەر هەموو پێغەمبەران بێ- کە گەلەکەی لێیان دابوو، دەم‌و چاویان خوێناوی کردبوو، حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) بەپەنجەی خۆی روخساری خۆی دەسڕی‌و تەمسیلی ئەو پێغەمبەرەی دەکرد، کەلەپاش دەسدرێژی هۆزەکە خوێنەکەی لەرووی خۆی دەسڕی، کەچی لەباتی ئەوەی نزای خراپیان لێ بکا، بۆیان دەپاڕایەوەو دەیفەرموو: (اللهم اغفر لقومي فأنهم لايعلمون) خودایە! لێیان مەگرە، نەزانی خۆیانە کە ئەمە حاڵی منە بەدەستیانەوە! (ش).

١٣/٣٧-[١٣]- وَعنْ أَبي سَعيدٍ وأَبي هُرَيْرة رضي اللَّه عَنْهُمَا عـن النبـي صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قَالَ: «مَا يُصِيبُ الْمُسْلِمَ مِنْ نَصَبٍ وَلاَ وَصَبٍ وَلاَ هَمّ وَلاَ حَزَن وَلاَ أَذًى وَلاَ غمّ، حتَّى الشَّوْكَةُ يُشَاكُها إِلاَّ كفَّر اللَّه بهَا مِنْ خطَايَاه) متفقٌ عليه.

ئەبو سەعیدو ئەبو هورەیرە (رەزای خودایان لەسەر بێ) فەرموویان: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرچی توشی موسوڵمان دەبێ- لە دڕکێکەوە بیگرە تا زیاتر، وەکو ماندووی‌و شەکەتی‌و نەخۆشی‌و دەردو خەم‌و خەفەت‌و پەژارەو ئێش‌و ئازارو تێ هەڵچەقینی دڕك- ئەمانە هەمووی دەبێ بە مایەی سڕینەوەی تاوانەکانی‌و بەهۆی هەڵوەرینی گوناهەکانی‌و هەروەها دەیکا بەمایەی سەربەرزی‌و پایە بەرزی بۆی.(ش/تاج).

١٤/٣٨- [١٤]- وعن ابْن مسْعُود رضي اللَّه عنه قَالَ: دَخلْتُ عَلى النبـي صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم وَهُو يُوعَكُ فَقُلْتُ يا رسُولَ اللَّه إِنَّكَ تُوعكُ وَعْكاً شَـدِيداً قـال: (أَجَـلْ إِنِّـي أُوعَكُ كَمَا يُوعَكُ رَجُلان مِنْكُم» قُلْتُ: ذلكَ أَنَّ لَكَ أَجْريْن ؟ قال: (أَجَلْ ذَلـك كَـذَلك مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصِيبُهُ أَذًى، شوْكَةٌ فَمَا فوْقَهَا إِلاَّ كَفَّر اللَّه بهَا سيئاته، وَحطَّـتْ عنْـهُ ذُنُوبُـهُ كَمَا تَحُطُّ الشَّجرةُ وَرقَهَا) متفقٌ عليه.

---

١٣ بوخاری (٥٦٤١)، موسلیم(٢٥٧٣).

١٤ بوخاری (٥٦٤٧)، موسلیم (٢٥٧١).

ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: چووم بۆ لای پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) نەخۆش بوو، گوتم: قوربان! تایەکی گران دایگرتووی، فەرمووی: بەڵێ وایە من کە تا دام دەگرێ بەقەد دوو پیاو لە ئێوە بە قورسی دام دەگرێ، عەرزیم کرد: دیارە ئەوە لەبەر ئەوەیە کە پاداشتی تۆ دوو قاتە؟ فەرمووی: بەڵێ چۆنی دەڵێی ئەمەوایە. هەر موسوڵمانێ ئیشێ ئازارێ بێتە ڕێی —لە دڕکێکەوە بیگرە تا زیاتر- خودا دەیکا بە مایەی داپۆشینی خراپەکانیو گوناهەکانی پێی هەڵدەوەرێ وەك چۆن پایزان گەڵای دارو درەخت هەڵدەوەرێ ئاوا (ش).

١٥/٣٩- [١٥]- وعنْ أَبي هُرَيرة رضيَ اللَّهُ عنه قال: قال رسولُ اللَّهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْراً يُصِبْ مِنْهُ): رواه البخاري.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (درووودی خودای لەسەر بێ): خودا ئەگەر خواستی باشی بە کەسێ هەبێ تووشی ناڕەحەتیو ئەرکو ئازاری دەکا(ب).

١٦/٤٠- [١٦]- وعَنْ أَنَسٍ رضي اللَّهُ عنه قال: قال رسولُ اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (لا يتَمنينَّ أَحدُكُمُ الْمَوْتَ لِضُرِّ أَصَابَهُ، فَإِنْ كَانَ لا بُدَّ فاعلاً فليقُل: اللَّهُمَّ أَحْيِني ما كَانَت الْحياةُ خَيراً لِي وتوفَّني إِذَا كَانَتِ الْوفَاةُ خَيْراً لِي) متفق عليه.

ئەنەس (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لە حەزرەتەوە (درووودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەگەر یەکێکتان دوچاری زیانێ بوو با مەرگ بەئاوات نەخوازێ، ئەگەر هەر زۆری بۆ هاتو چاری نەبوو مەرگی خۆی بە ئاوات خواست با بڵێ: ئەی خودایە! هەتا ژیانم باشترە بۆم بمژیێنە، کەییش مردنم باشتر بوو بۆم ئەوا ئەو کاتە بم مرێنە!(ش).

١٧/٤١- [١٧]- وعنْ أبي عبدِ اللَّهِ خَبَّابِ بْنِ الأَرتِّ رضيَ اللَّهُ عنه قال: شَكَوْنَا إِلَى رسولِ اللَّهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم وَهُو مُتَوسِّدٌ بُردةً لَهُ في ظلِّ الْكَعْبةِ، فَقُلْنَا: أَلا تَسْتَنْصِرُ لَنَا أَلاَ تَدْعُو لَنَا ؟ فَقَالَ: قَد كَانَ مَنْ قَبْلكُمْ يؤْخَذُ الرَّجُلُ فيُحْفَرُ لَهُ في الأَرْضِ فيجْعلُ فِيهَا، ثمَّ يُؤْتِى بالْمِنْشارِ فَيُوضَعُ علَى رَأْسِهِ فيُجعلُ نصْفَيْن، ويُمْشطُ بِأَمْشاطِ الْحديدِ مَا دُونَ لَحْمِهِ وَعظْمِهِ، ما يَصُدُّهُ ذلكَ عَنْ دِينِهِ، واللَّه ليتِمنَّ اللَّهُ هَذا الأَمْرَ حتَّى يسِير الرَّاكِبُ مِنْ صنْعاءَ إِلَى حَضْرمْوتَ لا يخافُ إِلاَّ اللهَ والذِّئبَ عَلَى غنَمِهِ، ولكِنَّكُمْ تَسْتَعْجِلُونَ) رواه البخاري. وفي رواية: (وهُوَ مُتَوسِّدٌ بُرْدةً وقَدْ لقِينا مِنَ الْمُشْرِكِين شِدَّةً).

---

١٥ بوخاری (٥٦٤٥).

١٦ بوخاری (٥٦٧١)، موسلیم(٢٦٨٠)

١٧ بوخاری (٣٦١٢).

**خەببابی کوری ئەرەت** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **جارێ لە سێبەری کەعبەدا راکشابوو، عەباکەی خۆی لەباتی سەرین خستبووە ژێر سەری، ئێمەیش سکالآمان لە خزمەتیا کردو عەرزیمان کرد، ئەرێ بۆ داوای کۆمەکیوسەرکەوتنمان لە خودا بۆناکەی، بۆ بۆمان ناپارێیتەوە؟ خۆ ئێمە وا لەتاو بت پەرستو هاوبەش پەیدا کەرەکان تەواو زۆرمان بۆهاتووە! فەرمووی: شت بەپەلە نابێ، صەبر کلیلی سەرکەوتنە، ئێوە لەچاو پێشینانا چیتان بەسەر هاتووە، وابووە لە پێشینانی ئێوە پیاوی موسوڵمانیان دەگرتو دەیان هێناو بەبەر چاوی خۆیەوە چاڵیان لە زەویدا بۆ هەڵدەکەندو بەزیندووی تێیان دەخستو ئینجا مشاریان دەهێناو لەسەر تەوقی سەری دایان دەناو بەرەبەرە بەشەقە مشار دایان دەهێنا وەك پارچە تەختە! هەبوو بە شانەی ئاسنین وەکو موو شانە بکرێ ئاوا لەشانەیان دەداو گۆشتو رەگو ئێسکیان بەڕنەی ئاسن ئەنجن ئەنجن دەکرد، بەلام چونکە باوەڕیان بەسەرکەوتنی خۆیان هەبوو، وەلەگەڵ خودای خۆیانا راست بوون بەمانەیش کۆڵیان نەدەداو وازیان لە ئایینەکەی خۆیان نەدەهێنا، بەخوا من لێم روونو ئاشکرایە کە خودا ئەم ئایینی ئیسلامە بەئەنجام دەگەیەنێو سەری دەخا، تەنانەت لەژێر سێبەری ئاڵای ئیسلامدا ئەمنو ئاسایش وا پەرە دەستێنێو حوکمی ئیسلام وا رەگو ریشە دادەکوتێ دنیا وا ئاسوودەو ئەمین دەبێتەوە هەموو کەس لە سەرو ماڵو نامووسی خۆی ئەمین دەبێو سوار بەتەنها لە صەنعاوە دەروات بۆ حەضرەمەوت، لە ڕێگەو لەهەموو لایێ وا بێ ترس دەبێ لەخودا نەبێ لەکەسی تر ناترسێ، مەگەر ترسی گورگی هەبێ کە بنێتە رانەکەی وەلێ ئێوە لە ئیشەکە بەپەلەن! (ب/تاج).**

١٨/٤٢-[١٨]- وعن ابن مَسعُودٍ رضي اللّه عنه قال: لَمّا كَانَ يَوْمُ حُنَيْنٍ آثَر رسولَ اللّه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم نَاساً في الْقِسْمَةِ: فَأَعْطَى الأَقْرعَ بْنَ حابِسٍ مائةً مِنَ الإبِلِ وأَعْطَى عُيَيْنَةَ بْنَ حِصْنٍ مِثْلَ ذلِكَ، وأَعطى نَاساً منْ أشرافِ الْعربِ وآثَرهُمْ يوْمئِذٍ في الْقِسْمَةِ. فَقَالَ رجُلٌ: واللّهِ إنَّ هَذِهِ قِسْمةٌ ما عُدِلَ فِيها، وما أُريد فِيهَا وَجهُ اللّه، فَقُلْتُ: واللّه لأُخْبِرَنَّ رَسُولَ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، فأتيتُهُ فَأخبرته بِما قال، فتغَيَّر وَجْهُهُ حتَّى كَانَ

---

**١٨ بوخاری(٣٦١٢).**

كَالصِّرْفِ. ثُمَّ قال: (فَمنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ يعدِلِ اللّٰهُ ورسُولُهُ ؟ ثم قال: يرحَمُ اللّٰهُ موسى قَدْ أُوْذِيَ بِأَكْثَرَ مِنْ هَذَا فَصبرَ) فَقُلْتُ: لا جرمَ لا أَرْفعُ إلَيه بعْدها حدِيثاً. متفقٌ عليه.

ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لە ڕۆژی غەزای حونەینا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە بەشدانا بەشی چەند کەسێکی پتر دا، سەد وشتری بەبەش دا بە ئەقرەعی کوری حابیس، ئەوەندەشی دا بە عویەینەی کوری حیصن، هەروەها بەشی گەورە گەورەی بەچەند پیاوێکی تر لە خانەدانەکانی عەرەب دا، وە ئەو ڕۆژە لە بەشدانا ئەوانەی جیاکردەوە. کابرایەکیش گوتی: بەخودا ئەم دابەشکردنە لەسەر ئەم شێوەیە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کردی، عەدالەتی تیا نییەو مەبەست لێی ڕەزای خودا نییە، منیش گوتم: بەخودا دەبێ بە پێغەمبەر بڵێم، جا کە ئەمەم عەرزی کرد ڕەنگو ڕووی‌وەك سورخ- سوور هەلگەڕاو گۆڕا، جا فەرمووی: ئەی کێ‌ی تر عادل دەبێ ئەگەر خوداو پێغەمبەری خودا عادل نەبن؟ لە پاشا فەرمووی: ڕەحمەتی خودا لە موسای کوری عیمران، ئەو پێغەمبەرە گەورەو نازدارە گەلێ لە ئێستای من زیاتر ئازار دراو ئێشیان گەیاند بەدڵی، بەڵام بێ حەوصەلەیی نیشان نەداو ددانی بەخۆیدا گرت لەسەر بێ وێڵی گەلەکەی، کەواتە منیش وەك ئەو دەشێ صەبر لەسەر ئازاریان بگرم، منیش گوتم: وای لێ هات ببڕای ببڕای من جارێکی تر قسەی ئەم‌و ئەو ببەمەوە بۆ حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) (ش).

١٩/٤٣-[١٩]- وعن أنس رضي اللّٰه عنه قال: قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (إِذَا أَرَادَ اللّٰهُ بعبْدِهِ خَيْراً عجَّلَ لَهُ الْعُقُوبةَ فِي الدُّنْيَا، وإِذَا أَرَادَ اللّٰه بِعبدِهِ الشَّرَّ أمسَكَ عنْهُ بذَنْبِهِ حتَّى يُوافِيَ بهِ يَومَ الْقِيامةِ). وقَالَ النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (إِنَّ عِظَمَ الْجزاءِ مَعَ عِظَمِ الْبلاءِ، وإِنَّ اللّٰه تعالى إِذَا أَحَبَّ قَوماً ابتلاهُمْ، فَمنْ رضِيَ فَلَهُ الرضَا، ومَنْ سَخِطَ فَلَهُ السُّخْطُ) رواه الترمذي وقَالَ: حديثٌ حسنٌ.

ئەنەس (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ کە خودا ئارەزوی خێری بەبەندەی خۆی هەبێ، زوو بە زوو لە جیهاندا تۆڵەی لێ دەستێنێ، وەکاتێ کەخودا خواستی شەڕی بەبەندەی خۆی هەبێ بەری بۆ بەرەڵڵا دەکاو وازی لێ دێنێ‌و تا ملی پێوە دەنێ‌و لەسەر تاوانکاری خۆی دەڕوا، تا بە کۆڵێ

١٩ تیرمذی (٢٣٩٨).

**گوناهو تاوانەوە دەچێتەوە بەر دەستی خودا، ئیتر خودا لە قیامەتا تۆڵەی تەواوی لێ دەستێنێ.هەروەها حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەندەی باش پاداشی هەرەگەورەی خۆی لەسەر تووش بوونی بەڵاو مەینەتی گەورەگەورە وەردەگرێ، بەڵێ مەینەتو بەڵای پیاوی موسوڵمان هەتا گەورەتر بێ پاداشەکەشی گەورەتر دەبێ، سەرەڕای ئەمەش خودای گەورە ئەگەر هۆزێکی خۆش بوێ ئەوا لە جیهاندا بەدەردو بەڵاو مەینەت تاقییان دەکاتەوە، جا ئەوەی بەبەشی خودا رازی دەبێ، وەئەوەی لەبەشی خودای گەورە لالووتو نارازی بێ خودایش لەو نارازی دەبێ (ت).**

٢٠/٤٤– [٢٠]– وعنْ أَنَسٍ رضي اللّٰه عنه قال: كَانَ ابْنٌ لأبي طلْحةَ رضي اللّٰه عنه يَشْتَكي، فخرج أبُو طَلْحة، فَقُبِضَ الصبيُّ، فَلَمَّا رَجعَ أَبُو طَلْحةَ قال: ما فَعَلَ ابني ؟ قَالَت أُمُّ سُلَيْم وَهِيَ أُمُّ الصَّبِيِّ: هو أَسْكَنُ مَا كَانَ، فَقرَّبَتْ إِلَيْهِ الْعَشاءَ فَتعَشَّى، ثُمَّ أَصَابَ مِنْهَا، فَلَمَّا فرغَ قَالَتْ: وارُوا الصَّبِيَّ، فَلَمَّا أَصْبحَ أَبو طَلْحَةَ أَتى رسولَ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم فَأَخْبرهُ، فَقَالَ: (أَعرَّسْتُمُ اللَّيْلَةَ ؟ قَالَ: نَعَمْ، قال: (اللَّهمَّ بارِكْ لَهُما) فَولَدتْ غُلاماً فقَالَ لِي أَبُو طَلْحَةَ: احْمِلْهُ حتَّى تَأْتِيَ بِهِ النبـي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، وبَعثَ مَعهُ بِتمْرَاتٍ، فقال: «(أمعهُ شيْءٌ ؟) قال: نعمْ، تَمراتٌ فَأَخذَهَا النبـي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم فمضَغهَا، ثُمَّ أَخذَهَا مِنْ فِيهِ فَجعَلَهَا في فِي الصَّبِيِّ ثُمَّ حَنَّكَه وسَمَّاهُ عبدَ اللّٰهِ متفقٌ عليه.

وفي روايةٍ للْبُخَاريِّ: قال ابنُ عُيَيْنَة: فَقَالَ رجُلٌ منَ الأَنْصارِ: فَرأَيْتُ تَسعة أَوْلادٍ كلُّهُمْ قدْ قَرؤُوا الْقُرْآنَ، يعْنِي مِنْ أَوْلادِ عَبْدِ اللّٰه الْموْلُود.

وفي روايةٍ لمسلِم: ماتَ ابْنٌ لأبِي طَلْحَةَ مِنْ أُمِّ سُلَيْمٍ، فَقَالَتْ لأهْلِهَا: لا تُحَدِّثُوا أَبَا طَلْحَةَ بابنِهِ حتَّى أَكُونَ أَنَا أُحدِّثُهُ، فَجاءَ فقرَّبَتْ إِلَيْهِ عَشَاءً فَأَكلَ وشَرِبَ، ثُمَّ تصنَّعتْ لَهُ أَحْسنَ ما كانتْ تَصنَّعُ قَبْلَ ذلكَ، فوقَعَ بِهَا، فَلَمَّا أَنْ رأَتْ أَنَّهُ قدْ شَبِع وأَصَابَ مِنْها قَالتْ: يا أَبَا طلْحةَ، أَرَأيْتَ لَوْ أَنَّ قَوْماً أَعارُوا عارِيتهُمْ أَهْل بيْتٍ فطَلبوا عارِيَتَهُم، أَلَهُمْ أَنْ يمْنَعُوهَا؟ قَالَ: لا، فَقَالَتْ: فاحتسِبْ ابْنَكَ. قَالَ: فغَضِبَ، ثُمَّ قَالَ: تركتِنِي حتَّى إِذَا تَلطَّخْتُ ثُمَّ أَخْبرتِنِي بِابْنِي، فَانْطَلَقَ حتَّى أَتَى رسولَ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم فأخْبَرهُ بمَا كَانَ، فَقَالَ رسولُ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (بَارَكَ اللّٰه لكُما في لَيْلتِكُما). قال: فحملَتْ، قال: وكَانَ رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم في سفَرٍ وهِي مَعَهُ وكَانَ رسولُ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ

٢٠ بوخاری (٦١١٤)، موسلیم(٢٦٠٩).

عَلَيْهِ وسَلَّم إِذَا أَتَى الْمَدِينَةِ مِنْ سَفَرِ لاَ يَطْرُقُها طُرُوقاً فَدنَوْا مِنَ الْمَدِينَةِ، فَضَرَبَهَا الْمَخاضُ، فَاحْتَبَس عَلَيْهَا أَبُو طَلْحَةَ، وانْطلَقَ رسولُ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم. قَالَ: يقُولُ أَبُو طَلْحةَ إِنَّكَ لتعلمُ يَا ربِّ أَنَّهُ يعْجبُنِي أَنْ أَخْرُجَ معَ رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم إِذَا خَرَجَ، وأَدْخُلَ مَعهُ إِذَا دَخَلَ، وقَدِ احْتَبَسْتُ بِما تَرى. تقولُ أُمُّ سُلَيْم: يا أَبَا طَلْحةَ مَا أَجِد الَّذي كنْتُ أَجِدُ، انْطَلِقْ، فانْطَلَقْنَا، وضَربهَا الْمَخاضُ حينَ قَدِمَا فَولَدتْ غُلاماً. فقالَتْ لِي أُمِّي: يا أَنَسُ لا يُرْضِعُهُ أَحدٌ تَغْدُوَ بِهِ عَلَى رسُول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، فلمَّا أَصْبحَ احتملْتُهُ فانطَلقْتُ بِهِ إِلَى رسولِ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم. وذَكَرَ تمَامَ الْحَدِيثِ.

**ئەنەس** (رەزای خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: کوڕێکی منالّی ئەبو طەلحە، نەخۆش دەبێ، کە ئەبو طەلحە لەماڵ دەردەچێ کوڕەکە دەمرێ، کە دێتەوە، دەڵێ: کوڕەکەم چۆنە؟ ئوممو سولەیمیش، کە هەم دایکی منو هەم دایکی منالّە مردووەکە بوو، دەڵێ: لە گشت کاتێ خامۆشترە، زۆر بێ دەنگە، ئینجا شێوی بۆ دەهێنێو شێو دەکا، ئینجا لە گەڵیشی دروست دەبێ، کە لێ دەبێتەوە ژنەکەی دەڵێ: دە ئینجا منالّەکە بسپێرن بەخاكو بڕۆن بینێژن! بۆ بەیانییەکەی ئەبو طەلحە دەچێتە خزمەتی حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **و ئەم باسەی عەرز دەکا. دەفەرموێ: ئایا ئەمشەو دروست بوون پێکەوە؟ دەڵێ: بەڵێ، فەرمووی: خودایە! لێیان پیرۆز بکە، دوایی ئوممو سەلیم کوڕێکی بوو، ئەبو طەلحە، کە باوە پیارەم بوو، پێی فەرمووم: براکەت هەڵبگرەو بیبە بۆ خزمەتی پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **وەچەند دەنکێ خورماشی لەگەڵما نارد، حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: هیچت هێناوە لەگەڵێ؟ گوتم: بەڵێ، چەند قلێ خورمام هێناوە، حەزرەت خورماکەی وەرگرتو جوویی‌و دوایی لەدەمی خۆی دەری هێناو نایەناو دەمی منالّەکەوەو مەلاشوی پێ هەنوو، وەناوی نا عەبدوللا (ش).**

**لە گێڕانەوەیەکی بوخاری دا: ئیبنو عەینە گوتی: پیاوێکی ئەنصاری دەیگوت: بەچاوی خۆم منالّی ئەم عەبدوللایەم دیوە، وەهەر نۆیان قورئان خوێن بوون، لە گێڕانەوەیەکی موسلیمدا: طەلحە کەلە ئوممو سولەیمی دایکم بوو دەمرێ، دایکم بەکەس‌و کارەکەی دەڵێ: کەستان باسی مردنی کوڕەکە مەکەن بۆ باوکی هەتا خۆم پێی دەڵێم: جا کە ئەبو طەلحە دێتەوە دایکم شێوی بۆ دێنێ، ئەویش بە ئاسوودەیی نان‌و ئاوەکەی دەخوا، ئینجا ژنەکەی خۆی دەڕازێنێتەوە بۆی، زۆر**

بەجوانی وەك جاری جاران، وەك بڵێی هیچ رووی نەدابێ، جا پێکەوە درووست دەبن، ژنەکەی کە تەماشا دەکا هەم تێری خواردووەو هەم ئیشی شەرعی کرد پێی دەڵێ: ئەی ئەبو طەلحە! پێم بڵێ: ئەگەر کۆمەڵێ ئەمانەتو سپاردەیماڵێکیان لەلابێو ماڵەکە داوای سپاردەکەی خۆیان بکەنەوە، ئایا ئەو کۆمەڵە مافی ئەوەیان هەیە کە ئەو ئەمانەتەیان نەدەنەوە!! گوتی نەء، گوتی: دە داوای پاداش لە خودا بکە لەسەر مردنی کوڕەکەت. گوتی: ئەبو طەلحە تووڕەبوو، وە گوتی: چۆن پەندێکت پێدام لەکۆڵم نەبوویتەوە هەتا چەپەڵ بوومو لەشم پیس بوو، ئەوجا مەرگی کوڕەکەمم پێ دەڵێیت، دوایی ڕۆی بۆلای پێغەمبەرو چی رویدابوو هەمووی بۆ دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ: خودا ئەم شەوەتان بۆ پیرۆز بکا. گوتی: هەر ئەو شەوە بەفەرمانی خودا ئومموسولەیم سکی پڕ بوو، مندالْ دەکەوێتە سکی، تا جارێ حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەچێ بۆ سەفەرێ، ئوممسولەیمو ئەبو طەلحەی مێردیشی لەگەڵیا دەڕۆن بۆ ئەو سەفەرە، دەستووری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وابوو کە لەسەفەر دەگەڕایەوە بۆ شاری مەدینە بەشەو لەناکاودا نەیدەکرد بەناو خاوو خێزاندا، کە لەمەدینە نزیك دەبنەوە ئوممسوولەیم ژان دەیگرێ، ئەبو طەلحەیش دەڵێ: ئەی خودایە! خۆت دەزانیت، هەمیشە حەزدەکەم کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەربچێ منیش لەگەڵیا دەربچمو کە بگەڕێتەوە لەگەڵیا بگەڕێمەوەو لێی دوانەکەوم، وەڵێ وەك دەبینیت ئەوا من بەم ئیشەوە پلکاومو بەدەست ئەم ژنەی خۆمەوە گیرم خواردووە! ئوممسولەیم دەڵێ: ئەی ئەبو طەلحە! ئەو ژانەی کە بووم نەم ماوە، بڕۆ با لەگەڵ حەزرەتا بڕۆینەوە، ئیتر هەمووومان ملی ڕێمان گرتو کەوتینە ڕێ، کەلەگەڵ گەیشتینە بەرەوە دیسان ژان گرتیەوەو کوڕێکی بوو. دایکم پێی فەرمووم: ئەی ئەنەس نابێ کەس گۆشی بکاو مەمکی بداتێ، تا بەیانییەکەی خۆت بەدەستی خۆت هەڵی دەگریتو دەیبەیت بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ). بەیانی هەڵم گرتو بردم بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ)، لە تاجولئوصولدا لە بوخاری موسلیمو ئەبو داودەوە ریوایەت دەکا-(ڕەزای خودایان لەسەر بێ)- دەفەرموێ: ئەنەس (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو طەلحە لەدایك بوو هەڵم گرتو بردم بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کەچووم پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) عابایەکی لەبەردا بوو، خەریك بوو تیژاوی قەترانی دەدا لە وشترێکی خۆی،

فەرمووی: خورمات هێناوە؟ گوتم بەڵێ، چەند دەنکێ خورمام پێ بوو دامن پێ ی، ئەویش هەڵی دانە ناو دەمی خۆیەوەو جوینیو ئینجا دەمی منداڵەکەی داچەقاندو ماجوومی خورماکەی تقاندە ناو دەمی، منداڵەکەیش یەکسەر دەستی کرد بە مڵچاندنیو زمانی بۆ دەگێڕا!! پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خورما خۆشەویستی یاریدەدەرانە: خورما یاری یاریدەدەرانە بۆیە هەر لە ئێستەوە ئاوا دەی قۆزێتەوە! وە ناویشی نا عەبدوللا! (تاج. بەرگی پێنجەم،باسی ناونانی منداڵی تازەبوو).

٤٥/٢١-[٢١] – وعنْ أَبِي هُريرةَ رضي اللّه عنه أَن رسول اللّه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (لَيْسَ الشديدُ بالصُّرَعةِ إِنَّما الشديدُ الّذي يَمْلِكُ نَفسَهُ عِنْد الْغَضَبِ) متفقٌ عليه.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لە حەزرەتەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەو کەسە ئازا نییە کە پاڵەوانی چاکەو کەس لە زۆرانبازیدا دەرەقەتی نایە، بەڵام ئەو کەسە ئازایە کە لەکاتی تووڕەیی دا خۆی پێ دەگیرێو ڕقی خۆی دەخواتەوە! (ش).

٤٦/٢٢-[٢٢]– وعنْ سُلَيْمانَ بْنِ صُرَدٍ رضي اللّه عنهُ قال: كُنْتُ جالِساً مع النبي صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم، ورجُلان يستَبَّان وأَحدُهُما قَدِ احْمَرَّ وَجْهُهُ. وانْتفَختْ أوداجهُ. فقال رسولُ اللّه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّمَ: (إِنِّي لأعلَمُ كَلِمةً لَوْ قَالَها لَذَهَبَ عنْهُ ما يجِدُ، لوْ قَالَ: أَعْوذُ بِاللّهِ مِنَ الشّيْطَانِ الرَّجِيمِ ذَهَبَ عنْهُ ما يجدُ. فقَالُوا لَهُ: إِنَّ النبي صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم قَالَ: «تعوَّذْ بِاللّهِ مِن الشَّيطان الرَّجِيمِ). متفقٌ عليه.

سولەیمانی کوڕی صورەد (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: لە خزمەتی حەزرەتدا بووین (درودی خوای لەسەر بێ) دوو پیاو بوو بە شەڕە جنێویان، یەکێکیان چاوی سوور هەڵگەڕاو ڕەگی لاملی هەڵسا، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: من وشەیێ دەزانم ئەگەر ئەم کابرایە بیڵێ ڕقەکەی دەنیشێتەوە ئەو فەرموودەیە ئەمەیە: اعوذ بالله من الشیطان الرجیم: پەنا دەگرم بەخودا لە شەڕی شەیتانی دوور لە ڕەحمەتی خودا. کەچی کە ئەم فەرمایشتەی حەزرەتیان بەکابرا گوت، کابرا گوتی: بۆ لەتۆ وایە من شێت بووم! (ش/تاج).

---

٢١ بوخاری (٦١١٤)، موسلیم(٢٦٠٩).

٢٢ بوخاری (٣٨٨٢)، موسلیم(٢٦١٠).

٤٧/٢٣-[٢٣]- وعنْ مُعاذ بْنِ أَنَسٍ رضي اللَّه عنه أَنَّ النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قَالَ: (مَنْ كظَمَ غيظاً، وهُو قَادِرٌ عَلَى أَنْ يُنْفِذَهُ، دَعَاهُ اللَّهُ سُبْحانَهُ وتَعالَى عَلَى رُؤُوسِ الْخلائِقِ يَوْمَ الْقِيامَةِ حَتَّى يُخَيِّرَهُ مِنَ الْحُورِ الْعِينِ مَا شَاءَ)رواه أَبُو داوُدَ والتِّرْمِذيُّ وقال:حديثٌ حسنٌ.

موعـاذی كـوڕی ئەنـەس (ڕەزای خودایـان لەسـەر بـێ) فـەرمووی: حـەزرەت (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فەرمووی: ئەو كەسەی بتوانێ ڕقی خۆی بەیەكێ بڕێژێ بەڵام ڕقەكەی بخواتـەوەو پێی نەڕێژێ، ئەوە لـە ڕۆژی قیامەتـدا خـودا-لەبەرچاوی ئـەو هـەموو عەشامەتە-دەستی ڕێزی لێ دەنێ‌و بانگی دەكاو دەیكا بەسـەر پشك كە بـە ئـارەزوی خـۆی لـە حـۆری‌و پەریـە چـاو جوانـەكانی بەهەشـت هەڵبـژێری بـۆ خـۆی!! (د/ت) تیرمـذی دەڵێ: ئەم فەرموودەیە حەسەنە.

٤٨/٢٤-[٢٤]- وعنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضيَ اللَّهُ عنهُ أَنَّ رَجُلاً قَالَ للنَّبِيِّ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: أوْصِنِي، قَالَ: (لا تَغضَبْ) فَرَدَّدَ مِراراً قَالَ، (لا تَغْضَبْ) رواه البخاريُّ.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حـەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) عەرزی كرد شتێكی وام فێربكە كە تێـی بگـەم بـەڵام زۆرنـا! فـەرمووی پـێی: تووڕە مەبە، پیاوەكە چـەند جارێ ئـەم قسـەیەی دووبـارە كـردەوەو پـێی دەگـوت: شتێكم فێر بكە بەڵام زۆرنا، بەشكم لێی حاڵی بـبم؟ پێغەمبـەریش (درودی خوای لەسەر بێ) هەر بەم وشەیە وەڵامی دەدایەوەو دەیفەرموو: (تووڕە مەبە)(ب/تاج).

٤٩/٢٥-[٢٥]- وَعَنْ أَبي هُرَيْرةَ رَضِيَ اللَّهُ عنه قال: قـال رسـولُ اللَّـهِ صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم: (مَا يَزَال الْبَلاءُ بِالْمُؤْمِنِ وَالْمؤمِنَةِ في نَفْسِهِ وَولَدِهِ ومَالِهِ حَتَّى يَلْقَى اللَّه تعالى وَمَـا عَلَيْهِ خَطِيئَةٌ) رواه التِّرمِذيُّ وقال: حديثٌ حسنٌ صحِيحٌ.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەڵاو مەینەت لە كۆڵ پیاوی موسوڵمان‌و ئافرەتی موسوڵمان نابنەوەو واز لە خۆی‌و ماڵ‌و منال‌و خاوو خێزانی ناهێنن هەتا كاتێ دەمرێ‌و دەچێتەوە بەر دیوانی خودا یـەك

[٢٣] ئەبوداوود (٤٧٧٧)، تیرمذی (٢٠٢٢)و (٢٤٩٥).

[٢٤] تیرمذی (٢٤٠١).

[٢٥] بوخاری(٦١١٦).

دەنك چییە گوناهی پێوە نامێنێ (ت:ح/ح/ص: تیرمذی دەفەرموێ: فەرموودەیەکی جوانی ساغە).

٢٦/٥٠-[٢٦] - وَعَنْ ابْنِ عَبَاسٍ رضي اللّٰه عنهما قال: قَدِمَ عُيَيْنَة بْنُ حِصْنٍ فَنَزلَ عَلَى ابْنِ أَخِيهِ الْحُر بْنِ قَيْسٍ، وَكَانَ مِنَ النَّفَرِ الَّذِين يُدْنِيهِمْ عُمرُ رضِيَ اللّٰهُ عنهُ، وَكَانَ الْقُرَّاءُ أَصْحابَ مَجْلِسِ عُمَرَ رضي اللّٰهُ عنه وَمُشاوَرَتِهِ كُهولاً كَانُوا أَوْ شُبَّاناً، فَقَالَ عُيَيْنَةُ لابْنِ أَخِيهِ: يَا ابْنَ أَخِي لَكَ وَجْهٌ عِنْدَ هَذَا الأَمِيرِ فَاسْتَأْذِنْ لِي عَلَيْهِ، فاستَأذنَ فَأَذِنَ لَهُ عُمرُ. فَلَمَّا دخَلَ قَالَ: هِيْ يا ابْنَ الْخَطَّاب، فَوَاللّٰه مَا تُعْطِينَا الْجَزْلَ وَلا تَحْكُمُ فِينَا بالْعَدْلِ، فَغَضِبَ عُمَرُ رضِيَ اللّٰه عنه حتَّى هَمَّ أَنْ يُوقِعَ بِهِ فَقَالَ لَهُ الْحُرُّ: يا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ إنَّ اللّٰه تعَالَى قَالَ لِنبِيِّهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: { خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الجاهلينَ } ﴿ سورة الأعراف: ١٩٨ ﴾ وإِنَّ هَذَا مِنَ الجاهلينَ، وَاللّٰه ما جاوَزَها عُمَرُ حِينَ تلاها، وكَانَ وَقَّافاً عِنْد كِتَابِ اللّٰهِ تعالى رواه البخاري.

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) فەرمووی: عویەینەی کوری حیصن هاتبوو بە میوانی حوڕی کوڕی قەیسی برازای، کە حوڕ لەلای عومەر خاتری هەبوو، چوونکە قورئان خوێنێکی باش بوو، قورئان خوێنەکان هاودەمو ڕاوێژکاری کوڕی عومەربوون، ئیتر چی لاو بوونایەو چی پیر بوونایە، عویەیەنە بە برازاکەی گوت: ئەی کوڕی برام! تۆ ڕووی لای ئەم فەرمانڕەوایەت هەیە، کەوایە ڕوخصەتم بۆ بخوازە کە بچم بۆلای، ئەویش داوای ڕێگە پێدانی بۆ کرد، کە چووە لای عومەر، گوتی: ئەی کوڕی خە طتاب! بەخودا نەبەشی قەویمان دەدەیتیۆ نە بەعەدالەت بڕیار دەدەیت لەناومانا! عومەریش تووڕە بوو، تەنانەت وەختە بوو بەباشی تووشی بکا. حوڕیش پێی گوت: ئەی فەرمان ڕەوای موسوڵمانان! خودای گەورە بە پێغەمبەری فەرمووە:﴿خذ الغفو وأمر بالعرف وأعرض عن الجاهلين﴾الأعراف/١٩٨. ئەم پیاوەش نەزانەو لە ڕیزی نەفامانە. بە خودا کە حوڕ ئەم ئایەتەی بۆ عومەر خوێندەوە ئیتر عومەر رەق ڕاوەستاو هێواش بۆوە، چونکە عومەر لەحاست نامەی خودا وشك ڕادەوەستاو بەسەریا گوزەری نەدەکرد(بوخاری).

---

[٢٦] بوخاری(٤٦٤٢).

٥١/٢٧-[٢٧]- وعَن ابْنِ مسْعُودٍ رضي اللّه عنه أنّ رسولَ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (إنَّهَا سَتكُونُ بَعْدِي أَثَرَةٌ وَأُمُورٌ تُنْكِرونَها، قَالُوا: يا رسُولَ اللّهِ فما تَأمرُنا ؟ قالَ: تُؤَدُّونَ الْحقَّ الّذي عَلَيْكُمْ وتَسْأَلونَ اللّه الذي لكُمْ) متفقٌ عليه. (والأَثَرَةُ): الانفرادُ بالشيْءِ عمَّنْ لَهُ فيهِ حقٌّ.

**ئيبنو مەسعوود** (رەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: لەپاش من خۆخۆیی پەیدا دەبێ، گەلێ شتی وا روو دەدا کە ناپەسەندو نا شایستەن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر فریای رۆژی وا کەوتین‌و کەوتینە وا رۆژێ فەرمانمان بەچی پێ دەفەرموی؟ فەرمووی: مافی سەرتان جێبەجێ بکەن، داوای حەقی خۆشتان لە خودا بکەن‌و صەبر بکەن‌و بە کەمترین بیانوو ئاژاوە بەرپا مەکەن(ش= بوخاری‌و موسلیم).**

٥٢/٢٨-[٢٨]- وَعن أبي يحْيَى أُسَيْدِ بْنِ حُضَيْرٍ رضي اللّهُ عنهُ أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ قال: يا رسولَ اللّهِ أَلا تَسْتَعْمِلُنِي كَمَا اسْتَعْمَلتَ فُلاناً وفلاناً فَقَالَ: (إِنَّكُمْ سَتَلْقَوْنَ بَعْدي أَثَرَةً فاصْبِرُوا حَتَّى تلقَوْنِي علَى الْحوْضِ) متفقٌ عليه.

**ئوسەیدی کوری حوضەیر** (رەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: پیاوێکی یاریدەدەر عەرزی پێغەمبەری کرد** (درودی خوای لەسەر بێ)**: ئەی فروستادەی یەزدان! منیش وەکوو فیسارە کەس بکە بە سەرکاری سەرکارێ؟ فەرمووی: ئێوە لەپاش خۆم تووشی خۆخۆیی دەبن‌و نازی ئەم‌و ئەو دەدەن بەسەرتانا بەلام تەنگە جیقەلان‌و کەم حەوسەلە مەبن، لەبەر باری خودادا لە پێناو سوودو بەرژەوەندی ئیسلاما صەبرو ئارام بگرن، دیارە کە لەحالەتی وادا دەگەنەوە بەخۆم لەسەر کارێزی کەوسەر(ش).**

٥٣/٢٩-[٢٩]- وَعنْ أبي إبْراهيمَ عَبْدِ اللّه بْنِ أبي أَوْفي رضي اللّهُ عنهمَا أَنَّ رسولَ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم في بعْضِ أَيَّامِهِ التي لَقِيَ فِيهَا الْعَدُوَّ، انْتظرَ حَتَّى إذَا مَالَتِ الشَّمْسُ قَامَ فِيهِمْ فَقَالَ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ لا تَتمنَّوا لِقَاءَ الْعدُوِّ، وَاسْأَلُوا اللّه العَافِيَةَ، فَإذَا لقيتُموهم فاصْبِرُوا، وَاعْلَمُوا أَنَّ الْجَنَّة تَحْتَ ظِلاَلِ السُّيُوفِ) ثُمَّ قَالَ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم:

---

٢٧ بوخاری (٧٠٥٢)، موسلیم(١٨٤٣).

٢٨ بوخاری(٧٠٥٧)، موسلیم(١٨٤٥)ز

٢٩ بوخاری(٢٨١٨)، موسلیم(١٧٤٢).

(اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ وَمُجْرِيَ السَّحَابِ، وَهَازِمَ الأَحْـزابِ، اهْـزِمْهُمْ وَانْصُـرْنا عَلَـيْهِمْ). متفقٌ عليه وباللّٰه التَّوْفيقُ.

**عەبدوڵڵای كوری ئەبو ئەوفا** (رەزای خودایان لەسەر بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **رۆژێ بەر لەوەی بەرەنگاری دوژمن بێ، چاوەنواڕی فەرمووو تا خۆر لار بۆوە ئەوجا هەڵسایەوە، لەناو یارانا ڕاوەستاو فەرمووی: ئەی موسوڵمانینە! مەچن بە پیری جەنگەوەو خۆزگە مەخوازن بۆ ئەوە كە ئاوقەدی دوژمن بن‌و هەمیشە داواتان لەخودا ئەوە بێ سەرو ماڵ‌و وڵات‌و ئایینتان دوور بن لە دەردو بەڵاو، سەلامەت‌و بێ وەی بن، بەڵام كاتێ بە دوژمن گەیشتن خۆڕاگرو ئازاو مەردی مەیدان بن، موسوڵمان نابێ ترسنۆك‌و بێ ورە بێ، ئەوەش بزانن كە بەهەشت وا لە ژێر سێبەری شیرو تیرداو دینی ئیسلام بەبێ سوپایەكی رێك‌و پێكی پڕ چەكی ئامادە مانی نەمانە. لەپاشا فەرمووی: خودایە! قورئان قورئانی تۆیەو لە خۆتەوە هاتووە بۆ ئێمە، خودایە! تۆ سەرچاوەی هەموو خێرو بێرێكی كە یەكێ لەوانە ئەم هەورو بەڵایە كە دەیهێنی‌و دەیبەی، خودایە! تۆ ئەو خودایەی كە لەرۆژی غەزای خەندەقا دەستەو تاقمەو پارتی كافرەكانت تێكشكاندو سەری ئیسلامت بەرزكردەوە، خودایە! ئەم جارەش وەك هەموو جارێ سەرمان بخە بەسەر دوژمنان‌و دوژمن- كە دوژمنی دینی تۆیە- تێك‌و پێكی قوپێنە(ش).**

## ٤- باسی راستی (باب الصدق)

**قال الله تعالى:﴿يا ايهاالذين آمنوا اتقوا الله و كونوا مع الصادقين﴾التوبة/١١٩. واتە: ئەی موسوڵمانینە! ترسی خوداتان هەبێ تەقوای بكەن، خۆتان بپارێزن لە نافەرمانی ئەو خودا مەزنە، وە هەموو كاتێ بە دەم‌و دڵ لەگەڵ پیاو راستانا بن.**

**وقال تعالى: ﴿والصادقين والصادقات﴾الاحزاب/٣٥.**

**وقال تعال: ﴿فلو صدقوا لكان خيرا لهم﴾محمد/٢١**

٥٤/١-[١] – عَن ابْنِ مَسْعُودٍ رضي اللّٰه عنه عن النبـي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَـلّم قـال: (إِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الجَنَّةِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ ليصْدُقُ حَتَّـى يُكتَـبَ عِنْـدَ

---

١ بوخاری (٦٠٩٤)، موسلیم(٢٦٠٧).

اللّٰهِ صِدِّيقاً، وإنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الفجُورِ وَإِنَّ الفجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَكْذِبُ حَتَّى يُكتَبَ عِنْدَ اللّٰهِ كَذَّاباً) متفقٌ عليه.

**ئیبنو مەسعوود** (رەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: لەراستی رەحمەت دەباریٚ، هەمیشە راستی بکەن بە پیشە، چونکە ڕاستی ئادەمیزاد دەخاتە سەر ڕێگەی چاکە، کردەوەی چاکەیش ئادەمیزاد دەخاتە سەر ڕێگەی بەهەشت! پیاوی وا هەیە ئەوەندە ڕاستگۆیەو ئەوەندە سۆراخی راستی دەکاو ئەونە عەودالی راستییە هەتا لەلای خودا بە پیاوی راستو راستاڵ لە قەڵەم دەدریٚو لە دیوانی خودا ناوی بەراست دەنووسریٚ، وەنەکەن درۆ بکەن، چونکە درۆ پیاو دەخاتە سەر ڕێگەی خراپە، کردەوەی خراپەیش پیاو دەخاتە سەر ڕێگەی ئاگری دۆزەخ، پیاوی واهەیە ئەوەندە درۆزنەو زۆر درۆ دەکاو ئەوەندە منەیی درۆ دەکا هەتا لای خودا بە درۆزن دەنوسریٚ (ش/تاج).**

٢/٥٥-[٢]- عَنْ أبي مُحَمَّدٍ الْحَسنِ بْنِ عَلِيٍّ بْنِ أبي طَالِبٍ، رَضيَ اللّٰهُ عَنْهما، قَالَ حفِظْتُ مِنْ رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (دَعْ ما يَرِيبُكَ إِلَى مَا لا يَرِيبُكَ، فَإِنَّ الصِّدْقَ طُمأنينَةٌ، وَالْكَذِبَ رِيبةٌ) رواه التِرْمذي وقال: حديثٌ صحيحٌ. قَوْلُهُ: (يرِيبُكَ) هُوَ بفتحِ الياء وضَمِّها، وَمَعْنَاهُ: اتْرُكْ ما تَشُكُّ في حِلّه، واعْدِلْ إلى مَا لا تَشُكُّ فيه.

**حەسەنی کوری عەلی** (رەزای خودایان لەسەر بێ) **دەفەرمویٚ: ئەم فەرمایشتەم لەدەمی حەزرەت خۆیەوە** (درودی خوای لەسەر بێ) **لەبەرکردووە، کە دەفەرمویٚ: ئەوەی گومانی خراپەی لیٚ دەکریٚ لێی گەڕیٚو دووربە لەوەی لێی بەگومانی، لەباتی شتی وا کارێك بکە کە دڵت ئاوی پیٚ دەخواتەوە، چونکە لە راستی دڵنیایی دەباریٚو بە درۆش دڵ گەرد دەگریٚو سەری لیٚ دەشێویٚ(ت: ح/ص).**

٥٦/٣-[٣]- عنْ أبي سُفْيانَ صَخْرِ بْنِ حَرْبٍ . رضيَ اللّٰه عنه. في حديثِه الطَّويلِ في قِصَّةِ هِرقْلُ، قَالَ هِرقْلُ: فَماذَا يَأْمُرُكُمْ يعْني النبـيٍّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم قَالَ أَبُو سُفْيَانَ: قُلْتُ: يقول (اعْبُدُوا اللّٰهَ وَحْدَهُ لا تُشرِكُوا بِهِ شَيْئاً، واتْرُكُوا ما يَقُولُ آباؤُكُمْ، ويَأْمُرنَا بالصَّلاةِ والصِّدقِ، والْعفَافِ، والصِّلَةِ). متفقٌ عليه.

---

٢ تیرمذي(٢٥٢٠).

٣ بوخاری (٧)، موسلیم(١٧٧٣).

ئەبو سوفیان- کە ناوی صەخری کوڕی حەربە- لەداستانی وتوویژە درێژەکەی خۆیو هیرەقلا دەگێڕێتەوە دەڵێ: هیرەقل گوتی: موحەممەد فەرمانی چیتان پێ دەکاو دەڵێ چی بکەنوچی مەکەن؟ منیش گوتم: دەڵێ هەر خودای تاكو تەنیا بپەرستنو هاوبەشو هاوڕێو شتی لەم بابەتەی بۆ پەیدا مەکەن، قسەی پڕوپوچی باو باپیرتان پشت گوێ بخەن، کە لەبارەی فرە خوداییەوە کردوویانە، وەکی دیکەیش دەڵێ نوێژی راستو دروست بۆ خودا بکەنو، هەتا دەتوانن ڕاستاڵوڕاستگۆ بنو، پیشەتان راستیو داوێن پاکیو دەمو دەست پاکی بێ، هەروەها خزم دۆست بنو، خزمو خوێشی خۆتان بەسەر بکەنەوەو، پەیوەندیان پێوە بکەن(ش).

٥٧/٤-[٤]- عَنْ أبي ثَابِتٍ، وقِيلَ: أبي سعيدٍ، وقِيلَ: أبي الْوليدِ، سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ، وَهُوَ بدرِيٌّ، رضي اللَّه عنه، أَن النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (مَنْ سَأَلَ اللَّهَ، تعالَى الشَّهَادَةَ بِصِدْقٍ بَلَّغهُ اللَّهُ مَنَازِلَ الشُّهدَاء، وإِنْ مَاتَ عَلَى فِراشِهِ) رواه مسلم.

سەهلی کوری حونەیف (رەزای خودای لەسەر بێ) کە خۆی پیاوێکی بەدرییە، واتە: لەغەزای بەدردا ئامادەبووەو لەوێ بووەو بەشداری ئەو جەنگە پیرۆزەی کردووە، دەفەرموێ: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ بەراستیو بەدڵ لەخودا داوای شەهیدبوون بکا، خودای گەورە پایەی شەهیدی دەداتێ، با بەدەردی خودایش لەسەر نوێنی خۆی بمرێ(م).

٥٨/٥-[٥]- عَنْ أبي هُريْرة رضي اللَّهُ عنه قـال: قـال رسـولُ اللَّـه صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم: (غزا نَبِيٌّ مِنَ الأَنْبياءِ صلواتُ اللَّه وسلامُهُ عليهِمْ فَقَالَ لقوْمِهِ: لا يتْبعْني رَجُلٌ ملَكَ بُضْعَ امْرَأَةٍ. وَهُوَ يُريدُ أَن يَبْنِيَ بِهَا وَلَمَّا يَبْنِ بِها، ولا أَحدٌ بنَى بيُوتاً لَمْ يرفَع سُقوفَهَا، ولا أَحَدٌ اشْتَرى غَنَماً أَوْ خَلَفَاتٍ وهُو يَنْتَظرُ أوْلادَهَا. فَغزَا فَدنَا مِنَ الْقَرْيـةِ صـلاةَ الْعصْـرِ أَوْ قَرِيباً مِنْ ذلكَ، فَقَال للشَّمس: إِنَّكِ مَأمُورةٌ وأَنا مأمُورٌ، اللهمَّ احْبسْـهَا علَينـا، فَحُبِسـتْ حَتَّى فَتَحَ اللَّهُ عليْهِ، فَجمَعَ الْغَنَائِم، فَجاءَتْ يَعْنِي النَّارَ لتأكُلـهَا فَلَـمْ تطْعمْهَـا، فقـال: إِنَّ فِيكُمْ غُلُولاً، فليبايعني منْ كُلِّ قبِيلَةٍ رجُلٌ، فلِزقتْ يدُ رَجُلٍ بِيـدِهِ فَقَـالَ: فِـيكُم الْغُلـولُ،

---

٤ موسلیم(١٩٠٩).

٥ بوخاری (٣١٢٤)، موسلیم(١٧٤٧).

فليبايعنِي قبيلَتُك، فلزقَتْ يدُ رجُليْنِ أو ثلاثَةٍ بِيَدِهِ فقَالَ: فِيكُمُ الْغُلُولُ، فَجاءوا برَأْسٍ مِثْلِ رَأْس بَقَرَةٍ مِنْ الذَّهبِ، فوضَعها فجَاءَت النَّارُ فَأَكَلَتها، فلمْ تَحل الْغَنَائِمُ لأحـدٍ قَبلَنَـا، ثُـمَّ أَحَلَّ اللَّهُ لَنا الغَنَائِمَ لَمَّا رأَى ضَعفَنَا وعجزَنَا فأحلَّها لنَا) متفقٌ عليه.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لـە حەزرەتـەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: جارێ پێغەمبـەرێ لـە پێغەمبـەران- (درودی خـوای لەسـەر هـەموویان بـێ)- چـوو بـۆ غــەزایێ، بەگەلەكـەی فـەرموو: ئـەو پیـاوەی كـە ژنـی مـارە بڕیـوەو دەیـەوێ بیگوێزێتەوەو هێشتا نەیگوێزاوەتەوە شوێنم نەكەوێ، ئەوەی حاڵی وایە لەگەڵ من نـەیێ بـۆ ئـەم غەزایـە، هـەروەها ئـەو كەسەشی خـانووی تـازەی درووسـت كـردووە هێشـتا سـەری نـەگرتووە، هـەروا ئـەو كەسـانەش كـە مـەڕو بـزنو وشـترو ئـاژەڵی ئاوسیان كڕیوەو چاوەڕوانی ئەوەن كە ئاژەڵەكانیان بزێ، ئەمانـە كەسیان نـەیـەن لەگـەڵما بـۆ ئـەم غەزایە،ئـەوجا كەوتـە ڕێو دەمـی نوێـژی عەسـر، یـا نزیـك كـاتی نوێژی عەسر، لەو دێیەی كە بۆی دەچوو غـەزای بكـا، نزیـك بـۆوە، بـە خۆرەكـەی فەرموو: ئەی خۆر! تـۆش وەك مـنو منـیش وەك تـۆ هـەردووكمان فـەرمانی خـودا بـەجێ دەهێـنین، تـۆ دێو دەچیت بەفـەرمانی خودایـە، مـن كـە دەچـم بـۆ ئـەم غەزایە دیسان بەفەرمانی خودایە، ئەی خودایـە! ئـەم هـەتاوە بوەسـتێنەو مەهێڵـە ئاوا ببێ تا غـەزاكەمان تـەواو دەكـەین، ئـیتر خۆرەكـە حـەپس بـوو گلی خـواردەوە هــەتا خــودا دێكــەی دا بەدەســتیانەوەو گرتیــان، ئــەوجا تالانییەكــەی هــەموو كۆكردەوەو ئاگر لە ئاسمانەوە وەكوو هەمووجارێ هات كە بیخوات، وەلێ چەشـكەی نەكردو نەیخوارد، لە كۆنا تالانی حەلاڵ نـەبوو، لـەپاش شـەڕەكە مـاڵی تالانیـان لـە شـوێنێكا كـۆدەكردەوە، خـودا ئـاگرێكی دەنـارد دەی خـواردو هـەمووی دەسـووتاند، بـەلام ئـەم جـارە كـە ئاگرەكـە هـات ماڵـە تالانییەكـەی نـەخوارد، لەبەرئـەوە پێغەمبەرەكە زانی كە دزیو ناپاكی لە تالانەكە كراوەو ناخونـەكیان لێ داوە، بۆیـە فەرمووی: گزیو دزی لـە تالانەكـە كـراوە، دەسـتی ناپاكتـان لەناودایـە، بـا لـە هـەر هۆزێ سـەر خێڵەكـەیان پـەیمانم لەگـەڵ تـازە بكاتـەوەو دەسـت بخاتـە نـاو دەسـتم، لەكاتی پەیمان وەرگرتنو تەوقە كردنەكەدا، دەستی دوو پیـاو یـا سـێ پیـاو نووسـا بەدەستی پێغەمبەرەكەوە، فەرمووی: گزیەكە لەناو ئێوەدایە، پاشان سەلكە گایەكی زێڕینیان هێناو فڕێیان دایە سەر خەرمانی تالانییەكە، ئیتر ئاگری قودرەت هات

خواردی، بۆ كەسی تر لەپێش ئێمەوە ماڵی تالانی شەڕی كافران حەڵاڵ نەبووە، وەڵێ ئێستا خودا تالانی بۆ ئێمە حەڵاڵ كردووە، لەبەرئەوە كە كەم هێزو كەم دەسەڵاتین بۆی ڕەوا دیوین، هەتا بەهرەی لێ وەربگرینو خۆمانی پێ بەهێز توانا بكەین، تا بەرابەر دوژمن رابووەستین(ش).

٥٩/٦-[٦] عن أبي خالدٍ حكيم بنِ حزَامٍ. رضِيَ اللّٰهُ عنه، قال: قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (الْبيِّعَان بالخِيارِ ما لم يَتفرَّقا، فإن صدقَا وبيَّنا بورِكَ لَهما في بَيْعِهِما، وإن كَتَما وكذَبَا مُحِقَتْ بركةُ بيْعِهِما) متفقٌ عليه.

حەكیمی كوری حیزام (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: كڕیارو فرۆشیار هەردوولا خۆیان سەرپشكنو دەتوانن لەو سەودایە كە گرێیان داوە پەشیمان ببنەوە هەتا لەیەكتری جیا دەبنەوە، جا ئەگەر لەگەڵ یەكتریدا راستو دروست بنو شت لەیەكتری نەشارنەوەو نەنگی شاراوەی سەوداكەی حەشار نەدەن، ئەوە ئەو سەودایەیان پیتو فەڕی تێ دەكەوێ بۆیان. بەڵام ئەگەر لەگەڵ یەك ناراستو نادرووست بنو شت لەیەكتری حەشار بدەن، ئەوا پیتەی سەوداكەیان دەچێ بە حەوادا(ش/تاج).

## ٥- باسی ئاگا لەخۆبوون (باب المراقبه)

قال الله تعالى: ﴿الذي يراك حين تقوم، وتقلبك في الساجدين﴾الشعراء/ ٢١٨-٢١٩. وقال تعالى: ﴿وهو معكم اينما كنتم﴾ الحديد/٤. وقال تعالى: ﴿إن الله لا يخفى عليه شيئ في الأرض ولا في السماء﴾آل عمرا/٥، وقال تعالى: ﴿إن ربك لبالمرصاد﴾الفجر/١٤. وقال تعالى: ﴿يعلم خائنة الأعين وما تخفي الصدور﴾غافر/١٩.

والآيات في الباب كثيرة معلومة.

ئایەتەكان تێكڕا دەفەرموون: ئەی خۆشەویست! ئەی پێغەمبەری من! بزانن كە خودا چاوی لە هەموو شتێكە، ئاگای لە خشەی مارو مێرووە، دوورو نزیكیو شەوو ڕۆژ بۆ خودا نییە، هەموو شتێ، لە هەر كوێ بێ، لە هەر كەسێكەوە بێ، گەورە بێ یا بچووك، خێر بێ یا شەڕ، چاك بێ یا خراپ، خودا زۆر بەباشی ئاگای لێیە،

---

٦ بوخاری (٢٠٧٩، موسلیم(١٥٣٢).

ئەوەی کاری باش دەکا خودا چاوی خێری لێیەتی، ئەوەی کاری خراپدەکا خودا بەچاوی قارو خەشم بۆی دەڕوانێ، بزانن کە خودا زۆر بەوردی سەرنجی کارو کردەوەتان دەدا، وەك لە کەمیندا بێ ئاوا، وەك راوکەرێ لەپارێزی نێچیرێکا بێ ئاوا، نیازی دڵتان دەزانێ، ئاگای لە گزیو بەنارەوا ڕوانینی چاوی ناپاکە، چەکەرەی دڵ، ئارەزووی دەروون گشتی دەزانێ، کەواتە شەرمو شکۆی لێ بکەنو هەمیشە وادانێن کەوان لە خزمەتی خودادا. ئایەتی تر لەم چەشنە لە سایەی خوداوە زۆرە.

٦٠/١-[١]- عَنْ عُمرَ بنِ الخطابِ، رضيَ اللّٰهُ عنه، قال: «بَيْنما نَحْنُ جُلُوسٌ عِنْد رسولِ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، ذَات يَوْمٍ إِذْ طَلع عَلَيْنَا رجُلٌ شَديدُ بياضِ الثِّيابِ، شديدُ سوادِ الشَّعْرِ، لا يُرَى عليْهِ أَثَر السَّفَرِ، ولاَ يَعْرِفُهُ منَّا أَحدٌ، حتَّى جَلَسَ إِلَى النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، فَأَسْنَدَ رَكْبَتَيْهِ إِلَى رُكبَتَيْهِ، وَوَضع كفَّيْه عَلَى فخِذيهِ وقال: يا محمَّدُ أَخبِرْني عن الإِسلام فقالَ رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: الإِسلامُ أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ، وأَنَّ مُحَمَّداً رسولُ اللّٰهِ وَتُقِيمَ الصَّلاَةَ، وَتُؤتِيَ الزَّكَاةَ، وتصُومَ رَمضَانَ، وَتَحُجَّ الْبيْتَ إِنِ استَطَعتَ إِلَيْهِ سَبِيلاً.

قال: صدَقتَ. فَعجِبْنا لَهُ يسْأَلُهُ ويصدِّقُهُ، قَالَ: فَأَخْبِرْني عن الإِيمَان. قَالَ: أَنْ تُؤْمِنَ بِاللّٰهِ وملاَئِكَتِهِ، وكُتُبِهِ ورُسُلِهِ، والْيومِ الآخِرِ، وتُؤمِنَ بالْقَدرِ خَيْرِهِ وشَرِّهِ. قَال: صدقْتَ قال: فأَخْبِرْني عن الإِحْسانِ. قال: أَنْ تَعْبُدَ اللّٰه كَأَنَّكَ تَراهُ. فإِنْ لَمْ تَكُنْ تَراهُ فإِنَّهُ يَراكَ قَالَ: فَأَخْبِرْني عن السَّاعةِ. قَالَ: مَا المسْؤُولُ عَنْهَا بأَعْلَمَ مِن السَّائِلِ. قَالَ: فَأَخْبِرْني عَنْ أَمَاراتِهَا. قَالَ أَنْ تلدَ الأَمَةُ ربَّتَها، وَأَنْ تَرى الْحُفَاةَ الْعُراةَ الْعالَةَ رِعاءَ الشَّاءِ يتَطاولُون في الْبُنيانِ ثُمَّ انْطَلَقَ، فلبثْتُ ملِيًّا، ثُمَّ قَالَ: يا عُمرُ، أَتَدرِي منِ السَّائِلُ قلتُ: اللّٰهُ ورسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ: فإِنَّهُ جِبْرِيلُ أَتَاكُمْ يُعلِّمُكم دِينَكُمْ) رواه مسلمٌ.

عومەری کوڕی خەططاب (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی:ڕۆژێ لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین (درودی خوای لەسەر بێ) لەوکاتەدا لەناکاو پیاوێکی بەرگ سپی وەك چۆڕی شیر، موو ڕەشی قەترانی هاتەناومان، نەبەدیمەن لە ڕێبواری دەکرد، نەکەسیشمان دەمان ناسی، جا چوو لەلای حەزرەتا دانیشتو هەردوو چۆکی خۆی نا بەهەردوو چۆکی پێغەمبەرەوەو هەردوو لەپی خۆی لەسەر هەردوو رانی خۆی داناو

---

١ موسلیم(٨).

بەرێزەوە دانیشتو گوتی: ئەی موحەممەد! ئیسلامەتیم پێ بڵێ، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئیسلامەتی ئەوەتانێ کە شایەتی بدەی: کە هەر خودا خودایەو هیچ خودایەکی تر نییە، وە موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) پێغەمبەرو رەوانەکراوی ئەوە، وەئەوەتە کە نوێژ بکەی و زەکات بدەی و رۆژوی رەمەزان بگریت و حەجی ماڵی خودا بکەی، ئەگەر تەوانای رێگەو بانت ببێ، پیاوەکە بە پێغەمبەری گوت: راست دەفەرمووی! عومەر فەرمووی: قسەکەیمان پێ سەیر بوو، چۆن لە پێغەمبەر دەپرسێو کەچی دەڵێ راست دەفەرمووی، ئینجا گوتی: ئەی موحەممەد! ئیمان و باوەرم بۆ روون بکەرەوە، فەرمووی: ئەوەتا کە باوەر بکەی بە خوداو بە فریشتەکانی خوداو بە نامەکانی خوداو بە پێغەمبەرەکانی خودا، وە باوەر بکەی بە رۆژی دوایی، وە بە قەزاو قەدەرو چارەنووسی خودایی، بە چاکی و بەخراپی. گوتیەوە: راست دەفەرمووی، ئینجا گوتی: ئەی چاکە چییە؟ فەرموی: چاکە ئەوەیە کە بەچەشنێکی وا خودا بپەرستیت کەوەك چاوت لە خودا بێ وابێ، خۆ ئەگەر تۆش ئەو نابینیت، بێگومان کە ئەو تۆ دەبینێ، ئنجا گوتی: پێم بفەرموو: قیامەت کەیە؟ فەرمووی: منیش هەروەك تۆی لێ دەزانم. گوتی: دەباشە نیشانەکانیم پێ بفەرموو، فەرموی: ئەوەتە کە منداڵ بە چاوی کارەکەرو نۆکەر تەماشای دایك و باوکی خۆیان بکەن، وەئەوەتە بە چاوی خۆت ببینی: کە پێ خاووس و رەش و رووت و رەجاڵ و شوان و گاوان ببن بەخاوەن موڵك و سامان و خانووبەرەو کۆشك و تەلاری لێ رابکێشن و فیزو دەعیەی پێوەبکەن. عومەر فەرمووی: ئینجا کابراکە رۆیشت.

جا لەپاش ماوەیێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: ئەی عومەر! دەزانی ئەو پرسیار کەرە کێ بوو؟ گوتم: نەخەیر، خوداو پێغەمبەر دەزانن. فەرمووی: ئەوە جوبرائیل بوو، هاتبوو کە بەو شێوەیە ئێوە فێری دین و ئایینی خۆتان بکات(م/تاج) لەتاجولئوصولدا ئەمەی پترە: لە گێرانەوەیەکا ئەمەشی زیاترە: فەرمووی: یەکێکە لەو پێنج شتانە کە هەر خودا بۆخۆی دەیانزانێ ئنجا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەم ئایەتەی بە تەواوی خوێندەوە: ﴿إن الله عنده علم الساعة﴾ /٣٤.

واتە: بەراستی بەس خودا دەزانێ رۆژی قیامەت کەی دەبێ. دوایی: کە پیاوەکە رۆیشت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بی گێرنەوە بۆ لام، ئەوانیش کە چوون

بی هێننەوە بۆلای، هیچیان نەدی. جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوە جوبرائیل بوو هاتبوو کە خەڵکەکە فێری ئایینی ئیسلام بکات.

٢/٦١–[٢]– عن أبي ذَرّ جُنْدُبِ بْنِ جُنَادةَ، وأبي عبْدِ الرَّحْمنِ مُعاذِ بْنِ جبل رضيَ اللّٰه عنهما، عنْ رسولِ اللّٰهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم، قال: (اتَّقِ اللّٰهَ حَيْثُمَا كُنْتَ وأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحسنةَ تَمْحُهَا، وخَالقِ النَّاسَ بخُلُقٍ حَسَنٍ) رواهُ التِّرْمذيُّ وقال: حديثٌ حسنٌ.

ئەبوذەڕ-کەناوی جوندوبی کوڕی جەنادەیە- ومعاذی کوڕی جەبەل- (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) فەرموویان: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: لە هەموو شوێنێ ترسی خودات هەبێو بێ فەرمانی مەکە، بزانن کە یاسایەکی خودایيە کەکردەوەی باشو کاری چاکە هەمیشە کردەوەی خراپو تاوان لادەبن، لەگەڵ هەموو کەسێکا ڕەفتارو گوتارو کردارتان شیرینو جوان بێ (تیرمذي ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوەو فەرموویەتی: فەرموودەیەکی حەسەنە).

٣/٦٢–[٣]– عن ابنِ عبَّاسٍ، رضيَ اللّٰه عنهمَا، قال: (كُنْتُ خَلْفَ النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم يوْماً فقال: (يَا غُلامُ إِنِّي أُعلّمك كَلِمَاتٍ: (احْفَظِ اللّٰهَ يَحْفَظْكَ احْفَظِ اللّٰهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ، إِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلِ اللّٰه، وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللّٰهِ، واعلَمْ: أَنَّ الأُمَّةَ لَو اجتَمعتْ عَلَى أَنْ ينْفعُوكَ بِشيْءٍ، لَمْ يَنْفعُوكَ إلاَّ بِشَيْءٍ قَد كَتَبَهُ اللّٰهُ لَكَ، وإن اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوك بِشَيْءٍ، لَمْ يَضُرُّوكَ إلاَّ بَشَيْءٍ قد كَتَبَهُ اللّٰه عليْكَ، رُفِعَتِ الأَقْلاَمُ، وجَفَّتِ الصُّحُفُ)). رواهُ التِّرمذيُّ وقَالَ: حديثٌ حسنٌ صَحيحٌ. وفي رواية غيرِ التِّرْمِذيِّ: (احفظَ اللّٰهَ تَجِدْهُ أَمَامَكَ، تَعَرَّفْ إِلَى اللّٰهِ فِي الرَّخَاءِ يعرِفْكَ فِي الشِّدةِ، واعْلَمْ أَنّ مَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصيبَك، وَمَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُن لِيُخطِئَكَ واعْلَمْ أنّ النَّصْرَ مَعَ الصَّبْرِ، وأَنَّ الْفَرَجَ مَعَ الْكَرْب، وأَنَّ مَعَ الْعُسرِ يُسْراً).

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) فەرمووی: ڕۆژێ لەپاشکۆی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) سواربووم فەرمووی: ڕۆڵەکەم! باچەند وشەو قسەیەکی بەسوودت فێربکەم: یەکەم: ئاگات لە خودا بێو هەمیشە خودات لەبیر بێ، خودایش ئاگای ڕەحمەتی لە تۆ دەبێو بەچاوی ڕەحمەت ئاگاداریت دەکا، لەئاگاداری خودا غافڵ

---

٢ تیرمذي (١٩٨٨).

٣ تیرمذي (٢٥١٨).

مەبە، دەبینیت خودا لەگەڵتایەو لەکاتی خۆشیو تەنگانەدا جێت نایەڵێو سەرەوکاریت دەکا، دووەم: هەرچی داوا دەکەی هەر لە خودای داوا بکەو نیازو مرازی خۆت هەمیشە روو بە رووی خودا بکەرەوە، سێیەم: داوای یارمەتیو کۆمەکی هەمیشە لە خودا بکە، چونکە خودا ئەگەر خواستی لەسەر ئەوە بێ تووشی خێرێکت بکا هۆی بۆ دەسازێنێ، بشزانە ئەگەر مەخلوقاتو درووستکراوانی خودا هەموو کۆ ببنەوە بیانەوێ سودێ، خێرێکت پێ بگەیەنن ناتوانن، مەگەر ئەوەی کە خوا لە رۆژی هەوەڵا لەچارەی نووسیوی، وەئەگەر هەمووشیان یەك بگرن گەلە کۆمەکەت لێ بکەنو پیلانت لێ بکەن کە زیانێکت تووش بکەن ناتوانن مەگەر ئەو زیانەی کە خوا لە رۆژی یەکەمدا لەچارەی نووسیوی!

بزانە، ئەوەی دێتە رێت تازە تێ پەڕیو ڕەت بوونەوەی بۆ نییەو کار لەکار ترازاوەو لەچارەت نووسراوەو کاغەزو قەڵەم پێچراونەتەوەو هەڵگیراونو هیچ لەگەڵ چارەنووس ناکرێ! (ت:ح/ح/ص) لە گێڕانەوەیەکی تردا، بەڵام هی تیرمذی نا ئەمەی پترە: بێ ئاگا مەبە لە خوداو حەقی خودا بەجوانی بدە خوداش هەمیشە ئاگای خێری لە تۆ دەبێو هەست دەکەی کە هەمیشە خودا بە کەرەمی خۆی لەگەڵتایە، لەکاتی خۆشیو فەرحانەدا خودات لەبیر بێو خۆتی پی بناسە، تا خودایش لەکاتی لێ قەومانو سەخڵەتیو تەنگانەدا بێ بەهاوارتەوەو لای خێرت لێبکاتەوە،سوور بزانە هەرچی خودا لەچارەی نەنووسیبی قەت نابێ کە تووشت ببێ، چارەنووسی خودایی تیرێکی راستە، هەڵەی نییە، دیسان باش بزانە کە سەرکەوتن بەری داری صەبرو ددان بەخۆدا گرتنە، مەینەت کلیلی دەرو لێکردنەوەی خودایە! دیسان بزانە کە کار نییە خودا ئاسانی نەکا!

٦٣/٤-[٤] – عنْ أَنَس رضي اللّهُ عنه قالَ: (إِنَّكُمْ لَتَعْمَلُونَ أَعْمَالاً هِيَ أَدقُّ فِي أَعْيُنِكُمْ مِنَ الشَّعَرِ، كُنَّا نَعُدُّهَا عَلَى عَهْدِ رسولِ اللّـهِ صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم مِنَ الْمُوبِقَاتِ) رواه البخاري. وقال: (الْمُوبِقَاتُ) الْمُهْلِكَاتُ.

ئەنەس (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: گەلێ شت هەیە کەئێستا ئێوە زۆر بەئاسانی دەیکەنو لەبەر چاوتان لە موو باریکترن، بەڵام بەسەرینی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ)

---

٤ بوخاری (٦٤٩٢).

که خۆی له ژیاندا بوو ئێمه کردنی ئەوانەمان بە ماڵ وێرانکەر دادەناو ئەوەی توشی ببوایە وامان دادەنا کە بەفەتارەت چووە (بوخاری).

٥/٦٤–[٥] عَنْ أبِي هريْرَةَ، رضي اللّٰه عنه، عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: إنَّ اللّٰهَ تَعَالَى يَغَارُ، وَغَيْرَةُ اللّٰهِ تَعالَى، أنْ يَأْتِيَ الْمَرْءُ مَا حَرَّمَ اللّٰهُ عَلَيْهِ) متفقٌ عليه.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خودا غیرەت دەیگرێو، موسوڵمانیش غیرەتو دەمار دەیگرێو بەتەنگی شەرفو ناموسەوە دێ، خودا لەسەر ئەوە غیرەت دەیگرێو هەڵ دەداتێ کە موسوڵمان شتی ناڕەوا بکاو ئەوەی خودا حەرامی کردووەو ڕەوای نەدیوە ئەو بچێ بیکا. (ش/تاج) زیادەی تەرجەمەکە لە ریوایەتەکەی تاجول ئوصول وەرگیراوە.

٦/٦٥–[٦] عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رضي اللّٰه عنه أنَّهُ سمِع النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم يَقُولُ: (إنَّ ثَلاثَةً مِنْ بَنِي إسْرائيلَ: أبْرَصَ، وأقْرَعَ، وأعْمَى، أَرَادَ اللّٰهُ أَنْ يَبْتَلِيَهُمْ فَبعث إلَيْهِمْ مَلَكاً، فأتَى الأبْرَصَ فقَالَ: أيُّ شَيْءٍ أَحبُّ إلَيْكَ ؟ قَالَ: لَوْنٌ حسنٌ، وَجِلْدٌ حَسَنٌ، ويُذْهَبُ عنِّي الَّذي قَدْ قَذَرنِي النَّاسُ، فَمَسَحَهُ فذَهَب عنهُ قذرهُ وَأُعْطِيَ لَوْناً حَسناً. قَالَ: فَأيُّ الْمال أَحبُّ إلَيْكَ ؟ قال: الإبلُ أوْ قَالَ الْبَقرُ شَكٌّ الرَّاوِي فأُعْطِيَ نَاقَةً عُشراءَ، فقَالَ: بارَكَ اللّٰهُ لَكَ فِيها.

فأتَى الأَقْرعَ فقَالَ: أيُّ شَيْءٍ أَحب إلَيْكَ ؟ قال: شَعْرٌ حسنٌ، ويذْهبُ عنِّي هَذا الَّذي قَذِرَني النَّاسُ، فمسحهُ عنْهُ. أُعْطِيَ شَعراً حسناً. قال فَأيُّ الْمَال. أَحبُّ إلَيْكَ ؟ قال: الْبَقرُ، فأُعطِيَ بقرةً حامِلاً، وقَالَ: بَارَكَ اللّٰهُ لَكَ فِيهَا.

فَأتَى الأعْمَى فقَالَ: أيُّ شَيْءٍ أَحبُّ إلَيْكَ ؟ قال: أنْ يردَّ اللّٰهُ إلَيَّ بَصَرِي فَأُبْصِرَ النَّاسَ فَمَسَحَهُ فَرَدَّ اللّٰهُ إلَيْهِ بصَرَهُ. قال: فَأيُّ الْمَال أَحبُّ إليْكَ ؟ قال: الْغنمُ فَأُعْطِيَ شَاةً والِداً فَأنْتجَ هذَانِ وَوَلَّدَ هَذا، فكَانَ لِهَذَا وَادٍ مِنَ الإبِلِ، ولَهَذَا وَادٍ مِنَ الْبَقرِ، وَلَهَذَا وَادٍ مِنَ الْغَنَم.

ثُمَّ إنَّهُ أتَى الأبرص في صورَتِهِ وَهَيْئتِهِ، فقَالَ: رَجُلٌ مِسْكِينٌ قدِ انقَطعتْ بِيَ الْحِبَالُ فِي سَفَرِي، فَلا بَلاغَ لِيَ الْيَوْمَ إلاّ باللّٰهِ ثُمَّ بِكَ، أَسْأَلُكَ بِالَّذي أَعْطَاكَ اللَّوْنَ الْحَسَنَ، والْجِلْدَ

---

٥ بوخاری(٥٢٢٣)، موسلیم(٢٧٦١).

٦ بوخاری(٣٤٦٤)، موسلیم(٢٩٦٤).

الْحَسَنَ، والْمَالَ، بَعيراً أَتبلَّغُ بِهِ فِي سفَري، فقالَ: الحقُوقُ كَثِيرةٌ. فقال: كَأَنِّي أَعرِفُكَ أَلَمْ تَكُنْ أَبْرص يَقْذُرُكَ النَّاسُ، فَقيراً، فَأَعْطَاكَ اللَّهُ، فقالَ: إِنَّما وَرِثْتُ هَذا المالَ كَابراً عَنْ كابِرٍ، فقالَ: إِنْ كُنْتَ كَاذِباً فَصَيَّركَ اللَّهُ إِلى مَا كُنْتَ.

وأَتَى الأَقْرَع فِي صورتهِ وهيئَتِهِ، فَقالَ لَهُ مِثْلَ ما قَالَ لهذَا، وَرَدَّ عَلَيْه مِثْلَ مَاردَّ هَذَا، فَقَالَ: إِنْ كُنْتَ كَاذِباً فَصَيَّرَكَ اللهُ إِلىَ مَاكُنْتَ.

وأَتَى الأَعْمَى فِي صُورتِهِ وهَيْئَتِه، فقالَ: رَجُلٌ مِسْكِينٌ وابْنُ سَبِيلٍ انْقَطَعَتْ بِيَ الْحِبَالُ فِي سَفَرِي، فَلا بَلاغَ لِيَ اليَوْمَ إلاَّ بِاللَّهِ ثُمَّ بِكَ، أَسْأَلُكَ بالَّذي رَدَّ عَلَيْكَ بصرَكَ شَاةً أَتَبلَّغُ بِهَا فِي سَفَري ؟ فقالَ: قَدْ كُنْتُ أَعْمَى فَرَدَّ اللَّهُ إِلَيَّ بَصرِي، فَخُذْ مَا شِئْتَ وَدعْ مَا شِئْتَ فَوَاللَّهِ ما أَجْهَدُكَ الْيَوْمَ بِشْيءٍ أَخَذْتَهُ للَّهِ عزَّ وجلَّ. فقالَ: أَمْسِكْ مالَكَ فإِنَّمَا ابْتُلِيتُمْ فَقَدْ رضِيَ اللَّهُ عنك، وَسَخِطَ عَلَى صَاحِبَيْكَ) متفقٌ عليه.

(وَالنَّاقةُ الْعُشَرَاءُ) بِضم العينِ وبالمدِّ: هِيَ الحامِلُ. قولُهُ: (أَنْتجَ) وفي روايةٍ: «(فَنَتجَ) معْنَاهُ: تَوَلَّى نِتاجَهَا، والنَّاتجُ للنَّاقةِ كالْقَابِلَةِ لِلْمَرْأَةِ. وقولُهُ: (وَلَّدَ هَذا) هُوَ بِتشْدِيدِ اللام: أَيْ: تَوَلَّى وِلادَتها، وهُوَ بمَعْنَى نَتجَ فِي النَّاقَةِ. فالْمُوَلِّدُ، والناتجُ، والقَابِلَةُ بِمَعْنى، لَكِنْ هَذا لِلْحَيَوانِ وذاكَ لِغَيْرِهِ. وقولُهُ: (انْقَطَعَتْ بِي الحِبالُ) هُوَ بالحاءِ المهملة والباءِ الموحدة: أَي الأَسْبَاب. وقولُه: (لا أَجهَدُكَ) معناهُ: لا أَشقُّ عليْك فِي رَدِّ شَيْءٍ تَأْخُذُهُ أَوْ تَطْلُبُهُ مِنْ مَالِي. وفي رواية البخاري: (لا أَحْمَدُكَ) بالحاءِ المهملة والميم، ومعناهُ: لا أَحْمَدُكَ بِتَرْك شَيْءٍ تَحتاجُ إِلَيْهِ، كما قالُوا: لَيْسَ عَلَى طُولِ الحياةِ نَدَمٌ أَيْ عَلَى فَوَاتِ طُولِهَا.

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: بە گوێچکەی خۆم لەدەمی پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو** (دروودی خوای لەسەر بێ): **سێ کەس لەنەوەی ئیسرائیل واتە: لەبەنی ئیسرائیل: بەڵەکێك و کەچەڵێك و کوێرێك، خودا دەیەوێ تاقیان بکاتەوە، جا فریشتەیێ لەسەر شێوەی پیاوی دەنێرێ بۆلایان، فریشتەکە دەچێتە لای بەڵەکەکەو پێی دەڵێ: زیاتر حەزت لەچییە؟ دەڵێ: حەزم لە ڕەنگ و بۆیەکی جوان و پێستێکی جوانەو ئەم بەڵەکییەشم نەمێنێ، کە بووە بەهۆی ئەوە کە خەڵك قێزو بێزم لێ دەکەنەوە، فریشتەکە دەستێ دەهێنێ بەسەر جەستەیدا ئیتر دەنك چەپەڵیەکەی نامێنێ و ڕەنگ و بۆیەکی جوان و پێستێکی جوانیشی پێ دەدرێ، ئەوجا فریشتەکە پێی دەڵێ: حەزت لە چی جۆرە ماڵێکە؟ پیاوەکە دەڵێ: حەزم لە وشترە یاخود دەڵێ: حەزم لە ڕەشە وڵاخە. ئیسحاق کە یەکێکە لە**

ڕاویەکانی ئەم فەرموودەیە- گومانی لەوەدا بۆ پەیدا بوو کە بەڵەك و کەچەڵەکە کامیان داوای وشترو کامیان داوای ڕەشەوڵاخی کردبوو، فەرمووی: جا وشترە مێیەکی هەراشی ئاووسی لەسەر گوانی دایەو پێی گوت: خودا پیت و فەڕی تێ بخات بۆت. فەرمووی: ئینجا فریشتەکە دەڕوا بۆ لای کەچەڵەکەو پێی دەڵێ: زیاتر حەزت لە چییە؟ دەڵێ: زیاتر حەزم لە قژێکی جوانەو ئەم کەچەڵیەشم نەمێنێ، کە بووە بە هۆی ئەوەی خەڵك قێزو بێزم لێ بکەنەوە، فەرمووی: جا فریشتەکە دەستێ دەهێنێ بەسەری دا، ئیتر کەچەڵیەکەی دەڕواو قژێکی جوانی پێ دەدرێ، ئینجا پێی دەفەرموێ: حەز لە چی جۆرە ماڵێ دەکەی؟ دەڵێ: لە ڕەشەوڵاخ، جا مانگایەکی ئاوسی دەداتێو پێی دەڵێ: خودا پیت و بەرەکەتی تێ بخات بۆت. فەرمووی: ئینجا فریشتەکە دەڕوا بۆلای کوێرەکەو پێی دەفەرموێ: زیاتر حەزت لەچییە؟ دەڵێ: زیاتر حەزم لە دوو چاوی ساغە کە خودا بیان دات پێم تا ئەم خەڵکەیان پێ ببینم، فەرمووی: جا دەستێ دەهێنێ بە چاوەکانیاو خودا چاوەکانی دەداتەوە، جا پێی دەفەرموێ: ئەی حەز لەچی جۆرە سامانێ دەکەی؟ دەڵێ: لەمەڕ، جا مەڕێکی زاوی بەرخ بەبەری دەداتێ، ئیتر بەرەبەرە ئاژەڵەکان زاوزێ دەکەن و ئەوانیش بەرهەمیان دەهێنن، تاوا زۆر دەبن ئەمیان بوو بەخاوەنی پڕ شیوێ وشترو ئەویان بوو بەخاوەنی پڕ دۆڵێ ڕەشەوڵاخ و ئەوی تریشیان بوو بەخاوەنی پڕ شیوێ گەلە ڕان. فەرمووی: لەپاشدا فریشتەکە خۆی لێ گۆڕین و لەسەر شکڵ و شێوەی ئەوسای بەڵەکەکە خۆی هاتەوە بۆ لای و پێی گوت: پیاوێکی هەژاری داماوی ڕێبواری لێ قەوماوم، سەر بەهیچ لایەکا دەرناکەم، سا مەگەر یەکەم بە پشتیوانی خودای گەورەو دووەم بەهۆی یارمەتی تۆوە بگەمەوە شوێن و ڕێی خۆم، جا تۆبیت و ئەو کەسەی کە ئەم شێوە جوانەو ئەم لەشە جوانەو ئەم ماڵە زۆرەی پی داویت وشترێکم بدەرێ، تا لەم سەفەرەمدا خۆمی پێ بگەیەنمە ماڵەوە، کابرا گوتی: خاوەن بەش زۆرن بەر تۆ ناکەوێ! فریشتەکەش فەرمووی: وەك من تۆ بناسم وایە، ئەرێ تۆ ئەو پیاوە بەڵەکە نیت کە خەڵك بێزی لێ دەکردیتەوە، وە ئەو هەژارە نیت کە خودا دەوڵەمەندی کردیت! گوتی: خەیر! من ئەم ماڵ و سامانەم لە باوباپیرانمەوە بۆ بەجێ ماوە، ئەوانیش هەر بووە بوون و پشتاو پشت بەبەگزادەیی هاتونەتە خوارەوە! فریشتەکەش دەڵێ: ئەگەر درۆ دەکەی خودا وەك

جـاری جـارانی خۆتــت لێ بکاتــەوە. فــەرمووی: جـا لــە شـێوەی شـکڵی پێشـووی کەچەڵەکە چوو بۆلای ئەویش، چی بەبە ڵەکەکە گوت دیسان بەمیشی وا گـوت: وە بەڵەکەکــە چــی بــە فریشــتەکە گــوت دیســان کەچــەڵەکەش ئــەوەی پــێ گــوت، فریشتەکەش گوتی: ئەگەر درۆ دەکەی خودا وەك جاری جارانی خۆتت لێ بکاتەوە!. فــەرمووی: جـا لەســەر شـێوەی شـەکڵی پێشـووی کوێرەکەیشـدا هاتــەوە بـۆلای‌و فــەرمووی: پیـاوێکی هـەژاری دامـاوی ڕێبـواری لێ قـەوماوم، سـەر بـە هـیچ لایەکـدا دەرناکـەم، سامەگەر یەکـەم بـە پشـتیوانی خـوداو دووەم بـەهۆی یارمـەتی تـۆوە، بگەیەمەوە شوێن‌و ڕێگەی خۆم، جا تۆ بیت‌و ئـەو خودایـەی کـە چاوەکانتی چـاك کردیتەوە مەڕێکم بدەرێ بەشکوو لـەم سـەفەرەدا پـێی بگەیەمـەوە ماڵـەوە، پیـاوە کوێرەکە دەڵێ: ئـای! منـیش وەك ئێسـتای تـۆ کـوێر بـووم‌و دەزانم کـوێری چـەندە کۆڵـەوارە، وە خـودا چـاوی چـاك کردمــەوە، سـەرەڕای ئەوەیشـە هـەژاریش بـووم‌و دەشزانم هەژاری چەندە ناخۆشە، جـا کەواتـە بـە ئـارەزووی خـۆت چـی دەبـەیت بـۆ خۆت بیبە،وەچی دەهێلیتەوە بۆ من ئارەزوی خۆتە، بـەو خودایـە هەرچـی ئـەمڕۆ تۆ بیبەیت بۆ خۆت لە ڕێگەی خودادا دەست نانێمە ڕێگەت. فریشتەکە گوتی: ماڵی خۆت بۆ خۆت، من فریشتەم هـەوەجێم بـەماڵ نییـە، بەڕاسـتی ڕووداوەکـە ئاوایـە: ئێوە واتە: تۆو بەڵەك‌و کەچەڵەکە، لەلایـەن خـودای گـەورەوە تاقیکرانـەوە، خـودا لەتۆ خۆشنوودو ڕازیە، بەلام لەهەردوو هاوڕێکەت ڕەنجاوەو ناڕازیە(ش).

٦٦/٧–[٧]– عَنْ أبي يَعْلَى شَدَّادِ بْن أَوْسٍ رضي الله عنه عن النبـــي صَــلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسلَّم قال: «الكَيِّس مَنْ دَانَ نَفْسَهُ، وَعَمِلَ لِما بَعْـدَ الْمـوْتِ، وَالْعَـاجِزُ مَـنْ أَتْبَـعَ نَفْسَـه هَواهَا، وتَمَنَّى عَلَى اللّهِ الأماني» رواه التِّرْمِذِيُّ وقالَ حديثٌ حَسَنٌ. قال التِّرْمذيُّ وَغَيْـرُهُ مِنَ الْعُلَمَاءِ: مَعْنَى (دَانَ نَفْسَه): حَاسَبَهَا.

شــەددادی کــوڕی ئــەوس (ڕەزای خـودای لەسـەر بـێ) فــەرمووی: حــەزرەت (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فەرمووی: ژیرو هۆشیار ئەو کەسەیە کە مەحکەمەی خۆی بکا، دانا ئـەو مەردمیـە کە جڵەوی هەواو هـەوەس بۆنـەفس بـەرەڵا نـەکاو نـەفس ترشـی بـی‌و خۆشـی بـێ ڕێگەی چاکەی پێ بگرێ، وە تێ بکۆشێ بۆ ژیانی پاش مردن، وەهەرچی دەکا بـیری

٧ تیرمذي (٢٤٦١).

دوارۆژی بێو بزانێ كه مردن له پێشه، وه خوێڕیو نەكارەیش ئەو لاژگەیه شوێن هەواو هەوەسو ئارەزوی خۆی دەكەوێو كەچی خۆزگەش بەلاش لەخودا داوا دەكاو ئاواتی هیچو پوچ له خودا دەخوازێ(ت/ح/ح).

٦٧/٨-^٨- عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رضيَ اللّهُ عنهُ قال: قالَ رسولُ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: مِنْ حُسْنِ إِسْلامِ الْمَرْءِ تَرْكُهُ مَالاَ يَعْنِيهِ) حديثٌ حسنٌ رواهُ التِّرْمذيُّ وغيرُهُ.

ئەبو هورەیره (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: نیشانەی ئیسلامبوونی مرۆڤ بەشێوەیەكی جوان ئەوەیە كەهەرچی لەمەبەستو ئامانجی ئەوەوە دووره وازی لێ بێنێ (ت:ح/ح).

٦٨/٩-^٩- عَنْ عُمَرَ رضي اللّهُ عنه عَنِ النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلّم قـال: (لا يُسْـأَلُ الرَّجُلُ فِيمَ ضَربَ امْرَأَتَهُ) رواه أبو داود وغيرُه.

عومەر (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لەحەزرەتـەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: لـەپیاو پرسیار ناكرێ كەلەسەر چی له ژنی خۆی داوە(د/تاج). مەبەست ئەوەیـه كـه لەسـەر هـەق لێی بدا دەنا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەو جۆره مێردانه كه ئازاری ژنی خۆیان دەدەن لەسەر شتی هیچو پووچ لەژنی خۆیان دەدەن پیاوی باش نین! (تـاج. باسی (ژن-ئەگەر به تەمێو ئامۆژگاریو جێ لێ جیاكردنـەوە)- عـاری نـەنا ئەوسا لێی دەدرێ).

## ٦- باسی تەقواو ترسی خوداو پارێز له نافەرمانی خودا (باب في التقوى)

قال الله تعالى: ﴿يا ايها الذين آمنوا اتقوا الله حق تقاته﴾آل عمرا/١٠٢.

وقال تعالى: ﴿فاتقوا الله ماموٴستا استطعتم﴾التغابن/١٦. وقـال تعـالى: ﴿يـا ايهـا الذين آمنوا اتقوا الله وقولوا قولا سديدا﴾الأحزاب/٧٠.

والآيات في الأمر التقوى كثيرة معلومة:

مەبەست لـه ئایەتـه پیرۆزەكـان: ئـەی موسـوڵمانینه! ئێـوه خـەڵاتی ئیمانتـان دەردەست كردووه، دەی ئەو خەڵاته گەورەیه ڕێزو قەدری خۆی بدەنێ، تەقوایەكی جوانو ڕێكو پێكی خودا بكەن، له خودا بترسن چەنده دەتوانن كۆتـایی لەتـەقوای

٨ تیرمذي (٢٣١٨)

٩ ئەبوداوود (٢١٤٧).

خودا مەكەن، باوەری تەواو تەقوای ڕاستو دروست بەپێی تەواناو قسەی هەق کردن نیشانەی دامەزراندنی ئیمانە.

ئایەتی تریش لەم بارەیەوە زۆرە وەك:

وقال تعالى: ﴿ومن يتق الله يجعل له مخرجا ويرزقه من حيث لا يحتسب﴾الطلاق/٢-٣. وقال تعالى: ﴿إن تتقوا الله يجعل لكم فرقانا ويكفر عنكم سيئاتكم ويغفر لكم ذنوبكم والله ذو الفضل العظيم﴾الأنفال/٢٩. واتە: هەرکەسێ بەڕاستی لە خودا بترسێو تەقوای بکا خودا لە هەردوو جیهانا دەروی ڕەحمەتی خۆی لێ دەکاتەوەو فریای دەکەوێو رزقی حەلاڵیشی بۆ دەڕەخسێنێ، لە جێگەی واوە ڕزقی بۆ دێت کە خۆی بەخەیاڵیا نەیەت، دوو ترس یەك ناگرن، کەسێ بەڕاستی لە خودا بترسێ خودا لە دوژمنی خۆی جیای دەکاتەوەو لە ئاگری دۆزەخ هێمنی دەکاتەوەو خراپەو نەنگی ڕابردووی دادەپۆشێو لە تاوانو هەڵەو سووچو گوناهی خۆش دەبێ، بۆ خودا چی تێ دەچێ، خەزێنەی فەضلو بەخششی خودا ئەوەندە گەورەیە مەگەر خۆی بزانێ.

١/٦٩-[١] - عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رضي اللَّهُ عنه قال: قِيلَ: يا رسولَ اللَّهِ مَن أَكْرَمُ النَّاسِ ؟ قال: (أَتْقَاهُمْ) فقَالُوا: لَيْسَ عَنْ هَذا نَسْأَلُكَ، قَالَ: (فيُوسُفُ نَبِيُّ اللَّهِ ابن نَبِيِّ اللَّهِ ابن نَبِيِّ اللَّهِ ابنِ خَلِيلِ اللَّهِ). قَالُوا: لَيْسَ عن هَذَا نَسْأَلُكَ، قال: فعَنْ مَعَادِنِ الْعَرَب تسْأَلُونِي ؟ خِيَارُهُمْ في الْجاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ في الإسلامِ إذَا فَقِهُوا) متفقٌ عليه.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: عەرزی پێغەمبەریان کرد (دروودی خوای لەسەر بێ): کێ لە مەردوم زۆر بەڕێزو بەقەدرە؟ فەرمووی: کێ لە هەموویان بەتەقواتربێو پتر لەخودا بترسێ ئەوە. گوتیان: مەبەستمان ئەمە نییە، فەرمووی: دە یووسف کە خۆی پێغەمبەری خودا بووەو کوڕی پێغەمبەری خودایە کە حەزرەتی ئیسحاقەو ئەویش کوری پێغەمبەری خودایە کە حەزرەتی ئیبراهیمە کە نازناوی (خەلییلو الله) یە، واتە: دۆستی خودا. گوتیان: مەبەستمان ئەم مەعنایەش نییە. فەرموی: وادیارە لەبارەی کانگای خانەدانی بنەماڵەکانی عەرەبەوە لێم دەپرسن، ئەوانەیان لەسەردەمی نەزانیدا باش بوون هەر ئەوانەشیان لەسەردەمی ئیسلاما باشن بەمەرجێ شارەزای ئایین بن.(ش).

---

١ بوخاری (٣٣٥٣)، موسلیم(٢٥٢٦).

٧٠/٢-[٢] عَنْ أبي سَعيدِ الْخُدْرِيِّ رضي اللّٰه عنه عن النبـي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (إنَّ الدُّنْيا حُلْوَةٌ خضِرَةٌ، وإنَّ اللّٰهَ مُسْتَخْلِفُكُمْ فِيهَا. فينْظُر كَيْفَ تَعْمَلُـونَ. فـاتَّقوا الـدُّنْيَا واتَّقُوا النِّسَاءِ. فَإنَّ أَوَّلَ فِتْنةِ بَنِي إسْرَائِيلَ كَانَتْ في النسَاء) رواه مسلم.

ئەبو سەعید لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ڕاستە کە ماڵی دنیاو دنیا خۆی میوەیەکی سەوزی دڵگیری، شیرین‌و خۆشە، وەڵێ بەلاش‌و حەلاش نییەو لێپرسینەوەی هەیە، چونکە خودا ئێوەی کردووە بە جێگەداری پێشینان تیایدا، تا بڕوانێ کە کردارو ڕەفتارتان چۆنە، کەواتە پارێز لە دنیا بکەن، هەروەها ئاگاداری خۆتان بکەن لەداوی ژنان، چونکە یەکەم ئاژاوەیێ کە نەوەی ئیسرائیل دووچاری بوون ئەوە بوو کەوتنە بەندی ژنانەوە(م).

٧١/٣-[٣] عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي اللّٰه عنه أَنَّ النبـي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم كَـانَ يَقُـولُ: «اللّٰهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْهُدَى وَالتُّقَى وَالْعفافَ والْغِنَى) رواه مسلم.

ئیبن‌و مەسعوود (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: گەلێ جار حەزرەت ئەم نزایەی دەکرد، دەیفەرموو: اللهم إني أسألك الهدى والتقى العفاف والغنى، خودایە! داوای ڕێنموونیت لێ دەکەم، ڕێگەی ڕاستی خۆتم پێ نیشان بدە، داوای ئەومت لێ دەکەم کە لەترسی تۆ بێ ئاگا نەبم، داوای دەم‌و دەست‌و داوێن پاکییت لێ دەکەم، داوای دارایی باش‌و دەوڵەمەندی دڵ‌و دەروونت لێ دەکەم(م).

٧٢/٤-[٤] عَنْ أبي طَرِيفٍ عدِيِّ بْنِ حاتمِ الطائِيِّ رضي اللّٰه عنه قال: سمعت رسولَ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم يقُولُ: (مَنْ حَلَفَ عَلَى يمِين ثُمَّ رَأَى أتقَى للّٰهِ مِنها فَلْيَأْتِ التَّقْوَى) رواه مسلم.

عەدی کوڕی حاتەمی طائی (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لە حەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەر بێ): کەسێ لەسەر شتێ سوێندی خواردو لەپاشا بۆی دەرکەوت کە بە بارەکەی تردا تەقوای خودای زیاتر تیادایە با سوێندەکەی بخات‌و بارە تەقوادارەکە بکات‌و کەفارەت(برێتی)ی سوێندەکەی بدات(م).

---

٢ موسلیم(٢٧٤٢).

٣ موسلیم(٢٧٢١).

٤ موسلیم (١٦٥١).

٧٣/٥-[٥]- عنْ أبي أُمَامَةَ صُدَيِّ بْنِ عَجْلانَ الْباهِلِيِّ رضي اللّٰهُ عنه قال: سَمِعْتُ رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يَخْطُبُ في حَجَّةِ الْوداع فَقَالَ: (اتَّقُوا اللّٰه، وصَلُّوا خَمْسَكُمْ، وصُومُوا شَهْرَكمْ، وأَدُّوا زكَاةَ أَمْوَالِكُمْ، وَأَطِيعُوا أُمَرَاءَكُمْ، تَدْخُلُوا جَنَّةَ رَبِّكُمْ) رواه التِّرْمذيُّ، في آخر كتابِ الصلاةِ وقال: حديثٌ حسنٌ صحيح.

**ئەبو ئومامە** (رەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: لەحەجی ماڵ ئاوایی (حجة الوداع) داگوێم لێ بوو، پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **وتاری دەدا، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: لە خودا بترسن‌و تەقوای خودا بکەن‌و پێنج نوێژەی خۆتان بکەن‌و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی خۆتان بگرن‌و زەکاتی ماڵی خۆتان بدەن‌و بەگوێی خاوەن فەرمان‌و گەورەی خۆتان بکەن، ئیتر خودا یاربێ بەخێرو خۆشی دەچنە ناو بەهەشتی خودای پەروەردگاری خۆتان (ت:ح/ح/ص).**

## ٧- باسی یەقین‌و پشت بە خودا بەستن (باب في اليقين والتوكل)

**قال الله تعالى: ﴿ولما رأى المؤمنون الأحزاب قالوا هذا ماوعدنا الله ورسوله وصدق الله ورسوله وما زادهم إلا ايمانا وتسليما﴾الأحزاب/٢٢. وقال تعالى: ﴿الذين قال لهم الناس إن الناس قد جمعوا لكم فاخشوهم فزادهم ايمانا وقالوا حسبنا الله ونعم الوكيل، فانقلبوا بنعمة من الله وفضل لم يمسسهم سوء، وإتبعوا رضوان الله، والله ذو فضل عظيم﴾آل عمران/١٧٣-١٧٤. وقال تعالى: ﴿وتوكل على الحي الذي لايموت﴾الفرقان/ ٥٨. وقال تعالى: ﴿وعلى الله فليتوكل المؤمنون﴾إبراهيم/١١. وقال تعالى: ﴿ومن يتوكل على الله فهو حسبه﴾الطلاق/٣. وقال تعالى: ﴿إنما المؤمنون الذين إذا ذكر الله وجلت قلوبهم وإذا تليت عليهم آياته زادتهم إيمانا وعلى ربهم يتوكلون﴾الأنفال/٢.**

**والايات في فضل التوكل كثيرة معلومة:**

**مەبەست‌و واتای ئایەتە پیرۆزەکان بە تێکرایی: لە غەزای خەندەقا کافرەکان گەلەکۆمەیەکی گەورەیان لە موسوڵمانەکان کردبوو، ویستان کە بدەن بەسەریاناو لەناو شاری مەدینەدا بنەبڕیان بکەن، جا کە هاتنە سەریان‌و چوار دەوریان گرتن‌و موسوڵمانەکان بەچاوی خۆیان ئەم حاڵەیان دی‌و بەگوێی خۆیان هەڕەشەو**

---

٥ تيرمذي (٦١٦).

گورِەشەی دوشمنیان بینی، کە بەو پەڕی پشتەسوورییەوە بە موسوڵمانەکانیان دەگوت: بۆ کوێ دەردەچن لەچنگمان، ئێوە ڕێوی ناو کون‌و ئێمە ڕاوچی ئامادە، بە چەك‌و توولەو تانجیەوە هاتوینەتە سەرتان، زوو یا درەنگ گۆشاو گۆش سەرتان دەبڕین‌و پێستتان کەوڵ دەکەین!

ئادەمیزاد لەم هەڵوێستە ناسك‌و شلۆقەدا موسوڵمانەکان وەك وەك شێری نەڕی مەیدان سنگیان داکوتاو چاویان نەشکاو پتر ورەیان بەرز بوو، چونکە پشتەسوور بوون لە یاریدەی خودا بەدڵێکی ساف، بە زمانێکی پاراو، وەڵامی دوژمنانیان بەم فەرمایشتە شیرینە دایەوە، کە لە هەمان کاتدا نوێ کردنەوەی پەیمان‌و گفتی خۆیانە لەگەڵ خوداو پێغەمبەری خۆیانا، فەرموویان: ئەمە ئەو ڕۆژە گەورەو پیرۆزەیە کە ئێمە بەتەمای بووین، لەسەر بەڵێن‌و گفتی خوداو پێغەمبەری، ئەمە ئیمتیحان‌و تاقیکردنەوەیە، باوەڕو متمانەمان بەقسەی خوداو پێغەمبەر هەیە، فەرموودەیان راست‌و درووستە سەرکەوتن بۆ ئێمەیەو ژێرکەوتن بۆ دوژمنی لەخۆ بایی بووە. ئیتر ئابەم باوەڕە پتەوە دەم بەدەم ورەیان بەرزتر دەبوو، باوەڕیان قایم تر دەبوو، پتر خۆیان دەدایە دەست خوداو لەپێناو یاریدەی دینی ئەوا گیانی شیرینی خۆیان لەسەر پێیان دانابوو، یاریان پێ دەکرد، زمانی حاڵیان دەیفەرموو: چەن خۆش‌و بەنرخە ژیانی تێکۆشەرێ، کە پێیەکی لە قەراغی زەوی بێ‌و ئەو پێیەکەی تری لە دەرگای بەهەشت! های خوێن! بەڕەزای خودا، بەمیوەی بەهەشت، بەدووعای خێری موحەممەد، بە شوکرو سوپاسی سەرجەمی میللەتی ئیسلام!!

سەرەنجام، خودا هات بە هاواریانەوەو بەلەشکری غەیبی خودایی دوژمن شکاو بەپەلە پرووزە هەڵهاتن‌و مەدینەی نازدار گەشایەوە وەك گوڵی بەهار. لەپاش غەزای ئوحودیش، لەساڵی داهاتوودا پێشەنگ‌و قەرەوڵیان نارد کە بچن دڵی موسوڵمانەکان سارد بکەنەوەو بیان ترسێنن‌و ئەوانیش چوون‌و گوتیان سوپایەکی گەورە کۆبوونەتەوەو دەیانەوێ بدەن بەسەرتانا، کەوایە دەرمەچن‌ومەڕۆن بۆ شەڕ لەگەڵیاناو شەڕی خۆترێن مەکەن‌و خەمی خۆتان هەبێ، کەچی ئەوان ئەو قسانە ئەوەندەی تر ئیمان‌و باوەڕی پتەوتر کردن‌و گوتیان ئێمە خودامان بەسە، خودا چاکترین پشت‌و پەنامانە. ئیتر خودا خۆشیی تێ خستن‌و بێوەیی کردن‌و نازو بەهرەی دانێ‌و ڕەزامەندی خۆشی پێ بەخشین.

دەی دەبێ موسوڵمانی هۆشیار هەمیشە پشت ببەستێ بەیاریدەی خودای خۆی، چونکە خودا زیندووی نەمرەو کەس باڵا دەستی نییەو چی بوێ دەیکا، بەڵام نابێ دوای خەیاڵ پڵاو بکەوێ، دەشێ هۆی سەرکەوتن، مایەی ژیانی بەرێز، چەكو تفاقی پێویست هەمووی ئامادە بکا، دوای ئەوەی ئەسبابی عەزمی ساز کرد، ئەوسا عەزم جەزم بکاو دەست بە کاربکاو پشت بە لوتفی خودا ببەستێو باوەڕی وابێ کە فاعیلی خەقیقی هەر خودایەو کۆششو تفاق خستن عەمەل بە ظاهیرە، دەشێ ئەوەش بزانی کە بەقسەی رووت هیچ بەهیچ نابێ، موسوڵمان ئەو موسوڵمانەیە لەباسی خوداو قەبرو قیامەتو حیسابو کیتاب بترسێو دڵی ڕابچڵەکێو بەدەوری قورئانو بەبیستنی فەرموودەی حەزرەت دڵی ناسك ببێتەوەو گریانی بێو باوەڕی قایمتر بێ، جا لەهەلو مەرجی ئاوادا هەرموسوڵمانی بەڕاستی پشت بە لوتفی خودا ببەستێ مسۆگەر خودای بەسە! ئەوەی خودای کەسە، خودای بەسە.

دیارە لەم بابەتەوە ئایەتی تر گەلێ زۆرە.

١/٧٤-١ – عَن ابْن عَبَّاسٍ رضي اللَّهُ عنهما قال: قال رسولُ اللَّه صلى اللَّه عليه وآله وسلم: (عُرِضَت عليَّ الأمَمُ، فَرَأَيْت النبي وَمعَه الرُّهيْطُ والنبي ومَعهُ الرَّجُل وَالرَّجُلانِ، وَالنبي ولَيْسَ مَعهُ أحدٌ إذ رُفِعَ لِي سوادٌ عظيمٌ فظننتُ أَنَّهُمْ أُمَّتِي، فَقِيلَ لِي: هذا موسى وقومه ولكن انظر إلى الأفق فإذا سواد عظيم فقيل لى انظر إلى الأفق الآخر فإذا سواد عظيم فقيل لي: هَذه أُمَّتُكَ، ومعَهُمْ سبْعُونَ أَلْفاً يَدْخُلُونَ الْجَنَّة بِغَيْر حِسَابٍ ولا عَذَابٍ) ثُمَّ نَهَض فَدَخَلَ منْزِلَهُ، فَخَاضَ النَّاسُ فِي أُولَئِكَ الَّذينَ يدْخُلُون الْجَنَّةَ بِغَيْرِ حسابٍ وَلا عذابٍ، فَقَالَ بعْضهُمْ: فَلَعَلَّهُمْ الَّذينَ صَحِبُوا رسول اللَّه صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، وقَال بعْضهُم: فلعَلَّهُمْ الَّذينَ وُلِدُوا في الإسْلام، فَلَمْ يُشْرِكُوا باللَّه شيئاً وذَكَروا أشْياء فَخرجَ عَلَيْهمْ رسول اللَّه صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم فَقَالَ: (مَا الَّذي تَخُوضُونَ فِيهِ ؟) فَأخْبَرُوهُ فَقَالَ: (هُمْ الَّذِينَ لا يرقُونَ، وَلا يَسْتَرْقُونَ، وَلاَ يَتَطيَّرُون، وَعَلَى ربِّهِمْ يتوكَّلُونَ) فقَامَ عُكَّاشَةُ بنُ مُحْصِنٍ فقَالَ: ادْعُ اللَّه أنْ يجْعَلَنِي مِنهُمْ، فَقَالَ: (أَنت مِنهُمْ) ثُمَّ قَام رَجُلٌ آخَرُ فَقَالَ: ادْعُ اللَّه أنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ فقال: ((سَبَقَكَ بِهَا عُكَّاشَةُ) متفقٌ عليه.

(الرُّهَيْطُ بِضمِّ الرَّاء: تَصغيرِ رَهْط، وهُم دُونَ عشرةِ أنْفس. (والأفُقُ): النَّاحِيةُ والْجانِب. (وعُكاشَةُ) بِضَمِّ الْعيْن وتَشْديد الْكافِ وبِتَخْفيفها، والتَّشْديدُ أفْصحُ.

١ بوخاری (٥٧٠٥)، موسلیم (٢٢٠).

**ئیبنو عەبباس** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: لەخەوما، لەخوداوە نەتەوەکانم پی نیشان دراو نەتەوە نەتەوە ڕایان نواندن بۆم، کە تەماشام کرد پێغەمبەری وا هەبوو کە ڕەت دەبوو بەبەردەمما تاقە یەك پیاوی لەگەڵ بوو، وەهەموو ئوممەتەکەی بریتی بوو لەو تاقە زەلامە! پێغەمبەری واش هەبوو تاقە دوو پیاوی لەگەڵدا بوو، پێغەمبەری واش هەبوو کەسی لەگەڵدا نەبوو، بەڵام لەپڕ تارمای‌و ڕەشایی عەشامەتێکی گەلێ زۆرم دی تا چاو بڕکا ئاسۆیان داپۆشیبوو،هیوام وابوو کە ئەوانە ئوممەتی من بن، بەڵام گوترا پێم: ئەمانە مووساو گەلی مووسان، ئینجا پێم گوترا: تەماشاکە، کەتەماشام کرد تارمایی عەشامەتێکی زۆر هەتا چاو حوکم بکا ئاسۆی داگرتبوو، دیسان پێم گوترا: تەماشای لای ڕاست‌و لای چەپیشت بکە، جا کە تەماشام کرد تارمایی عەشامەتێکی گەلێ گەلێ زۆر ئاسۆی داگرتبوو، جا پێم گوترا: ئەمە نەتەوە(ئوممەت)ی تۆن، حەفتا هەزار کەسیان لەگەڵدایە بەبێ لێپرسینەوەو سزادان دەچنە بەهەشت، ئەوجا حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **هەڵساو چووەوە بۆ ماڵەوە، لەپێش ئەوەدا کە باسی ئەوانەیان بۆ بکا کە ئەو حەفتا هەزارە کێن‌و چ کارەن، یارانی پێغەمبەریش (دروودی خودا لەسەر خۆی‌و ڕەزای خودای لەسەر یارانی بێ ) لەناو خۆیانا دەستیان کرد بە مقۆمقۆو هەندێکیان گوتیان: ڕەنگ بێ ئەمانە بن کە بوون بەهاوڕێی پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **هەندێکی تریان فەرموویان: ئێمە هەرچەندە باوەڕمان هێناوە بە خوداو بەپێغەمبەری خودا بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئێمە لەسەردەمی فرە خودایی (شرك)دا لەدایك بووین، ڕەنگە ئەوانە ئێمە نەبین، بەڵکوو ئەوانە لە نەتەوەی ئێمە دەبن! کە لەسەردەمی ئیسلامەتیدا لەدایك دەبن‌و هاوبەشی بۆ خودا پەیدا ناکەن، وەگەڵ شتی لەم بابەتانەیان ناو هەڵدا، جا حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **هات بەسەریاندا فەرمووی: ئەوە وت‌و وێژی چیتانە؟ ئەوانیش باسەکەیان عەرزی کرد، فەرمووی: ئەوانەکەسانێکن نە نووشتە دەکەن بۆ کەسێکی ترو نە نووشتەش بۆ خۆیان لەلای یەکێکی تر دەکەن، وە نوقڵانەی خراپ لێنادەن لەبەر نەخۆشین جەستەی خۆیان ئاگر داخ ناکەن، بەڵکوو هەمیشە بۆ جێ بەجێ بوونی کارو فرمانی خۆیان پشت بەلوتف‌و کەرەمی خودای خۆیان دەبەستن‌و بەس (واتە: مەرحەلەی تەوەسسول بە ئەسبابیان طەی کردووە-**

وەرگێڕ). جا عوککاشەی کوری میحصەن هەڵسایە سەرپاو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەخودا داوا بکە بۆم کە بمکات بە یەکێ لەوانە، فەرمووی: تۆ لەوانەیت. لە پاشدا پیاوێکی تریش هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا بۆ منیش داوا لە خودا بکە، فەرمووی: عوککاشە دەستپێشکەری لێ کردیو بۆ خۆی بردی!(ش/تاج).

٢/٧٥-[٢]- عَنْ ابْنِ عبَّاس رضي اللّٰه عنهما أيْضاً أَنَّ رسولَ اللّٰهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم كانَ يقُولُ: «اللَّهُم لَكَ أسْلَمْتُ وبِكَ آمنتُ، وعليكَ توَكَّلْتُ، وإلَيكَ أنَبْتُ، وبكَ خاصَمْتُ. اللَّهمَّ أعُوذُ بِعزَّتِكَ، لا إلَه إلاَّ أنْتَ أنْ تُضِلَّنِي أنْت الْحيُّ الَّذي لا تَموتُ، وَالْجِنُّ وَالإنْسُ يمُوتُونَ» متفقٌ عليه. وَهَذا لَفْظُ مُسْلِمٍ وَاخْتَصرهُ الْبُخَارِيُّ.

دیسان لە ئیبنو عەبباسەوە (رەزای خودایان لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دەستووری وابوو دەیفەرموو: خودایە! خۆم سپارد بە تۆو ملکەچی فەرمانی تۆم، بڕوام هەیە بەتۆ، پشتم بەستووە بە تۆ، خۆم خستە بەختی تۆو خۆم فڕێدایە ئاستانەی تۆ، وە بە پشتی تۆ دەچم بەگژ ناحەزماو تۆ دەکەم بەگژیا، خودایە! پەنا دەگرم بەگەورەیی تۆ، خودای تر نییە تۆ نەبێ، پەنا دەگرم بەتۆ لەوەی قارم لێ بگریو لە ڕێ دەرم کەیو گومڕام بکەی، تۆ مایەی بوونو ژیانو مانی هەموو شتێکی، چونکە هەر خۆت زیندووی نەمریت، جنۆکەو مرۆڤ لەم لایەنەوە بێ دەسەڵاتن چونکە ئەوان دەمرنو گیای مردنن(م/ب).

٣/٧٦-[٣]- عن ابْنِ عَبَّاسٍ رضي اللّٰه عنهما أيضاً قال: «حسْبُنَا اللّٰهُ ونِعْمَ الْوكِيلُ قَالَهَا إبْراهِيمُ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم حينَ أُلْقِيَ في النَّار، وَقالَها مُحمَّدٌ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم حِينَ قَالُوا: «إنَّ النَّاسَ قَدْ جَمعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إيماناً وقَالُوا: حَسْبُنَا اللّٰهُ وَنِعْمَ الْوكِيلُ) رواه البخاري.

وفي رواية له عن ابْنِ عَبَّاسٍ رضي اللّٰه عنهما قال: (كَانَ آخِرَ قَوْل إبْراهِيمَ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم حِينَ أُلْقِيَ فِي النَّارِ (حَسْبِيَ اللّٰهُ وَنِعمَ الْوَكِيلُ).

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لەسەر بێ) فەرمووی: ئەو کاتە کە ئیبراهیم فڕێدرایە ناو مەنجەنیقەکەوە فەرمووی: حسبنا الله ونعم الوكيل: خودامان بەسەو خودا باشترین

---

٢ بوخاری(٧٣٨٣)، موسلیم(٢٧١٧).

٣ بوخاری (٤٥٦٣).

پشــتو پەنايــە! وە موحەممــەديش هــەرواى فــەرموو ئەوكاتــەى كــە پێشــەنگو سـيخوڕى دوژمـن بـۆ دڵ ساردكردنەوەى موسـوڵمانان دەيـان گـوت: ﴿إن النـاس قـد جمعـوا لكـم فإخشـوهم فـزادهم إيمانــا وقــالوا حسـبنا الله ونعــم الوكيــل﴾(ب) لەگێڕانەوەيـەكى تـرى بوخاريـدا: ئـيبنو عـەبباس (ڕەزاى خودايان لەسەر بێ) فـەرمووى: كاتـێ حەزرەتى ئيبراهيم (سەلامى خوداى لەسەر بێ) فڕێ درايە ناو مەنجەنيقەكەوە دوا وتەو فەرمايشتى ئەوە بوو فەرمووى:حسبى الله ونعـم الوكيـل: خـودام بەسـە، كـارم بەكەسى تر نييە باشترين پشتو پەنام هەر خودايەو بەس. بەندەيش كە وەرگێڕى ئەم نامە پيرۆزەيەم كە دانراوى وا نايـابو چاك مەگـەر بـە دەگمـەن هـەڵ بكـەوێ بەنــدەش لــەم ڕۆژى ســەخڵەتو مەينەتــەدا، لــەم كــاتى شــەپۆلى بــێ دينــىو بــێ ڕەوشتييەدا، دەڵێمو دەڵێمەوە: حسبنا الله ونعم الوكيل، على الله توكلنا.

٤/ ٧٧–٤– عَن أبي هُرَيْرةَ رضي اللّٰه عنه عن النبـي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَـلّم يَـدْخُلُ الْجَنَّةَ أقْوَامٌ أفْئِدتُهُمْ مِثْلُ أفئدة الطَّيْرِ) رواه مسلم. قيل معْنَاهُ مُتوكّلُـون، وقِيـلَ قُلُـوبُهُمْ رقِيقةٌ.

ئەبو هورەيرە (ڕەزاى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: حەزرەت (درودى خواى لەسەر بێ) فـەرمووى: گـەلێ كەس دەچنە بەهەشتەوە، لە هۆى ئەوەوە دڵو دەرونيان وەك دڵو دەروونى باڵندە وايە(م).

ئەوەوى (ڕەزاى خوداى لەسەر بێ) دەفەرموێ: لەسەر فەرمايشتێ مەعناى وايە: كە پشتيان بە خوداى خۆيان بەستووە، وەك مەلو مۆر، لەسەر فەرمايشتێكى تر مەعناى وايە: دڵ نەرمو نەرمو نيانن!

٥/٧٨–٥– عنْ جَابِرِ رضي اللّٰهُ عنه أنَّهُ غزَا مَعَ النبـي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وسَـلّم قِبَـلَ نَجْدٍ فَلَمَّا قَفَل رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم قَفَل مَعهُمْ، فأدْركتْهُمُ الْقائِلَةُ في وادٍ كَثِيرِ الْعضَاهِ، فَنَزَلَ رسولُ اللّٰهِ صَلّي اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم، وتَفرَّقَ النَّاسُ يسْتظلّونَ بالشـجر، ونَـزَلَ رسولُ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم تَحْتَ سَمُرَةٍ، فَعلَّقَ بِهَا سيْفَه، ونِمْنَا نوْمةً، فإذا رسولُ اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم يدْعونَا، وإذَا عِنْدَهُ أعْرابِيٌّ فقَالَ: (إنَّ هَذَا اخْتَرطَ عَلَيَّ سـيْفي وأنَـا نَائِمٌ، فاسْتيقَظتُ وَهُو في يدِهِ صَلْتاً، قالَ: مَنْ يَمْنَعُكَ منِّي ؟ قُلْتُ: اللّٰه ثَلاثاً) وَلَـمْ يُعاقِبْـهُ وَجَلَسَ. متفقٌ عليه.

---

٤ موسليم (٢٨٤٠).

٥ بوخارى (٢٩١٠)، موسليم(٨٤٣)

وفي رواية: قَالَ جابِرٌ: كُنَّا مع رسول اللّهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم بذاتِ الرِّقاعِ، فإذَا أتينا على شَجرةٍ ظليلة تركْنَاهَا لرسول اللّه صَلّي اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم، فَجاء رجُلٌ من الْمُشْرِكِين، وسيف رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم مُعَلّقٌ بالشَّجرةِ، فاخترطهُ فقال: تَخَافُنِي ؟ قَالَ: (لا) قَالَ: فمَنْ يمْنَعُكَ مِنِّي ؟ قال: «اللّه».

وفي رواية أبي بكرِ الإسماعيلي في صحيحِهِ: قال منْ يمْنعُكَ مِنِّي ؟ قَالَ: (اللّهُ) قال: فسقَطَ السَّيْفُ مِنْ يدِهِ، فأخذ رسَول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم السَّيْفَ فَقال: (منْ يمنعُك مِنِّي ؟) فَقال: كُن خَيْرَ آخِذٍ، فَقَالَ: (تَشهدُ أنْ لا إِلَه إلا اللّهُ، وأنّي رسولُ اللّه ؟) قال: لا، ولكِنِّي أعاهِدُك أن لا أقَاتِلَكَ، ولا أكُونَ مع قوم يقاتلونك، فَخلّى سبِيلهُ، فَأتى أصحابَه فقَالَ: جِئتكُمْ مِنْ عِنْدِ خيرِ النَّاسِ.

**جابير** (رەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: لەخزمەتی حەزرەت خۆیدا** (درودی خوای لەسەر بێ) **چووین بۆ غەزایێ، بۆلای نەجد، کە پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **گەڕایەوە منیش لەگەڵیا گەڕامەوە، لە قرچەی گەرمەی نیوەڕۆدا گەیشتینە شیوێ پڕ بوو لە درەختە دڕکاویەکانی بیابانەکان، پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **لای دا بۆ وچان، مەردومەکەش بڵاو بوونەوەو هەرکەسێ پەنای بردە بەر سێبەری دارێ. پێغەمبەریش** (درودی خوای لەسەر بێ) **لەبن دار سەموورەیەکا دابەزیو شمشێرەکەی پیا هەڵواسیو هەموو خەوتین، لەناکاو پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **بانگی کردین، کەڕوانیمان وا عەرەبێکی دەشتەکی لەلادایە، فەرمووی: نوستبووم، ئەم کابرایە شیرەکەی خۆمی لێ هەڵکێشابووم، کە خەبەرم بووەوە بەرووتی بەدەستیەوە بوو، دەیگوت: کێ رزگات دەکا لەدەستم؟ منیش سێ جار گوتم: خودا. ئیتر پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **تۆڵەی لێ نەسەندو دانیشت (ش). لە گێڕانەوەیەکا: جابیر فەرمووی: لەغەزای زاتولریقاعا لەخزمەتی پێغەمبەردا** (درودی خوای لەسەر بێ) **بووین، ئەگەر درەختێکی سێبەرداری سێبەر خۆشمان دەست بکەوتایە بەجێمان دەهێشت بۆ جێگە پشووی حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ). **پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **لەبن شێخەڵێکا نووستبوو، شمشێرەکەی بە درەختەکەوە هەڵواسرابوو، کابرایەکی بتپەرست هاتبوو شمشێرەکەی داگرتبو، وە هەڵیکێشابوو لە حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **وەدەڵێ پێی: لێم دەترسیت؟ دەفەرموێ: (نەء) دەڵێ: ئەی کێ قوتارت دەکا لەدەستم؟ دەفەرموێ: خودا! ئیتر شیرەکە لەدەستی کابرا دەکەوێتە خوارەوە، پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ)

شمشێرەکە هەڵدەگریو دەفەرموێ: ئەی کێ تۆ قوتار دەکا لە چنگم. دەڵێ: پیاوی باش بە لێم ببوورە. دەفەرموێ: ئایا شایەتی دەدەی کە هیچ خودایە نییە جگە لە یەزدانی پاك وەمنیش پێغەمبەری خودام؟ دەڵێ: نەء، وەلێ مەرج بێ پەیمانت دەدەمێ کە شەڕ ناکەم لەگەڵتا، وە لەگەڵ ئەو کەسەیش نەبم کە دەجەنگێ لەگەڵ سوپای تۆدا. حەزرەت (درووودی خوای لەسەر بێ) بەرەڵلای کردو ڕۆیشتو چووەوە بۆلای هاوڕێکانی پێی گوتن: لەلای باشترین کەسەوە هاتوم بۆ لای ئێوە.

٧٩/٦-[٦]- عنْ عمرَ رضيَ اللّهُ عنه قال: سمعْتُ رسولَ اللّه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يقُولُ: (لَوْ أنَّكم تتوكَّلونَ على اللّهِ حقَّ تَوكّلِهِ لرزَقكُم كَما يرزُقُ الطَّيرَ، تَغْدُو خِماصاً وترُوحُ بِطَاناً) رواه الترمذي، وقال: حديثٌ حسنٌ.

عومەر (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەگەر ئێوە بەڕاستی پشت بەخودا ببەستن، بەڵام پشت بەستنێکی بەراستی تەواو، ئەوا خودا وەك چۆن رزقو رۆزی مەلو باڵندەکان دەدا بەرێكو پێکی، ئاوا رزقو رۆزی ئێوەیش دەدا، ئەوەتانێ ئەو مەلو باڵندانە سەر لەبەیانەکی بەسکی چۆڵو برسی لەلانەو جێگەی خۆیان دەردەچن، بەبێ ئەوە توێشەبەرەیەکیان پێ بێ، یا عەمارێکیان هەبێ، کەچی سەر لە ئێوارێ بە تێرو تەسەلیو بە جیقڵدانەیەکی پڕەوە دەگەڕێنەوە (ت:ح/ح).

٨٠/٧-[٧]- عن أبي عِمَارةَ الْبراءِ بْنِ عازِبٍ رضي اللّه عنهما قال: قال رسولُ اللّه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (يا فُلان إذا أَويْتَ إِلَى فِرَاشِكَ فَقُل: اللّهمَّ أسْلَمْتُ نفسي إلَيْكَ، ووجَّهْتُ وجْهِي إلَيْكَ، وفَوَّضْتُ أمري إلَيْكَ، وألْجأْتُ ظهْرِي إلَيْكَ. رغْبَة ورهْبةً إلَيْكَ، لا ملجأَ ولا منْجى مِنْكَ إلاّ إلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذي أنْزَلْتَ، وبنبيِّك الَّذي أرْسلتَ، فَإنَّكَ إنْ مِتَّ مِنْ لَيْلَتِكَ مِتَّ عَلَى الْفِطْرَةِ، وإنْ أصْبحْتَ أصَبْتَ خيْراً) متفقٌ عليه.

وفي رواية في الصَّحيحين عن الْبرَاء قال: قال لي رسول اللّه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (إذَا أتَيْتَ مضجعَكَ فَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ للصَّلاَةِ، ثُمَّ اضْطَجِعْ عَلَى شِقِّكَ الأيْمَنِ وقُلْ: وذَكَر نَحْوَه ثُمَّ قَالَ وَاجْعَلْهُنَّ آخرَ ما تَقُولُ).

---

٦ تیرمذي (٢٣٤٥)

٧ بوخاری(٦٣١٣)، موسلیم (٢٧١٠).

بەڕائی کوڕی عازیب (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی فیسار! کاتی دەچیتە سەر نوێنی نووستن بڵێ: اللهم اسلمت نفسي إليك ووجهت وجهي إليك، وفوضت أمري إليك، وألجأت ظهري إلي، رغبة ورهبة إليك، لا ملجأ ولا منجا منك إلا إليك، آمنت بكتابك الذين أنزلت، وبنبيك الذي أرسلت: ئەی پەروەردگارم! خۆمم سپارد بە تۆو ملکەچی فەرمانی تۆم، وە رووم کردە قاپی ڕەحمەتی تۆ، خۆم خستە بەختی تۆ. کاری خۆمم دایە دەستی تۆ، پەنام هێنا بۆ بارەگای مەرحەمەتی تۆ، هەر خۆت پشتو پەنامی، راو بەخت خۆم فڕە دایە ئاستانەی تۆ، چاوی ئومێدم لە دەرگای میهری تۆیە لەترسی قارو بێ باکیشت دڵم دەلەرزێ، پەناو پاسار نییە لە سزاو قاری تۆ مەگەر لای خۆت، پەنا دەگرم بە خۆت لەخۆت، باوەڕم هەیە بەو نامەیە کە ناردوتە بۆ موحەممەدو، بڕوام هەیە بە پێغەمبەرەکەی تۆ کە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلایە، جا ئەگەر دنیا بوو لەو شەوەی ئەمەی تیا دەڵێیت بمری ئەوا لەسەر ئیمان دەمری، ئەگەر کەوتیتە ڕۆژیش ئەوا خێر دێت بە پیرتەوە (ش) لە گێڕانەوەیەکی صەحیحەیندا لە بەڕائەوە فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: کاتی دەچیتە سەر جێی خەوتن، دەستنوێژێ بگرە بە تێرو تەسەلی ئەوجا لەسەر لای ڕاستت ڕابکشێو بڵێ: اللهم اسلمت...تاد. ئینجا فەرمووی: با ئەم دووعایە دوا قسەت بێو لەدوا ئەوە قسەی دنیایی مەکە.

٨١/٨- ^٨^- عنْ أبي بَكْرٍ الصِّدِّيق رضي اللَّه عنه عبدِ اللَّه بنِ عثمانَ بنِ عامِرِ بنِ عُمَرَ ابن كعب بن سعد بْنِ تَيْمِ بْنِ مُرَّةَ بْنِ كَعْبِ بْن لُؤيِّ بْنِ غَالِبٍ الْقُرَشِيِّ التَّيْمِيِّ رضي اللَّه عنه وهُو وأَبُوهُ وَأُمُّهُ صحابَةٌ، رضي اللَّه عنهم قال: نظرتُ إلى أقْدَامِ الْمُشْرِكِينَ ونَحنُ في الْغَارِ وهُمْ علَى رؤوسنا فقلتُ: يا رسولَ اللَّهِ لَوْ أَنَّ أحَدَهمْ نَظَرَ تَحتَ قَدميْهِ لأبصرَنا فقال: (مَا ظَنُّك يا أبا بكرٍ باثْنَينِ اللَّهُ ثالِثُهما) متفقٌ عليه.

ئەبو بەکری صەدیق (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: منو حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لەناو ئەشکەوتەکەدا بووین، لە کێوی ئەور، کە تەماشام کرد قاچی هاوبەش پەیداکەرەکانم دی، بەسەر سەرمانەوە وەستا بوون، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆ ئەگەر یەکێکیان تەماشای ژێر پێی خۆی بکا دەمان بینێو پێمان دەزانن.

٨ بوخاری (٤٦٦٣)، موسلیم(٢٣٨١).

فەرمووی: ئەی ئەبو بەکر! ئەوە تۆ گومانت چۆنە بەو دوو کەسەی کە منو تۆین، کە خودای گەورە خۆی کەسی سێیەمیانەو بە چاوی رەحمەت ئاگای لێیانە! (ش).

٨٢/٩- ٩- عَنْ أُمِّ المُؤمِنِينَ أُمِّ سلَمَةَ، واسْمُهَا هِنْدُ بنْتُ أبي أُمَيَّةَ حُذَيْفَةَ المخزومية رضي اللّٰهُ عنها أن النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم كانَ إذَا خَرجَ مِنْ بيْتِهِ قالَ: (بسم اللّٰهِ، توكّلْتُ عَلَى اللّٰهِ، اللّٰهُمَّ إنّي أعوذُ بِكَ أنْ أَضِلَّ أو أُضَلَّ، أَوْ أَزِلَّ أوْ أُزلَّ، أوْ أظلِـمَ أوْ أُظلَـم، أوْ أَجْهَـلَ أو يُجهَـلَ عَلَـيَّ) حـديثٌ صـحيحٌ رواه أبـو داود والتِّرمـذيُّ وَغيْرُهُمَـا بِأسـانِيدَ صحيحةٍ. قالَ التِّرْمذي: حديثٌ حسنٌ صحيحٌ، وهذا لَفظُ أبي داودَ.

دایکی موسوڵمانان، هاوسەری پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ئوممو سەلەمە (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) کە لە ماڵ دەردەچوو دەیفەرموو: بسم الله..هەتا. ..يجهل علی. واتە: بەناوی خودا، بەپشتی خودا، ئەی خودایە! پەنا دەگرم بە پەنای تۆ لەوەی کە خودا نەخواستە خۆم لەرێ دەربچم، یا کەسێ لەرێ دەربکەم، یا تووشی هەڵەیێ ببەمو پێ خلیسکەیێ بکەم یا کەسێکی تر توشی هەڵەو هەڵخلیسکان بکەم، یا زۆرو ستەمیبکەم لە شتێ، یا کەسێ زۆرو ستەمم لێ بکا، یاخود ناپیاوی لەکەسێ بکەین یا کەسێ ناپیاویو نامەردیمان لێ بکا(د/ت-ح/ح/ص).

٨٣/١٠- ١٠ - عنْ أنسٍ رضيَ اللّٰهُ عنه قال: قال: رسولُ اللّٰهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (مَنْ قَالَ يعنِي إذا خَرَج مِنْ بيْتِهِ: بِسْم اللّٰهِ توكَّلْتُ عَلَى اللّٰهِ، ولا حوْلَ ولا قُوةَ إلاَّ بِاللّٰهِ، يقالُ لهُ هُديتَ وَكُفِيت ووُقِيتَ، وتنحَّى عنه الشَّـيْطَانُ) رواه أبـو داودَ والترمـذيُّ، والنِّسـائِيُّ وغيرُهم: وقال الترمذيُّ: حديثٌ حسنٌ، زاد أبو داود: (فيقول: يعْنِي الشَّـيْطَانَ لِشَـيْطانٍ آخر: كَيْفَ لكَ بِرجُلٍ قَدْ هُدِيَ وَكُفِي وَوُقِي»؟.

ئەنەس (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ ئەو دەمەی لەماڵ دەردەچێ بڵێ: بسم الله، توكلت على الله لاحول ولا قوة الا بالله: بە پیرۆزی ناوی خودا لەماڵ دەردەچم بەپشتی خودا، هێزو تەوانایی هەر بەدەستی خودا خۆیەتیو بەس. فەرموی (درودی خوای لەسەر بێ): ئەو حەلە فریشتە پێی

٩ ئەبو داوود (٥٠٩٤)، تیرمذي (٣٤٢٣).

١٠ ئەبو داوود (٥٠٥٩)، تیرمذي (٣٤٢٢).

دەڵێن: (هديت وكفيت ووقيت): هيدايەت درايتو كيفايەت كرايتو پارێزرايت، ئيتر شەيتان لێی دوور دەكەوێتەوە (د/ت/ن:ح/ح)ئەبو داوود ئەمەی پترە: جا شەيتانێ دەچێ بۆی، شەيتانێكی تريش پێی دەڵێ: ئەم پياوە هيدايەت دراوەو بێ نياز كراوەو پارێزراوە، ئيتر دەتوانی چی لێ بكەی. واتە: تازووە لەكۆڵی بەرەوە.

١١/٨٤-[١١]- وَعنْ أنَسٍ رضي اللَّهُ عنه قال: كَان أخوانِ عَلَى عهْدِ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم، وكَانَ أَحدُهُما يأْتِي النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّمَ، والآخَرُ يحْترِفُ، فَشَكَا الْمُحْتَرِفُ أخَاهُ للنبيِّ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم فقال: (لَعلّكَ تُرْزَقُ بِهِ) رواه التِّرْمذيُّ بإسناد صحيح على شرط مسلمٍ. (يحْرِفُ): يكْتَسِب ويَتَسبَّبُ.

ئەنەس (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێ) دوو برا هەبوون، يەكێكيان دەهات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ئەوی تريشيان كارو كەسابەتی دەكرد، ئيشكەرەكەيان لەلای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) سكاڵای لە براكەی كرد، كە گوايە ئيشو كارێ بۆ گوزەرانی خۆی ناكا، فەرمووی: ڕێی تێ دەچێ كە خودا لەبەر خاتری ئەو رزقو رۆزی تۆ بدا، واتە: كەواتە گلەيی لێ مەكە (ت:س/ص).

## ٨- باسی راساڵی، واتە: ئيستيقامەت (باب في الأستقامة)

قال الله تعالى: ﴿فاستقم كما امرت﴾هود/ ١١٢. واتە: ئەی خۆشەويست! وەكو دەستورت پێ دراوە ئاوا بە ڕێكو پێكی بەبێ كۆڵدان لەسەر راستاڵیو يەك رەنگی خۆت برۆو ئيستيقامەت هەبێ هەتا سەر.

وقال تعالى: (ان الذين قالوا ربنا الله ثم استقاموا تتنزل عليهم الملائكة ان لا تخافوا ولا تحزنوا وأبشروا بالجنة التي كنتم توعدون، نحن أولياؤكم في الحياة الدنيا وفي الآخرة ولكم فيها ما تشتهي أنفسكم ولكم فيها ماتدعون، نزلا من غفور رحيم)فصلت/٣٠-٣٢. واتە: بەراستی ئەو مەردانە، كە هەميشە ناوی پيرۆزی خودا وا لەسەر زمانيانو دەڵێن: خودای ئێمە يەزدانی مەزنە، بەشوێن ئەم ئيعلانی پەيوەندييە پيرۆزەدا لە نێوانی خۆيانو خودايانـدا بەراساڵیو لەسەر راساڵی بەردەوام دەبن لەسەر طاعەتو خوا پەرستی خۆيان، ئەم مەردانی خودايە لەدەمی

---

١١ تيرمذي (٢٣٤٦).

سەرە مەرگا فریشتەی رەحمەت دادەبارن بەسەریاناو دێنە خوارەوە بۆ لایان‌و پێیان دەفەرموون: کە لە مردن‌و پاش مردن مەترسن‌و خەفەتتان نەبێ، ترس‌و خەم‌و خەفەت بۆئێوە نەما، مژدەتان لێ بێ، ئەو بەهەشتە بەرینەی کە خودا بەڵێنی ئەوی داونەتێ ئامادەیە بۆ پێشوازیتان، لە هەردوو جیهاندا خۆمان خاوەنتانین‌و ئێمە دۆستانین، بەهەشت بەهەشتی خۆتانە حەزتان لەچییە تێیدایەتی، دڵخوازی ئێوە هەمووی بە زیادەوە لەوێ هەیە، سەرەڕای ئەو هەموو نازو نیعمەت‌و بەهرە گەورانەی کە وان لەبەهەشتا خودای گەورە بێ دڵێتان ناکا، داوای هەرچی بکەن دەست بەجێ پێتان دەدرێ، وەك میوانێکی ئازیزی خۆشەویست، کە خانە خوێکەی خودایەکی سڕ پۆشی تاوان پۆشی میهرەبانی میوان پەروەر بێ ئاوا لەبەهەشتا دادەکرێن‌و قاوەڵتی‌و نان‌و ئاو لەسەر خوانی یەزدانیی نۆش دەکەن.

وقال تعالى: (ان الذين قالوا ربنا الله ثم استقاموا فلا خوف عليهم ولا هم يحزنون أولئك أصحاب الجنة خالدين فيها جزاءا بما كانوا يعملون)الأحقاف/١٣-١٤

٨٥/١-[١]- وَعَنْ أبي عمرو، وقيل أبي عمْرة سُفْيانَ بنِ عبد اللَّه رضي اللَّه عنه قال: قُلْتُ: يا رسول اللَّهِ قُلْ لِي في الإِسلامِ قَولاً لا أَسْأَلُ عنْه أَحداً غيْركَ. قال: (قُلْ: آمَنْت باللَّهِ: ثُمَّ اسْتَقِمْ) رواه مسلم.

سوفیانی کوری عەبدوڵڵا (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: عەرزی حەزرەتم کرد: ئەی ڕەوانە کراوی یەزدان! فەرمایشتێکم پێ بفەرموو: بۆ موسوڵمانەتی: کە ئیتر هەوەجێم بەکەسی تر نەبێ جگە لە خۆت، کە بۆ ئەوە لێی بپرسم، فەرمووی: بڵێ باوەڕی تەواوم هەیە بە خودا، ئیتر ملی ڕێگەی ڕاست بگرەو بە ڕاساڵی سەرڕەمڕ لەسەری بڕۆ! (موسلیم).

٨٦/٢-[٢]- وعنْ أبي هُريْرة رضي اللَّه عنه: قال قال رسول اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّم: (قَارِبُوا وسدِّدُوا، واعْلَمُوا أنَّه لَنْ ينْجُو أحدٌ منْكُمْ بعملهِ) قَالوا: ولا أنْت يَا رسُولَ اللَّه؟ قال: (ولا أَنَا إلا أنْ يتَغمَّدني اللَّه برَحْمةٍ منْه وَفضْلٍ) رواه مسلم.

---

١ موسليم (٣٨).

٢ موسليم (٢٨١٦)، (٧٦).

و (الْمُقارَبةُ): الْقَصْدُ الَّذي لا غلُوَّ فيه ولا تقْصيرَ. و (السَّدادُ): الاسْتِقَامةُ وَالإِصابةُ، و (يتغَمَّدني) يُلْبسُنِي ويَسْتُرني.

قالَ الْعُلَمَاءُ: معنَى الاستقَامَةِ: لُزومُ طَاعةِ اللّٰهِ تَعالى، قالُوا: وَهِيَ مِنْ جوامِـعِ الْكلِـم، وهِيَ نظام الأمُورِ، وباللّٰه التَّوفيق.

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لەسەر بێ) **لەحەزرەتـەوە دەفـەرموێ** (درودی خوای لەسەر بێ)**: هـەوڵو تەقەلایـەکی رێـكو پێكـی مامناوەنـدی بـدەنو لـەکاری خێـردا درێغـی مەکـەنو ئەوەندەی بۆتان دەلوێ بەراساڵی کۆتایی لەکردنی کاری چاك مەکەن، بشزانن کە کەسـتان بـەهۆی کـردەوەی خۆیـەوە رزگـاری نابـێ. گوتیـان: هـەتا تـۆیش ئـەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: بەڵێ، هەتا منیش، مەگەر خودای گەورە بەرەحمەتو میهـری خـۆی دامگـرێو نـوقمی رەحمـەتی خـۆیم بکـا (م)، لـە گێڕانەوەیـەکی تاجولئوصولدا: فـەرمووی: کەسـتان بـەکردەوەی خـۆی نـە دەچێتە بەهەشـتو نـە قوتاری دەبێ لە ئاگری دۆزەخ، تەنانەت منیش هەروا، مەگەر خـودا بـە میهرەبـانی خۆی رەحمـمان پـێ بکـا، زاناکـان دەفـەرموون: مەبەسـت لـە ئیسـتیقامەتو راسـاڵی ئەوەیە رابێ بە طاعـەتو فەرمانبـەری خـوداوەو بیکـەی بـە پیشـەی هەمیشـەیی خۆت، وە دەشفەرموون: وشـەی ئیسـتیقامەت یەکێکـە لـە فەرمایشـتە پـڕ واتـاو پـڕ مەبەستەکان.**

**٩- باسی وردبونەوە لەم هەموو دروسکراوانی خودایە، کە دارای ئەم هەموو حاڵو بارو دۆخە سەیرانەنو هەروا بیرکردنەوە لە بێ بەقایی جیهانو لە سامو زەبرو زەنگی ئەو هەموو ناسازیو ناخۆشیەی کەدێنە ڕێمان، وەهەروەها لە بێ کارەیی دەروونو نەفسو پوختە کردنیو رامهێنانی لەسەر راساڵیو رەوشتی باش (باب في التفكير في عظيم مخلوقات الله تعالى وفناء الدنيا واهوال الآخرة وسائر أمورها وتقصير النفس وتهذيبها وحملها على الإستقامة)**

قال اللّٰه تعالى: { إنَّمَا أعِظُكُمْ بِوَاحدةٍ أنْ تقُوموا للّٰهِ مَثْنَى وفُـرادَى ثُـمَّ تَتَفكَّـرُوا } ﴿سبأ ٤٦﴾ وقال تعالى: { إنَّ في خَلْـقِ السَّـمواتِ والأرْضِ واخْـتلافِ اللَّيْـلِ وَالنَّهَـارِ لآيَاتٍ لأُولِي الألْبَابِ الَّذِينَ يَذْكُرونَ اللّٰهَ قِياماً وَقُعُوداً وعَلَى جُنُوبِهمْ ويَتَفكَّرون في خَلْـقِ السَّمواتِ وَالأرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَـذَا بَـاطلاً سُبْحَانَكَ } الآيـــات ﴿ آل عمـران ١٩٠، ١٩١ ﴾. وقال تعالى: { أفلا يَنْظُرونَ إلَى الإبلِ كَيْفَ خُلِقَتْ وإلَى السَّمَاءِ كَيْفَ

رُفِعتْ وإلَى الْجِبالِ كَيْفَ نُصِبتْ وَإلَى الأرضِ كيْفَ سُطِحتْ فَذَكّرْ إنما أنْتَ مُـذَكّرٌ } ﴿ الغاشية: ١٧، ٢١﴾. وقال تعالى: { أفلَمْ يَسيروا في الأرْضِ فَيَنْظُروا } ﴿ محمد: ١٠﴾.

مەبەست لەئایەتە پیرۆزەکان بەتێکڕایی: ئەی خۆشەویست! تۆ کە پێغەمبەری منیو رەهبەری ئەو خەڵکەی لەسەر شێوەی پەند دادانو ئامۆژگاری جوان بڵێ پێیان: ئامۆژگاری هەرە گەورەی من بۆ ئێوە کە خودا بۆ عیبادەتی خۆی درووستی کردوون ئەوەیە هەمیشە بیکەن بە پیشە بۆ خودا بسازێنو لە هەموو کارو کردەوەیەکتان مەبەستان رەزای خودا بێ، ئیتر هەر خۆتان بن بەتەنیا، یا کەسێکی ترتان لەگەڵدا بێ، خودا ئەم هۆشو گۆشو چاوو دڵو بیرو زەینو هەستو شتانەی داونەتێ هەتا بیر بکەنەوەو هۆش بکەنەوەو بەراوردتان هەبێو لەم هەموو نیشانەو پەندو ئامۆژگاریو شتە سەیرو عەنتیکانەی کە خودا دروستی کردوون لەناو ئاسمانەکانو زەویدا تێ بگەنو پەی بە مەبەستو حیکمەتی درووستکردنیان ببەن! بەراستی کەسانی کە بۆ خودا لێ ببڕێنو هۆگری یادی خودا بنو لەهەموو حاڵێکا، بەپێوە، بە دانیشتنەوە بە پاڵکەوتنەوە، هەمیشە ناوی خوداو یادی خودا ویردی سەردەمو زبانیان بێ بەراستی ئەم هۆشمەندە مەردە یادکارانە کە ئەمە کردارو رەفتاریانە زۆر بەجوانی لە حاڵ حاڵی دەبنو دەگەن بە پایەی پەی بردن بەهەق، بۆیە بە دەمو دڵ دەڵێینو دەڵێینەوە: پەروەردگاری ئێمە، ئەی خودای خاوەنی هەموو شت ئەم بوونەوەرە سەیرو عەجیبو غەریبە،کە پڕە لە یاساو دەستووری وردو رەساو تەواو، کە لە دەسەڵاتی مەخلووق بەدەرە ئەم بوونەوەرە بێ هوودەو بێ حیکمەت نییەو یاری منالان نییەو باتڵ نییە، بەڵێ درووستکراوانی خودا هەمووی سەرنجی هۆشمەند رادەکێشێ بۆلای خۆی ئەم حوشترە، بەم سەیریو عەجائیبییە، بەم قەبەییەو زلییە، وەڵێ عەرەبێ وەك فرفرۆکە هەڵی دەسورێنێ، باری دەکا، سواری دەبێ، جوتی پێ دەکا، دەیدۆشێ، سەری دەبڕێ، ئەمە دەبێ کێ ئەم کێوەی بۆ ئەم قلمۆتکەیە ئاوا رامهێنابێ، ئەم ئاسمانە بەرزو شینە، بەسەرمانەوە چۆن چۆنی ئاوا بەم بەرزیەو سەیرییە هەزاران ساڵ راوەستاوە، نە دەڕوخێو نە دلۆپەیێ دەکا، نە نووچێ دەدا، ئەم کێوانە کێ وا وەك گوڵمێخ دایکوتاون بەناو جەرگی زەویدا، ئەم زەویە چۆن وا ڕاخراوە دەڵێی بەڕەو دۆشەکە، ئادەمیزادو ئاژەڵو ماشێنو فڕۆکەو خشۆك هەمووی قیتو قنج لەسەری دەڕۆن، دەڵێی ماسینو بەناو ئاودا دەڕۆن، سووكو سۆڵو بەبێ دەردی سەری، ئەی خۆشەویست! چەندەی لە دەستت دێ تەمێو

ئامۆژگاری خێری ئەو خەڵکە بکە، هۆش‌و ئاستی بیرکردنەوەیان بشڵەقێنە، هەتا بکەونە سەر بیرکردنەوەو هۆشکردنەوەو سوود لەهەموو شتێ وەربگرن، بەرەبەرە بە هۆشیاری‌و بەچاوی هۆشمەندانەوە بەناو کون‌و قوژبنی زەویدا بسوڕێنەوە، بۆ مەبەستی بەرزی بەکەڵك، نەك بۆ کەیف‌و ئارەزووبازی ناڕەوا.

والايات في الباب كثيرة. ومن الأحاديث الحديث السابق (الكيس من دانة نفسه)، واتە: لەسایەی خوداوە ئایەت‌و فەرموودەی حەزرەت لەشانی ئەم باسەی ژێر دەستماندا زۆر زۆرە، یەکێکیش لەو فەرموودانەی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لەم بارەیەوە ئەو فەرموودەیە کە لەپێشەوە رابوورد، لە زنجیرە پێنجی ئەم بەرگەدا، فەرموودەی حەوتەم، کە دەفەرموێ: (الكيس من دان نفسه....تاد)بڕوانە فەرموودەی(٦٦/٧).

## ١٠- باسی بەپیرەوە چوونی هەموو کارێکی خێرو پەلەکردن لەکاری خێرداو بەزوویی کردنی بەبێ دڕەنگ (باب في المبادرة الى الخيرات وحث من توجه الى الخير على اقبال عليه بالجد من غير تردد)

قال الله تعالى: ﴿فاستبقوا الخيرات﴾البقرة/١٤٨. وقال تعالى: ﴿وسارعوا إلى مغفرة من ربكم وجنة عرضها السموات والأرض أعدت للمتقين﴾ آل عمران/١٣٣. واتە: هەمیشە سەرتان پێوە نەبێ بۆ کاری چاکە، پەلاماری بدەن‌و بەگورجی هەڵمەتی بۆ بەرن‌و بچن بەپیریەوە، بیکەن بە دەسمایەی دەستان‌و رەزای خودای پێ بکرن، تا خودا تاوانتان ببۆشێ‌و لە دۆزەخ دوورتان بخاتەوەو شاد ببن بە بەهەشتی بەرینی نەبڕاوەی پڕ لە خۆشی‌و شادی، کە پانایيەکەی بەقەد هەموو ئاسمانەکان‌و زەوی دەبێ، گەورەیی‌و درێژییەکەی مەگەر هەر خودا خۆی بیزانێ![*]

٨٧/١[١]- عَنْ أبي هريرة رضي اللّه عنه أن رسولَ اللّـهِ صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلّم قـال: (بادِروا بالأعْمال الصَّالِحةِ، فستكونُ فِـتَنٌ كقطَـعِ اللَّيـلِ الْمُظْلـمِ يُصـبحُ الرجُـلُ مُؤمنـاً ويُمْسِي كافراً، ويُمسِي مُؤْمناً ويُصبحُ كافراً، يبيع دينه بعَرَضٍ من الدُّنْيا» رواه مسلم.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لەسەر بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: بە کردەوەی باش دەست پێشکەری لە قەومانی ئەو فەرتەنەو ئاشووبانە بکەن کەوەك

---

★ بەپانی بەقەد دنیای خۆمانە خانەی رازاوەی تۆی موسوڵمانە(وەرگێڕ)

١ موسلیم (١١٨).

شەوەزەنگ خەڵك دادەگرن‌و دنیا تاریك دەكەن، خەڵك وا سەریان لێ دەشێوێ‌و ڕێیان لێ دەگۆڕێ، پیاو هەیە بەیانی موسوڵمانەو ئێوارە كافرە، ئێوارە موسوڵمانەو بەیانی كافرە، ئایینی خۆی دەفرۆشێ بۆ شڕەو پڕو پیتی جیهان(م).

٨٨/٢–[٢]– عنْ أبي سِرْوَعَةَ بكسرِ السينِ المهملةِ وفتحها عُقْبةَ بـنِ الْحـارثِ رضـي اللّٰه عنه قال: صليت وراءَ النبـي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم بالمدِينـةِ الْعصْـرَ، فسلّـم ثُـمَّ قـامَ مُسْرعاً فَتَخَطَّى رِقابَ النَّاسِ إلى بعض حُجَرِ نسـائِهِ، فَفَـزِعَ النَّـاس مـن سـرعَتهِ، فخـرج عَليهمْ، فرأى أَنَّهُمْ قدْ عَجِبوا منْ سُرْعتِه، قالَ: «ذكرت شيئاً من تبْرٍ عندَنا، فكرِهْتُ أن يحبسَنِي، فأمرْتُ بقسْمتِهِ» رواه البخاري. وفي رواية له: كنْتُ خلَّفْتُ في الْبيتِ تِـبراً مـن الصَّدقةِ، فكرِهْتُ أنْ أُبيِّتَه». «التِّبْر» قطع ذهبٍ أوْ فضَّةٍ.

عوقبـە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: لەمـەدینـە، جـارێ پێغـەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نوێژی عەصری بۆ كردین، كە سڵاوی دایەوە بەپەلە هەڵساو چوو بۆ ماڵی یەكێ لە هاوسەرەكانی، لەپاشا كە هاتەوە تەماشای ڕووی خەڵكەكەی كرد روانـی خەڵكەكە سـەیریان دێ لـەم پەلەكردنـەی، فـەرمووی: ئـەوە بۆیـە وام كـرد چـونكە لـەناو نوێژەكەدا بیرم كەوتەوە كە شووشێ زێڕمان لەلا هەیـە جا حـەزم نـەكرد لـە ماڵی منا ئێوارەی بەسەردا بێ، یا فەرمووی: شەوی بەسەردا بێ، وە لە ماڵەوە پێم گوتن كە دابەشی بكەن بەسەرهەژاراندا! (ب) لە گێڕانەوەیەكی تری بوخاریدا: لە ماڵەوە شووشێ زێڕ، كە هی زەكات بوو مابوو حەزم نەكرد كە ئەم شەو لەماڵی منا بمێنێ.

٨٩/٣–[٣]– عن جابر رضي اللّٰهُ عنه قال: قال رجلٌ للنبيِّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم يـومَ أُحُدٍ: أرأيتَ إنْ قُتلتُ فأينَ أنَا ؟ قال: «في الْجنَّةِ» فألْقى تَمراتٍ كنَّ في يَدِهِ، ثُمَّ قاتل حتَّى قُتلَ. متفقٌ عليه.

جابیر (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ڕۆژی غەزای ئوحود پیاوێ بە حەزرەتی فـەرموو (دروودی خوای لەسەر بێ): قوربـان! پـێم بڵـێ ئەگـەر كوژرام لـەپێناو تـۆدا جێگـەم كوێیـە؟ فـەرمووی: جێگـەت ناوەڕاسـتی بەهەشـتە. چـەند دەنكێ خورمـای لەدەسـتدا بـوو، فـڕێی دان‌و فـەرمووی: تـا ئەمانـە دەخـۆم زۆری پـێ دەچـێ‌و درەنگـتر دەگەمـە

---

٢ بوخاری (٨٥١).

٣ بوخاری (٤٠٤٦)، موسلیم (١٨٩٩).

بەهەشت! ئەوجا جەنگی‌و چووە مەیدانی مەردایەتی تاکوژراو شەهید بوو، وە بەمژدەکەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) شاد بوو (ش).

٤/٩٠-[٤]- عن أبي هُريرةَ رضي اللّهُ عنه قال: جاءَ رجلٌ إلى النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، فقال: يا رسولَ اللّهِ، أيُّ الصَّدقةِ أعْظَمُ أجْراً ؟ قال: «أنْ تَصَدَّقَ وأنْتَ صحيحٌ شَحيحٌ تَخْشى الْفقرَ، وتأْمُلُ الْغنى، ولا تُمْهِلْ حتَّى إذا بلَغتِ الْحلْقُومَ. قُلت: لفُلانٍ كذا ولفلانٍ كَذَا، وقَدْ كان لفُلان» متفقٌ عليه.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (درووی خوای لەسەر بێ) گوتی: ئەی ڕەهبەری خودا! کام خێرو بەخشینە پاداشی گەورەترە؟ فەرمووی: ئەو خێرەی دەیکەی لەشت ساخ بێ‌و دڵت بە ماڵداریی خۆش بێ‌و مەترسی هەژارکەوتنت هەبێ‌و هیوای دەوڵەمەندبوونت هەبێ، نەوەك کەمتەرخەمی بکەی تا ئەو دەمەی گیان دەگاتە سەر لێوو مردن یەخەت دەگرێ، جا ئەو حەلە بە پەلە پڕووزە بڵێی: ئەوە بۆ ئەم‌و ئەمە بۆ ئەو تازە چ سوود! گریمان ئەگەر سوودیشی هەبێ کەمە لەچاو خێرکردنی حاڵی لەش ساغی دا، چونکە ئەو شتە لەدەستی تۆ دەرچووەو دەبێ بەماڵی یەکێکی تر (ش).

٥/٩١-[٥]- عن أنس رضي اللّه عنه، أنَّ رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم أخذَ سيْفاً يوم أُحدٍ فقَالَ: «مَنْ يأْخُذُ منِّي هَذا ؟ فبسطُوا أَيدِيهُم، كُلُّ إنْسان منهمْ يقُول: أنا أنا. قَالَ: «فمنْ يأْخُذُهُ بحقِه ؟ فَأَحْجمِ الْقومُ، فقال أَبُو دجانة رضي اللّه عنه: أَنا آخُذه بحقِّهِ، فأَخَذهُ ففَلق بِهِ هَام الْمُشْرِكينَ». رواه مسلم.

ئەنەس (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووی خوای لەسەر بێ) ڕۆژی غەزای ئوحود شمشێرێکی گرت بەدەستەوەو فەرمووی: کێ ئەم شیرەم لێ وەردەگرێ؟ یارانیش (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) هەموویان دەستیان بۆ ڕاکێشا، هەرکەسەیان دەیگوت: من،من! فەرمووی: ئەی کێ بەڕاستی وەری دەگرێت‌و مافی خۆی دەداتێ؟ خەڵکەکەش کشانەوەو ساردبوونەوە، بەڵام ئەبو دوجانە فەرمووی: من بەڕاستی وەری دەگرم‌و مافی خۆشی دەدەمێ، جا وەری گرت‌و کەللەی بتپەرستەکانی یەك لەدوای یەك شەق‌و

---

٤ بوخاری (١٤١٩)، موسلیم (١٠٣٢).

٥ موسلیم (٢٤٧٠).

پەق کرد پێی! (م- ڕەزای خودای لەسەر بێ ). ئەبو دوجانە ناوی سیماکی کوری حیراش بوو.

٩٢/٦-[٦]– عن الزُّبَيْرِ بنِ عديٍّ قال: أَتَيْنَا أَنس بن مالكٍ رضي اللّٰه عنه فشَكَوْنا إليهِ ما نلْقى من الْحَجَّاجِ. فقال: «اصْبِروا فإنه لا يأْتي زمانٌ إلاّ والّذي بعْده شرٌ منه حتَّى تلقَوا ربَّكُمْ» سمعتُه منْ نبيِّكُمْ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم. رواه البخاري.

زوبەیری کوڕی عەدی (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: چووینە خزمەتی ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لەسەر بێ) سکاڵای خۆمان لەلا کرد، کە حەجاج چ زۆرو نارەواییەکمان لێدەکا، فەرمووی: ددان بەخۆتانا بگرن، چونکە تا دێ خراپتر دەبێ، ڕۆژ بە ڕۆژ خۆزگە بە دوێنێ، هەتا دەچنەوە بەر دیوانی خودا ئەمەیش قسەی من نییە، بەڵکوو بەگوێی خۆم ئەمەم لە زاری حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) ژنەوتووە (بوخاری، هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی نازداری).

٩٣/٧-[٧]– عن أبي هريرة رضي اللّٰه عنه أَن رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (بادروا بالأَعْمال سبعاً، هل تَنتَظرونَ إلاّ فقراً مُنسياً، أَوْ غنيٌ مُطْغياً، أَوْ مرضاً مُفسداً، أَو هرماً مُفْنداً أَو موتاً مُجهزاً أَوِ الدَّجَّال فشرُّ غَائب يُنتَظر، أَوِ السَّاعة فالسَّاعةُ أَدْهى وأَمر،) رواه الترمذي وقال: حديثٌ حسن.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: بە کردەوە باش پێشدەستی لەم حەوت شتە بکەن: چی لە جیهانا چاوەڕێ دەگەن، جگە لە یەکێ لەمانە، کە لە پڕێکا پڕتان پیابکاو بدا بەسەرتاندا: یەکەم هەژاری کە هەموو شتێ لەبیر دەباتەوە، دووەم دەوڵەمەندی، کە پیاو یاخیو بایی دەکا، سێیەم نەخۆشین کە لەش تێك دەدا، چوارەم پیری کە مرۆڤ دەخەڵەفێنێ، پێنجەم مردنی کوتوپڕی بڕس بڕ! شەشەم جەجاڵ کە خراپترینو بەدترین نادیار(غائب)ێکە، کە چاوەڕوان دەکرێ، حەوتەم قیامەت کە ئەمەیان لەهەمووی سامناکترو دیژوارترە! (ت:ح/ح).

---

٦ بوخاری (٧٠٦٨).

٧ تیرمذي (٢٣٠٧).

٩٤/٨-[8]- عنه أَن رسولَ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال يوم خيْبر: «لأعطِينَّ هذِهِ الراية رجُلا يُحبُّ اللّه ورسُوله، يفتَح اللّه عَلَى يديهِ» قال عمر رضي اللّهُ عنه: ما أَحببْت الإمارة إلاّ يومئذٍ فتساورْتُ لَها رجَاءَ أَنْ أُدْعى لَها، فدعا رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم عليَ بن أبي طالب، رضي اللّه عنه، فأَعْطَاه إيّاها، وقالَ: «امش ولا تلْتَفتْ حتَّى يَفتح اللّه عليكَ» فَسار عليٌّ شيئاً، ثُمَّ وقف ولم يلْتفتْ، فصرخ: يا رسول اللّه، علي ماذَا أُقاتل النَّاس؟ قال: «قاتلْهُمْ حتَّى يشْهدوا أَنْ لا إله إلاّ اللّه، وأَنَّ مُحمَّداً رسول اللّه، فَإذا فعلوا ذلك فقدْ منعوا منْك دماءَهُمْ وأَموالَهُمْ إلاّ بحَقّها، وحِسابُهُمْ على اللّهِ» رواه مسلم «فَتساورْت» هو بالسِّين المهملة: أَيْ وثبت مُتطلّعاً.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ڕۆژی خەیبەر، حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم ئالایە دەدەم بە پیاوێ، خوداو پێغەمبەری خودای خۆش دەوێ، لەسەر دەستی ئەو خودا قەلای خەیبەر ئازاد دەکا، عومەر (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: ئەو ڕۆژە نەبێ هەرگیز حەزم لە فەرمانداریی‌و سەرکردەیی نەکردووە، بەلام ئەو ڕۆژە خۆم بۆ قوت کردەوە، سابەشکو من بکرێم بەسەرکردە، جا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) عەلی بانگ کردو ئالاکەی دایەو فەرمووی: بڕۆو لا نەکەیتەوە هەتا خودا فەتحی دەکات بۆت. جا عەلی تۆزێ ڕۆیشت‌و ئینجا راوەستا- بەلام لای نەکردەوە- وە گوتی بەدەنگی بەرز: ئەی پێغەمبەری خودا! لەسەر چی جەنگ بکەم لەگەڵ ئەو خەڵکەدا؟ فەرمووی جەنگ بکە لە گەڵیاندا هەتا شایەتی دەدەن: لا اله الا الله وان محمدا رسول الله، جا کاتێ ئەوەیان کرد، ئیتر سەرو ماڵیان لەتۆ قەدەغە دەبێ، مەگەر لەسەر حەق، وەلێپرسینەوەیان لەسەر خودای گەورە دەبێ (م).

## ١١- باسی تێکۆشان‌و لێبڕان بۆ خوا (باب في المجاهدة)

قال الله تعالى: ﴿والذين جاهدوا فينا لنهدينهم سبلنا وأن الله لمع المحسنين﴾العنكبوت/٦٩. واتە:ئەو مەردانەی کە لەڕێگەی خودادا تێکۆشان‌و لێبڕاون بۆ خوداو خۆیان ڕەنجاندووە بۆ ئێمە، لەچاکەی ئەوەدا ئێمەش شارەزای هەموو ڕێگەیەکی باشی خۆمانیان دەکەین، دیارە کە خودا هەر لەگەڵ چاکە خوازانە.

---

٨ موسلیم (٢٤٠٥).

وقال تعالى: ﴿وأعبد ربك حتى يأتيك اليقين﴾الحجر/٩٩. واته: له تاعەتو خودا پەرستيی ساردمەبەرەوە، هەتا لەسەر يەقينی تەواوو ئيمانی كاملْ دەمری.

وقال تعالى: ﴿واذكر اسم ربك وتبتل اليه تبتيلا﴾المزمل/٨. أي إنقطع اليه.

واته: هەميشە ناوی خوداو يادی خوداو ويردی سەر دەمت بیٚو لەيادی خودا بیٚ ئاگامەبەو بەباشی لیٚ ببڕیٚ بۆ خودا.

وقال تعالى: ﴿فمن يعمل مثقال ذرة خيرا يره ومن يعمل ميثقال ذرة شرا يره﴾الزلزلة/٧. واته:ئەوەی تۆزقالیٚ چاكەی هەبیٚ، لای خوداون نابیٚو پاداشی باشی لەسەر وەردەگریٚ، دیارە هەتا زۆرتری هەبیٚ پاداشی زۆرترە.

وقال تعالى: ﴿وما تقدموا لأنفسكم من خير تجدوه عند الله هو خيرا وأعظم أجرا﴾المزمل/٢٠. واته:هەر خیٚرو چاكە بیٚ لەپیٚش خۆتانەوە رەتی بكەن بۆ ئەو دنیاتان، ئەوە زەخیرەو دەسمایەیەكی چاكە لەلای خودا هیچ خیٚریٚ لەلای خودا نافەوتیٚ، خیٚریٚ بەدەستی خۆتان بۆ خۆتانی بكەن گەلیٚ لەوە باشترە كە چاوەڕوانی دەستی ئەمو ئەو بن.

وقال تعالى: ﴿وما تنفقوا من خير فإن الله به عليم﴾البقرة/٢٧٣. واته: هەرچی بكەن بەخیٚر، وەهەر خیٚرو چاكەییٚ بكەن، كەم بیٚ یا زۆر هیچی لەلای خودا ون نابیٚ، وەخودا ئاگای لیٚیەتی.

والايات في الباب كثيرة معلومة: لەسايەی خوداوە ئايەتی تر لەم بابەتە زۆرە، لەلای كەسی خۆی ئاشكرايە.

١/٩٥-[١]- عن أبي هريرة رضي اللّٰه عنه. قال قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: «إنَّ اللّٰه تعالى قال: منْ عادى لي وليًّا. فقدْ آذنتهُ بالْحرْب. وما تقرَّبَ إلَيَ عبْدِي بشْيءٍ أَحبَّ إلَيَ مِمَّا افْتَرَضْت عليْهِ: وما يَزالُ عبدي يتقرَّبُ إلى بالنَّوافِل حَتَّى أُحِبَّه، فإذا أَحبَبْتُه كُنْتُ سمعهُ الَّذي يسْمعُ به، وبَصره الذي يُبصِرُ بِهِ، ويدَهُ التي يَبْطِش بِهَا، ورجلَهُ التي يمْشِي بها، وَإنْ سألَنِي أَعْطيْته، ولَئِن اسْتَعَاذَنِي لأُعِيذَّنه» رواه البخاري. «آذنتُهُ» أَعلَمْتُه بِأَنِّي محارِبَ لَهُ «استعاذنِي» رُوى بالنون وبالباء.

---

١ بوخاری (٦٥٠٢).

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: کەسی گەر بکا بە خۆشەویستێکی منو دوژمنایەتی بکا لەگەڵ دۆستێکی مندا ئەوە دوژمنایەتی لەگەڵ من دا دەبەستێ، کەواتە با خۆی ئامادە بکا بۆ شەڕکردن لەگەڵ خۆمدا، من خۆم شەڕی تێ دەبەستمو لەجیاتی ئەو دۆستە نازدارەم بۆی دەچمە مەیدانی نەبەرد بۆ ئەو ناحەزەی! وە عەبدو بەندەی من بەهیچ شتێکی خۆشەویست وەك ئەوە خۆی لەمن نزیك ناکاتەوە، کەوەك بەکردنی ئەو شتانەی فەرزم کردووە لەسەری، بەوە خۆی لەمن نزیك بکاتەوە، وە بەرەبەرە بەندەی من بەکردنی سوننەتەکان خۆی لەمن نزیك دەکاتەوەو خۆی دێنێتە پێشەوە هەتا خۆشەویست دەبێ لەلام، جا کاتێ بەندە گەیشتە ئەو پایەیەی کە ببێتە خۆشەویستو دۆستی من، ئیتر خۆم دەبم بەگوێو چاوو دەستو پێ بۆی! هەرچی بەدڵی من نەبێو بۆ رەزای من نەبێ نە گوێی دەداتێو نە تەماشای دەکاو نە دەستی بۆ دەباو نە بۆی دەچێ! ئیتر منیش بێ دڵی ئەو ناکەمو دڵی ناشکێنم، هەرچیم لێ داوا بکا بەبان چاو دەیدەمێو بەدەستی خۆم دەیدەمێو بەپێی خۆم بۆی دەبەم، ئەگەر پەنام بۆ بێنێ پەنای دەدەم، لەکردنی هیچ شتێ وەك ئەوە سێو دوو ناکەم کە لە کێشانی گیانی موسوڵمانا سێو دوو دەکەم،چونکە ئەو حەزی لەمردن نییە، وە منیش هەرچەندە حەزم لە بێ دڵی ئەو نییە بەڵام مردنیش کارێکی ناچارییە هەردەبێ ببێ، (ب/تاج).

٩٦/٢-[٢]- عن أَنس رضي اللَّه عنه عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم فيمَا يرْويهِ عنْ ربهِ عزَّ وجَلَّ قال: «إِذَا تقرب الْعبْدُ إِليَّ شِبْراً تَقرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِراعاً، وإِذَا تقرَّب إِلَيَّ ذراعاً تقرَّبْتُ منه باعاً، وإِذا أَتانِي يَمْشِي أَتيْتُهُ هرْوَلَة» رواه البخاري.

ئەنەس (رەزای خودای لەسەر بێ) دەگێڕێتەوە لە حەزرەتەوە (درووودی خوای لەسەر بێ) ئەویش دەگێڕێتەوە لەخودای گەورەو سەروەری خۆیەوە، لە فەرموودەیەکی قودسی- فەرمایشتی پیرۆز- دا خودا دەفەرموێ: کاتێ بەندە بستێ لەمن خۆی نزیك بکاتەوە، من باڵێك خۆم لەو نزیك دەکەمەوە، ئەگەر ئەو یەك باڵ خۆی لەمن

---

٢ بوخاری (٧٥٣٦).

**نزيك بخاتەوە من دوو شاباڵ خۆم لەو نزيك دەخەمەوە ئەگەر ئەو بە ڕۆيشتنى ئاسايى بێ بۆلاى من، من بە ڕاكردن دەچم بە پيريەوە! (ب).**

٩٧/٣-[٣]- الثالث: عن ابن عباس رضي اللّٰه عنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «نِعْمتانِ مغبونٌ فيهما كثير من الناس: الصحة والفراغ» رواه مسلم.

**ئيبن‌و عەبباس** (ڕەزاى خودايان لەسەر بێ) **دەفەرموێ: حەزرەت** (دروودى خواى لەسەر بێ) **فەرمووى: دوو بەهرەى گەورە هەن زۆر كەس بەرهەميان ناهێنن‌و دەستەخەڕۆو دەستەشكێن بوون بەهۆى ئەو پشتگوێ خستنەوە: يەكەم تەندروستى‌و لەشى ساخ، دەبێ بەندە ئەو هەلە لەدەست خۆى نەداو خەريكى كارى باشە بێ، دووەم: دەست بەتاڵى، كە ئەميش هەروەها. (ب)**

٩٨/٤-[٤]- عن عائشة رضي اللّٰه عنها أَنَّ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم كَان يقُومُ مِنَ اللَّيْلِ حتَّى تَتفطَرَ قَدمَاهُ، فَقُلْتُ لَهُ، لِمْ تصنعُ هذا يا رسولَ اللّٰهِ، وقدْ غفرَ اللّٰه لَكَ مَا تقدَّمَ مِنْ ذَنبِكَ وما تأخَّرَ؟ قال: «أَفَلاَ أُحِبُّ أَنْ أَكُونَ عبْداً شكُوراً؟» متفقٌ عليه. هذا لفظ البخاري، ونحوه في الصحيحين من رواية المُغيرة بن شُعْبَةَ.

**عائيشە** (ڕەزاى خوداى لەسەر بێ) **دەفەرموێ: پێغەمبەر** (دروودى خواى لەسەر بێ) **ئەوەندە زۆر لە شەو نوێژدا بە پێوە ڕاوەستابوو هەردوو قاچى-ياهەردوو لاقى- پەنەمابوون! جا عەرزيم كرد: قوربان! بۆ وا لەخۆت دەكەى؟ خۆ تۆ خودا لەگوناهى بەرەو دوات خۆش بووە؟ ئەويش فەرمووى: ئاخر منيش دەبێ بەوپەڕى پێ خۆشبوونەوە بەندەيەكى سوپاس بژێربم؟! (ش-**(ڕەزاى خوداى لەسەر بێ)**).**

٩٩/٥-[٥]- عن عائشة رضي اللّٰه عنها أنها قالت: «كان رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم إذَا دَخَلَ الْعشْرُ أحيا اللَّيْلَ، وأيقظ أهْلهْ، وجدَّ وشَدَّ المِئْزَرَ» متفقٌ عليه.

والمراد: الْعشْرُ الأواخِرُ من شهر رمضان: «وَالمِئْزَر»: الإزارُ وهُو كِنايَةٌ عن اعْتِزَال النِّساءِ، وقِيلَ: المُرادُ تشْمِيرهُ للعِبادَةِ. يُقالُ: شَددْتُ لِهذا الأَمرِ مِئْزَرِي، أيْ: تشمرتُ وَتَفرَّغتُ لَهُ.

---

**٣ بەخارى (٦٤١٢).**

**٤ بوخارى (١١٣٠)، موسليم (٢٨١٩)،(٢٨٢٠).**

**٥ بوخارى (٢٠٢٤)، موسليم(١١٧٤).**

**عائیشه** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **وابوو، کە دەی دوایی ڕەمەزان دەهات خۆی گورج دەکردەوە بۆ خوداپەرستیو بەشەو نوێژو یادی خودا شەوی خۆی ئاوەدان دەکردەوە، وەکەسوکاری خۆشی خەبەر دەکردەوە بۆ هەمان مەبەست(ش).**

٦/١٠٠-[٦]- عن أبي هريرة رضي اللّٰه عنه قال: قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «المُؤمِنِ الْقَوِيُّ خيرٌ وَأَحبُّ إلى اللّٰهِ مِنَ المُؤْمِنِ الضَّعِفِ وفي كُل خيْرٌ. احْرِصْ عَلَى مَا يَنفَعُكَ، واسْتَعِنْ بِاللّٰهِ وَلاَ تَعْجَزْ. وإنْ أصابَكَ شيءٌ فلاَ تقلْ: لَوْ أَنِّي فعلْتُ كَانَ كَذَا وَكذَا، وَلَكِنْ قُلْ: قدَّرَ اللّٰهُ، ومَا شَاءَ فَعَلَ، فَإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ». رواه مسلم.

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **گوتی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: موسوڵمانی تەواناو هێزدار باشترو خۆشەویست ترە لە موسوڵمانی زەبوونی بێ هێز، وەلێ هەردوولا مادام موسوڵمانی باشن لەلای خودا باشو نازدارن، هەرچی قازانجی هەیە بۆت مشووری بخۆ، هەمیشە داوای کۆمەکی لە خودا بکەو تەمەڵو تەوەزل مەبە، ئەگەر تووشی شتێ بووی، مەڵێ: ئەگەر وام بکردایە وادەبوو، بەڵام بڵێ: چارەنووسی خودا وابوو، چارەنووسی خودایش ڕتبوونەوەی نییەو شتێ کە لە سەرەتاوە خواستی خودای لەسەربێ دەبێ هەرببێ، چونکە (ئەگەر) ڕێگەو دەرگا بۆ کاری شەیتان دەکاتەوە. (م).**

٧/١٠١-[٧]- عنه أَنَّ رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: «حُجِبتِ النَّارُ بِالشَّهَواتِ، وحُجِبتْ الْجَنَّةُ بَالمكَارِهِ» متفقٌ عليه. وفي روايةٍ لمسلم: «حُفَّت» بَدلَ «حُجِبتْ» وهو بمعناهُ: أيْ: بينهُ وبيْنَهَا هَذا الحجابُ، فإذا فعلَهُ دخَلها.

**دیسان فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: پەردەو پەرژینی دۆزەخ هەوەسبازیو ئارەزووبازییە (واتە: ئەوەی دوای هەوەسو ئارەزو بکەوێ ئەو پەردەیە دەدڕێنێو ئەو پەرژینە دەشکێنێو بەئاسانی دەچێتە ناو دۆزەخ، وەك چۆن کولەوەیبابێ لەناو قەفەزێکدا بێ، تەڵێکی زێڕ بێو تەڵێکی زیو بێ، کەسێکی پارە پەرست بچێ یەکە یەکە تەڵەکانی دەربکێشێ، بەخەیاڵی خۆی زێڕو زیو دەبا،**

---

٦ موسلیم(٢٦٦٤).

٧ بوخاری (٦٤٨٧)، موسلیم(٢٨٢٢).

تا لەناکاو قەفەزەکە کونێکی گەورەی تێ دەبێ‌و لەپڕ مارەکە دەستی دەبا بەدەماو پێوەی دەداو تـوکی سەری بـا دەی بـا، زێـڕو زیوەکـەیش لـەو نـاوەدا دەکـەوێ!) وە پەردە پەرژینی بەهەشتیش بێ دڵی کردنی نەفسە (واتە: ئەوەی بی دڵـی دەروونـی خۆی بکا بەکردنی ئەو ئەرکە ئایینیانـە کـە کردنیـان لەسـەر شانی نـەفس گرانـە، چونکە نەفس وەك منالْ دەشنێ بۆ شتی ئـالاّو والاّو خـاس‌و خراپـی خـۆی نازانـێ، ئەوا ئەو پەردەو پەرژینە لادەباو بەئاسانی دەچێتە نـاو بەهەشـت، ئەمـەیش وەك ئەوە پیاڵەیێ ئاوی ژیان لەناو قەفەزێکی ئەڵماس‌و زومرووتدا بێ، کەسێکی ژیـری دووربینی لێ زان بەهێواشی تـەڵ تـەڵ ئـەڵماس‌و زومرووتەکە دەربێنـێ‌و گوێ بـە شەو نوخونی‌و ماندووی‌و ڕەقی تیژی‌و دڕی ئەڵماس‌و زومرووتەکە نـەداو نەیـەڵێ ئاوەکەش بڕژێ، تا دەوری چۆڵ دەبێ‌و ڕێی دەستی دەکرێتەوەو پیاڵە ئاوەکە هەڵ دەگرێ‌و دەینێ بەسەریەوەو دەیخواتەوەو، ژیانی نەبڕاوەی پـڕ لـە خێـرو خۆشـی‌و شادی بۆ خۆی مسۆگەر دەکا!) (ش).

١٠٢/٨–[٨]– عن أبي عبد اللّٰه حُذَيْفَةَ بن اليمان، رضي اللّٰهُ عنهما، قال: صَلَّيْتُ مع النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَافْتَتَحَ الْبقرة، فقُلْت يرْكَعُ عِندَ المائة، ثـمَّ مضـى، فَقُلْت يُصلِّي بِهَا في رَكْعةٍ، فَمَضَى. فقُلْت يَرْكَع بهَا، ثمَّ افْتَتَح النِّسَاءَ، فَقرأَهَا، ثـمَّ افْتـتح آلَ عِمْرانَ فقرأَهَا، يَقْرَأُ مُتَرَسِّلاً إذا مرَّ بِآيَةٍ فِيها تَسْبِيحٌ سَبَّحَ، وإذا مَرَّ بِسؤَال سَأل، وإذا مَرَّ بِتَعَوذٍ تَعَوَّذَ، ثم ركع فَجعل يقُول: «سُبحانَ رَبِّيَ الْعظِيمِ» فكَانَ ركُوعُه نحْوا مِنْ قِيامِهِ ثُمَّ قَالَ: «سمِع اللّٰهُ لِمن حمِدَه، ربَّنا لك الْحمدُ» ثُم قَام قِياماً طوِيلاً قَريبـاً مِمَّـا ركَـع، ثُـمَّ سَجَدَ فَقالَ: «سبحان رَبِّيَ الأعلَى» فكَانَ سُجُوده قَرِيباً مِنْ قِيامِهِ». رواه مسلم.

حوزەیفەی کوڕی یەمان (ڕەزای خودای لەسەر بێ) گوتی: شەوێ لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێ) نوێژم دەکرد، لە سەرەتای سورەتی بەقەرە دەستی پێ کـردو لەسـەری ڕۆیـی، لەدڵی خۆما گوتم: لە ئایەتی سەدهەما ڕکوع دەبـا بـەلاّم لـەوێش تێپـەڕی، گوتم: دیارە هەمووی لـەم ڕکاتـەدا دەخوێنـێ بـەلاّم لـەوەش زیـاتری خوێنـد، لـەدوا ئـەو دەسـتی کـرد بـە خوێنـدنی سـورەتی نیساءو ئەویشـی بەتـەواوی خوێنـد، لـەپاش ئەویش دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی ئالی عیمران، ئەویشی بەتەواوی خوێنـد،

٨ موسلیم (٧٧٢).

بەڵام چۆن خوێندنێ لەسەر خۆو بە شێنەیی ددانی دەنا بە پیتەکانا، کە دەگەیشتە سەر ئایەتێ تەسبیحی تیا بێ، تەسبیحاتی دەکرد، کە دەگەیشت بە ئایەتێ شێوە پاڕانەوەو داواکردن بێ، دەپاڕایەوەو داوای لە خودا دەکرد. کە دەگەیشت بە شوێنێ پەناگرتن بێ پەنای بە خودا دەگرت ئەوجا چەمییەوەو چوو بە روکووعاو لەناو روکووعا هەر دەیفەرموو: سبحان ربي العظيم: پاكو پیرۆزە پەروەردگاری گەورەم.

روکووعەکەشی بۆ درێژی بەقەد وەستانەکەی بە پێوە دەبوو، ئنجا سەری لە روکووع هەڵبڕیو فەرمووی: سمع الله لمن حمده ربنا لك الحمد. ئەوی ستایشو سوپاسی یەزدان بکاو نیازی خۆی عەرزی بارەگای ئەو زاتە بکا ئەوە هەم سوپاسەکەیو هەم نیازەکەی گیرایە، پەروەردگارا! کەواتە سوپاسێکی زۆر بۆ تۆ، ئینجا زۆر بە پێوە راوەستا، چەپی کەمتر بوو لە قەدەری درێژی روکووعەکەی، ئەوجا چوو بۆ سەجدەو کوڕنووشی برد فەرمووی: سبحان ربی الاعلی: پاكو بێ گەردو بێ نەنگە پەروەردگاری هەرە بڵندم، کوڕنووشەکەشی بۆ درێژی نزیکی وەستانکەیی کردەوە (م).

١٠٣/٩-[٩]- عن ابن مسعودٍ رَضِيَ اللَّهُ عنه قال: صلَّيْت مع النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم لَيلَةً، فَأَطَالَ الْقِيامَ حتَّى هممْتُ أَنْ أجْلِسَ وَأدعَهُ. متفقٌ عليه.

ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: شەوێکیان لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێ) نوێژم دەکرد، ئەوەندە وەستانەکەی درێژە پێ دا تا خەیاڵێکی خراپ هات بە دڵما، گوتیان: خەیاڵی چی هات بەدڵتا؟ گوتی: خەیاڵی ئەوەم بوو کە بۆخۆم دابنیشمو واز لەنوێژکردن بێنم لەگەڵ ئەودا! دیارە خەیاڵێ سەربکێشێ بۆ نوێژبڕین لە پشتی پێغەمبەرەوە خەیاڵێکی بەدە(ش).

١٠٤/١٠-[١٠]- عن أنس رضي اللّه عنه عن رسولِ اللّهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: «يتْبَـعُ المَيْتَ ثلاثَةٌ: أهلُهُ ومالُه وعمَلُه، فيرْجِع اثنانِ ويبْقَـى واحِـدٌ: يرجـعُ أهلُـهُ ومالُـهُ، ويبقَـى عملُهُ» متفقٌ عليه.

---

٩ بوخاری (١١٣٥)، موسلیم (٧٧٣).

١٠ بوخاری (٦٥١٤)، موسلیم(٢٩٦٠).

ئەنەس (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: سێ شت شوێن مردوو دەکەون تاسەر لێواری گۆڕ لەگەڵی دەچن، بەڵام لەوێ دوانیان دەگەڕێنەوەو یەکێیان لەگەڵی دەمێنێتەوە: کەس‌و کارو ماڵ‌و کردەوەی لەگەڵی دەچن، بەڵام کەس‌و کارو ماڵ‌و منداڵەکەی دەگەڕێنەوە، تەنیا کردەوەکەی لەگەڵی دەمێنێ! (ش- ڕەزای خودایان لەسەر بێ -).

١٠٥/١١-[١١]- عن ابنِ مسعودٍ رضيَ اللّهُ عنه قال: قال النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: «الجنة أَقربُ إلى أَحدِكُم مِنْ شِراكِ نَعْلِهِ والنَّارُ مِثْلُ ذلِكَ» رواه البخاري.

لە ئیبن‌و مەسعوودەوە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکامێ لە ئێوە بگری بەهەشتی لێوە نزیکترە لەبن پێلاوی کەوشەکانی، دۆزەخیش هەروەها (بوخاری-ڕەزای خودای لەسەر بێ).

١٠٦/١٢-[١٢]- الثاني عشر: عن أبي فِراس رَبِيعةَ بنِ كَعْبٍ الأَسْلَمِيِّ خادِمِ رسولِ اللّهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم، ومِنْ أَهْلِ الصُّفَّةِ رضي اللّهُ عنه قال: كُنْتُ أَبيتُ مع رسولَ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم، فآتِيهِ بِوَضوئِهِ، وحاجتِهِ فقال: «سلْني» فقُلْت: أَسْأُلُكَ مُرافقَتَكَ في الجنَّةِ. فقالَ: «أوَ غَيْرَ ذلِكَ؟» قُلْت: أَسْأُلُكَ مُرافقَتَكَ في الجنَّةِ. فقالَ: «أوَ غَيْرَ ذلِك ؟» قُلْت: هو ذَاك. قال: «فأَعِنِّي على نَفْسِكَ بِكَثْرةِ السجُودِ» رواه مسلم.

ئەبو فیراس: ڕەبیعەی کوڕی کەعبی ئەسلەمی (ڕەزای خودای لەسەر بێ) کە بەردەستی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) بوو، کە یەکێك بوو لە دانیشتوانی صوففە، فەرمووی: لە سەفەرێکا بەشەو لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم (دروودی خوای لەسەر بێ) جارێکیان کە ئاوی دەسنوێژو بەرماڵ‌و سیواك‌و شتومەکەکەیم بۆی برد، فەرمووی پێم: داخوازیت چییە بیکە. گوتم: داوای ئەوەت لێ دەکەم کە لە بەهەشتا ببم بەهاوڕێت، فەرموی: خۆ داوای شتێکی تر ناکەی؟ گوتم: نەخێر داوام هەر ئەوەیەو بەس، فەرموی: کەواتە خۆتیش بەکردنی نوێژی زۆر، کە سەجدەی زۆری تیایە یاریدەم بدە، هەتا نەفست بێنینە سەر ڕێ (م).

---

١١ بوخاری (٦٤٨٨).

١٢ موسلیم (٤٨٩)

١٠٧/١٣-[١٣]– عن أبي عبد اللّٰه ويُقَالُ: أَبُو عَبْدِ الرَّحمنِ ثَوْبانَ مَوْلى رسول اللّٰهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: سَمِعْتُ رسولَ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم يقول: عليكَ بِكَثْرةِ السُّجُودِ، فإنَّك لَنْ تَسْجُد للّٰهِ سجْدَةً إلاّ رفَعكَ اللّٰهُ بِهَا درجةً، وحطّ عنْكَ بِهَا خَطِيئَةً» رواه مسلم.

**ئەوبان** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **کە نۆکەری حەزرەت بوو** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: بە گوێی خۆم ژنەوتم لە زاری پیرۆزی حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: هەتا دەتوانیت نوێژێکی بێ شومار بکە بۆ خودا، هەموو جارێ کە کڕنووشێ بۆ خودا دەبەیت خودا بەو کوڕنووشە یەك پایە بەرزت دەکاتەوەو یەك گوناهیشت لێ هەڵ دەوەرێنێ (م-خ-).**

١٤/١٠٨– عن أبي صَفْوانَ عبدِ اللّٰه بن بُسْرِ الأسلَمِيِّ، رضي اللّٰه عنه، قال: قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: «خَيْرُ النَّاسِ مَنْ طالَ عمُرُه وَحَسُنَ عملُه» رواه الترمذي، وقال حديثٌ حسنٌ.

**گێڕانەوەی تاجی پیرۆز، لەبەرگی پێنجەما، لەباسی حیرص و طوولی ئەمەلدا ئاوایە: ئەبوبەکر** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! چ کەسێ باشە؟ فەرمووی: ئەو کەسەی کە تەمەنی درێژ بێ و کرداری جوان بێ ئەوە باشترین کەسە[١].گوتی: ئەی چ کەسێ زۆر بەدە؟ فەرمووی: ئەو کەسەی تەمەنی درێژ بێ و ڕەفتاری خراپ بێ ئەوە خراپترین کەسە. (بڕوانە تاج/٩ل-٣٠٥ بەکوردی)**

١٥/١٠٩– عن أنسٍ رضي اللّٰه عنه، قال: غَاب عمِّي أَنَسُ بنُ النَّضْرِ رضي اللّٰهُ عنه، عن قِتالِ بدرٍ، فقال: يا رسولَ اللّٰه غِبْت عن أوَّلِ قِتالٍ قَاتلْتَ الْمُشرِكِينَ، لَئِنِ اللّٰهُ أشْهَدَنِي قتالَ المشركين لَيُرِيَنَّ اللّٰهُ ما أصنعُ، فلما كانَ يومُ أُحدٍ انْكشَفَ الْمُسْلِمُون فقال: اللّٰهُمَّ أعْتَذِرُ إليْكَ مِمَّا صنَع هَؤُلاءِ يَعْني أصْحَابَه وأبرأُ إلَيْكَ مِمَّا صنعَ هَؤُلاءِ يعني الْمُشْرِكِينَ ثُمَّ تَقَدَّمَ فَاسْتَقْبَلَهُ سعْدُ بْنُ مُعاذٍ، فَقالَ: يا سعْدُ بْنَ مُعاذٍ الْجنَّةُ وربِّ الكعْبةِ، إنِي أجِدُ رِيحَها مِنْ دُون أُحُدٍ. قال سعْدٌ: فَمَا استَطعْتُ يا رسول اللّٰه ماصنَعَ، قَالَ أنسٌ: فَوجدْنَا بِهِ بِضْعاً وثَمَانِينَ ضَرْبةً بِالسَّيفِ، أوْ طَعْنَةً بِرُمْحٍ، أو رمْيةً بِسهْمٍ، ووجدْناهُ قد قُتِلَ

---

١٣ موسليم (٤٨٨).

١ وەك جەنابی مامۆستا مەلا کریمی بیارە، خودا بەرخورداری هەردوو جیهانی بکاو ئێمەیش لەخاك پای ئەودا پەنا بدا. (وەرگێڕ)

وَمُثِّلَ بِهِ المُشرِكُونَ فَما عرفَهُ أَحدٌ إلاَّ أُخْتُهُ بِبنَانِهِ. قال أنسٌ: كُنَّا نَرى أوْ نَظُنُّ أنَّ هَذِهِ الآيَة نزلَتْ فيهِ وَفِي أشْباهِهِ: ﴿مِنَ المُؤْمِنِينَ رِجالٌ صدقُوا ما عَاهَدُوا اللَّه علَيهِ﴾ ﴿الأحزاب: ٢٣﴾ إلى آخرها. متفقٌ عليه. قوله: «لَيُرِيَنَّ اللَّهُ» رُوِي بضم الياءِ وكسر الراءِ، أي لَيُظْهِرنَّ اللَّهُ ذَلِكَ لِلنَّاسِ، ورُوِي بفتحهما، ومعناه ظاهر، واللَّه أعلم.

ئەنەس (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: مامەم، ئەنەسی کوری نەضر (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لەشەڕی بەدردا لەوێ نەبوو بوو، جا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەیەکەم شەڕدا، کە تۆ کردت لەگەڵ کافرانا من لەوێ نەبووم. بەڵام لەمەولا ئەگەر خودا شەڕی لەگەڵ کافرانا بە نصیب کردم ئەوسا خۆم دەزانم کەچی دەکەم، وە خوا یاربێ خودا بۆ خۆی دەمبینێ، لەمەیدانی مەردایەتیدا چی دەکەم. جا کاتی ڕووداوی ڕۆژەکەی ئوحود هەوماو موسوڵمانەکان ڕەوینەوەو پشتیان چۆڵ بوو، مامەم بە پەرۆشەوە فەرمووی: خودایە! پۆزش خوازی لەلای تۆ دەکەم و داوای لێ بووردن دەکەم لەمەی ئەم برادەرە موسوڵمانانەی من کردیان وەیەخەیش هەڵ دەتەکێنم لەم نامەردییەی ئەم بتپەرستانە دەیکەن و بەریم لەخۆیان و کردارو ڕەفتاریان. ئەوجا وەك شێری نەر ڕۆیشتە پێشەوە بۆ کۆڕی شەڕ، لەولاوە سەعدی کوری موعاذ ڕووبەرووی دەێ و ڕادەکا، مامیشم پێی دەڵێ: ئەی سەعدی کوری موعاذ! بۆچی هەڵ دێی؟ چۆن پیاو لەبەهەشت ڕادەکا، ئا ئەوە بەهەشتە، بە خاوەنی کەعبەی موسوڵمانان کە خودای هەمووانە بۆن و بەرامەی بەهەشت لەلای ئوحودەوە دەمار دێ بەسەرما!

سەعد دەیفەرموو: ئەی پێغەمبەری خودا ! ئەوەی ئەو کردی لە تەوانای مندا نەبوو. ئەنەس فەرمووی: تەرمەکەی زیاتر لە هەشتا شوێنی ڕم و دەمەتیرو شیری پێوە بوو، کە دۆزیمانەوە کوژرابوو، کافرەکان لچ و لێویان کردبوو، کەس نەیناسیەوە، خوشکەکەی نەبێ، ئەویش بەسەر پەنجەکانیدا ناسییەوە.

ئەنەس دەیفەرموو: ئێمە وامان دانابوو کەئەم ئایەتە پیرۆزمیە لەشەئنی ئەوو وێنەی ئەوا هاتۆتە خوارەوە کە دەفەرموێ: الاحزاب /٢٣. واتە: کەڵە پیاوی مەردی نەبەرد، لەسایەی خوداوە زۆر زۆرە لەناو موسوڵمانانَدا، کە مەردانەو شێرانە ئەو پەیمانەی دەیدەن بەخودا بەسەر ڕاستی دەیبەنە سەرو خودا لەخۆیان ڕازیی دەکەن و چاوو دڵی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ڕۆشن دەکەن، ئەم مەردانی خودایە

**هەیانە سەری خۆی داناوە لە پێناوی ئیسلاماو بەئاکامی خۆی گەیشتووە، سا یا بەمردن، یا بەشەهید بوون، وهەیانە هێشتا بەتەمایە بگا بەو پایە جوانە، بەڕاستی ئەم مەردانە یەك ڕەنگن‌و یەك دینن‌و پەسمانی خۆیان بە کەمترین گۆڕین نەگۆڕیوە (ش).**

١٦/١١٠-[١٦]- عن أبي مسعود عُقْبَةَ بن عمرو الأنصاريِّ البدريِّ رضي اللّٰهُ عنه قال: لَّما نَزَلَتْ آيةُ الصَّدَقةِ كُنَّا نُحامِلُ عَلَى ظُهُورنا. فَجَاءَ رَجُلٌ فَتصَدَّقَ بِشَيْءٍ كَثِيرٍ فَقَالُوا: مُراءٍ، وجاءَ رَجُلٌ آخَرُ فَتَصَدَّقَ بِصَاعٍ فقالُوا: إنَّ اللّٰه لَغَنِيٌّ عَنْ صاعِ هَذَا، فَنَزَلَتْ {الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الُمطَّوِّعِينَ مِنَ الُمؤْمِنِينَ فِي الصَّدَقَاتِ وَالَّذِينَ لاَ يَجِدُونَ إلاَّ جُهْدَهُمْ} ﴿التوبة ٧٩﴾ الآية. متفقٌ عليه. «ونُحَامِلُ» بضم النون، وبالحاءِ المهملة: أَيْ يَحْمِلُ أَحَدُنَا على ظَهْرِهِ بالأجْرَةِ، وَيَتَصَدَّقُ بها.

**ئەبو مەسعوودی ئەنصاری** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: کە ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە، کە فەرمان دەکا بەخێرو زەکات، دەچووین کۆڵە کێشیمان دەکردو کرێکەیمان دەکرد بەخێر، پیاوێ ماڵی زۆری بەخشییەوە بازێ گوتیان: ئەمە بۆ رووپامایی‌و ریاکاری ئەمەی کردووە، پیاوێکی تریش هات، مەنێکی کرد بەخێر، بازێ گوتیان: خودا چ هەوەجێکی بەم مەنەی ئەمە هەیە؟ جا ئەم ئایەتە هاتە خوەارەوە: ﴿الذين يلمزون المطوعين من المؤمنين في الصدقات والذين لايجدون إلا جهدهم فيسخرون منهم سخر الله منهم ولهم عذب عظيم﴾ التوبة/ ٧٩- (ش).**

١١١/١٧-[١٧]- عن سعيدِ بنِ عبدِ العزيزِ، عن رَبيعةَ بنِ يزيدَ، عن أَبِي إدريس الخَوْلاَنِيِّ، عن أَبِي ذَرِّ جُنْدُبِ بنِ جُنَادَةَ، رضي اللّٰهُ عنه، عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم فيما يَرْوي عَنِ اللّٰهِ تبارك وتعالى أنه قال: «يا عِبَادِي إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّماً فَلاَ تَظالُموا، يَا عِبَادِي كُلُّكُم ضَالٌّ إلاَّ مَنْ هَدَيْتُهُ، فَاسْتَهْدُونِي أَهْدكُمْ، يَا عِبَادِي كُلُّكُمْ جائعٌ إلاَّ منْ أطعمتُه، فاسْتطْعموني أُطعمْكم، يا عبادِي كلكم عَارٍ إلاَّ مِنْ كَسَوْتُهُ فَاسْتَكْسُونِي أَكْسُكُمْ، يَا عِبَادِي إِنَّكُمْ تُخْطِئُونَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَأَنَا أغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعاً، فَاسْتَغْفِرُونِي أغْفِرْ لَكُمْ، يَا عِبَادِي إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضُرِّي فَتَضُرُّونِي، وَلَنْ تَبْلُغوا نَفْعِي

---

١٦ بوخاری (١٤١٥)، موسلیم (١٠١٨).

١٧ موسلیم (٢٥٧٧).

فَتَنْفَعُوني، يَا عِبَادِي لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وآخِرَكُمْ، وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أتقَى قلبِ رجلٍ واحدٍ منكم ما زادَ ذلكَ فِي مُلكي شيئاً، يا عِبَادِي لو أَنَّ أوَّلكم وآخركم وإنسكم وجنكُمْ كَانوا عَلَى أفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئاً، يَا عِبَادِي لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، قَامُوا فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، فَسأَلُونِي فَأَعْطَيْتُ كُلَّ إنْسان مَسْأَلَتَهُ، مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِمَّا عِنْدِي إلاَّ كَمَا يَنْقُصُ المِخْيَطُ إِذَا أُدْخِلَ البَحْرَ، يَا عِبَادِيَ إنَّما هِيَ أعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُمْ، ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إيَّاهَا، فَمَنْ وَجَدَ خَيْراً فَلْيَحْمِدِ اللّه، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلاَ يَلُومَنَّ إلاَّ نَفْسَهُ». قَالَ سعيدٌ: كان أبو إدريس إذا حدَّثَ بهذا الحديث جَثَا عَلَى رُكبتيه. رواه مسلم. وروينا عن الإمام أحمد بن حنبل رحمه اللّه قال: ليس لأهل الشام حديث أشرف من هذا الحديث.

سەعیدی کوڕی عەبدولعەزیز، لە ڕەبیعەی کوڕی یەزیدەوە لە ئەبو ئیدریسی خەولانییەوە، لە ئەبو ذەڕەوە (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) لە حەزرەتەوە (درودی خوای لەسەر بێ) لە فەرموودەیەکی قودسیدا فەرمووی: خودای گەورەو میهرەبان دەفەرموێ: ئەی عەبدەکانم! ئەی بەندەکانم! من زوڵمو زۆرو ستەمم لەسەر خۆم حەرام کردووەو لەناو ئێوەشا حەرامم کردووە، کەواتە ئێوە زۆرو ستەم لە یەکتری مەکەن، ئەی بەندەکانم! ئێوە هەمووتان سەر لێ شێواوو گومڕان مەگەر ئەوانەتان کە من خۆم بیخەمە سەر ڕێگەی ڕاستو ڕێی هەقی نیشان بدەم، کەوایە داوای ڕێنموونی هەر لە خۆم بکەن هەتا ڕێنموونیتان بکەم، ئەی بەندەکانم! هەمووتان ڕەشو رووتو برسین، ئەوانەتان نەبێ کە خۆم نانو ئاوو پۆشاکی پێ بدەم، کەواتە داوای ئەم شتانە هەر لەخۆم بکەن تا بیدەم پێتان. ئەی بەندەکانم! ئێوە ناگەنە ئەو دارەتو رادەیە کەبتوانن زیانێ، یا سوودێ بەمن بگەیەنن، کەواتە مەبەست لەم پەندو تەمێو ئامۆژگارییە سوود-یا زیان-ی ئێوەیە، نەك سوودو زیانی من، ئەی بەندەکانم! ئەگەر ئێوە لەیەکەم کەستانەوە بیگری، هەتا دوا کەستان، بەئادەمیزادو پەریتانەوە بە خاسو خراپتانەوە، یەك بەیەکتان پیاوی باشو لەخوا ترس بن، وەك لەخودا ترسترین کەسی ئێستاتان، بەوە هیچ لەسامانو موڵكو گەورەیی من زیاد ناکات، هەروەها ئەگەر لەیەکەم کەستانەوە بیگری هەتا دوا کەستان، بەئادەمیزادو پەریو جنۆکەتانەوە، بەخاسو خراپتانەوە، یەك بەیەکتان پیاوی خراپ بن وەك لەخودا دوورترین کەسی ئێستاتان، بەوە هیچ

لەسامان و گەورەیی من کەم نابێتەوە، واتە: بوون و نەبوونی ئێوە بۆ خوایەتی من یەکسانەو چوون یەکەو، ئەی بەندەکانم! ئەگەر بێت و لەیەکەم کەستانەوە تا دوا کەستان، بە ئادەمیزادو جنۆکەتانەوە لە دەشتێکا بوەستن و لەیەك دەما هەرکەستان داوای شتێکم لێ بکا، وە لەیەك هەناسەدا هەرکەسەیەکتان دڵخوازی خۆیی پێ بدەم، بەوە هیچ لە گەنجینەی من کەم نابێتەوە، چۆن دەرزییەك بژەنی بەئاوی دەریایەکا ئاوا، ئەی بەندەکانم! هەرچی دێتەوە ڕێتان کردەوەی خۆتانە، من زۆر بە وردی سەرژمێریان دەکەم و ژمارەو چەنی چۆنیان ڕادەگرم و دوایی بەتەواوی دەیدەمەوە پێتان!

جا هەرچی هاتەوە ڕێتان کردەوەی خۆتانە، ئەگەر باش بوو ئەوا سوپاسی خودای لەسەر بکەن، خۆ ئەگەر بە جۆرێکی تر بوو ئەوا سەرزەنشتی خۆتان بکەن و بەس کە ئەو کارە بەدەتان لەکاتی خۆیا کردووە، ئەبو سەعید (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەیگوت: هەموو جارێ کە ئەبو ئیدریس ئەم فەرموودەیەی دەگێڕایەوە دەهات بەچۆکاو بەڕێزەوە چۆکی دەدا (م). ئیمامی نەوەوی (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەم فەرموودەی پێشەوە نازدارترین فەرموودەیە کە خەڵکی شام گێڕاویانەتەوە.

## ١٢- باسی هاندان لەسەر زۆر خێرکردن و خێرخواهی لەدوا دوایی تەمەندا
## باب الحث على الإزياد في أواخر العمر

قال الله تعالى: ﴿أو لم نعمركم ما يتذكر فيه من تذكر وجاءكم النذير﴾فاطر/٣٧. واتە: کافرەکان لە دۆزەخا هات و هاوار دەکەن و دەڵێن: خودایە! هاوار لەم ئاگرە ڕزگارمان بکە، ئیتر تۆبە، مەرج بێ ئیتر کاری باش نەبێ نەیکەین، دەفەرموون پێیان: درۆ دەکەن، ئەی ئەوە نەبوو لە جیهانا ماوەیەکی لەبار ماوەمان دان و تەمەنمان درێژکردن، ئەوەی کە هۆش و گۆشێکی بوو بۆ خۆی بیرێی کردەوە، ئەی ئەوە نەبوو پێغەمبەرمان بۆ ناردن و لەم ڕۆژە ڕەشەی ترساندن، بەڵام ئێوە خۆتان لەڕاستی هەق کەڕکرد، کەواتە بخۆن دەرتان بێ، تازە کەس نایە بەهاواری ستەمکارانەوە.

ئیبن و عەبباس و زانا وردکارەکان دەفەرموون: مەعنای وایە: پێیان دەگوترێ: ئەی ئەوە نەبوو لە جیهاندا شەست ساڵ تەمەنمان درێژکردن؟ فەرموودەی ژمارە (١١٢/١)ی ئەم باسە پشتگیری لەم واتایە دەکا.

بێژراویشە: واتە: هەژدە ساڵ، بێژراویشە: مەبەست چل ساڵە، حەسەن‌و کەلبی‌و مەسرووق وایان فەرمووە، هەمان مەعنا لە ئیبن‌و عەبباسیشەوە ڕاگوێز کراوە. ڕاگوێزیش کراوە کە خەڵکی مەدینە کاتێ تەمەنیان دەگەیشتە چل ساڵ ئیتر خۆیان تەرخان دەکرد بۆ خوداپەرستی.

وقوله تعالى: ﴿وجاءكم النذير﴾ قال ابن عباس الجمهور: على أنه هو النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) وقيل: الشيب، قال عكرمة وابن عيينة وغيرهما والله أعلم.

ئیبن‌و عەبباس‌و جەماوەری زاناکان دەفەرموون: مەبەست لە (نذير) لەم ئایەتەدا پێغەمبەری خۆمانە (درودی خوای لەسەر بێ). دەیشڵێن: مەبەست سەروڕیشی ماش‌وبرنجە کە نیشانەی پیریيە، ئەم ڕاڤەیەش عیکرەمەو عویەینەو گەلێ کەسی تر گوتوویانە.

١/١١٢–[1] عن أَبي هريرة رضي اللّٰه عنه، عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: «أَعْذَرَ اللّٰهُ إلى امْرِىءٍ أخَّرَ أجلَه حتى بلَغَ سِتِّينَ سنةً» رواه البخارى. قال العلماءُ معناه: لَمْ يتْرُكْ لَه عُذْراً إذ أمْهَلَهُ هذِهِ المُدَّةَ. يُقال: أعْذَرَ الرَّجُلُ إذا بلغَ الغاية في العُذْرِ.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خودا بیانوی ئەو کەسەی بڕیوەو عوزری بۆ نەهێشتۆتەوە کە ئاکامی دوا بخات‌و تەمەنی درێژ بکا تا تەمەنی دەگاتە شەست ساڵ (ب).

٢/١١٣–[2] عن ابن عباس، رضي اللّٰه عنهما، قال: كان عمر رضي اللّٰه عنه يُدْخِلُني مَع أشْياخ بْدر، فَكأنَّ بعْضَهُمْ وجدَ فِي نفسه فقال: لِمَ يَدْخُلُ هَذِا معنا ولنَا أبْنَاء مِثْلُه، ؟ فقال عمرُ: إنَّهُ من حيْثُ علِمْتُمْ، فدَعَانى ذاتَ يَوْمٍ فَأدْخلَنى معهُمْ، فما رأَيْتُ أنَّه دعانى يوْمئِذٍ إلاَّ لِيُرِيهُمْ قال: ما تقولون في قول اللّٰه تعالى: { إذا جاءَ نَصْرُ اللّٰهِ والْفَتْحُ} ﴿الفتح: ١ ﴾ فقال بَعضُهُمْ: أمِرْنَا نَحمَدُ اللّٰهَ ونَسْتَغْفِره إذَا نَصرنَا وفَتَحَ علَيْنَا. وسكَتَ بعضهُمْ فلم يقُلْ شيئاً فقال لى: أكَذلك تقول يا ابنَ عباس ؟ فقلت: لا. قال فما تقول ؟ قلت: هُو أجلُ رسولِ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم، أعْلمَه له قال: { إذا جَاءَ نَصْرُ اللّٰهِ والْفتحُ} وذلك علامةَ أجلِك { فَسَبِّحْ بِحمْدِ رَبِّكَ واسْتغْفِرْهُ إنَّه كانَ تَوَّاباً} ﴿ الفتح: ٣﴾ فقال عمر رضي اللّٰه عنه: ما أعْلَم منها إلاَّ ما تَقُول. رواه البخارى.

---

١ موسلیم (٦٤١٩).

٢ بوخاری (٤٩٧٠).

ئیبن‌و عەباس (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) فەرموی: عومەر (ڕەزای خودای لەسەر بێ) گەڵێ جار منی دادەنا لەناو کۆڕی پیرانی موسوڵمانانداا ئەوانەیان کە کاتی خۆی ئامادەی غەزای بەدر بوو بوون، لەگەڵ ئەواندا راوێژی بەمنیش دەکرد، وەك بڵێی هەندێکیان لە دڵەوە ئەمەی پێ ناخۆش بێ وابوو، بۆیە دەیانگوت: بۆ ئەمە دێتە ناو ئێمەوە، خۆشەویستی ئێمە کوڕەکانمان وەك ئەمە وایە؟ عومەریش (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرموی: ئەمە لەو بنەماڵە پیرۆزەیە کە خۆتان دەیزانن، کە خانەوادەی حەزرەتە (درودی خوای لەسەر بێ).

جا رۆژێ عومەر (ڕەزای خودای لەسەر بێ) ناردی بەشوێنماو لەناو کۆڕی ئەواندا دایانام، خۆم زانیم کە ئەو رۆژە بۆ ئەوە بانگی کردووم کە پایەی زانستی‌و ژیری منیان پێ نیشان بدا. عومەر فەرمووی: لەبارەی فەرمایشتی خواوە﴿إذا جاء نصر الله والفتح﴾ئێوە دەڵێن چی؟ هەندێکیان گوتی: خودا لەم ئایەتەدا فەرمانی پێ کردووین کە سوپاسی بکەین‌و لێی بپاڕێینەوە بەتایبەتی لەو کاتانەدا کەسەرمان دەخاو وڵاتمان بۆ فەتح دەکا بازێ تریان خامۆش بوون‌و قسەو نقەیان نەکرد، ئەوجا بەمنی فەرموو: تۆیش هەروا دەڵێیت، ئەی ئیبن‌و عەبباس؟! گوتم: نەء، گوتی: ئەی تۆ دەڵێی چی؟ گوتم ئەمە نیشانەی ئاگامی پێغەمبەرە (درودی خوای لەسەر بێ) خودا لەم ئایەت‌و سوورەتەدا، حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) ئاگادار دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿إذا جاء نصر الله والفتح﴾ النصر/١. کاتی خودا سەری خستیت بەسەر دوژمنتاو مەککەی پیرۆز گیراو ئازاد کراو بووەوە بە وڵاتی ئیسلام. ئەوە نیشانەی مەرگی تۆیە. ﴿فسبح بحمد ربك واستغفره انه كان توابا﴾النصر/٣، کەواتە: ئەو کاتە تەسبیح‌و ئیستیغفارو حەمدی خودا بکەو بڵێ: (سبحان الله بحمده، أستغفر الله وأتوب اليه) چونکە خوا تەوبەی زۆر پێ خۆشەو تەوبە لە عەبدی خۆی گیرا دەکا.

عومەریش (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: منیش هەر ئەمەی لێ دەزانم کە تۆ گوتت. (بوخاری -ڕەزای خودای لەسەر بێ).

٣/١١٤–[٣]– عن عائشةَ رضي اللّه عنها قالت: ما صَلّى رسولُ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم صلاةً بعْد أَنْ نزَلَتْ عليْهِ { إذَا جَاءَ نصْرُ اللّهِ والْفَتْحُ } إلاّ يقول فيها: (سُبْحانك ربَّنَا وبِحمْدِكَ، اللّهُمَّ اغْفِرْ لى) متفقٌ عليه.

---

٣ بوخاری (٤٩٦٧)، موسلیم (٤٨٤) رقم(٢١٨)و (٢١٩)و (٢٢٠).

وفي رواية الصحيحين عنها: كان رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يُكْثِر أنْ يَقُول فِي ركُوعِهِ وسُجُودِهِ: (سُبْحانَكَ اللّٰهُمَّ ربَّنَا وَبحَمْدِكَ، اللّٰهمَّ اغْفِرْ لي) يتأوّل الْقُرْآن.

معنى: (يتأوَّل الْقُرْآنَ) أيْ: يعْمل مَا أُمِرَ بِـهِ فِي الْقُـــرآنِ فِي قولِـهِ تعـالى: {فَسبِّحْ بِحمْدِ ربِّكَ واستَغْفِرْهُ }.

وفي رواية لمسلم: كان رسولُ اللّٰـه صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم يُكْثِـرُ أنْ يَقـولَ قبْـلَ أَنْ يَمُوتَ: «سُبْحانَكَ اللّٰهُمَّ وبِحَمْدِكَ، أَسْتَغْفِرُكَ وأَتُوبُ إِلَيْـكَ». قالـت عائشـةُ: قلـت: يـا رسولَ اللّٰه ما هذِهِ الكلِمَاتُ الَّتِي أرَاكَ أحْدَثْتَها تَقولها ؟ قـال: «جُعِلَتْ لِي علامةٌ في أمَّتي إذا رَأَيتُها قُلتُها {إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللّٰهِ والْفَتْحُ } إلى آخر السورة».

وفي رواية له: كان رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يُكْثِرُ مِنْ قَـوْل: «سُـبْحانَ اللّٰـهِ وبِحَمْدِهِ. أَسْتَغْفِرُ اللّٰه وَأَتُوبُ إِلَيْه». قالت: قلت: يا رسـولَ اللّٰـه، أَرَاكَ تُكْثِـرُ مِـنْ قَـوْل: سُبْحَانَ اللّٰهِ وبِحَمْدِهِ، أَسْتَغْفِر اللّٰه وأَتُوبُ إِلَيْهِ ؟ فقال: «أَخْبَرَنِي رَبِّي أَنِّي سَأَرَى علاَمَةً فِـي أُمَّتِي فَإِذَا رأَيْتُها أكْثَرْتُ مِن قَوْل: سُبْحانَ اللّٰهِ وبِحَمْدِهِ، أَسْـتَغْفِرُ اللّٰـه وَأَتـوبُ إِلَيْـهِ: فَقَـدْ رَأَيْتُها: {إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللّٰهِ والْفَتْحُ } فَتْحُ مَكَّةَ، { ورأَيْتَ النَّاس يدْخُلُونَ فِـي دِيـنِ اللّٰـهِ أَفْوَاجًا، فَسبحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ واسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كانَ توَّاباً }».

**عائیشه** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: لەپاش هاتنە خوارەوەی سورەتی ﴿إذا جاء نصر الله والفتح﴾ حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **لەناو هەموو نوێژێکا دەیفەرموو: (سبحانك ربنا وبحمدك، اللهم أغفر لى) (ش).**

**عائیشە** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **بەزۆری لە چەمینەوەو کوڕنوشدا دەیفەرموو: (سبحانك اللهم ربنا وبحمدك اللهم اغفر لی: خودایە تۆ خودایەکی پاكو بێ نەنگیت، ئەی پەروەردگارم! لەسایەی خۆتەوەیە کە من تەسبیحو سوپاسو ستایشی تۆ دەکەم، خودایە! لێم خۆش ببە. حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **بەگوتنی ئەم وشە پیرۆزەیە کاری بەو ئایەتی قورئانە دەکرد، کەفەرمانی پێ دەکا بەکردنی تەسبیحاتو حەمدو ئیستیغفار واتە کاری بەم ئایەتە دەکرد: ﴿فسبح بحمد ربك واستغفره﴾(ش).**

**لەگێڕانەوەیەکی موسلیمدا: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **لەپێش مەرگیدا بەزۆری دەیفەرموو: (سبحانك وبحمدك، استغفرك واتوب اليك). عائیشە** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: عەرزیم کرد: قوربان! ئەم وشە تازانە چییە، تازە فێربووی دەیان**

فەرمووی؟ فەرمووی (درودی خوای لەسەر بێ) ﴿إذا جاء نصر الله والفتح﴾ تاكۆتایی سوورەت كراوە بە نیشانەیێ بۆم، ئەوەتەی ئەو نیشانە هاتۆتە دی، منیش وەك پێم گوتراوە ئەم وشانە دەڵێم.

لە گێڕانەوەیەكی موسلیما (ڕەزای خودای لەسەر بێ) عائیشە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بەزۆری دەیفەرموو: (سبحان الله وبحمده استغفر الله وأتوب اليه). فەرمووی منیش عەرزم كرد، قوربان! دەتبینم بەزۆری دەفەرمووی: (سبحان الله وبحمده استغفر الله وأتوب اليه)؟ فەرمووی (درودی خوای لەسەر بێ): پەروەردگارم هەواڵی داوە پێم، كە بە چاوی خۆم نیشانەیێ لەناو ئوممەتما دەبینم، هەركاتێ ئەو نیشانەیە ببینم بەزۆری دەڵێم: (سبحانك اللهم وبحمدك، أستغفر الله وأتوب اليه). ئێستاش ئەوەتانێ ئەو نیشانەیە بەچاوی خۆم دەبینم، كە هاتنی ئەم سوورەتەیە ﴿إذا جاء نصر الله والفتح﴾ هەتا ﴿كان توابا﴾ مەبەست لەم فەتحەی كە لەم سوورەتەدایە فەتحی مەككەیە.

١١٥/٤-[٤]– عن أنسٍ رضي اللّهُ عنه قال: إنَّ اللّه عزَّ وجلَّ تَابعَ الوحْيَ على رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قَبْلَ وَفَاتِهِ، حتَّى تُوُفِّي أكْثَرَ مَا كَانَ الْوَحْيُ. متفقٌ عليه.

ئەنەس (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: خودای گەورەو خاوەن شكۆ پەیتا پەیتا سروشی بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەنارد، لە پێش مەرگیا، تەنانەت لە دەوروبەری مەرگیا لە هەموو كاتێ پتر سرووشی بۆ دەهات. (ش).

١١٦/٥-[٥]– عن جابرٍ رضي اللّه عنه قال: قال رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (يُبْعثُ كُلُّ عبْدٍ على ما مَاتَ علَيْهِ) رواه مسلم.

جابیر (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەتا بەندە لەسەر ئەو شتە زیندوو دەكرێتەوە كە لەدنیادا لەسەری مردووە(م). واتە: كەسێ لەپێش مردنیا خوو بە چیەوە بگرێ، لەسەر ئەو حاڵە زیندوو دەكرێتەوەو لەدەشتی مەحشەردا بەو پیشەیەوە ناو دەردەكا، ئیتر چ چاك، چ خراپ، خۆزگە بە خۆزگەی خودا لەسەر ئەم حاڵەی ئێستا زیندوو دەبوومەوە،

٤ بوخاری (٤٩٨٢)، موسلیم (٣٠١٦).

٥ موسلیم (٢٨٧٨).

تەرجەمەی فەرموودەکانی پێغەمبەری خودام دەکرد. بۆ خودا چی تێ دەچێ (وەرگێڕ).

## ١٣-باسی زۆری ڕێگەی خێرو چاکە (باب في بيان كثرة طرق الخير)

قال الله تعالى: ﴿وما تفعلوا من خير فإن الله به عليم﴾البقرة/٢١٥. واتە: هەر چاکەو خێرێ بکەن، کەم بێو زۆر بێ، خودا ئاگای لێیەتی شتیش کە بۆ خودابێ، کەم بێو زۆر بێ، پێی خۆشەو پاداشی دەداتەوە.

وقال تعالى: ﴿وما تفعلوا من خير يعلمه الله﴾البقرة/١٩٧.

وقال تعالى: ﴿فمن يعمل مثقال ذرة خيرا يره﴾الزلزلة/٧.

واتە: هەرکەسێ بەقەی سەنگی گەردیلە بچکۆلەیێ چاکەی کردبێ پاداشەکەی دەبینێتەوە.

وقال تعالى: ﴿من عمل صالحا فلنفسه﴾الجاثية/١٥.

واتە: چاکە بکەن هەر بۆخۆتانی دەکەن، خراپە بکەن هەر بۆ خۆتانی دەکەن.

والآيات في الباب كثيرة، وأما الأحاديث فكثيرة جدا، وهي غير منحصرة فنذكر طرفا منها:

١١٧/١-[١]- عن أَبِي ذرّ جُنْدَبِ بنِ جُنَادَةَ رضي اللّٰه عنه قال: قلت يا رسولَ اللّٰه، أيُّ الأعْمالِ أفْضَلُ ؟ قال: (الإيمانُ باللّٰهِ، وَالجِهَادُ فِي سَبِيلِهِ). قُلْتُ: أيُّ الرِّقَابِ أفْضَلُ ؟ قال: (أنْفَسُهَا عِنْد أهْلِهَا، وأكثَرُهَا ثَمناً). قُلْتُ: فَإنْ لَمْ أفْعلْ ؟ قال: (تُعِينُ صَانِعاً أوْ تَصْنَعُ لأخْرَقَ) قُلْتُ: يا رسول اللّٰه أرَأيتَ إنْ ضَعُفْتُ عَنْ بَعْضِ الْعملِ ؟ قال: (تَكُفُّ شَرَّكَ عَن النَّاسِ فَإنَّها صدقةٌ مِنْكَ على نَفسِكَ). متفقٌ عليه. (الصانِعُ) بالصَّاد المهملة هذا هو المشهور، ورُوِي (ضَائعاً) بالمعجمة: أيْ ذَا ضياع مِنْ فقْرِ أوْ عِيالٍ، ونْحو ذلكَ (والأخْرَقُ): الّذي لا يُتقنُ ما يُحاوِلُ فِعْلَهُ.

ئەبو زەڕ (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پرسیم لە حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ): کام کارە زۆر پەسەندو گەورەیە؟ فەرمووی: ئیمانو باوەڕ بە خوداو خەباتو تێکۆشان لە ڕێگەی ئەو زاتەدا. گوتم: ئەی کام جۆرە بەندەیێ ئازاد بکرێ پاداشی گەورەترە؟

١ بوخاری (٢٥١٨)و موسلیم (٨٤).

فەرمووی: ئەوەی کە بەبەها گرانەو لەلای خاوەنەکەی گەلێ چاكو نایابو گرانبەهایە. عەرزیم کرد: ئەگەر ئەوەم بۆ نەکرا؟ فەرموی: یاریدەی پیشەسازێ بدە، یا دەستی ناشیو كۆڵییەك بگرەو فێری کارێ، یا پیشەیەکی بکە، عەرزیم کرد: ئەگەر ئەوەیشم بۆ نەکرا؟ فەرمووی: شەڕی خۆت لە مەردووم لادە، ئەویش هەر خێرو چاکەیەو بۆ خۆتی دەکەی. (ش/ تاج).

١١٨/٢-[٢]- عن أَبِي ذرّ رضي اللّٰه عنه أيضاً أنَّ رسُولَ اللّٰهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: يُصْبِحُ على كلِّ سُلاَمَى مِنْ أَحَدِكُمْ صدقَةٌ، فَكُلّ تَسبِيْحةٍ صَدقةٌ، وكُلُّ تَحْمِيدَةٍ صدقَةٌ، وكُلُّ تهْلِيلَةٍ صَدَقةٌ، وكلُّ تَكْبِيرةٍ صَدَقَةٌ، وأمْرٌ بالمعْرُوفِ صدقَةٌ، ونَهْيٌ عَنِ الْمُنْكَرِ صدقَةٌ. ويُجْزِئُ مِنْ ذَلكَ رَكعَتَانِ يرْكَعُهُما مِنَ الضُّحى) رواه مسلم. (السُّلاَمَى) بضم السين المهملة وتخفيف اللام وفتح الميم: المفْصِلُ.

ئەبو زەڕ (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەموو ڕۆژێ گشت جومگەو ئێسکی ئادەمیزاد خێرێکی دەکەوێتە سەر جا لەبەر ئەوەی هەموو کە سێ سەدو شەست ئێسكو ئەندامی هەیە سێ سەدو شەست خێری دەکەوێتە سەر: هەموو تەسبیحاتو یادی خوا کردنێ خێرێکە، هەموو حەمدو سوپاسکردنێکی خودا خێرێکە، هەموو تەلیلەو (لا الە الا الله)کردنێ خێرێکە،هەموو ئەڵلاهو ئەکبەر کردنێ خێرێکە،فەرمان کردنێ بە چاکەیێ خێرێکە، نەهی کردنێ لە خراپەیێ خێرێکە، وە کردنی دوو رکات نوێژی چێشتەنگاویش بریتی ئەم خێرانە سەرجەم دەکەوێ)(م/تاج).

١١٩/٣-[٣]- وعنْهُ قال: قال النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (عُرِضَتْ عَلَيَّ أعْمالُ أُمَّتِي حسَنُهَا وسيِّئُهَا فوجَدْتُ في مَحاسِنِ أعْمالِهَا الأذَى يُماطُ عن الطَّرِيقِ، وَوجَدْتُ في مَساوَىءِ أعْمالِها النُّخَاعَةُ تَكُونُ فِي المَسْجِدِ لاَ تُدْفَنُ) رواه مسلم.

دیسان لەوەوە فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: چاكو خراپی کردەوەی ئوممەتم رانوێرا بۆم هەموویان نیشان دام، دیتم کە لابردنی ئازاری سەر ڕێگە یەکێ بوو لە کردەوە جوانەکانیان، وە چڵمو بەڵغەم ڕۆکردنیش لەناو

---

٢ موسلیم (٧٢٠).

٣ موسلیم (٥٥٣).

مزگەوتا، یەکێ بوو لە کردەوە خراپەکانیان، ئەگەر نەیشارنەوە (م) بەپێی ئەم فەرمموودە پیرۆزەیە پیاوانی پاكو تەمیزی خۆلڕێژەکانی شارەوانی، کە لەم چەرخەی ئێمەدا ڕۆڵێکی زۆر گرنگیان هەیە بۆ ڕاگرتنو پاراستنی پاكو خاوێنی لەناو وڵاتدا، بە پێی ئەم فەرمموودەیە ئەم زاتانە پاداشتێکی گەلێ گەورەیان هەیە، وە کارو پیشەکەیان دادەنرێ بە ئەرکێکی پیرۆزو بە کردەوەیەکی جوان. (وەرگێڕ).

٤/١٢٠-٤- وعنه أنَّ ناساً قالوا: يا رسُولَ اللّهِ، ذَهَب أهْلُ الدُّثور بالأجُور، يُصَلُّونَ كَمَا نُصَلِّي، وَيَصُومُونَ كَمَا نَصُومُ، وَيَتَصَدَّقُونَ بِفُضُول أمْوَالِهِمْ قال: «أوَ لَيس قَدْ جَعَلَ لَكُمْ مَا تَصَدَّقُونَ بِهِ: إنَّ بِكُلِّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةً، وكُلِّ تَكبِيرةٍ صدقة، وكلِّ تَحْمِيدةٍ صدقةً، وكلِّ تِهْلِيلَةٍ صَدَقَةً، وأمرٌ بالمعْرُوفِ صدقةٌ، ونَهيٌ عنِ المُنْكر صدقةٌ وفي بُضْعِ أحدِكُمْ صدقةٌ» قالوا: يا رسولَ اللّهِ أيأتي أحدُنَا شَهْوَتَه، ويكُونُ لَه فيها أجْر ؟، قال: «أرأيْتُمْ لو وضَعهَا في حرامٍ أكَانَ عليهِ وِزْرٌ ؟ فكذلكَ إذا وضَعهَا في الحلاَلِ كانَ لَهُ أجْرٌ» رواه مسلم.

دیسان لەوەوە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: چەند کەسێ عەرزی حەزرەتیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! هەرچی پاداشی هەرە گەورە هەیە، هەمووی داراو دەوڵەمەندەکان دەیبەن بۆخۆیان! پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: چۆن؟ عەرزیان کرد: چونکە ئێمە نوێژ دەکەین، ئەوانیش ڕێك وەك ئێمە نوێژ دەکەنو وەك ئێمە ڕۆژو دەگرنو سەرەڕای ئەوەش ماڵی زیادەیان هەیە خێرو خێراتی لێ دەکەن. فەرمووی: چۆن وا دەڵێن: لە کاتێکا خودا هەقی بۆ ئێوەش کردۆتەوەو ڕێگەیەکی زۆری بۆ داناون بۆ خێرکردن: هەموو تەسبیحاتێ خێرێکە، هەموو تەکبیراتێ خێرێکە، هەموو حەمد کردنێ خێرێکە، هەمو تەلیلەیێ خێرێکە، فەرمان کردنێ بە چاکەیێ خێرێکە، هەموو نەهی کردنێ لە خراپەیێ خێرێکە، دروست ببن لەگەڵ حەڵاڵی خۆتانا خێرێکە، گوتیان: قوربان! وەك تۆ دەفەرمووی: ئەگەر ئارەزووی خۆمان بشکێنینو کەیف لەگەڵ حەڵاڵی خۆمانا بکەین، ئەوەیش خێرو پاداشی هەیە؟ فەرمووی: باشە، بە من بڵێن ئەگەر کەسێ لەئێوە لەئیشی

٤ موسلیم (١٠٠٦).

حەراما بەکاری بێنێ ئایا تاوانی لەسەرە یا نا؟ کەواتە هەر لەسەر ئەم بنیاتە ئەگەر لە حەلاڵا بەکاری بێنێ پاداشی بۆهەیە (م).

١٢١/٥-[٥]– وعنه قال: قال لي النبي صلى اللّٰه عليه وآله وسلم: «لاَ تَحقِرنَّ مِن المعْرُوفِ شَيْئاً ولَوْ أنْ تلْقَى أخَاكَ بِوجهٍ طلِيقٍ) رواه مسلم.

دیسان لەوەوە فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرمو: ئەی ئەبو زەڕ! ئەوەی پێی بگوترێ چاکە بەکەمی مەزانەو بەسووك مەیگرە، با ئەوەیش بێ بەڕوویەکی گەشەوە بگەی بە برادەری خۆت (م).

١٢٢/٦-[٦]– عن أَبي هريرة رضي اللّٰه عنه قال: قال رسُولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (كُلُّ سُلاَمَى مِنَ النَّاسِ علَيْهِ صدَقةٌ كُلَّ يَوْمٍ تَطْلُعُ فيه الشَّمْسُ: تعدِلُ بيْن الاثْنَيْنِ صدَقَةٌ، وتُعِينُ الرَّجُلَ فِي دابَّتِهِ، فَتحْمِلُهُ عَلَيْهَا، أوْ ترْفَعُ لَهُ علَيْهَا متاعَهُ صدقةٌ، والكلمَةُ الطَّيِّبةُ صدَقةٌ، وبِكُلِّ خَطْوَةٍ تَمْشِيها إلى الصَّلاَةِ صدقةٌ، وتُميطُ الأذَى عَن الطرِيق صَدَقةٌ) متفق عليه.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لەحەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەموو ڕۆژێ، کە خۆری تیا هەڵدێ گشت جومگەو ئێسکێی ئادەمیزاد خێرێی دەکەوێتە سەر، دوو کەس ڕێك دەخەیتو ناوبژیان دەکەیتو ئاشتیان دەکەیتەوە خێرێکە، یارمەتی پیاوێ دەدەی تا سواری ولاخەکەی دەبێ خێرێکە، یا دەسباری پیاوێ دەدەیو بارەکەی لەگەڵدا باردەکەی خێرێکە، ئازارێ لە ڕێگەیێ دوور بخەیتەوە خێرێکە (ش).

ورواه مسلم أيضاً من رواية عائشة رضي اللّٰه عنها قالت: قال رسُول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّم: (إنَّهُ خُلِقَ كُلُّ إنْسان مِنْ بني آدم علَى سِتِّينَ وثلاثمائةِ مَفْصِلٍ، فَمنْ كَبَّر اللّٰه، وحِمدَ اللّٰه، وَهَلَّلَ اللّٰه، وسبَّحَ اللّٰهَ واستَغْفَر اللّٰه، وعَزلَ حَجراً عنْ طَرِيقِ النَّاسِ أوْ شَوْكَةً أوْ عظْماً عن طَرِيقِ النَّاسِ، أوْ أمر بمعرُوفٍ أوْ نهى عنْ مُنْكَرٍ، عَددَ السِّتِّينَ والثَّلاَثمائة، فإنَّهُ يُمْسي يَوْمئِذٍ وَقَد زَحزحَ نفْسَهُ عنِ النَّارِ).

---

٥ موسلیم (٢٦٢٦).

٦ بوخاری (٢٧٠٧)، موسولیم (١٠٠٩)و (١٠٠٧).

عائیشە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەموو ئادەمیزادێ -لەنەوەی ئادەم- لەسەر سێ سەدو شەست جومگە دروست کراوە، جا هەرکەسێ هەر ڕۆژێ بەقەد ئەو سێ سەدو شەست جومگەیە خێرێ چاکەیێ بکا، ئیتر ئەو ڕۆژە ئەو کەسە خۆی دوورخستۆتەوە لە دۆزەخ، ئەڵڵاهوئەکبەرێ چاکەیەکە، ئەلحەمدو لیلایەك چاکەیەکە، (لا الە الا اللە)یەك چاکەیەکە (سبحان اللە)یەك چاکەیەکە، (استغفر اللە)یەك چاکەیەکە، وە بەردێ، یا درکێ، یا ئێسکێ دوور بخەیتەوە لە سەرڕێی خەڵك چاکەیەکە، یان فەرمان بکەی بە چاکەیێ خێرێکە، یا نەهی بکەی لە خراپەیێ خێرێکە (م).

١٢٣/٧ -[٧]- وعنه عن النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (منْ غـدَا إلى المَسْـجِدِ أو رَاحَ، أعدَّ اللّهُ لَهُ في الجنَّةِ نُزُلاً كُلَّمَا غَدا أوْ رَاحَ) متفقٌ عليه.

دیسان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: گشت جارێ کە کەسێ دەچێ بۆ مزگەوت یا لە مزگەوت دەگەڕێتەوە خودا لەبەهەشتا، نانێ کە لایەقی میوان بێ بۆی دروست دەکا! (ش).

١٢٤/٨-[٨]- عنه قال: قال رسولُ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلّم: (يـا نِسَـاء المُسْـلِماتِ لاَ تَحْقِرنَّ جارَةٌ لِجارتِهَا ولَوْ فِرْسِنَ شاةٍ) متفقٌ عليه. قال الجـوهري: الفِرْسِـنُ مِـنَ الْـبعِيرِ: كالحافِرِ مِنَ الدَّابَّةِ، قال: ورُبَّمَا استُعِير في الشَّاةِ

دیسان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: ئەی موسوڵمانەکان! دیاری پێشکەشی یەکتری بکەن، چونکە دیاری دڵ ساف دەکاو دەغەزی سینگ دەکێشێ، ئافرەتیش بۆ ئافرەتی دراوسێی خۆی هیچ دیاریو دەسەنەو کاسە ئاوسێیەك بەکەم نەزانێ، با لاسمی مەڕێکیش بێ یا پێچکەی بزێکیش بێ (ش/تاج. باسی دییاری سونەتە).

١٢٥/٩ -[٩]- وعنه عن النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (الإيمَانُ بِضْعٌ وَسبْعُونَ، أوْ بِضْعٌ وَسِتُّونَ شُعْبَةً: فَأفْضلُهَا قوْلُ لاَ إلَـهَ إلاَّ اللّـهُ، وَأدْنَاهَـا إمَاطَـةُ الأذَى عـنِ الطَّرِيـقِ، وَالحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإيمانِ) متفقٌ عليه.

---

٧ بوخاری (٦٦٢)، موسلیم (٦٦٩).

٨ بوخاری (٢٥٦٦)، موسلیم (١٠٣٠).

دیسان لەوەوە واتە. لە ئەبو هورەیرەوە دەفەرموێ: (ئیمان و باوەڕ حەفتاو ئەوەندە لقە) یافەرمووی: شەست و ئەوەندە لقە، گەورەترینی ئەو لقانە وشەی (لا اله الا الله)یە، وە هەرە خوارەکەیان لابردنی ئازاری سەر ڕێگەو بانە، وەشەرم و حەیا بەشێکە لەبەشەکانی باوەڕ (ش).

١٠/١٢٦-[١٠]- وعنه أن رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بطَرِيقٍ اشْتَدَّ علَيْهِ الْعَطشُ، فَوجد بِئراً فَنزَلَ فيها فَشَرِبَ، ثُمَّ خرج فإذا كلْبٌ يلهثُ يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ، فقال الرَّجُلُ: لَقَدْ بلَغَ هَذَا الْكَلْبُ مِنَ العطشِ مِثْلَ الَّذِي كَانَ قَدْ بَلَغَ مِنِّي، فَنزَلَ الْبِئْرَ فَملأَ خُفَّه مَاءً ثُمَّ أَمْسَكَه بِفيهِ، حتَّى رقِيَ فَسقَى الْكَلْبَ، فَشكَرَ اللّٰهُ لَه فَغَفَرَ لَه. قَالُوا: يا رسولَ اللّٰه إنَّ لَنا في الْبَهَائِمِ أَجْراً ؟ فَقالَ: (فِي كُلِّ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ) متفقٌ عليه. وفي رواية للبخاري: (فَشَكَر اللّٰه لهُ فَغَفَرَ لَه، فَأَدْخَلَه الْجنَّةَ). وفي رواية لَهُما: (بَيْنَما كَلْبٌ يُطيف بِركِيَّةٍ قَدْ كَادَ يقْتُلُه الْعطَشُ إِذْ رأتْه بغِيٌّ مِنْ بَغَايا بَنِي إِسْرَائيلَ، فَنزَعَتْ مُوقَهَا فاسْتَقت لَهُ بِهِ، فَسقَتْهُ فغُفِر لَها بِهِ)).

دیسان لە ئەبو هورەیرەوە (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: جارێ پیاوی لە چۆڵێ، بەرێگایەکا دەرۆیی، توونێتی زۆری بۆ هێنا، تا بیرێکی دۆزییەوەو چووە ناوی و ئاوی خواردەوە، کە هاتە دەرەوە، ڕوانی وا سەگێ لە تووونیانا زمانی دەرکێشاوەو هاسکە هاسکێتی و لەتاوا تەڕایی دەورو بەری بیرەکە دەلێسێتەوە، جا پیاوەکە لەبەر خۆیەوە گوتی: ئەم سەگەیش لە توونیانا وەکو منی بەسەر هاتووە! جا دیسانەوە ڕۆیشتە خوارەوە بۆناو بیرەکەو کاڵە (خوففە)کەی خۆی پڕ کرد لە ئاوو گرتی بە دەمیەوەو سەرکەوتەوە سەرێ و سەگەکەی ئاودا، جا خودا لەسەر ئەوە سوپاسی کردو تۆڵەی بۆ کردەوەو لێی خۆش بوو.

یارانیش گوتیان: ئەی ڕەوانەکراوی خودا دیارە هەر چاکەیێ لەگەڵ گیانلەبەری بێ زمانا بیکەین خێرو پاداشی هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ هەر چاکەیێ لەگەڵ هەر شتێ بکرێ، کە تەڕایی ژیانی تیا بێ خێرێکی گەورەیە (ش). لە گێڕانەوەیەکی بوخاریدا (رەزای خودای لەسەر بێ): جا خودا لەسەر ئەوە سوپاسی کردو تۆڵەی بۆ کردەوەو لێی خۆش بوو، وە ناردی بۆ بەهەشت.

---

٩ بوخاری (٩) موسلیم (٣٥).

١٠ بوخاری (٢٣٦٣)، موسلیم (٢٢٤٤)و (٢٢٤٥).

لـه گێڕانەوەیـەکی شـەیخەین-بوخـاری موسـلیم-دا: جارێکیـان سـەگێ لـەدەوری بیرێ دەخولایەوە، خەریك بوو توونێتی بی کوژێ، لەو دەمەدا ژنێکی داوێـن پـیس-لەنـەوەی ئیسـرائیل- چـاوی بـەحاڵی کـەوتو کاڵەکـەی خـۆی لـەپێی داکەنـدو بەکاڵەکەی ئاوی بۆ هەڵ گۆزیو ئاوی دایە، خودا بەوە لێی خۆش بوو.

١١/١٢٧–[١١]– وعنْهُ عن النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم قـال: (لَقَـد رأَيْـتُ رَجُـلاً يَتَقَلَّبُ فِي الْجنَّةِ فِي شَجرةٍ قطَعها مِنْ ظَهْرِ الطَّرِيقِ كَانَتْ تُؤْذِي الْمُسلِمِينَ). رواه مسلم.
وفي رواية: (مرَّ رجُلٌ بِغُصْنِ شَـجرةٍ عَلَـى ظَهْـرِ طَرِيـقٍ فَقَـالَ: واللّـهِ لأُنَحِّـيَنَّ هـذا عـنِ الْمسلِمِينَ لا يُؤْذِيهُمْ، فأُدْخِلَ الْجَنَّةَ). وفي رواية لهما: (بيْنَما رجُـلٌ يمْشِـي بِطريـقٍ وجـد غُصْن شَوْكٍ علَى الطَّرِيقِ، فأخَّرُه فشَكَر اللَّهُ لَهُ، فغَفر لَهُ).

دیسان لەوەوە لە حەزرەتەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: پیـاوێکم چاو پێکـەوت لەبەهەشتا بەئارەزوی خۆی هەڵسو کـەوتی دەکـرد، لـە پاداشـی ئـەوەدا درەختێکـی بڕیبوو، لە سەرە ڕێی موسوڵمانانا بوو، ئازاری دەدان (م).

لەگێڕانـەوەیەکا: پیاوێ لقی داری لەسەر چەقی ڕێگە چاو پێ کەوت، گوتی: بـە خودا دەبێ ئەمە لەسەر ڕێگـەی موسـوڵمانانا دوور بخەمـەوە تـا ئازاریـان نـەدا، جـا لەهۆی ئەوەوە خودا بردی بۆ بەهەشت.

لە گێڕانـەوەیەکی هەردووکیانـا: جارێ پیـاوێ بـە ڕێگایـەکا دەڕۆیـی لقـێ دڕکـی بینی لەسەر ڕێگەکە کەوتبوو، دووری خستەوە، خـودا لەسـەر ئـەوە سوپاسـی کـردو پاداشی باشی دایەوەو لێی خۆش بوو.

١٢٨/١٢–[١٢]– وعنْه قالَ: قَال رسولُ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم: (مـنْ توضَّـأ فأحَسَـنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ أَتَى الْجُمعةَ، فَاستمع وأنْصتَ، غُفِر لَهُ ما بيْنَهُ وبيْنَ الْجُمعةِ وزِيادةُ ثَلاثَةِ أيَّامٍ، ومَنْ مسَّ الْحصا فَقد لَغَا) رواه مسلم.

دیسان لەوەوە لە حەزرەتەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ دەستنوێژیی جوان بگرێو ئنجا بچێ بۆ نوێژی هەینیو خۆی لە پێشنوێژ نزیـك بکاتـەوە هـەتا بەجوانی گوێ لە قسەکانی بگرێو لەو کاتەدا بێ دەنـگو خـامۆش بـێ، ئـەوا خـودا

---

١١ موسلیم (١٩١٤)، (١٢٩).

١٢ موسلیم (٨٥٧)، (٢٧).

**خۆش دەبێ لە گوناهی نێوانی ئەو هەینییەو هەینییەکەی پێشویو زیادەی سێ ڕۆژیش، هەرکەسێکیش لەو کاتەدا کە وتار خوێن وتاری هەینی دەخوێنێتەوە دەست لە وردە بەردو زیخو چەوو شتی وا بدا (واتە: خۆی بە شتی بێ هوودەوە خەریك بکا)ئەوە نا بەجێیی دەکا (م/تاج).**

١٢٩/١٣-[١٣]- وعنه أن رسولَ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (إذَا تَوضَّأَ الْعبْدُ الْمُسْلِم، أو الْمُؤْمِنُ فغَسلَ وجْههُ خرج مِنْ وَجْههِ كُلُّ خطِيئةٍ نظر إلَيْهَا بعينهِ مَعَ الْماءِ، أوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْماءِ، فَإذَا غَسَل يديهِ خَرَج مِنْ يديْهِ كُلُّ خَطِيْئَةٍ كانَ بطشتْهَا يداهُ مع الْمَاءِ أَو مع آخِرِ قَطْرِ الْماءِ، فَإذَا غسلَ رِجليْهِ خَرجَتْ كُلُّ خَطِيْئَةٍ مشَتْها رِجْلاُه مع الْماءِ أَوْ مع آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ حَتَّى يخْرُج نقِياً من الذُّنوبِ) رواه مسلم.

**دیسان لەوەوە** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **لە پێغەمبەرەوە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: کاتی بەندەی موسوڵمان -یا بەندەی بڕوادار- دەستنوێژێ دەگرێ، کە دەموو چاوی دەشوا ئەو گوناهانەی کە بەچاوەکانی کردوونی، وەك ڕوانینی ناڕەواو شتی وا، لەگەڵ چۆڕاوگەی ئاوی دەشتنوێژەکەدا دەکەونە خوارەوەو دەڕۆن یان لەگەڵ دوا دڵۆپی ئاوەکەدا دادەکەون و دەڕۆن، کە هەردوو دەستی دەشۆری ئەو گوناهانەی کە بە دەستەکانی کردوونی، لەگەڵ چۆڕاوگەی ئاوی دەشتنوێژەکەدا دەکەونە خوارەوە، یان لەگەڵ دوا دڵۆپی ئاوەکەدا دادەکەون و دەڕۆن، هەتا پاك دەبێتەوە لە گوناهو دەستەکانی لەگوناهی وردە پاك دەبێتەوە، کە هەردوو قاچی دەشوا هەروا (م).**

١٣٠/١٤-[١٤]- وعنه عن رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم قـال: (الصَّـلواتُ الْخمْـسُ، والْجُمُعَةُ إِلَى الْجُمُعةِ، ورمضانُ إِلَى رمضانَ مُكفِّرَاتٌ لِمَا بينَهُنَّ إذَا اجْتنِبَت الْكَبائِرُ) رواه مسلم.

**دیسان فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: هەر پێنج نوێژەکان، ئەم نوێژ تا ئەو نوێژو نوێژی هەینی تا ئەو هەینی دەبن بە کەفارەتی ئەو گوناهانە کە لە نێوانیانا دەکرێن، بەمەرجێ گوناهی گەورە نەکرابێ (م).**

---

١٣ موسلیم (٢٤٤).

١٤ موسلیم (٢٣٣)، (١٦).

١٣١/١٥-[١٥]- وعنه قال: قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلّم: (ألا أدلّكـم علـى مـا يَمْحُو اللّٰهُ بِهِ الْخَطايا، ويرْفَعُ بِهِ الدَّرجاتِ ؟) قالوا: بلى يـا رسُـولَ اللّـهِ، قـال: (إسـباغ الْوُضوءِ على الْمَكَارِهِ وكَثْرةُ الْخُطَا إِلَى الْمسَاجِدِ، وانْتِظَارُ الصَّلاةِ بعْدِ الصَّـلاةِ، فَـذلِكُمُ الرِّبَاطُ) رواه مسلم.

دیسان فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هۆشیاربن! با ئـەوەتان پـێ نیشـان بـدەم کـە خـودا تـاوانی پـێ دەکوژێنێتـەوەو پایـەی موسـوڵمانی پـێ بەرزدەکاتەوە چییە؟ گوتیان: فەرموو بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! فـەرمووی: دەسـتنوێژگرتنی تێـرو تەسـەلە لـەکاتی خۆشـیو ناخۆشـیدا، وە هاموشـۆکردنی مزگەوتـە زۆر بەگـەرمی، وە چـاوەنواڕی نوێـژە نوێـژ لـەپاش نوێـژ وە کردنـی نوێژەکانە بە ڕێكو پێکی یەك لەدوای یەك، ئائەمانەن خەباتو تێکۆشانو لێبڕانن بۆ خودا (م).

١٣٢/١٦-[١٦]- عن أَبِي موسى الأشعري رضي اللّٰه عنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (منْ صلّى الْبَرْدَيْنِ دَخَلَ الْجنَّةَ) متفقٌ عليه.

ئەبو مووسا لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ نوێژی بەیانیو عەصر بکا دەچێتە بەهەشت (ش).

١٣٣/١٧-[١٧]- وعنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلّم: (إِذَا مـرِضَ الْعبْـدُ أَوْ سافَر كُتِب لَهُ ما كانَ يعْملُ مُقِيماً صحِيحاً) رواه البخاري.

ئەبو مووسا (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەنـدە ئەگەر نەخۆش بوو، یا چوو بۆ سەفەر، خودا بەکەرەمی خۆی ئەو ئەجرو پاداشەی بۆ دەنووسێ کە لەوەو پێش لەحاڵەتی لەش ساغیدا بـۆی دەنووسـێ، یا بـە نیشـتە جێیی بۆی دەنووسێ) (ب).

١٣٤/١٨-[١٨]- وعنْ جابرٍ رضي اللّٰه عنه قال: قال رسولُ اللّـه صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلّم: (كُلُّ معرُوفٍ صدقَةٌ) رواهُ البخاري، ورواه مسلم مِن رواية حذَيفَةَ رضي اللّٰه عنه.

---

١٥ موسلیم (٢٥١).

١٦ بوخاری (٥٧٤)، موسلیم (٦٣٥).

١٧ بوخاری (٢٩٩٦).

**جابير** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **لە پێغەمبەرەوە** (درروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: ئەوەی شەریعەت پەسەندی بکا بە چاکەو خێر حلێبە (ب).**

١٩/١٣٥-[١٩]- وعنهُ قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (ما مِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْساً إلاَّ كانَ ما أُكِلَ مِنْهُ لهُ صدقةً، وما سُرِقَ مِنْه لَه صدقَةً، ولا يرْزؤه أحَدٌ إلاَّ كَانَ له صدقةً) رواه مسلم. وفي رواية له: (فَلا يغْرِس الْمُسْلِم غرساً، فَيأْكُلَ مِنْهُ إنسانٌ ولا دابةٌ ولا طَيرٌ إلاَّ كانَ له صدقةً إلَى يَوْمِ الْقِيَامةِ). وفي روايةٍ لَه: (لا يغْرِس مُسلِم غرْساً، ولا يزْرعُ زرْعاً، فيأْكُل مِنْه إنْسانٌ وَلا دابَّةٌ ولا شيْءٌ إلاَّ كَانَتْ لَه صدقَةٌ، ورويَاه جميعاً مِنْ رواية أَنَسٍ رضي اللّٰه عنه. قولُهُ: (يرْزَؤُهُ) أي: يَنْقُصهُ.

**جابير** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **لە پێغەمبەرەوە** (درروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: هەرموسوڵمانێ شتێ بڕوێنێ، یا نەمامێ بنێژێ، ئەوەی لێی بخوا، ئەوەی لێی بدزێ، ئەوەی دڕندەو دەعبا بیخوا، ئەوەی مەلو مۆر بیخوا، ئەوەی سوودی لێ ببینێ، ئیتر هەر سوودێ بێ، ئەوانە هەموویان، یەك بەیەکیان بۆی دەبێ بە خێرو خێرات (م/تاج). لە گێڕانەوەیەکی موسلیما** (ڕەزای خودای لەسەر بێ)**: هەر موسوڵمانێ نەمامێ بنێژێ، کەسێ، گیانەوەرێ، مەلو مۆرێ، لێی بخوا ئەوەهەمووی دەبێ بە خێرو بەخشش بۆی هەتا ڕۆژی قیامەت!**

٢٠/١٣٦-[٢٠]- وعنْهُ قالَ: أَراد بنُو سَلِمَة أَن ينْتَقِلوا قُرْبَ المَسْجِدِ فبلَغَ ذلك رسولَ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، فَقَالَ لَهُمْ: (إنَّه قَدْ بَلَغَنِي أَنَّكُمْ تُرِيدُونَ أَنْ تَنْتَقِلُوا قُربَ الْمَسْجِدِ ؟) فَقَالُوا: نَعَمْ يا رسولَ اللّٰهِ قَدْ أَرَدْنَا ذلكَ، فَقَالَ: «يا بَنِي سَلِمةَ ديارَكُمْ، تكْتبْ آثارُكُمْ، دِيارَكُم، تُكْتَبْ آثارُكُمْ) رواه مسلم. وفي روايةٍ: (إنَّ بِكُلِّ خَطْوةٍ درجةً) رواه مسلم. ورواه البخاري أيضاً بِمعنَاهُ مِنْ روايةِ أَنَسٍ رضي اللّٰه عنه.

**جابیر** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: خانووەکانمان دوور بوون لە مزگەوتەوە، ویستمان بیان فرۆشین‌و بگوێزینەوە بۆ نزیکی مزگەوت، بەڵام پێغەمبەر** (درروودی خوای لەسەر بێ) **نەیهێشت‌و فەرمووی: خەبەرم زانیوە کە دەتانەوێ بگوێزنەوە بۆ نزیکی**

---

١٨ بوخاری (٦٠٢١)، موسليم (١٠٠٥).

١٩ بوخاری (٢٣٢٠)، موسليم (١٥٥٢)و (١٥٥٣).

٢٠ بوخاری (٦٥٦)، موسليم (٦٦٤)و (٦٦٥)

مزگەوت. عەرزیان كرد: ئەی پێغەمبەری خودا! نیازمان وایە، فەرمووی: ئەی هۆزی بەنی سەلەمە! لە شوێنی خۆتان بمێننەوە، چونكە هاتوچۆی مزگەوت دەكەن‌و شەقاو بە شەقاو پاداشتان بۆ دەنووسرێ یەك دوو جار ئاوای فەرمووە (م). لە گێڕانەوەیەكا: هەموو هەنگاوێكی بە پایەیەكە. لە گێڕانەوەیەكی شەیخەینا، كە تاج‌ولئوصول دەیگێڕێتەوە: جا ئەوانیش گوتیان! بەس نەبوو نەمان گواستەوە!

١٣٧/٢١–[٢١]– عنْ أَبِي الْمُنْذِرِ أُبيٍّ بن كَعبٍ رضي اللّٰه عنه قال: كَان رجُلٌ لا أَعْلَمُ رجُلا أَبْعَدَ مِنَ الْمَسْجِدِ مِنْهُ، وكَانَ لا تُخْطِئُهُ صلاةٌ فَقِيل لَه، أَوْ فقُلْتُ لَهُ: لَوْ اشْتَرَيْتَ حِماراً ترْكَبُهُ في الظَّلْماءِ، وفي الرَّمْضَاءِ فَقَالَ: ما يسُرُّني أَن منْزِلي إِلَى جنْب الْمسْجِدِ، إِنِّي أُرِيدُ أَنْ يُكْتَب لِي ممْشَايَ إِلَى الْمَسْجد، ورُجُوعِي إِذَا رجعْتُ إِلَى أَهْلِي، فقالَ رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (قَدْ جمع اللّٰهُ لكَ ذلِكَ كُلَّهُ) رواه مسلم. وفي روايةٍ: (إِنَّ لَكَ مَا احْتسَبْت). (الرمْضَاءُ) الأَرْضُ الَّتِي أَصابَهَا الْحرُّ الشَّديدُ.

ئوبەیی كوڕی كەعب (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پیاوێكی ئەنصاری هەبوو كەس شك نابەم بەقەدەر ئەو ماڵی دوور بێ لە مزگەوتەوە، لەگەڵ ئەوەشا نوێژێكی بە جەماعەت نەدەچوو، من خۆم پێم گوت: یا كەسێ تر پێی گوت: بۆ گوێرێژێ ناكڕی، هەم لەشەوی تاریك‌و هەم لە قرچەی گەرمای نیوەڕۆدا كە دەچی بۆ مزگەوت سواری بیت؟! گوتی: ئۆخەیش كە ماڵەكەم لە پەنا مزگەوتا نییە، چونكە من نیازم هەیە كە هاتوچۆم بۆ مزگەوت، چ لەم سەرەوە كە دەچم بۆ مزگەوت، چ لەو سەرەوە كە دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە، هەردوو لایم بۆ بنووسرێ، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خودا ئەوانەی هەموو بۆ كۆكردویتەوە(م). لە گێڕانەوەیەكا: تۆ بە نیازی خۆت گەیشتووی.

١٣٨/٢٢–[٢٢]– عنْ أَبِي محمدٍ عبدِ اللّٰهِ بنِ عمرو بن العاص رضي اللّٰه عنهما قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (أَرْبعُونَ خَصْلَةً أَعلاها منِيحةُ الْعَنْزِ، ما مِنْ عامِلٍ يعملَ بِخَصْلَةٍ مِنْها رجاءَ ثَوَابِهَا وتَصْدِيقَ موْعُودِهَا إِلاَّ أَدْخلَهُ اللّٰهُ بِهَا الْجنَّةَ) رواه البخارى.

---

٢١ موسلیم (٦٦٣).

٢٢ بوخاری (٢٦٣١).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموی: چل کاری باش هەن، گەورەکەیان بزنە بە دۆخەیە، ئەوەی یەکێ لەم ئیشە باشانە بکا، بەهیوای پاداشی باش بێ، وە لە هەمان کاتدا باوەڕی بەو بەڵێنە هەبێ، کە خودا داویەتی لەبارەی کردنی ئەو ئیشەوە ئەوە بێ گومان کە خودا بەوە دەیباتە بەهەشت (ب).

١٣٩/٢٣-[٢٣]- عَنْ عديٍّ بنِ حاتِمٍ رضي اللّٰه عنه قال: سمِعْتُ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلّم يقول: (اتَّقُوا النار وَلوْ بِشقِّ تَمْرةٍ) متفقٌ عليه.

وفي رواية لهما عنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إلاَّ سيُكَلِّمُه ربُّه لَيْس بَيْنَهُ وبَينهُ تَرْجُمَان، فَيَنْظُرَ أَيْمنَ مِنْهُ فَلا يَرى إلاَّ مَا قَدَّم، وينْظُر أشأمَ مِنْهُ فلا يَرَى إلاَّ ما قَدَّمَ، وَينْظُر بَيْنَ يدَيْهِ فَلا يَرى إلاَّ النَّارَ تِلْقَاءَ وَجْهِهِ، فاتَّقُوا النَّارَ ولوْ بِشِقِّ تَمْرةٍ، فَمَنْ لَمْ يَجدْ فَبِكَلِمَةٍ طيِّبةٍ).

عەدیی کوری حاتەم (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرموی: بە گوێی خۆم ژنەوتم لەزاری حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: خۆتان لەئاگری دۆزەخ بپارێزن، گریمان بە لەتی دەنکە خورمایەکیش بووە. (ش). لە گێڕانەوەی شەیخەینا لە عەدییەوە فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: یەك بەیەکتان، بەبێ تەرجومانو زمان زان خودا خۆی یەکسەر قسەو گفتو گۆی لەگەڵ دەکا، جا ئەوکاتە تەماشای لای ڕاستی خۆی دەکا، ئەوەی کە لە پێش خۆیەوە ڕەتی کردووە ئەوە دەبینێتەوە، وە تەماشای لای چەپی خۆی دەکا ئەوەی کە لەپێش خۆیەوە رەتی کردووە بەس ئەوە دەبینێتەوە، وە تەماشای بەردەمی خۆی دەکا دەڕوانێ ئاگری دۆزەخ بەرامبەر رووی راوەستاوە، دەی کەواتە خۆتان بپارێزن لە ئاگری دۆزەخ، ئەگەر بەلەتی دەنکە خورمایەکیش بووە، ئەگەر هەر هیچ نەبوو، بە قسەیەکی باش، بە گفتێکی شیرین خۆتان ڕزگار بکەن.

١٤٠/٢٤-[٢٤]- عنْ أَنَس رضي اللّٰه قال: قال رسولَ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (إنَّ اللّٰه لَيرْضَى عَنِ الْعَبْدِ أَنْ يَأْكُلَ الأَكْلَةَ فيحْمدَهُ عليْهَا، أَوْ يشْربَ الشَّربَةَ فيحْمدَهُ عليْهَا) رواه مسلم.

---

٢٣ بوخاری (٦٠٢٣)، موسلیم (١٠١٦) رقم (١٧)و(٦٨).

ئەنەس لە حەزرەتەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: خودا لە بەندەی خۆی خۆشنود دەبێ، کاتی کەشتێ دەخوا، سوپاسی خودای لەسەربکا (م).

١٤١/٢٥- [٢٥] – عن أَبِي رضي اللّٰه عنه، عن النبى صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ صدقةٌ) قال: أَرَأَيْتَ إِنْ لَمْ يَجدْ ؟ قالَ: (يعْمَل بِيَديهِ فَينْفَعُ نَفْسَه وَيَتَصدَّقُ): قَال: أَرَأَيْتَ إِنْ لَمْ يستَطِعْ ؟ قال: يُعِينُ ذَا الْحَاجَةِ الْملْهوفَ) قالَ: أَرأَيْت إِنْ لَمْ يسْتَطِعْ قالَ: (يَأْمُرُ بِالمَعْرُوفِ أَوِ الْخَيْرِ) قالَ: أَرأَيْتَ إِنْ لَمْ يفْعلْ ؟ قالْ: «يُمْسِكُ عَنِ الشَّرِّ فَإِنَّهَا صدَقةٌ» متفقٌ عليه.

ئەبو مووسا (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەموو موسوڵمانێ لەسەریەتی خێرێ بکا. پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی ئەگەر نەیبوو چۆن؟ فەرمووی: قۆڵی لێ هەڵماڵێو ئیش بکاو هەم خۆی بەخێو بکاو هەم خێریش بکا. گوتیان: ئەی ئەگەر ئەمەی بۆ نەکرا؟ فەرمووی: یاریدەی لێ قەوماوێکی داماو بدا، گوتیان: ئەی ئەگەر ئەمەشی بۆ نەلوا چی بکا؟ فەرموی: با ڕەفتاری جوان بێو کاری باش بێو ڕێگەی باش بە خەڵك بڵێو واز لە خراپە بێنێ، ئەمەیش دەبێ بە گەورەترین خێرو خێرات بۆی (ش).

## ١٤- باسی ئیقتیصادو میانەکاری لە طاعەتدا (باب في الإقتصاد في الطاعة)

قال الله تعالى: ﴿طه ماأنزلنا عليك القرآن لتشقى﴾طه/١-٢.

ئەی خۆشەویستا! تۆزێ باری لەشی خۆت سووك کە، ئەوەندە بە شەو نوێژی دوورو درێژەوە خۆت ماندوو مەکە، خۆئێمە ئەو قورئانەمان بۆ ئەوە بۆ نەناردووی کە تۆ ئاوا خەوو ڕاحەت لەخۆت هەراسان بکەیو بە طاعەتی زۆر خۆت ماندوو و شەکەت بکەی.

وقال تعالى: ﴿يريد الله بكم اليسر ولا يريد بكم العسر﴾البقرة/ ١٨٥.

واتە: خودای مەزن ئاسانکاری دەوێ بۆ ئێوە، ئەوەتانی لەکاتی سەفەرا نوێژی کەم کردۆتەوە بۆتانو ڕۆژووی لابردووە لەسەرتان، خودای گەورە زۆر بەرەحمو میهرەبانە لەگەڵ ئێوەدا، کە ئەرکێ دەدا بەسەرتانا لەبەر حیکمەتە، کە

---

٢٤ موسلیم (٢٧٣٤).

٢٥ بوخاری (١٤٤٥)، موسلیم (١٠٠٨).

**مەصلەحەتو بەرژەوەندیو سوودو قازانجی خۆتانی تیایە، دەنا بۆ ئەوەی نییە کە لە بەلاشو بە خوتو خۆڕایی کاری ئێوە گران بکا یا بارتان قورس بکا.**

١٤٢/١-[١]- عن عائشةَ رضي اللّٰهُ عنها أن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم دخَلَ عليْها وعِنْدها امْرأَةٌ قال: منْ هَذِهِ ؟ قالت: هَذِهِ فُلانَة تَذْكُرُ مِنْ صَلاتِهَا قالَ: (مَهُ عليكُمْ بِما تُطِيقُون، فَوَاللّٰه لا يَمَلُّ اللّٰهُ حتَّى تَمَلّوا وكَانَ أَحَبُّ الدِّينِ إِلَيْهِ ما داوَمَ صَاحِبُهُ عَلَيْهِ) متفقٌ عليه.

**عائیشە** (رەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: جارێ کە پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **هات بۆ لام، ئافرەتێکم لەلا بوو، فەرمووی: ئەم ژنە کێیە؟ گوتم: ئەمە فیسارە ئافرەتە، بۆ نوێژکردنو خودا پەرستی مانەندی نییە! فەرمووی: وسبە! ئەوەندە خودا پەرستی بکەن کە لەتواناتاندا بێ، چونکە بەخودا هەتا ئێوە وەڕس نەبن خودا وەرس نابێ، وە باشترین ئایین داری لەلای خودا ئەوەیە کە خاوەنەکەی بەردەوام بێ لەسەری (ش).**

١٤٣/٢-[٢]- وعنِ أَنس رضي اللّٰه عنه قال: جاءَ ثَلاثَةُ رهْطِ إِلَي بُيُوتِ أَزْواجِ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم يسْأَلُونَ عنْ عِبَادَةِ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم، فَلَمَّا أُخبِروا كَأَنَّهُمْ تَقَالّوْها وقالُوا: أَين نَحْنُ مِنْ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قَدْ غُفِر لَهُ ما تَقَدَّم مِنْ ذَنْبِهِ وما تَأَخَّرَ. قالَ أَحَدُهُمْ: أَمَّا أَنَا فأُصَلّي الليل أَبداً، وقال الآخَرُ: وَأَنا أَصُومُ الدَّهْرَ أَبداً ولا أُفْطِرُ، وقالَ الآخرُ: وأَنا اعْتَزِلُ النِّساءَ فلا أَتزوَّجُ أَبداً، فَجاءَ رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم إِلَيهِمْ فقال: (أَنْتُمُ الَّذِينَ قُلْتُمْ كذا وكذَا ؟، أَما واللّٰهِ إِنّي لأَخْشَاكُمْ للّٰهِ وَأَتْقَاكُم له لكِنِي أَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأُصلّي وَأَرْقُد، وَأَتزَوّجُ النِّسَاءَ، فمنْ رغِب عن سُنَّتِي فَلَيسَ مِنّي) متفقٌ عليه.

**ئەنەس** (رەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: سێ کەس چوون بۆ ماڵی هاوسەرەکانی پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەبارەی پەرستشو عیبادەتی حەزرەتەوە پرسیاریان هەبوو، کە پێیان گوترا عیبادەتی پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **چۆنە وەك بڵێی بەکەمی بزانن وابوو، جا گوتیان: ئێمە لەکوێو پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەکوێ،**

---

١ بوخاری (١١٥١)، موسلیم (٧٨٥).

٢ بوخاری (٥٠٦٣)، موسلیم (١٤٠١).

ئەو خودا بە صريحی ئايەت لە گوناهی بەرو دوای خۆش بووە، ئەوەتانێ یەزدانی گەورە موژدەی دەداتێو پێی دەفەرموێ: ﴿إنا فتحنا لك فتحا مبينا ليغفر لك الله ما تقدم من ذنبك وما تأخر﴾الفتح/١-٢. جا یەکێکیان گوتی: من بەشەو هەر شەو نوێژ دەکەم هەتا هەتایە، یەکێکی تریشیان گوتی: منیش ساڵ دوانزە مانگە هەر بەڕۆژوو دەبم‌و یەك ڕۆژی لێ ناخۆم، ئەوی تریشیان گوتی: منیش کلا دەبم لەژن‌و هەتا هەتایە ژن ناهێنم‌و توخنی ژن ناکەوم. جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هات بۆ لایان‌و فەرمووی: ئەوە ئێوە وەها وەها دەڵێن‌و ئەم قسانە دەکەن! دەسا بەو خودایە من لە ئێوە زیاتر لە خودا دەترسم‌و لە ئێوە زیاتر تەقوای دەکەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا من بەش بەحاڵی خۆم ڕۆژووش دەگرم‌و ڕۆژووش ناگرم‌و شەو نوێژیش دەکەم‌و بەشی خۆشم دەخەوم‌و سەرەڕای ئەمانەش ژنیش دەهێنم، جا ئەمە ڕێگەو ڕەوشت‌و ڕەفتاری منە، ئەوەی لێی لابدا لەمن نییە (ش/ن/تاج).

٣/١٤٤-[٣]- وعن ابن مسعودٍ رضي اللّه عنه أن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (هَلَكَ الْمُتَنَطِّعُونَ) قالَهَا ثلاثاً، رواه مسلم. (الْمُتَنطِّعُونَ): الْمُتعمِّقونَ الْمُشَدِّدُون فِي غَيْرِ موْضَعِ التَّشْدِيدِ.

عەبدوڵڵای کوری مەسعوود (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) سێ جار لەسەر یەك فەرمووی: ئەوانەی شت زۆر قوڵ دەکەنەوە، سەریان تێدا دەچێ (م).

٤/١٤٥-[٤]- عن أَبِي هريرة رضي اللّه عنه النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: إنَّ الدِّينَ يُسْرٌ، ولنْ يشادَّ الدِّينُ إلاَّ غَلَبه فسدِّدُوا وقَارِبُوا وَأَبْشِرُوا، واسْتعِينُوا بِالْغدْوَةِ والرَّوْحةِ وشَيْءٍ مِن الدُّلْجةِ) رواه البخاري. وفي رواية له (سدِّدُوا وقَارِبُوا واغْدوا ورُوحُوا، وشَيْء مِنَ الدُّلْجةِ، الْقَصْد الْقصْد تَبْلُغُوا).

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئایین ئاسانە ئەگەر کەسێ لەخۆی گران نەکا، هەرگیز نەبووە یەکێ ئایین لەخۆی گران بکاو، بەتوندی باوەشی پیا بکاو تاسەر بیباتە سەرا! بەڵکوو ئەو کەسانە لە

---

٣ موسلیم (٢٦٧٠).

٤ بوخاری (٦٤٦٣).

ئەنجامدا ئایین بەزاندوونیو کۆڵی پێ داون، ا کەواتەهەر لە سەرتاوە ملی ڕێگەی ڕاست بگرنو ئەوەندەی بۆتان دەلوێ درێغی لە کردنی کاری باش مەکەنو مزگێنی وەربگرن، ئێوەیش وەك ڕێبواری چالاك لەم سێ کاتەدا تێکۆشنو خودا پەرستیو بەندەگی خۆتان بکەنو بیکەن بە دەسمایەی خۆتان: سەر لە بەیانیانو سەر لە ئێوارانو دەمەو پارشێو! (ب).

لە گێڕانەوەیەکی تری بوخاریدا (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بە پێی تەوانا هەوڵ بدەنو درێغیو کۆتایی لەکاری خێرا مەکەنو لەکاتی چالاکیو دەست بەتاڵیتانا خودا پەرستیەکی جوان بکەن، وەکوو ئەم سێ کاتە: سەر لەبەیانیانو سەر لە ئێوارانو دەمەو پارشێو! ڕێگەی ڕاستو ڕەوان بگرنو لە هەموو شتێکا میانەکار بنو لەرادە دەرمەچن، بەئاواتی خۆتان دەگەن.

١٤٦/٥-[٥]- وعن أَنسٍ رضي اللّٰهُ عنه قال: دَخَلَ النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم الْمَسْـجِدَ فَإِذَا حبْلٌ مَمْدُودٌ بَيْنَ السَّارِيَتَيْنِ فقالَ: (ما هَذَا الْحبْلُ ؟ قالُوا، هَذا حبْلٌ لِزَيْنَبَ فَإِذَا فَترَتْ تَعَلَقَتْ بِهِ. فقال النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (حُلّوهُ، لِيُصَلِّ أَحـدُكُمْ نَشَـاطَهُ، فَإِذا فَـترَ فَلْيَرْقُدْ) متفقٌ عليه.

ئەنەس (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جارێ حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) چوو بۆ مزگەوت: ڕوانی گوریسێ (لەناوەندی دوو کۆڵەکەدا) ڕایەڵ کراوە، فەرمووی: ئەم گوریسە چییە؟ گوتیان: ئەمە گوریسی زەینەبە، کە لەنوێژکردنی سوننەتدا ماندوو بوو، خۆی پێ دەگرێ، فەرمووی (درودی خوای لەسەر بێ):بیکەنەوەو لایبەن، ئەوەندە نوێژی سوننەت بکەن کە گورجو گۆڵن، کە خاوبوونەوەو خولکتان نەما ئیتر بخەون (ش).

١٤٧/٦-[٦]- وعن عائشة رضي اللّٰه عنها أن رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (إِذَا نَعَسَ أَحدُكُمْ وَهُوَ يُصَلِّي، فَلْيَرْقُدْ حَتَّى يَذْهَبَ عَنْهُ النَّـوْمُ، فَإِن أَحـدَكم إِذَا صـلّى وهُـو نَاعَسٌ لا يَدْرِي لعلَّهُ يذهَبُ يسْتَغْفِرُ فَيَسُبُّ نَفْسَهُ). متفقٌ عليه.

عائیشە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەگەر نوێژتان دەکردو لەوکاتەدا خەوتان دەهات ئەوا بخەون، تا خەوەکەتان دەڕوا،

---

٥ بوخاری (١١٥٠)، موسلیم (٧٨٤).

٦ بوخاری (٢١٢)، موسلیم (٧٨٦).

چونكه ئەگەر بەدەم خەوەوە نوێژ بكەن‌و بەدەم وەنەوزەكوتیّ‌و خەو بردنەوەوە نوێژ بكەن ڕەنگە بتانەوێ بپاڕێنەوە بۆ خۆتان بەڵام لەجیاتی ئەوە جنێو بەخۆتان بدەن! (ش).

١٤٨/٧-[٧]- وعن أَبِي عبد اللّٰه جابر بن سَمُرَةَ رضي اللّٰهُ عنهما قال: كُنْتُ أُصَلِّي مَعَ النبي صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم الصَّلَوَاتِ، فَكَانَتْ صلاتُهُ قَصداً وخُطْبَتُه قَصْداً) رواه مسلم.

جابیری كوڕی سەمووره (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: هەمیشە كە نوێژەكانم لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێ) دەكرد بە كۆمەڵ-واتە: بەجەماعەت- سەرنجم دەدا هەم نوێژەكەی‌و هەم وتارو دوانەكەی میانەكارو مامناوەندی بوون (م/تاج/دت/ن).

١٤٩/٨-[٨]- وعن أَبِي جُحَيْفَةَ وَهبِ بْنِ عبد اللّٰه رضي اللّٰهُ عنه قال: آخَى النبي صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم بَيْن سَلْمَانَ وأَبِي الدَّرْدَاءِ، فَزَارَ سَلْمَانُ أَبَا الدَّرْدَاءِ، فَرَأَى أُمَّ الدَّرْدَاء مُتَبَذِّلَةً فقالَ: ما شَأْنُكِ؟ قالَتْ: أَخوكَ أَبو الدَّرداءِ لَيْسَ له حَاجةٌ فِي الدُّنْيَا. فَجَاءَ أَبو الدرْدَاءِ فَصَنَعَ لَه طَعَاماً، فقالَ لَهُ: كُلْ فَإِنِّي صَائِمٌ، قالَ: ما أَنا بآكِلٍ حَتَّى تأْكُلَ، فَأَكَلَ، فَلَمَّا كانَ اللَّيْلُ ذَهَبَ أَبُو الدَّرْدَاءِ يقُوم فقال لَه: نَمْ فَنَام، ثُمَّ ذَهَبَ يَقُوم فقالَ لَه: نَمْ، فَلَمَّا كان من آخرِ اللَّيْلِ قالَ سلْمانُ: قُم الآنَ، فَصَلَّيَا جَمِيعاً، فقالَ له سَلْمَانُ: إنَّ لرَبِّكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لنَفْسِكَ عَلَيْكَ حقًّا، ولأَهلِك عَلَيْكَ حَقًّا، فَأَعْطِ كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّه، فأَتَى النبي صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم فَذَكر ذلكَ لَه، فقالَ النبي صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم: (صَدَقَ سلْمَانُ) رواه البخاري.

ئەبو جوحەیفە، وەهبی كوڕی عەبدوڵلا فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) پەیمانی برایەتی بەست لەبەینی سەلمان‌و ئەبو دەرداءدا، ڕۆژێ سەلمان دەچێ بۆ دیتنی ئەبو دەرداء، دەڕوانێ ئوممو دەردای خێزانی زۆر پەڕپووتە، پێی دەڵێ: ئەوە بۆ وات لەخۆت كردووە؟ دەڵێ: ئەبو دەردای برات كاری بە دنیا نەماوەو ئیشی بە ژن نییە، ئیتر بۆ كێ خۆم ئارایش بكەم؟ ئەبو دەردا هاتەوە، نانی بۆ سەلمان درووست كردو نان دانراو بەسەلمانی فەرموو: فەرموو نانەكەت بخۆ، من بەڕۆژووم،

---

٧ موسلیم (٨٦٦).

٨ بوخاری (١٩٦٨).

سەلمان فەرمووی: دەی منیش ناخۆم تا تۆیش نەخۆی، جا ئەویش خواردی، کە شەو هات، ئەبو دەرداء هەڵسایەوە بۆ شەو نوێژ، سەلمان پێی فەرموو: جارێ بخەوە، ئەویش خەوت، دیسان هەڵسایەوە بچێ بۆ شەونوێژ، سەلمان پێی گوت: بخەوەرەوە، لەدوایی شەودا سەلمان پێی فەرموو: دە ئێستا هەڵسە بۆ شەونوێژ، ئیتر پێکەوە شەونوێژیان کرد، لەپاشا سەلمان پێی فەرموو: لەڕاستیدا خودا مافی بەسەرتەوە هەیەو تۆی بۆ ئەوە درووست کردووە کە لەسەر شێوەیەکی جوان بی پەرستی، وەهەروەها خۆت بەش بەحاڵی خۆت مافی حەسانەوەو حەوانەوەت لەسەر خۆت هەیە، وە خێزانەکەت بەشی خۆی مافی هەیە لەسەرت، کەواتە هەموو خاوەن مافێ مافی خۆی بدەرێ، ئەوجا ئەبو دەرداء دەچێ بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) و ئەمەی بۆ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: سەلمان راست دەکا (بوخاری).

٩/١٥٠-[٩] – وعن أَبِي محمد عبدِ اللَّهِ بن عمرو بنِ العاص رضي اللَّه عنهما قال: أُخْبِرَ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم أنّي أَقُول: وَاللَّهِ لأَصومَنَّ النَّهارَ، ولأَقُومنَّ اللَّيلَ ما عشْتُ، فَقَالَ رَسُول اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «أَنْتَ الَّذِي تَقُول ذلك ؟ فَقُلْت له: قَدْ قُلتُه بأَبِي أَنْتَ وأُمِّي يا رسولَ اللَّه. قَالَ: (فإنكَ لا تَسْتَطِيعُ ذِلكَ، فَصُمْ وأَفْطِرْ، ونَمْ وَقُمْ، وَصُمْ مِنَ الشَّهْرِ ثلاثَةَ أَيَّامٍ فَإِنَّ الْحسنَةَ بعَشْرِ أَمْثَالَهَا، وذلكَ مثْلُ صِيامِ الدَّهْرِ قُلْت: فَإِنِّي أُطِيق أفْضَلَ منْ ذلكَ قالَ: فَصمْ يَوْماً وأَفْطِرْ يَوْمَيْنِ، قُلْت: فَإِنِّي أُطيق أفْضَلَ مِنْ ذلكَ، قَالَ: (فَصُم يَوْماً وَأَفْطِرْ يوْماً، فَذلكَ صِيَام دَاوود عليه السلام، وَهُو أَعْدَلُ الصِّيَامِ). وَفي رواية: (هوَ أَفْضَلُ الصِّيامِ) فَقُلْتُ فَإِنِّي أُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذلكَ، فقال رسول اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (لا أَفْضَلَ منْ ذلك» وَلأَنْ أَكُونَ قَبلْتُ الثَّلاثَةَ الأَيَّامِ الَّتِي قال رسولُ اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم أَحَبُّ إليَّ منْ أَهْلِي وَمَالِي.

وفي روايةٍ: (أَلَمْ أُخبَرْ أَنَّكَ تَصومُ النَّهارَ وتَقُومُ اللَّيْلَ ؟) قلت: بلَى يَا رسول اللَّهِ. قال: (فَلا تَفْعل: صُمْ وأَفْطِرْ، ونَمْ وقُمْ فَإِنَّ لجَسَدكَ علَيْكَ حقًّا، وإِنَّ لعيْنَيْكَ عَلَيْكَ حقًّا وَإِنَّ لزَوْجِكَ علَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لزَوْركَ عَلَيْكَ حَقًّا، وإِنَّ بحَسْبكَ أَنْ تَصومَ فِي كُلِّ شَهْرٍ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ، فَإِنَّ لَكَ بِكُلِّ حَسَنَةٍ عشْرَ أَمْثَالِهَا، فَإِذن ذلك صِيَامُ الدَّهْرِ» فَشَدَّدْتُ فَشُدِّدَ

---

٩ بوخاری (١٩٧٦-١٩٧٩)، موسلیم (١١٥٩).

عَلَيَّ، قُلْتُ: يا رسول اللّٰه إِنِي أَجِدُ قُوَّةً، قال: (صُمْ صِيَامَ نَبِيِّ اللّٰهِ داوُدَ وَلا تَـزِدْ عَلَيْـهِ» قلت: وما كَانَ صِيَامُ داودَ؟ قال: (نِصْفُ الدهْرِ) فكَانَ عَبْدُ اللّٰهِ يقول بعْد مَا كَبِرَ: يالَيْتَنِي قَبِلْتُ رُخْصةَ رسول اللّٰه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم.

وفي رواية: (أَلَمْ أُخبَرْ أَنَّك تصُومُ الدَّهْر، وَتَقْرأُ الْقرْآنَ كُلَّ لَيْلَة ؟) فَقُلْـتُ: بَلَـى يـا رسولَ اللّٰهِ، ولَمْ أُرِدْ بذلِكَ إِلاّ الْخيْرَ، قَالَ: (فَصُمْ صَوْمَ نَبِيِّ اللّٰهِ داودَ، فَإِنَّـه كَـانَ أَعْبَـدَ النَّاس، واقْرأْ الْقُرْآنَ في كُلِّ شَهْر) قُلْت: يَا نَبِيَّ اللّٰهِ إِنِّي أُطِيق أَفْضَـل مِـنْ ذلِـكَ ؟ قَـالَ: (فَاقْرَأه فِي كُلِّ عِشرين) قُلْت: يَا نبيَّ اللّٰهِ إِنِي أُطِيق أَفْضَل مِنْ ذَلِكَ ؟ قَالَ: «فَـاقْرَأْهُ فِـي كُلِّ عَشْر) قُلْت: يا نَبِيَّ اللّٰهِ إِنِّي أُطِيق أَفْضَلَ مِنْ ذلِكَ ؟ قَالَ: (فَاقْرأه في كُلِّ سَبْعٍ وَلاَ تَزِدْ عَلَى ذَلِكَ) فَشَدَّدْتُ فَشُدِّدَ عَلَيَّ، وقَالَ لِي النبـي صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (إِنَّـكَ لاَ تَـدْري لَعلَّكَ يَطُول بِكَ عُمُرٌ قالَ: فَصِرْت إِلَى الَّذِي قَالَ لِي النبـي صَلّى اللّهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم فَلَمَّـا كَبِرْتُ وَدِدْتُ أَنِّي قَبِلْت رخْصَةَ نَبِيِّ اللّٰهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم.

وفي رواية: (وَإِنَّ لوَلَدِكَ عليْكَ حَقًّا) وفي روايةٍ: لا صَامَ من صَامَ الأَبَـدَ) ثَلاثـاً. وفي روايةٍ: (أَحَبُّ الصِّيَامِ إِلَى اللّٰه تَعَالَى صِيَامُ دَاوُدَ، وَأَحبُّ الصَّـلاةِ إِلَـى اللّٰـهِ تَعَـالَى صَـلاةُ دَاوُدَ: كَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيلِ، وَيَقُومُ ثُلُثَهُ، وَيَنَامُ سُدُسَهُ، وَكَانَ يَصُومُ يوْمـاً وَيُفْطِـرُ يَوْمـاً، وَلا يَفِرُّ إِذَا لاقَى).

وفي رواية قَالَ: أَنْكَحَنِي أَبِي امْرَأَةً ذَاتَ حسَبٍ، وكَانَ يَتَعَاهَدُ كَنَّتهُ أي: امْرَأَة ولَدِهِ فَيسْأَلُهَا عَنْ بَعْلِهَا، فَتقُولُ لَهُ: نِعْمَ الرَّجُلُ مِنْ رجُل لَمْ يَطَأْ لنَا فِراشاً ولَمْ يُفتِّشْ لنَـا كَنَفـاً مُنْذُ أَتَيْنَاهُ فَلَمَّا طالَ ذَلِكَ عليه ذَكَرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم. فَقَالَ: (الْقَـني بـه) فلَقيتُهُ بَعْدَ ذلكَ فَقَالَ: (كيفَ تَصُومُ ؟) قُلْتُ كُلَّ يَوْم، قَالَ: (وَكَيفَ تَختِم ؟) قلتُ: كُلَّ لَيلة، وذَكَر نَحْوَ مَا سَبَق وكَان يقْرأُ عَلَى بعْض أَهْلِه السُّبُعَ الَّذِي يقْرؤهُ، يعْرضُهُ مِن النَّهَار لِيَكُون أَخفَّ علَيهِ بِاللَّيْل، وَإِذَا أَراد أَنْ يَتَقَوَّى أَفْطَر أَيّاماً وَأَحصَى وصَام مِثْلَهُنَّ كَراهِيَةَ أَن يتْرُك شيئاً فارقَ علَيهِ النبـي صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم.

كُلُّ هذِهِ الرِّوَايات صحيحةٌ مُعْظَمُهَا فِي الصَّحيحيْنَ وقليلٌ منْهَا في أَحَدِهِما.

عەبدوڵڵای کوری عەمر (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) فەرمووی: عەرزی پێغەمبەریان کردبوو (دروودی خوای لەسەر بێ) کە من گوتوومە: بەخودا تا ماوم بەشەو هەرشەو نوێژ دەکەمو بەڕۆژ هەر بەڕۆژوو دەبم. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئایا تۆ وات گوتووە؟ گوتم: بەڵێ گوتوومە، ئەی پێغەمبەری خودا! باوكو دایكم بە قوربانت بێ،

فەرمووی: ناتوانی ئەمە بکەی، بەڵام ناو بەناو بەڕۆژوو ببەو ناو بەناویش بەڕۆژوو مەبە، وە تاوێ شەو نوێژ بکەو تاوێکیش بخەوە، وە لەهەموو مانگێ سێ ڕۆژ بەرۆژوو ببە بەسە، ئیتر ئەوە وەك ئەوە وایە کەساڵ دوانزە مانگەی خودا بەرۆژوو ببی، چونکە چاکەیەك بە دەیە، گوتم: قوربان! تەواناى پتر هەیە، فەرمووی: دە ڕۆژ ناڕۆژێ بەرۆژوو ببە، کە ئەوەیش دەستووری بەرۆژووبوونی داود پێغەمبەر بووە، درودی لێ بێ، وەئەم دەستوورەیش ڕەواترین دەستوورو یاسایە بۆ ڕۆژوو گرتن! گوتمەوە: قوربان! من لەمەیش باشتر دەتوانم. فەرمووی: لەمە باشتر نییە. عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لە دواین تەمەنیا دەیگوت: بریا ئەو سێ ڕۆژەی کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی لە هەموو مانگێ سێ ڕۆژ بەرۆژوو ببە بریا ئەو سێ ڕۆژەم قەبووڵ بکردایە، قەبووڵ کردنی ئەم سێ ڕۆژەم لەلا خۆشترە تا ماڵو مناڵم. لە گێڕانەوەیەکا: فەرمووی: وامەکە، ناو بەناو بەڕۆژوو ببەو ناو بەناویش بەڕۆژوو مەبە، وە تاوێ شەو نوێژ بکەو تاوێکیش بخەوە، چونکە لەڕاستیدا لەش‌و جەستەت مافی هەیە لەسەر تۆ کە زۆر نەی ڕەنجێنی‌و تا ڕادەی پرووکان نەی ڕەتێنی، وە هەروەها چاوەکانت مافیان هەیە لەسەر تۆ، جا دەبێ موڕاعاتی حاڵی ئەمانە بکەی، هەرکەسەی بەپێ‌ی خۆی، وە لەگشت مانگێ تەنیا سێ ڕۆژ بەرۆژوو ببە بەستە! چونکە چاکە یەك بەدەیە، ئیتر ئەوە وەك ئەوە وایە کە ساڵ دوانزە مانگەی خوا بەرۆژوو ببی. عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لەسەر بێ) گوتی: وەڵێ من خۆم کارەکەم لەخۆم گران کرد، بۆیە لێم گران کراوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! لەخۆم ڕادەبینم‌و بەخۆما ڕادەپەرمووم کە زیاتر خودا پەرستی بکەم. فەرمووی: وەکوو پێغەمبەری خودا داوود بەرۆژوو بەو لێی زیاد مەکە، عەرزم کرد:ڕۆژووی داوود پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) چۆن بووە؟ فەرمووی: ڕۆژ نا ڕۆژێ بەرۆژوو دەبوو. عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لەسەر بێ) کاتێ پیر بوو بوو دەیفەرموو: خۆزگایەم کاتی خۆی ڕوخصەوتەکەی پێغەمبەرم قوبووڵ بکردایە. لە گێڕانەوەیەکا: فەرمووی: بیستوومە ساڵ دوانزە مانگە بەرۆژوو دەبی‌و هەموو شەوێ قورئان دەخوێنی؟ گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا! مەبەستیشم بەس ڕەزای خودایە. فەرمووی: وەکوو پێغەمبەری خودا داوود بەرۆژوو بە، بەڕاستی داود لەهەموو کەسێ خودا پەرستی پتر دەکرد، وەهەموو مانگێکیش یەك خەتمەی



قورئـان بکـه. گـوتم: قوربـان! لەمـە باشـتر لـەتواناما هەیـە، فـەرمووی: دە هـەموو حەفتەیێ خەتمێ بکە، وە لەوە زیـاتری مەکـە، عەبـدوڵڵا (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووشی پێم: چونکە تـۆ نـازانی، تەمـەنی درێـژ شـەرمی لەکەس نییە، بەشکوو تۆ تەمەنت درێژ بوو! گوتی: ئـەوەتانێ وەك حـەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی ئاوا پیر بووم، ئێستاکە پیربووم حەزدەکەم کاتی خـۆی ڕێـپێـدان (ڕوخصـەت)ەکـەی پێغەمبـەرم قـەبووڵ بکردایـە. لـە گێڕانەوەیـەکا: وە منالّەکـەت مافی هەیە لەسەر تۆ.

لـە گێڕانەوەیـەکا: ڕۆژووی ئـەو کەسـە گیرا نـەبێ کـە دوانـزە مانگـە بـەڕۆژوو دەبـێ! سـێ جـار ئـەم ڕسـتەیەی دووبـارە کـردەوە، لەگێڕانەوەیـەکا: پەسـەندترین ڕۆژوو لەلای خودا ئەو ڕۆژووەیە کە لەسـەر دەسـتووری ڕۆژووی داود بـێ (سـەلامی خودای لەسەر بێ) وە هەروەها نوێژیش وە یاسای داوودیش ئاوا بـوو: نیـوەی شـەو دەخەوت، سـێ یـەکێکی شـەویش شـەونوێژی دەکـرد، ئەمـە دەکاتـە پێـنج بـەش لـە شەش بەش، وە ئەو شەش یەکەی تریشی دەخەوتەوە! وە ڕۆژ ناڕۆژێکیش بەڕۆژوو دەبـوو، وە کاتـێ دەگەیشـت بـە دوژمـن لەبـەری هـەڵ نـەدەهات. لـە گێڕانەوەیـەکا: بـاوکم ژنـێ خانـەدانی هێنـا بـۆم، نـاو بـەناو سـەری لـە بووکەکـەی دەدا، کـە ژنـی کوڕەکەیـەتی، وە بەسـەری دەکـردەوە وە هـەواڵی مێردەکـەی لێ دەپرسـی، ئـەویش ڕۆژێ پێی دەڵێ: پیاو لەوە چاتر دەبێ چۆن بێ، هێشتا پێی لـە پـێم نەکـەوتووەو ئەوەتەی بووم بە ژنیو هاتوومەتە لای بەدەستی نەگرتومو لەبەر عیبـادەت کـردن ناپەرژێ لەگەڵ من درووست ببێ، کە ئەم حاڵە درێژەی کێشا باوکم ئەمە عـەرزی حـەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دەکـا، دەفـەرموێ: بیهێنـە بـۆم جـا لـەوە دوا چـووم بـۆ خزمـەتی. فـەرمووی: چـۆن چـۆنی بـەڕۆژوو دەبـی؟ گـوتم: هـەموو ڕۆژێ بـەڕۆژوو دەبم، فەرمووی: ئەی خەتمەی قورئان چۆن دەکەی؟ گوتم: هەموو شەوێ خەتمەیێ دەکەم. ئیتر فەرموودەکـەی بەتـەواوی گێڕایـەوە وەك لەپێشـەوە ڕابـورد. عەبـدوڵڵا (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لەدوایی دا دەچوو ئەو حەوت یەکەی کە بەشەو دەیخوێند، بەڕۆژ لای یەکێ لە کەسو کارەکەی خـۆی دەوری دەکـردەوە، هـەتا بەباشـی ڕەوانـی بـێ، هـەتا شەو بەئاسانی بیخوێنێ، جار جارە کـە دەیویسـت تـۆزێ هێـزی تـێ بێتـەوە دەچـوو چەند ڕۆژێ ڕۆژووی دەشکاندو ژمارەی ڕۆژەکانی دەژمارد، لەوەدوا دەق بەدەق ئەو

رۆژانەی رۆژوو دەگرتەوە، چونکە پێی ناخۆش بوو کە ئەوشتانەی کە لەسەردەمی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێ) دەقی پێیەوە گرتبوو وازی لێ بێنێ.

ئەم ریوایەتانە هەمویان صەحیحن، زۆربەیان هەم لە صەحیحی بوخاریو هەم لە صەحیحی موسلیم دا هەیە، کەمیان لەیەك لایاندا هەیە.

١٥١/١٠-[١٠]- وعن أَبِي رِبْعِيّ حنْظَلَةَ بنِ الرَّبيع الأُسيدِيِّ الْكَاتِب أَحدِ كُتَّابِ رسول اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: لَقِيَنِي أَبو بَكْر رضي اللَّه عنه فقال: كَيْفَ أَنْتَ يا حنْظلَةُ ؟ قُلْتُ: نَافَقَ حنْظَلَةُ، قَالَ: سُبْحانَ اللَّه ما تقُولُ ؟،: قُلْتُ: نَكُونُ عِنْد رسول اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يُذكِّرُنَا بالْجنَّةِ والنَّار كأَنَّا رأْيَ عين، فَإِذَا خَرجنَا مِنْ عِنْدِ رسول اللَّهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم عافَسنَا الأَزْوَاجَ وَالأَوْلادَ وَالضَّيْعاتِ نَسينَا كَثِيراً قال أَبو بكْر رَضي اللَّه عنه: فَواللَّهِ إِنَّا لنَلْقَى مِثْلَ هَذَا فانْطلقْتُ أَنَا وَأَبو بَكْر حتى دخَلْنَا عَلى رسول اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم. فقُلْتُ نافَقَ حنْظَلَةُ يا رسول اللَّه، فقالَ رسولُ اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «ومَا ذَاكَ؟» قُلْتُ: يا رسولَ اللَّه نُكونُ عِندكَ تُذكِّرُنَا بالنَّارِ والْجنةِ كأَنَّا رأْيَ العَيْنِ فَإِذَا خَرَجْنَا مِنْ عِنْدِكَ عَافَسنَا الأَزوَاج والأَوْلاَدَ والضَّيْعاتِ نَسِينَا كَثِيراً. فقال رسولُ اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيدِهِ أن لَوْ تَدُومُونَ عَلَى مَا تَكُونُونَ عِنْدِي وَفِي الذِّكْر لصَافَحتْكُمُ الملائِكَةُ عَلَى فُرُشِكُم وفي طُرُقِكُم، وَلَكِنْ يا حنْظَلَةُ ساعةً وساعةً» ثَلاثَ مرَّاتٍ، رواه مسلم.

حەنظەلەی کوری روبەیعی ئەلئوسەیدی (رەزای خودای لەسەر بێ)، کە میرزایەکی باش بوو، وە یەکێ بوو لە نووسەرەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: جارێ ئەبوبەکرم پێ گەیشت فەرمووی: تۆ چۆنیت ئەی حەنظەلە؟! گوتم: حەنظە لە ناپاکی سەری لێ هەڵداوە! فەرموی: سوبحانەڵلا! ئەوە دەڵێی چی؟ گوتم: کە دەچین بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ)، حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) باسی بەهەشتو دۆزەخمان بۆ دەکا، دڵ دا دەهێنینو وامان لێ دێ دەڵێی بەچاوی خۆمان تەماشایان دەکەینو وان بە بەرچاومانەوە، بەڵام کە لای حەزرەتمان چۆڵ کردو چووینەوە ناو ماڵو منداڵو پلکاین بە خاوو خێزانو مووشوری مەرو ماڵاتو خەڵەو خەرمانو گوزەرانمان خوارد ئیتر دەچینە حاڵێی ترەوەو زۆرمان لە ئامۆژگاریەکانی حەزرەت

---

١٠ موسلیم (٢٧٥٠).

(درودی خوای لەسەر بێ) لەبیر دەچێ! دەی ئەگەر ئەمە دووڕوویی و نیفاق نییە چییە؟ ئەبو بەکر فەرمووی: خۆئەگەر بۆ ئەمە بڵێی دەسا بەخودا هەموومان هەرواین! ئیتر من و ئەبو بەکر چووین بۆ لای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! حەنظەلە دووروویی سەری لێ هەڵداوە! فەرمووی: ئادەی چۆن؟ چیم عەرزی ئەبو بەکر کرد عەرزی ئەویشم کرد، ئەویش فەرمووی: بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە، ئەگەر دەوام بکەن لەسەرئەو حاڵی دلگەرمییەی کە لەلای من هەتانە، وە بەردەوام سەرگەرمی یادو زیکری خودابن، پەردە لە نێوان ئێوەو فریشتەکاندا هەڵدەگیرێ، ئیتر لە هەموو جێیێ، تەنانەت لەسەر نوێن و لە ڕێگەو بانیش فریشتەکان چاك و چۆنی و تەوقەیان لەگەڵ دەکردن! ئینجا فەرمووی: ئەی حەنظەلە! ئەوە قەیناکاو ئەوە نیفاق و دووڕوویی نییە، چونکە ژیانەکە خۆی وایە: تاوێ بۆ خوداو تاوێ بۆ پەیداکردنی گوزەران و تاوێکیش بۆ وچان و پشوو! (موسلیم).

١١/ ١٥٢-[١١]- وعن ابن عباس رضي اللّٰه عنهما قال: بيْنما النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم يَخْطُبُ إذَا هُوَ بِرجُلٍ قَائِمٍ، فسأَلَ عَنْهُ فَقَالُوا: أَبُو إسْرائيلَ نَذَر أَنْ يَقُومَ فِي الشَّمْس وَلا يقْعُدَ، ولا يستَظِلَّ ولا يتَكَلَّمَ، ويصومَ، فَقالَ النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (مُرُوهُ فَلْيَتَكَلَّمْ ولْيَستَظِلَّ ولْيُتِمَّ صومَهُ) رواه البخاري.

ئیبن و عەبباس (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) وتاری دەدا، پیاوێکی دی لەبەر هەتاوەکە ڕەق ڕاوەستابوو، پرسی بۆچی ئەو پیاوە وا ڕەق ڕاوەستاوە؟ عەرزیان کرد: ئەوە ئەبو ئیسرائیلە، ئاە (نەزر)ی کردووە ە بەپێوە لەبەر خۆر ڕەق ڕاوەستێ و دانەنیشێ و نەچێتە بەر سێبەرو قسە نەکاو لەهەمان کاتدا بەڕۆژووش بێ، فەرمووی: فەرمانی پێ بکەو لەزمانی منەوە پێی بڵێ: کە قسە بکاو بچێتە بەر سێبەرو دابنیشێ بەڵام ڕۆژووەکەی تەواو بکا (بوخاری-خ-).

## ١٥- باسی ئاگاداری کردنی کردەوەی چاکە (باب المحافظة على الأعمال)

قال الله تعالى: ﴿ألم يأن للذين آمنوا أن تخشع قلوبهم لذكر الله وما نزل من الحق ولا يكونوا كالذين أوتوا الكتاب من قبل فطال عليهم الأمد فقست

١١ بووخاری (٦٧٠٤).

قلوبهم﴾الحديد/١٦. واته: ئەی یارانی موحەممەد! ئەوە هەتا کەی لە خەوی بێ ئاگاییە خەبەرتان نابێتەوەو خەریکی گەمەو گاڵتە دەبن، کاتی ئەوە هاتوە کە دڵتان نەرم ببێو دڵ دابهێنن‌و خوو بدەنە یادو زیکرو عیبادەتی خواو هۆگری ببن‌و ئەو قورئانە هەق‌و راستییەی کە بۆ موحەممەد هاتوە بە دەست‌و دەم بیگرن، وە هەتا کەی چاو لەو جوولەکەو گاورانە دەکەن کە لەپێش ئێوەوە نامەیان بۆ هاتبوو، لەبەر ئەوەی لە مێژەوە لە پێغەمبەرەکانیان دابڕاون دڵیان رەق بووەو ناچن بەلای زیکرو یادی خوداوە.

وقال تعالى: ﴿وقفينا بعيسى ابن مريم وآتيناه الإنجيل وجعلنا في قلوب الذين إتبعوه رأفة ورحمة ورهبانية أبتدعوها ما كتبناها عليهم إلا ابتغاء رضوان الله فما رعوها حق رعايتها﴾الحديد/٢٧. واتە: ئینجا بەشوێن ئەواندا پێغەمبەرانی خۆمانمان بەرودوا دەنارد، تا سەرە هاتە سەر عیسای کوری مەریەم، ئەویشمان کرد بە پێغەمبەرو ناردمان‌و نامەی پیرۆزی ئینجیلمان بە خەڵات داپێ، بە میهرەبانی خۆم دڵی ئەوانەم نەرم کردووە ە پەیرەوی عیسا دەکەن، وە رەحمی خودام ناوەتە دڵیان، وەڵێ خۆیان لە خۆیانەوە بەبێ فەرمانی من شتێکیان داهێناو ناویان لێ نا رەبەنی‌و تەرکی دنیاو گۆشەگیری، بە خەیاڵی ئەوە کە ببێ بەمایەی رەزای خودا، بەڵام وەك شتەکە بیدعەت بوو، وە دەستکردی خۆیان بوو بۆشیان نەچووە سەرو بەرێك‌و پێی هەقی خۆیان نەدایێ.

وقال تعالى: (ولا تكونوا كالتي نقضت غزلها من بعد قوة أنكاثا)النحل/٩٢. واتە: چاو لەو ژنە لاژگە مەکەن کە دەچوو رۆژ تا ئێوارێ بەنی دەرێساو لەپاشا رێسەکەی خۆی هەڵدەوەشانەوەو شی دەکردەوە وە دەیکردەوە بەخوری!

وقال تعالى: (واعبد ربك حتى يأتيك اليقين)الحجر/٩٩.

وأما الأحاديث فمنها حديث عائيشة وكان أحب الدين إليه ماداوم صاحبه عليه وقد سبق الباب قبله:بڕوانە فەرموودەی ژمارە(١/١٤٢).

١٥٣/١-[١] وعن عمرَ بن الخطاب رضي اللّٰه عنه قال: قَال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (منْ نَامَ عَنْ حِزْبِهِ مِنَ اللّيْل، أَو عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ فَقرأه ما بينَ صلاةِ الْفَجـرِ وَصلاةِ الظهرِ، كُتب لَهُ كأنما قرأَهُ مِن اللّيْلِ) رواه مسلم.

١ موسليم (٧٤٧).

**عومەری کوڕی خەتتاب** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **لە حەزرەتەوە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** ئەگەر کەسی شەوێ خەوی لێ کەوت و ئەو شەوە بەشە شەو طاعەتی سوننەتی ئەو شەوەی نەکرد، جا ئایا هەمووی نەکرد، یا هەندێکی کردو هەندێکی نەکرد، بەلآم بەرۆژ قەزای بداتەوە لەناوەندی نوێژی بەیانی و نوێژی نیوەڕۆدا ئەوە وەك ئەوە وایە بەشەو طاعەتی کردبێ ئاوایەو ئەو پاداشەی بۆ دەنووسرێ (م).

١٥٤/٢-[٢]- وعن عبدِ اللّه بنِ عمرو بنِ العاص رضي اللّه عنهما قال: قال لي رسولُ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (يَا عَبْدَ اللّه لا تَكُنْ مِثلْ فُلانٍ، كَانَ يقُومُ اللّيْلَ فتَركَ قِيامَ اللّيْل) متفقٌ عليه.

**عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) فەرمووی:** **پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **پێی فەرمووم:** ئەی عەبدوڵڵا! وەك فیسارە کەس مەبە، کە شەو نوێژی دەکرد، بەلآم ئێستا وازی لێ هێناوە (ش).

١٥٥/٣-[٣]- وعن عائشةَ رضي اللّه عنها قالت: كان رسولُ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم إذَا فَاتَتْهُ الصَّلاةُ مِنْ اللّيْلِ مِنْ وجعٍ أَوْ غيْرِهِ، صلّى مِنَ النَّهَارِ ثِنْتَي عشْرَةَ ركعةً) رواه مسلم.

**عائیشە** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستووری وابوو هەر کارێکی خێری بکردایە دەیکرد بە پیشەو بەردەوام دەبوو لەسەری، ئەگەر بەشەویش خەوی لێ بکەوتایە، یا نەخۆش بوایە، یا لەبەر هەر هۆیەکی تر بەشە شەونوێژی ئەو شەوەی بچوایە، ئەوا بە ڕۆژ دەی گێڕایەوەو لەباتی ئەوە بەرۆژ دوازدە ڕکات نوێژی دەکرد. (م/تاج).

## ١٦- باسی فەرمان کردن بە ئاگاداری کرنی سونەت و ڕەوشتی حەزرەت و دەستوورو شێازەکانی سوننەت
## باب في الأمر بالمحافظة على السنة وآدابها

قال الله تعالى: ﴿وما آتاكم الرسول فخذوه وما نهاكم عنه فانتهوا﴾الحشر/٧.
وقال تعالى: ﴿وما ينطق عن الهوى إن هو إلا وحي يوحى﴾النجم/٣-٤.

٢ بوخاری (١١٥٢)، موسلیم (١١٥٩)و (١٨٥).

٣ موسلیم (٧٤٦)، (١٤٠).

وقـال تعـالى: ﴿قـل إن كنـتم تحبـون الله فـاتبعوني يحبـبكم الله ويغفـر لكـم ذنوبكم﴾آل عمران/٣١.

قال تعالى: ﴿لقد كان لكم في رسول الله أسوة حسـنة لمن كان يرجـوا الله واليـوم الآخر﴾الأحزاب/٢١.

وقال تعالى: ﴿فلا وربك لايؤمنون حتى يحكموك فيما شجر بينهم ثـم لا يجـدوا في أنفسهم حرجا مما قضيت ويسلموا تسليما﴾النساء/٦٥.

وقال تعالى: ﴿فإن تنازعتم في شئ فردوها الى الله والرسول إن كنتم تؤمنون بالله واليوم الآخر﴾النساء/٥٩. قال العلماء: معناه الى الكتاب والسنة.

وقال تعالى: ﴿من يطع الرسول فقد أطاع الله﴾النساء/٨٠.

وقال تعـالى: ﴿فليحـذر الـذين يخـالفون عـن أمـره أن تصـيبهم فتنـة أو يصـيبهم عذاب أليم﴾النور/ ٦٣.

وقال تعالى: ﴿واذكـرن مـايتلى في بيـوتكن مـن آيـات الله والحكمـة﴾الأحـزاب/ ٣٤. والآيات في الباب كثيرة.

تێكـڕا مەبەسـت لـە ئايەتـە پیرۆزەکـان ئەمەیـە: لـە قسـەو فـەرمان‌و ڕێبـازی سوننەتی پێغەمبـەری خۆتـان دەرمەچـن، هەرچـی دا پێتـان قـەبوڵی بکـەن‌و وەری بگرن‌و فـەرمانی مەشـکێنن‌و کـە فـەرمووی شـتێ مەکـەن مەیکـەن‌و وازی لێ بێـنن، چونکە ئەو لەبەرئەوەی ڕەوانەکراوی خودایە سەرمەشقی ئێوەیە لە خۆیەوە قسـە ناکا، فەرمایشتەکانی هەمووی بە سروش بۆی دێ لەلای خـوداوە، هیچـی بـۆ هـەواو هەوەس نییە، لەبەر ئەوەی کە ڕێگـەی ڕەهبـەر ڕێگـەی راسـتی خودایـە هەرکەسـێ شوێنی بکەوێ‌و، بـۆ هـەموو رەوش‌و رەفتـارو کرداری شـوێنپای ئـەو زاتـە نـازدارە هەڵبگرێ‌و بەپێی نامەی خودا کە قورئانەو بەپێی فەرمایشت‌و ڕەوشـی حـەزرەت رەفت بکاو لە ڕێبازی ئەو دەرنەچێ ئەوە مەعنای وایە کە ئەو کەسەیە بـە گـوێی خودای کردووە، ڕێگەی ڕاستی خودای گرتووە، کەواتە لەم حاڵەدا خودا ئەو کەسەی خۆش دەوێ، لەبەر ئەوە پایەی بەرزی بەخەڵات دەداتێ وە لـەتاوانی خـۆش دەبـێ، وە عەیب‌و شوورەیی‌و نەنگی دەپۆشێ، وەڵێ کەسانێ کە لە فەرمانی ئەو دەردەچن‌و بەحوکم‌و بڕیاری ئەو رازی نابن‌و لە سوننەت‌و ڕەوشتی ئـەو لووتـەلان، ئەوانـە یـا باوەڕی تەواویان نییە، یا با ئاگایان لە خۆیان بێ، کاتێکیان زانی لە ناکاوێکا لەسەر ئەو سەرپێچییە تووشی فیتنـەو ئـاژاوە بـوون، یـا تووشـی سـزایەکی زۆر بـە ئـێش بوون.

خودای گەورە دووپاتی دەکاتەوە بۆ ئوممەتی ئیسلام کە سوننەتو ڕێگەی ڕەهبەر-کە ناوی دەبا بە حیکمەت، واتە: فەرمایشی بەرزی پیرۆزو زانستی پڕ واتا-ئەویش وەك ئایەتو سورەتەکانی قورئانی پیرۆز شایەنی قۆستنەوەو دەورکردنەوەو لەبەرکردنو گوێ پێ دانن، بۆیە بە هاوسەرەکانی حەزرەت دەفەرموێ: ئەی هاوسەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خۆشەویستی من! شتێ کە شایەنی شانی ئێوەی خاوەن قەدرو ڕێز بێ ئەوەیە کە بەردەوام لە فیکرو بیرو یادی ئەم قورئانە پیرۆزەدا بن، کە لەناو ماڵەکانتانا دەور دەکرێتەوە وەك چرایەکی جوان دەگرێ، هەروەها یاساو ڕەوشو ڕێگەی ڕەهبەر کە بە زوبانی قورئان پێی دەگوترێ: حیکمەت.

١٥٦/١-[١]- عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي اللّٰه عنه عن النبـي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: «دَعُونِي ما تَرَكْتُكُمْ: إِنَّما أَهْلَكَ من كَانَ قَبْلَكُم كَثْرةُ سُؤَالِهِمْ، وَاخْتِلافُهُمْ عَلَى أَنْبِيـائِهِمْ، فَإِذا نَهَيْتُكُمْ عنْ شَيْءٍ فاجْتَنِبُوهُ، وَإِذا أَمَرْتُكُمْ بِأَمْرٍ فَأْتُوا مِنْهُ ما اسْتَطَعْتُمْ» متفقٌ عليه.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: ئەوەی گوتم مەیکەن توخنی مەکەون، وە ئەوەی گوتم بیکەن چەندەی لەتواناتانا هەیە بیکەن، زۆر لێی مەکۆڵنەوەو چەندو چوونی لەسەر مەکەن، چونکە نەتەوەکانی پێش ئێوە لەسەر ئەوە لەناو چوون چونکە پرسیاری زۆریان لە پێغەمبەرەکانیان دەکردو لەدژیان دەوەستان (ش/تاج).

١٥٧/٢-[٢]- عَنْ أَبِي نَجِيحٍ الْعِرْباضِ بْنِ سَارِيَةَ رضي اللّٰه عنه قال: وَعَظَنَا رسـولُ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم مَوْعِظَةً بليغةً وَجِلَتْ مِنْهَا الْقُلُوبُ وَذَرَفَتْ مِنْهَا الْعُيُون، فقُلْنَا: يا رَسولَ اللّٰه كَأَنَهَا موْعِظَةُ مُوَدِّعٍ فَأَوْصِنَا. قال: «أُوصِيكُمْ بِتَقْوى اللّٰـه، وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَـةِ وإنْ تَأَمَّر عَلَيْكُمْ عَبْدٌ حبشيٌّ، وَأَنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ فَسَيَرى اخْتِلافاً كثِيرا. فَعَلَـيْكُمْ بسُـنَّتي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ، عضُّوا عَلَيْهَا بالنَّواجِذِ، وإِيَّاكُمْ ومُحْدثَاتِ الأُمُورِ فَإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضلالَةٌ» رواه أبو داود، والترمذِي وقال حديث حسن صحيح.

عیرباضی کوڕی ساریە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ڕۆژێ، لەپاش نوێژی بەیانی، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ئامۆژگارییەکی شیرینو تەمێیەکی دلگیری کردین، چاوی

١ بوخاری (٧٢٨٨)، موسلیم (١٣٣٧).

٢ ئەبوداوود (٤٦٠٧)، تیرمذي (٢٦٧٨)

هێنایه گریانو دڵی خسته ترسو لەرزین، تاگوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمایشتەکانت لەقسەی کەسێ دەچێ کەلەسەر ئۆغربێو ماڵ ئاواییو خودا حافیزی بکا، کەوایە فەرمانت بەچییە پێمان، فەرمووی: ئامۆژگاریئەوەتان دەکەم کە لەخودا بترسنو تەقوای خودا بکەنو گوێڕایەڵو فەرمانبەربنو لەفەرمانی سەرکارو فەرمانڕەوای خۆتان دەرمەچن، ئەگەر چێ قولە ڕەشێکی حەبەشیش بووە بە فەرمانبەرتان، چونکە ئەوەی لە ئێوە بمێنێ ناکۆکییەکی زۆر دەبینێ، وە خۆتان بپارێزن لە کاروباری تازەهەڵلا، چونکە ئەوانە هۆی سەر لێشێوانو هەوێنی گومڕایین، جا ئەگەر کەسێ لە ئێوە کەوتە ئەو ڕۆژانەو شتێ لەوانەی تووش بوو با دەست بگری بە سوننەتو یاسای خۆمو پەیرەوی ڕەوشتو ڕەفتاری جێنشینە باشە شارەزاکانم بکا، وە بەدەمو دەست یاسای خۆمو جێنشینە باشەکانم بگرنو بە پێڵوی چاو بیپارێزن! (د/ت/ح/ح-(ب-تاج).

١٥٨/٣-[٣]- عَنْ أَبِي هريرة رضي اللّٰه عنه أَن رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: كُلُّ أُمَّتِي يدْخُلُونَ الْجنَّةَ إلاَّ مَنْ أَبي). قِيلَ وَمَنْ يَأَبى يا رسول اللّٰه ؟ قالَ: (منْ أَطَاعَنِي دَخَلَ الجَنَّةَ، ومنْ عصَانِي فَقَدْ أَبي) رواه البخاري.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئوممەتم هەموویان دەچنە بەهەشت مەگەر ئەوانەیان کە مل نادەن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوانە کامانەن کە مل نادەن؟ فەرمووی: ئەوەی بە گوێی من بکا دەچێتە بەهەشت، وە ئەوەی بەگوێ من نەکا بەمەعنا مل بە فەرمانی من ناداو لە فەرمانی من دەردەچێ (ب).

١٥٩/٤-[٤]- عن أَبي مسلمٍ، وقيلَ: أَبِي إِيَاسٍ سلَمةَ بْنِ عَمْرو بن الأَكْوَعِ رضي اللّٰه عنه، أَنَّ رَجُلاً أَكَلَ عِنْدَ رسولِ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم بِشِمَالِهِ فقالَ: (كُلْ بِيمِينكَ) قَالَ: لا أَسْتَطِيعُ. قالَ: (لا استطَعْت) ما منعَهُ إِلاَّ الْكِبْرُ فَمَا رَفَعَها إِلَى فِيهِ، رواه مسلم.

سەلەمەی کوری ئەکوەع (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پیاوێ، لە خزمەتی حەزرەتدا (دروودی خوای لەسەر بێ) بە دەستی چەپی نانی دەخوارد، پێی فەرموو: بە دەستی ڕاستت نان

---

٣ بوخاری (٧٢٨٠).

٤ موسلیم (٢٠٢١).

بخۆ، گوتی: ناتوانم، حەزرەت پێی فەرمووو: دە هەرگیز ناتوانیت! کابرا بە درۆ گوتی ناتوانم، لە راستیدا دەعیەی نەدەهات کە بەگوێی پێغەمبەر بکا. گوتی: جا نزاکەی پێغەمبەری لێ گیرا بوو، ئیتر جارێکی تر ئەو کابرایە ئەو دەستەی بۆ نەبرا بۆ دەمی! (م).

٥/١٦٠-٥- عنْ أَبِي عبدِ اللَّه النُّعْمَان بْن بَشِيرٍ رضي اللَّه عنهما، قال: سمِعْتُ رسولَ اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يقولُ: (لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ أَوْ لَيُخالِفَنَّ اللَّه بَيْنَ وُجُوهِكُمْ) متفقٌ عليه

وفي روايةٍ لِمُسلمٍ: كان رسولُ اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يُسَوِّي صُفُوفَنَآ حَتَّى كأَنَّمَا يُسَوي بِهَا الْقِداحَ حَتَّى إذَا رأَى أَنَّا قَدْ عَقَلْنَا عَنْهُ ثُمَّ خَرَجَ يوماً، فقامَ حتَّى كَادَ أَنْ يكبِّرَ، فَرأَى رجُلا بادِياً صدْرُهُ فقالَ: (عِبادَ اللَّه لَتُسوُّنَّ صُفوفَكُمْ أَوْ لَيُخالِفَنَّ اللَّه بيْن وُجُوهِكُمْ).

نوعمانی کوری بەشیر (رەزای خودایان لەسەر بێ)، فەرمووی: ژنەوتم لە حەزرەت خۆی (درودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (یا ریزەکانتان رێك دەخەن و لە ریزی نوێژدا رێك رادەوەستن، یاخود خودا لەسەرئەوە رووتان تاق و لۆق دەکاو دژایەتی و ناکۆکی و دووبەرەکی دەخاتە نێوانتانەوە!) (ش). لە گێڕانەوەیەکی موسلیما: جاران، حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) وەها بە رێك و پێکی ریزەکانی لە نوێژدا رێك دەخستین دەتگوت دووخە، تا بەباشی فێری رێك راوەستانی ناو ریزی نوێژ بووین و لە باوەڕی حەزرەت دا وابو کە ئیتر بەباشی لە حاڵەکە حاڵی بووین، کەچی رۆژێ کە تەشریفی هات و لە میحرابەکەدا راوەستاو خەریك بوو ئەڵلاهو ئەکبەری نوێژ دابەستن بکا، لەم کاتەدا پیاوێکی بینی سنگی دەرپەڕیبوو، فەرمووی: ئەی بەندە نازدارەکانی خودا! یا ریزەکانتان رێك دەخەن و لە ریزی نوێژدا رێك و پێك راست رادەوەستن، یاخود خودا رووتان تاق و لۆق دەکاو دژایەتی و ناکۆکی و دووبەرەکی دەخاتە ناوتانەوە!).

٦/١٦١-٦- عن أَبِي موسى رضي اللَّه عنه قال: احْتَرق بيْتٌ بالْمدِينَةِ عَلَى أَهلِهِ مِنَ اللَّيْل فَلَمَّا حُدِّث رسول اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم بِشَأْنِهِمْ قال: (إنَّ هَذِهِ النَّار عَدُوٌّ لكُمْ، فَإِذَا نِمْتُمْ فَأَطْفِئُوهَا عَنْكُمْ) متَّفقٌ عليه.

---

٥ بوخاری (٧١٧)، موسلیم(٤٣٦)و ()١٢٨.

٦ بوخاری (٦٢٩٤)، موسلیم (٢٠١٦).



ئەبو مووسا (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لەمەدینە خانوویەك بەسەر خاوەنەكەیا سوتا، كە ئەم باسەیان عەرزی حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) كرد، فەرمووی: ئاگر دوژمنی ئێوەیە، كە دەخەون لەخۆتانی بكوژێننەوە (ش).

١٦٢/٧-[٧]- وعَنْهُ قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (إنَّ مَثَل مَا بعَثني اللّٰه بِهِ منَ الْهُدَى والْعلْمِ كَمَثَلَ غَيْثٍ أَصاب أَرْضاً فكَانَتْ طَائِفَةٌ طَيبَةٌ، قبِلَتِ الْمَاءَ فَأَنْبَتتِ الْكلأَ والْعُشْبَ الْكَثِيرَ، وَكَانَ مِنْهَا أَجَادِبُ أَمسكَتِ الماءَ، فَنفَعَ اللّٰه بهـا النَّـاس فَشَـرِبُوا مِنْهَـا وسَقَوْا وَزَرَعَوا. وأَصَابَ طَائِفَةً أُخْرَى، إنَّمَا هِيَ قِيعانٌ لا تُمْسِكُ ماءً وَلا تُنْبِتُ كَلأً فَذَلِكَ مَثَلُ مَنْ فَقُهَ فِي دِينَ اللّٰه، وَنَفعَه ما بعَثَنِي اللّٰه به، فَعَلِمَ وعَلَّمَ، وَمثلُ مَنْ لَمْ يَرْفَـعْ بِـذَلِكَ رَأْساً ولَمْ يَقْبَلْ هُدَى اللّٰهِ الذي أُرْسِلْتُ بِهِ) متفقٌ عليه.

دیسان گوتی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم هیدایەتو ڕێنموویی‌و زانستە، كە خودا بە منا ناردوویەتی بۆ ئەم خەڵكە، وەك بارانێكی زۆروایە، كە لەخاكێ ببارێ، بەشێكی خاكێكی پاكو بە پێز بێ‌و باراناوەكە بگرێتە خۆی‌و لەوەڕو گیایەكی زۆری پێ سەوز ببێ، وە بەشێكی تری زەویەكی ڕەقەن‌و ڕووتەن بێ، شینایی‌و سەوزایی نەڕوێنێ، بەڵام ئاوەكە قوت نەداتەوە، بەڵكوو گلی بداتەوەو ببێ بە ئەستێرو گۆلاوو خودا بیكا بە مایەی خێرو خۆشی‌و سوود بۆ خەڵك: بەم ڕەنگە هەم خۆیان لێی بخۆنەوەو هەم ئاژەڵ‌و ماڵاتی پێ ئاو بدەن‌و هەم كشت‌و كاڵی لەبەرا بكەن، وە بەشێكی تریشی دەشتانی‌و شۆرەكات بێ، نە ئاو گل بداتەوەو نە لەوەڕیش سەوز بكا، جا ئەم خاك‌و بارانە نموونەو وێنەیشە بۆ ئەو كەسە خودا پێداوانە كە لە ئایینی خودا شارەزا دەبن‌و بەفەرمانی خودا لەم ئایینی منە سوود وەردەگرن‌و هەم خۆیان فێری زانین دەبن‌و هەم خەڵكی تریش فێردەكەن لەهەردوو جیهانا سەریان پێ بەرز دەبێتەوە، هەروەك نموونەو وێنەیشە بۆ ئەو كەسانەیش كەسەریان پێ بەرز نابێ‌و ئەو هیدایەت‌و دینە ڕاستەی كە خودا بەمنا ناردوویەتی نایانەوێ‌و وەری ناگرن (ش).

١٦٣/٨-[٨]- عن جابر رضي اللّٰه عنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم: «مثَلِي ومثَلُكُمْ كَمَثَلِ رجُلٍ أَوْقَدَ نَاراً فَجعَلَ الْجَنَادِبُ وَالْفَراشُ يَقَعْـنَ فيهَـا وهُـوَ يـذُبُّهُنَّ عَنهَا وأَنَا آخذٌ بِحُجَزِكُمْ عَنِ النارِ، وأَنْتُمْ تَفَلَّتُونَ منْ يَدِي) رواه مسلمٌ.

---

٧ بوزخناری (٧٩)، موسلیم (٢٢٨٢).

٨ موسلیم (٢٢٨٥).

لە جابیرەوە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لە حەزرەتەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: وێنەی منو وێنەی ئێوەی ئوممەتی من، وەك وێنەی پیاوێ وایە، ئاگرێکی کردبێتەوە، جانەوەرو پەپوولەیەکی زۆری تێ ورووکابنو پەیتا پەیتا تێی بکەونو بسوتێنو ئەویش خۆش خۆش دووریان بخاتەوە لە ئاگرەکە، کەچی ئێوە بەزۆر خۆتان لەدەستم رادەپسکێننو خۆتانی تێ فڕێ دەدەن! (موسلیم (ڕەزای خودای لەسەر بێ)

٩/١٦٤-[٩]- عَنْهُ أَنْ رسولَ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم أَمَر بِلَعْقِ الأَصابِعِ وَالصحْفَةِ وقال: (إِنَّكُم لا تَدْرُونَ في أَيِّهَا الْبَرَكَةَ) رواه مسلم.

وفي رواية لَهُ: (إِذَا وَقَعتْ لُقْمةُ أَحدِكُمْ. فَلْيَأْخُذْهَا فَلْيُمِطْ مَا كَانَ بِهَا مِنْ أَذًى، وَلْيَأْكُلْهَا، وَلا يَدعْهَا لَلشَّيْطانِ، وَلا يَمْسَحْ يَدَهُ بِالْمَنديلِ حَتَّى يَلْعَقَ أَصابِعهُ، فَإِنَّهُ لا يدْرِي في أَيِّ طَعَامِهِ الْبَرَكَةَ).

وفي رواية له: (إِنَّ الشَّيْطَانَ يَحْضُرُ أَحَدكُمْ عِنْدَ كُلِّ شَيءٍ مِنْ شَأْنِهِ حَتَّى يَحْضُرَهُ عِنْدَ طَعَامِهِ، فَإِذَا سَقَطَتْ مِنْ أَحَدِكُمْ اللُّقْمَةُ فَلْيُمِطْ مَا كَان بِهَا منْ أَذًى، فَلْيأْكُلْها، وَلا يَدعْهَا لِلشَّيْطَانِ.

جابیر (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دیسان فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی پێ دەکردین کە دەوری قاپەکەش بەپەنجە دالێسینو پەنجەمان بلێسینەوە، وە دەیفەرموو: چونکە ئێوە نازانن کە پیتو بەرکەتی خواردەمەنییەکانتان بەکاموەیەتی (م). لە گێڕانەوەیەکا: موسلیم (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەگێڕێتەوە: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەگەر پاروی کەسێکتان بەربۆوە، با هەڵی بگرێتەوەو با پاکی بکاتەوە لە ئازارو شتی واو ئینجا بیخواتو نەیهێڵێتەوە بۆ شەیتان کە لە نان خواردنیش لێ بۆوە، با لەپێشا پەنجەکانی بلێسێتەوە، ئەوساکە ئەگەر ویستی با بەخاولی دەستی بسڕێ! چونکە ئەو نازانێ کە پیتو فەڕی خوواردەمەنییەکەی بە کاموەیەتی. لە گێڕانەوەیەکی تری موسلیمدا: شەیتان بۆ هەموو کارو بارێکتان دێ بەلاتانەوە، سا بۆ زیانی ئێوە یا بۆ سوودی خۆی، تەنانەت لەکاتی نان خواردنیشدا دێت بۆ لاتان، جا ئەگەر تیکەی یەکێکێتان بەربووەوە با پاکی بکاتەوە لەئازارو شتی واو ئینجا بیخواتو نەیهێڵێتەوە بۆ شەیتان.

٩ موسلیم (٢٠٣٣) (١٣٤) (١٣٥).

تێبینی: مەبەست لەم فەرموودە پیرۆزانە ئەوەیە کە ماڵ کەمو زۆری بە فیڕۆ نەڕواو ئەگەر دەنکێ برینجیش بووە بە خۆڕایی بەزایە نەچێ، بەڵام بەهیچ جۆرێ مەبەست ئەوە نییە کە پیاو گوێ بە پاكو پیسی نەداو ئەگەر تیکەکەی کەوتە سەر زەویەکی پیسو خۆڵاوی بوو، فوویێ دووانی لێ بکاو بیخوا، ئیسلام دژی پیسو پۆخەڵییە دۆستی گیانی بەگیانی پاكو تەمیزییە. ئێستا لەم چەرخەی ئێەشدا گەلێ لایەنی تایبەتی هانی مەردووم دەدەن، کە لێوارە کولێرەو گوێچکە نانو ناوە سەموون کۆبکەنەوەو سوودی لێ وەربگرنو هەتا ئەو پەڕی تەوانا لەنانو چێشتا زیادە ڕەویو دەست بڵاوی نەکەن. بەڵام داخەکەم نەزانینی خۆمانو کەرسەگیو شەیطەنەتی دوژمنەکانمان گەلێ ڕەوشتو دەستوورو نەریتی جوانی ئیسلامیان لەبەرچاوی خەڵکە ساویلکەکە لەکەدارو ناشیرین کردووە، بەڵام خوا یار بێ کاروانی رۆشنبیری ئایینی، بە جڵەو کێشیی رۆشنئاییینانی داناو، بەیارمەتی خوای گەورە، لەبەر رووناکی فەرمایشتەکانی خوداو فەرموودەکانی حەزرەت، رۆژ بەرۆژ دەم بەدەم بەرەو پێش دەروا، تا لەهەلو مەرجێکی خودایی دا دەگاتە جێو دەوڵەتی قورئان سەر هەڵدەداو شەومزەنگی کوفرو بێ دینی وەك کاژە هەوری هاوین دەڕەوێتەوە. پەنا بەخودا. (وەرگێڕ).

١٠/ ١٦٥- [١٠]- عن ابن عباس، رضيَ اللّٰه عنهما، قال: قَامَ فينَا رسولُ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم بمَوْعِظَةٍ فقال: (أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ محشورونَ إِلَى اللّٰه تَعَالَى حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً { كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْداً عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ } ﴿ الأنبياء: ١٠٣﴾ أَلا وَإِنَّ أَوَّلَ الْخَلائِقِ يُكْسى يَوْمَ الْقِيَامَةِ إبراهيم صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، أَلا وإِنَّهُ سَيُجَاء بِرِجَالٍ مِنْ أُمَّتِي، فَيُؤْخَذُ بِهِمْ ذَاتَ الشِّمال فَأَقُولُ: يارَبِّ أَصْحَابِي، فَيُقَالُ: إِنَّكَ لا تَدْرِي مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ، فَأَقُول كَما قَالَ الْعَبْدُ الصَّالِحُ: { وكُنْتُ عَلَيْهِمْ شَهيداً ما دُمْتُ فِيهِمْ } إِلَى قولِهِ: { العَزِيز الحَكِيمُ } ﴿ المائدة: ١١٧، ١١٨ ﴾ فَيُقَالُ لِي: إِنَّهُمْ لَمْ يَزَالُوا مرتَدِّينَ عَلَى أَعقَابِهِمْ مُنذُ فارَقْتَهُمْ) متفقٌ عليه.

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) دەفەرموێ: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) هەڵسایەوە ئامۆژگارییەکی شیرینی کردین، فەرمووی: ئەی کۆمەڵەی ئادەمیزاد! بێ گومان کە

---

١٠ بوخاری (٣٣٤٩)، موسلیم (٢٥٨٩)، (٥٨).

ئێوه به پێ خاوسی‌و به رووت‌و قووتی‌و بەخەتەنە کراوی وەك یەکەم جار پێتان نایە ناو دنیاوە ئاوا لەسەر ئەم حاڵە لای خودا کۆدەکرێنەوەو حەشر دەکرێن، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە راستی ئەم کارە دەردەخاو دەبێ بە بەڵگە بۆی کە دەفەرموێ: ﴿كما بدأنا أول خلق نعيده وعدا علينا إنا كنا فاعلين﴾الانبياء /١٠٤. واتە: لەسەرەتاوە ئەو بوونەوەرانەمان لە نەبوون چۆن چۆنی دروست کردبوو، دیسانەوە ئاوا لەسەر ئەو حاڵە، لەپاش نەمانی، سەر لەنوێ دروستی دەکەینەوە، ئەمە گفتەو داومەو بووە بە بەڵێن لەسەرم‌و دەیبەمە سەر.

ئینجا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بزانن! رۆژی قیامەت یەکەم کەس کە پۆشتە دەکرێتەوەو بەرگی لەبەر دەکرێتەوە ئیبراهیمە (سەلامی خوای لەسەر بێ) هۆشیار بن! چەند پیاوی لە ئوممەتی من دێن‌و بەرەو لای چەپ بە کێشیان دەکەن بۆ ناو ئاگری دۆەخ، منیش دەڵێم: ئەی پەروەردگارم! خۆ ئەمانە لای خۆیان هاوڕێی من بوون دەی ئەوە بۆ کوێیان دەبەن؟ دەفەرموێ: تۆ ئاگات لێ نییە، کەئەمانە لەپاش مردنی تۆ چی فەرتەنەیەکیان بەرپاکردبوو، ئەوجا منیش وەك بەندەی باش، عیسای کوڕی مەریەم، دەڵێم: ﴿وكنت عليهم شهيدا مادمت فيهم، فلما توفيتني كنت أنت الرقيب عليهم، وأنت على كل شئ شهيد، إن تعذبهم فإنهم عبادك، وإن تغفر لهم فإنك أنت العزيز الحكيم﴾المائدة/١١٨. واتە: هەتا من لە ناویاندا بووم ئاگاداریم دەکردن‌و نەم دەهێشت شتی وا بکەن، جا کاتێ تۆ منت بردەوە بۆ لای خۆت ئیتر تۆ خۆت چاودێریان بووی بە سەریانەوە، هەروەکو تۆ چاودێری بەسەر هەموو شتێکی ترەوە، بەندەی دەسنێژی خۆتن، خۆت دەزانی شانیان چی هەڵ دەگرێ، ئەگەر سزاو ئازاریان دەدەی ئەوا دیارە سزاواری ئەوەن‌و موڵك موڵکی خۆتە کەس هەقی قسەو رەخنەی نییە، ئەگەر بە میهرەبانی خۆشت لێیان خۆش دەبی ئەوا لە گەورەیی خۆتە، بەڕاستی تۆ تەواناو لێزان‌و داناو کار دروستی، کاری نابەجێ‌و هەڵە لەتۆوە دوورە.

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جا خودا دەفەرموێ پێم: ئەمانە لەپاش مردنی تۆ دەستبەجێ پاشگەز بوونەتەوەو لە ئیسلامەتی هەڵگەڕاونەتەوە! (ش/تاج).

١٦٦/١١-^١١- عَنْ أَبِي سعيدِ عبدِ اللّٰهِ بن مُغَفَّل، رضي اللّٰه عنه، قال: نَهَى رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، عَن الخَذْفِ وقالَ: (إِنَّهُ لا يقْتُلُ الصَّيْدَ، ولا يَنْكَأُ الْعَدُوَّ، وَإِنَّهُ يَفْقَأُ الْعَيْنَ، ويَكْسِرُ السِّنَّ) متفقٌ عليه.

ئەبو سەعید: عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی پەلە پیتکە هاویشتنی نەدەدا، دەیفەرموو: ئەمە نەنێچیری پێ دەکوژرێو نە دوژمنی پێ کوڵەوار دەکرێ، وەلێ ڕێ دەکەوێ دەدا لە چاوی بێ تاوانێ کوێری دەکا، یا دەدا لە ددانی دۆستێو بە ناهەق دەیشکێنێ (دیارە شتێکیش کەهەر زیانی رووت بێ زۆر ناپەسەندە)(ش).

وفي رواية: أَنَّ قريباً لابْنِ مُغَفَّلٍ خَذَفَ، فَنَهَاهُ وقال: إنَّ رسولَ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم نَهَى عن الخَذْفِ وقَالَ: (إِنَّهَا لا تَصِيدُ صَيْداً) ثُمَّ عادَ فقالَ: أُحَدِّثُكَ أن رسولَ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، نَهَى عَنْهُ، ثُمَّ عُدْتَ تَخْذِفُ، ؟ لا أُكَلِّمُكَ أبداً.

لە گێڕانەوەیەکا: خزمێکی ئیبنو موغەففەل پەلەپیتکەی دەهاویشت، ئەویش قەدەغەی لێ کردو فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی پەلە پیتکە هاویشتنی نەدەدا، دەیفەرموو: شتی وا راوی پێ ناکرێ، بەڵام خزمەکەی دووبارە تێ هەڵچووەوەو دەستی کردەوە بە پەلەپیتکە وەشاندن، عەبدوڵڵایش توورەبوو گوتی: من پێت دەڵێم کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی شتی وا نادا، کەچی دووبارە پەلەپیتکە فڕێ دەدەی، کەوابوو ببڕای ببڕ قسەت لەگەڵ ناکەم.

١٦٧/١٢-^١٢- وعنْ عابسِ بن ربيعةَ قال: رَأَيْتُ عُمَرَ بنَ الخطاب، رضي اللّٰه عنه، يُقَبِّلُ الْحَجَرَ يَعْنِي الأَسْوَدَ ويَقُولُ: إني أَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ مَا تَنْفَعُ ولا تَضُرُّ، ولَوْلا أَنِّي رأَيْتُ رسولَ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، يُقَبِّلُكَ ما قَبَّلْتُكَ. متفقٌ عليه.

عابیسی کوڕی ڕەبیعە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بە چاوی خۆم عومەری کوڕی خەتتابم چاوپێکەوت حەجەرولئەسوەدی ماچ دەکردو دەیفەرموو: من دەزانم کە تۆ بەردێکیت، نە زیانت هەیەو نەسوود، بەڵام ئەوەندە هەیە من خۆم پێغەمبەرم دیوە کە تۆی ماچ دەکرد، بۆیە منیش ماچت دەکەم، تەنیا بۆ پەیرەوی ئەو زاتە ئەگینا ماچم نەدەکردیت (ش).

---

١١ بوخاری (٦٢٢٠). موسلیم (١٩٥٤).

١٢ بوخاری (١٦١٠)، موسلیم(١٢٧٠)(٢٥٠).

بــرای ســوننەکار! ببیکــە بــە خێــرت
بــێ بــەشمان مەکــە لــە خێــرو بیێــرت
جــار جــار بــەدووعا، یــا بــە فاتیحــا
لــەگۆڕا گــوڵم بــدە بــە ڕۆحــا!!
بەتــەمای لــوتفی ئێــوەی خوێنــەران
تــەواو تەمــەڵ بــووم لــە تاعــەتی جوان!
دەی ئێــوەش توخــوا، وەک مــن بەتــەمام
وەکــوو فریشــتە بگەنــە فریــام!!
یــاران! مــن ئێــوەم بــەیاد کــردووە
بــەزەینم پشــتێن مــەردم گرتــوە!
دەیــنم بــە ملتــان، نەمکەنــە کــوردەی
لە دوو جەژنە بووی، کــردە بــا بــردەی،
بفــەرموون: نــوری گــەچی بــێ نــوور بــوو
بۆخــۆی، بــۆ ئێمــە چــرایێ دوور بــوو
لەبــەر خــاتری فــەرمووەی ســەروەر
گــۆڕی گــوڵێ بــێ لــەباخی کــەوسەر!!

## ١٧- باسی پێویستی ملکەچی بۆ بڕیارو حوکمی خودا وە ئەو کەسەی داوای ئەوەی لێ بکرێ چی بڵێ، یا ئەو کەسەی فەرمانی پێ بکرێ بە چاکە یا ڕێگەی خراپەی نەدرێ چی بکا (باب في وجوب الانقياد لحكم الله تعالى وما يقوله من دعي الى ذلك وأمر بالمعروف، أو نهي عن منكر)

قال الله تعالى: ﴿فلا وربك لا يؤمنون حتى يحكموك فيما شجر بينهم ثم لا يجدوا في انفسهم حرجا مما قضيت و يسلموا تسليما﴾النساء/٦٥. (بڕوانە ئایەتی پێنجەمی زنجیرەی/١٦)

قال الله تعالى: ﴿إنما كان قول المؤمنين إذا دعوا الى الله ورسوله ليحكم بينهكم أن يقولوا سمعنا وأطعنا وأولئك هم المفلحون﴾النور/٥١.

واتە: هەرکاتێ موسوڵمانێ بەراستی داوای لێ بکرێ کە گوێ شل بکا بۆ حوکمی خودا، کە پێغەمبەری خودا پێیان رادەگەیەنێ، زۆر بەجوانیو بەو پەڕی

ملكەچییەوە دەڵێن: قسەی خواو پێغەمبەر لەسەر سەرمان، بەجوانی گوێی لێ دەگرین‌و بەتەواوی جێ بەجێی دەکەین، بەراستی ئەمانە لەم کاتەدا سەرکەوتوو خۆیانن.

وفيه الأحاديث: حديث أبي هريرة المذكور في أول الباب قبله وغيره من الأحاديث فيه:

ئیمامی نەوەوی (پڕ گۆڕی پیرۆزی لە نووری خودا بێ) دەفەرموێ: فەرموودەکانی باسەکەی پێش ئەم باسە زۆریان بۆ ئەم باسەیش دەست دەدەن، بەتایبەتی یەکەم فەرموودەی کە لەئەبوو هورەیرەوە بوو.

١٦٨/١-[١]- عن أَبِي هريرة رضي اللّٰه عنه، قال: لَمَّا نَزَلَتْ عَلَى رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: { للّٰهِ ما في السَّموات وَمَا فِي الأرض وإن تبدوا مافِي أَنْفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحاسبْكُمْ بِهِ اللّٰه} الآية ﴿البقرة ٢٨٣﴾ اشْتَدَّ ذلكَ عَلَى أَصْحابِ رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، فأَتوْا رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، ثُمَّ برَكُوا عَلَى الرُّكَب فقالُوا: أَيْ رسولَ اللّٰه كُلِّفنَا مِنَ الأعمالِ مَا نُطِيقُ: الصَّلاَةَ وَالْجِهادَ وَالصِّيام وَالصَّدقة، وَقَدْ أُنْزِلَتْ عليْكَ هَذِهِ الآيَةُ وَلا نُطِيقُهَا. قَالَ رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «أَتُرِيدُونَ أَنْ تَقُولُوا كَمَا قَالَ أَهْلُ الْكِتابَينِ مِنْ قَبْلكُمْ: سَمِعْنَا وَعصينَا ؟ بَلْ قُولوا: سمِعْنا وَأَطَعْنَا غُفْرانَك رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمصيرُ» فَلَمَّا اقْتَرَأَهَا الْقَومُ، وَذَلقَتْ بِهَا أَلْسِنتهُمْ، أَنْزلَ اللّٰه تعَالَى في إِثْرِهَا: { آمنَ الرَّسُولُ بِما أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤمِنونَ كُلٌّ آمنَ بِاللّٰه وَملائِكَتِهِ وكُتُبِه وَرُسُلهِ لا نُفرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلهِ وَقالوا سمِعْنَا وَأَطعْنا غُفْرَانكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصيرُ } فَلَمَّا فعلُوا ذلك نَسخَهَا اللّٰه تعَالَى، فَأَنْزلَ اللّٰه عَزَّ وَجلَّ: { لا يُكلِّفُ اللّٰه نَفْساً إلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبتْ، رَبَّنَا لا تُؤاخِذْنَا إنْ نَسِينَا أَو أَخْطَأْنَا } قَالَ: نَعَمْ { رَبَّنَا وَلا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْراً كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا } قَالَ: نعَمْ { رَبَّنَا ولا تُحَمِّلْنَا مَالا طَاقَةَ لَنَا بِهِ } قَالَ: نَعَمْ { واعْفُ عَنَّا واغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْت مَوْلانَا فانْصُرنَا عَلَى الْقَومِ الْكَافِرِينَ } قَالَ: نعَمْ. رواه مسلم.

ئەبو هورەیرە فەرمووی: کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ﴿لله ما في السموات وما في الأرض فيغفر لمن يشاء ويعذب من يشاء والله على كل شئ قدير﴾البقرة/٢٨٤. واتە: هەرچی وا لەئاسمانەکان‌و زەویدا، هەموی هی

---

١ موسلیم (١٢٥).

خودایـەو موڵـكو دروسـتكراوی خۆیـەتی، وەهەرچـی وا لـەناو دڵو دەرونتانـا، چ ئاشـكرای بكـەنو چ بیشـارنەوە خـودا لـە ڕۆژی قیامەتـدا موحاسـەبەی ئـەوەتان لەگەڵدا دەكا، ئەوسا بەئارەزووی خۆیەتی هەركەسێ خواستی لەسەر بێ چاوپۆشی لێ دەكا، وەهەركەسێ خواستی لەسەر بێ ئازارو سزای دەدا. ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خودی لەسەر بێ) فـەرمووی: كـە ئەمـە هاتـە خـوارەوە، یـارانی پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەر بێ) تـەواو سەخڵەت بوون، جا چوون بـۆ خزمـەتیو هـاتن بـە چۆكداو عـەرزیان كـرد: هـەی ڕەوانـەكراوی خـودا! خـۆت دەزانـی خـودای گـەورە ئـەم ئەركانـەی تـا ئێسـتا داوە بەسەرمانا وەك نوێژو ڕۆژوو و خـەباتو زەكات، لەبەرئـەوەی تـەوانای ئەمانـەمان هەیەو لەكێشمانان هیچمان نـەگوتووەو كركـەمان نـەكردووە، بـەڵام ئـەوەتانێ ئـەم ئایەتەت بۆ هاتووە، تەوانای ئەمەمان نییە!

حــەزرەت (درودی خـوای لەسـەر بـێ) فــەرمووی: ئایــا ئێــوەیش دەتانــەوێ- وەك دوو میللەتەكەی پێش خۆتان، كە میللەتی تـەوراتو میللـەتی ئینجیلن، ئایـا دەتانـەوێ كەوەك ئـەو دوو میللەتـە- بڵێن: ﴿سمعنـا وعصينـا﴾البقرة/٩٢: خودایـە زۆر بـاش گوێمـان لـە فەرمایشـتو فەرمانەكەتـە، بـەڵام بـەگوێت ناكـەین! ئایـا دەتانـەوێ كـە ئێوەیش ئاوا بڵێن، نەكەن شتی وا بكەن، بەڵكوو بە ملكەچی بڵێن: ﴿سمعنا وأطعنا غفرانك ربنا واليك المصير﴾: جاكاتێ كە یاران ملیان كەچ كرد بۆ فـەرمانی خـوداو ئەم ئایەتەیان بە زمانی پاراو خوێندوو هیچ لە دڵیانا نەما، ئەوساكە خـودا گـورج بەشوێن ئەو ئایەتەدا ئـەم ئایەتـەی تـری نـاردە خـوارەوە: ﴿آمـن الرسـول...﴾هـەتا ﴿واليك المصير﴾البقرة/٢٨٥. واتە: ئیمانو باوەڕی هەیـە پێغەمبـەری خۆشەویسـت، بـەو كتێبـە كـە پـەروەردگاری ناردوویـەتی بـۆی لەلایـەنی خۆیـەوە، هـەروەها موسوڵمانەكانیش باوەڕو ئیمانیان پێی هەیە، هەموویان یەك بە یـەكیان باوەڕیـان هێنـاوە بەئەصـڵو بناغـەكانی ئیمـان: بـەخوداو بـە فریشـتەكانیو بەنامـەو كتێبـەكانیو بـە پێغەمبـەرەكانی، كـە خـۆی نـاردوونی بـۆ تـەمێو ئامۆژگـاری هۆشیاران، وە هەموو بە باوەڕی تەواوەوە، دەڵێن: ئەی خودای پـەروەردگاری ئێمـە! بەدڵ گوێمان لە فەرمایشتەكانتە هەرچی فەرمانی تۆیە لەسەر سەرو لەسەر چاوە، هەمیشە گەردن كەچین بۆ فەرمانی تۆ، داوای چاو پۆشیت لێ دەكەین، ئەگەر داوای تـاوان پۆشی لـەتۆ نەكـەین ئـەی لـە كـێ بكـەین! خودایـە! لەپاشـە ڕۆژدا لـەڕۆژی

ژینەوەدا دێینەوە بەر دەستی خۆت، سەرەنجام بەندە بەکۆڵێ تاوانەوە خۆی فڕێ دەداتە ئاستانەی خودای خۆی، ئیتر تۆیش کەیفی خۆتە، جا کە ئەمەیان کرد خودا حوکمی ئەو ئایەتەی نەسخ کردەوە، کە دەلالەت لەسەر موحاسەبەی شتی ناو دڵ دەکا، بەم ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿لا يكلف الله﴾هەتا﴿القوم الكافرين﴾البقرة/٢٨٦. واتە: خودا ئەرکێکی وا نادا بەسەر شانی کەسێکا، کە لەبارەیا نەبێ، وە داوایێ لەکەسێ ناکا کەلە تاقەتو تەوانایا نەبێ، هەرکەسێ چاکە بکا چاکەکەی بۆ خۆیەتی، وە هەرکەسێ خراپە بکا، خراپەکەی بۆ خۆیەتی، هەرچی بکەی ئەوە دێتەوە ڕێت.

وە موسوڵمانەکان لەسەر پاڕانەوەی خۆیان ڕۆیشتن و سەرەڕای پاڕانەوەکەی پێشەوەیان گوتیشیان: ئەی خودایە! ئەگەر هەنێ لەئەرکی سەرشانی خۆمان لەبیرچوو یا بەهەڵە کردمان تۆ لێمان مەگرەو لەسەر ئەوە سزاو ئازارمان مەدە، ئەی پەروەردگاری ئێمە! باری قورس مەهاوێژە سەر شانمان، وەکوو باری خۆکوشتن بۆ گیرابوونی پەشیمانی، وەکوو بڕینی هەر پارچەیێ لە کاڵامان کە پیس بووبێ، وەك ئەم بارە قورسەت دابوو بەسەر شانی گەلی جوولەکەدا، کە لەپێش ئێمەوە بوون، ئەی پەروەردگاری ئێمە مەدە بەسەر ئێمەدا دەردو بەڵاو ئاژاوەو ئاشووبێکی وا کە لەکێشمانا نەبێ، وە شوێنەواری تاوان و گوناهەکانمان کوێر کەرەوەو ئازارمان مەدە، وە عەیب و نەنگمان بپۆشەو کردەوەی باشمان دەربخە، وە بە لوتف و کەرەمی خۆت ڕەحممان پێ بکەو نازو بەهرەو ڕەحمەت بڕێژە بەسەرمانا، هەرتۆی سەرداری ئێمەو جگە لەتۆ پشت و پەنای ترمان نییە، وەزیاد لەمانەیش یارمەتیمان بدە بۆ خەبات و تێکۆشان و زاڵمان بکە بەسەر کۆمەڵەی کافرو بێ باوەڕەکاندا.

موسوڵمانەکان کاتێ ئەم دووعایەیان دەکرد خودای گەورەو مەزن لەپاش هەموو وشەیێ لە دووعاکانیان دەیفەرموو: بەڵێ باشە ئەم دووعایەتان قەبووڵ دەکەم(م).

## ١٨-باسی جڵەوگیری لەکاری ناشایستەی تازەقەڵا
## باب في النهي عن البدع ومحدثات الأمور

قال الله تعالى: ﴿فماذا بعد الحق إلا الضلال﴾يونس/٣٢. واتە: ئەوەی ئەم شتانە دەکا خودای بەهەقی ڕاست و دروستی ئێوەیە، دەی ئەوەی بڕیاری خودایەکی تر

بدا، جگه لەم زاتە پاكو بێگەردە دیارە ئەوە گومڕایە، چونكە خودای راست یەكە، زیاد لەو هیچو پووچە.

وقال تعالى: ﴿ما فرطنا في الكتاب من شئ﴾الأنعام/٣٨. واتە: هیچمان نەهێشتۆتەوە كەلە لەوحولمەحفوظا نەمان نووسیبێ.

وقال تعالى: ﴿فإن تنازعتم في شئ فردوه إلى الله والرسول﴾أي الكتاب والسنة. لەپێشەوە رابوورد.

وقال تعالى: ﴿وأن هذا صراطي مستقيما فاتبعوه ولا تتبعوا السبل فتفرق بكم عن سبيله﴾الأنعام/١٥٣. واتە: ئەمە رێگەی راستی منە، ملی ئەم راستە رێگەیە بگرن، دوای كوێرە رێكانی تر مەكەون، دەنا رێگەی راستی خوداتان لێ تێك دەدەنو سەركوێرتان دەكەن!.

وقال تعالى: ﴿قل إن كنتم تحبون الله فاتبعوني يحببكم الله﴾ بڕوانە ئایەتی سێیەم لەزنجیرەی (١٦).

والآيات في الباب كثيرة معلومة. وأما الأحاديث فكثيرة جدا وهي مشهورة فنتقصر على طرف منها:

ئایەتی لەم بابەتە بۆ ئەم باسە زۆرو دیارییە، هەروا فەرموودەیش گەلێ زۆرەو هەمووش بەناوبانگن، بەكورتی چەند فەرموودەیەك باس دەكەین وەك:

١٦٩/١ –[١]– عن عائشةَ، رضي اللّه عنها، قالت قال رسولُ اللّه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسلَّم: (منْ أَحْدثَ في أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فهُو رَدٌّ) متفقٌ عليه.

وفي رواية لمسلمٍ: (مَنْ عَمِلَ عملاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُو ردٌّ).

عائیشە (رەزای خودای لەسەر بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەركەسێ شتێكی ناشایستە لەم دینەی ئێمە زیاد بكا، كە پەیوەندی پێوە نەبێ، ئەو شتە قەبووڵ نییەو دەدرێتە دواوە(ش). لە گێڕانەوەیەكی موسلیمدا (رەزای خودای لەسەر بێ): هەركەسێ كارێ بكا كە فەرمانو رەزای ئێمەی لەسەر نەبێ ئەو كارە قەبووڵ نییەو دەدرێتە دواوە.

---

١ بوخاری (٢٦٩٧)، موسلیم (١٧١٨)(١٨).

٢/١٧٠-[٢]- وعن جابر، رضي الله عنه، قال: كـان رسـولُ اللّـه صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم، إذَا خَطَب احْمرَّتْ عيْنَاهُ، وعَلا صوتُهُ، وَاشْتَدَّ غَضَـبُهُ، حتّـى كَأَنَّـهُ مُنْـذِرُ جَـيْشٍ يَقُولُ: «صَبَّحَكُمْ ومَسَّاكُمْ» وَيقُولُ: (بُعِثْتُ أَنَا والسَّـاعةُ كَهَـاتيْن) وَيَقْـرنُ بـين أُصْـبُعَيْهِ، السبَابَةِ، وَالْوُسْطَى، وَيَقُولُ: (أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ خَيرَ الْحَديثَ كِتَابُ اللّه، وخَيْرَ الْهَدْى هـدْيُ مُحمّدٍ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم، وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُها وكُلّ بِدْعَةٍ ضَـلالَةٌ) ثُـمَّ يقُـولُ: (أَنَـا أَوْلَى بُكُلِّ مُؤْمِن مِنْ نَفْسِهِ. مَنْ تَرَك مَالا فَلأَهْلِهِ، وَمَنْ تَرَكَ دَيْناً أَوْ ضَيَاعاً، فَـإِلَيَّ وعَلَـيَّ) رواه مسلم.

**جابیر** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **کاتێ وتـاری دەدا چـاوی سـوور هەڵدەگـەڕا دەنگـی بـەرز دەکـردەوە، تـەواو تـووڕە دەبـوو، بەشـێوەیەکی وا دەتگوت ترسێنەر (مونذیر)ی سوپایەو سوپا دەترسێنێ لە دوشمن‌و دەڵێ: وا سوپای دوژمن سەر لەبەیانی یا سەر لەئێوارێ بەم زووانە دەدا بەسەرتانا، لەهەنـدێ وتـارا پەنجەی شایەتمان‌و پەنجەی بەرزە لوتەی خۆی جووت دەکردو دەیفـەرموو** (دروودی خوای لەسەر بێ)**: لـەپاش ئـەمـە بـزانن کـە باشـترین فەرمایشت نامـەی خودایـە، کـە قورئـانی پـیرۆزە، وە باشـترین ڕێبـازو ڕێگـەی چـاکە ڕێبازگـەی موحەممـەدە، وە خـراپترین کاروبارو فەرمانیش لەئاییندا ئەو کارو بارانەن کە نوێبـاوو تازەهـەڵلان، وەهـەموو کارێکی ناشایستەیش سەرگەردانی‌و گومڕاییە لەپاشا دەیفەرموو** (دروودی خوای لەسەر بێ) **مـن بۆ هەموو موسوڵمانێ لەخۆی لەپشترم بۆی! چونکە دەیخەمـە سـەر ڕێـی ڕزگـاریی ئێجگاریی، بەڵام ئەوەی بمرێ‌وماڵی لەپاش بەجێ بمێنێ ئەوە ماڵەکەی بۆ کـەس‌و کارەکەیەتی، وەڵێ ئەوەی قەرزار بێ، یـاخود خێزانێکـی بـێ داڵـدەی لـەپاش بـەجێ بمێنـێ، ئـەوە قەرزەکـەی ڕووبـەرووی مـن دەبێتـەوە، خـۆم دەیبژێرمـەوە بـۆی‌و سەرەوکاریی کەسوکارەکەشی لەسەر منە (م/تاج).**

## ١٩- باسی کەسێ کە ڕەوشتێکی شیرین یا ناشیرین دابهێنێ
## باب فيمن سن سنة حسنة أو سنة سيئة

**قال الله تعالى: ﴿والذين يقولـون ربنـا هـب لنـا مـن أزواجنـا وذرياتنـا قـرة أعـين وأجعلنا للمتقين إماما﴾الفرقان/٧٤. واتە: دەستـەیەکی تر لە (عباد الرحمن) بەنـدە**

---

٢ موسليم (٨٦٧).

هەڵبژاردەكانی خودای میهرەبان رەوشیان وایە دەڵێن: ئەی پەروەردگاری گەورەو مەزنی ئێمە! ژن‌و ماڵێكی وامان پێ ببەخشە كەببێتە بە مایەی فێنكی دڵ‌و رۆشنایی چاومان وە خۆشمان بكە بە پێشەواو سەرمەشقی جوان بۆ لەخوا ترسەكان.

وقال تعالى: ﴿وجعلناهم أئمة يهدون بأمرنا﴾الأنبياء/٧٣. واتە: ئیبراهیم‌و ئیسحاق‌و یەعقوبمان كرد بە پێشەواو رەهبەر، بەفەرمانی خۆمان رێگەی دینی راست نیشانی مەردووم دەدەن.

١٧١/١-[١]- عَنْ أَبي عَمرو جَرير بنِ عبدِ اللّٰه، رضي اللّٰه عنه، قال: كُنَّا في صَدْرِ النَّهارِ عِنْد رسولِ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم فَجاءهُ قوْمٌ عُـرَاةٌ مُجْتابي النِّمار أَو الْعَباءِ. مُتَقلّدي السُّيوفِ عامَّتُهمْ، بل كلهم مِنْ مُضرَ، فَتمعَّر وجهُ رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم، لِما رَأَى بِهِمْ مِنْ الْفَاقة، فدخلَ ثُمَّ خرج، فَأَمر بلالاً فَأَذَّن وأَقَامَ، فَصلّى ثُمَّ خَطبَ، فَقالَ: {يَا أَيُّهَا الناسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الذي خلقكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدةٍ } إِلَى آخِرِ الآيـة: { إِنَّ اللّٰه كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً}، وَالآيَةُ الأُخْرَى الَّتِي في آخر الْحشْرِ: { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمنُوا اتَّقُوا اللّٰه ولْتنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمتْ لِغَدٍ} تَصدَّق رَجُلٌ مِنْ دِينَارِهِ مِنْ دِرْهَمِهِ مِنْ ثَوْبِهِ مِـنْ صَـاعِ بُرِّه مِنْ صَاعِ تَمره حَتَّى قَالَ: وَلوْ بِشقِّ تَمْرةٍ فَجاءَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ بِصُرَّةٍ كَادتْ كَفُّهُ تَعجزُ عَنْهَا، بَلْ قَدْ عَجزتْ، ثُمَّ تَتابَعَ النَّاسُ حَتَّى رَأَيْتُ كَوْمَيْنِ مِنْ طَعَامٍ وَثِيابٍ، حتَّى رَأَيْتُ وجْهَ رسولِ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم، يَتهلّلُ كَأَنَّهُ مذْهَبَةٌ، فقال رسولُ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (مَنْ سَنَّ في الإِسْلام سُنةً حَسنةً فَلَهُ أَجْرُهَا، وأَجْرُ منْ عَملَ بِهَا مِنْ بَعْدِهِ مِنْ غَيْرِ أَنْ ينْقُصَ مِنْ أُجُورهِمْ شَيءٌ، ومَنْ سَنَّ في الإِسْلامِ سُنَّةً سيِّئةً كَانَ عَليه وِزْرها وَوِزرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ بعْده مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْءٌ) رواه مسلم.

جەریری كوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: سەرلەبەیانیەك لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) بووین. دەستەیێ پیاوی شرۆڵەی روت‌و قووت هاتن بۆلای، باڵاپۆشەكانی خۆیانیان لەبەر هەڵكێشابوو، یا فەرمووی: سەرو عابایان بەتەنیا لەبەردابوو، وەهەركەسەیان شمشێری خۆی لەملدا بوو، زوربەیان -بگرە هەموویان- لەبەرەی موضەر بوون!

---

١ موسلیم (١٠١٧).

کاتێ حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لەسەر ئەم حاڵەی کەساسییە دینی، دڵی پێیان سووتاو رووی کرژ بوو، یا درژبوو، ئەوجا چوو بۆ ماڵەوەو ئەوجا هاتەوەو فەرمانی بە بیلال کرد: بانگی داو قامەتی کرد. ئەوجا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) نوێژی کردو لەپاشا وتارێکی داو فەرمووی: ﴿يا ايها الناس أتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة﴾النساء/١. واتە: ئەی بەرەی ئادەمیزاد! لەخودای خۆتان بترسن، خودا ئەو خودایەیە کە ئێوەی هەموو لەیەك کەس دروست کردووە، کە ئادەمی باوکتانە، هەتا دوایی ئایەتەکە: ﴿إن الله كان عليكم رقيبا﴾ کە لەویش هاوسەرەکەی درووست کردووە کە حەووای دایکتانە، وە لەم دوو کەسە ئەو هەموو پیاوو ژنە زۆرەی خستۆتەوەو بەناو زەویدا بڵاوی کردوونەتەوە، کەواتە هەم لەخودای خۆتان بترسن کە دروستی کردوون و لەناو خۆتان بەخاتری خودا داوای شت لەیەکتری دەکەن، هەم لەتۆڵەی تاوانی پساندنی رشتەی خزمایەتی بترسن، چ نزیکی، چ دووری، هەمووتان لەئادەمن و ئادەمیش لەگڵە، دیارە کە خودا ئاگای لەهەموو جم‌وجووڵ و هەڵس‌و کەوتێکتانە، وەئەم ئایەتەی تریشی بەسەردا خوێندینەوە، کە لەدوایی سورەتی (حەشر)دایە کە دەفەرموێ: ﴿يا أيها الذين آمنوا أتقوا الله ولتنظر نفس ما قدمت لغد﴾الحشر/ ١٨. واتە:

**موسوڵمانینە لە خوا بترسن**
**دەرمانی دەردی خۆتان بپرسن!**
**توێشەی باش بخەن لەبۆ سبەینێ**
**سبەینێ نەڵێن: خۆزگە بە دوێنێ**

لەپاش ئەوە حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: پیاو لە دیناری، لە دەرمی، لەجل‌و بەرگی، لەمەنە گەنمێ، لە مەنە خورمایێ با خێری لێ بکا، چەندەی لەدەست دێ لەکەم کەم‌و لە زۆر زۆر با خێر بکا، تەنانەت فەرمووی: با لەتی خورمایەکیش بێ خێر هەر خێرە.

جا پیاوێکی ئەنصاری پریاسکەیە خێری هێنا، پڕی بوو لەپارە، بە حاڵە حاڵ دەستی هەڵی دەگرت، ئیتر مەردوومەکە یەك لە شوێن یەکەوە شتیان دەهێنا، تا بەچاوی خۆم دوو کۆمەڵی گەورەم بینی، یەکێ خواردەمەنی‌و یەکێ پۆشاك‌و جل‌و بەرگ. تەماشام کرد روخساری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وەك مانگ‌و پارچەی

زرِكفت كراوه گەشايەوەو ورشە ورشى بوو، ئەوجا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ -لەئیسلاما- رەوشتو یاسایەکی جوان بەکاربهێنێ وەخەڵك چاوی لێ بکەن و رەفتاری پێ بکەن چ لەژیانا چ لە پاش مردنی، ئەوە لەپاداشی ئەوەدا بەقەد پاداشی ئەوکەسانە کە بەو یاسایە کار دەکەن خێرو پاداشیش بۆ ئەو کەسە دەنوسرێ، بەبێ ئەوە کە هیچ لە خێری ئەوان کەم بکاتەوە، وەهەرکەسێ-لە ئیسلاما- یاسایەکی ناشیرین دابهێنێو خەڵك چاوی لێ بکەنو رەفتاری پێ بکەن، چ لەژیانا چ لەپاش خۆی ئەوە بەقەد گوناهی ئەوانەی کاری پێ دەکەن گوناهیش بۆ ئەو کەسە دەنووسرێ، بەبێ ئەوە کە هیچ لەگوناهی ئەوان کەم بکاتەوە (م).

١٧٢/٢-[٢]- وعن ابنِ مسعودٍ رضي اللّٰه عنه أَنَّ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (ليس مِنْ نفْسٍ تُقْتَلُ ظُلماً إلاَّ كَانَ عَلَى ابنِ آدمَ الأوَّلِ كِفْلٌ مِنْ دمِهَا لأَنَّهُ كَان أَوَّل مَنْ سَنَّ الْقَتْلَ) متفقٌ عليه.

ئيبنو مەسعوود (رەزای خودای لەسەر بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ بەناڕەوا بکوژرێ، بەشێ لە ئۆباڵی خوێن رشتنەکەی بەئەستۆی کوڕە پێشووەکەی ئادەمە. واتە: بەملی قابیلە، چونکە ئەو یەکەم کەس بوو کە پیاوکوشتنی داهێنا، وەك خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە سوورەتی مائیدەدا لەئایەتی سێهەمدا دەفەرموێ: ﴿فطوعت له فسه قتل أخيه فقتله فأصبح من الخاسرين﴾ جا نەفسی قابیل کوشتنی هابیلی برای لەبەرچاوی جوانکردو کوشتی، ئیتر بەم کردەوە ناپەسەندە قابیل بوو بە پیاوێکی پیاوکوژی زیانبار لەهەردوو جیاهاندا (ش/تاج).

## ٢٠- باسی رێگەی خێر نیشاندان بەخەڵك، یا رێگەی شەڕ پیشاندان بەخەڵك
## باب في الدلالة على الخير والدعاء الى الهدى أو الضلالة

قال تعالى: ﴿وأدع الى ربك﴾القصص/٨٧. وقال تعالى: ﴿أدع الى سبيل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة﴾النحل/١٠٤. وقال تعالى: ﴿وتعاونوا على البر والتقوى﴾المائدة/٢.

---

٢ بوخاری (٧٣٢١)، موسلیم (١٦٧٧).

مەبەست لەئايەتە پيرۆزەكان ئەمەيە: لەسەر شێوەيەكی جوان، مەردووم بانگ بكەن بۆسەر ئايينو طاعەتو خودا پەرستی، بەزمانی شيرين، بە ئامۆژگاری جوان، جارێ بەخوێندنەوەی فەرمووده، جارێ بەئايەتی قورئان، بۆ كاری خێر پشتی يەكتر بگرنو لەسەر كردنی چاكەو فەرمانبەری خودا هەرەومزو دەستياو بكەن، با دەستەيێ لەئێوە خۆيان تەرخان بكەن بۆ خەڵك بانگ كردن بۆلای خێرو چاكەو رێگەی باشە، ئەمانەش ديارە دەبێ دەستەيەكی زاناو دانابن، نەوەك نەفامو نەدان.

١٧٣/١-[١]- وعن أَبِي مسعودٍ عُقبَةَ بْن عمْرو الأَنْصَارِيِّ رضي اللّٰه عنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (مَنْ دَلَّ عَلَى خَيْرٍ فَلَهُ مثلُ أَجْرِ فَاعِلِهِ) رواه مسلم.

ئەبو مەسعوودی بەدری (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پياوێ هاتە لای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) داوای ولاخی سواری كرد بۆ خۆی، گوتی: پەكم كەوتووە لەبەر بێ ولاخی، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بچۆ بۆلای فيسارە كەس، ئەويش چوو بۆلای، كابرا ولاخێكی سواری دايە، پێغەمبەريش (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەركەسێ خێرێ نيشانی كەسێ بدا خۆشی بەقەد خێركەرەكە خێری دەگا (م/تاج).

١٧٤/٢-[٢]- وعن أَبِي هريرة رضي اللّٰه عنه أَن رسولَ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: «منْ دَعَا إِلَى هُدًى كَانَ لَهُ مِنَ الأَجْرِ مِثْلُ أُجُور منْ تَبِعَهُ لا ينْقُصُ ذلِكَ مِنْ أُجُورِهِم شَيْئاً، ومَنْ دَعَا إِلَى ضَلاَلَةٍ كَانَ عَلَيْهِ مِنَ الإِثْمِ مِثْلُ آثامِ مَنْ تَبِعَهُ لا ينقُصُ ذلكَ مِنْ آثَامِهِمْ شَيْئاً) رواه مسلم.

ئەبو هورەيرە (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەركەسێ رێگەی راست نيشانی خەڵك بدا خۆشی بەقەد ئەو كەسانە كە بەگوێی دەكەن خێری دەگا، بەبێ ئەوە كە هيچ لە خێری ئەوان كەم بكاتەوە، وەهەركەسێ رێگەی خراپ نيشانی خەڵك بدا خۆشی بەقەد ئەو كەسانە كە بەگوێی دەكەن گوناهی دەگا، بەبێ ئەوە كە هيچ لە گوناهی ئەوان كەم بكاتەوە (م).

١ موسليم (١٨٩٣).

٢ موسليم (٢٦٧٤).

١٧٥/٣–[٣]– وعن أَبي العباسِ سهل بنِ سعدٍ السَّاعِدِيِّ رضي اللّٰه عنه أَن رسولَ اللّٰه صَلّي اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال يَوْمَ خَيْبَرَ: (لأُعْطِيَنَّ الرَّايَةَ غَداً رَجُلاً يَفْتَحُ اللّٰه عَلَى يَدَيْهِ، يُحبُّ اللّٰه ورسُولَهُ، وَيُحبُّهُ اللّٰه وَرَسُولُهُ) فَبَاتَ النَّاسُ يَدُوكونَ لَيْلَتَهُمْ أَيُّهُمْ يُعْطَاهَا. فَلَمَّا أصبحَ النَّاسُ غَدَوْا عَلَى رسولِ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم: كُلُّهُمْ يَرجُو أَنْ يُعْطَاهَا، فقال: (أَيْنَ عليُّ بنُ أَبي طالب ؟) فَقِيلَ: يا رسولَ اللّٰه هُو يَشْتَكي عَيْنَيْه قال: (فَأَرْسِلُوا إِلَيْهِ) فَأُتِي بِهِ، فَبَصقَ رسولُ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم في عيْنيْهِ، وَدعا لَهُ، فَبرأَ حتَّى كَأَنْ لَمْ يَكُنْ بِهِ وَجعٌ، فأَعْطَاهُ الرَّايَةَ. فقال عليٌّ رضي اللّٰه عنه: يا رسول اللّٰه أُقاتِلُهمْ حَتَّى يَكُونُوا مِثْلَنَا ؟ فَقَالَ: (انْفُذْ عَلَى رِسلِكَ حَتَّي تَنْزِلَ بِسَاحتِهِمْ، ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى الإِسْلامِ، وَأَخْبرْهُمْ بِمَا يجِبُ مِنْ حقِّ اللّٰه تَعَالَى فِيهِ، فَواللّٰه لأَنْ يَهْدِيَ اللّٰه بِكَ رَجُلاً وَاحِداً خَيْرٌ لَكَ مِنْ حُمْرِ النَّعَمَ» متفقٌ عليه.

سەهلی كوڕی سەعدی ئەلساعیدی (ڕەزای خوداى لەسەر بێ) فەرمووی: ڕۆژی خەیبەر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: سبەینێ ئەم ئاڵایە دەدەمە دەست پیاوێ، لەسەر دەستی ئەوا خەیبەر دەدا بەدەستەوە، ئەو پیاوە خوداو پێغەمبەری خودای خۆش دەوێ، خوداو پێغەمبەریش ئەویان خۆش دەوێ. ئەو شەوە مەردوومەكە هەر مقۆمقۆی ئەوەیان بوو دەبێ ئاڵاكە بدا بەكێ، دەبێ كامیان ئەو بەختەوەرە بێ؟ بۆ بەیانی چوون بۆلای حەزرەت هەركەسەیان لەدڵی خۆیا بەهیوای ئەوە بوو كە بدرێ بەو، بەڵام بەیانی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوە عەلی كوڕی ئەبو طالیب كوا؟ گوتیان: قوربان چاوی ئێشێ. فەرمووی: بنێرن بەشوێنیا، چوون هێنایان، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) تفی ڕۆكردە ناو هەردوو چاوەكانیەوەو دووعای بۆ كرد، ئیتر دەست بەجێ هەردوو چاوی تەواو چاك بۆوە، وەك لەوەو پێش نەئێشابێ ئاوا، ئەوجا ئاڵاكەی دایێ، عەلی (ڕەزای خوداى لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێ)! ئایا كە دەستم كرد بەشەڕ لەگەڵیانا وازیان لێ نەهێنم هەتا وەك خۆمان موسوڵمان دەبن؟ فەرمووی: بە هێواشی لەسەرە خۆت بڕۆرە پێشەوە هەتا دەگەیتە لایماڵەكانیان و بۆیان دەچیتە مەیدان، جا لەوێ داوایان لێ بكە كە ئیسلام بن و پێیان بڵێ لەحاڵی ئیسلام بوونا خودا ئەو ماف و حەقانەی داناوە

---

٣ بوخاری (٣٧٠١)، موسلیم (٢٤٠٦).

لەسەرتان، چونکە بەخودای گەورە ئەوە گەڵ باشترە بۆ تۆ کە خودا بەهۆی تۆوە تاقە پیاوێ بخاتە سەر ڕێگەی ڕاست، تا ئەوەی هەرچی ڕانە ئاژەڵی سوورکەلەو مەڕمزە هی تۆ بێ (ش).

١٧٦/٤-[٤] – وعن أَنس رضي اللّٰه عنه أَنْ فَتَى مِنْ أَسْلَمَ قال: يا رسُولَ اللّٰه إنِّي أُريد الْغَزْوَ ولَيْس مَعِي مَا أَتَجَهَّزُ بِهِ ؟ قَالَ: (ائْتِ فُلاناً فإنه قَدْ كانَ تَجَهَّزَ فَمَرِضَ) فَأَتَاهُ فقال: إنَّ رسولَ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يُقرئُكَ السَّلامَ وَيَقُولُ: أَعْطِنِي الذي تَجَهَّزْتَ بِهِ، فقال: يا فُلانَةُ أَعْطِيهِ الذي تَجَهَّزْتُ بِهِ، ولا تَحْبِسِي مِنْهُ شَيْئاً، فَواللّٰه لا تَحْبِسِينَ مِنْهُ شَيْئاً فَيُبَارَكَ لَكِ فِيهِ. رواه مسلم.

ئەنەس (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لاوێکی ئەسلەمی گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! من دەمەوێ بچم بۆ غەزا، وەڵێ هیچ کەرەسەیەکم نیە کە خۆی پێ ڕێك بخەم، فەرمووی: بڕۆ بۆلای فیسارە پیاو، ئەو خۆی ئامادە کردبوو، تفاقی خستبوو، بەڵام نەخۆشکەوتووەو ناچێ.

لاوەکە چوو بۆلای‌و گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) سڵاوت لێ دەفەرموێ، وە دەفەرموێ: تفاقەکەی خۆت بدەی بەمن، پیاوەکەش بە ژنەکەی خۆی گوت: کچێ! ئەو تفاقەی کە بۆ خۆمم ئامادە کردبوو، گشتی بێنەو بیدە بەم، وەهیچی لێ گل مەدەرەوە، سا بەو خودایە هەرچی لەو تفاقە گل بدەیتەوە بۆ خۆمان خێری لێ نابینی! (م).

## ٢١-باسی هەرەوەزو هاوکاری لەسەر کاری چاکەو تەقوای خوا
## باب في التعاون الى البر والتقوى

قال الله تعالى: ﴿وتعاونوا على البر والتقوى﴾المائدة/٢.

وقال تعالى: ﴿والعصر إن الانسان لفي الخسر الا الذين آمنوا وعملوا الصالحات وتواصوا بالحق وتواصوا بالصبر﴾العصر/١-٣.

واتە: سوێندم بەم چەرخ‌و ڕۆژگارە کە دێ‌و دەڕوا، هەرچی لەڕەگەزی ئادەمیزادە ماڵ وێران‌و زیانەوەمەندە، ئەوانەی لێ دەرچێ: کە خاوەنی باوەڕی تەواون بەخوداو بە ڕێگەی ڕاستی ئایین، وە کردەوە باشەکانیش دەکەن، وەك

---

٤ موسلیم (١٨٩٤).

نوێژو رۆژوو و زەکاتو حەجو عەمرەو غەزاو دەوری قورئانو رەفت کردن بە شەریعەت، وە هەروەها لەناو خۆیانا هانی یەکتری دەدەن لەسەر ئەوە کە بە حەوصەلەبنو بە پشوو بنو لەکاتی تەنگانەدا ددان بەخۆیانا بگرن.

قال الإمام الشافعي-رحمه الله- كلاما معناه: إن الناس أو اكثرهم في غفلة عن تدبر هذه السورة:

ئیمامی شافیعی (رەحمەتی خودی لێ بێ) فەرمایشێکی گوتووە پاڵفتەکەی ئەمەیە: کە زوربەی ئەو خەڵکە زۆر بێ ئاگان لە سەرنجدانی ئەم سوورەتە بەوردی!

١٧٧/١-[1]- عن أَبي عبدِ الرحمن زيدِ بنِ خالدٍ الْجُهَنِيِّ رضيَ اللَّه عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: مَنْ جهَّزَ غَازِياً في سَبِيلِ اللَّه فَقَدْ غَزَا وَمَنْ خَلَفَ غَازِياً فِي أَهْلِهِ بِخَيْرٍ فَقَدْ غَزَا» متفقٌ عليه.

زەیدی کوڕی خالید (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ خەباتگێڕێ پڕ چەكو تفاق بكا، كە لەڕێگەی خوادا بچێ بۆ غەزا، ئەوە بە ئیعتبار خۆشی چووە بۆ ئەو غەزایە، وە هەرکەسێ سەرپەرشتی ماڵو منالّی خەباتکارێ بکا، کە لەبەر خاتری خودا چووبێ بۆ غەزا، لەو کاتەوە کە لەماڵ دەردەچێ تا دەگەڕێتەوە، ئەوە وادادەنرێ کە خۆشی چووە بۆ ئەو غەزایە (ش).

١٧٨/٢-[2]- وعن أَبي سعيدٍ الخُدْرِيِّ رضي اللَّه عنهُ أَنَّ رسولَ اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، بَعَثَ بَعْثاً إِلى بَني لِحيانَ مِنْ هُذَيْلٍ فقالَ: (لِيَنْبعِثْ مِنْ كُلِّ رَجُلَيْنِ أَحَدُهُمَا وَالأَجْرُ بَيْنَهُمَا) رواه مسلم.

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستەیەكی نارد بۆلای خێڵی بەنی لەحیان، لە هۆزی هوزەیل، وەفەرمووی پێیان:(با لەهەموو دوو پیاوێ یەكێكیان بچێ بۆ ئەم غەزایە، پاداشەكەیان بەنیوەیی دەبێ)(م).

١٧٩/٣-[3]- وعن ابنِ عباسٍ رضي اللَّه عنهما أَنَّ رسُولَ اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم لَقِيَ رَكْباً بالرَّوْحَاءِ فقال: «مَنِ الْقَوْمُ ؟» قالُوا: المُسْلِمُونَ، فَقَالُوا: مَنْ أَنْتَ ؟ قَال: «رسُولُ اللَّه» فَرَفَعَتْ إِلَيْهِ امْرَأَةٌ صَبِيًّا فَقَالَتْ: أَلَهَذَا حَجٌّ ؟ قال: (نَعمْ وَلَكِ أَجْرٌ) رواه مسلم.

---

١ بوخاری (٢٨٤٣)، موسلیم(١٨٩٥).

٢ موسلیم (١٨٩٦).

٣ موسلیم (١٣٣٦).

ئیبن‌و عەبباس (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لە ڕەوحا، کە شوێنێکە لەبەینی مەککەو مەدینەدایە، توشی بڕکەیێ سوار بوو، فەرمووی: ئێوە کام هۆزن؟ گوتیان: ئێمە هۆزی ئیسلامین، جا ئەوانیش گوتیان: ئەی تۆ کێی؟ فەرمووی: من پێغەمبەری خۆتانم، جا ئافرەتێ منالێکی هەلبڕی‌و نیشانی پێغەمبەری داو گوتی: ئەی ڕەهبەری خودا! ئایا حەج بۆ ئەم مندالە دەبێ؟ فەرمووی: بەلێ بۆی دەبێ، وە بۆ تۆش پاداشی هەیە لەسەر ئەوە کە حەجی پێ دەکەی، چونکە مامۆستای خێر وەك خێرکەر وایە (م).

٤/١٨٠-[٤]- وَعَنْ أَبِي موسى الأَشْعَرِيِّ رضيَ اللَّهُ عنه، عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم أَنَّهُ قال: (الخَازِنُ المُسْلِمُ الأَمِينُ الذي يُنَفِّذُ ما أُمِرَ بِهِ، فَيُعْطِيهِ كَامِلاً مَوفُراً، طَيِّبَةً بِهِ نَفْسُهُ فَيَدْفَعُهُ إِلى الذي أُمِرَ لَهُ بِهِ أَحَدُ المُتَصَدِّقَيْن) متفقٌ عليه.

وفي رواية: (الذي يُعْطِي مَا أُمِرَ بِهِ) وضَبطُوا (المُتَصدِّقَيْنِ) بفتح القاف مع كسر النون على التَّثْنِيَةِ، وعَكْسُهُ عَلَى الجمْعِ وكلاهُمَا صَحِيحٌ.

ئەبو مووسای ئەشعەری (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: کلیل بەدەستی موسولمانی دەسپاك، ئەگەر بە دلێکی پاك‌و بەڕوویەکی خۆشەوە، ئەو فەرمانەی پێی دەکرێ جێ بەجێی بکاو بەتەواوەتی بیدا بەو کەسەی کە پێی وتراوە کەشتەکەی بداتێ، ئەوە خۆشی یەکێکە، لە دوو خێرکەرەکە(ش).

## ٢٢- باسی ئامۆژگاری (باب في النصيحة)

قال تعالى: ﴿إنما المؤمنون إخوة﴾الحجرات/١٠. واتە: موسولمان برای موسولمانەو ئەهلی ئیمان‌و دەستەی بڕواداران لەناو خۆیانا برای دینین. وقال تعالى إخبارا عن نوح(عليه السلام): ﴿وأنصح لكم﴾الأعراف/٦٢. وعن هود (عليه السلام): ﴿وأنا لكم ناصح أمين﴾الأعرةاف/٦٨.

---

٤ بوخاری (١٤٣٨)، موسلیم (١٠٢٣).

١٨١/١-[١]- عن أَبِي رُقَيَّةَ تَميم بنِ أَوْس الدَّاريِّ رضي اللّٰه عنه أَنَّ النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم قَالَ: (الدِّينُ النَّصِيحَةُ) قُلْنَا: لِمَنْ ؟ قَالَ (للّٰه وَلِكِتَابِـهِ ولِرسُـولِهِ وَلأَئمَّـةِ المُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ) رواه مُسْلم.

**تەميمى دارى** (رەزاى خوداى لەسەر بێ) **لە پێغەمبەرەوە،** دەفەرموێ (دروودى خواى لەسەر بێ): **دين — واتە:ئايين- بريتييە لە ئامۆژگارىو دڵسۆزىو ساغى، ئێمەيش گوتمان: بەرابەر كێ؟ فەرمووى: بەرابەر بە خوداو قورئانو پێغەمبەرو پێشەواياني موسوڵمانانو تێكڕاى موسوڵمانان (م).**

١٨٢/٢-[٢] - عَنْ جرير بْنِ عبدِ اللّٰه رضي اللّٰه عنه قال: بَايَعْتُ رَسـولَ اللّٰـه صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم عَلى: إِقَامِ الصَّلاَةِ، وإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالنُّصْحِ لِكلِّ مُسْلِمٍ. متفقٌ عليه.

**جەريرى كوڕى عەبدوڵلا** (رەزاى خوداى لەسەر بێ) **فەرمووى: بەڵێنو پەيمانم دا بە پێغەمبەر** (دروودى خواى لەسەر بێ) **لەسەر ئەوە كە نوێژ بكەمو زەكات بدەمو ئامۆژگارى خێرى هەموو موسوڵمانێكيش بكەم (ش).**

١٨٣/٣-[٣]- الثَّالثُ: عَنْ أَنَس رضي اللّٰه عنه عن النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قـال: (لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ) متفقٌ عليه.

**ئەنەس** (رەزاى خوداى لەسەر بێ) **فەرمووى: پێغەمبەر** (دروودى خواى لەسەر بێ) **دەفەرموێ: كەستان بە تەواوى ئيمانو باوەڕ ناهێنێ هەتا هەرچى بۆ خۆى پێ خۆشە بۆ براى موسوڵمانيشى پێى خۆش نەبێ (ش).**

## ٢٣- باسى فەرمانكردن بەچاكەو قەدەغەكردنى كارى خراپە
## باب في الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر

**قال الله تعالى: ﴿ولتكن منكم أمة يدعون الى الخير ويأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر وأولئك هم المفلحون﴾آل عمران/١٠٤.**

**وقال تعالى: ﴿كنتم خير أمة أخرجت للناس تأمرون بالمعروف وتنهون عن المنكر﴾آل عمران/١١٠.**

---

١ موسليم (٥٥).

٢ بوخارى (٥٧)، موسليم (٥٦).

٣ بوخارى (١٣٩، موسليم (٤٥).

وقال تعالى: ﴿خذ العفو وأمر بالعرف وأعرض عن الجاهلين﴾الأعراف/١٩٩.

وقال تعالى: ﴿المؤمنون والمؤمنات بعضهم أولياء بعض يأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر﴾التوبة/٧١.

وقال تعالى: ﴿لعن الذين كفروا من بني إسرائيل على لسان داود وعيسى ابن مريم ذلك بما عصوا وكانوا يعتدون، كانوا لا يتناهون عن منكر فعلوه لبئس ما كانوا يفعلون﴾المائدة/٧٨.

وقال تعالى: ﴿وقل الحق من ربكم فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر﴾الكهف/٢٩.

وقال تعالى: ﴿فاصدع بما تؤمر﴾الحجر/٩٤.

وقال تعالى: ﴿ثم انجينا الذين ينهون عن السوء، وأخذنا الذين ظلموا بعذاب بئيس بما كانوا يفسقون﴾الأعراف/١٦٥.

مەبەست لە ئایەتە پیرۆزەکان: دەستەیێ لە موسوڵمانان خۆیان تەرخان بکەن، بۆ خەڵك خستنە سەر ڕێگەی خێرو چاکەو ببن بە مامۆستای خێری ئەو خەڵکە، خێر نیشانی مەردووم بدەن، لە خراپە بیان تەکێننەوە چونکە ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە ئێوە لە میللەتە هەرە باشەکانی ئەو خەڵکەن، ڕێی ئاسان بگرن و ڕەوشتی بەرز بەرمەدەن و هەقتان بەسەر پیاوی نادانەوە نەبێ، دەم مەنێنە دەم نەفامان، ئێوە کە خاوەن بڕوان و میللەتی موسوڵمانن ئەوە بزانن و رەفتی پێ بکەن: کە موسوڵمانان لەناو خۆیانا، بە پیاوو ژنیانەوە، دۆستی یەکترین، پشت و پەنای یەکترین، کەس و هەقداری یەکترین، بەشێ لەنەوەی ئیسرائیل کە لە ڕێ دەرچووبوون و لەفەرمانی خودا یاخی بووبوون و دەستدرێژی و ناهەقیان دەکردو لەناو خۆیانا بەبەرچاوی یەکترییەوە کاری ناشایستەیان دەکردو بێزاریان دەرنەدەبڕی و لێی بی دەنگ دەبوون، لەسەر ئەم رەوشتە پیسانەیان خودا لەسەر زمانی داوود پێغەمبەرو لەسەر زبانی عیسا پێغەمبەر نەفرین و لەعنەتی کرد لەو کافرانە، کە ئەو کارە بەدانەیان کردبوو بە پیشەی خۆیان. ئەی خۆشەویست! هەق و ناهەق ئاشکرابووە، هەموو کەس دەیان ناسێ، کەواتە هەرکەس بەئارەزوی خۆیەتی، دەیەوێ ئەوە شارێگەی هەقە، دەڵێی رۆژی نیوەڕۆیە دیارو ئاشکرایە با بیگرێ و خۆی بگەیەنەتە ژێر سێبەری قورئانی پیرۆز، هەروەها ڕێگەی ناهەقیش

دیاره، کێ دەیگرێ کەیفی خۆیەتی. ئەی خۆشەویست! یاسای ئێمە وایە: داوا لە پێغەمبەران دەکەین کە هەڵبسن بەئەرکی سەرشانی خۆیان و لە جێبەجێ کردنی فەرمانی خودادا گورج و گۆڵ و چابوك و وریابن و دریغی و کۆتایی تێدا نەکەن، چونکە دەستورێکی نەگۆڕو دامەزراوە:پیاو چاکان ڕزگاریان دەبێ و پیاو خراپان و ستەمکاران سەرەنجام خودا دەیانگرێ و سەریان تیادا دەچێ.

١٨٤/١-[١]- عن أَبي سعيدٍ الخُدْريِّ رضي اللّٰه عنه قال: سَمِعْتُ رسُولَ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّم يقُولُ: (مَنْ رَأَى مِنْكُم مُنْكراً فَلْيغيِّرْهُ بِيَدهِ، فَإنْ لَمْ يَسْتَطعْ فبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبقَلبِهِ وَذَلكَ أَضْعَفُ الإِيمانِ) رواه مسلم.

طاريقی کوڕی شیهاب (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: یەکەم کەس کە لە پێش نوێژی جەژندا خوتبەی دا مەڕوان بوو، پیاوێ بۆی هەڵساو گوتی: نوێژی جەژن لەپێش خوتبەدایە، مەڕوان گوتی: ئەوەی تۆ دەیڵێی تەرك کراوە! جا ئەبو سەعید فەرمووی: ئەم پیاوە ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ هێنا، بە گوێی خۆم لەدەمی حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) ژنەوتم دەیفەرموو: هەرکەسێ لەئێوە شتێکی ناڕەوای دی با بەزەبری دەست و هێزی بازوو لەناوی ببا، جا ئەگەر بەدەستی نەیتوانی بە زبان و بە قسەو ئامۆژگاری، ئەگەر بە زمانیش نەیتوانی بەدڵ پێی ناخۆش بێ، ئەم کەسەیش کە بەدڵ پێی ناخۆشە باوەڕی تەواو کزە، ئەگینا بەدەست و بەزبانیش بەرهەڵستی دەکردو دەربەست نەدەبوو لە پێناو هەقا هەرچی بەسەر بهاتایە (م/تاج).

١٨٥/٢-[٢]- عن ابنِ مسْعُودٍ رضيَ اللّٰه عنه أَنَّ رسولَ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: «مَا مِنَ نَبِيّ بعثَهُ اللّٰه فِي أُمَّةٍ قَبْلِي إلاَّ كان لَه مِن أُمَّتِهِ حواريُّون وأَصْحَابٌ يَأْخذون بِسُنَّتِهِ ويقْتدُون بأَمْره، ثُمَّ إِنَّها تَخْلُفُ مِنْ بعْدِهِمْ خُلُوفٌ يقُولُون مَالاَ يفْعلُونَ، ويفْعَلُون مَالاَ يُؤْمَرون، فَمَنْ جاهدَهُم بِيَدِهِ فَهُو مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جاهدهم بقَلْبِهِ فَهُو مُؤْمِنٌ، ومَنْ جَاهَدهُمْ بِلِسانِهِ فَهُو مُؤْمِنٌ، وليس وراءَ ذلِك مِن الإِيمانِ حبَّةُ خرْدلٍ) رواه مسلم.

---

١ موسليم (٤٩).

٢ موسليم (٥٠).

ئیبن‌و مەسعوود (ڕەزای خوودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەموو پێغەمبەرێ، کە خودا ناردوویەتی بۆ ناو میللەتێ، لە پێش مندا، ئەو پێغەمبەرە لە گەلەکەی خۆی چەند برادەرێکی گیانی بە گیانی‌و چەند هاوڕێیەکی باشی بووە، کە ئەو پێغەمبەرەیان کردووە بەسەر مەشقی خۆیان‌و ڕەوشتی ئەویان گرتووەو ڕەفتاریان بە ڕەفتاری ئەو کردووە، لە پاشا بەرەبەرە لەپاش ئەوان چەند چینێکی پاشەبەرەی نابار بوون بە جێگەداری ئەوان‌و حاڵیان وابووە کە قسەو ڕەفتاریان لەیەك جیابووەو بەبێ فەرمانی خودا لەخۆیانەوە شت دادەتاشن‌و دەیکەن، جا ئەوەی بە کردەوە بەرپەرچیان بداتەوەو بچێ بەگژیانا ئەوە موسوڵمانی چاکە، هەروەها ئەوەی کە بەزمان لە دژیان بێ، ئاخر شت ئەوەیە کە بەدڵ حەزیان لێ نەکاو لە دڵەوە ڕقی لێیان بێ، ئیتر لەمە بترازی بەقەی دانەی خەرتەلەیێ پێی نالێن موسوڵمانەتی (م).

١٨٦/٣–[٣]– عن أَبي الوليدِ عُبَادَةَ بنِ الصَّامِتِ رضي اللّٰه عنه قال: (بايعنا رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم على السَّمعِ والطَّاعَةِ في العُسْرِ وَاليُسْرِ والمَنْشَطِ والمَكْرَهِ، وَعلى أَثَرَةٍ عَلَيْنا، وعَلَى أَنْ لاَ نُنَازِعَ الأَمْرَ أَهْلَهُ إلاَّ أَنْ تَرَوْا كُفْراً بَوَاحاً عِنْدكُمْ مِنَ اللّٰه تعالَى فيه بُرهانٌ، وعلى أن نقول بالحَقِّ أينَما كُنَّا لا نَخافُ في اللّٰه لَوْمَةَ لائمٍ) متفقٌ عليه.

عوبادەی کوڕی صامت (ڕەزای خوودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: بەیعەت‌و پەیمانمان دا بە پێغەمبەری خودا، لەسەر ئەوە کە گوێڕایەڵ‌و فەرمانبەر بین، لەکاتی خۆشی‌و ناخۆشیداو لەحاڵی ئاسودەیی‌و تەنگانەدا، ئەگەر چی فەرمانڕەواکانمان خۆ خۆییشمان لەگەڵدا بکەن‌و نازی ئەم‌و ئەویش بدەن بەسەر ئێمەدا، وەلەسەر ئەوەیش کە گەڕو گێچەڵ بەو کەسانە نەکەین کە بوون بەسەرەو کارو فەرمانڕەوای موسوڵمانان(مەگەر لە حاڵێکا کە بەتەواوەتی لە ڕێی ڕاست لادەن‌و بە بەرچاوەوە بی کە خودا حەز بەڕەفتارو کرداریان ناکا) یا مەگەر کوفرێکی پەتی‌و بێ باوەڕییەکی ئاشکرایان بەچاوی خۆتان لێ ببینن، کە ببێ بە بەڵگەیەکی ڕۆشن‌و بەهانەیەکی ڕەوا بۆتان لەلای خودا ئەوجا هەقتان هەیە بەزەبری شیرو تیر بایان پێ بدەنەوە بۆ سەر شەقامە ڕێی ئیسلام وەلەسەر ئەوەیش کە هەمیشە

---

٣ بوخاری (٧٠٥٦)، موسلیم(١٧٠٩).

راست بڕۆین و لەبەر خودا لەسەر قسەی هەق لە لۆمەو سەرزەنیشتی کەس نەترسین (ش).

١٨٧/٤ –[٤]– عن النعْمان بن بَشيرٍ رضي اللّه عنهما عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (مَثَلُ القَائِمِ في حُدودِ اللّهِ، والْوَاقِعِ فيها كَمَثَلِ قَومٍ اسْتَهَمُوا على سفينةٍ فصارَ بعضُهم أعلاهَا وبعضُهم أسفلَها وكانَ الذينَ في أسفلها إذَا اسْتَقَوْا مِنَ الماءِ مَرُّوا عَلَى مَنْ فَوْقَهُمْ فَقَالُوا: لَوْ أَنَّا خَرَقْنَا في نَصيبِنا خَرْقاً وَلَمْ نُؤْذِ مَنْ فَوْقَنَا، فَإنْ تَرَكُوهُمْ وَمَا أَرادُوا هَلَكُوا جَمِيعاً، وإِنْ أَخَذُوا عَلَى أَيْدِيهِم نَجوْا ونجوْا جَمِيعاً). رواهُ البخاري.

نوعمانی کوڕی بەشیر (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) دەفەرموێ: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: وێنەی کەسێ ئاگای لە خۆی بێ و خۆی بپارێزێ لەو شتانەی کە خودا سنووری بۆ داناون لەگەڵ وێنەی ئەوکەسە دا کەگوێ نەداتێ و سنوورەکانی خودا تێك بداو بێ فەرمانی خودا بکا، وەك وێنەی دەستەیێ وایە، کە لەناو خۆیانا، لەسەر جێگەی خۆیان، لەناو پاپۆڕێکی دوو قاتیدا، تیرو پشك بکەن، تاقمەیەکیان قاتی سەرەوەیان بەربکەوێ و ئەوانی تریان قاتی خوارەوەیان بەربکەوێ، وەئەوانەی لەقاتی خوارەوەن بەسەر ئەواندا بچن بۆ ئاو کە وان لەقاتی سەرەوە، لەبەر ئەوە بڵێن: بۆچی ئێمە لەبەشی خۆمانا کونێکی تێ نەکەین و ئیتر ئەوەندە ئازاری ئەوانەی قاتی سەرەوە نەدین و بەسەریانا نەچین و نەیەین. جا ئەگەر ئەوانەی سەرەوە وازیان لێ بێنن و ڕێگەی ئەوەیان بدەن کە کونی تێ بکەن ئەوا پاپۆڕەکە پڕدەبێ لەئاوو نوقم دەبێ و هەموویان وەکو یەك دەفەوتێنن، بەڵام ئەگەر دەستیان بگرن و نەهێڵن کە ئەو هەڵەیە بکەن ئەوا خۆشیان و ئەوانەی خوارەوەیش هەردوولا ڕزگار دەبن (ب).

١٨٨/٥ –[٥]– عَنْ أُمِّ المُؤْمِنِينَ أُمِّ سَلَمَةَ هِنْدٍ بنتِ أَبِي أُمَيَّةَ حُذَيْفَةَ رضي اللّه عنها، عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم أنه قال: (إِنَّهُ يُسْتَعْمَلُ عَلَيْكُمْ أُمَراءُ فَتَعْرِفُونَ وتُنْكِرُونَ فَمَنْ كَرِه فقَدْ بَرِىءَ وَمَنْ أَنْكَرَ فَقَدْ سَلِمَ، وَلَكِنْ من رَضِيَ وَتَابَعَ) قالوا: يا رَسُولَ اللّه أَلاَ نُقَاتِلُهُمْ ؟ قَالَ: «لاَ، مَا أَقَامُوا فِيكُمْ الصَّلاَةَ) رواه مسلم.

---

٤ بوکخاری (٢٤٩٣).

٥ موسلیم (١٨٥٤)(١٨٥٥).

ئوممولموئمینین، دایکی موسولّمانان، ئوممو سەلەمە (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: رۆژێ دەبێ کاربەدەستانێ دەبن بە فەرمانڕەواتان چاك‌و خراپ تێکەڵ دەکەن، جا ئەوەی خراپەکەی پێ ناخۆش بێ ئەوە خۆی دەپەرێنێتەوە، وەئەوەی بەرهەڵستی بکا ئەوە خۆی بەباشی سەرفراز دەکا، بەڵام ماڵ وێران‌و هاوبەشی تاوان ئەو کەسانەن کە بەو خراپەیە قایل دەبن‌و پەیڕەویی ئەوان دەکەن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا نەچین بەگژیانا؟ فەرمووی: هەتا لەناوتانا نوێژبکەن نەء (م).

١٨٩/٦-[٦] عن أُمِّ الْمُؤْمِنِين أُمِّ الْحكَمِ زَيْنبَ بِنْتِ جحْشٍ رضي اللَّه عنها أَنَّ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم دَخَلَ عَلَيْهَا فزعاً يقولُ: (لا إِلهَ إِلاَّ اللَّهُ ويْلٌ لِلْعرب مِنْ شَرٍّ قَدِ اقْتَرب، فُتحَ الْيوْمَ مِن ردْمِ يَأْجُوجَ ومأْجوجَ مِثْلُ هذِهِ) وَحلَّقَ بأُصْبُعه الإِبْهَامِ والَّتِي تَلِيهَا. فَقُلْتُ: يَا رسول اللَّه أَنَهْلِكُ وفِينَا الصَّالحُونَ ؟ قال: (نَعَمْ إِذَا كَثُرَ الْخَبَثُ) متفقٌ عليه.

زەینەبی کچی جەحش (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لە خەو ڕاپەڕی‌و هات بۆلام، ڕووی سوور هەڵگەڕابوو، فەرمووی: لا اله الا الله!. هەر خودا خودایەو بەس، هاوار لەعەرەب، بۆ ئەم شەڕەی کەوا ڕووی تێ کردوون، ئەمڕۆکە ئەوەندەی ئەمە لە سەددی یەئجووج‌و مەئجووج کون بووا سوفیان سەری پەنجەی شایەتمانی خۆیی نووساند بەبنی پەنجە کەڵەیەوەو کردی بە ئەڵقەیەکی بچکۆلەو نیشانی دا کە مەبەستی حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) شتێکی کەم بووە، وەك ئەم ئەڵقە بچکۆلەیە، منیش عەرزیم کرد: قوربان! ئەگەر پیاو چاکانیشمان تیابن هەر دەفەوتێین؟ فەرمووی (درودی خوای لەسەر بێ): بەڵێ کە پیسی‌و گەندەیی پەرەی سەند! (ش).

١٩٠/٧-[٧] عنْ أَبِي سَعيد الْخُدْرِيِّ رضي اللَّه عنه عنِ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (إِيَّاكُم وَالْجُلُوسَ فِي الطرُقاتِ) فقَالُوا: يَا رسَولَ اللَّه مَالَنا مِنْ مَجالِسنَا بُدٌّ، نَتحدَّثُ فِيهَا، فقَال رسول اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: فَإِذَا أَبَيْتُمْ إِلاَّ الْمَجْلِس فَأَعْطُوا الطَّرِيقَ حَقَّهُ» قالوا: ومَا حَقُّ الطَّرِيقِ يا رسولَ اللَّه ؟ قال: (غَضُّ الْبَصَرَ، وكَفُّ الأَذَى، وردُّ السَّلامِ، وَالأَمْرُ بالْمعْروفِ، والنَّهْيُ عنِ الْمُنْكَرِ) متفقٌ عليه.

---

٦ بوکخاری (٧١٣٥)، موسلیم (٢٨٨٠).

٧ بوخاری (٢٤٦٥)، موسلیم (٢١٢١).

ئـەبو سـەعیدی خـودری (ڕەزای خـودای لەسەر بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر بێ) فـەرمووی: نەکـەن لەسـەر ڕێگـەوبان دابنیشـن، گوتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! چارمان نییـە، جێگـەی ترمـان نییـە، کـەلێی دەمەتـەقێی لێ بکـەین ئـەوێ نـەبێ، فەرمووی: کە وای لێ هات مافی ڕێگەوبان بەجێ بێـنن، گوتیـان قوربان! ئایا مـافی ڕێگەوبان چییە؟ فەرمووی: چاوی خۆتان بگرن و تەماشای ناموس و نەنگی خـەڵکی پـێ مەکـەن و ئەگـەر شـتێکتان بەرچـاو کـەوت چاوپۆشـی لێ بکـەن و ئـازاری کـەس مەدەن و مـەبن بـە ئـێش و ئـازار بـۆ ڕێبـوار، وەلامـی سلا و بدەنـەوەو ڕێگـەی بـاش نیشانی خەڵك بدەن و جڵەو گیری لە خراپە بکەن (ش).

١٩١/٨-[٨]- عن ابن عباس رضي اللّٰه عنهما أن رسولَ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلّم رأى خَاتمًا مِنْ ذَهَبٍ فِي يَد رَجُلٍ، فَنَزعَهُ فطَرحَهُ وقَـال: (يَعْمَـدُ أَحَـدُكُمْ إِلَـى جَمْـرَةٍ مِـنْ نَـار فَيجْعلهَا فِي يَدِهِ،) فَقِيل لِلرَّجُلِ بَعْدَ مَا ذَهَـبَ رسـولُ اللّٰـه صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلّم: خُـذْ خَاتَمَكَ، انتَفعْ بِهِ. قَالَ: لا واللّٰه لا آخُذُهُ أَبَداً وقَـدْ طَرحـهُ رسـول اللّٰـه صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم. رواه مسلم.

ئـیبن و عـەبباس (ڕەزای خودایـان لەسەر بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسەر بێ) لەدەسـتی پیاوێکا ئەنگوستیلەیەکی زێڕی دی، ئەنگوستیلەکەی لەپەنجەی داکەنـدو تـوڕی دا، وە فەرمووی: بازێ کەستان پەلاماری سکڵی ئاگر دەداو خودسەر دەیکاتە دەستی!

لەپاشا، کە پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسەر بێ) تەشـریفی بـرد، خەڵکەکـە بـە پیاوەکـەیان گوت: ئەنگوستیلەکەت هـەڵبگرەوە، بەکـەڵکی شـتێك دێ، گـوتی: نـا بـەخودا، بـڕای بـەبڕای شـتی وا نـاکـەم، شـتێ پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر بێ) تـووڕی بـداو مـن هـەڵی بگرمەوە، شتی وا نەبووەو نەدەبێ (م/تاج).

١٩٢/٩-[٩]- عَنْ أَبِي سعيدٍ الْحسنِ البصْري أَنَّ عَائِذَ بن عمْرٍو رضي اللّٰه عنه دخَلَ عَلَى عُبَيْدِ اللّٰهِ بن زيَادٍ فَقَالَ: أَيْ بن زيَادٍ فقَالَ: أَيْ بنيَّ، إنّي سمِعتُ رسولَ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم يقولُ: (إنَّ شَرَّ الرِّعاءِ الْحُطَمَةُ) فَإِيَّاكَ أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ. فَقَالَ لَهُ: اجْلِسْ فَإِنَّمَا أَنـت مِنْ نُخَالَةِ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم، فقال: وهَلْ كَانَتْ لَهُمْ نُخَالَةٌ إِنَّمَا كَانَتِ النُّخالَةُ بَعْدَهُمْ وَفي غَيرِهِمْ، رواه مسلم.

---

٨ موسليم ١٨٣٠(٢٠٩٠).

٩ موسليم (١٨٣٠).

لە ئەبو سەعید حەسەنی بەصرییەوە دەگێڕنەوە: عائیشەی کوڕی عەمر (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەچێ بۆلای عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد، پێی دەفەرموێ: ئەی کوڕی خۆم! بۆخۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: بەدترین شوان شوانی ڕان پسێنە: خراپترین کاربەدەست کاربەدەستی میللەت ڕەتێنە، جا ئامان سەد ئامان تۆ لەو شوانە ڕانبیسێنانە نەبیت! عوبەیدوڵڵایش پێی گوت: دانیشە، تۆیش لەسەر کۆزەری یارانی موحەممەدیت (دروودی خوای لەسەر بێ) عائیشەیش (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوان هەموو گەنمە قەندەهاری بوون، کوا سۆس و سەرکۆزەریان هەبوو؟ سۆس و سەرکۆزەر لەدوا ئەوان و لەخەڵکی تردا هەبوو (م).

١٩٣/١٠-[١٠]- عَنْ حذيفةَ رضي اللّٰه عنه أنَّ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (والَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَأْمُرُنَّ بالْمعرُوفِ، ولَتَنْهَوُنَّ عَنِ الْمُنْكَرِ، أَوْ لَيُوشِكَنَّ اللّٰه أَنْ يَبْعثَ عَلَيْكمْ عِقَاباً مِنْهُ، ثُمَّ تَدْعُونَهُ فَلاَ يُسْتَجابُ لَكُمْ) رواه الترمذي وقال: حديثٌ حسنٌ.

حوذەیفە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لەحەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەر بێ): بەوکەسە کە گیانی منی بەدەسە، یا دەشێ فەرمان بکەن بە چاکەو جڵەوگیری بکەن لە خراپە، یا زۆر نزیکە کە خودا سزاو تۆڵەیەکی سەختتان بۆ بنێرێ، لەپاشا هەزار هات و هاوار بکەن خودا نایەت بەهاوارتانەوە (ت:ح/ح).

١٩٤/١١-[١١]- عنْ أَبِي سَعيد الْخُدريِّ رضي اللّٰه عنه عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: «أَفْضَلُ الْجِهَادِ كَلِمَةُ عَدْلٍ عندَ سلْطَانٍ جائِرٍ) رواه أبو داود، والترمذي وقال: حديثٌ حسنٌ.

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: گەورەترین خەبات و تێکۆشان و غەزا قسەی ڕەوایە لەڕووی گەورەی زۆرداردا! (د/ت:ح/ح).

١٩٥/١٢-[١٢]- عنْ أَبِي عبدِ اللّٰه طارقِ بنِ شِهابٍ الْبُجَلِيِّ الأَحْمَسِيِّ رضي اللّٰه عنه أَنَّ رجلاً سأَلَ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، وَقَدْ وَضعَ رِجْلَهُ في الغَرْزِ: أَيُّ الْجِهادِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «كَلِمَةُ حقّ عِنْدَ سُلْطَانٍ جائِرٍ) رَوَاهُ النسائيُّ بإسنادٍ صحيحٍ.

---

١٠ تيرمذي (٢١٧٠).

١١ تيرمذي (٢١٧٥)، ئەبوداوود (٤٣٤٤)، ئیبن‌وماجە (٤٠١١).

١٢ نەسائی (٧/١٦١).

**طاريقی کوڕی شیهاب** (رەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر دۆو پێی نابووە ناو ئاوزەنگی، لەوکاتەدا پیاوێ لێی پرسی: چ خەباتو عەزایێ لەهەمووان گەورەترە؟ فەرمووی: قسەی ڕەوا لەلای خاوەن دەستەڵاتی ستەمکار! (ن‌س/ص).**

١٩٦/١٣-[١٣]- عن ابن مَسْعُودٍ رضي اللّٰه عنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم: «إِنَّ أَوَّلَ مَا دخَلَ النَّقْصُ عَلَى بَنِي إِسْرائيلَ أَنَّه كَانَ الرَّجُلُ يَلْقَى الرَّجُلَ فَيَقُولُ: يَا هَذَا اتَّقِ اللّٰهَ وَدعْ مَا تَصْنَعُ فَإِنَّهُ لا يَحِلُّ لك، ثُم يَلْقَاهُ مِن الْغَدِ وَهُو عَلَى حالِهِ، فلا يَمْنَعُه ذلِك أَنْ يكُونَ أَكِيلَهُ وشَرِيبَهُ وَقعِيدَهُ، فَلَمَّا فَعَلُوا ذَلِكَ ضَرَبَ اللّٰه قُلُوبَ بَعْضِهِمْ بِبعْضٍ) ثُمَّ قال: { لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ بنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى لِسَانِ داوُدَ وعِيسَى ابنِ مَرْيَم } إِلَى قوله: { فَاسِقُونَ } ثُمَّ قَالَ: (كَلاَّ، وَاللّٰهِ لَتَأْمُرُنَّ بِالْمَعْرُوفِ، وَلَتَنْهَوُنَّ عَنِ الْمُنْكَرِ، ولَتَأْخُذُنَّ عَلَى يَدِ الظَّالِمِ، ولَتَأْطِرُنَّهُ عَلَى الْحَقِّ أَطْراً، ولَتقْصُرُنَّهُ عَلَى الْحَقِّ قَصْراً، أَوْ لَيَضْرِبَنَّ اللّٰه بقُلُوبِ بَعْضِكُمْ عَلَى بَعْضٍ، ثُمَّ لَيَلْعَنكُمْ كَمَا لَعَنَهُمْ) رواه أبو داود، والترمذي وقال: حديث حسن. هذا لفظ أبي داود ولفظ الترمذي: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: لَمَّا وقعت بنو إسرائيل في المعاصي نهتهم علماؤهم فلم ينتهوا فجالسوهم في مجالسهم ووكلوهم وشاربوهم فضرب الله قلوب بعضهم ببعض ولعنهم {على لسان داود وعيسى ابن مريم ذلك بما عصوا وكانوا يعتدون} فجلس رسول الله صلى الله عليه وسلم وكان متكئا فقال لا والذي نفسي بيده حتى تأطروهم على الحق أطرا.

ذلِك بِما عَصَوْا وكَانوا يعْتَدُونَ، كَانُوا لا يَتَنَاهَوْنَ عنْ مُنْكَرٍ فَعَلُوهُ لَبِئْسَ مَا كَانُوا يَفْعلُون صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم تَرى كَثِيراً مِنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ الَّذينَ كَفَرُوا لَبِئْسَ مَا قَدَّمتْ لَهُمْ أَنْفُسُهُمْ.

**ئیبن‌و مەسعوود** (رەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: لەسەرەتاوە بەم شێوەیە کەم‌و کووڕی ڕووی‌دا لەنەوەی ئیسرائیل: کاتێ پیاوێکی زانایان دەگەیشت بە پیاوێکی نەدانیان، کە خەریکی کارێکی خراپ بوو، پێی دەگوت: کابرا! شەرم لەخودا بکەو لەخودا بترسەو واز لەم کارە بێنە کە دەیکەی، چونکم ئەمە بۆ تۆ درووست نییە، کەچی بۆ سبەینێ لەسەر ئەو حاڵە پێی دەگەیشتەوە، هیچ قەدەغەی لێ نەدەکرد، بەڵکوو خۆشی لەگەڵیا دەیخواردو**

١٣ ئەبوداوود (٤٣٣٦) تیرمذي (٣٠٥٠)، ئیبنوماجە (٤٠٠٦).

دەیخواردەوەو دەبوو بەهاونشینی! کاتێ کە حاڵیان گەیشت بەم حاڵە خودا دڵیانی تێکەڵو پێکەڵ کردو کردنی بە فیتنەو ئاشووب بۆ یەکتری! ئەوجا حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) ئەم چەند ئایەتەی خوێندەوە: ﴿لعن الذين كفروا من بني إسرائيل﴾هەتا ﴿فاسقون﴾المائدة/٧٨-٨١. واتە: بەفەرمانی خودا نەفرینو لەعنەتکراوە لە ناموسوڵمانەکانی نەوەی ئیسرائیل، لەسەر زمانی داوود پێغەمبەرو عیسا پێغەمبەری کوڕی مەریەم، دورودی خودایان لەسەربێ، چونکە لەخودا یاخی دەبوونو دەستدرێژیان لەیاساو شەریعەتی ئەو دەکرد، حاڵیان وابوو لەناو خۆیانا خراپەیان دەکردو چاوپۆشیان لە خراپەکەرەکە دەکردو پێیان نەدەگوت: ئەوە خراپەیە مەیکە، بەخودا کارێکی زۆر ناشیرینو ناپەسەندیان دەکرد بەم ڕەوشتە بەدەیان، تەماشادەکەی گەلێ کەسیان دەبن بەدۆستو برادەری خودا نەناسەکان، ئەمەش بووە هۆی ئەوە کە خودا رقو قاریان لێ بگرێ وە دەبێ لەوە خراپتر کە ئەمانە بەدەستی خۆیان بۆ خۆیانیان سازاندووە چی بێ؟ سەرەڕای ئەوەیش لەپاشە رۆژدا لەناو ئاگری دۆزەخدا دەمێننەوەو هەڵ دەتوتێن هەتا هەتایە، بەڵێ ئەگەر ئەم خاوەن نامانە باوەڕیان هەبێ بەخوداو بە پێغەمبەری خودا -کە موحەممەدە- و بە قورئان کە ڕەوانە کراوە بۆی ئەوا ئەو بتپەرستو خوا نەناسانەیان نەدەگرت بە دۆستو برادەری خۆیان، بەڵام زووربەی ئەوان لەڕێ دەرچوون. ئینجا فەرمووی: (نا بەخودا یا دەبێ فەرمان بکەن بەچاکەو نەهی بکەن لە خراپەو بە باشی بەری زۆری زۆردار دەگرنو بای پێ دەدەنەوە بۆ سەر ڕاستە ڕێگەی هەقو نایەڵن بە موو لەهەق لابدا، بە خودا یا ئەمە دەکەن، یا ئێوەیش وەك ئەوان خودا بۆ یەکتری دەتانکا بە بشێوەنەو دڵتان تێکەڵو پێکەڵ دەکا سەرەڕای ئەوەیشە وەك لەعنەتی لەوان کردووە لەعنەت لە ئێوەیش دەکا)(ئەبوداوودو تیرمذي گێڕاویانەتەوە) تیرمذي دەفەرموێ: فەرموودەیەکی جوانە، حەدیثیکی حەسەنە، ئەمە گفتی ئەبوداوود بوو، گفتی تیرمذي ئاوایە: کاتی نەوەی ئیسرائیل دەستیان دایە گوناە کردن، زاناکانیان جڵەو گیریان لێ دەکردن، وەلێ ئەوان وازیان لە تاوانکاری خۆیان نەهێنا، هەتا زاناکانیشیان دەچوون لەگەڵ ئەوانا لە کۆڕیانا دادەنیشتنو نانو ئاوو خۆراكو خواردنەوەیان لەگەڵدا دەخواردن، جا بۆیە خودا کردنی بە بشێوەنە بۆ یەکتری، وەلەسەر زمانی داوود پێغەمبەر و عیسای کوڕی

مەریەم نەفرینی لێ کردن، وەك دەفەرموێ: ﴿ذلك بما عصوا وكانوا يعتدون﴾ قسەبەر (راوی) فەرمووی: لە پێشدا حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) شانی دادا بوو، ئینجا ڕێك دانیشت‌و فەرمووی: نەخێر! هەروا بە ئاسانی رزگارتان نابێ‌و قەبوولّ نییە لێتان هەتا نەدەن لەبالّی ستەمکارو بەر لە زۆری زۆردار نەبڕنەوەو بای پێ نەدەنەوە بۆ سەر شارێگەی ڕاستەو لووتی پێ دانەژەنن بەسەر قەبوولّی هەقا!.

١٩٧/١٤-[١٤]- عن أَبي بَكْرٍ الصِّدِّيق، رضي الله عنه. قال: يا أَيُّهَا النَّـاسُ إِنَّكُـمْ تقـرءونَ هَذِهِ الآيَةَ: { يَا أَيُّهَا آمَنُوا الَّذِينَ علَـيْكُمْ أَنْفُسَـكُمْ لا يَضُـرُّكُمْ مـنْ ضَـلَّ إِذَا اهْتَـدَيْتُمْ } ﴿المائدة: ١٠٥﴾ وإني سَمِعت رسول اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يَقُـولُ: (إِنَّ النَّـاسَ إِذَا رَأَوْا الظَّالِمَ فَلَمْ يَأْخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ أَوْشَـكَ أَنْ يَعُمَّهُـمُ اللَّـه بِعِقَـابٍ مِنْـهُ) رواه أبـو داود، والترمذي والنسائي بأسانيد صحيحة.

ئەبو بەكری صدیق (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی خەڵكینە! ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوەو دەیکەن بە بیانوو، بۆ تەرکی ئەمر بە مەعرووف‌و نەهی لە مونکەرو کاری ناشایستە، ئەم ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿ياايها الذين آمنوا عليكم أنفسكم لا يضركم من ضل إذا أهتديتم﴾ المائدة/١٠٥. واتە: ئەی موسوڵمانینە! ئێوە خەمی خۆتان بخۆن‌و چارەسەری خۆتان بکەن، ئەگەر ئێوە ڕێگەی ڕاستی خۆتان بگرن، ئیتر بەدکاریی‌و گومڕایی خەڵکی تر زیان نادا لە ئێوە!. بەڵام من بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی حەزرەتم بیست دەیفەرموو (درودی خوای لەسەر بێ): هەرکاتی کۆمەڵەی ئادەمیزاد، بەبەرچاوی ئەوانەوە ستەمگەر ستەم بکاو زۆردار زۆرو ناهەقی بکاو ئەوانیش دەستی نەگرن‌و ڕێگەی زۆرو ستەمکردنی بدەن ئەوە زۆر نزیکە کە خودا بەزوویی سزایەکی گشتی بۆ هەموویان بنێرێ! (سەنەدی هەرسێکیان صەحیحە).

## ٢٤- باسی سەختی سزای ئەو کەسەی کە بە پێچەوانەی قسەی باشی خۆی ڕەفتار بکات (باب تغليظ عقوبة من أمر بمعروف أو نهي عن منكر وخالف قوله فعله)

قال الله تعالى: ﴿أتأمرون الناس بالبر وتنسون أنفسكم وأنتم تتلون الكتاب أفلا تعقلون﴾البقرة/٤٤. واتە: چۆن حالێکە! ئامۆژگاری خێری مەردووم دەکەن‌و بەوان دەڵێن کە چاکە بکەن‌و خراپە مەکەن، کەچی خۆتانتان لەبیر دەچێ، لەگەڵ ئەوەشا

١٤ ئەبوداوود (٤٣٣٨)، تیرمزی (٢١٦٩)و (٣٠٥٩).

دەوری نامەی خودا دەگەنەوە کە هەڕەشە دەکا لە ڕەفتاری ناهەمواری وا، ئەدی هەتا کەی خۆتان تەفرە دەدەن‌و هۆشێ ناکەنەوەو ڕەحمێ بەحاڵی خۆشتان ناکەن!.

وقال تعالى: ﴿يا ايها الذين آمنوا لم تقولون ما لا تفعلون كبر مقتا عند الله أن تقولوا مالا تفعلون﴾الصف/٢-٣. واتە: ئەی موسوڵمانەکان! دەشێ موسوڵمان کردارو گفتاری یەك بێ، کاری ڕێکی قسەی بێ‌و دەست‌و دڵی ئاسمان‌و ڕێسمان نەبێ، کەواتە چۆن شتێ دەڵێن کە باوەڕتان پێی نییەو دەم‌و دڵتان یەك نییە، خودا زۆر زۆر ڕقی لەشتی وایە.

وقال تعالى إخبارا عن شعيب (عليه السلام) ﴿وما أريد أن أخالفكم إلى ما أنهاكم عنه﴾هود/٨٨. واتە: خودای گەورە لەم ئایەتەدا فەرمایشتەکەی پێغەمبەر شوعەیب (سەلامی خوای لەسەر بێ) دەگێڕێتەوە، کە پاکانە بۆ خۆی دەکاو دەفەرموێ: ئەی خزمینە! من باش باش دەزانم کە من لەسەر هەقم‌و ئێوە لەسەر ناهەقن، وەمن ئەو قسانەی بۆ ئێوەی دەکەم خۆشم دەگرێتەوە مەبەستم ئەوە نییە کە من خۆم لە ئێوە جیابکەمەوە، بە ئێوە بڵێم خراپە مەکەن‌و کەچی خۆم بچم بیکەم، شتی وا بەد لەمن ناوەشێتەوەو پێغەمبەران لەشتی وا زۆر دوورن.

١٩٨/١-[١]- وعن أبي زيدٍ أُسامة بْنِ حَارِثَةَ، رضي الله عنهما، قال: سَمِعْتُ رسولَ اللَّه صَلّى اللَّهُ عَلَيْهِ وسلَّم يَقُولُ: (يُؤْتَـى بالرَّجُلِ يَوْمَ الْقِيامةِ فَيُلْقَى في النَّار، فَتَنْدلِقُ أَقْتَابُ بَطْنِهِ، فيَدُورُ بِهَا كَمَا يَدُورُ الحِمَارُ في الرَّحا، فَيجْتَمِعُ إِلَيْهِ أَهْلُ النَّـار فَيقُولُـونَ: يَـا فُـلانُ مَالَكَ ؟ أَلَمْ تَكُن تَأْمُرُ بالمَعْرُوفِ وَتَنْهَى عَنِ الْمُنْكَرِ ؟ فَيَقُولُ: بَلَى، كُنْتُ آمُرُ بالمَعْرُوفِ وَلاَ آتِيه، وَأَنْهَى عَنِ الْمُنْكَرِ وَآتِيهِ) متفق عليه.

ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی حاریثە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (لە ڕۆژی قیامەتدا بازێ پیاو دێنن‌و توورِی دەدەنە ناو ئاگرەوە، ریخۆڵەکانی دەڕژێنە بەر پێی، وەك گای گێرە بەدەوری خۆیا دەخولێتەوەو ریخۆڵەکانی خۆی گێرە دەکا، دۆزەخیەکان لەدەوری کۆمەڵەدەکەن‌و پێی دەڵێن: فلانەکەس! ئەمە خۆتی؟ تۆ چیتە؟ تۆ چی دەکەی لێرە؟ خۆ تۆ لەکن خۆی ئامۆژگاری باشی ئێمەت دەکرد! ئەمەت لەچی‌و ئەوەت

---

١ بوخاری (٣٢٦٧)، موسلیم (٢٩٨٩).

لەچی؟ ئـەویش دەڵـێ: بـەڵێ وابـووم، بـەڵام داخەکـەم بـۆ خـۆم وانـەبووم، بەپێچـەوانەوە بـە ئێـوەم دەگـوت چـاکە بکـەن‌و خـۆم نـەیم دەکـرد، بـە ئێـوەم دەگوت خراپە مەکەن کەچی بۆ خـۆم خراپـەم دەکـرد، ئەمـەی دەیبیـنن سـزای ئەو کەسانەیە کە ئەمە رەفتارو کرداریانە) (ش).

## ٢٥-باسی فەرمان بە دانەوەی ئەمانەت (سپاردە)
## باب الأمر بأداء الأمانة

قال الله تعالى: ﴿إن الله يأمركم أن تؤدوا الأمانات إلى أهلها﴾النساء/٥٨.

واتە: خودا دەفەرموێ: ئەی موسوڵمانینە! خودا فەرمانتان پێ دەکا کە هەموو جۆرە سپاردەو ئامانـەتێ، بدەنـەوە دەسـتی خـاوەنی خـۆی، دەسـت دەسـت دەناسـێ، کلیلی کابە بدەنەوە دەستی خاوەنی پێشووی.

وقال تعالى: ﴿إنا عرضنا الأمانة على السموات والأرض والجبال فأبين أي يحملنها وأشـفقن منهـا وحملـها الإنسـان إنـه كـان ظلومـا جهـولا﴾الأحـزاب/٨٢. واتـە: ئێمـە پێشـنیازمان پێشکەشـی ئاسمانـەکان‌و زەوی‌و کێوەکـان کـرد کـە سـپاردە گەورەکـەی خـودا، کـە ئەرکـەکانی شـەریعەتی خودایـە، وەك نوێـژو رۆژوو و کردنـی چـاکەو نەکردنی خراپە، کە ئەم ئەمانەتە مەزنە بگرنە ئەستۆی خۆیان ئەگەر دەیانەوێ، بەڵام ئەوان لەمە ترسان‌و مەترسی ئەوەیان هەبوو کە بەجوانیی بۆیـان ڕانـەگیرێ، لەبەرئـەوە قـەبووڵیان نـەکردو عـەرزی خودایـان کـرد کـە ئەمـە بـە ئێمـە نـاکرێ، کەچی مرۆڤ هەر لەگـەڵ ئـەم پێشـنیارەمان نیشـانی دا- بـەبێ سـێ‌و دوو قـەبووڵی کردو شانی دایە بەری! لە ڕاستیدا لە هەڵگرتنی ئەم بارە مەزنـەدا توشی گەلێ زۆرو ستەم بوو، چونکە بە نەزانی چووە ژێری!

١٩٩/١-[١]- عن أَبي هريرة، رضي اللّٰه عنه، أن رسولَ اللّٰه صَلّى اللّٰه عَلَيْـهِ وسَـلَّم قال: (آيَةُ المُنَافِقِ ثلاثٌ: إذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإذَا وَعَدَ أَخْلَـفَ، وإذَا آؤْتُمِـنَ خَـانَ) متفـقٌ عليه. وفي رواية: (وَإِنْ صَامَ وَصَلَّى وزعَمَ أَنَّهُ مُسْلِمٌ).

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لەسەر بێ) دەگێڕێتـەوە: حـەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: نیشـانەی پیـاوی ناپـاك ئـەم سـێ ڕەوشـتەیە:لـەکاتی قسـەکردنندا درۆ بکـا، لـەکاتی

---

١ بوخاری (٢٣٩، موسلیم (٥٩).

پەیمان دانا بشکێنێو نەیباتە سەرو بێ پەیمان بێ و وەعدو بەڵێن نەباتە سەرو سەرچەوت بێ، ڕەوشتی سێیەم ئەوەیە: گزی و دەسپیسی لە سپاردە دەکاو ناخونەك لەئامانەت دەدا! (ش) لە گێڕانەوەیەکدا: با بەڕۆژوویش بێو نوێژیش بکاو خۆیشی بە موسوڵمان بزانێ!.

٢/٢٠٠-[٢]- وعن حُذيْفَة بن الْيمان، رضي اللَّه عنه، قال: حدثنا رسولُ اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، حَديثَين قَدْ رَأَيْتُ أَحدهُمَا، وَأَنَا أَنْتظرُ الآخَرَ: حدَّثَنا أَنَّ الأَمَانَة نَزلتْ في جَذْرِ قُلُوبِ الرِّجَالِ، ثُمَّ نَزَلَ الْقُرآنُ فَعلموا مِنَ الْقُرْآن، وَعلِمُوا مِنَ السُّنَّةِ، ثُمَّ حَدَّثنا عَنْ رَفْعِ الأَمانَةِ فَقال: «يَنَامُ الرَّجل النَّوْمَةَ فَتُقبضُ الأَمَانَةُ مِنْ قَلْبِهِ، فَيظَلُّ أَثَرُهَا مِثْلَ الْوَكْتِ، ثُمَّ ينامُ النَّوْمَةَ فَتُقبضُ الأَمَانَةُ مِنْ قَلْبِهِ، فَيظَلُّ أَثَرُهَا مِثْل أثرِ الْمَجْلِ، كجَمْرٍ دَحْرجْتَهُ عَلى رِجْلكَ، فَنفطَ فَتَراه مُنْتبراً وَلَيْسَ فِيهِ شَيءٌ» ثُمَّ أَخذَ حَصَاةً فَدَحْرَجهَا عَلَى رِجْلِهِ، فَيُصْبحُ النَّاسُ يَتبايَعونَ، فَلا يَكادُ أَحَدٌ يُؤَدِّي الأَمَانَةَ حَتَّى يُقَالَ: إنَّ في بَنِي فَلان رَجُلاً أَمِيناً، حَتَّى يُقَالَ لِلرجلِ: مَا أَجْلدهُ مَا أَظْرَفهُ، مَا أَعْقلَهُ، وَمَا في قلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَان. وَلَقَدْ أَتَى عَلَيَّ زَمَانٌ وَمَا أُبَالِي أَيُّكُم بايعْتُ، لَئِنْ كَانَ مُسْلماً ليردُنَّهُ عَليَّ دِينُه، ولَئِنْ كَانَ نَصْرانياً أَوْ يَهُوديًّا لَيُردُنَّهُ عَلَيَّ سَاعِيه، وأَمَّا الْيَوْمَ فَما كُنْتُ أُبايُعُ مِنْكمْ إِلاَّ فُلاناً وَفلاناً» متفقٌ عليه.

حوذەیفەی کوڕی یەمان (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەر بێ) دوو فەرمایشتی پێمان فەرموو، یەکێکیانم بەچاوی خۆم دی هاتە دی کە برێتی بوو لە هاتنی سپاردە، وە چاوەنواڕی ئەوی تریشیانم کە بێتە دی کە برێتیە لە نەمانی ئەمانەت، فەرمایشتی یەکەم ئەوەبوو فەرمووی پێمان: ئەمانەت- واتە: سپاردە- کەهاتە خوارەوە لەناخی دڵی پیاو چاکانا ڕەگو ریشەی داکوتاو جێگەی خۆی گرت، بەرە بەرە قورئانیش دەهاتە خوارەوە، ئیتر ئەوانیش بە فێربوونی قورئانو بەزانینی شەریعەت پەروەردەیان کرد. فەرمایشتی دووەم ئەوەبوو باسی نەمانەی ئەمانەتی بۆ کردینو فەرمووی (درودی خوای لەسەر بێ): کاتی ئەمانەت هەڵدەگیرێ بەرەبەرە نامێنێ پیاو دەبێ خەوی لێ دەکەوێو سپاردە لەدڵی وەردەگیرێتەوە بەرەبەرە شوێنەکەشی لەناو دڵا کوێر دەبێتەوە!

---

٢ بوخاری (٦٤٩٧)، موسلیم (١٤٣).

یەکەم جار شوێنەکەی وەك نیتکەیەکی ڕەش دەمێنێتەوە، دووەم جار کە خەوی لێ دەکەوێ ئەوەشی ماوە لەدڵیا ئەویش دەڕواو هیچی نامێنێ، ئیتر شوێنەکەی وەك تلۆقی لێ دێ، نووری ئەمانەت لەدڵ باردەکا وەك ئەو پشکۆیە وایە کە بینێیت بە قاچی خۆتاو هەڵتۆقێ، سەیر دەکەی بلۆق دەکاو بلۆقەکەو شوێن بلۆقەکە تا ماوەیێ دەمێنێ بەڵام پشکۆکە نەماوەو سکەڵەکە دیار نییە، ئەمانەتیش کەباری کرد ئاوایە، ئەوجا بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستەکە چەوێکی هەڵگرتو تلانیەوە بەسەر قاچی خۆیا. فەرمووی: جاوای لێ دێ خەڵك مامەڵەو سەودا لەگەڵ یەکتری دەکەن، بەڵام خەریك دەبێ کە کەس ئەمانەت بەجێ نەهێنێ تاوای لێ دێ پیاوی ئەمین و دەستپاك وا کەم دەبێ دەڵێن: لەفیسارە خێڵدا پیاوێکی دەسپاکی ئەمین ماوە! وای لێ دێ دەبێ بە پاشاگەردانی و قسەو گوتاریان بایەخی نامێنێ، پیاوی وا پەیدا دەبێ سەنگی دەنکە خەرتەلەیێ چییە، باوەڕو ئیمان لەدڵیا نییە، کەچی پێی دەڵێن: ئای لەم شاپیاوە، چەندە ئازایە، یا چەندە سالارو ناسك و نازدارە، یا چەندە ژیرو هۆشیارە.

حوزەیفە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: ئەو سەردەمە نەماوە کە من دەربەست نەبووم کە لەگەڵ هەرکامێکتانا مامەڵەو سەودام بکردایە ترسم نەبوایە، چونکە مامەڵە کەرەکە، ئەگەر خۆی موسوڵمان بوایە، ئایین و دینەکەی نەیدەهێشت کە گزی و ناپاکیم لێ بکا، خۆ ئەگەر گاورو جولەکەش بوایە سەرکارەکەی سەری نەیدەهێشت کە گزی و ناپاکیم لێ بکا!

وەلێ ئەمڕۆکە مەگەر لەگەڵ فیسارەکەس و ئەو فیسارەکەسا بتوانم مامەڵەو سەودا بکەم و لێیان دڵنیابم! (ش).

٢٠١/٣ –[٣]– وعن حُذَيْفَةَ، وَأَبي هريرة، رضي اللّٰه عنهما، قالا: قال رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «يَجْمعُ اللّٰه، تَبارك وَتَعَالَى، النَّاسَ فَيَقُومُ الْمُؤمِنُونَ حَتَّى تَزْلفَ لَهُمُ الْجَنَّةُ، فَيَأْتُونَ آدَمَ صلواتُ اللّٰه عَلَيْهِ، فَيَقُولُون: يَا أَبَانَا اسْتَفْتِحْ لَنَا الْجَنَّةَ، فَيقُولُ: وهَلْ أَخْرجكُمْ مِنْ الْجنَّةِ إلاَّ خَطِيئَةُ أَبِيكُمْ، لَسْتُ بصاحبِ ذَلِكَ، اذْهَبُوا إِلَى ابْنِي إبْراهِيمَ خَلِيل اللّٰه، قَالَ: فَيأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ، فيقُولُ إبْرَاهِيمُ: لَسْتُ بصَاحِبِ ذَلِك إِنَّمَا كُنْتُ خَلِيلاً مِنْ وَرَاءَ

---

٣ موسلیم (١٩٥).

وراءَ، اعْمَدُوا إِلَى مُوسَى الذي كَلَّمهُ اللّٰه تَكْلِيماً، فَيَأْتُونَ مُوسَى، فيقُولُ: لسْتُ بِصَاحِب ذلكَ، اذْهَبُوا إِلَى عِيسى كَلِمَةِ اللّٰه ورُوحِهِ فَيقُولُ عيسَى: لَسْتُ بِصَاحِبِ ذلكَ. فَيأْتُونَ مُحَمَّداً صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، فَيَقُومُ فَيُؤْذَنُ لَهُ، وَتُرْسَلُ الأَمانَةُ والرَّحِمُ فَيَقُومَان جَنْبَتَي الصراطِ يَمِيناً وشِمالاً، فيَمُرُّ أَوَّلُكُمْ كَالْبَرْق) قُلْتُ: بأَبِي وَأُمِّي، أَيُّ شَيءٍ كَمَرِّ الْبَرْق ؟ قال: (أَلَمْ تَروْا كَيْفَ يَمُرُّ ويَرْجعُ فِي طَرْفَةِ عَيْنٍ ؟ ثُمَّ كَمَرِّ الريحِ ثُمَّ كَمرِّ الطَّيْرِ ؟ وَأَشَدُّ الرِّجالِ تَجْرِي بِهمْ أَعْمَالُهُمْ، ونَبِيُّكُمْ قَائِمٌ عَلَى الصرّاطِ يَقُولُ: رَبِّ سَلِّمْ، حَتَّى تَعْجِزَ أَعْمَالُ الْعِبَادِ، حَتَّى يَجِئَ الرَّجُلُ لا يَسْتَطِيعُ السَّيْرَ إلاّ زَحْفاً، وفِي حافَتَي الصرّاطِ كَلالِيبُ مُعَلَّقَةٌ مَأْمُورَةٌ بأَخْذِ مَنْ أُمِرَتْ بِهِ، فَمَخْدُوشٌ نَاجٍ وَمُكَرْدَسٌ في النَّارِ) وَالَّذِي نَفْسُ أَبِي هُرَيْرَةَ بِيَدِهِ إِنَّ قَعْرَ جَهنَّم لَسبْعُونَ خَرِيفاً. رواه مسلم.

**حوذیفەو ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) **فەرموویان: پێغەمبەری خوا** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: خودای پیرۆزو گەورە لە رۆژی قیامەتا، لەدەشتی مەحشەردا، مەردووم هەموو کۆدەکاتەوە، ئەوجا موسوڵمان‌و بڕوادارەکان دەنوارن بەهەشت ئامادە کراوە بۆیان‌و هاکا چوونە ناوی، جا بەم بۆنەیەوە دەچن بۆ خزمەتی بابە ئادەم‌و عەرزی دەکەن (سەلامی خوای لەسەر بێ): ئەی باوە! بفەرموو خۆت دەرگای بەهەشتمان بۆ بکەرەوە. ئەویش دەفەرموێ: ئەوەی کە ئێوەی لە بەهەشت دەرکرد چی بوو جگە لە گوناهی باوکتان! کەواتە ئەوە بەمن ناکرێ، بڕۆن بۆلای ئیبراهیمی کوڕم کە دۆستی خودایە، فەرمووی: کەدەچنە لای ئیبراهیم دەفەرموێ: ئەوە لەکوێ‌و من لەکوێ، ڕاستە کەمن دۆستی خودام، وەلێ ئەوە بەمن ناکرێ، بچن بۆلای مووسا، کە خودا خۆی گفت‌و گۆی لەگەڵ کردووە، کە دەچن بۆلای مووسا دەفەرموێ: ئەمە لە وزەی منا نییە، بڕۆن بۆلای عیسا، کە پێغەمبەری خودایە‌و بە فەرموودەی خودا لەمەریەم بووە بە بێ باب‌و رەحمەتێکە‌و خودا ناردوویەتی، عیسایش دەفەرموێ: ئەمە بەمن ناکرێ، ئیتر دەچن بۆلای موحەممەد** (درودی خوای لەسەر بێ) **ئیتر حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **هەڵ دەستێ‌و خودا ڕێگەی ئەوەی پێ دەدا، بەڵام سپاردەو خزمایەتی: (ئەمانەت‌و رەحم) لەراست‌و چەپی پردی سیراتەوە رادەوەستن. ئەوجا کە من دەرگای بەهەشت دەکەمەوە بۆ بەهەشتییەکان یەکەمەکەتان بەسەر پشتی پردی صیراطدا وەك برووسکە تێپەڕ دەکاو دەپەڕێتەوە، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! باوك‌و دایکم بە قوربانت بن**

وەك بروسكە چۆنە؟؟ فەرمووی: برووسکەتان نەبینیوە کە چۆن بەچاو تروووکاندنێ دێتو دەڕواو ون دەبێتەوە، ئاوا، فەرمووی: ئینجا هی وا هەیە وەك با تێپەڕ دەکا، هی واش هەیە وەك مەل تێپەڕ دەبێ، ئەو پیاوە زۆر خێرایەو زۆر باش رادەکا کە کردەوەی خۆی غاری دەدا، لەم کاتەدا پێغەمبەری ئێوە لەسەر پردی صیراط ڕاوەستاوە، دەڵێ: خودایە! بەخۆشیو بەبێ وەی، تا بەرەبەرە کردەوە کوڵ دەداو پیاوانی وا دێن کە کردەوەکانیان نایان پەڕێننەوە! تاوای لێ دێ گەلێ کەس بە گاگۆڵکێو چنگە کرێو سکە خشکێ بەسەریدا دەڕۆن، لەهەمان کاتدا لەم بەرو لەوبەری پردی صیراتیشەوە قولاپ هەڵواسراون، ناوبەناو لەسەر فەرمانی خودا هەندێ کەسی تاوانبار دەگرنو گلی دەدەنەوە، هی واهەیە بە ڕوشاوی قوتاری دەبێ لە چنگیان، زۆریش دەسەپێن بەسەریەکاو دەیان ترنجێننە ناو دۆزەخەوە!. بەو کەسە کە گیانی ئەبو هورەیرەی بەدەسە: لە لێواری دۆزەخەوە هەتا بنی حەفتا ساڵە ڕێگەیە (موسلیم).

٢٠٢/٤-[٤]- وعن أَبي خُبَيْبٍ بضم الخاءِ المعجمة عبد اللَّهِ بن الزُّبَيْر، رضي اللَّه عنهما قال: لَمَّا وَقَفَ الزبَيْرُ يَوْمَ الْجمَلِ دَعانِي فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ، فَقَالَ: يَا بُنَيَّ إِنَّهُ لا يُقْتَلُ الْيَوْمَ إِلاَّ ظَالِمٌ أَوْ مَظْلُومٌ، وإِنِّي لأُرَنِي إِلاَّ سأُقْتَلُ الْيومَ مَظْلُوماً، وَإِنَّ مِنْ أَكْبرِ هَمِّي لَدِيْنِي أَفْتَرى دَيْنَنَا يُبْقِي مِنْ مالنا شَيْئاً ؟ ثُمَّ قَالَ: بِعْ مَالَنَا واقْضِ دَيْنِي، وَأَوْصَى بالثُّلُثِ، وَثُلُثِهُ لبنيه، يَعْنِي لبَنِي عَبْدِ اللَّه بن الزبير ثُلُثُ الثُّلُث. قَالَ: فَإِن فَضلَ مِنْ مالِنَا بعْدَ قَضَاءِ الدَّيْنِ شَيءٌ فَثُلُثُهُ لِبَنِيك، قَالَ هِشَامٌ: وكان وَلَدُ عَبْدِ اللَّهِ قَدْ وَرأى بَعْضَ بَنِي الزبَيْر خُبيبٍ وَعَبَّادٍ، وَلَهُ يَوْمَئذٍ تَسْعَةُ بَنِينَ وتِسعُ بَنَاتٍ. قَالَ عَبْدُ اللَّه: فَجَعَلَ يُوصِينِي بدَيْنِهِ وَيَقُول: يَا بُنَيَّ إِنْ عَجزْتَ عنْ شَيءٍ مِنْهُ فَاسْتَعِنْ عَلَيْهِ بمَوْلايَ. قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا دَرَيْتُ ما أَرادَ حَتَّى قُلْتُ يَا أَبتِ مَنْ مَوْلاكَ ؟ قَالَ: اللَّه. قال: فَواللَّهِ مَا وَقَعْتُ في كُرْبَةٍ مِنْ دَيْنِهِ إِلاَّ قُلْتُ: يَا مَوْلَى الزبَيْرِ اقْضِ عَنْهُ دَيْنَهُ، فَيَقْضِيَهُ. قَالَ: فَقُتِلَ الزُّبَيْرُ وَلَمْ يَدَعْ دِينَاراً وَلاَ دِرْهَماً إِلاَّ أَرَضِينَ، مِنْهَا الْغَابَةُ وَإِحْدَى عَشَرَةَ داراً بالْمَدِينَةِ. ودارَيْن بالْبَصْرَةِ، وَدَاراً بالْكُوفَةِ وَدَاراً بِمِصْرَ. قال: وَإِنَّمَا كَانَ دَيْنُهُ الذي كَانَ عَلَيْهِ أَنَّ الرَّجُلَ يَأْتِيهِ بالمال، فَيَسْتَودِعُهُ إِيَّاهُ، فَيَقُولُ الزُّبَيْرُ: لا وَلَكِنْ هُوَ سَلَفٌ إِنِّي أَخْشَى عَلَيْهِ الضَّيْعةَ. وَمَا وَلِي إِمَارَةً قَطٌّ وَلا جِبَايَةً ولا خَراجاً ولا

---

٤ بوخاری (٣١٢٩).

شَيْئاً إلاَّ أَنْ يَكُونَ في غَزْوٍ مَعَ رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، أَوْ مَعَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ رضي اللّٰه عنهم، قَالَ عَبْدُ اللّٰه: فَحَسَبْتُ مَا كَانَ عَلَيْهِ مِنَ الدَّيْنِ فَوَجَدْتُهُ أَلْفَيْ أَلْفٍ وَمائَتَيْ أَلْفٍ، فَلَقِيَ حَكِيمُ بْنُ حِزَام عَبدَ اللّٰهِ بن الزُّبَيْرِ فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي كَمْ عَلَى أَخِي مِنَ الدَّيْنِ ؟ فَكَتَمْتُهُ وَقُلْتُ: مِائَةُ أَلْفٍ. فَقَالَ: حَكِيمٌ: وَاللّٰه مَا أَرى أَمْوَالَكُمْ تَسَعُ هَذِهِ، فَقَالَ عَبْدُ اللّٰهِ: أَرَأَيْتكَ إنْ كَانَتْ أَلْفَي أَلْفٍ ؟ وَمِائَتَيْ أَلْفٍ ؟ قَالَ: مَا أَرَاكُمْ تُطِيقُونَ هَذَا، فَإنْ عَجَزْتُمْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ فَاسْتَعِينُوا بِي. قَالَ: وكَانَ الزُّبَيْرُ قدِ اشْتَرَى الْغَابَةَ بِسَبْعِينَ ومِائَة أَلْف، فَبَاعَهَا عَبْدُ اللّٰهِ بِأَلف أَلفٍ وسِتِّمِائَةِ أَلْفَ، ثُمَّ قَامَ فَقَالَ: مَنْ كَانَ لَهُ عَلَى الزُّبَيْرِ شَيْءٍ فَلْيُوافِنَا بِالْغَابَةِ، فَأَتَاهُ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ جعفرٍ، وكَانَ لَهُ عَلَى الزُّبَيْرِ أَرْبعُمِائَةِ أَلْفٍ، فَقَالَ لعَبْدِ اللّٰه: إنْ شِئْتُمْ تَرَكْتُهَا لَكُمْ ؟ قَالَ عَبْدُ اللّٰه: لا، قال فَإنْ شِئْتُمْ جعلْتُمُوهَا فِيمَا تُؤخِّرُونَ إنْ أَخَّرْتُمْ، فقال عَبْدُ اللّٰه: لا، قال: فَاقْطَعُوا لِي قِطْعَةً، قال عَبْدُ اللّٰه: لَكَ مِنْ هاهُنا إِلَى هاهُنَا. فَبَاعَ عَبْدُ اللّٰهِ مِنْهَا فَقَضَى عَنْهُ دَيْنَه، وَوَفَّاهُ وَبَقِيَ مِنْهَا أَرْبَعَةُ أَسْهُمٍ وَنِصْفٌ، فَقَدم عَلَى مُعَاوِيَةَ وَعِنْدَهُ عَمْرُو بْنُ عُثْمَانَ، وَالْمُنْذِرُ بْنُ الزُّبَيْرِ، وَابْن زَمْعَةَ. فقال لَهُ مُعَاوِيَةُ: كَمْ قَوَّمَتِ الْغَابَةُ ؟ قال: كُلُّ سَهْمٍ بِمائَةِ أَلْفٍ قال: كَمْ بَقِيَ مِنْهَا ؟ قال: أَرْبَعَةُ أَسْهُمٍ ونِصْفٌ، فقال الْمُنْذِرُ بْنُ الزَّبَيْرِ: قَدْ أَخَذْتُ مِنْهَا سَهْماً بِمائَةِ أَلْفٍ، وقال عَمْرُو بنُ عُثْمانَ: قَدْ أَخَذْتُ مِنْهَا سَهْماً بِمائَةِ أَلْفٍ. وقال ابْن زمْعَةَ: قَدْ أَخَذْتُ مِنها سَهْماً بِمائَةِ أَلْفٍ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: كَمْ بَقِيَ مِنْهَا؟ قال: سَهْمٌ ونصْفُ سَهْمٍ، قَالَ: قَدْ أَخَذْتُهُ بِخَمسينَ ومائَةِ ألف. قَالَ: وبَاعَ عَبْدُ اللّٰه بْنُ جَعْفَرٍ نصِيبَهُ مِنْ مُعَاوِيَةَ بسِتِّمِائَةِ أَلْفٍ. فَلَمَّا فَرغَ ابنُ الزُّبَيْرِ مِنْ قَضاءِ دَيْنِهِ قَالَ بَنُو الزُّبَيْرِ: اقْسِمْ بَيْنَنا مِيراثَنَا. قَالَ: وَاللّٰهِ لا أَقْسِمُ بيْنَكُمْ حَتَّى أُنَادِيَ بالموسم أَرْبَع سِنِين: أَلا مَنْ كان لَهُ عَلَى الزُّبَيْرِ دَيْنٌ فَلْيَأْتِنَا فَلْنَقْضِهِ. فَجعَلَ كُلَّ سَنَةٍ يُنَادِي في الْمَوسمِ، فَلَمَّا مَضى أَرْبَعُ سِنِينَ قَسم بَيْنَهُمْ ودَفَعَ الثُلث وكَان للزُّبَيْرِ أَرْبَعُ نِسْوَةٍ، فَأَصاب كُلَّ امْرَأَةٍ أَلْفُ أَلْفٍ ومِائَتَا أَلْفٍ، فَجَمِيعُ مَالِهِ خَمْسُونَ أَلْف أَلْفٍ ومِائَتَا أَلْف. رواه البخاري.

**عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر** (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) **فەرمووی: لەڕۆژی ڕووداوی جەنگی حەربولجەمەلا، کە لەنێوانی حەزرەتی عائیشەو ئیمامی عەلیدا ڕوویدا، کە باوکم لەڕیزی لەشکری عائیشە بوو، بانگی کردم، چووم لەلایا ڕاوەستام، فەرمووی: کوڕی شیرینم! هەرکەسێ لەم ڕۆژەدا بکوژرێ یەکێکە لەم دووانە: یاستەمکارە، یاستەمبارە، وەلێ من بەزەینی خۆم لەم شەڕەدا بەستەمباری دەکوژرێم، بەڵام**

ئەوەی كە زۆر بەتەنگیەوە هەم ئەو قەرزانەیە كەوان لەسەرم، ئایا دەبێ بە زەینی تۆ شتێكمان بۆ بمێنێتەوە لە ماڵەكانمان، یا هەمووی قەرز دەیبات؟ لە پاشا فەرمووی: رۆڵەی خۆشەویسستم! ماڵەكەمان بفرۆشەو قەرزەكەی سەر منی پێ بدەرەوە، ڕایسپارد كە سێیەكی ماڵەكەی بۆ خێر بێ، وەلەو سێ یەكە خێرە سێیەكێكی بۆ كوڕەكانی عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیر بێ هیشامی كوڕی عوروە فەرمووی: بەشی خوبەیبو عەبباد، كە كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیر بوون، لەو سێیەكی سێیەكە خێرە بەقەد بەشی بازێ لە كوڕەكانی زوبەیر خۆی بوو. فەرمووی: ئەو رۆژە زوبەیر (ڕەزای خودای لەسەر بێ) نۆ كوڕو نۆ كچی هەبوو، عەبدوڵڵا فەرمووی: ئیتر باوكم هەر ئامۆژگاری دەكردم لەبارەی قەرزەكەی سەریەوە، فەرمووی: كوڕی خۆم! ئەگەر بۆ شتێك دامای، داوای یارمەتی لە گەورەی خۆم بكەو هاوار بۆ ئەو بەرە، گوتی: دەسا بەخودا نەمزانی مەبەستی بە گەورەكەی كێیە، هەتا گوتم: بابەگیان! گەورەكەت كێیە؟ فەرمووی: گەورەی من خودایە، دەی بەزاتی خودا لەوەو دوا هەرچەند بەهۆی قەرزەكەیەوە تووشی مەینەتیو سەخڵەتی دەبووم كە دەمگوت: ئەی گەورەی زوبەیر! هاوار قەرزەكەی بۆ بدەرەوە، گورج خودا قەرزەكەی بۆ جێبەجێ دەكرد. فەرمووی: كاتێكیش زوبەیر كوژرا، نە زێڕی هەبوو نە زیو، بەڵام چەند پارچە زەوییەكی لەپاش بەجێ مابوو، كە یەكێكیان باخە خورماكەی بوو كە لە ئەل-غابە بوو، یازدە خانووشی لەمەدینە هەبوو، خانوویەكی لە بەصرە هەبوو، خانوویەكی لە كووفە هەبوو، خانوویەكی تری لە میصر هەبوو. عەبدوڵڵا فەرمووی: ئەو ئەو قەرزەی كە لەسەر زوبەیر بوو هی ئەوە بوو، خەڵك ماڵیان دەهێنایە لای بەئەمانەت، باوكیشم دەیفەرموو: ئەمانەت قەبووڵ ناكەم دەترسم لەناو بچێ، بەڵام بەقەرز وەری دەگرم، زوبەیر (ڕەزای خودای لەسەر بێ) نە ئاغای خاوەن دێهاتی بوو، نە باجو مەكاتی دەسەند، نە هیچی تری لەم بابەتە هەبوو ئەوەندە هەبوو لە خزمەتی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێ) یا لە خزمەتی ئەبو بەكردا (ڕەزای خودای لەسەر بێ)، یا لەخزمەتی عومەردا (ڕەزای خودای لەسەر بێ)، یا عوثمان (ڕەزای خودای لەسەر بێ)، دەچوو بۆ غەزا، بۆیە خودا بەرەكەتی خستبووە ناو ماڵو منالی، عەبدوڵڵا (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: قەرزەكەیم حلێب كرد: دوو ملیۆنو دووسەد هەزار درەم بوو! فەرمووی: جارێ حەكیمی كوڕی حیزامم پێ گەیشت،

فەرمووی: ئەی برازای خۆم قەرزی سەر براکەم چەندە، واتە: باوکت چەندە قەرزارە، منیش راستیم پێ نەگوت، گوتم: سەد هەزار درەمە، حەکیم فەرمووی: بەخودا بە زەینم ماڵەکەتان بەشی ئەوە ناکا، منیش گوتم: باشە ئەگەر دوو ملیۆنو دووسەد هەزار بێ دەڵێی چی؟ فەرمووی: وادەزانم وزەی دانەوەی ئەوەتان نییە، ئەگەر بۆتان نەدرایەوە من یارمەتیتان دەدەم ئاگادارم بکەرەوە، عوروە (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتی خۆی زوبەیر زەویو زارەکەی ئەلغابەی بەسەدو حەفتا هەزار درەم کڕیبوو، بەڵام عەبدوڵڵا فرۆشتیەوە بە ملیۆنیكو شەش سەد هەزار درەم، لەدواییدا عەبدوڵڵا جاڕی داو فەرمووی: هەرکەسێ هەقێکی لەسەر زوبەیر هەیە با لەغابە بێتە لای خۆم هەتا بیدەمەوە.

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر (رەزای خودایان لەسەر بێ) چوار سەد هەزار درەمی لەسەر زوبەیر بوو، لە غابە چووە لای عەبدوڵڵا، فەرمووی: ئەگەر حەز دەکەن دەست لەقەرزەکەم هەڵدەگرم بۆ خۆتان بێ!

عەبدوڵڵا وەڵامی دایەوە: خەیر، دەیدەینەوە، فەرمووی: ئەگەر قەرزەکە هەمووی نادەنەوە هەندێکی دوا دەخەن ئەوە من پەلەم نییە کەی دەمدەنەوە کەیفی خۆتانە. عەبدوڵڵا فەرمووی: نەء هیچی دوا ناخەین! فەرمووی: کەوابوو پارچەیەکم لە غابە بۆ بڕ بدەن، عەبدوڵڵا فەرمووی: باشە، لەوێوە تا ئەوێ بۆ تۆ بێ، عوروە دەڵێ: ئەو پارچەی لە غابە پێ فرۆشتو دایە دەستیو قەرزەکەی بەتەواوی دایەوە!

لە غابە هێشتا چوار پشكو نیو مایەوە، عەبدوڵڵا چوو بۆلای موعاویە، عەمری کوڕی عوسمانو مونذیری کوڕی زوبەیرو عەبدوڵڵای کوڕی زەمعە لەلای موعاویە بوون (رەزای خودایان لەسەر بێ) موعاویە پێی گوت: غابەتان بەچەندە نرخ بڕی؟ فەرمووی: هەر پشکێکی بە سەد هەزار درەم، گوتی: چەند پشکی ماوە؟ فەرمووی: چوار پشكو نیوی ماوە، مونذیری کوڕی زوبەیر فەرمووی: وا پشکێکم بەسەد هەزار وەرگرت، عەمری کوڕی عوسمان گوتی: منیش پشکێکم بە سەد هەزار درەم وەرگرت، عەبدوڵڵای کوڕە زەمعە گوتی: منیش پشکێکم بە سەد هەزار درەم وەرگرت، موعاویە گوتی: منیش ئەوەم بە سەدو پەنجا هەزار درەم وەرگرت.

عوروه فەرمووی: جا عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر بەشەکەی خۆیی بە موعاویە فرۆشت بە شەش سەد هەزار درەم. کە ئیبن‌و زوبەیر (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لە قەرزدانەوە بووەوە کوڕانی زوبەیر عەرزیان کرد: ئیتر کەلەپورەکەمان بەسەردا دابەش بکە. فەرمووی: نەبەخودا ئێشتا بەشی ناکەم، تا چوار ساڵ لەکاتی حەج کردندا جاڕ نەدەم کە کێ قەرزی بەسەر زوبەیرەوە هەیە بابێ، هەتا بیدەمەوە پێی ئەم کەلەپورە دابەش ناکەم لەناو خۆمانا، چوار ساڵ لەکاتی حەجا بەو شێوەیە جاڕی دا، جا کە بەتەواوی قەرزەکەی هەموو دایەوە ئەوسا سێیەکە خێرەکەشی لەماڵ جیاکردەوە، ئیتر باقی مەندەی ماڵەکەی دابەش کرد بەسەر ژنەکانی زوبەیرو منالەکانی دا، زوبەیر چوار ژنی لەپاش بەجێ مابوو، هەر ژنەی یەك ملیۆنی بەرکەوت وە بەم پێیە سەرجەمی ماڵی زوبەیر پەنجا ملیۆن‌و دووسەد هەزار درەم بوو. (بوخاری).[1]

١ وا دەزانم جەنابی مامۆستا مەلا رەشید بەگی بەابان-رەحمەتی خودای لێ بێ- ئەویش وەك بەندە، لەبەر دۆخی تایبەتی، کە دابڕاوە لە کۆڕو مەجلیسی عیلمی مامۆستاو مەلاو حوجرەی فەقێیان، کتێبەکانی فەوتاوە، وە لە حەلکردنی هەندێ مەسئەلەی خۆمانەدا ئیعتمادی گەورەی لەسەر زەین‌و حافیظە و یادی خۆی بووە، بەڵام ئەو- بەپێچەوانەی منەوە- لەبەرئەوەی کە زۆر زیرەك‌و بلیمەت بووەو زەینیشی زۆر ڕۆشن بووە، زوربەی قەواعیدو یاساو مەسئەلەکانی لەیاد ماوە، هەرچەندە لەحاڵی وادا کەم وادەبێ کە مرۆڤ، کەم یازۆر، تووشی هەڵە نەبێ لەهەمان کاتدا ئەو زاتە بەزیرەکی خۆی پێشبینی ئەوەی کردووە کە کاتی ئەوە هاتووە کە مامۆستا ئایینییەکانیش ئاوڕێ لەبارو دۆخی خۆیان بدەنەوەو اعادە نەظەرێ بکەنەوە، وە لە گەلێ شوێندا لە ضیمندا ئەمەی نیشان داوە، چونکە خۆ سازدان لەگەڵ زەمان‌و ئەهل‌و وەزعی زەماناو سوودو بەهرە وەرگرتن لە ڕەوڕەوەی پێشکەوتن‌و گەشەکردن، بۆ سوودی دین‌و دنیا شتێکی گەلێ جوانە.

جا بۆیە مامۆستای بابان (خوای لێ رازی بێ) لێرەدا ئەم مەسەلەیەی لەسەر ڕێبازێکی نیوە نوێ لەسەر ئەم شێوەیە حەل کردووە کە لە (مجمع البحرین)ە کەیدا دەفەرموێ: (تەصحیحی مەسئەلەی میراثییە: ٧٧٧٦:ثلث/٢٥٩٢، ثلث الثلث/٨٦٤، أربع نسوة لكل منها/٢٤٣، البنات لكل منها/١٢٤، والبنون لكل منهم/٢٤٨. مسألة/٧٧٧٦ تەماشای مەجمەعولبەحرەین بکە، بەرگی چوارەم لاپەڕە (٢٧٦).

ئەمەش لەخوارەوە تەفصیلی ئەم حەلەی مامۆستا بابانە:

واتە: ئەم مەسەلەیە لەپاش دانەوەی قەرزەکە چل‌و هەشت ملیۆن درەمی دەمێنێتەوە، سێیەك‌و سێیەکی سێیەك‌و هەشت یەك‌و چواریەکی هەشت یەکی تێدایە، عەصەبە (باوان)ەکانیش ژمارەی سەریان نۆ کوڕو نۆ کچن، بەپێی زانەستی کەلەپوور مەخرەجی سێ‌و سێیەك نۆیە، مەخرەجی هەشت‌و چواریەکی هەشت یەك سی‌و دووە. نۆ کوڕەکەش دەکەنە ١٨ سەر. کەواتە: ٩کچ+١٨=٢٧- ژمارەی

سەری عەصەبەكان، كەواتە: ٩×٣٢×٢٧= ٣\٧٧٧٦= ٢٥٩٢ سێیەك (خێر). ٩\٧٧٧٦=٨٦٤ سێیەكی سێیەك (بۆ كوڕانەی عەبدوڵلا). ٣٢\٧٧٧٦=٢٤٣ چورایەكی هەشتیەك بۆ هەر ژنێ لە چوار ژنەكەی زوبەیر. ٢٤٣× ٤=٩٧٢ هەشتیەك.

دیارە بەپێی زانستی كەلەپوور بەشكردن لە پێشدا بەشی خاوەن پشكەكانی لێ جیادەكرێتەوەو چەند پشك لەوان مایەوە دابەش دەكرێ بەسەر عەصەبەكاندا، بەر لەم عەمەلییاتو كردارمیش قەرزو وەصیەتو خێر لە ئەصلی ماڵەكە دەردەكرێ، كەواتە ئەم میراتی زوبەیرە ئاوا بەش دەكرێ، پاش ئەوەی دوو ملیۆنو دووسەد هەزار درەم لەسەرجەمی ماڵەكەی دەردەكرێ، باقی مەندەی پەنجا ملیۆنو دووسەد هەزارەكە ئاوا دابەش دەكرێ:

١- ٤٨٠٠٠٠٠٠\٧٧٧٦×٢٥٩٢=١٦٠٠٠٠٠٠ ملیۆن درەم بەشی وەصیەت جیادەكرێتەوەو دەمێنێتەوە: ٣٢٠٠٠٠٠٠ ملیۆن

٢- ٤٨٠٠٠٠٠٠\٧٧٧٦×٨٦٤=٥٣٣٣٣٣٣ ملیۆن درەم سێیەكی سێیەك (بۆ كوڕانی عەبدوڵلا) ئەمە لە سێیەكە خێرەكە دەردەكرێ، چونكە مامۆستای بابان لەدەقی ئەثەرە عەرەبییەكەدا، نەك لە تەرجەمە كوردیەكەدا تەئیدی ئەوە دەكا كە سێیەكە خێرەكە بكرێ بە سێ بەشەوە، بەشێكی بۆ كوڕانی عەبدوڵلا و دووبەشەكەی تری بۆ خێری رووت. بەڵام لێرەدا مامۆستا ئەم نۆیەكەشی هەر لە ئەصلی ماڵەكە دەركردووە نەك لە سێیەكەكە. لەلاپەڕە (٢٧٠)یشدا ئەم نۆیەكە هەر لە ڕەئسولمالەكە دەردەكا دەگونجێ مەبەستی مامۆستای مەزن ئەوە بێ كە بەم شێوەیەش وەصییەتەكە دادەمەزرێ. وەلێ ئێمە بۆ ئەوەی مەسەلەكە لە خوێنەری ئازیز نەئاڵۆسكێ وەك حەلەكەی خۆی حەلی دەكەین.

٣- ٣٢٠٠٠٠٠٠\٧٧٧٦× ٩٧٢\٤= ١٠٠٠٠٠٠ ملیۆن درەم= چواریەكی هەشتیەك= پشكی هەریەكێ لە چوار ژنەكەی زوبەیر.

لە ئەصلی ماڵەكە ٢٨٠٠٠٠٠٠ بیستو هەشت ملیۆن درەم دەمێنێتەوە بۆ نۆ كوڕو نۆ كچ ئەمە لەحاڵێكا وەایە كە سێیەكی سێیەك لەئەصلی ماڵەكە دەرنەكەین، دەنا ئەوە پشكی ژنو منالەكان كەمتر دەكا.جا ئەم (٢٨) ملیۆنە دابەش دەكەین بەسەر كوڕو كچەكاندا، كوڕەكان یەكی دوو ملیۆنو كچەكان یەكی ملیۆنێكیان پێ دەبرێ، ملیۆنێك دەمێنێتەوە ئەویش بەهەمان یاسا لێیان دابەش دەكرێتەوە.

٤- بەڵام مامۆستا مەسەلەكەی ئاوا حەل كردووە: لە پێشدا ئەم پشكانە جیا دەكاتەوەو چەند پشك لەمان مایەوە دابەشی دەكا بەسەر عەصەبەكاندا. كەواتە:

٢٥٩٢+٨٦٤+ ٩٧٢= ٤٤٢٨ كەواتە:

٧٧٧٦- ٤٤٢٨= ٢٧\٣٣٤٨= ١٢٤ پشكی هەر كچێ.

١٢٤× ٢= ٢٤٨ بەشی هەر كوڕێ. كەواتە:

١٦٠٠٠٠٠٠+ ٥٣٣٣٣٣٣+ ٤٠٠٠٠٠٠= ٢٥٣٣٣٣٣٣ درەم كەواتە:

٤٨٠٠٠٠٠٠- ٢٥٣٣٣٣٣٣=٢٢٦٦٦٦٦٦، كەواتە:

٢٢٦٦٦٦٦٦\٣٣٤٨× ٢٤٨= ١٦٧٩٠١٢ درەم پشكی یەك كوڕ.

تێبینی: كەسری دیرهەمم لە پشكەكاندا ئیهمال كردووە. وەكی دیكەیش:

## ٢٦- زۆرو ستەمو نارەوایە، دانەوەی نارەواییەکان
## باب تحريم الظلم والأمر برد المظالم

قال الله تعالى: ﴿وما للظالمين من حميم ولا شفيع يطاع﴾غافر/١٨.

واتە: لە رۆژی قیامەتا، کە دڵ لەبەر ترس، وابەرزەوە دەبێ خەریکە بگاتە بینو بەخەمو خەفەت خنراوە، ستەمکارەکان لەو رۆژەی تەنگانەو لێقەومانەدا نە دۆستێ، نە خۆشەویستێ، نە تکاکارێ کە سوودی هەبێ نییانە.

وقال تعالى: ﴿وما للظالمين من نصير﴾الحج/٧١.

بڕوانە فەرموودەی ژمارە: ١١١/١٧.

واتە: لە پیاوی زاڵم بێ کەستر نییە، نە دۆستی هەیە نە یاریدەدەر.

٢٠٣/١-[١]- وعن جابر رضي اللّٰه عنه أن رسولَ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (اتَّقُوا الظُّلْمَ فَإِنَّ الظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيامَةِ، واتَّقُوا الشُّحَّ فَإِنَّ الشُّحَّ أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، حمَلَهُمْ على أَنْ سفَكَوا دِماءَهُمْ واسْتَحلّوا مَحارِمَهُمْ) رواه مسلم.

جابیر (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خۆتان لە زۆرو ستەم بپارێزن، بەڕاستی زۆرو ستەم تەمو تاریکی زۆرنو لە رۆژی قیامەتاو زۆردارەکە دەکەوێتە ناویانو وەك کوێری مزمەعیل بەهیچ لایەکا سەر دەرناکا، هەروەها خۆشتان لە پیسکەییو چرووکی بپارێزن، چونکە چرووکیو پیسکەیی بوون بە هۆی لەناوچوونی میللەتەکانی پێش ئێوە، بەرەبەرە وای لێ کردن حەرام نەزاننو نارەوا بە رەوا دابنێن (م).

٢٠٤/٢-[٢]- وعن أَبِي هريرة رضي اللّٰه عنه أَن رسولَ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (لَتُؤَدُّنَّ الْحُقُوقَ إِلَى أَهْلِهَا يَوْمَ الْقِيامَةِ حَتَّى يُقَادَ للشَّاةِ الْجَلْحَاء مِنَ الشَّاةِ الْقَرْنَاء). رواه مسلم.

---

٢٨٠٠٠٠٠٠\٣٣٤٨× ١٢٤=١٠٣٧٠٣٧ پشکی کچێك

٢٨٠٠٠٠٠٠\٣٣٤٨×٢٤٨= ٢٠٧٤٠٧٤ درەم پشکی کوڕێ

وەرگێڕ
نوری فارس حمەخان

---

١ موسلیم (٢٥٧٨).

٢ موسلیم (٢٥٨٢).

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەتا هەموو خاوەن مافێ مافی خۆی وەردەگرێو مافی کەس لەسەر کەس نامێنێ، تەنانەت تۆڵەی بزنی کۆڵ لە بزنی شاخ دار دەسێنرێ بۆی! (م/تاج).

٢٠٥/٣-[٣]- وعن ابن عمر رضي اللّه عنهما قال: كُنَّا نَتحدَّثُ عَنْ حَجَّةِ الْوَدَاعِ، وَالنبي صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم بَيْن أَظْهُرِنَا، وَلاَ نَدْرِي مَا حَجَّةُ الْوداعِ، حَتَّى حمِدَ اللّه رسول اللّه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ ذَكَر الْمسِيحَ الدَّجَالَ فَأَطْنَبَ فِي ذِكْرِهِ، وَقَالَ: (ما بَعَثَ اللّه مِنْ نَبيّ إلاَّ أَنْذَرَهُ أُمَّتهُ: أَنْذَرَهُ نوحٌ وَالنَّبِيُّون مِنْ بَعْدِهِ، وَإِنَّهُ إنْ يَخرُجْ فِيكُمْ فما خفِيَ عَلَيْكُمْ مِنْ شَأْنِهِ فَلَيْس يَخْفِي عَلَيْكُمْ، إنَّ رَبَّكُمْ لَيس بأَعْورَ، وَإِنَّهُ أَعورُ عَيْنِ الْيُمْنَى، كَأَنَّ عيْنَهُ عِنبةٌ طَافِيَةٌ. ألا إن اللّه حرَّم علَيْكُمْ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوالكُمْ، كَحُرْمَةِ يوْمكُمْ هذا، فِي بلدِكُمْ هذا، فِي شَهْرِكُم هذا ألاَ هل بلَّغْتُ ؟) قَالُوا: نَعَمْ، قال: (اللَّهُمَّ اشْهَدْ ثلاثاً ويْلَكُمْ أَوْ: ويحكُمْ، انظُروا: لا ترْجِعُوا بَعْدِي كُفَّاراً يضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ) رواه البخاري، وروى مسلم بعضه.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) فەرمووی: بەسەرینیی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەناو خۆماندا، باسی حەجی ماڵاواییمان دەکرد، هێشتا بە باشی نەماندەزانی کە حەجی ماڵاوایی چییە، هەتا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ستایش‌و سوپاسی جوانی خودای کرد، لەپاشا بەدوورو درێژی هات بەشانی باسی ججاڵەکوێرەدا، فەرمووی: هەتا ئێستا خودا هەرچی پێغەمبەرێکی لە پێش مندا ڕەوانە کردووە، هەموویان گەلەکانی خۆیان ئاگادار کردۆتەوەو مەترسی ئەم فەرتەنە گەورەیەیان خستوونەتە بەر! لە نووحەوە بیگرە هەتا گشت ئەو پێغەمبەرانەی کە لە دوا ئەوەوە هاتوون یەك بەیەکیان لەفەرتەنەی ئەم بەڵایە هۆشیارکردۆتەوە، دەی هەرکاتی ججاڵ هەڵبستێ لەناوتانا دەیناسن، چونکە ئەوەی لەبارەی ئەوەوە لێتان روون نەبووە ئێستا روون‌و ئاشکرایە وەك ئەوە ئەو لەعنەتییە کوێرە، بەڵام دیارو ئاشکرایە کە خودای ئێوە بینایەو چاوی ساغەو کوت‌و کوێر نییە، وەڵێ ئەو نەعلەتییە چاوی ساغی کوێرە، چاوی دەڵێی دەنکە ترێی قۆقزی زەقی لەبۆڵ دەرپەڕیوە!

---

٣ بوخاری(٤٤٠٢)، موسلیم (٢٩٣٢)(٦٩).

ئاگادار بن كە خوداى گەورە سەرو سامان‌و نامووستانى لەيەكترى قەدەغە كردووە، خوێن‌و سەرو ماڵ‌و نامووسى كەس بۆ كەس حەڵاڵ نییە، وەك چۆن شكاندنى ڕێزى ئەم ڕۆژە پیرۆزەتان كە ڕۆژى نۆمینەى حاجیانە، لەم مانگە پیرۆزەتانا كە مانگى قوربانە، زۆر زۆر نارەواو حەرامە ئاوەها سەرو ماڵ‌و نامووستان لەيەكترى حەرامە ئەوجا حەزرەت (درودى خواى لەسەر بێ) فەرمووى: ئەدى پێم بڵێن ئایا من ئەركى سەرشانى خۆم لەلایەنى ئیسلامەوە بەئێوە ڕاگەیاند یا نا؟. ئێمەیش گوتمان: بەڵێ تۆ بۆ ئەمە كۆتاییت نەكردووە، ئەویش سێ جار لەسەر یەك فەرمووى: دەى خوایە! تۆ بە شایەت بە ئەوجا فەرمووى: خانە خراپینە! یا فەرمووى: هاوار بە ماڵم بۆ ئێوە ورد ببنەوەو كوێرانە مل مەنێن، لەپاش خۆم بامەدەنەوە سەر باى بەرە بۆرو وەك سەردەمى كافرى دەست بكەنەوە بە كوشتارى یەكترى‌و بەشیرو تیر سەرو ملى یەكترى بپەڕێنن! (ب).

٢٠٦/٤-[٤]- وعن عائشة رضي الله عنها أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (( مَنْ ظَلَمَ قِيدَ شِبْرٍ مِنَ الأَرْضِ طُوِّقَهُ منْ سَبْعِ أَرَضِينَ )) متفقٌ عليه.

عائیشە (ڕەزاى خوداى لەسەر بێ) لە حەزرەتەوە (درودى خواى لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەركەسێ بەزۆرو ستەم بستێ زەوى داگیر بكا، لەڕۆژى قیامەتا بەهەر حەوت چینەى زەمینەوە وەك كەڵەمە لەملى گادا ئاوا دەكرێ بە تەوق‌و دەكرێتە ئەستۆى! (ش).

٢٠٧/٥-[٥]- وعن أبي موسى رضي اللّه عنه قال: قال رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (إِنَّ اللّه لَيُمْلِي لِلظَّالِمِ فَإِذَا أَخَذَهُ لَمْ يُفْلِتْهُ، ثُمَّ قَرَأَ: { وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَى وَهِيَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ } .

ئەبو مووسا (ڕەزاى خوداى لەسەر بێ) لە حەزرەتەوە (درودى خواى لەسەر بێ) دەفەرموێ: لەڕاستیدا خودا مۆڵەتى پیاوى زۆردارو ستەمكار دەدات‌و تاماوەیێ جڵەوى بۆ شل دەكا، هەتا بزانێ پەشیمان دەبێتەوە یان نا، بەڵام كاتێ كە قورتمى دەگرێ ئیتر قوتارى نابێ لە چنگى! ئینجا بۆ پشتیوانى ئەم فەرموودەیە حەزرەت (درودى خواى لەسەر بێ) ئەم ئایەتەى خوێندەوە: ﴿وكذالك أخذ ربك إذا أخذ القرى وهي ظلمة إن أخذه اليم شديد﴾

٤ بوخارى (٢٤٥٢)، موسليم (١٦١٢).

٥ بوخارى (٤٦٨٦)، موسليم (٢٥٨٣٩.

هود/١٠٢. ئاوەها وەك چۆن خودا لەپاش مۆڵەت ئەو گەلە ستەم كارانەی كە لە پێشەوە باس كران قورتمی گرتن‌و تەفن‌و تونای كردن لەمەودواش هەروەها لەپاش مۆڵەت‌و ماوەییَ خودای تۆ سزا دەنێریَ‌و قار دەگریَ لەخەڵكی ئەو وڵات‌و دێهاتانە كە زۆرو ستەم پەرە دەستێنیَ لەناویەاندا، دەبن بە زۆردارو ستەم كار، بەڕاستی كاتیَ خودای تۆ قورتمی زاڵم دەگریَ ئێشی پیَ دەگەیەنیَ‌و بڕستی دەبڕیَ (ش).

٢٠٨/٦-[٦]– وعن مُعاذٍ رضي اللّه عنه قال: بعَثَنِي رسولُ اللّـه صَلّى اللّهُ عَلَيْـهِ وسَـلّم فقال: «إنَّكَ تَأْتِي قوْماً مِنْ أَهْلِ الْكِتَاب، فادْعُهُمْ إلَـى شَـهَادة أَنْ لا إِلَـهَ إلاّ اللّـه، وأَنّـي رسول اللّه فإنْ هُمْ أطاعُوا لِذَلِكَ، فَأَعْلِمهُمْ أَنَّ اللّه قَدِ افْتَرضَ علَيْهم خَمْسَ صَـلَواتٍ في كُلِّ يومٍ وَلَيْلَةٍ، فَإنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذلكَ، فَأَعلِمْهُمْ أَنَّ اللّه قَدِ افْتَرَضَ عَلَيهمْ صدَقَةً تُؤْخذُ مِنْ أَغنيائِهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فُقَرائهم، فَإنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذلكَ، فَإيَّاكَ وكَرائِمَ أَمْوالِهم. واتَّـقِ دعْـوةَ الْمَظْلُومِ فَإنَّهُ لَيْس بينها وبيْنَ اللّه حِجَابٌ» متفقٌ عليه.

موعـاذ (رەزای خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: كاتـیَ پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەر بێ) منـی نـارد بـۆ یەمەن‌و كردمی بە سەركارومامۆستایان پـیَ‌ی فـەرمووم: ئـەوا تـۆ دەچیت بـۆ نـاو گەلێك، كە ئـەهلی كیتـاب‌و خـاوەنی نامـەن، كاتـیَ دەچـیتە ناویـان لەپێشا داوایـان لێبكە شایەتی بدەن: كە هەر خودا خودایەو خودای تر نییەو موحەممـەدی كوڕی عەبدوڵلا پێغەمبەری خودایە، ئەوجا ئەگەر بۆ ئەمە بەگوێیان كردی ئەوجا پێیان بڵیَ: كـە خـودا- لەهـەموو رۆژێكـا- پێـنج نوێـژی لەسـەریان دانـاوە، جا ئەگـەر بـۆ ئەمەیش بە گوێیان كردی ئەوجا پێشیان بڵیَ: كە خـودا زەكـاتی لەسـەریان دانـاوە، كە لە دەوڵەمەندەكانیان وەردەگیریَ‌و دەدرێتـەوە بـە هـەژارەكانیان، جـا ئەگـەر بـۆ ئەمەش بە گوێیان كردی ئەوا نەكەی بچی نایابی سامان‌و ماڵـەكانیان هەڵبـژێریَ‌و لـەباتی زەكـات بیبـەی. وە خۆشـت لەناڵـەو نـزای سـتەمبار بپـارێزە، چونكە ئـاهو نزوولەو ناڵەی ستەمدیدە تیرێكی كوشـندەیەو لەگـەڵ لـە كـەوان دەرچـوو بڕسـتی ستەمكار دەبڕیَ‌و هیـچ شتیَ بەری ناگریَ تا خۆی دەگەیەنێتە بارەگای پەروەردگار! (ش).

---

٦ بوخاری (١٣٩٥)، موسلیم (١٩).

٢٠٩/٧-[٧]- وعن أَبِي حُمَيْد عبْدِ الرَّحْمن بن سعدٍ السَّاعِدِيِّ رضي اللَّه عنه قال: استْعْملَ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّم رَجُلاً مِن الأَزْدِ يُقَالُ لَهُ: ابْنُ اللّتْبِيَّةِ عَلَى الصَّدقَةِ، فَلَمَّا قَدِمَ قال: هَذَا لَكُمْ، وَهَذَا أُهدِيَ إِلَيَّ فَقَامَ رسولُ اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم على الْمِنبرِ، فَحمِدَ اللَّه وأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قال: (أَمَّا بعْدُ فَإِنِّي أَسْتَعْمِلُ الرَّجُلَ مِنْكُمْ على الْعمَلِ مِمَّا ولاَّنِي اللَّه، فَيَأْتِي فَيَقُولُ: هَذَا لَكُمْ، وَهَذَا هَدِيَّةٌ أُهْدِيَت إِلَيَّ، أَفَلا جلس في بيتِ أَبِيهِ أَوْ أُمِّهِ حتَّى تأْتِيَهُ إِنْ كَانَ صادقاً، واللَّه لا يأْخُذُ أَحدٌ مِنْكُمْ شَيْئاً بِغَيْرِ حقِّهِ إلاَّ لَقِيَ اللَّه تَعالَى، يَحْمِلُهُ يَوْمَ الْقِيامَةِ، فَلا أَعْرِفَنَّ أَحداً مِنْكُمْ لَقِيَ اللَّه يَحْمِلُ بعِيراً لَهُ رغَاءٌ، أَوْ بَقَرة لَهَا خُوارٌ، أَوْ شاةً تيْعَرُ ثُمَّ رفَعَ يَدَيْهِ حتَّى رُؤِيَ بَياضُ إِبْطيْهِ فقال: (اللَّهُمَّ هَلْ بلَّغْتُ) ثلاثاً، متفقٌ عليه.

ئەبو حەمید (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) پیاوێکی ئەزدی کرد بەسەرکاری زەکات، ناوی ئیبنوللوتبییە بوو، کابرا کە هاتەوە گوتی: ئەم زەکاتە هی ئێوەیەو ئەمەیش هی منە بە دیاری بۆم هاتووە! جا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) سەرکەوتە سەر دووانگەو ڕاوەستاو ستایش‌و سوپاسی خودای کردو فەرمووی: پاش سوپاسی خودا، ئەمە چی پێ دەڵێن! هەندێ سەرکار کە دەینێرم بۆ سەرکاریی شوێنێ لەو شوێنانەی کە خودا منی کردووە بە سەرەوکاری، کەدێتەوە دەڵێ: ئەمە هی ئێوەیەو ئەمەیش هی منە بەدیاری بۆم هاتووە، جا ئەگەر وایەو ڕاست دەکا ئەدیی بۆچی لەماڵی بابی یا لەماڵی دایکی دانانیشێت هەتا بزانێ کە دیاریی بۆ دێ یا نا؟ بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە ئەوەی لە ئێوە ناخونەك لەم ماڵە بداو چەپ‌و گووپی لێ بکاو بەناڕەوا شتێ ببا ئەوە لەرۆژی دوایی دا ئەوناخونەکە، یا ئەو شتە دەنێ بە نەرەی شانییەوەو دەیهێنێ بۆ دیوانی خودا، نامەوێ لەدیوانی خودا بتانبینمەوە وشتری دزێتی بە قەلاندۆشکانتانەوە بێ‌و بەسەر شانتانەوە دەست بکا بە بۆرە بۆر، یا ڕەشەوڵاخی دزێتی بە قۆرە قۆر بە کۆڵتانەوە بێ، یا مەڕو بزنی دزێتی بە باڕەباڕو باعە باع بە کۆڵتانەوە بێ! وە لەسەر ئەم شێوە ناشیرینە خۆتان بکەن بەپەند!. ئینجا حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) هەردوو دەستی بەرز کردەوە بەڕادەیەکی وەها بۆرایی (خاڵ)ی هەردوو بنباڵی

٧ بوخاری (٢٥٩٧)، موسلیم (١٨٣٢).

وەدەرکەوت‌و سێ جار لەسەر یەك فەرمووی: ئەی خودایە! ئەوا تۆ خۆت ئاگاداری، تۆ بەشایەت بە ئەوا من پێم ڕاگەیاندن‌و ئەرکی سەر شانی خۆم بەجێ هێنا (ش).

٢١٠/٨-[٨]- وعن أَبي هُرَيْرَةَ رضي اللَّه عنه عن النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (مَـنْ كَانتْ عِنْدَه مَظْلمَةٌ لأَخيهِ، مِنْ عِرْضِهِ أَوْ مِنْ شَيْءٍ، فَلْيتَحَلَّلْه مِنه الْيوْمَ قَبْـلَ أَنْ لا يكُـونَ دِينَارٌ ولا دِرْهَمٌ، إنْ كَانَ لَهُ عَملٌ صَالحٌ أُخِذَ مِنْهُ بِقدْرِ مظْلمتِهِ، وإنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ حسَـنَاتٌ أُخِذَ مِنْ سيِّئَاتِ صاحِبِهِ فَحُمِلَ عَلَيْهِ) رواه البخاري.

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لەسـەر بـێ) دەگێڕێتـەوە لـە حەزرەتـەوە (درودی خـوای لەسـەر بـێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ ناڕەواییيـەکی لەکەسـێ کردبێ، یـا حـەقێکی کەسـێکی تـری لەسەر بێ، خوا هی نامووس بێ، خوا هی شتێکی تـر بـێ، بـا ئـەمرۆ لـەم جیهانـەدا گەردنی خۆی پێ ئازاد بکا لەو هەقە، یا لەو ناڕەواییە، یا بەهەر شێوەیێ دەتوانـێ بەپێی شەرع ڕازی بکا لەخۆی، بەر لەوەی کە بمرێ‌و بچێ بۆ ئەو دنیـاو حەقەکە بکەوێتـە ڕۆژێکـەوە کـە لـەو ڕۆژەدا دینـارو درەم‌و پـارەو پـوول نامێنـێ‌و بـە دەرد ناخوا، ئەوا ئەگەر وانەکا ئەوە حـاڵ لـەم دوو حاڵـە بـەدەر نییـە: ئەگـەر کـردەوەی باشی هەبێ بەقەد ئەو هەقە لەکردەوە باشـەکەی دەدرێ بـە خـاوەن هەقەکـە، خـۆ ئەگەر گریمان کردەوەی باشی نەبوو ئەوا خراپتر چونکە لـە خراپـەی برادەرەکـەی کە هەقەکەی لە سەریەتی هەڵ دەگیرێ‌و فڕێ دەدرێتە سەر ئەو.

٢١١/٩-[٩]- وعن عبد اللَّه بن عَمْرو بن الْعاص رضي اللَّه عنهما عن النبـي صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: «الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسانِهِ ويَدِهِ، والْمُهَاجِرُ مَـنْ هَجَـرَ مـا نَهَى اللَّه عَنْهُ) متفق عليه.

لە عەبـدوڵڵای کـوڕی عـەمرەوە (ڕەزای خودایـان لەسـەر بێ) لـە پێغەمبـەرەوە (درودی خـوای لەسـەر بێ) دەفەرموێ: موسوڵمانی ساخ ئەو موسوڵمانەیە کە موسوڵمانانی تر سەلامەت‌و ڕزگار بن لەزیانی دەست‌و زمانی، وە موهاجیرو کۆچکەریش ئەو کەسەیە کە ڕەو بکا لەو شتەی کە خودا قەدەغەی کردووەو نەهی لێ کردووە (ش).

---

٨ بوخاری (٢٤٤٩).

٩ بوخاری (١٠)، موسلیم (٤٠).

٢١٢/١٠-[١٠]- وعنه رضي اللّه عنه قال: كَانَ عَلَى ثَقَل النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ كِرْكِرةُ، فَمَاتَ فقال رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (هُوَ فِي النَّارِ) فَذَهَبُوا يَنْظُرُونَ إِلَيْهِ فوَجَدُوا عَبَاءَة قَدْ غَلَّهَا. رواه البخاري.

**ديسان** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: پیاوێ هەبوو ناوی کەرکەرە بوو، بارگەچی پێغەمبەر بوو** (درودی خوای لەسەر بێ) **عەمری خودای کرد، حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: وا لەناو ئاگردا. یاران چوون بۆ سۆراخی فەرمایشتەکەی حەزرەتەوە تا بزانن بۆچی وا لەناو ئاگردا، کە سەیریان کرد وا بالاپۆشێکی شاردۆتەوە بۆ خۆی و قولی داوە، جا بۆیان دەرکەوت ئەوە بووە بەهۆی چوونە ناو ئاگر (ب).**

٢١٣/١١-[١١]- وعن أَبي بَكْرَةَ نُفَيْع بنِ الحارثِ رضيَ اللّه عنهُ عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (إِنَّ الزَّمَانَ قَدِ اسْتَدَارَ كَهَيْئَتِهِ يَوْمَ خَلَقَ اللّه السَّموات والأَرْضَ: السَّنةُ اثْنَا عَشَر شَهْراً، مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُم: ثَلاثٌ مُتَوَالِيَاتٌ: ذُو الْقَعْدة وَذو الْحِجَّةِ، والْمُحرَّمُ، وَرجُب الذي بَيْنَ جُمادَي وَشَعْبَانَ، أَيُّ شَهْرٍ هَذَا ؟) قلْنَا: اللّه ورسُولُهُ أَعْلَم، فَسكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ، قال: أَلَيْس ذَا الْحِجَّةِ ؟ قُلْنَا: بلَى: قال: (فَأَيُّ بلَدٍ هَذَا ؟) قُلْنَا: اللّه وَرسُولُهُ أَعلَمُ، فَسَكَتَ حتّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سيُسمِّيهِ بغَيْر اسْمِهِ. قال: (أَلَيْسَ الْبَلْدةَ الحرمَ ؟) قُلْنا: بلَى. قال: (فَأَيُّ يَوم هذا ؟) قُلْنَا: اللّه ورسُولُهُ أَعْلمُ، فَسكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّه سيُسمِّيهِ بغَيْر اسْمِهِ. قال: (أَلَيْسَ يَوْمَ النَّحْر ؟) قُلْنَا: بَلَى. قال: (فإِنَّ دِماءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وأَعْراضَكُمْ عَلَيْكُمْ حرامٌ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا في بَلَدِكُمْ هَذا في شَهْرِكم هَذَا، وَسَتَلْقَوْن ربَّكُم فيسْأَلُكُمْ عَنْ أَعْمَالِكُمْ، أَلا فَلا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّاراً يضْربُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْض، أَلاَ لِيُبلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ، فلَعلَّ بعْض من يبْلغُه أَنْ يَكُونَ أَوْعَي لَه مِن بَعْضِ مَنْ سَمِعه) ثُمَّ قال: (أَلا هَلْ بَلَّغْتُ، أَلا هَلْ بلَّغْتُ ؟) قُلْنا: نَعَمْ، قال: (اللَّهُمْ اشْهدْ) متفقٌ عليه.

**ئەبوبەکرە** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **لەحەجی مالاواییدا وتارێکی دا فەرمووی: چەرخ چووەتەوە دۆخی جارانی خۆی و زەمان هەڵسوڕاوەتەوە سەر ئەو شێوەیەی خۆی، کە خودای گەورە ئاسمانەکان و زەوی درووست کردو شەوو رۆژو مانگ و ساڵی دانا، ئیمساڵ ساڵ بووەتەوە بە**

---

١٠ بوخاری (٣٠٧٤).

١١ بوخاری (٣١٩٧)، موسلیم (١٦٧٩).



دوانزەمـانگو هـەموو مانگـێ لـە دوانـزە مانگـەی خـودا کەوتۆتـەوە شـوێنی ڕاسـتەقینەی خـۆیو نەسـیء نـەما، وە وەك سـەردەمی پێغەمبـەرەکان (سـەلامی خوایـان لەسـەر بـێ) ئـەوەی ڕەوایـە بۆتـەوە بـە ڕەواو ئـەوەی ناڕەوایـە بۆتـەوە بـە ناڕەوا، وە ئەو گۆڕانو دەستکاری شەریعەتە کە لەسەردەمی نەزانیدا کرابوون ڕاست کرانەوە، ئەم مانگە چواریان مانگی حەرامنو خاوەن ڕێـزو قـەدرو نـرخنو لەبـەر ئەوە شەڕو شۆڕو هەراو جەنگیان زۆر تیـا حەرامـە، وە ئـەم چوار مانگـە سیانیان بـەرو دوانو بەشوێن یـەکا دێـن: کـە نـاو جـەژنانو نۆمینـەو موحـەڕەمن، ئـەوی تریشیان تەنیایـە، کـە مـانگی ڕەجەبـە، کـە مەشـهورو نـاوداره بـە ڕەجـەبی هـۆزی موضەر، لەبەرئەوە کە هۆزی موضەر زۆر قەدری ئەم مانگە دەگرن، کـە دەکەوێتـە ناوەنـدی جومـادی دووهـەمو کولەمانگـەوە، ئـەی موسـوڵمانەکان! ئـەم مانگـە چـۆن مانگێکـە؟ عـەرزیمان کـرد: خـوداو پێغەمبـەری خـودا باشـتری دەزانـن، حـەزرەت ماوەیێ بـێ دەنـگ بـوو، گومانمـان بـۆ ئـەوە چـوو کـە نـاوێکی تـری لێ دەنـێ، بـەڵام فـەرمووی: دیـارە ئـەمـە مـانگی نۆمینـەیـە، کـە حـەجی تیـا دەکـرێ. گوتمـان: چـۆن دەفـەرمووی وایـە، فـەرمووی: ئـەی ئـەم شـارە چـۆن شـارێکە؟ گوتمـان: خـوداو پێغەمبەری خودا باشتری دەزانن، جا خامۆش بوو، لەدڵی خۆمانا گوتمان: ڕەنگ بێ ناوێکی تری نوێی لێ بنێ، بەڵام فەرمووی: دیارە ئەمە شـارە نازدارەکـەی خۆمانـە، مەککەی پیرۆز! گوتمان: بۆ هەموو شتێ خوداو پێغەمبەری خودا خۆیان زۆر باشی لێ دەزانن! فەرمووی ئەی ئەمڕۆ چ ڕۆژ ڕۆژێکە؟ گوتمان خـوداو پێغەمبـەر باشـتری لێدەزانن، حەزرەت تا ماوەیێ مات بوو، لەدڵی خۆمانا دەمانگوت: لەوانەیـە نـاوێکی تازە لەم ڕۆژە بنێ، هەتا فەرمووی: دیارە ئەمە ڕۆژی جەژنی قوربانـە، کـە قوربـانی تیا دەکرێ، گوتمان: وەك دەفەرمووی وایـە. ئـەوجا فـەرمووی: دە بـزانن کـە سـەرو ماڵو خوێنو ناموستان لەیەکتری حەرامەو بەیەکتری ناڕەوایـە، وەك چـۆن تـاوان گەڵێ حەرامەو زۆ ناڕەوایە، بەتایبەتی ئەگەر ئەو تاوانـە لـەم ڕۆژە زۆر بـەڕێزەتانا بکرێ، کـەوا لـەم مانگـە زۆر بـەڕێزەتانا، نـەخوازەڵا لـەم شـارە پیرۆزەشـتانا بکـرێ، بزانن بە زوویی دەچنەوە بەر دەستی خـودا، خـودا بـۆ خـۆی لێتـان دەپرسـێ کـارو پیشەتان چی بـوو، چ نـەبوو، وە مەحکەمـەتان دەکا لەسـەری، هۆشـیار بـن نەکـەن لەپاش خۆم پاشگەز ببنەوەو وەکی کۆمەڵی کافرانو میللەتی خۆ خۆر بەرببنـەوە

سەرو گوێلاكی یەكتریو لەسەر پرو پاتاڵی جیهان لەگەردنی یەكتری بدەن! ئینجا فەرمووشی: ئاگادار بن! كێ لێرەیەو گوێی لەم قسانەیە با رایان بگەیەنی بەو كەسانەی كە ئێستا لێرە حازر نین، لەناو خۆتانا هەرچی دەژنەون لەم فەرموودانەو بەیانی شەریعەتە، بەپێی تەوانا رایان بگەیەنن بەیەكتری، سا بەشكوو حازرەكە، یا پێگوتراوەكە، ئەم زانینو فەرمایشتانە رابگەیەنێ بە كەسێكی تر كە دوور نییە ئەو لەم باشتر لێیان تێ بگاو چاكتر لەبەریان بكا (ش).

٢١٤/١٢-[١٢]- وعن أَبي أُمَامةَ إِيَاسِ بن ثعْلَبَةَ الْحَارِثِيِّ رضي اللَّه عنه أَن رسولَ اللَّه صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (مَنِ اقْتطَعَ حَقَّ امْرِيءٍ مُسْلمٍ بيَمِينِهِ فَقَدْ أَوْجَبَ اللَّه لَه النَّارَ، وَحَـرَّمَ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ) فقال رجُلٌ: وإِنْ كَانَ شَيْئاً يسِيراً يا رسـولَ اللَّـه ؟ فقـال: (وإِنْ قَضِـيباً مِـنْ أَرَاكٍ) رواه مسلم.

ئەبو ئوما‌مە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) وتی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەركەسێ بە زەبری سوێندو سوێندكاری مافی موسوڵمانێ بە ناڕەوا بپچرێ بۆ خۆیو بە ناهەق بیكا بە هی خۆی، ئەوە خودا ئاگری بۆ مسۆگەر دەكاو بەهەشتی لێ قەدەغە دەكا. پیاوێكیش گوتی: با ئەو شتە شتێكی كەمیش بێ هەر وایە؟ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: با پەلكە دار سیواكێكیش بێ! (م).

٢١٥/١٣-[١٣]- وعن عَدِيِّ بن عُمَيْرَةَ رضي اللَّه عنه قال: سَمِعْتُ رسولَ اللَّه يَقُول: (مَن اسْتَعْمَلْنَاهُ مِنْكُمْ عَلَى عَمَل، فَكَتَمَنَا مِخْيَطاً فَمَا فَوْقَهُ، كَانَ غُلُولا يَأْتِي بِهِ يوْم الْقِيامَةِ) فقَام إِلَيهِ رجُلٌ أَسْودُ مِنَ الأَنْصَارِ، كَأَنِّي أَنْظرُ إِلَيْهِ، فقال: يا رسول اللَّه اقْبل عني عملَكَ قـال: (ومالكَ ؟) قال: سَمِعْتُك تقُول كَذَا وَكَذَا، قال: (وَأَنَا أَقُولُـهُ الآن: مـن اسْـتعْملْنَاهُ عَلَـى عملٍ فلْيجِيء بقَلِيلهِ وَكثِيرِه، فمَا أُوتِي مِنْهُ أَخَذَ ومَا نُهِي عَنْهُ انْتَهَى) رواه مسلم.

عەدی كوڕی عومەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: گوێم لێ بوو حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەركەسێ لەئێوە كاتی دەیكەن بەسەركاری سەركارێ ئەگەر بەقەد سەری دەرزییەك، یا پتر یا كەمتر، لەوكارە حەشار بدا لێتان ئەوە دەبێ بە گزیو دزی ناخونەك، لە ڕۆژی قیامەتا وەك خودا لەم ئایەتەدا دەفەرموێ دەیێنێ

١٢ موسلیم (١٣٧).

١٣ موسلیم (١٨٣٣).

بەنەڕەی شانیەوەو دەیهێنێ بۆ پای هەق‌و حیساب: ﴿ومن یغلل یأت بما غل یوم القیامة﴾آل عمران/١٦١. واتە: وە هەرکەسێ شتێ قول بداو بیبا بۆ خۆی لە رۆژی ژینەوەدا دەینێ بە نەڕەی شانیەوەو بەبەرچاوی دۆست‌و دوژمنەوە دەیهێنێ بۆ مەیدانی پرسینەوەو لەبەرچاوی ئەو هەموو عەشامەتە لەپێش هەموو شتێکا شەرمەزارو روو زەرد دەبێ! کە حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) وای فەرموو، زەلامێ هەڵسا چوو بۆ خزمەتی، دەڵێی ئێستاکەش شێوەی وا لەبەرچاوم، پیاوێکی ئەنصاری رەش بوو، چوو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! سەرکارییەکەتم لێ وەربگرەوە، ئیتر من سەرکاری ناکەم، فەرمووی: بۆ چی بووە؟ گوتی: ئەی ئەوە نییە تۆ وا دەفەرمووی: چۆن چی بووە! ئەگەر وابێ ئەوە بەمن ناکرێ! فەرمووی: من لەقسەی خۆم پەشیمان نابمەوە ئێستاش هەروا دەڵێم: ئەوەی کارێکی موسوڵمانانی پێ دەسپێرین‌و دەیکەین بەسەرپەرشتی کارێکی خۆمان نابێ چەپوو گووپی لێ بکاو گزی‌و فزی لێ بکا، دەبێ بە دڵسۆزی کەم‌و زۆری ئەو کارەمان بۆ بێنێ، تەنیا ئەوەی خۆمان دەیدەینێ‌و ئەو مووچەو بەراتەی خۆمان بۆی دەبڕینەوە تەنیا ئەوە وەربگرێ‌و بەس، دەنا مافی هیچی تری نییە (م).

٢١٦/١٤-[١٤]- وعن عمر بن الخطاب رضي اللّهُ عنه قال: لَمّا كان يوْمُ خيْبرَ أَقْبل نَفرٌ مِنْ أَصْحابِ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم فَقَالُوا: فُلانٌ شَهيدٌ، وفُلانٌ شهيدٌ، حتَّى مَرُّوا علَى رَجُلٍ فقالوا: فلانٌ شهيد. فقال النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (كلاَّ إِنِّي رَأَيْتُهُ فِي النَّارِ فِي بُرْدَةٍ غَلَّها أَوْ عبَاءَةٍ) رواه مسلم.

عومەری کوڕی خەططاب (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لە رۆژی غەزای خەیبەردا، دەستەیێ لەیارانی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) هاتن گوتیان: فیسارەکەس شەهید بوو، هەروەها ئەو فیسار، تا ناوی پیاوێکیان بردو گوتیان: ئەویش شەهید بوو. پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: نەخێر ئەو شەهید نییە هەرچەند لەم غەزایەدا کوژراوە، وەلێ من ئەوم بینی لەناو ئاگری دۆزەخدا لەسەر ئەوە ناپاکی لە تالانەکە کردبوو، عابایەکی لێ دزی بوو! (م).

---

١٤ موسلیم (١١٤).

٢١٧/١٥-[١٥]- وعن أَبي قَتَادَةَ الْحارثِ بنِ ربعي رضي اللّٰه عنه عن رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم أَنَّهُ قَام فِيهِمْ، فذَكَرَ لَهُمْ أَنَّ الْجِهادَ فِي سبِيلِ اللّٰه، وَالإِيمانَ بِاللّٰه أَفْضلُ الأَعْمالِ، فَقَامَ رَجلٌ فقال: يا رسول اللّٰه أَرَأَيْت إنْ قُتِلْتُ فِي سَبِيلِ اللّٰه، تُكَفَّرُ عنِي خَطَايَايَ؟ فقال لَهُ رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (نعَمْ إنْ قُتِلْتَ فِي سَبِيلِ اللّٰه وأَنْتَ صَابر مُحْتَسِبٌ، مُقْبِلٌ غيْرَ مُدْبِرٍ) ثُمَّ قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (كَيْف قُلْتَ ؟) قال: أَرَأَيْتَ إِنْ قُتِلْتُ فِي سَبِيل اللّٰه، أَتُكَفرُ عني خَطَاياي ؟ فقال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: «نَعمْ وأَنْت صابِرٌ مُحْتَسِبٌ، مُقبِلٌ غَيْرَ مُدْبِرٍ، إلاَّ الدَّيْن فَإِنَّ جِبْرِيلَ قَال لِي ذلِكَ) رواه مسلم.

ئـەبو قـەتادە (رەزای خـودای لەسـەر بێ) فـەرمووی: حـەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) هەڵسـایەوە لەناوماندا خوتبەیەکی دا، باسی ئەوەی فەرموو، کە گەورەترین کردەوەی بەنـدەی خودا تێکۆشان‌و غەزایە لـە ڕێگەی خـودادا، لەگەڵ بـاوەڕی تـەواو بـەخودا، پیاوێ هەڵسا وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو ئەگەر لە پێناوی خودا بکوژرێم لەگوناە پاك دەبمەوە؟ حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی پێی: بەڵێ ئەگەر لەپێناوی ئاینی خودادا بکوژرێی لەگوناە پاك دەبیتـەوە، بەمـەرجێ دەدان بەخۆتـدا بگری‌و مەبەسـتت ڕەزای خـودا بێ‌و پاداشـتی خـۆت هـەر لـەو داوا بکـەی‌و بـەرەو دوژمـن ڕاوەسـتیت‌و پشـت هەڵنەکـەیت.. لەپاشا حـەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: چـۆن چۆنیت گوت؟ گوتی: پێم بفەرموو ئەگـەر لـەپێناوی خـودا بکوژرێم لـەگوناە پـاك دەبمەوە؟ فەرمووی: ئا، بەمەرجی بەئارام بی‌و مەبەستت ڕەزای خودا بێ‌و پاداشتی خۆت هەر لەو داوا بکەیت‌و بەرەو دوژمن ڕاەستیت‌و پشتت هەڵنەکەیت‌و سەرەڕای ئەوەیشە قەرزاریش نەبی، چونکە جوبرائیل ئاوای پێ فەرمووم (م).

٢١٨/١٦-[١٦]- وعن أَبي هريرة رضي اللّٰه عنه، أَن رسولَ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: «أَتَدْرُون من الْمُفْلِسُ ؟» قالُوا: الْمُفْلِسُ فِينَا مَنْ لا دِرْهَمَ لَـهُ وَلا مَتَاعَ. فقال: (إِنَّ الْمُفْلِسَ مِنْ أُمَّتِي مَنْ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيامةِ بِصَلاةٍ وَصِيَامٍ وزَكَاةٍ، ويأْتِي وقَدْ شَتَمَ هذا، وقذَفَ هذَا وَأَكَلَ مالَ هَذَا، وسفَكَ دَم هذَا، وَضَرَبَ هذا، فيُعْطَى هذَا مِنْ حسَنَاتِهِ، وهَذا مِن

---

١٥ موسليم (١٨٨٥).

١٦ موسليم (٢٥٨١).



حسَنَاتِهِ، فَإِنْ فَنِيَتْ حسناته قَبْلَ أَنْ يقْضِيَ مَا عَلَيْهِ، أُخِذَ مِنْ خَطَايَاهُمْ فَطُرِحَتْ عليْه، ثُمَّ طُرِح فِي النَّارِ» رواه مسلم.

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر – سەرو ماڵو منداڵو ڕۆحو گیانو هەستو نەست هەمووی بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێو صەلاتو سەلامو درودو ڕەحمەتی خودای لەسەر بێ- فەرمووی: ئەرێ ئێوە دەزانن کە نابووت کێیە؟ گوتیان: لەناو ئێمەدا نابووت ئەو کەسەیە کە پارەو ماڵی نەبێ! فەرمووی:** (درودی خوای لەسەر بێ)**: بەڵام نابووتی ئوممەتی من ئەو کەسەیە، کە لەرۆژی قیامەتا دێ بۆ دیوانی خودا بۆ لێپرسینەوە، لەلایەکەوە نوێژی کردووەو ڕۆژووی گرتووەو زەکاتی داوەو بەشی خۆی چاکەی هەیە، لەلایەکی تریشەوە جنێوی بەمو بەو داوە، یا بوختانی بۆ کەسێ کردووە، یا ماڵی ئەمو ئەوی بە ناڕەوا خواردووە، یا خوێنی خەڵکی بەناهەق ڕشتووە، یا لەخەڵکی داوە، یا خراپەی تری کردووە، جا لەبەر ئەوە ئەم چاکەیەی دەدرێ بەمو ئەو چاکەیەکی دەدرێ بەوی تر، لەجیاتی هەقی خۆیان، جا ئەگەر چاکەکانی هەموو تەواو بوونو بەشی دانەوەی ئەو هەقەیان نەکرد کەوان لەسەری، ئەوا ئەوجا لەگوناهو تاوانەکانی ئەو خاوەن هەقانە دێننو فڕەیان دەدەنە سەر ئەم، ئەوسا کلکی دەگرنو بەبێ نرخیی توورِی دەدەنە ناو دۆزەخ! (م** (ڕەزای خودای لەسەر بێ)**.**

٢١٩/١٧-[١٧] – وعن أُمِّ سَلَمةَ رضي اللّٰه عنها، أَن رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: «إِنَّمَا أَنَا بشَرٌ، وَإِنَّكُم تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَلْحنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْض، فَأَقْضِي لَهُ بِنحْوِ ما أَسْمَعُ فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِحَقِّ أَخِيهِ فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ» متفق عليه. «أَلْحَن» أَيْ: أَعْلَم.

**ئوممو سەلەمە** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: منیش هەر ئادەمیزادم وەك ئێوەو غەیب زان نیم، جا ئێوە کەدێن بۆلای من بۆ دادخوایی، بۆ مەحکەمە، ڕەنگ بێ هەندێکتان لە هەندێکی ترتان باشتر لە بەڵگەسازی بزانێو لە هاو داواکەی بە دەمو پل تر بێ، وە منیش بڕوای پێ دەکەمو بە پێی ئەوەی کە لەوی دەبیستم بڕیار بدەم بۆی وە لەڕاستیدا هی ئەو نەبێ،**

---

١٧ بوخاری (٧١٦٩)، موسلیم (١٧١٣).

بەڵكوو هی برایەکی ئایینی خۆی بێ، ئەوە با ئەو شتە وەرنەگرێ، چونکە بەوە نابێ بەحەلاڵی، بەڵكوو ئەگەر ئەو بەساختە وەری گرت ئەوە لێی روون بێ کەشتی وا پارچەیە ئاگری ڕووتەو من بۆی بڕ دەدەم! (ش).

٢٢٠/١٨-[١٨]– وعن ابنِ عمرَ رضي اللّٰه عنهما قال قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (لَنْ يَزَالَ الْمُؤمِنُ فِي فُسْحَةٍ مِنْ دِينِهِ مَالَمْ يُصِبْ دَماً حَراماً) رواه البخاري.

ئیبن و عومەر (رەزای خودایان لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: موسوڵمان هەتا خوێن ڕشتنی ناڕەوا نەبێ بە تووشیەوە هێشتا ئایینی بەبەریەوە دەمێنێ (ب).

٢٢١/١٩-[١٩]– وعن خَوْلَةَ بِنْتِ عامِرِ الأَنْصَارِيَّةِ، وَهِيَ امْرَأَةُ حَمْزَةَ رضي اللّٰهُ عنه وعنها، قالت: سمِعْتُ رسولَ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يَقُولُ: (إِنَّ رِجَالاً يَتخَوَّضُونَ فِي مالِ اللّٰهِ بِغَيْرِ حَقّ فَلهُمُ النَّارُ يَوْمَ الْقِيَامةِ) رواه البخاري.

خەولەی کچی عامیری ئەنصارییە، کە هاوسەری حەمزە بوو (رەزای خودایان لەسەر بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم ژنەوتم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: پیاوانێ هەن چەپ و گووپ لەماڵی خودا دەکەن و بەناڕەوا لرفی لێ دەدەن، ئەوانە لەڕۆژی زینەوەدا ئاگریان بۆ هەیە (ب-خ).

## ٢٧- باسی گەورەیی ڕێزی موسوڵمانان و بەیانکردنی مافیان و بەزیی هاتنەوە پێیانداو دڵسۆزی بۆیان

## بيان تعظيم حرمات المسلمين وبيان حقوقهم والشفقة عليهم

قال تعالى: ﴿ومن يعظم حرمات الله فهو خير له عند ربه﴾ الحج/٣٠.

وقال تعالى: ﴿ومن يعظم شعائر الله فإنها من تقوى القلوب﴾الحج/٣٢.

زقال تعالى: ﴿واخفض جناحك لمن اتبعك من المؤمنين﴾الشعراء/٢١٥.

وقال تعالى: ﴿ من قتل نفسا بغير نفس أو فساد في الأرض فكأنما قتل الناس جميعا ومن أحياها فكأنما أحيا الناس جميعا﴾المائدة/٣٢.

---

١٨ بوخاری (٧١٦٩)، موسلیم (١٧١٣).

١٩ بوخاری (٣١١٨).

مەبەست لە ئايەتە پيرۆزەكان بە تێكڕايى: خوداى گەورەو مەزن لەم ئايەتانەدا دەفەرموێ: كەسێ بە ڕێزو قەدرێكى زۆرەوە رەفتار بكا لەگەڵ ياساو شەريعەتى خوداو بەچاوى ڕێز تەماشاى فەرمايشتو ياساو دروشمەكانى خوداى گەورە بكا، وەلەفەرمانيان دەنەچێ، وە بەپێى ئەوان هەڵسو كەوت بكا، ئەوە خێرو چاكەيەكى زۆر نايابەو بۆ خۆيى دەكاو لە جيهانا دەبێ بەهۆى شانازىو سەربەرزى بۆىو لەدوا رۆژيشا دەبێ بەمايەى رەزاى خودا، ڕێزگرتنى ياساو شەرعو نيشانەكانو دروشمەكانى ئايينى خودا خۆراكى دڵە، رووناكى چاوە، بۆ دڵو دەروونى زيندوو هێزو هەناوە، موسوڵمانە نازدارەكان! بزانن كە خوداى گەورە فەرمان دەكا بە خۆشەويستى خۆى كە موحەممەدە دەفەرموێ: لەگەڵ موسوڵمانانا كە پەيرەوانى تۆن نەرمو نيان بەو باڵى ميهرەبانيان بۆ ڕاخەو لەژێر سێبەرى باڵى خۆتا وەك دايكو بەچكە پەروەردەيان بكە، هەروەها خودا دەفەرموێ: ئادەميزاد لەلاى خودا زۆر بەڕێزە، لەبەر ئەوە هەركەسێ بەناڕەوا كەسێ بكوژێ، كە نەكەسێكى كوشتبێو نە ئاژاوەو خراپەيەكى بەرپا كردبێ، ئەوە وەك ئەوە وايە كە بەدەستى خۆى ئەو خەڵكەى هەموو كوشتبێ، هەروەها كەسێ كەسێ لە كوشتن رزگار بكا وەك ئەوە وايە هەموو كەسێكى لە كوشتن رزگار كردبێ، كەوابێ موسوڵمانى باش بنو لەفەرمانى خوداو بە گوێكردنى پێغەمبەر (درودى خواى لەسەر بێ) دەرمەچن*.

٢٢٢/١-[١] وعن أَبي موسى رضي اللّٰه عنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «الْمُؤْمنُ للْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشدُّ بعْضُهُ بَعْضاً» وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِه. متفق عليه.

* ڕۆح چەن عەزيزە! لەش چەن نازدارە
ژينيش شاكارى خوداى فەردارە
گيان پەرى خوايە! جەستە بەهەشتى
خواوەن بەدەستى خۆى لەوێ ناشتى!!
دەى كەى ويژدانە! خوا چۆن هەڵدەگرێ
پەرى بێ تاوان لەلان دەربكرێ!!

(وەرگێڕ)

١ بوخارى (٦٠٢٦)، موسليم (٢٥٨٥).



**ئەبو مووسا** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **لە پێغەمبەرەوە** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: موسوڵمان قەڵایە بۆ موسوڵمان‌و وەك چینی دیوەار چنگ دەدەنە یەك! ئەوجا پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **پەنجەکانی هەردوو دەستی خۆی تێك پەڕاندو ئاماژەی کرد کە ئاوا پشتی یەك دەگرن (ش).**

٢٢٣/٢-[٢]- وعنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (مَن مَرَّ فِي شَيْءٍ مِنْ مَسَاجِدِنَا، أَوْ أَسْوَاقِنَا، ومَعَه نَبْلٌ فَلْيُمْسِكْ، أَوْ لِيَقْبِضْ عَلَى نِصالِهَا بِكفِّهِ أَنْ يُصِيب أَحَداً مِنَ الْمُسْلِمِينَ مِنْهَا بِشَيْءٍ) متفق عليه.

**دیسان فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەگەر ڕێکەوت کەسێك ڕێی کەوتە ناو مزگەوت بەچەکەوەو ڕم‌و نێزەی پێ بوو، با ئاگای لەخۆی بێ‌و چەکەکەی بە ڕێك‌و پێکی بگرێ، با دەست بگرێ بە نووکی ڕم‌و شیرەوە نەبادا خوانەخواستە بکەوێ لە شوێنێکی موسوڵمانێك‌و بۆی بێ بە ئازار (ش).**

٢٢٤/٣-[٣]- وعن النُّعْمَانِ بنِ بشِيرٍ رضي اللّٰه عنهما قال: قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وتَرَاحُمِهِمْ وتَعاطُفِهِمْ، مَثَلُ الْجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَداعَى لهُ سائِرُ الْجسدِ بالسهَرِ والْحُمَّى) متفقٌ عليه.

**نوعمانی کوڕی بەشیر** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **دەگێڕێتەوە: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: دەبێ موسوڵمانان لەناو خۆیاندا وەك برا دۆست‌و دڵسۆزی یەکتری بن‌و لەگەڵ یەکتری بەڕەحم‌و میهرەبان بن، نموونەی باڵاو سەرمەشقێکی جوان بن بۆ بەتەنگەوە بوونی یەکتری، وەك چۆن جەستەیەك ئەگەر ئەندامێکی بێتە ژان، بەوێنە چاو ژان بکا، ئیتر هەموو گیانی وەك یەك دێنە ژان‌و هەموو ئەندامەکانی تری شەو نوخوونی لەگەڵ دەکێشن‌و لەتاوی ئازاری ئەو ئەوانیش تایان لێ دێ، دەبێ موسوڵمانیش لەگەڵ یەکتریدا ئاوا بن! (ش).**

٢٢٥/٤-[٤]- وعن أَبي هُرَيْرَةَ رضي اللّٰه عنه قال: قَبَّل النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم الْحسنَ ابن عَلِيّ رضي اللّٰه عنهما، وَعِنْدَهُ الأَقْرعُ بْنُ حَابِسٍ، فقال الأَقْرَعُ: إِنَّ لِي عَشرةً

---

٢ بوخاری (٤٥٢٢)، موسلیم (٢٦١٥).

٣ بوخاری (٦٠١١)، موسلیم (٢٥٨٦).

٤ بوخاری (٥٩٩٧)، موسلیم (٢٣١٩).

مِنَ الْوَلَدِ ما قَبَّلتُ مِنْهُمْ أَحداً فنَظَر إِلَيْهِ رسولُ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم فقـال: «مَـن لا يَرْحَمْ لا يُرْحَمْ» متفقٌ عليه.

ئــەبو هــورەيرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فــەرمووی: ئــەقرەعی کــوڕی حــابیس لــەلای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دانیشتبوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) حەسەنی کوڕی عەلی ماچ کرد، کە کچەزای خۆیەتی، ئەقرەعیش گوتی: دە کوڕم هەیە هێشتا کەسیانم مـاج نـەکردووە! پێغەمبـەریش (درودی خوای لەسەر بێ) سـەیرێکی سـەیری کـردو فـەرمووی: ڕەحم بەبێ ڕەحم ناکرێ! (ش).

٢٢٦/٥-[٥]- وعن عائشةَ رضي اللّه عنها قالت: قدِم ناسٌ مِن الأَعْرابِ عَلَى رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم، فقالوا: أَتُقبِّلونَ صِبيْانَكُمْ ؟ فقال: (نَعَمْ) قالوا: لَكِنَّا واللّه ما نُقَبِّـلُ، فقال رسولُ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (أَوَ أَمْلِكُ إِنْ كَانَ اللّه نَزعَ مِنْ قُلُـوبِكُمْ الرَّحْمَـةَ» متفقٌ عليه.

عائیشە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: چەند کەسێ لەعـەرەبی دەشـتەکی هـاتن بۆ خزمـەتی پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەر بێ) گوتیـان: ئایا ئێـوە منـاڵی خۆتـان مـاچ دەکـەن؟ حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئا، ماچیان دەکـەین، گوتیـان: بـەڵام بـەخوا ئێمـە مناڵ ماچ ناکەین! پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئێوە خوا ڕەحـم‌و بـەزەیی لـە دڵتان داڕنیوە، ئیتر من دەتوانم چیتان لێ بکەم!

٢٢٧/٦-[٦]- وعن جرير بن عبد اللّه رضي اللّه عنه قال: قال رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (مَنْ لا يرْحَم النَّاس لا يرْحَمْهُ اللّه) متفقٌ عليه.

جـەریری کـوڕی عەبـدوڵلا (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کەسێ ڕەحم بەکەسێ نەکا خودایش ڕەحم بەو ناکا! (ش).

٢٢٨/٧-[٧]- وعن أَبي هُريرةَ رضي اللّه عنه، أَنَّ رسولَ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلّم قال: (إِذا صلى أَحدُكُمْ للنَّاسِ فلْيُخَفِّفْ، فَإِنَّ فِيهِمْ الضَّعِيفَ وَالسقيمَ والْكَبِيرَ. وإِذَا صَلّى أَحَدُكُمْ لِنَفْسِهِ فَلْيطَوِّل ما شَاءَ) متفقٌ عليه. وفي روايةٍ: (وذَا الْحاجَةِ).

٥ بوخاری (٥٩٩٨)، موسلیم (٢٣١٧).

٦ بوخاری (٧٣٧٦)، موسلیم (٢٣١٩).

٧ بوختاری (٧٠٣)، موسلیم (٤٦٧)و (٨٥).

**ئـەبو هـورەیرە** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فـەرمووی: پێغەمبـەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فـەرمووی: ئەگەر بوون بە پێش نوێژو پێشنوێژیتان بۆ مەردووم دەکرد ئەوا نوێـژێکی ڕێـك و پێکی کورتی سووکەڵەی پوختیان بۆ بکەن، چونکە نوێژکەرەکان هەیانە بێ هێـزو لازەبـوون، هەیانـە دەردەدارو نەخۆشـە، هەیانـە پـیرە، هەیانـە ئـیش و کـاری تـری هەیەو پەلەیەتی، بـەڵام ئەگـەر یـەکێکتان بەتـەنیا بـۆ خـۆی نوێـژی دەکـرد، ئـەوە چەنی حەز دەکا با ئەوەندەی درێژی بکاتەوە (ش).**

٢٢٩/٨-[٨]- وعن عائشة رضي اللّٰه عنها قَالَتْ: إنْ كَان رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم لَيدعُ الْعَمَلَ، وهُوَ يحِبُّ أَنَ يَعْملَ بِهِ، خَشْيَةَ أَنْ يَعْمَلَ بِهِ النَّاسُ فيُفْرَضَ عَلَيْهِمْ) متفقٌ عليه.

**عائیشـە** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فـەرمووی: وا دەبـوو پێغەمبـەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **حـەزی لەهەنـدێ شـتی سـوننەت هـەبوو، حـەزی دەکـرد کـە بـەردەوام بیانکـاو وازیـان لێ نـەهێنێ، بـەڵام وازی لێ دەهێنـا، چـونکە مەترسـی ئـەوەی هـەبوو کـە بەرەبـەرە موسوڵمانانیش چاو لە خۆی بکەن و ئەو سوننەتە تـەرك نەکـەن و لەئـەنجاما فـەرز ببێ لەسەریان! (ش).**

٢٣٠/٩-[٩]- وعنْهَا رضي اللّٰه عنها قالَتْ: نَهَـاهُمْ النبــي صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم عَـن الْوِصال رَحْمةً لَهُمْ، فقالوا: إنَّكَ تُواصلُ ؟ قال: (إنِّي لَسْتُ كَهَيْئَتِكُمْ إنِّـي أَبِيـتُ يُطْعِمُـنِي رَبِّي ويَسْقِيني) متفقٌ عليه مَعناهُ: يجعَلُ فيَّ قُوَّةَ مَنْ أَكَلَ وَشرَبَ.

**دیسان فەرمووی:** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **ڕێگەی نەدەدا کە یەکێ دوو ڕۆژ یا پتر شەو و ڕۆژ بە ڕۆژوو بێ و لەو ماوەیەدا بـەهیچ جۆرێ ڕۆژووەکـەی نەشکێنێ، کە بەمـە دەڵێن: ڕۆژوو دانـە دەم یـەك، ئەمـەش بۆیـە ڕێگـەی نـەدەدان چونکە بەزەیی پێیانا دەهاتەوە، یارانیش گوتیان: قوربان خۆ تۆ خۆت وا دەکەیت؟ ئیتر بۆ لەئێمەی قەدەغە دەکەی؟ فەرمووی: جا ئێوە وەك مـن وان؟ مـن جیـام لـە ئێوە، من خودا فرسەتم دەداو بەشەو نان و ئاوم دەداتێ (ش).**

---

٨ بوخاری (١١٢٨)، موسلیم (٧١٨).

٩ بوخاری (١٩٦٤٩، موسلیم (١١٠٥٩.

٢٣١/١٠-¹⁰- وعن أَبي قَتادَةَ الْحارِثِ بنِ رِبْعي رضي اللّٰه عنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «إِنِّي لأَقُومُ إِلَى الصَّلاةِ، وأُرِيدُ أَنْ أُطَوِّل فِيها، فَأَسْمعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ، فَأَتَجوَّزَ فِي صلاتِي كَرَاهِيَةَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمِّهِ) رواه البخاري.

ئەبو قەتادە (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: رێ دەكەوێ كە دەست دەكەم بە نوێژ، دەمەوێ درێژی بكەمەوە، بەلاّم لەناو نوێژەكەدا كە دەنگی گریانی منالێ دەبیستم، كە دایكەكەی لەپشت منەوە بە جەماعەت نوێژ دەكا، ئیتر نوێژێكی رێكو پێكی سووكەڵەی پوخت دەكەمو درێژی ناكەمەوە، مەبادا دایكی ئەو منداڵە سەخڵەت بكەم! (ش).

٢٣٢/١١-¹¹- وعن جُنْدِبِ بن عبد اللّٰه رضي اللّٰه عنه قال: قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم:«منْ صَلَّى صَلاةَ الصُّبحِ فَهُوَ فِي ذِمةِ اللّٰه فَلا يطْلُبنَّكُمْ اللّٰهُ مِنْ ذِمَّتِهِ بِشَيْءٍ، فَإِنَّهُ منْ يَطْلُبْهُ مِنْ ذِمَّتِهِ بِشَيْءٍ يُدرِكْه، ثُمَّ يكُبُّهُ عَلَى وجْهِهِ» رواه مسلم.

جونەیدی كوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودای لەسەر بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەركەس نوێژی بەیانی بكا ئەوە لەپەناو ئامانی خودادایە، كەواتە نەكەن ئازاری ئەو كەسە بكەن كەوا لەپەنای خوادا، دەنا خودا داوای مافی ئەوتان لێ دەكا، ئەو كەسەشی خودا داوای مافی ئاوای لێ بكا لەچنگی قوتاری نابێو دەیگرێ، سەرەنجام لەناو ئاگری دۆزەخدا لەسەر روو دەیگەوزێنێ (م).

٢٣٣/١٢-¹²- وعن ابن عمر رضي اللّٰه عنهما أَنَّ رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (المُسْلِمُ أَخُو المُسْلِمِ، لا يظْلِمُه، ولا يُسْلِمهُ، منْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ كَانَ اللّٰهُ فِي حاجتِهِ، ومَنْ فَرَّج عنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً فَرَّجَ اللّٰهُ عنْهُ بِهَا كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يوْمَ الْقِيامَةِ، ومَنْ ستر مُسْلِماً سَترَهُ اللّٰهُ يَوْمَ الْقِيامَةِ) متفقٌ عليه.

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لەسەر بێ) لە حەزرەتەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: موسوڵمان برای موسوڵمانە، نابێ زۆرو ستەمی لێ بكا، یا بیدات بە دەست دوشمنو ناحەزی خۆیەوە، هەركەسێ مشووری كاری برایەكی ئایینی خۆی بخواو بچێ بەدەنگیەوە

---

١٠ بوخاری (١٩٦٤)، موسلیم (١١٠٥).

١١ موسلیم (٦٥٧)و (٢٦٢).

١٢ بوخاری (٢٤٤٢)، موسلیم (٢٥٨٠).

خودایش مشوری کاری ئەو دەخوات و دەچێت بە دەنگیەوە، هەرکەسێ موسوڵمانێ لە تەنگانەیەك رزگار بکا خوداش ئەو لەتەنگانەیەك لەتەنگانەکانی رۆژی ژینەوە رزگار دەکا، وەهەرکەسێ موسوڵمانی پۆشتە بکاتەوەو بەجل و بەرگ لەشی بپۆشێ خودایش رۆژی قیامەت ئەو پۆشتەو پەرداخ دەکاتەوە، یان بۆ رازیبوونی خودا نەنگ و نهێنی ئەو بپۆشێ خودایش لەتۆڵەی باشی ئەوەدا لە قیامەتدا نەنگ و نهێنی ئەو دەپۆشێ (ش).

٢٣٤/١٣-[١٣]- وعن أَبي هريرة رضي اللّٰه عنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «المُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لا يخُونُه ولا يكْذِبُهُ ولا يخْذُلُهُ، كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حرامٌ عِرْضُهُ ومالُه ودمُهُ التَّقْوَى هَاهُنا، بِحسْبِ امْرِىءٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخاهُ المسلم» رواه الترمذيُّ وقال: حديث حسن.

ئەبو هورەیرە لە حەزرەتەوە دەفەرموێ: (درودی خوای لەسەر بێ): موسوڵمان برای موسوڵمانە، نابێ گزیو ناپاکی لەگەڵ بکا، نابێ پشتی لەزەوی بداو لەکاتی لێقەومانا پشتی تێ بکا، نابێ درۆزن بێ لەگەڵیا، هەموو شتێکی موسوڵمان بە موسوڵمانێکی تر حەرامەو ناڕەوایە: ناموس و سەرو ماڵی، بزانن تەقواو ترسی خودا ئالێرەدایە وا لەناو دڵا، بەسە بۆ خراپی موسوڵمان کە بەچاوی سووکی تەماشای برای موسوڵمانی خۆی بکا. (ت:ح/ح).

٢٣٥/١٤-[١٤]- وعنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (لا تَحاسدُوا ولا تناجشُوا ولا تَباغَضُوا ولا تَدابرُوا ولا يبِعْ بعْضُكُمْ عَلَى بيْعِ بعْضٍ، وكُونُوا عِبادَ اللّٰه إِخْواناً. المُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لا يَظلِمُه ولا يَحْقِرُهُ ولا يَخْذُلُهُ. التَّقْوَى هَاهُنا ويُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلاثَ مرَّاتٍ بِحسْبِ امْرِيءٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِر أَخاهُ المسلم. كُلَّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حرامٌ دمُهُ ومالُهُ وعِرْضُهُ) رواه مسلم.

دیسان ئەو فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: حەسودیو بەخیلی بەیەکتری مەبەن و، کۆستە کۆستە لەیەکتری مەکەن و کینەو دەغەز لەیەکتری مەکێشن و پشت لەیەکتری مەکەن و لەیەکتری لوتە لامەبن و کڕیار یا فرۆشیار

---

١٣ تیرمذي (١٩٢٨).

١٤ موسلیم (٢٥٦٤).



لەیەکتری هەڵمەگێڕنەوە، وەك برا بەندەی خودا بن، موسوڵمان برای موسوڵمانە، نابێ زۆرو ناهەقی لێ بکا، نابێ بەچاوی سووك تەماشای بکا، نابێ پشتی لەزەوی بداو دەستە شکێنی بکا، حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) سێ جار دەستی نایە سەر دڵی‌و فەرمووی: تەقواو ترسی خودا وا لێرەدا، لەناو دڵدا، بەسە بۆ خراپی موسوڵمان کە بەچاوی سووك تەماشای برای موسوڵمانی خۆی بکا! هەموو شتێکی موسوڵمان بە موسوڵمانێکی تر حەرامە: خوێنی، سامان‌و ماڵی، شەرەف‌و ئابڕوو و نامووسی (م).

کەدڵ بە تیشکی تەقوا ناو درا
بەندە رووی دەبێ بە شەوقی چرا
ئەندامی یەك یەك پلوسکی نوورن
لە تەڵخی‌و لیڵی دەروونی دوورن!

٢٣٦/١٥-[١٥]- وعن أَنسٍ رضي اللّٰه عنه عن النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (لا يُؤْمِنُ أَحدُكُمْ حتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ) متفقٌ عليه.

لە زنجیرە (٢٢)دا رابورد، واتە: فەرموودەی سێیەم لەباسی (ئامۆژگاری)، بڕوانە ژمارە (١٨٣).

٢٣٧/١٦-[١٦]- وعنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِماً أَوْ مَظْلُوماً» فقَالَ رَجُلٌ: يَا رسول اللّٰه أَنْصرهُ إِذَا كَانَ مَظلُوماً أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ ظَالِماً كَيْفَ أَنْصُرُهُ ؟ قال: (تَحْجُزُهُ أَوْ تَمْنعُهُ مِنَ الظُّلْمِ فَإِنَّ ذلِك نَصْرُهُ) رواه البخاري.

ئەنەس (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: یاریدەی برای خۆت بدە، لەسەر هەق بێ، یا لەسەر ناهەق بێ! پیاوێکیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر لەسەر هەق بێ ئەوا جێگەی خۆیەتی یارمەتی دەدەم، وەلێ پێم بفەرموو ئەگەر لەسەر ناهەق بوو چۆن چۆنی یارمەتی بدەم؟ فەرمووی: مەهێڵە ئەو ناهەقیە بکا ئەوە باشترین یارمەتییە بۆی! (ب). ئەم جۆرە فەرمایشتە بەشێوە فەرمانە بەیارمەتی ناهەقیکەر، بەڵام وەکی ترو لە ڕاستیدا فەرمانە بە

---

١٥ بڕوانە ژمارە (١٨٣).

١٦ بوخاری (٢٤٤٣).

یارمەتی ناهەقی لێ کراو، لە زیمنی ئەوەشدا لازمی مەعنای یارمەتیدانیش بۆ ناهەقیکەر دەگەیەنێ (وەرگێڕ).

١٧/٢٣٨-[١٧] وعن أَبي هريرة رضي اللّٰه عنه أَنَّ رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (حقُّ الْمُسْلمِ عَلَى الْمُسْلِمِ خمسٌ: رَدُّ السَّلامِ، وَعِيَادَةُ الْمرِيضَ، واتِّبَاعُ الْجنَائِزِ، وإِجابة الدَّعوةِ، وتَشمِيت العَاطِسِ) متفق عليه. وفي رواية لمسلم: (حق الْمُسْلم على المسلم ستٌّ: إذا لَقِيتَهُ فسلّم عليْهِ، وإذَا دَعاكَ فَأَجبْهُ، وَإذَا اسْتَنْصَحَكَ فَانْصح لَهُ، وإِذا عطَس فحمِدَ اللّٰه فَشَمِّتْهُ. وَإِذَا مرِضَ فَعُدْهُ، وَإِذَا ماتَ فاتْبعهُ)).

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لەحەزرەتەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: مافی موسوڵمان لەسەر موسوڵمان پێنجن: وەڵامدانەوەی سلاو، سەرلێدانی نەخۆش، شوێنکەوتنی تەرم، چوون بۆسەر دەعوەتو بانگێشتن، نزاکردن بۆ پژمیو (ش). لە گێڕانەوەیەکی موسلیمدا: دەفەرموێ (درودی خوای لەسەر بێ): بە یاسای شەرع موسوڵمان شەش مافی تایبەتی لەسەر موسوڵمان هەیە: یەکەم کاتی توشی دەبێ سلاو رۆژباشی لێ بکا، دووەم ئەگەر خولکی کرد بۆ سەر شاییو شتی وا با بچێ بۆسەر بانگێشتەکەی، سێیەم کاتێ داوای ئامۆژگاری لێ کردیت ئامۆژگاری باشی بکەو بەشێوەیەکی گشتی هەرچیت پێ خۆشە بۆ خۆت بۆ ئەویش ئەوەت پێ خۆش بێ، چوارەم کاتێ دەپژمێ-ئەگەر سوپاسی خودای کرد لە دوای پژمەکەو گوتی: (الحمد لله: سوپاس بۆ خودا)- تۆش نزای بۆ بکەو پێی بلێ: (یرحمك الله: خودا رەحمت پێ بکا)، پێنجەم ئەگەر نەخۆش کەوت سەری لێ بدەو لەکاتی ناساخیدا هەواڵپرسی لێ بکە، شەشەم کاتێ دەمرێ شوێن تەرمەکەی بکەوەو ئەگەر لەگەڵیا تا سەر گۆڕستانەکە بچیت چاکترە.

١٨/٢٣٩-[١٨] وعن أَبي عُمارة الْبراءِ بنِ عازبٍ رضي اللّٰه عنهما قال: أَمرنا رسولُ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم بِسبْعٍ: أَمرَنا بِعِيادة الْمرِيضِ، وَاتِّبَاعِ الْجنازةِ، وتَشْمِيتِ الْعاطِسِ، وَإِبْرارِ الْمُقْسِمِ، ونَصْرِ المظْلُومِ، وَإجابَةِ الدَّاعِي، وإِفْشاءِ السَّلامِ. وَنَهانَا عَنْ خواتِيمَ أَوْ تَختُّمٍ بالذَّهبِ، وَعنْ شُرْبٍ بالفضَّةِ، وعَنِ المياثِرِ الحُمْرِ، وَعَنِ الْقَسِّيِّ، وَعَنْ

١٧ بوخاری (١٢٤٠)، موسلیم (٢١٦٢)و (٥).

١٨ بوخاری (١٢٣٩)، موسلیم (٢٠٦٦).

لُبْسِ الحَرِيرِ وَالإِسْتَبْرَقِ وَالدِّيبَاجِ. متفق عليه. وفي روايةٍ: وإِنْشَادِ الضَّالةِ فِي السَّبْعِ الأولِ.

ئەبو عیمارە بەرای کوڕی عازیب (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کردین بە حەوت شت، وە جڵەوگیری لێ کردین لە حەوت شت، فەرمانی پێ کردین بە سەردانی نەخۆشو دواکەوتنی تەرمو نزا بۆ پژمیو و بەجێهێانی سوێندو یاریدەی ستەمبارو چوون بۆ سەر دەعوەتو پەخشکردنەوەی سلاو، جڵەو گیریشی لێ کردین لەم حەوتە: ئەنگوستیلەی زێڕو لەشت خواردنەوە بە حاجەتی زیوو، لە نەرمە زینی سووری بەرگ ئاورشمین، لە کالاو مشکیو هەوری پۆشینی تێکەڵ لەئاوریشمو شتی تر، لە ئیستەبرەقو دەیباج (ش). لە گێڕانەوەیەکدا: فەرمانی پێکردین بەبانگەواز هەڵدان بۆ شتی ون بوو، لەملاولا جاڕ هەڵدا: کێ شتی ون بووە با لەمن بپرسێ.

## ٢٨- باسی پۆشینی نەنگو شەرمگەو عەورەتی موسوڵمانان وە نەهی کردن لە هەڵماڵینی نەنگو نهێنی موسوڵمان، مەگەر لەبەر ناچاری
## بالستر عورات المسلمين والنهي عن اشاعتها لغير الضرورة

قال تعالى: ﴿أن الذين يحبون أن تشيع الفاحشة في الذين آمنوا لهم عذاب أليم في الدنيا والآخرة﴾النور/١٩. واتە: ئەوانەی حەز دەکەن نەنگی موسوڵمانان درکەوێو باسی ناموسی خەڵك بە خراپە دەکەنو بە ناهەق ئابڕوویان دەبەن، ئەم جۆرە نامەردانە لە هەردوو جیهانا خودای گەورە سزای سەختی پڕ ئێشو ئازاری بۆ بڕیونەتەوە.

٢٤٠/١-[1]- وعن أَبي هريرة رضي اللّه عنه عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (لا يسْتُرُ عَبْدٌ عبْداً فِي الدُّنْيَا إِلاَّ سَتَرهُ اللّه يَوْمَ الْقيامَةِ) رواه مسلم.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (درودی خوای لەسەر بێ): هەر کەسێ عەیبو نەنگیی یەکێ لەبەندەکانی خودا بپۆشێ، یا جەستەو لەشی بە پۆشاکێ بپۆشێ ئەوە خودا ئەو کەسە لەهەردوو جیهانا بەبەرگی ڕەحمەتی خۆی دادەپۆشێ (م/تاج).

---

١ موسليم (٢٥٩٠)و (٧٢).

٢٤١/٢-[٢]- وعنه قال: سمِعت رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم يقول: (كُلُّ أَمَّتِي مُعَافًى إلاَّ الْمجاهرِينَ، وإنَّ مِن الْمجاهرةِ أَن يعمَلَ الرَّجُلُ بالليلِ عملاً، ثُمَّ يُصبِحَ وَقَدْ سَترهُ اللّه عَلَيْهِ فَيقُولُ: يَا فلانُ عَمِلْتُ الْبارِحَةَ كذَا وَكَذَا، وَقَدْ بَاتَ يَسْتره ربُّهُ، ويُصْبِحُ يَكْشفُ سِتْرَ اللّهِ) متفق عليه.

ديسان ئەبو هورەيرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ژنەوتم لەزاری پیرۆزی حەزرەت خۆی (درودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: ئوممەتم هەموویان بەر عەفوو لێبوردنی خودا دەکەون، مەگەر ئەوانەیان کە سرِی خۆیان هەڵدەماڵن، وەك ئەوە کابرایە لە شەودا کارێکی ناشیرین دەکا، وە خودا بۆی دەپۆشێ، کەچی بۆ بەیانی دەچێ تاوانی خۆی ئاشکرا دەکاو دەیگێڕێتەوە دەڵێ: ئەی فیسار! من دوێ شەو ئیشێکی واوام کرد! تەماشاکەن ئەو کابرایە خودا بەشەو پەردەی بۆ دەکاو بە پەردەی میهری خۆی نەنگی دەپۆشێ، کەچی ئەو ئەوەندە بێ باكو بێ ئاگایە بە رۆژ دەچێ پەردەی خودا لەسەر نەنگو عەیبی خۆی هەڵ دەداتەوە! (ش).

٢٤٢/٣-[٣]- وعنه عن النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (إذَا زَنَتِ الأَمةُ فَتبينَ زناهَا فَليجلدْها الحدَّ، ولا يُثرِّبْ عَلَيْهَا، ثمَّ إنْ زَنَتِ الثَّانية فَلْيجلدْها الحدَّ ولا يُثرِّبْ عَلَيْهَا، ثُمَّ إنْ زَنتِ الثَّالثةَ فَلْيبعَها ولوْ بِحبْلٍ مِنْ شعرٍ) متفق عليه. «(التَّثْرِيبُ)»: التَّوْبيخُ.

دیسان فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەگەر کەنیزەك زینای کردو ئیسپات بوو، با خاوەنەکەی داری حەددی لێ بداو ئیتر سەرکۆنەی نەکاو هەموو کاتی نەیداتەوە بە چاویا، جا ئەگەر دیسان زینای کردەوە با دووبارە داری حەددی لێ بداتەوەو ئیتر سەرکۆنەی نەکا، بەڵام ئەگەر بۆ جاری سێیەم زینای کردەوە ئیتر ئەگەر فرۆشتوویەتی بە پەتێکی موو با بیفرۆشێ (ش). (کەنیزەك واتە: ئەمەتە).

٢٤٣/٤-[٤]- وعنه قال: أُتِيَ النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم بِرجلٍ قَدْ شرِب خَمْراً قَال: «اضْرِبُوهُ» قال أَبو هُرَيْرةَ: فمِنَّا الضَّارِبُ بِيدهِ والضَارِبُ بِنَعْلِه، والضَّارِبُ بثوبِهِ. فَلَمَّا

---

٢ بوخارەی (٦٠٦٩)، موسلیم (٢٩٩٠).

٣ بوخاری (٢٥٥٥)، موسلیم (١٧٠٣).

٤ بوخاری (٦٧٨١).

انْصَرَفَ قَال بعْضُ الْقَومِ: أَخْزاكَ اللّٰه، قال: لا تقُولُوا هَكَذا لا تُعِينُوا عليه الشَّيْطان) رواه البخاري.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کابرایەکیان هێنا بۆلای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کابرا مەست بوو، خواردبویەوە، فەرمووی: ئادەی لێی دەن! ئیتر ئێمەش دەستمان کرد بە لێدانی، هەمان بوو بە دەستی لێی دەدا، هەمان بوو بە سۆلەکەی. هەمان بوو بە جلەکەی، کە کابرا ڕۆیی هەندێ کەس گوتیان: خوا ڕوو زەردو شەرمەسارت بکا. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: وا مەڵێن، مەبن بە کۆمەکی شەیتان لە سەری!. (بوخاری ڕەحمەتی خوا لە گۆڕی نازداری)

بیکە بە پیشە دووعای خێر کردن
لە بۆ موسوڵمان، مەخصوص پاش مردن

(وەرگێڕ)

## ٢٩- باسی گەورەیی جێبەجێ کردنی کارو ئیشی موسوڵمانان
## باب في قضاء حوائج المسلمين

قال الله تعالى: ﴿وأفعلوا الخير لعلكم تفلحون﴾الحج/٧٧. واتە: چاکەو خێر بکەن، ئومێدە سەرفرازو سەرکەوتوو بن.

١/٢٤٤-[١]- وعن ابن عمرَ رضي اللّٰهُ عنهما أَن رسولَ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم قال: «المسلمُ أَخـو المسلم لا يَظلِمُه ولا يُسْلِمُهُ. ومَنْ كَانَ فِي حاجةِ أَخِيهِ كانَ اللّٰهُ فِـي حاجتِهِ، ومنْ فَرَّجَ عنْ مُسلمٍ كُرْبَةً فَرَّجَ اللّٰهُ عنه بها كُرْبَةً من كُرَبِ يـومَ القيامـةِ، ومـن سَتَرَ مُسْلماً سَتَرَهُ اللّٰهُ يَومَ الْقِيامَةِ) متفق عليه.

لەباسی (٢٧)دا ڕابوورد، فەرموودەی ژمارە (٢٣٣)و (٢٣٤).

٢٤٥/٢-[٢]- وعن أَبي هريرة رضي اللّٰه عنهُ، عن النبـي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (من نَفّس عن مؤمن كُرْبة منْ كُرب الدُّنْيا، نفّس اللّٰه عنْه كُرْبة منْ كُرَب يوم الْقِيامَـةِ، ومـنْ يسَّرَ على مُعْسرٍ يسَّرَ اللّٰه عليْه في الدُّنْيَا والآخِرةِ، ومنْ سَتَر مُسْلِماً سَترهُ اللّٰه فِـي الـدنْيا والآخرة، واللّٰه فِي عوْنِ العبْد ما كانَ العبْدُ في عوْن أَخيهِ، ومنْ سلك طَرِيقاً يلْتَمسُ فيـهِ

---

١ بڕوەانە ژمارە (٢٣٣) لە پێشەوە ڕابورد.

٢ موسلیم (٢٦٩٩).

عِلْماً سهَّل اللّٰه لهُ به طريقاً إلى الجنَّة. وما اجْتَمَعَ قوْمٌ فِي بيْتٍ منْ بُيُوتِ اللّٰه تعالَى، يتْلُون كِتَابَ اللّٰه، ويَتدارسُونهُ بيْنَهُمْ إلاَّ نَزَلَتْ عليهم السَّكِينةُ، وغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمةُ، وحفَّتْهُمُ الملائكَةُ، وذكَرهُمُ اللّٰه فيمَنْ عنده. ومنْ بَطَّأَ به عَملُهُ لمْ يُسرعْ به نَسَبُهُ) رواه مسلم.

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ** (درودی خوای لەسەر بێ):

**هەرکەسێ موسوڵمانێ لە مەینەتێ لەمەینەتیەکانی جیهان رزگار بکا، خودا لەپاداشتی ئەوەدا مەینەتێ لەمەینەتەکانی رۆژی قیامەتی بۆ چار دەکاو ڕزگاری دەکا لێی، وەهەرکەسێ موسوڵمانێ لە تەنگانەیێ قوتار بکا، یا دەست گیرۆیی هەژارو نەدارایێ بکا خودا لە دونیاو لە قیامەتدا دەستگیرۆیی دەکا، لەتەنگانە قوتاری دەکا، وە هەرکەسێ عەیبو نەنگیی موسوڵمانێ بپۆشێ، یا جەستەو لەشی بە پۆشاکێ داپۆشێ ئەوە خودا ئەو کەسە لەهەردوو جیهاندا بەبەرگی رەحمەتی خۆی دادەپۆشێ، وە خودا لەپشتی ئەو بەندەیە، کە پشتی برای ئایینی خۆی دەگرێ، هەرکەسێ ڕێگەی زانست بگرێو وێڵی دوای ڕێگەی زانستو زانین بێ خودا ڕێگەی بەهەشتی بۆ خۆش دەکا، وە هەر کۆمەڵێ لەماڵێ لە ماڵەکانی خودادا کۆببنەوەو نامەی خودا بخوێننو لەناو خۆیاندا، دەوری قورئانی پیرۆز بکەنەوەو واتەو مانای لێك بدنەوە، ئەوە بێگومان کەوا پەری میهرو دڵنیایی بەسەریاندا دادەبارێو رەحمەتو میهرەبانی دایان دەپۆشێو فریشتە دەوریان لێ دەدەن، وە خودایش لەبارەگای خۆی لەلای مەلەئی ئەعلا، لەناو ئەنجوومەنی هەرە بالادا، باسی چاکیو چاکەکەیان دەکا، وە هەرکەسێ کارو کردەوەی خۆی دوای بخا بنیچەو رەسەنی پێشی ناخا! (م).**

## ٣٠- باسی تکا کردن (باب الشفاعة)

**قال تعالى: ﴿من يشفع شفاعة حسنة يكن له نصيب منها﴾النساء/٨٥.**
**واتە:هەرکەسێ بەپێی شەرع تکا لە کەسێ بکاو کارێکی رەوای موسوڵمانێکی پێ رایی بکا، ئەوە خودا پێی خۆشەو لەباتی ئەوە تۆڵەی چاکی بۆ دەکاتەوە.**

١/٢٤٦–[١]– وعن أَبي موسى الأَشعري رضي اللّٰه عنه قال: كان النبـي صَلّى اللّٰه عَلَيْهِ وسَلَّم إِذَا أَتَاهُ طَالِبُ حاجةٍ أَقْبَلَ عَلَى جُلسائِهِ فقال: (اشْفَعُوا تُؤجَرُوا ويَقْضِي اللّٰه عَلَى لِسان نَبِيِّهِ ما أَحبَّ) متفق عليه. وفي رواية: (مَا شَاءَ).

---

**١ بوخاری (١٤٣٢). موسلیم (٢٦٢٧).**

ئەبو مووساى ئەشعەرى (ڕەزاى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: جاران كە حەزرەت (درودى خواى لەسەر بێ) نیازمەندێ دەهاتە خزمەتى بۆ كارێكى خۆى، رووى دەكردە دانیشتوانى خزمەتىو دەیفەرموو: تكاى باش بكەن بۆ داماوانو نیازمەندان، تا كرێو پاداشتى باشى لەسەر وەربگرن، هەرچیش نیازى خوداى گەورەى لەسەر بێ ئەوا خودا لەسەر زمانى پێغەمبەرى بەیانى دەكا (ش).

٢٤٧/٢-[٢]– وعن ابن عباس رضي اللّٰه عنهما في قِصَّة بريرَةَ وزَوْجِها. قال: قال لَهَا النبي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (لَوْ راجَعْتِهِ ؟) قَالتْ: يا رَسُولَ اللّٰه تأْمُرُنِي ؟ قال: (إِنَّما أَشْفَعُ) قَالَتْ: لا حاجة لِي فِيهِ. رواه البخاري.

ئیبنو عەبباس (ڕەزاى خوداى لەسەر بێ) لەشانى چیرۆكى جیابوونەوەى بەریرە لە مێردەكەیدا فەرمووى: پێغەمبەر (درودى خواى لەسەر بێ) بەبەریرەى فەرموو: بۆ ناگەڕێیتەوە بۆلاى مێردەكەت؟ بەریرەش گوتى: ئەمە فەرمانەو پێم دەكەى، یا تكایەو لێم دەكەى؟ فەرمووى: ئەوە تكایەو دەیكەم، گوتى: دەكارم پێى نەماوەو نامەوێ (ب).

## ٣١- باسى ناوبژى كردنو نێوان ڕێكخستن (باب الإصلاح بين الناس)

قال الله تعالى: ﴿لا خير في كثير من نجواهم إلا من أمر بصدقة أو معروف أو إصلاح بين الناس﴾النساء/١١٤. وقال تعالى: ﴿والصلح خير﴾النساء/١٢٩.

وقال تعالى: ﴿فاتقوا الله وأصلحوا ذات بينكم﴾الأنفال/١. وقال تعالى: ﴿إنما المؤمنون إخوة فأصلحوا بين أخويكم﴾الحجرات/١٠.

مەبەست لە ئایەتە پیرۆزەكان: ئەو سرتە سرتو چپە چپەى ئەو خەڵكە دەیكەن زوربەى بێ سوودو بێ هودەیەو قسەى رووتى بۆشى بەتاڵە، قسەى باشو گوتارى رەوا ئەوەیە باسى خێرو چاكە كردن بكاو ڕێگەى چاكە نیشانى مەردووم بداو نێوانى خەڵك ڕێك بخاو مایەى خۆشى خەڵكو رەزاى خودا بێ، موسوڵمان ئەو موسوڵمانەیەلەخوا بترسێو لەبەر رەزاى ئەو بتوانێ دوو كەس ڕێك بخا، دوو موسوڵمان ئاشت بكاتەوە، چونكە موسوڵمان براى موسوڵمانە، براش ئەگەر برا بێ خراپەى بۆ براى خۆى ناوێ.

---

٢ بوخارى (٢٥٨٣).

**١/٢٤٨- لەباسی زۆری ڕێگەی خێرو چاکەدا رابورد، فەرموودەی دووەم‌و شەشەم (بڕوانە٦/ ١٢٢).**

٢/٢٤٩-[٢]- وعن أُمِّ كُلْثُوم بنتِ عُقْبَةَ بن أَبي مُعَيْطٍ رضي اللّه عنها قالت: سمِعْتُ رسولَ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم يَقُولُ: (لَيْسَ الْكَذّابُ الذي يُصْلحُ بَيْنَ النّاسِ فَيَنْمي خَيْراً، أَوْ يَقُولُ خَيْراً) متفق عليه. وفي رواية مسلمٍ زيادة، قالت: وَلَمْ أَسْمَعْهُ يُرَخِّصُ في شَيْءٍ مِمّا يَقُولُهُ النّاسُ إلاّ في ثلاثٍ، تَعْني: الحَرْبَ، وَالإصْلاَحَ بَيْنَ النّاسِ، وَحَدِيثَ الرَّجُلِ امْرَأَتَهُ، وَحَديثَ المَرْأَةِ زَوْجَهَ.

**ئوممو کەلثوومی کچی عەقەبە** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: ژنەوتم لە حەزرەت خوای** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: بەو کەسە ناگوترێ درۆزن کە میانەی خەڵك ڕێك دەخاو قسەی باش لە نێوانیاندا دێنێ‌و دەبا، با ئەو قسەیەش کە دەیکا لەو بەینەدا خۆی دروستی بکا! (ش).**

**لە گێڕانەوەیەکی موسلیمدا: ئوممو کەلثووم فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **نەبووە کە ڕێگەی دەمەتەقێ‌و باس‌و خواسی ئەو خەڵکە بدا، مەگەر بۆ یەکێ لەم سێ شتە: بۆ جەنگ‌و بۆ ناوبژی‌و ئاشت کردنەوەی مەردووم لەناو خۆیاناو بۆ قسەی خۆشی ژن‌و مێرد کە بۆ رابواردن‌و دەمەتەقێ دەیکەن لە نێوانی هەردووکیانا.**

٣/٢٥٠-[٣]- وعن عائشة رضي اللّه عنها قالت: سمِع رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم صَوْتَ خُصُومٍ بالْبَابِ عَالِيَةٍ أَصْواتُهُمَا، وَإذَا أَحَدُهُمَا يَسْتَوْضِعُ الآخَرَ وَيَسْتَرْفِقُهُ في شيءٍ، وَهُوَ يَقُولُ: واللّهِ لا أَفعَلُ، فَخرَجَ عَلَيْهِمَا رسولُ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم فقال: (أَيْنَ الْمُتَأَلِّي عَلَى اللّه لا يَفْعَلُ المَعْرُوفَ ؟) فقال: أَنَا يَا رسولَ اللّهِ، فَلَهُ أَيُّ ذلِكَ أَحَبَّ. متفقٌ عليه.

**عائیشە** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **گوێی لە قیرە قیرێ بوو لە پشت دەرگاکەوە هاو داواکان کردبوویان بە هەراو زەنا، قەرزارەکە داوای لە خاوەن قەرزەکە دەکرد کە دڵی بەحاڵی بسوتێ‌و هەنێ لە قەرزەکەی سەری بۆ**

---

٢ بوخاری(٢٦٩٢)، موسلیم (٢٦٠٥).

٣ بوخاری (٢٧٠٥٩، موسلیم (١٥٥٧).



دابشکێنێ، ئەویش دەیگوت: بەخودا نایکەم، حەزرەتیش (دروودی خوای لەسەر بێ) دەرچوو بۆ لایان و فەرمووی: ئەوە کێیە بەخودا سوێند دەخوا دەیکا بە بیانوو بۆ ئەوەی کە چاکە ناکا؟ خاوەن قەرزەکەیش گوتی: ئەوە منم ئەی پێغەمبەری خودا! کەواتە هاوڕێکەم چۆن حەز دەکا با وابێ و چەندەم لە قەرزەکەم دەداتەوە کەیفی خۆیەتی! (ش).

٢٥١/٤-٤- وعن أَبي العباس سهلِ بنِ سعدٍ السَّاعِدِيِّ رضي اللَّهُ عنه، أن رسولَ اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم بلَغهُ أَنَّ بَني عَمْرِو بن عوْفٍ كان بيْنهُمْ شرٌّ، فَخَرَجَ رسولُ اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يُصْلِحُ بَيْنَهمْ فِي أُنَاسٍ مَعَه، فَحُبِسَ رسول اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم وَحَانَتِ الصَّلاَةُ، فَجاءَ بِلالٌ إِلَى أَبِي بَكْرٍ رضي اللَّه عنهما فقال: يَا أَبَا بَكْرٍ إِنَّ رسولَ اللَّهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قَدْ حُبِسَ، وَحَانَتِ الصَّلاَةُ، فَهَلْ لكَ أَنْ تَؤُمَّ النَّاس؟ قَالَ: نَعَمْ إِنْ شِئْتَ، فَأَقَامَ بِلالٌ الصَّلاَةَ، وتقَدَّمَ أَبُو بَكْرٍ فكَبَّرَ وكبَّرَ النَّاسُ، وَجاءَ رسول اللَّه يَمْشِي في الصُّفوفِ حتَّى قامَ في الصَّفِّ، فَأَخَذَ النَّاسُ فِي التَّصْفِيق، وكَانَ أَبو بَكْرٍ رضي اللَّه عنه لا يَلْتَفِتُ فِي صلاتِهِ، فلَمَّا أَكْثَرَ النَّاسُ التَّصْفِيقَ الْتَفتَ، فَإِذَا رسولُ اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، فَأَشَار إِلَيْهِ رسول اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، فَرَفَعَ أَبُو بَكْر رضي اللَّه عنه يدَهُ فَحمِد اللَّه، وَرَجَعَ القهقرى وَراءَهُ حَتَّى قَامَ فِي الصَّفِّ، فَتقدَّمَ رسول اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، فَصلَّى للنَّاسِ، فَلَمَّا فرغَ أَقْبلَ عَلَى النَّاسِ فقال: (أَيُّهَا النَّاسُ مالَكُمْ حِين نَابَكُمْ شَيْءٌ في الصَّلاَةِ أَخذْتمْ فِي التَّصْفِيقِ ؟، إِنَّما التَّصفِيقُ لِلنِّسَاءِ. منْ نَابهُ شيءٌ فِي صلاتِهِ فَلْيَقلْ: سُبْحَانَ اللَّهِ ؟ فإِنَّهُ لا يَسْمعُهُ أَحدٌ حِينَ يَقُولُ: سُبْحانَ اللَّهِ، إِلاَّ الْتَفتَ. يَا أَبَا بَكْرٍ: ما منعَكَ أَنْ تُصلِّيَ بِالنَّاسِ حِينَ أَشرْتُ إِلَيْكَ ؟) فقال أَبو بكْرٍ: مَا كَانَ ينبَغِي لابْنِ أَبِي قُحافَةَ أَنْ يُصلِّيَ بِالنَّاسِ بيْنَ يَدَيْ رسولِ اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم. متفقٌ عليه.

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) چوو بۆ هۆزی بەنی عەمری کوڕی عەوف، بۆ ناوبڕی هەتا ئاشتیان بکاتەوە، چوونکی ژنەوتبووی کە شەڕیان بووە! چەند کەسێکی تریش لە خزمەتیا چوون، جا لەوێ گلی خواردەوە، تا نوێژ بوو، جا بیلال (ڕەزای خودای لەسەر بێ) کە بانگدەری حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) بوو هات بۆلای ئەبو بەکرو پێی فەرموو: ئەوەتا پێغەمبەر

---

٤ بوخاری (١٢٣٤)، موسلیم (٤٢١).

(درودی خوای لەسەر بێ) گل دراوەتەوەو نوێژیش بووە، ئەگەر قامەت بکەم بەرنوێژیەکە دەکەی بۆ خەڵکەکە؟ فەرمووی: بەڵێ دەیکەم ئەگەر ئارەزووت هەبێ. جا بیلال قامەتی کردو ئەبو بەکر پێشکەوتو ئەڵڵاهو ئەکبەری نوێژ دابەستنی کردو خەڵکەکەی تریش لە پشتیەوە بە گوتنی (الله اكبر)نوێژیان دابەست، جا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) هاتەوە بەڵام هێشتا نوێژەکەیان نەکردبوو، جا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) یەکە یەکە دڕی بە ریزەکان دا تا خۆی گەیاندە ریزی یەکەم‌و لەوێ وەستا، ئیتر خەڵکەکە دەستیان کرد بە چەپڵە لێدان، ئەبو بەکریش عادەتی نەبوو لەناو نوێژدا لابکاتەوە، بەڵام کەدی خەڵکەکە چەپڵەیەکی زۆر لێدەدەن ئەویش ئاوڕی دایەوەو پێغەمبەری دی، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ئیشارەتی بۆ کرد: کە لە شوێنی خۆت بمێنەرەوەو نوێژەکەمان بۆ تەواو بکە. بەڵام ئەبو بەکر هەردوو دەستی خۆی بەرزکردەوەو سوپاسی خودای کرد لەسەر ئەم دەستی خێرەی کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بەو فەرمانە لەوی نا، ئینجا پاشەو پاش گەڕایەوە دواوە هەتا ڕێك چووە ناو ریزەکەو لەوێ وەستا، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) پێشکەوتو بەرنوێژەکەی کرد بۆ خەڵکەکە، کە لە نوێژەکە بۆوە رووی کردە خەڵکەکەو فەرمووی: ئەوە بۆ ئەو هەموو چەپڵەیەتان لێدا، هەرکەسێ لەناو نوێژدا شتێکی لێ روودا، با بڵێ (سبحان الله)، چونکە کە (سبحان الله)ی کرد ئیتر تێدەگەن لە مەسەلەکە، وەڵێ چەپڵە لێدان لەناو نوێژدا بۆ ژنانە. فەرمووشی: ئەی ئەبو بەکر! ئەوە بۆ فەرمانم پێ کردیت نەمایتەوە لە شوێنی خۆت‌و نوێژەکەت تەواو نەکرد بۆ مەردوومەکە؟ ئەبو بەکر (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بۆ من نەهاتووە کە پێش تۆ بکەوم‌و هەتا تۆ حازر بی من رادەی ئەوەم نییە بەرنوێژی بۆ مەردووم بکەم (ش).

## ٣٢- باسی بەهرەی لازەبوونان‌و هەژاران‌و بێ نەواو بێ نموودانی موسوڵمانان
## باب فضل ضعفة المسلمين والفقراء والخاملين

قال الله تعالى: ﴿واصبر نفسك مع الذين يدعون ربهم بالغداة والعشيّ يريدون وجهه ولا تعد عيناك عنهم﴾الكهف/٢٨.

واتە: ئەی پێغەمبەری خودا! خوو بگرە بە هاوڕایی هەژارە خواناسەکانەوەو خۆت بەند بکە بەوانەوە، ئەوانە بەیانی‌و ئێوارە عیبادەت‌و بەندەیی ساخ بۆ

خودای خۆیان دەکەن، تەنیا بۆ ڕەزای خودا، نەك بۆ سوودی دنیایی خۆیان، نەکەی لەوان بێزار ببیو چاو ببڕیتە هاوڕێیەتی کەسانی تر!

٢٥٢/١-[١]- عن حَارِثَةَ بْنِ وهْب رضي اللّٰه عنه قال: سمعتُ رسولَ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يقولُ: (أَلا أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ الجَنَّةِ ؟ كُلُّ ضَعيفٍ مُتَضَعِّفٍ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللّٰه لأبرَّه، أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بَأَهْلِ النَّارِ؟ كُلُّ عُتُلّ جَوَّاظٍ مُسْتَكْبِرٍ). متفقٌ عليه.

حاریثەی کوڕی وەهب (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بیستم لە حەزرەت خوای (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: ئەدی با پێتان بێژم کەکێ بەهەشتییە؟ ئەو مرۆڤە لازەبوونو بێ هێزو بێ پەنایانەی کەلەبەر بێ نەوایی‌و بێ دەرەتانی خەڵك بەچاوی سووك‌و بەبێ قەدر تەماشایان دەکەن، ئەوانە هەموویان بەهەشتین، ئەوانە گەرچی (وەك گوترا)وان‌و حاڵیان هەژارە، بەڵام لای خودا ئەوەندە بەقەدرو بەڕێزو خاوەن نازو نازدارن داوای هەرچی لە خودا بکەن، خودا دڵیان ناشکێنێ، تەنانەت ئەگەر پێشەکی سوێند لەسەر شتێ بخۆن‌و وڕکی شتێ لە خودا بگرن سوێندەکەیان ناخاو کارەکەیان بۆ دەکا!

دەی با پێشتان بڵێم کە کێ دۆزەخییەو نیشانەی پیاوی دۆزەخی چییە؟ بزانن هەموو چارە قورسێکی موقنی مۆنی چرووکی پوولەکی خێرنەکەری فیزاوی دەعیەدار دۆزەخییە!

٢٥٣/٢-[٢]- وعن أَبي العباسِ سهلِ بنِ سعدٍ الساعِدِيِّ رضي اللّٰه عنه قال: مرَّ رجُلٌ على النبي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم فقالَ لرجُلٍ عِنْدَهُ جالس: (ما رَأْيكَ فِي هَذَا ؟) فقال: رَجُلٌ مِنْ أَشْرافِ النَّاسِ هذا وَاللّٰهِ حَرِيٌّ إنْ خَطَب أَنْ يُنْكَحَ وَإنْ شَفع أَنْ يُشَفَّعَ. فَسَكَتَ رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، ثُمَّ مَرَّ رَجُلٌ آخرُ، فقال له رسولُ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (مَا رأْيُكَ فِي هَذَا ؟) فقال: يا رسولَ اللّٰه هذا رَجُلٌ مِنْ فُقَرَاءِ الْمُسْلِمِينَ، هذَا حريٌّ إنْ خطَب أَنْ لا يُنْكَحَ، وَإِنْ شَفَع أَنْ لا يُشَفَّعَ، وَإِنْ قَالَ أَنْ لا يُسْمع لِقَوْلِهِ. فقال رسولُ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (هَذَا خَيْرٌ منْ مِلءِ الأَرْضِ مِثْلَ هذَا» متفقٌ عليه.

---

١ بوخاری (٤٩١٨)، موسلیم (٢٨٥٣).

٢ بوخاری (٥٠٩١).



سەهل (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پیاوێکی دەوڵەمەند لەلای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ڕەت بوو، فەرمووی: ئەم پیاوە چۆنە بەلاتانەوە؟ گوتیان: ئەمە پیاوێکی خانەدانە، بەخودا ئەمە شایستەی ئەوەیە ئەگەر داوای ژن بکا ژنی پێ بدرێ، ئەگەر تکایەك بکا تکای بگیرێ، ئەگەر قسەیە بکا گوێ بۆ قسەکەی شل بکرێ، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) بی دەنگ بوو، تا پیاوێکی هەژار لە موسوڵمانان لەوێوە ڕەت بوو، فەرمووی: ئەدی ئەم پیاوە چۆنە؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا: ئەمە پیاوێکە لە هەژارانی موسوڵمانانە ئەمە هەقی وایە کە ژنی پی نەدرێ، تکای نەگیرێ، گوێ لە قسەی نەگیرێ! پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: دەسا ئەمەیان باشترە لە پڕ زەوی لە وێنەی ئەوی تریان، قەدرو ڕێزو چاکی لەلای خودای گەورە بە دڵی پاکە بەماڵی زۆر نییە (ش/تاج).

٢٥٤/٣-[٣]- وعن أَبي سعيدٍ الخدري رضي اللّٰه عنه عن النبي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: «احْتجَّتِ الجنَّةُ والنَّارُ فقالت النَّارُ: فيَّ الجبَّارُونَ والمُتَكبِّرُونَ، وقَالتِ الجَنَّةُ: فيَّ ضُعفَاءُ النَّاسِ ومسَاكِينُهُم فَقَضَى اللّٰهُ بَيْنَهُما: إنَّك الجنَّةُ رحْمتِي أَرْحَمُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ، وَإِنَّكِ النَّارُ عَذابِي أُعذِّب بِكِ مَنْ أَشَاءُ، ولِكِلَيكُمَا عَلَيَّ مِلؤُها) رواه مسلم.

ئەبو سەعید (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەهەشتو دۆزەخ بوو بە دەمە قاڵەیان، دۆزەخ گوتی: من جێگەی ملهوڕو زەبرداران‌و دەعیەدارانم! بەهەشتیش گوتی: من جێگەی لاوازەبوون‌و بێ نەوایانی مەدوومم! خودایش ناوبژی کردن‌و فەرمووی: ئەی بەهەشت تۆ ڕەحمەتی منی، هەرکەسێ ئارەزوو بکەم تۆ دەکەم بە مایەی ڕەحمەتی خۆم بۆی، ئەی ئاگر! تۆیش سزای منی، هەرکەسێ ئارەزوو بکەم بە تۆ سزای دەدەم. ئەوەی کە لەسەر منە، هەردوو لاتان هەر کەسەتان لە ئەهلی خۆی پڕ بکەم! (م/خ).

٢٥٥/٤-[٤]- وعن أَبي هريرة رضي اللّٰه عنه عن رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (إِنَّهُ لَيأتِي الرَّجُلُ السَّمِينُ العْظِيمُ يَوْمَ الْقِيامةِ لا يزنُ عِنْد اللّٰه جناحَ بعُوضَةٍ) متفقٌ عَلَيه.

٣ موسلیم (٢٨٤٦).

٤ بوخاری (١٣٣٧)، موسلیم (٢٧٨٥).



**ئەبو هورەیرە لە حەزرەتەوە** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: لە رۆژی قیامەتدا پیاوی قەڵەو قەڵەوی زل زل دێن، بەڵام لەلای خودا سەنگی گرانی باڵی مێشوولەیەکیان نییە، واتە: قەدرو رێز لەلای خودا بە تاعەتو بێ وەیی‌و خێرو خێراتە، نەك بە گەدەو گیپاڵ! (ش/خ).**

٢٥٦/٥-[5]- وعنه أَنَّ امْرَأَةً سوْداءَ كَانَتَ تَقُمُّ المسْجِد، أَوْ شَابّاً، فَفقَدَهَا، أو فقده رسولُ اللّه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم، فَسَأَلَ عَنْهَا أَوْ عنهُ، فقالوا: مات. قال: (أَفَلا كُنْتُمْ آذَنْتُمُونِي) فَكَأَنَّهُمْ صغَّرُوا أَمْرَهَا، أَوْ أَمْرهُ، فقال: دُلُّونِي عَلَى قَبْرِهِ) فدلُّوهُ فَصلَّى عَلَيه، ثُمَّ قال: (إِنَّ هَذِهِ الْقُبُور مملُوءَةٌ ظُلْمةً عَلَى أَهْلِهَا، وإِنَّ اللّه تعالى يُنَوِّرُهَا لَهُمْ بصَلاتِي عَلَيْهِمْ) متفقٌ عليه.

**هەروەها ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: ژنێکی رەش یا (لاوێ) مزگەوتی دەماڵی، کە دەمرێ پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **ئاگای لێ نابێ، تا رۆژێ هەواڵی دەپرسێ، دەڵێن: مردووە، دەفەرموێ: ئەی بۆ هەواڵتان بەمن نەدا، گوتی: وەك بڵێی کاری ئەو مردووەیان بە سووك گرتبێ وابوو، پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: گۆڕەکەیم پێ نیشان بدەن، جا کە گۆڕەکەیان پێ نیشان دا چوو نوێژی لەسەر کرد، ئینجا فەرمووی** (درودی خوای لەسەر بێ)**: ئەم گۆڕانە سیخناخن لەتاریکی لەبەر تاریکی زۆر خاوەنەکانیان وەك لەتاریکستان دابن وایە، خودای بەتەواناو شکۆمەند بە مەرحەمەتی خۆی بەهۆی ئەم نوێژەوە کە من کردم لەسەریان بۆیان رۆشن‌و رووناك دەکاتەوە! (ش/ تاج نوقمی دەریای رەحمەتی خوابن).**

٢٥٧/٦-[6]- وعنه قال: قال رسول اللّه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (رُبَّ أَشْعثَ أغبرَ مدْفُوعٍ بالأَبْوَابِ لَوْ أَقْسمَ عَلَى اللّهِ لأَبرَّهُ) رواه مسلم.

**دیسان فەرمووی** (رەزای خودای لەسەر بێ)**: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: زۆر کەسی شڕۆڵەی پەرپووتی قژ ئاڵۆسکاوی، لەش‌و بەرگ خۆڵاوی‌و تۆزاوی، کەلەبەر بێ نموودی لەم دەرگاو دەرگا دەستی پێوە دەنێن، زۆر کەس هەیە لەم حاڵەو لەم رەنگە، لەناو خەڵکا وا بێ نموودو بێ بایەخە، بەڵام لەلای خودا ئەوەندە ناسك‌و**

---

٥ بوخاری (١٣٣٧)، موسلیم (٩٥٦).

٦ موسلیم (٢٦٢٢).

نازدارو بەقەدرو بەڕێزە، داوای هەرچی لێ بکا دەست نانێ بە ڕوویەوەو داوای جێبەجی دەکا. (م/خ).

٢٥٨/٧-[٧]- وعن أُسامَة رضي اللّٰه عنه عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (قُمْتُ عَلَى بابِ الْجنَّةِ، فإذَا عامَّةُ مَنْ دخَلَهَا الْمَسَاكِينُ، وأَصْحابُ الجَدِّ مَحْبُوسُونَ غيْر أَنَّ أَصْحاب النَّارِ قَدْ أُمِر بهِمْ إِلَى النَّارِ. وقُمْتُ عَلَى بابِ النَّارِ فَإِذَا عامَّةُ منْ دَخَلَهَا النِّسَاءُ) متفقٌ عليه.

ئوسامە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەبەر دەرگای بەهەشتا ڕاوەستام، ڕوانیم زۆربەی ئەوانەی لەپێش پێشا دەچنە ناو بەهەشتەوە هەژارو بێ نەواکانن، دەوڵەمەندو داراکان هێشتا هەر گلەوەدرابوون و چاوە چاویان بوو کە ڕێگە بدرێن بچنە ژوورەوە، وەلێ دۆزەخیەکان فەرمان درابوو کە بیانبەن بۆ دۆزەخ، وە لەبەر دەرگای دۆزەخا ڕاوەستام سەرنجم دا زۆربەی ئەوانەی کە دەچوونە ناو دۆزەخەوە ژنان بوون! (ش/خ).

٢٥٩/٨-[٨]- وعن أَبي هريرة رضي اللّٰه عنه عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (لَمْ يَتكَلَّمْ فِي المَهْدِ إلاَّ ثَلاَثَةٌ: عِيسى ابْنُ مريَمَ، وصَاحِب جُريْجٍ، وكَانَ جُرَيْجٌ رَجُلاً عَابِداً، فَاتَّخَذَ صَوْمَعةً فكانَ فِيهَا، فَأَتَتْهُ أُمُّهُ وَهو يُصلي فَقَالَتْ: يا جُرَيْجُ، فقال: يَاربِّ أُمِّي وَصَلاتِي فَأَقْبلَ عَلَى صلاتِهِ فَانْصرفتْ فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغدِ أَتَتْهُ وهُو يُصَلِّي، فقَالَتْ: يَا جُرَيْجُ، فقال: أَيْ رَبِّ أُمِّي وَصَلاتِي. فَأَقْبَلَ عَلَى صَلاتِهِ، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغد أَتَتْهُ وَهُو يُصَلِّي فَقَالَتْ: يا جُرَيْجُ فقال: أَيْ رَبِّ أُمِّي وَصَلاتِي، فَأَقْبَلَ عَلَى صَلاتِهِ، فَقَالَتْ: اللَّهُمَّ لا تُمِتْه حَتَّى ينْظُرَ إِلَى وُجُوه المومِسَاتِ. فَتَذَاكَّرَ بَنُو إِسْرائِيلَ جُرَيْجاً وَعِبادَتَهُ، وَكَانَتِ امْرَأَةٌ بغِيٌّ يُتَمَثَّلُ بِحُسْنِهَا، فَقَالَتْ: إِنْ شِئْتُمْ لأَفْتِنَنَّهُ، فتعرَّضَتْ لَهُ، فَلَمْ يلْتَفِتْ إِلَيْهَا، فَأَتَتْ رَاعِياً كَانَ يَأْوِي إِلَى صوْمعَتِهِ، فَأَمْكَنَتْهُ مِنْ نفسها فوقَع علَيْهَا. فَحملَتْ، فَلَمَّا وَلَدتْ قَالَتْ: هُوَ جُرَيْجٌ، فَأَتَوْهُ فاستنزلُوه وهدَمُوا صوْمعَتَهُ، وَجَعَلُوا يَضْرِبُونَهُ، فقال: ما شَأْنُكُمْ ؟ قالوا: زَنَيْتَ بِهذِهِ الْبغِيِّ فَولَدتْ مِنْك. قال: أَيْنَ الصبيُّ ؟ فَجاءَوا بِهِ فقال: دَعُونِي حَتَّى أُصَلِّي فَصلَّى، فَلَمَّا انْصَرَفَ أَتَى الصَّبِيَّ فَطَعنَ فِي بطْنِهِ وقالَ: يا غُلامُ مَنْ أَبُوكَ ؟ قال: فُلانٌ

---

٧ بوخاری (٥١٩٦)، موسلیم (٢٧٣٦).

٨ بوخاری (٣٤٣٦)، موسلیم (٢٥٥٠).

الرَّاعِي، فَأَقْبَلُوا على جُرَيْجٌ يُقَبِّلُونَهُ وَيَتَمَسَّحُونَ بِهِ وقَالُوا: نَبْنِي لَكَ صومَعَتَكَ مِنْ ذَهَبٍ قال: لا، أَعيدُوهَا مِنْ طِينٍ كَمَا كَانَتْ، فَفَعَلُوا. وَبَيْنَا صَبِيٌّ يرْضَعُ مِنْ أُمِّهِ، فَمَرَّ رَجُلٌ رَاكِبٌ عَلَى دابَّةٍ فارِهَةٍ وَشَارَةٍ حَسَنَةٍ فقالت أُمُّهُ: اللَّهُمَّ اجْعَلِ ابْنِي مثْلَ هَذَا، فَتَرَكَ الثَّدْيَ وَأَقْبَلَ إِلَيْهِ فَنَظَرَ إِلَيْهِ فقال: اللَّهُمَّ لا تَجْعَلْنِي مِثْلَهُ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى ثَدْيِهِ فَجَعَلَ يَرْتَضِعُ» فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم وَهُوَ يَحْكِي ارْتِضاعَهُ بِأُصبُعِه السَّبَّابَةِ فِي فِيهِ، فَجَعلَ يَمُصُّهَا، قال: (وَمَرُّوا بِجَارِيَةٍ وَهُمْ يَضْرِبُونَهَا، وَيَقُولُونَ: زَنَيْتِ سَرَقْتِ، وَهِي تَقُولُ: حَسْبِيَ اللّٰهُ وَنِعْمَ الْوكِيلُ. فقالت أُمُّهُ: اللَّهُمَّ لا تَجعَلْ ابْنِي مِثْلَهَا، فَتركَ الرِّضَاعَ وَنَظَرَ إِلَيْهَا فقال: اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِثْلَهَا، فَهُنالِكَ تَرَاجَعَا الحَدِيثِ فقالَت: مَرَّ رَجُلٌ حَسَنُ الهَيْئَةِ فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ اجْعَلْ ابْنِي مِثْلَهُ فَقُلْتَ: اللَّهُمَّ لا تَجْعَلنِي مِثْلَهُ، وَمَرُّوا بِهَذِهِ الأَمَةِ وَهُم يَضْرِبُونَهَا وَيَقُولُونَ: زَنَيْتِ سَرَقْتِ، فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ لا تَجْعَلْ ابنِي مِثْلَهَا فَقُلْتَ: اللَّهُمَّ اجعَلنِي مِثْلَهَا ؟، قَالَ: إِنَّ ذلِكَ الرَّجُلَ كَانَ جَبَّاراً فَقُلت: اللَّهُمَّ لا تَجْعَلْنِي مِثْلَهُ، وإِنَّ هَذِهِ يَقُولُونَ لها زَنَيْتِ، وَلَمْ تَزْنِ، وَسَرقْت، وَلَمْ تَسْرِقْ، فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِثْلَهَا) متفق عليه.

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەم سێ کەسە نەبێ کەسی تر لە بێشکەدا قسەی نەکردووە: یەکەم عیسای کوڕی مەریەم، دووەم: هاوڕێکەی جورەیج، پیاوی دەبێ لەنەوەی بەنی ئیسرائیل ناوی جورەیج دەبێ، سۆفیلکە دەبێ، خەڵوە خانەیە بۆخۆی دروست دەکاو لەناویا خواناسی دەکا، جارێ نوێژ دەکا، لەوکاتەدا دایکی دی بۆ لای‌و بانگی دەکا، ئەی جورەیج! ئەویش لەدڵی خۆیدا دەفەرموێ: خودایە نازانم وەڵامی دایکم بدەمەوە یا نوێژەکەم تەواو بکەم، لەپاشا وا بەباش دەزانی کە نوێژەکەی تەواو بکاو وەڵامی دایکی نەداتەوە، دایکیشی دەگەڕێتەوە، بۆ سبەینێ کە دێتەوە بۆلای دیسان جورەیج خەریکی نوێژ کردن دەبێ، بانگی دەکاو دەڵێ: ئەی جورەیج! جورەیجیش دەفەرموێ: خودایە! نازانم وەڵامی دایکم بدەمەوە یا نوێژەکەم تەواو بکەم، لەپاشا وا بەباش دەزانێ نوێژەکەی تەواو بکا، دایکیشی دەڵێ: خودایە! نەیمرێنی تا رووی داوێن پیسانی پێ نیشان دەدەی. لەولایشەوە نەوەی ئیسرائیل لەناو خۆیانا باسی خواناسیی جورەیج دەکەن کە چۆن بۆ خودا لێبڕاوە، ژنێکی سۆزانی دەبێ، بۆ جوانی بێ وێنە دەبێ، دەڵێ: ئەگەر حەز دەکەن من دەچم لەخشتەی دەبەم‌و**

تووشی فەرتەنەی دەکەم، جا ژنەکە دەچێ بۆلای، گەڵێ خەریکی دەبێو دێ بەلایەوە کە ئەو ئیشەی لەگەڵدا بکا، بەڵام جورەیج مل ناداو ئاوڕی لێ ناداتەوە، جا ژنەکە دەچێ بۆلای شوانێ، کە لە شەودا لە خەڵوەخانەکەی جورەیجا دەحەوایەوە، ئەو شوانە دەنێ لەخۆیو سکی پڕ دەبێو کوڕێکی دەبێ، دەڵێ: ئەم منالە لە جورەیجە، ئەوانیش دەچن بۆ گیانی تێرو پڕ فەلاقەی دەکەنو دەیدەنە بەر جمێن، ئەویش دەفەرموێ: ئەوە چیتانە بۆ وا لەمن دەکەن، گوناهم چییە؟ دەڵێن: چونکە ئیشی بێ شەرعیت لەگەڵ ئەم قەحبەیەدا کردووەو ئەوەتانێ لەتۆ ئەم زۆڵەی بووە! دەفەرموێ: کوا منالەکە لە کوێیە؟ ئەوانیش دەیهێنن بۆی، دەفەرموێ: تۆزێ پشووم بدەن با نوێژێ بکەم، جا دەستنوێژ دەگرێو نوێژ دەکا، کە نوێژەکە تەواو دەکا، دەڕوا بۆلای کوڕەکەو دەژنێ بەسکیاو دەفەرموێ: ئەی کۆرپەی ساوا! کێ باوکتە؟ کوڕەکەش دێتە زمانو دەڵێ: باوکی من فیسارە شوانە!!.

جا ئەو کاتە خەڵکەکە لە راستی ڕووداوەکە تێدەگەنو داوای لێبووردن لە جورەیج دەکەنو پەلاماری دەدەنو دەست دەکەن بە ماچ کردنیو خۆیانی تێ هەڵدەسوون بۆ مووفەڕکو، دەڵێن: خەڵوەخانەکەت لەزێڕ بۆ دروست دەکەینەوە؟ دەفەرموێ: نەخێر، بەڵام لەقوڕ وەك جارانی خۆی بۆم دروست بکەنەوە، سێیەم: جارێ ژنێ مەمکی دەدا بە کۆرپەکەی، (کە لەنەوەی ئیسرائیل بوو) لەو کاتەدا سوارێکی فۆزی بەناوبانگ بەلایا رادەبووری، بەسواری وڵاخێکی کەشخە، پایەو نیشانێکی زۆری پێوە دەبێ، ژنەکە دەڵێ: خودایە! ئەم کوڕەی منیش بکەی بەسوارچاکێکی ئاوا فۆزو بەناوبانگ، جا کوڕەکەی مەمکەکەی بەرداو ڕوو دەکاتە سوارەکەو تەماشایەکی دەکاو دەڵێ: خودایە! وەك ئەوم لێ نەکەی! ئینجا دیسان مەمکەکەی دەگرێتەوەو دەست دەکاتەوە بە مژینی.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: دەڵێی وا لەبەرچاوم کە چۆن چۆنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) پەنجەی دۆشاو مژەی خۆی دەمژیو لاسکایی حالی مەمکخواردنی منداڵەکەی دەکردەوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەپاشدا کەنیزەکێکیان هێنا، هێنابوویانە گیرو گازو لێیان دەداو دەیانگوت: حیزیو دزیت کردووە، ئەویش دەیگوت: حسبي الله ونعم الوكيل: من هەر خودام هەیە کەکەسم بێو بەسم بێ! بەڕاستی خودا پشتیوانی چاکە. جا دایکی منداڵەکە دەڵێ: خودایە:

خودایە ئەم کوڕەی من وەك ئەم کچە بەم دەردەی نەبەی، دیسان کوڕەکەی مەمکەکەی دایکی بەرداو تەماشای کچەکەی کردو گوتی: خودایە! وەك ئەم کچەم لێ بکە. جا لێرانەدا منداڵەکەو دایکی کەوتنە گفتوگۆو رازو گلەیی، دایکی گوتی: ئەو پیاوە شێوە جوانە رەت بوو، من گوتم: خودایە! کوڕەکەم پیاوێکی وەك ئەمەی لێ دەرچێ. کەچی تۆ گوتت: خودایە! نەمکەی بە پیاوێکی ئاوا، لەپاشان ئەم کەنیزەکەیان بە لێدان و تێهەڵدان هێناو پێی دەڵێن: حیزیو دزیت کردووە، منیش گوتم: خودایە! کوڕەکەم وەك ئەمەی لێ نەیێ، کەچی تۆ گوتت: خودایە! وەك ئەمەم بۆ لێ بکەی، ئەمە لەبەر چی؟ گوتی: چونکە سوارەکە زۆردارێکە لە زەبرداران، لەبەر ئەوە گوتم: خودایە! نەمکەی بە پیاوێکی ئاوا ستەمکار، بەلام کەنیزەکەکەی کە پێی دەڵێن: دزیو حیزی کردووە، بێ تاوانە پاكو بێ گەردەو ستەمبارە، نەدزی کردووەو نە حیزی، لەبەر ئەوە گوتم: خودایە! وەك ئەم ستەمبارەم لێ بکەی(ش).

## ٣٣-باسی بە ناسکی رەفتار کردن لەگەڵ هەموو لازەبوونێکا وەك هەتیوو کچو بێ نەوایانو دڵشکاو و پیرو بێوەژنو ئەمانە

قال تعالى: ﴿واخفض جناحك للمؤمنين﴾الحجر/٨٨.

وقال تعالى: ﴿واصبر نفسك.........الآية﴾سبقت الآية في تسلسل/٣٢.

وقال تعالى: ﴿فأما اليتيم فلاَ تقهر وأمّا السائل فلا تنهر﴾الضحى/١٠.

واتە: زەبرو زۆرو ناهەقی لە هەتیو مەکەو گەداو دەرووزەکەر روو شکێن مەکە.

وقال تعالى: ﴿أرأيت الذي يكذب بالدين فذلك الذي يدع اليتيم ولا يحض على طعام المسكين﴾الماعون/١-٣.

واتە: دەزانی کێ باوەڕی بەخودا نییەو دینو ئایین بە درۆ دەزانێ؟ ئەو جۆرە کەسانەی کە مافی هەتیو زەوت دەکەنو بە توندو تیژیو بێ رەحمی رەفتاریان لەگەڵ دەکەنو، لەهەموو کاتا نە خۆیان نان بدەنو نە خەڵکی تریش هان دەدەن لەسەر نان بدەییو یاریدەی هەژاران.

٢٦٠/١-[١]- عن سعد بن أَبي وَقَّاص رضي اللّٰه عنه قال: كُنَّا مَعَ النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم سِتَّةَ نفَر، فقال المُشْرِكُونَ للنَّبِيِّ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: اطْـرُدْ هـؤُلاءِ لا يَجْتَرِئُـون علينـا، وكُنْتُ أَنا وابْنُ مسْعُودٍ ورجُلٍ مِنْ هُذَيْلٍ وبلال ورجلان لَستُ أُسَمِّيهمـا، فوَقَـعَ في نَفْـسِ رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم ما شاءَ اللّٰه أَن يقعَ فحدَثَ نفْسهُ، فأَنْزَلَ اللّٰهُ تعالى: {ولا تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُون رَبَّهُمْ بالْغَداةِ والعَشِيِّ يُرِيدُونَ وجْهَهُ} ﴿الأنعام: ٥٢﴾رواه مسلم.

سەعدی كوڕی ئەبو وەققاص (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: شەش كەس بووین لە خزمەت پێغەمبەردا بووین، منو ئیبنو مەسعوودو پیاوێكی هوذەیلیو بیلالو دوو پیاوی تر بووین، كە نامەوێ ناویان بێنم، هاوبەش پەیداكەرەكان بە پێغەمبەریان گوت: ئێمە پێشنیارێكمان هەیە: ئەم هەژارانە دەربكە، تا ئێمەیش هامشۆت بكەین، با سامیان لێمان نەشكێو زات نەكەن بەسەرمانا. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەم لایەنەوە ئەوەی خودا لەچارەی نووسیبو هات بە دڵیاو دڵی چەكەرەی كرد! جا خودا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿ولا تطرد الذين يدعون ربهم بالغداة والعشي يرديدون وجهه﴾الأنعام/٥٢. ئەی خۆشەویست! تۆ پێغەمبەری خودای، نەك پیاوی دنیاییو سیاسی، كەواتە نەكەی دڵی ئەو هەژارانە بشكێنیو لە مەجلیسی خۆت، بەقسەی ئەو بتپەرستانە دەریان بكەی، ئەوانە بەڕۆژو بەشەو هەمیشە سەرگەرمی عیبادەتو بەندەیی ساغو دروستن بۆ ڕەزای خودا (م-(ڕەزای خودای لەسەر بێ).

٢٦١/٢-[٢]- وعن أَبي هُبَيْرَةَ عائِذِ بن عمْرو المزَنِيِّ وَهُوَ مِـنْ أَهْـلِ بيْعـةِ الرِّضْـوان رضي اللّٰه عنه، أَنَّ أَبا سُفْيَانَ أَتَى عَلَى سلْمَانَ وصُهَيْب وبلالٍ في نفَرٍ فقالوا : ما أَخَـذَتْ سُيُوفُ اللّٰه مِنْ عدُوِّ اللّٰه مَأْخَذَهَا، فقال أَبُو بَكْرٍ رضي اللّٰـه عَنـه: أَتَقُولُـونَ هَـذَا لِشَـيْخِ قُرَيْشٍ وَسَيِّدِهِمْ؟ فَأَتَى النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم، فَـأَخْبرهُ فقـال: يـا أَبـا بَكْـر لَعلَّـكَ أَغْضَبْتَهُم ؟ لَئِنْ كُنْتَ أَغْضَبْتَهُمْ لَقَدْ أَغْضبتَ رَبَّكَ ؟ فأَتَاهُمْ فقال: يا إِخْوَتَاهُ آغْضَـبْتُكُمْ ؟ قالوا: لا، يغْفِرُ اللّٰه لَكَ يا أُخَيَّ. رواه مسلم.

عائیذی كوڕی عەمری ئەلموزنی (ڕەزای خودای لەسەر بێ)، كە یەكێك بووە لە دەستەی پەیمانی بەیعەتو لریضوان، فەرمووی: ئەبو سوفیان لەپێش موسوڵمان بوونیا ڕەت

---

١ موسلیم (٢٤١٣)(٤٦).

٢ موسلیم (٢٥٠٤).

دەبێ، بەلای سەلمان و صوهەیبی رۆمیو بیلال و چەند موسوڵمانێکی تردا، دەڵێن: بەخودا ئەم دوشمنی خودایە هەر مایەوەو بەر شیری قاری خودا نەکەوت، ئەبو بەکریش (رەزای خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: چۆن قسەی وا بە سەرگەورەو ئاغای قورەیش دەڵێن! ئینجا دەچێ بۆلای پێغەمبەرو ئەم باس و خواسەی بۆ دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ: ئەی ئەبو بەکر! رەنگە تووڕەت کردبن، ئەگەر ئەوانەت تووڕە کردبێ، ئەوە بزانە کە خودایشت لەخۆت تووڕە کردووە! ئەبو بەکریش دەچێتەوە بۆ لایان و دەڵێ: ئەی گەلی براینە! خۆ تووڕ نەبوون لە من؟ دەڵێن: تووڕە نەبووین، خودا لێت خۆش بێ ئەی براله! (م/تاج).

٢٦٢/٣-[٣]- وعن سهلِ بن سعدٍ رضي اللّٰه عنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «أَنَا وكافلُ الْيتيمِ في الجَنَّةِ هَكَذَا» وأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى، وفَرَّجَ بَيْنَهُمَا». رواه البخاري.

سەهلی کوڕی سەعد (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: من و سەرپەرشت (کافیل)ی هەتیو لە بەهەشتا وەك ئەم دوو پەنجەیە ئاوا لەیەکەوە نزیکین، ئیتر گریمان ئەو هەتیوە هی خۆی بێ و خزم و کەسوکاری بێ یا هی بێگانە بێ، جیاواز نییە! ئەوجا بە پەنجەی دۆشاو مژەو هەڵمەقووتە ئیشارەتی کرد کە لە بەهەشتا ئاوا جێگەمان لە یەکەوە نزیکە (ب).

٢٦٣/٤-[٤]- وعن أَبي هريرة رضي اللّٰه عنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «كَافِلِ الْيتيمِ لَهُ أَوْ لِغَيرِهِ. أَنَا وهُوَ كهَاتَيْنِ في الجَنَّةِ» وَأَشَارَ الرَّاوي وهُو مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ بِالسَّبَّابَةِ والْوُسْطَى. رواه مسلم. وقوله صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (الْيَتِيمُ لَه أَوْ لِغَيرِهِ) معناهُ: قَرِيبهُ، أَوْ الأَجنَبِيُّ مِنْهُ، فَالْقرِيبُ مِثلُ أَنْ تَكْفُلَه أُمُّه أَوْ جدُّهُ أَو أَخُوهُ أَوْ غَيْرُهُمْ مِنْ قَرَابتِهِ، واللّٰه أَعْلَم.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: من و سەرپەرشت (کافیل)ی هەتیو لەبەهەشتا وەك ئەم دوو پەنجەیە ئاوا لەیەکەوە نزیکین ئیتر گریمان ئەو هەتیوە هی خۆی بێ و خزمی بێ، یا بێگانە بێ و هی یەکێکی تر بێ جیاوازی نییە.

---

٣ بوخاری (٥٣٠٤).

٤ موسلیم (٢٩٨٣).

قسەبەرکە مالیکی کوڕی ئەنەس بوو- بە پەنجەی دۆشاومژەو ناوەڕاست ئاماژەی کرد، فەرمووی واتە: ئاوا لە بەهەشتا لەگەڵ پێغەمبەردا دەبێ (م).

٢٦٤/٥-[٥]- وعنه قال: قال رسولُ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (لَيْسَ المِسْكِينُ الذي تَرُدُّهُ التَّمْرةُ وَالتَّمْرتَان، ولا اللُّقْمةُ واللُّقْمتان إنَّمَا المِسْكِينُ الذي يتعَفّفُ) متفقٌ عليه.

وفي رواية في (الصحيحين): (لَيْسَ المِسْكِينُ الذي يطُوفُ علَى النَّاسِ تَرُدُّهُ اللُّقْمةُ واللُّقْمَتان، وَالتَّمْرةُ وَالتَّمْرتَان، ولَكِنَّ المِسْكِينَ الذي لا يَجِدُ غِنًى يُغنِيه، وَلا يُفْطَنُ بِهِ فيُتصدَّقَ عَلَيهِ، وَلا يَقُومُ فَيسْأَلَ النَّاسَ).

دیسان فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەژاری بەڕاستی ئەوە نییە کە دەرگاو دەرگا دەکاو ماڵەو ماڵ دەسووڕێتەوەو خەڵك خەیری پێ دەکەن، لێرەو لەوێ بەپارووێ دوو پاروو، یا بە دەنکێ دوو دەنك خورما دەستی پێوە دەنێن، بەڵام هەژاری تەواو کە شایستەی زەکاتە ئەو کەسەیە کە خۆی ئەوەندەی دارایی نییە کە بەشی بکاو کەسیش پێی نازانێ کە حاڵی وایە تا زەکاتی بداتێو دەستگیرۆیی بکا، وەخۆشی لەبەر قەدر گرتنی خۆی ناچێ سواڵ لەمو لەو بکا (ش).

٢٦٥/٦-[٦]- وعنه عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (السَّاعِي علَى الأَرْمَلَةِ وَالمِسْكِين كَالمُجاهِدِ في سبيلِ اللّه) وأَحْسِبُهُ قال: (وَكَالْقائِمِ الَّذي لا يَفْتُرُ، وَكَالصَّائِمِ لا يُفْطِرِ) متفقٌ عليه.

دیسان فەرمووی (ڕەزای خودای لەسەر بێ): پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کەسێ تێبکۆشێ لە پێناوی ژنی بێ مێردو مرۆڤی هەژارداو ساغ بۆ ڕەزای خودای گەورە بەخێویان بکاو خزمەتیان بکا، ئەوە بەقەد ئەو کەسە کە لەڕێگەی خودادا خەبات دەگێڕێو غەزا دەکاو ناو دەردەکات بە غەزاکەر ئەوەندەی ئەوە خێرو پاداشتی بۆ هەیە! وا دەزانم فەرموشی: وە بەقەد ئەو کەسەیشە پاداشتی باشی بۆ هەیە کە بەشەو هەر نوێژ بکاو لێی سارد نەبێتەوەو بە ڕۆژیش هەمیشە بەڕۆژوو بێو یەك ڕۆژی لێ نەشکێنێ (ش).

٢٦٦/٧-[٧]- وعنه عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (شَرُّ الطَّعَام طَعَامُ الْولِيمةِ، يُمْنَعُها مَنْ يأْتِيهَا، ويُدْعَى إِلَيْهَا مَنْ يَأْبَاهَا، ومَنْ لَمْ يُجِبِ الدَّعْوةَ فَقَدْ عَصَى اللّه ورَسُولَهُ)

---

٥ بوخاری (١٤٧٦)، موسلیم (١٠٣٩) (١٠٢).

٦ بوخاری (٥٣٥٣)، موسلیم (٢٩٨٢).

٧ موسلیم (١٤٣٢)(١١٠) وحدیث ابي هریرة: بوخاری (٥١٧٧)و موسلیم (١٤٣٢)(١٠٧).



رواه مسلم. وفي رواية في الصحيحين عن أبي هريرةَ من قوله: (بِئْسَ الطَّعَامُ طَعَامُ الْوَلِيمَةِ يُدْعَى إِلَيْهَا الأَغْنِيَاءُ وَيُتْرَكُ الفُقَرَاءُ).

دیسان ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەدترین نان نانی شایی‌و شیرینیە، ئەوەی کە خۆی دەیەوێ بچێ بۆی ڕێگەی نادەن، ئەوەی دەعیەی نایە خولکی دەکەن بۆ سەری! ئەو کەسەشی خولك بکریٔو نەچێ ئەوە لە خوداو پێغەمبەری خودا یاخی دەبێ (م). لە گێڕانەوەیەکی شەیخەیندا ئاوایە: ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) بۆ خۆی دەیفەرموو: خراپترین نان نانی شایی‌و شیرینی‌و شتی وایە، دەوڵەمەندان بانگ دەکرێن بۆی‌و هەژاران بانگ ناکرێن.

٢٦٧/٨-[8]- وعن أَنس رضي اللّٰه عنه عن النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (مَنْ عَالَ جَارِيتَيْنِ حَتَّى تَبْلُغَا جَاءَ يَومَ القِيامَةِ أَنَا وَهُو كَهَاتَيْنِ) وَضَمَّ أَصَابِعَهُ. رواه مسلم.

ئەنەس (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ دوو کچ بە خێو بکا تا لە خەم دەرەخسن، من‌و ئەو وەك ئەم دوو پەنجەیە ئا جووت پێکەوە دەچینە بەهەشت! (م/تاج).

٢٦٨/٩-[9]- وعن عائشةَ رضي اللّٰه عنها قالت: دَخَلَتَ عليَّ امْرَأَةٌ ومعهَا ابْنَتَان لَهَا تَسْأَلُ فَلم تَجِدْ عِنْدِي شَيْئاً غَيرَ تَمْرةٍ واحِدةٍ، فَأَعْطَيْتُهَا إِيَّاهَا فَقَسَمتْهَا بَيْنَ ابنَتَيْهَا وَلَمْ تَأْكُلْ مِنْهَا ثُمَّ قامتْ فَخَرَجتْ، فَدخلَ النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم عَلَيْنا، فَأَخْبرتُهُ فقال: (مَنِ ابْتُلِيَ مِنْ هَذِهِ البَنَاتِ بِشَيْءٍ فَأَحْسَنَ إِلَيْهِنَّ كُنَّ لَهُ سِتْراً من النَّارِ) متفقٌ عليه.

عائیشە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ژنێ دوو کچی پێ بوو، هاتە لام، سواڵی دەکرد، منیش تاقە دەنکێ خورمام هەبوو دام پێی، ئەویش لەتی کرد بۆ هەردوو کچەکەی‌و خۆی لێی نەخوارد، ئینجا هەڵسا ڕۆیشت، جا کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هاتەوە ئەمەم بۆی گێڕایەوە، فەرمووی: کەسێ دووچاری دەستی کچ ببێ، وەبۆی باش بێ، خوا ئەو کچە یەك بێ یا زیاتر، لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو کچانە بۆی دەبن بە پەردەو پەرژین‌و نایەڵن بچێتە دۆزەخەوە (ش).

---

٨ موسلیم (٢٦٣١).

٩ بوخاری (١٤١٨)و موسلیم (٢٦٢٩).

٢٦٩/١٠-[١٠]- وعن عائشةَ رضيَ اللّهُ عنها قالت: جاءَتني مِسْكِينَةٌ تَحْمِلُ ابْنَتَيْنِ لها، فَأَطعمتهَا ثَلاثَ تَمْرَاتٍ، فَأَعطتْ كُلَّ واحدةٍ منهُمَا تَمْرَةً ورفعتْ إلى فيها تَمْرَةً لتأكُلَهَا، فاستطعمتها ابْنَتاهَا، فَشَقَّت التَّمْرَةَ التي كانَتْ تُريدُ أَنْ تأكُلَها بيْنهُمَا، فأَعْجبني شأنُها، فَذَكَرْتُ الَّذي صنعَتْ لرسول اللّه صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم فقال: (إن اللّه قَدْ أَوْجَبَ لَهَا بِهَا الجَنَّةَ، أَو أَعْتقَها بِهَا مَن النَّارِ) رواه مسلم.

**ديسان عائيشه** (رەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** ئافرەتێكی بێ نەوا دوو كچی خۆیی هەلگرتبوو، هاتە لام بۆ هەژاری، منیش سێ دەنك خورمام دا پێی بۆ خواردن، ئەویش هەر كچەی دەنكێكی داپێی، ئەو دەنكەكەی تریشی برد بۆ دەمی كە خۆی بیخوات، بەلام كچەكانی داوای ئەویشیان لێ كرد كە بیخۆن، ئەویش دەنكەكەی خۆشی (كە خەریك بوو بیخوات) كرد بە دوو كەرتەوەو دای پێیان و خۆی هیچی نەخوارد، منیش ئەم كارەیم پەسەند كردو زۆر بەدڵم بوو، لەبەر ئەوە گێرامەوە بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی:** خودا لەبەر خاتری ئەو دوو كچە بەهەشتی بۆ مسۆگەر كردووە، (یا فەرمووی: بەهۆی ئەو دوو كچەوە لە ئاگری دۆزەخ ئازادی دەكا)(م).

١١/٢٧٠-[١١]- وعن أبي شُرَيْحٍ خُوَيْلِدِ بْنِ عَمْرو الخُزاعِيِّ رضي اللّهُ عنه قال: قال النبي صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (اللّهُمَّ إِنِّي أُحَرِّجُ حَقَّ الضَّعِيفَينِ الْيَتِيمِ والمرْأَةِ) حديث حسن صحيح رواه النسائي بإسناد جيدٍ.

**ئەبو شورەیح** (رەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی:** ئەی خودایە! بەشایەتی تۆ ئەوا من ئەو خەلكە ئاگادار دەكەمەوە كە بەهیچ جۆرێ ناهەقیو بێ ویژدانی لە دوو لازەبوونەكە نەكەن، كە بریتین لە هەتیو و لە ژن وە مافیان نەخۆن (ن/ح/ح-اسناد جید).

١٢/٢٧١-[١٢]- وعن مُصْعبِ بنِ سعدِ بن أبي وقَّاصٍ رضي اللّه عنهما: رأَى سعْدٌ أَنَّ لَهُ فَضْلاً على مَنْ دُونهُ، فقال النبي صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (هَل تُنْصرُونَ وتُرزقُونَ إلاَّ

---

١٠ موسلیم (٢٦٣٠).

١١ تۆژەر (محقق) دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیەم بۆ نەدۆزرایەوە، لەنەسائی چاپ كراودا، بەناوی (موجتەبای نەسائی)بەلام لە (السنن الكبری)دا هەیە، هەروا لە ئیبن‌وماجەدا هەیە (٣٦٧٨).

١٢ بوخاری (٢٨٩٧).

بِضُعفائِكُم» رواه البخاري هَكَذا مُرسلاً، فَإن مصعَب ابن سعد تَابِعِيٌّ، ورواه الحافِظُ أَبو بكر الْبَرْقَانِي في صحيحِهِ مُتَّصلاً عن أَبيه رَضِي اللّٰه عنه.

موصعەبی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) فەرمووی: سەعد وای دەزانی کە خۆی گەورەترە لەخوار دەستەکانی خۆی، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئێوە لەبەر خاتری زەبوونو بێ نەواکانتان خودا سەرتان دەخاو هەر لەبەر خاتری ئەوانیش رزقو ڕۆزیتان دەدا، کەوایە بەچاوی کەم تەماشایان مەکەن (بوخاری ئاوا بە مورسەلی گێڕاویەتیەوە).

١٣/٢٧٢–[١٣]– وعن أبي الدَّرْداءِ عُوَيْمِرٍ رضي اللّٰه عنه قال: سمِعتُ رسولَ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يقول: «ابْغونِي في الضُّعَفاءَ، فَإِنَّمَا تُنْصرُونَ، وتُرْزقون بضُعفائِكُمْ» رواه أَبو داود بإسناد جيد.

ئەبو دەرداء (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: لەناو دەستەی لازەبوونو هەژارەکانا منەی من بکەن! چونکە ئێوە لەبەر خاترەی لازەبوونو هەژارەکانتان خودا سەرتان دەخاو رزقو ڕۆزیتان پێ دەدا (د-س/ج).

## ٣٤- باسی ئامۆژگاری خێر دەربارەی ئافرەتان (باب الوصية بالنساء)

قال الله تعالى: ﴿وعاشروهن بالمعروف﴾النساء/١٩.

وقال تعالى: ﴿ولن تستطيعوا أن تعدلوا بين النساء ولو حرصتم فلا تميلوا كل الميل فتذروها كالمعلقة وإن تصلحوا وتتقوا فإن الله كان غفورا رحيما﴾النساء/١٢٩.

واتە یەزدانی گەورە دەفەرموێ: تا دەتوانن زۆر بەجوانی رەفتارو گوزەران بکەن لەگەڵ ئافرەتان، لە ڕاستیدا ئێوە ناتوانن کە بەیەك چاو و بەیەکسان تەماشای ژنەکانتان بکەن، ئەوە شتێکە لە خوداوە، بەدڵ یەکێکیانتان خۆشتر دەوێ، بەڵام نابێ ئەم مەیلو حەزی دڵە بکەن بە بیانوو، بۆ ئەوەی بەلای یەکێکیانا بەتەواوی بابدەنەوەو ئەوی تریشیان وەك بەستراوە ببەستنەوە نە دابنرێ بە بێوەژن تا بۆ خۆی شوو بکاتەوە، نە بە مێردداریش حلێب بێ تا لەپەنای مێردا بخەوێتەوە، ئەگەر مەبەستتان نێوان چاك کردن بێو لەناهەقی خۆتان بپارێزن،

---

[١٣] ٥١٨٦

بێگومان کە خودا لەو حەزی دڵەی کەبەدەستی خۆتان نییە لێتان خۆش دەبێ، وە ڕەحمتان پێ دەکا.

١/٢٧٣-[١]- وعن أبي هريرة رضي اللّٰه عنه قال: قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: «اسْتوْصُوا بِالنِّساءِ خيْراً، فِإنَّ المرْأَةَ خُلِقَتْ مِنْ ضِلَعٍ، وَإِنَّ أَعْوجَ ما في الضِّلعِ أَعْلاهُ، فَإنْ ذَهبتَ تُقِيمُهُ كَسرْتَهُ، وإِنْ تركتَهُ، لَمْ يزلْ أعوجَ، فاستوْصُوا بِالنِّسَاءِ» متفقٌ عليه. وفي رواية في الصحيحين: (المرْأَةُ كالضلعِ إنْ أَقمْتَها كسرْتَهَا، وإن استَمتعْت بِهَا،اسْتَمتعْت وفِيها عَوجٌ). وفي رواية لمسلم: (إِنَّ المرْأَةَ خُلِقتْ مِن ضِلَعٍ، لَنْ تَسْتقِيمَ لكَ علَى طريقةٍ، فَإِنْ استمتعْت بِهَا، اسْتَمتَعْتَ بِهَا وفِيها عَوجٌ، وإِنْ ذَهَبْتَ تُقيمُها كسرتَهَا، وَكَسْرُهَا طلاقُها».

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لە حەزرەتەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ بە ڕاستی باوەڕی بە خوداو بە ڕۆژی دوایی هەیە نابێ ئازاری دراوسێی خۆی بدا، ئامۆژگاری بێ لێتان زۆر باش بن بۆ ئافرەتان، چونکە ئافرەتان لەپەراسووی ئادەم دروست کراون و لەبنەڕەتەوە چەوتن، وە لارترین شوێنی پەراسوویش نووکەکەیەتی، جا ئەگەر بتەوێ ڕاستی بکەیتەوە ڕاست نابێتەوە بەڵام دەشکێ، ئەگەر دەستیشی لێ نەدەی ئەوا بەلاری دەمێنێتەوە، هەرچۆنێ بێ بوونی لە نەبوونی باشترە، کەوابوو وەصیەت بێ لێتان زۆر باش بن بۆ ئافرەتان (ش/تاج) لە گێڕانەوەیەکا: ژن لە پەراسوو دروست کراوەو چەوتیەکەی بەشێکە لە سروشتیو تێکەڵاوی خوێنو بیرو هۆشی بووە، جا لەبەر ئەوە تا سەر لەسەر یەك بار نامێنێو زوو زوو دەگۆڕێ، جا ئەگەر دەتەوی ڕابوێری لەگەڵیا ئەوا دەبێ بەلاریو خواری ڕابوێری لەگەڵیا، چونکە ئەگەر بتەوێ ڕاستی بکەیتەوە بەتۆ ڕاست نابێتەوە، بەڵکوو لە دەستتا دەشکێ، شکاندنەکەیشی برێتییە لە تەڵاق دانی (تاج).

٢/٢٧٤-[١]- وعن عبد اللّٰه بن زَمْعَةَ رضي اللّٰهُ عنه، أَنه سمِعَ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم يَخْطُبُ، وذكَر النَّاقَةَ والَّذِى عقَرهَا، فقال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (إِذِ انْبعثَ أَشْقَاهَا) انْبعثَ لَها رَجُلٌ عزِيزٌ، عارِمٌ منِيعٌ في رهْطِهِ) ثُمَّ ذكَرَ النِّساءَ، فَوعظَ فِيهِنَّ، فقالَ:

---

١ بوخاری (٥١٨٦)، موسلیم (١٤٦٨)(٥٩)(٦٠).

١ بوخاری (٤٩٤٢)، مسلم (٢٨٥٥).

(يعْمِدُ أَحَدكُمْ فيجْلِدُ امْرأَتَهُ جلْد الْعَبْدِ فلَعلَّهُ يُضاجعُهَا مِنْ آخِرِ يومِهِ) ثُمَّ وَعَظَهُمْ في ضحكهِمْ مِن الضَّرْطَةِ وقال: «لِمَ يضحكُ أَحَدكُمْ مِمَّا يفعلُ ؟» متفق عليه.

عەبدوڵلای کوڕی زەمعە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی گوێم لەپێغەمبەر بوو دووانی دەدا وەباسی ووشترەکەی هۆزی سەمودی کرد لەگەڵ ئەو نەگبەتەی کە کوشتی ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێ: ﴿إِذِ انبَعَثَ أَشقَاهَا﴾ فەرمووی: کابرایەکی بەدەسەڵاتی شەڕانی نەگبەت، کەلەناو هۆزەکەیدا بەدەسەڵات بوو پەلاماری ووشترەکەی داو کوشتی، لەپاشا باسی ئافرەتانی کردو ئامۆژگاری باشی لەبارەیانەوە کردو فەرمووی هەتانە دەچێ وەك بەندە دارکاری بکا ئاوا ژنەکەی دارکاری دەکا، دەگونجێ هەر لەکۆتایی ئەو ڕۆژەیدا ئاشت ببێتەوەو دروست ببێ لەگەڵی! لەپاشا لەسەر بالێبوونەوەش تەمێی کردن کەبەشتی وا پێدەکەنن، فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): شتێ کەخۆشتان دەیکەن ئیتر بۆ پێی پێدەکەنن؟(ش).

٢٧٥/٣- [٢] وعن أبي هريرة رضي اللّٰه عنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (لا يَفْرَكْ مُؤْمِنٌ مُؤْمِنَةً إِنْ كَرِه مِنها خُلقاً رضِيَ مِنْها آخَرَ) أَوْ قَالَ: (غيْرَهُ) رواه مسلم.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: پیاوی موسوڵمان نابێ بێزار بێ لەژنی موسوڵمان چونکە ئەگەر خویەکیشی بەدڵ نەبێ خویەکی تری بەدڵیەتی؟(م).

٢٧٦/٤- [٣] – وعن عَمْرو بنِ الأَحْوَصِ الجُشميِّ رضي اللّٰه عنه أَنَّهُ سمِعَ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّم في حَجَّةِ الْوَداع يقُولُ بعد أَنْ حَمِدَ اللّٰه تعالى، وَأَثنَى علَيْهِ وذكَّر ووعظَ، ثُمَّ قال: (أَلا واسْتَوْصوا بِالنِّساءِ خَيْراً، فَإِنَّمَا هُنَّ عَوان عَنْدَكُمْ لَيْس تملكُونَ مِنْهُنَّ شَيْئاً غيْرَ ذلِكَ إِلاَّ أَنْ يأْتِينَ بِفَاحشةٍ مُبيِّنةٍ، فإِنْ فَعلْنَ فَاهْجُروهُنَّ في المضَاجعِ، واضْرِبُوهنَّ ضَرْباً غيْر مُبرِّحٍ، فإِنْ أَطعنَكُمْ فَلا تبْغُوا عَلَيْهِنَّ سبيلا، أَلا إِنَّ لَكُمْ عَلَى نِسائِكُمْ حَقًّا، ولِنِسائِكُمْ عَلَيْكُمْ حَقًّا، فَحقُّكُمْ عَلَيْهِنَّ أَن لا يُوطِئْنَ فُرُشكَمْ منْ تَكْرهونَ، وَلا يأْذَنَّ في بُيُوتكمْ لِمن تكْرهونَ، أَلا وحقُّهُنَّ عَلَيْكُمْ أَن تُحْسنُوا إِلَيْهِنَّ في كِسْوتِهِنَّ وَطعامهِنَّ».

رواه الترمذي وقال: حديث حسن صحيحٌ.

---

٢ موسلم (١٤٦٩).

٣ تيرمزی (١١٦٣).

عـەمری کوڕی ئـەحوەس (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی لەحـەجی ماڵئاواییـدا، گـوێم لەحەزرەت بـوو (درودی خودای لەسەر بێ) سوپاس‌و ستایشێکی جوانی خـودای کـردو تـەمێ‌و ئامۆژگاری باشی موسوڵمانانی کردو لەدواییدا فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): ئاگادار بـن، ئامۆژگاری بێ لێتان کـە زۆر باش بـن بـۆ ژنـان، چونکە ژنـان وەك دیـل وان لـەکن ئێوەی پیاوان، هەمیشـە وەك غـولام‌و نۆکـەر سـەرگەرمی خزمـەتی ئێـوەن‌و لـەژێر رکێفی ئێوەدان تەنیا ئەم مافەتان بۆ هەیە لەسـەریان ئـیتر نابـێ بـەهیچ کولۆجـێ ناهـەقیان لـێ بکـەن مەگـەر لەحاڵەتێکـدا کـەتنێکی ئاشـکرا بکـەن، لـەحاڵی وادا جێگەیان لـێ جیابکەنەوە ئەگەر بەئامۆژگاری‌و جێ لێ جیاکردنەوە چاریان نـەکرا ئەوا شەریعەت رێگەتان دەدا کە بەئەسپایی لێیان بدەن، وەلـێ هـەرکاتێ ژنـەکانتان لەفەرمانتان دەرنەچون‌و بەگوێیان کردن ئیتر ئێـوەش برۆبیانویـان لێمەدۆزنـەوەو بەخۆڕایی ناهەقیان لـێ مەکەن‌و ئازاریان مەدەن!.

بـزانن ج ئێـوە، ج ئـەوان مافتـان هەیـە لەسـەر یـەکتری مـافی ئێـوە لەسـەر ژنەکانتان ئەوەیـە کەنـەهێڵن ئـەو کەسانەی کەئێوە حـەزیان لێناکـەن بێنـە سـەر بـەڕەتان‌و هامشۆی ماڵتـان بکـەن، بـزانن کـەماف‌و حـەقی ئـەوانیش لەسـەر ئێـوە ئەوەیە کە بەجوانی رەفتاریان لەگەڵ بکەن‌و بـەجوانی جل‌و بـەرگیان بـۆ بکـەن‌و بەجوانی بەخێویان بکەن‌و بەکورتی‌و پـوختی دەبـێ بـەپێی بـاوو دەسـتوری وڵاتـی خۆتان رۆزی‌و ژێوارو خۆراك‌و بەرگ‌و پۆشاکیان پێ بدەن وەك هاوسەری هاوشـانی خۆتان، تا هەست بەهاوسەر پێ کەمی نەکەن. (ت‌ح/ح/ص).

٢٧٧/٥-[١] وعن مُعَاوِيَةَ بنِ حَيْدةَ رضي اللّٰه عنه قال: قلتُ: يا رسول اللّٰه ما حَقُّ زَوْجَةِ أَحَدنَا عَلَيْهِ ؟ قال: (أَن تُطْعِمَها إِذَا طَعِمْتَ، وتَكْسُوهَا إِذَا اكْتَسيْتَ ولا تَضْـربِ الْوَجـهَ، وَلا تُقَبِّحْ، ولا تَهْجُرْ إلاَّ في الْبَيْتِ) حديثٌ حسنٌ رواه أَبو داود وقال: معنـى (لا تُقَـبِّحْ» أَى: لا تقُلْ قَبَّحَكِ اللّٰه.

مەعاویەی کوڕی حەیدە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عـەرزی پێغەمبـەرم کـرد (درودی خودای لەسەر بێ) قوربـان! ئـەی پێغەمبـەری خودا!مـافی ژن چییە؟ فـەرمووی وەك خـۆت نان‌و بەرگی بۆ بکەو لێی مەدەو وەك ئاژەڵ دارکاری مەکە، ئەگەر دنیا بـوو لێشت

١ ئەبو داود (٢١٤٢).

دا لەدەمو چاوی مەدەو قسەی ناشیرینی پێ مەڵێو پێی مەڵێ خودا خراپت بۆ بکا، ئەگەر جێگەشت لێ جیاکردەوە لەبەر هۆیەکی ڕەوا ئەوا لە هۆدەیەکدا بەتەنیا دای مەنێ. (د-ح/ح).

٢٧٨/٦-[٢]- وعن أبي هريرة رضي اللّٰه عنه، قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (أَكْمَلُ المُؤْمنين إِيمَاناً أَحْسَنُهُمْ خُلُقاً، وَخِيارُكُمْ خيارُكم لِنِسَائِهِم) رواه التِّرمذي وقال: حديثٌ حسنٌ صحيحٌ.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ ئەو موسوڵمانانەی کە بەتەواوی باوەڕیان بەخودا تەواوە، ئەوانەن کە خویان جوانەو ڕەفتاریان شیرینو پەسەندە، چاکترینو پیاوە سەردەستەکانی ئێوە ئەو کەسانەتانن کە بۆ ژنی خۆیان زۆر چاکو باشن! (ت: ح/ص).

٢٧٩/٧-[٣]- وعن إياس بن عبدِ اللّٰه بن أبي ذُباب رضي اللّٰه عنه قال: قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (لاَ تَضْرِبُوا إِمَاءَ اللّٰهِ) فَجاءَ عُمَرُ رضي اللّٰه عنه إلى رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، فَقَالَ: ذَئِرْنَ النِّساءُ عَلَى أَزْواجِهنَّ، فَرَخَّصَ في ضَرْبِهِنَّ فَأَطاف بِآل رسولِ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم نِساءٌ كَثِيرٌ يَشْكونَ أَزْواجَهُنَّ، فقال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (لَقَدْ أَطَافَ بآلِ بَيْت مُحمَّدٍ نِساءٌ كَثيرٍ يشْكُونَ أَزْوَاجَهُنَّ لَيْسَ أُولئك بخيارِكُمْ) رواه أبو داود بإسنادٍ صحيح.

ئییاسی کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ژنان کەنیزانی خودان لێیان مەدەنو وەکوو ئاژەڵ دارکارییان مەکەن، عومەریش (ڕەزای خودای لێ بێ) هاتە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی قوربان! بەهۆی ئەم فەرمایشتەی تۆوەوە ژنان زاتیان شکاوە لەمێردەکانیان جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی دا بۆ لێدانیان. ئیتر ژن گەلێکی زۆر هاتە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سکاڵایان دەکرد لەدەستی مێردەکانیان.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ژن گەلێکی زۆر هاتوونەتە سەر ماڵی موحەممەد، هەموو دادو بێدادیانە لەدەستی مێردەکانیان، ئەم جۆرە مێردانە

---

٢ تیرمژی (١١٦٢)

٣ أبو داود (٢١٤٦)

کەئازاری ژنی خۆیان دەدەن‌و لەسەر شتی هیچ‌و پووچ لەژنی خۆیان دەدەن، ئەوانە پیاوی باش نین! (د-س، ص).

١-٢٨٠/٨ – وعن عبدِ اللّٰه بنِ عمرو بن العاص رضي اللّٰه عنهما أَن رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: «الدُّنْيَا مَتَاعٌ، وَخَيْرُ مَتاعهَا المَرْأَةُ الصَّالحَةُ» رواه مسلم.

عەبدوللّای کوڕی عەمر (ڕەزای خودا لەخۆی‌و بابی) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی ئەم جیهانە هەمووی هەر ڕابواردنەو خۆشیەکەی نیوەچڵەو پێنج‌و دوو ڕۆژێکە، باشترین هۆی ڕابواردن‌و خۆش گوزەرانیش لەم جیهانەدا ئافرەتی باشە! (م).

## ٣٥- باسی مافی مێرد لەسەر ژنی خۆی (باب حق الزوج على إمرأته)

قال الله تعالى: {الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء بِمَا فَضَّلَ اللّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللّهُ} سورة النساء/ ٣٤.

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: پیاوان لە —خوداییەوە- سەردارو سەرگەورەی ژنانن‌و خودا کردوونی بە گەورەو چاودێری سەریان بەهۆی ئەوەوە کە بە فەزڵ‌و بەخششی خۆی بەهرەی باش باش‌و لەشی تەواناو هۆشی بەهێزو دینی تەواوی داونەتێ، سەرەڕای ئەمەیش پیاوان مەسرەفی ماڵ دەکەن‌و ماڵ‌و دارایی خۆیان خەرج دەکەن‌و بەرپرسیارن لە ماڵ‌و میوان‌و لە ژێواری خێزان، ژنی باش‌و چاکیش ئەو ژنانەن کە مێرد پەروەرن‌و بێ دڵی مێردی خۆیان ناکەن‌و ئاگایان لە ناموسی خۆیان دەبێ، لە دیارو نادیار.

حديث عمرو بن الأحوص السابق في الباب قبله: واتە: یەکێ لەو فەرموودانەی کە بۆ ئەم باسەی ژێر دەستیشمان دەست دەدا فەرموودەکەی عەمری کوڕی ئەحوەصە، کە لەباسەکەی پێش ئەم باسەدا ڕابوورد، بڕوانە فەرموودەی ژمارە (٢٧٦/٤).

---

١ موسلم (١٤٦٧)



٢٨١/١–[١]– وعن أبي هريرة رضي اللّٰه عنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «إِذَا دعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فلَمْ تَأْتِهِ فَبَات غَضْبانَ عَلَيْهَا لَعَنتها الملائكَةُ حَتَّى تُصْبحَ» متفقٌ عليه. وفي رواية لهما: «إِذَا بَاتَتْ المَرْأَةُ هَاجِرَةً فِرَاشَ زَوْجها لَعنتْهَا المَلائِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ». وفي روايةٍ قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «والَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا مِن رَجُلٍ يَدْعُو امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فَتَأْبَى عَلَيْهِ إِلاَّ كَانَ الَّذي فِي السَّماءِ سَاخِطاً عَلَيْهَا حَتَّى يَرْضَى عَنْها».

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەگەر پیاو داوای سەرجێیی لە ژنەکەی بکاو ژنەکەی ملی نەدایە، وە پیاوەکەی بەدڵ ئێشاوی لێی شەوی کردەوە، ئەوە ئەو شەوە تا بەیانی فریشتەکان لەعنەت‌و نەفرینی لێ دەکەن (ش). لە گێڕانەوەیەکی تری شەیخەیندا: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەگەر ژن بەشەو لە جێگەی مێردەکەی بتۆرێ‌و لە باخەڵیا نەخەوێ هەتا بەیانی فریشتەکان هەر نەفرینی لێ دەکەن، لە گێڕانەوەیەکی تردا حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، بەو خودایەی کە خودای هەموانە، هەر پیاوێ داوای شەو باخەڵی‌و دروست بوون لە حەلاڵی خۆی بکاو ئەویش بەبێ مەهانەی ڕەوا داخوازی بەجێ نەهێنێ‌و بەگوێی نەکا بۆ ئەو ئیشە ئەوە خودای بانی سەر لەو ژنە تووڕەو ناڕازیە، تا دڵی مێردەکەی لەخۆی ڕازی دەکاتەوە.**

٢٨٢/٢–[٢]– وعن أبي هريرة رضي اللّٰه عنه أيضاً أَن رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: «لا يَحلُّ لامْرَأَةٍ أَنْ تَصُومَ وَزَوْجُهَا شَاهِدٌ إِلا بِإِذْنِهِ، وَلا تَأْذَنْ فِي بَيْتِهِ إِلاَّ بِإِذْنِهِ» متفقٌ عليه، وهذا لفظ البخاري.

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لەسەر بێ) **دیسان فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: دروست نیە کە ژن ڕۆژووی سوننەت بگرێ، ئەگەر مێردەکەی لەگەڵیا بێ مەگەر بە ڕەزای مێردەکەی، هەروەها نابێ کە ژن ڕێگەی کەس بدا کە بچێ بۆ ماڵی‌و هامشۆی بکا مەگەر بەڕەزای مێردەکەی (ب/م).**

---

١ بوخاری (٥١٩٣)و (٥١٩٤)، موسلیم (١٤٣٦)و (١٢١)و (١٢٢).

٢ بوخاری (٥١٩٥)، موسلیم (١٠٢٦).

٢٨٣/٣-[٣]- وعن ابن عمرَ رضي اللّهُ عنهما عن النبــي صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلّم قـال: (كُلّكُمْ راعٍ، وكُلّكُمْ مسئولٌ عنْ رعِيَّتِهِ، والأَمِيرُ رَاعٍ، والرَّجُـلُ راعٍ علَـى أَهْـلِ بَيْتِـهِ، والمرْأَةُ راعِيةٌ على بيْتِ زَوْجِها وولَدِهِ، فَكُلّكُمْ راعٍ، وكُلّكُمْ مسئولٌ عـنْ رعِيَّتِـهِ) متفـقٌ عليه.

**ئیبنـو عومـەر** (ڕەزای خوایان لەسەر بێ) **لـە حەزرەتـەوە** (درودی خوای لەسەر بێ) **فـەرمووی: ئێـوە هـەمووتان وەکـو شـوان چاودێرو شـوانی ئـەو خەڵکـەن کـەوان لـەژێر دەسـتانا، وە هەمووتان بەرپرسیارن لە ژێردەست (ڕەعییەت)ەکانی خۆتان، پێشەوا (کە سەرۆکی هـەموو خەڵکەکەیـە) چاودێرەو شـوانە، ژن (لـەناو مـاڵی مێردەکـەی دا) شـوانەو چاودێرەو بەرپرسیارە لەخێزانو منداڵی مێردەکەی، ئـیتر هـەمووتان بـەپێی حـاڵو مەقام شواننو هەمووتان بە پێی حاڵ بەرپرسیارن لە خوار دەستەی خۆتان کە وان لە ژێر چاودێریتانا (ش).**

٢٨٤/٤-[٤]- وعن أبي عليّ طَلْق بن عليّ رضي اللّه عنه أَن رسولَ اللّه صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم قال: «إِذَا دعا الرَّجُلُ زَوْجتَهُ لِحَاجتِهِ فَلْتَأْتِهِ وإِنْ كَانَتْ عَلَى التَّنُّور». رواه الترمذي والنسائي، وقال الترمذي: حديث حسن صحيح.

**طەلقی کوڕی عەلی** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فـەرمووی: ئەگەر پیاو کارێکی بە ژنەکەی هەبوو، وە بانگی کرد بۆ ئەو کارە، با ژنەکەی بچێ بۆ کنی ئەگەرچی لەو کاتەدا لەسـەر تەنـدووریش بێ، دەبـێ تەندرووەکـە بـەجێ بهێڵێو بچێ بەلای مێردەکەیەوە. (ت:ح/ح/ص-ن).**

٢٨٥/٥-[٥]- وعن أبي هريرة رضي اللّهُ عنه عن النبــي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (لَـوْ كُنْتُ آمِراً أحَداً أَنْ يسْجُدَ لأَحدٍ لأَمَرْتُ المرْأَةَ أَنْ تَسْجُدَ لِزَوْجِهَا). رواه الترمذي وقـال: حديث حسن صحيح.

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فـەرمووی: مـن ئەگـەر گریمـان فـەرمانم بکردایـە بەکەسـێ کـە کڕنـووش ببـا بـۆ کەسـێکی تـر، لـە**

---

٣ بوخاری (٥٢٠٠، موسلیم (١٠٢٦).

٤ تیرمذي (١١٦٠).

٥ تیرمذي (١١٥٩).

دروستكراوەكانی خودا، فەرمانم دەكرد بە ژنان كە كڕنووش ببەن بۆ مێردەكانیان، چونكە خودا ئەوەندە هەقو مافو قەدرو ڕێزی بۆ پیاوان داناوە لەسەر ژنان (ت:ح/ح/ص-تاج).

٢٨٦/٦-[٦]- وعن أُمِّ سلمةَ رضي اللّهُ عنها قالت: قال رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (أَيُّما امرأَةٍ ماتَتْ وزوْجُهَا عنها راضٍ دخَلَتِ الجَنَّةَ) رواه الترمذي وقال حديث حسن.

ئوممو سەلەمە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرموی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرژنێ بمرێو مێردەكەی لێی ڕازی بێ دەچێتە بەهەشتەوە (ت:ح/ح).

٢٨٧/٧-[٧]- وعن معاذِ بنِ جبلٍ رضي اللّهُ عنه عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (لا تُؤْذِي امْرَأَةٌ زَوْجَهَا في الدُّنْيا إلاَّ قالَتْ زَوْجَتُهُ مِنَ الحُورِ الْعِينِ لا تُؤْذِيه قاتلَكِ اللّه، فإنَّمَا هُو عِنْدَكِ دخِيلٌ يُوشِكُ أَنْ يُفارِقَكِ إلَينا) رواه الترمذي وقال حديث حسن.

موعاذی كوڕی جەبەل (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەر ژنێ لە جیهاندا كە ئازاری مێردەكەی دەدا، ژنەكەی تری (ئەوەی كە لە پەرییە نازدارەكانی بەهەشتە) لەوێوە دەڵێ: ئازاری مەدە، خودا بچێت بە گژتا، ئەوە لای تۆ ڕێبوارە، زۆری نەماوە كە تۆ بەجێ بێڵێو بێ بۆلای خۆمان! (ت:ح/ح).

٢٨٨/٨-[٨]- وعن أُسامَةَ بنِ زيد رضي اللّه عنهما عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (ما تركْتُ بعْدِي فِتْنَةً هِي أَضَرَّ عَلَى الرِّجالِ: مِنَ النِّسَاءِ) متفقٌ عليه.

ئوسامەی كوڕی زەید (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: گەورەترین فەرتەنەیێ كە زیان بدا لەپیاوان لەپاش نەمانی من، ئاژاوەی ژنانە (ش).

---

٦

٧ تیرمذي (١١٧٤).

٨ بوخاری (٥٠٩٦)، موسلیم (٢٧٤٠).

## ٣٦-باسی ژێوارو بەخێوکردنی خێزان (باب النفقة على العيال)

قال الله تعالى: ﴿وعلى المولود له رزقهن وكسوتهن بالمعروف﴾البقرة/٢٣٣.

واتە: خودا دایناوە لەسەر باوك كە منداڵەكە هی ئەوە، كە نەفەقەو ژێوارو جل‌و بەرگ بەپێی تەوانای خۆی بدا بە دایكی منداڵەكە.

وقال تعالى: ﴿لينفق ذو سعة من سعته ومن قدر عليه رزقه فلينفق مما آتاه الله، لايكلف الله نفسا إلا ما آتاها﴾الطلاق/٧.

واتە: با ئەوەی دارایەو دەوڵەمەندە بەپێی شانی خۆی ژێوارو نەفەقە بدا بە خێزانەی، ئەو پیاوەیشی كە دەستی كورتە با بەپێی ئەوەی كە خودا پێی داوە ژێوار بدا بە خێزانی، خودا بارێكی وا نانێ لەكەسێ كە پێی هەڵنەسێ.

وقال تعالى: ﴿وما أنفقتم من شئ فهو يخلفه﴾سبأ/٣٩.

واتە: هەرچی بەنیازێكی پاك خەرج بكەن لەرێگەی چاكەو خێرا لای خودا ون نابێ، وە خودا لەلای خۆی بۆتانی پاشەكەوت دەكا.

٢٨٩/١-[1] – وعن أبي هريرة رضي اللّٰه عنه قال: قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: «دِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ في سبيلِ اللّٰه، وَدِينَارٌ أَنْفَقتَهُ في رقَبَةٍ، ودِينَارٌ تصدَّقْتَ بِهِ عَلَى مِسْكِينٍ، وَدِينَارٌ أَنْفقْتَهُ على أَهْلِكَ، أَعْظمُهَا أَجْراً الّذي أَنْفَقْتَهُ علَى أَهْلِكَ) رواه مسلم.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: دینارێ بدەی بۆ غەزاو دینارێ بدەی بۆ ئازادكردنی بەندەو دینارێ بەخێر بدەی بەهەژارێ‌و دینارێ خەرج بكەی بۆ كەس‌و كاری خۆت ئەو دینارەیان خێری زۆر ترە كە خەرجی بكەی بۆكەس‌و كاری خۆت! (م).

٢٩٠/٢-[2] – وعن أبي عبدِ اللّٰهِ وَيُقَالُ له: أبي عبدِ الرَّحمن ثَوْبانَ بْن بُجْدُدَ مَوْلَى رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (أَفْضَلُ دِينَار يُنْفِقُهُ الرَّجُلُ دِينَارٌ يُنْفِقُهُ عَلَى عِيالِهِ، وَدِينَارٌ يُنْفِقُهُ عَلَى دابَّتِهِ في سبيلِ اللّٰه، ودِينَارٌ يُنْفِقُهُ عَلَى أَصْحابه في سبِيلِ اللّٰهِ) رواه مسلم.

---

١ موسليم (٩٩٥)

٢ مسليم (٩٩٤)



**سەوبانی کوڕی بوجدود** (رەزای خودای لێ بێ) **کە نۆکەری ئازادکراوی حەزرەت بوو، فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: باشترین دینارێ کەپیاو خەرجی بکا ئەو دینارەیە کە پیاو خەرجی بکا بۆ خێزانەکەی خۆی ئەو دینارەشە کەخەرجی بکا بۆ ئەو وڵاخەی کەڕای گرتووە بۆ خەبات گێڕان لەڕێگە خوداداو ئەو دینارەشە کە خەرجی بکا بۆ ئەو هاوڕێیانەی کە هاوڕێی رێگەی خودایینی! (م).**

٣-٢٩١/٣- وعن أُمِّ سلَمَةَ رضي اللّهُ عنها قَالَتْ: قلتُ يا رسولَ اللّهِ، هَلْ لـي أَجْـرٌ في بني أبي سلَمَةَ أَنْ أُنفِقَ علَيْهِمْ، ولَسْتُ بتارِكَتِهِمْ هَكَذَا وهَكَذَا، إِنَّما هُمْ بنِيَّ ؟ فقال: (نَعَمْ لَكِ أَجْرُ ما أَنْفَقْتِ علَيهِم) متفقٌ عليه.

**ئوممو سەلەمە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: عەرزی حەزرەتم کرد، گوتم: قوربان! ئەگەر شتێ بدەم بەمناڵەکانم کە لە ئەبو سەلەمەی مێردی پێشوومن ئایا هیچ خێرم دەگا؟ خۆ ناش توانم بەرەڵایان بکەم بەم لاو لادا چونکە منداڵی خۆمن! فەرمووی: بەڵێ هەرچی مەسرەفێکیان بۆ بکەی بەخێر حلێبە بۆتو پاداشتی لەسەر وەردەگریت! (ش).**

١-٢٩٢/٤ – وعن سعد بن أبي وقّاص رضي اللّه عنه في حديثِهِ الطّويلِ الذِي قَدَّمْناهُ في أَوَّل الْكِتَابِ فِي بَابِ النِّيَّةِ أَنَّ رسول اللّه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال له: (وَإِنَّـكَ لَـنْ تُنْفِـقَ نَفَقَةً تَبْتَغِي بِهَا وَجهَ اللّه إلاّ أُجِرْتَ بها حَتَّى ما تَجْعَلُ في في امرأَتِكَ) متفقٌ عليه.

**فەرموودەی شەشەمی زنجیرەی یەکەم لەپێشەوە ڕابورد بۆ ئێرەش دەست دەدا. بڕوانە ژمارە: (٦/٦).**

٢-٢٩٣/٥ – وعن أبي مَسْعُودٍ الْبَدرِيِّ رضي اللّه عنه، عن النبـي صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: «إِذَا أَنْفَقَ الرَّجُلُ على أَهْلِهِ نفقَةً يحْتَسبُها فَهِي لَهُ صدقَةٌ) متفقٌ عليه.

**ئەبو مەسعودی ئەلبەدری** (رەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموی: حەزرەت** (درودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: پیاو کاتێ مەسرەفێ دەکا بۆ خێزان و کەس و کاری خۆی، ئەوە دادەنرێ**

---

٣ بوخاری (١٤٦٧)، موسلیم (١٠٠١).

١ بڕوانە ژمارە (٦/٦) کە ڕابورد.

٢ بوخاری (٥٥)، موسلیم (١٠٠٢).

بەخێرو سەدەقە بۆی، بەمەرجێ مەبەستی لێی ڕەزای خوا بێ‌و بەنیازی پاداشی باشی لای خودا بکا! (ش).

نیـــازی پـــاک لـــەبۆکاری باشـــی چـــاک
وەک هـــەویر ترشـــەو هـــەوێنی زۆر پـــاک
داخـــم کـــاری بـــاش بـــەبێ نیـــازی پـــاک
وەک جەســـتەی بـــێ ڕۆح دەبێتـــۆ بـــەخاک

٦/٢٩٤-٣ – وعن عبدِ اللّهِ بنِ عمرو بنِ العاص رضي اللّه عنهما قال: قال رسولُ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (كَفي بِالمرْءِ إِثْماً أَنْ يُضَيِّعَ مَنْ يقُوتُ) حديثٌ صحيحٌ رواه أَبو داود وغيره.

ورواه مسلم في صحيحه بمعنَاهُ قال: (كَفي بِالمرْءِ إِثْماً أَنْ يَحْبِسَ عَمَّنْ يملِكُ قُوتَهُ).

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (ڕەزای خودا لەخۆی‌و بابی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بەسە بۆ گوناهباری پیاو، کە ئەو کەسانەی بەخێویان دەکا پشت گوێیان بخات. (د-ح/ص).

موسلیم (ڕەزای خودای لێ بێ) لە صەحیحی موسلیم دا بەمەعنا ئەم حەدیسەی لەسەر ئەم شێوەیە گێڕاوەتەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بەسە بۆ گوناهباری کەسێ کە نان‌و ئاو بگرێتەوە لەخوار دەستەی خۆی.

٧/٢٩٥-١ – وعن أبي هريرةَ رضي اللّهُ عنه أَن النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قـال: (مَـا مِنْ يوْمٍ يُصْبِحُ الْعِبَادُ فِيهِ إلاَّ ملكَان يَنْزِلان، فَيقولُ أَحـدُهُما: اللَّهُـمَّ أَعْـطِ مُنْفِقـاً خَلفـاً، ويَقولُ الآخَرُ: اللَّهُمَّ أَعْطِ مُمْسِكاً تَلَفاً) متفقٌ عليه.

ئـــەبو هـــورەیرە لەحەزرەتـــەوە دەفـــەرموێ (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) هـــەموو ڕۆژێ کەبەنـــدەکان ڕۆژیـــان لـــێ دەبێتـــەوە، دوو فریشـــتە دێنـــە خـــوارەوە، یـــەکێکیان دەفەرموێ: خودایە! ئەوەی بەخشندەیە تۆش پێی ببەخشەو تۆڵەی بۆ بکەرەوە، ئەوی تریشیان دەفەرموێ: خودایە: ئەوەی ڕژدو گێرە لێی بگرەوە! (ش).

---

٣ ئەبو داوود (١٦٩٢).

١ بوخاری (١٤٤٢)، موسلیم (١٠١٠).

٢-٢٩٦/٨ – وعنه عن النبـي صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (الْيَـدُ الْعُلْيـا خَيْـرٌ مِـنَ الْيَـدِ السُّفْلَى وابْدَأْ بِمن تَعُولُ، وَخَيْرُ الصَّدَقَةِ مَا كَانَ عَنْ ظَهْرِ غِنَى، ومَنْ يَسْتَعِففْ، يُعِفَّهُ اللَّـهُ، ومَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِه اللّهُ) رواه البخاري.

ديسان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: دیارە کە دەستی سەروو (کە دەستی خێرکەرە) لەدەستی ژێروو (کەدەستی دەرۆزەکەرە)، گەلێ باشترە! لە خێزانی خۆشتەوە دەست بکە بە خێرکردن، باشترین خێریش ئەو خێرەیە کە لەسەر تێری بێ، هەرکەسێکیش خۆی بەدوور بگرێ لە ڕوو زەردی سواڵو سواڵ کردن خودا لەهەردوو جیهاندا ڕوو سورو سەربەرزی دەکا (ب-خ).

مەحوی غەرقی ڕەحمەتی خودا بێ دەفەرموێ:

لە ڕوو سوریو عیبادەت لامو ڕوو زەردو خەجالەت مام

بەناوی سێوی ناوم باغەبانو من بەهێ دەگرم!

## ٣٧- باسی بەخشینو خێرکردن لەماڵی باشو نایاب
## باب الإنفاق مما (يجب) ومن الجيد

قال الله تعالى: ﴿لن تنالوا البرَّ حتى تنفقوا مِمَّا تحبُّون﴾. آل عمران/(٩٢).

وقال تعالى: ﴿يا أيُّها الَّذينَ آمَنوا أنفِقوا من طيِّباتِ مَا كَسَبتم وَمِمَّا أخرَجنا لكُم مِّنَ الأرضِ وَلا تيمَّمُوا الخَبيثَ منهُ تنفِقُون﴾. سورة البقرة/ (٢٦٧).

واتە: ناگەن بەخێرو چاکەی تەواو ڕەسا هەتا خەرجی نەکەن لەوشتە باشانەی کە خۆشتان دەوێن، لەکەسپی پاکی خۆتان، لەماڵی حەلاڵی ساغی خۆتان، لەبەرووبوومی زەویو زار کەخودا لەو عەرزە ڕەقە پەیدای دەکا بۆتان، بەپێی تەوانای خۆتان، بەپێی حاڵ، خێرو خێراتو پیاوەتی لێ بکەنو چروکیو ڕەزیلی مەکەن، وەك ئەوە بچن لە ئایەخو خراپی ماڵو دارایی خۆتان خێرو پیاوەتی بکەن.

١-٢٩٧/١ – عن أَنس رضي اللّه عنه قال: كَانَ أَبو طَلْحَةَ رضي اللّه عنه أَكْثَر الأَنْصَارِ بِالمدِينَةِ مَالاً مِنْ نَخْلٍ، وَكَانَ أَحَبُّ أَمْوالِهِ إِلَيْهِ بَيْرَحاءَ، وَكانَتْ مُسْتَقْبِلَةَ المسْجِدِ وكَانَ

---

٢ بوخاری (١٤٢٧).

١ بوخاری (١٤٦١)، موسليم (٩٩٨).

رسولُ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يدْخُلُهَا وَيشْربُ مِنْ ماءٍ فِيهَا طَيِّبٍ قَالَ أَنَسٌ: فلَمَّا نزلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: { لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ } قام أَبو طَلْحَةَ إلى رسول اللّه صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم فقال: يا رسولَ اللّه إنَّ اللّه تَعالَى أنْزَلَ عَلَيْكَ: { لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ } وَإنَّ أَحَبَّ مَالي إلَيَّ بَيْرَحَاءَ، وإنَّهَا صَدقَةٌ للّهِ تَعَالَى أَرْجُو بِرَّهَا وذُخْرهَا عِنْد اللّه تعالى، فَضَعْها يا رسول اللّه حيْثُ أَرَاكَ اللّهُ، فقال رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (بَخٍ، ذلِكَ مَالٌ رَابحٌ، ذلِكَ مَالٌ رَابحٌ، وَقَدْ سمِعْتُ مَا قُلْتَ، وَإنِّي أَرَى أَنْ تَجْعَلَهَا في الأَقْرَبِينَ) فقال أَبو طَلْحَةَ: أَفْعَلُ يا رسولَ اللّه، فَقَسَّمَهَا أَبُو طَلْحَةَ في أَقَارِبِهِ، وَبَني عَمِّهِ. متفقٌ عليه.

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەمەدینە ئەبو تەڵحە لەناو یاریدەدەرانا لەهەموویان دەوڵەمەند تربوو، باخێ خورمای هەبوو ناوی (بەیرەحا)بوو، بەرامبەر قیبلەی مزگەوتەکەی پیغەمبەر بوو، ئەم باخە خۆشەویسترینماڵی بوو، کانیاوێکی سازگاری تیابوو، گەلێ جار پیغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی دەچوو لەئاوەکەی دەخواردەوە.

جاکاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿لن تنالُوا البرَّ حَتى تنفِقُوا ممَّا تحِبُّونَ﴾ آل عمران/٩٢.

واتە: ناگەن بە پاداشتی چاكو خێری تەواو هەتا سەرف دەکەن لەڕێگەی خودادا لەماڵی نایابو خۆشەویستەکانتانو لەو نازو نیعمەتو پایەو بەهرە باشانەی کە خودا پێی داون. ئەبو تەڵحە هەڵسا چوو بۆلای پێغەمبەر گوتی: قوربان! خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا کەنامەی خۆیەتی دەفەرموێ: ﴿لن تنالُوا البرَّ حَتى تنفِقُوا ممَّا تحِبُّونَ﴾ وەمنیش باشترین ماڵم بەلامەوە باخی (بەیرەحا)یە جا ئەوە کردم بەخێر، ساغ لەبەر ڕەزای خودا، ئومێد دەکەم کە خودا بەچاکە بینوسێ بۆمو پاشەکەوتی بکا بۆم، بۆ رۆژی دواییم، جا تۆش ئەی پێغەمبەری خودا! خۆت سەرپشك بە چۆنی بەباش دەزانی ئاوای لێ بکە.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بەهە، لەم خێرە جوانە، بەڕاستی ماڵی پڕ فەڕو خێردار ئاوادەبێ! تێگەیشتم دەڵێی چی منیش وا بەباشی دەزانم کەبیدەی بەخزمو خوێشانی خۆت.

جا ئەبو تەڵحە دابەشی کرد بەسەر خزمو ئامۆزاکانی خۆیدا! (ش).

**٣٨- باسی پەروەردەکردنو ئامۆژگاری خاوو خێزانو ماڵو منداڵو ئەوانەی بەرپرسیارە لێیانو فەرمان کردن پێیان، بەفەرمانبەری خودای گەورەو قەدەغەکردنیان لەنافەرمانی خودا (باب وجوب أمره أهله وأولاده المميزين وسائر من في رعيته بطاعة الله تعالى، ونهيهم عن المخالفة وتأديبهم ومنعهم عن منهه عنه)**

قال الله تعالى: ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا﴾ سورة طه/ (١٣٢).

واتە: فەرمان بکە بەکەسو کاری خۆت کە نوێژ بەرێکوپێکی بکەنو خۆشت صەبر بگرە لەسەری.

وقال تعالى: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا﴾ سورة التحريم/(٦).

واتە: ئەی کەسانێ کەباوەڕتان هێناوە! تاعەتی خوداو پێغەمبەری خودا بکەن بەسەر مایەی خۆتانو کەسو کاری خۆتان بەهۆی ئەو دەست مایە جوانەوە بپارێزن لەئاگری دۆزەخ.

١-٢٩٨/١ – وعن أبي هريرةَ رضي اللّٰه عنه قال: أَخذ الحسنُ بنُ عليّ رضي اللّٰه عنهُما تَمْرةً مِنْ تَمرِ الصَّدقةِ فَجعلهَا في فِيهِ فقال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (كُخْ كُخْ، إرْمِ بِهَا، أَما عَلِمْتَ أَنَّا لا نأْكُلُ الصَّدقةَ، ؟) متفق عليه. وفي روايةٍ: (إنا لا تَحِلُّ لنَا الصَّدقةُ) وقوله: (كِخْ كِخْ) يُقالُ بإسْكَانِ الخَاءِ، ويُقالُ بكَسرِهَا مع التَّنْوِينِ وهيَ كلمةُ زَجْرٍ للصَّبِيِّ عن المُسْتَقذَرَاتِ، وكَانَ الحسَنُ رضي اللّٰه عنه صبِياً.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرموی: حەسەنی کوڕی عەلی (رەزای خودا لەخۆیو بابی بێ) منداڵ بوو، دەنکێ خورمای زەکاتی هەلگرتو نایە دەمیەوە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تێی خوڕی فەرمووی: قخ قخ: یەع یەع: فرێی دە، چ عەجەب نازانی کەئێمە زەکات ناخۆین، (ش). لەگێڕانەوەیەکدا ئەوە چۆنە کەنازانی زەکات بەئێمە ناشێ؟.

٢-٢٩٩/٢ – وعن أَبي حفْصٍ عُمَر بن أبي سلَمةَ عبدِ اللّٰه بنِ عبدِ الأَسد: ربيبِ رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: كُنْتُ غُلاماً في حجْرِ رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، وكَانَتْ يَدِي تَطِيشُ في الصَّحْفَةِ، فقال لي رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (يا غُلامُ سمِّ اللّٰهَ تعالى، وَكُلْ بِيمِينِكَ، وكُل مِمَّا يليكَ) فَما زَالَتْ تِلْكَ طِعْمتي بعْدُ. متفقٌ عليه.

---

١ بوخاری (١٤٩١)، موسلیم (١٠٦٩).

٢ بوخاری (٥٣٧٦)، موسلیم (٢٠٢٢).

**عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: منالْ بووم پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **خۆی بەخێوی دەکردم چونکە زڕ کوڕی بووم، کوڕی ئومو سەلەمە بووم، کەهاوسەری حەزرت** (درودی خودای لەسەر بێ) **بوو، کە نانم دەخوارد دەستم دەگێڕا بەناو لەگەنەکەدا، بەئارەزووی خۆم، جا پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **تەمێی کردمو فەرمووی: رۆڵە کە نان دەخۆی لەسەرەتاوە ناوی خودا بێنەو بسم الله بکەو بەدەستی ڕاستت شت بخۆو لەبەردەمی خۆتەوە بخۆ، فەرمووی ئیتر لەوساوە تا ئێستا هەربەم شێوەیە نان دەخۆم کە پێغەمبەر فێری کردوم (ش).**

٣/٣٠٠-١– وعن ابن عمَر رضي اللّٰه عنهما قال: سمعت رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يقول: (كُلُّكُمْ راعٍ، وكُلُّكُمْ مسئولٌ عنْ رعِيَّتِهِ، والأِمَامُ رَاعٍ، ومسئولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، والرَّجُلُ رَاعٍ في أَهْلِهِ ومسئولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، والمرْأَةُ راعِيةٌ في بيْتِ زَوْجِهَا ومسئولة عَنْ رعِيَّتِهَا، والخَادِمُ رَاعٍ في مالِ سيِّدِهِ ومسئولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، فكُلُّكُمْ راعٍ ومسئولٌ عنْ رعِيتِهِ» متفقٌ عليه.

**بڕوانە ژمارە: ٣ / ٢٨٣ ز/٣٥،**

٤/٣٠١-٢ – وعن عمرو بن شُعْيب، عن أَبيه، عن جَدِّهِ رضي اللّٰه عنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (مُرُوا أَوْلادكُمْ بِالصَّلاةِ وهُمْ أَبْنَاءُ سبع سِنِينَ، واضْرِبُوهمْ علَيْهَا وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرٍ، وفرِّقُوا بيْنَهُمْ في المضَاجعِ) حديثٌ حسن رواه أبو داود بإسنادٍ حسنٍ.

**عەمری کوڕی شوعەیب لەباوکیەوە لەباپیریەوە (رەزای خودا لەخۆیو بابی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: لەتەمەنی حەوتساڵیدا دەستور بدەن بەمنالی خۆتان کەنوێژ بکەن، لەتەمەنی دەساڵیدا منالتان ئەگەر نوێژیان نەکرد لەسەر ئەوە لێیان بدەن، وە جێگەی نوستنیان لەیەکتری جیا بکەنەوە (د-ح/ح).**

---

١ (٣/٣٠٠ز-٣٥).

٢ ئەبو داود (٤٩٥).

٥/٣٠٢-٣ – وعن أبي ثُريَّةَ سَبْرَةَ بن مَعْبدٍ الجهَنِيٍّ رضي اللّٰه عنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (عَلِّمُوا الصَّبِيَّ الصَّلاةَ لِسَبْعِ سِنِينَ، وَاضْرِبُوهُ عليْهَا ابْنَ عشْرِ سِنِينَ) حديث حسنٌ رواه أَبو داود، والترمِذي وقال حديث حسـن. ولَفْـظُ أبـي داوُد: (مـرُوا الصَّبِيَّ بِالصَّلاَةِ إِذَا بَلَغَ سَبْعَ سِنِينَ).

**سەبرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **فـەرمووی: منـاڵ کاتـێ تەمەنی بوو بە حەوت ساڵ فێری نوێژی بکەن، لەسەر نوێژ نەکردنیش لەتەمەنی دە ساڵیدا لێیان بدەن! (د/ت-ھ/ح). بێژە (لفظ)ی ترمزی ئاوایە: (مناڵ کەتەمـەنی بوو بە حەوت ساڵ پێیان بڵێن کەنوێژ بکەن).**

## ٣٩- باسی مافی دراوسێ و ڕاسپێری باش دەربارەی
## باب حق الجار والوصية به

قال الله تعالى: {وَاعْبُدُواْ اللّهَ وَلاَ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَبِـذِي الْقُرْبَـى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَالْجَارِ ذِي الْقُرْبَى وَالْجَارِ الْجُنُبِ وَالصَّاحِبِ بِالجَنبِ وَابْـنِ السَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ} سورة النساء/(٣٦).

**واتە: بەس خودا بپەرستن و ھاوبەش و ھاوەڵی بۆ بڕیار مەدەن، وە زۆر باش بن بـۆ بـاوك و دایـك و نـەنك و بـابی خۆتـان، دوورو نزیکیـان، ھـەروەھا زۆر بـەوێڵ و ماریفەت بن لەگەڵ خزم و خوێش و ھەتیوان و دراوسێی نزیـك و دوورتانـدا، ئـیتر چ خـزم بـن چ بێگانـە بـن، ھـەروەھا لەگـەڵ ھـاوڕێ و ھاوسـەرو ھاوبـەش و ھاوپیشـەی خۆتـان بابیـانیش بـن ھـەروەھا لەگـەڵ ڕێبـواری پەککەوتـە، لەگـەڵ ئـەو بەنـدەو کەنیزانەدا کەماڵی خۆتانن.**

١/٣٠٣-١ – وعن ابنِ عمرَ وعائشةَ رضي اللّٰه عنهما قَالا: قال رسولُ اللّٰـه صَـلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالجارِ حتَّى ظَنَنتُ أَنَّهُ سيُوَرِّثُهُ) متفقٌ عليه.

**ئیبنو عومەرو عائیشە (ڕەزای خودایـان لـێ بـێ) فـەرموویان: پێغەمبـەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: جوبرائیـل** (درودی خودای لەسەر بێ) **ئەوەنـدە بـەزۆری ئامۆژگاری کـردم**

---

٣ ئەبو داوود (٤٩٤)، تیرمزی (٤٠٧).

١ بوخاری (٦٠١٤) و(٦٠١٥)، موسلیم (٢٦٢٤) و(٢٦٢٥).

لەبارەی مافی دراوسێوە لەسەر دراوسێ تا وام زانی کە دراوسێ لەیەکتری کەلەپور دەبەن (ش).

٢-٣٠٤/٢ – وعن أبي ذرّ رضي اللّٰه عنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (يَا أَبَا ذرّ إِذا طَبَخْتَ مَرَقَةً، فَأَكْثِرْ مَاءَها، وَتَعَاهَدْ جِيرَانَكَ) رواه مسلم.

وفي رواية له عن أبي ذرّ قال: إن خليلي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم أَوْصَانِي: (إِذا طبخْتَ مَرَقاً فَأَكْثِرْ مَاءَهُ ثُمَّ انْظُرْ أَهْلَ بَيْتٍ مِنْ جِيرانِكَ، فَأَصِبْهُمْ مِنْهَا بِمعْرُوفٍ).

ئەبو ذەڕ (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی ئەبو ذەڕ! کاتی کە مەرگە لێ دەنێی هەندێ ئاوەکەی زۆرتر کەو ئاگات لە هاوسێکانت بێو بەشیان بدە لێی (م). لە گێڕانەوەیەکی تری موسلیمدا فەرمووی: دۆستی خۆشەویستم، پێغەمبەری نازدار (درودی خوای لەسەر بێ) ئامۆژگاری کردووم: کاتێ مەرگەو شتی وام لێنا هەندێ ئاوەکەی زۆرتر بکەم، فەرمووی: ئەوجا سەرنجی دراوسێکانت بدە، بەپێی تەوانا بەشیان لەو مەرگەیە بدە.

٣٠٥/٣–[٣]– وعن أبي هريرة رضي اللّٰه عنه أن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (واللّٰهِ لا يُؤْمِنُ، واللّٰهِ لا يُؤْمِنُ، واللّٰهِ لا يُؤْمِنُ) قِيلَ: منْ يا رسولَ اللّٰهِ ؟ قال: (الَّذي: لا يأْمنُ جارُهُ بَوَائِقَهُ،) متفق عليه. وفي رواية لمسلمٍ: (لا يَدْخُلُ الجنَّة مَنْ لا يأْمنُ جارُهُ بوَائِقهُ). (الْبَوائِقُ) الْغَوَائِل وَالشُّرُورُ.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) سێ جار لەسەر یەك فەرمووی: بەخودا باوەڕو ئیمانی نییە! عەرزیان کرد: کێ؟ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: کەسێ کە هاوسێ لەزیان و وەزەنی بترسێ! (ش).

وفي رواية لمسلم: لايدخل الجنة من لا يؤمن جاره بوائقه: لە گێڕانەوەیەکی موسلیما: دراوسێ زیانەخرۆ ناچێتە بەهەشت!

٣٠٦/٤– وعنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (يَا نِسَاءَ الْمُسلِمَاتِ لا تَحْقِرَنَّ جارَةٌ لجارتِهَا وَلَوْ فِرْسَنَ شَاةٍ) متفقٌ عليه.

بڕوانە ژمارە (١٢٤/٨ز-١٣).

---

٢ بوخاری (٦٠٦١)، موسلیم (٤٦).

٣ بوخاری (٦٠١٦)و ەموسلیم (٤٦).

٣٠٧/٥-[٥]- وعنه أَن رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: لا يَمْنَعْ جارٌ جارَهُ أَنْ يغْرزَ خَشَبَةً في جِدارِهِ) ثُمَّ يَقُولُ أَبو هريرة: مَالي أَرَاكُمْ عنْهَا معْرِضِينَ، واللّٰهِ لأرمِينَّ بها بيْنَ أَكْتَافِكُمْ. متفقٌ عليه.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لەسەر بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ: ڕێگەی دراوسێ بدەن كەسەری دەستەك و گوێسەوانە لەسەر دیوارتا دابنێن، ئەوجا ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوە بۆچی دەتانبینم لوتەلان لەم فەرمایشتە! دەسا بە یەزدانی پاك خۆشیتان بێ و ترشیتان بێ من ئەركی سەرشانی خۆم بەجێ دێنم و قسەی هەق وەك گوڵمێخ دەیكوتم بە ناوشانتانا (ش)*

٣٠٨/٦-[٦]- وعنه أَن رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ باللّٰهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ، فَلا يُؤْذِ جارَهُ، وَمَنْ كَان يُؤْمِنُ بِاللّٰهِ والْيَوْمِ الآخرِ، فَلْيكرِمْ ضَيْفهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللّٰهِ وَالْيومِ الآخِرِ، فَلْيَقُلْ خَيْراً أَوْ لِيَسْكُتْ) متفقٌ عليه.

دیسان فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوەی كە بەڕاستی باوەڕی ڕاستی بە خوداو ڕۆژی دوایی هەیە با نەبێ بەباری ئێش و ئازار بۆ دراوسێی خۆی، ئەوەی باوەڕی تەواوی بەخوداو پێغەمبەرو ڕۆژی دوایی هەیە با قەدرو ڕێزی میوانی خۆی بگرێ، وە ئەوەی باوەڕی تەواوی بە خوداو پێغەمبەرو ڕۆژی دوایی هەیە با یا قسەی باش بكا یا بێ دەنگ بێ و دەمی خۆی بگرێ (ش).

٣٠٩/٧-[٧٧]- وعن أَبي شُرَيْح الخُزاعيِّ رضي اللّٰه عنه أَن النبي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: ((مَنْ كَانَ يُؤمِنُ بِاللّٰهِ والْيوْمِ الآخِرِ، فَلْيُحسِنْ إِلى جارِهِ، ومنْ كَانَ يُؤمِنُ بِاللّٰهِ واليومِ

---

٥ بوخاری (٢٥٦٦)، موسلیم (١٠٣٠).

* بۆ ساخ كردنەوەی ئەم فەرموودەیە بەهرەم لە تاجولئوصول وەرگرتووە، چونكە ئەم ڕستەیە لە ئەصلەكەی بەردەستمدا ئاوایە: (ثم يقول: ابا هريرة مالي أراكم.....الخ)وە ئەم پەراوێزەی لەسەر نووسراوە: في الأصل (ابي هريرة) وهو خطأ لأن (ابا هريرة) منادآ بحرف نداء محذوف وەلێ من ئەمە بەهەڵە دەزانم، چونكە بەپێی ئەم قسەیەبێ دەبێ ئەم ڕستەیەش فەرمایشتی حەزرەت بێ و سەرزەنشتی ئەبو هورەیرەی پێ بكا، كە بەباشی گوێ بۆ فەرمایشتەكەی شل ناكا، بەڵام ئەم ڕستەیە قسەی ئەبو هورەیرەیە نەوەكو حەزرەت.

٦ بوخاری (٦٠١٨)و موسلیم (٤٧).

٧٧ موسلیم (٤٨)، بوخاری (٦٠١٩).

الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفهُ، ومنْ كانَ يؤمنُ باللّهِ واليومِ الآخرِ فَلْيَقُلْ خَيْراً أَوْ لِيسْكُتْ) رواه مسلم بهذا اللفظ، وروى البخاري بعضه.

**ئەبو شورەیح** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرموویـ: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرموویـ: کەسێ باوەڕی ساغی بە خوداو ڕۆژی دوایی هەیە با لەگەڵ هاوسێی زۆر باش بێ، کەسێ باوەڕی بە خوداو ڕۆژی دوایی هەیە ا ڕێزی میوانی خۆی بگری، کەسێ باوەڕی بە خوداو ڕۆژی دوەایی هەیە با قسەی چاك بكا یا بۆ خۆی بێ دەنگ بێ.**

٣١٠/٨-[٨]- وعن عائشة رضي اللّه عنها قالت: قلت: يا رسول اللّه إنَّ لي جَارَيْنِ، فَإِلى أَيِّهما أُهْدِي؟ قال: (إلى أَقْربهِما مِنْك باباً) رواه البخاري.

**عائیشە** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرموویـ: ئەی ڕەوانەكراوی خودا! من دوو دراوسێم هەیە، لە پێشا دیاری بە كامیان بدەم؟ فەرموویـ: بەوەیان كە دەرگاكەی لێتەوە نزیكترە (ب-خ).**

٣١١/٩-[٩]- وعن عبدِ اللّه بن عمرِ رضي اللّه عنهما قال: قال رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (خَيْرُ الأَصحاب عِنْدَ اللّهِ تعالى خَيْرُهُمْ لصاحِبِهِ، وخَيْرُ الجيران عِنْدَ اللّه تعالى خيْرُهُمْ لجارِهِ) رواه الترمذي وقال: حديث حسن.

**عەبدوڵلای كوڕی عومەر** (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) **فەرموویـ: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرموویـ: باشترین هاوڕێ لەلای خوا ئەو هاوڕێیەیە كە زۆرباش بێ بۆ هاوڕێی خۆی، باشترین دراوسێ ئەو لەلای خودای گەورە ئەو دراوسێیەیە كە زۆر باش بێ بۆ دراوسێی خۆی (ت:ح/ح).**

## ٤٠- باسی چاكیو دڵسۆزی بۆ باوكو دایكو خزمو دۆستو كەسوكار
## باب بر الوالدين وصلة الأرحام

**قال الله تعالى: ﴿واعبدوا الله ولا تشركوا به شيئا وبالوالدين.....﴾**

**بڕوانە سەرەتای بەاسی ژمارە (٣٩).**

**وقال تعالى: ﴿واتقوا الله الذي تسألون به والأرحام﴾الانساء/١.**

---

٨ بوخاری (٦٠٢٠).

٩ تیرمذي (١٩٤٥).

واته: وه تەقوای خودا بکەن‌و لەخودا بترسن، لەو خودا نازداره کە بەخاتری ئەو داوای شت لەیەکتری دەکەن، وه خۆتان بپارێزن لە بڕینی رشتەی خزمایەتی‌و میهرەبانی.

وقال تعالى: ﴿والذين يصلون ما أمر الله به أن يوصل﴾الرعد/٢١.

واته: خاوەن هۆشی ساغ‌و باش ئەو کەسانەن ئەوەی کە خودا فەرمانی کردووه بە کردنی‌و بەسەرپەرشتی کردنی دەیکەن‌و بەباشی سەرپەرشتی دەکەن.

وقال تعالى: ﴿ووصينا الإنسان بوالديه حسنا﴾العنكبوت/٨.

واته: ئێمە لەلایەنی خۆمانەوه بەفەرمانی تایبەتی ئامۆژگاری ئادەمیزادمان کردووه کە بۆ دایك‌و باوك‌و نەنك‌و باپیری خۆی باش بێ.

وقال تعالى: ﴿وقضى ربك ألا تعبدوا إلا إياه وبالوادين إحسانا إما يبلغن عندك الكبر أحدهما أو كلاهما فلا تقل لهما أف ولا تنهرهما وقل لهما قولا كريما، وأخفض لهما جناح الذل من الرحمة وقل رب أرحمهما كما ربياني صغيرا﴾الإسراء/٢٣-٢٤.

واته: فەرمان‌و بڕیاری خودا وایە کە ئێوەی بەندەکانی ئەو بەس خۆی بپەرستن‌و عیبادەتی ساغ بۆ ئەو بکەن، وه بۆ باوك‌و دایك زۆر باش بن، ئەگەر باوکتان یا دایکتان یا هەردووکیان کەوتنە کاتی پیری، وه تۆش مابووی ئەوا زۆر بە وێڵ‌و ئەدەب‌و ڕێزبە لەگەڵیان، نەکەی دڵیان بشکێنی، یا ئازاریان بدەی یا لە ڕوویاندا هەڵبگەڕێیتەوه، ئۆفی ئوف ئاسایی چییە پێیان مەڵێن هەمیشە زمانت شیرین بێ لەگەڵیان، بە ڕێزەوه قسەیان لەگەڵ بکەن، زۆر بە دڵسۆزی‌و میهرەبانی باڵی ملکەچی‌و میهرەبانیان بۆ رابخەو دووعاو نزای باشیان لە ژیان‌و مردندا بۆ بکەو داوای میهر و ڕەحمەتی گەورەیان لە خودا بۆ بکەو بڵێ: پەروەردگارا! ڕەحم بە باوك‌و دایکم بکە چونکە ئەوان منیان پەروەردە کردووه.

وقال تعالى: ﴿ووصينا الإنسان بوالديه حملته أمه وهنا على وهن، وفصاله في عامين أن أشكر لي ولوالديك﴾لقمان/١٤.

واته: ئێمە کە خودای ئێوەین لە ڕووی مەرحەمەتەوه ئامۆژگاری مرۆڤمان کردووه کە لەگەڵ باوك‌و دایکی خۆی باش بێ‌و خراپ نەبێ بۆیان، ئەو ئەرك‌و زەحمەتەی ئەوان دەیکێشن لەگەڵ منداڵیان وەبیرمان خستوونەتەوه، ئەوەتانێ وا بەبەرچاوەوه کە دایك چەندە ماندوو دەبێ تا منداڵێ دەهێنێ‌و گەورەی دەکا، لە

پێش هەموو شتێکا نۆ مانگ بەچەرمی سك هەڵی دەگرێ سەرەڕای ئەوەش بە ئێش‌و ئازارێکی زۆر کە دەبێ بەمایەی لاواز بوونی جار لەگەڵ جاردا، لەداوێنی دەکەوێتە خوارەوەو تووشی زەیستانی‌و ژانگرتن دەبێ، ئەوجا گەلێك شەو نووخونی‌و ئەرك‌و ماندوویی بەدیارەوە دەکێشێ، بەشیری مەمەی خۆی دووساڵی رەبەق مەمکی دەداتێ هەتا لەشیر دەیبڕێتەوە، وە بەفەرمانی تایبەتی پێمان گوتووە لەسەر زمانی پێغەمبەران: ئەی ئادەمیزاد! سپڵە مەبە چاکەی خوداو چاکەی باوك‌و دایکتت لەبەرچاو بێ، هەم سوپاسی من بکە کە تۆم لەتنۆکێ ئاو کردووە بە ئەم ئادەمییە رێکوپێك‌و جوان‌و نازدارەو نەمکردووی بە ئاژەڵ‌و کەرو گا، هەم سوپاسی دایك‌و باوکی خۆت بکە، کە مایەی بوونی تۆن هۆی مانی تۆن!.

٣١٢/١-[١] – عن أبي عبد الرحمن عبد اللّٰه بن مسعود رضي اللّٰه عنه قال: سأَلتُ النبي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم: أَيُّ الْعملِ أَحبُّ إلى اللّٰهِ تَعالى ؟ قال: (الصَّلاةُ على وقْتِهَا) قُلْتُ: ثُمَّ أَيُّ ؟ قال: «بِرُّ الْوَالِدَيْنِ» قلتُ: ثُمَّ أَيُّ ؟ قال: «الجِهَادُ في سبِيلِ اللّٰهِ» متفقٌ عليه.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەپێغەمبەرم پرسی (دروودی خودای لەسەر بێ): کام کردەوەیە لەلای خودای گەورە زۆر خۆشەویستە؟ فەرمووی: (نوێژ لەسەرەتای کاتی خۆیا) گوتم: لەپاش ئەمە چی تر زۆر خۆشەویستە لەلای خودا؟ فەرمووی: باش بوون بۆ باوك‌و دایك. گوتم: ئەی لەپاش ئەو چی تر؟ فەرمووی: خەبات‌و تێکۆشان لەڕێگای خودا(ش).

٢-٣١٣/٢ – وعن أبي هريرة رضي اللّٰه عنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (لا يَجْزِي ولَدٌ والِداً إلاَّ أَنْ يَجِدَهُ مملُوكاً، فَيَشْتَرِيَهُ، فَيَعْتِقَهُ) رواه مسلم.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کەس لەچاکەی باوك‌و دایك‌و باپیرەو نەنکی دەرناچێ، مەگەر ئەمانە بەندە بن‌و ئەو بیانکڕێ‌و ئازادیان بکا (م).

---

١ بوخاری (٥٢٧) وموسلیم (٤٧).

٢ موسلیم (١٥١٠).

٣١٤/٣- وعنه أيضاً رضي اللّٰه عنه أن رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللّٰهِ والْيَوْمِ الآخِرِ، فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كانَ يُؤْمِنُ بِاللّٰهِ والْيوم الآخِرِ، فَلْيصلْ رَحِمَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللّٰه وَالْيَوْمِ الآخِرِ، فلْيقُلْ خيراً أَوْ لِيَصمُتْ) متفقٌ عليه.

ژماره (٣٠٨/٦)و (٣٠٩/٧) لەزنجیرەی (٣٩).

٣١٥/٤-٣ – وعنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (إنَّ اللّٰه تَعَالى خَلَقَ الخَلْقَ حَتَّى إِذَا فَرَغَ مِنْهُمْ قَامَتِ الرَّحِمُ، فَقَالَتْ: هذا مُقَامُ الْعَائِذِ بِكَ مِنَ الْقَطِيعَةِ، قال: نَعَمْ أَمَا تَرْضَيْنَ أَنْ أَصِلَ مَنْ وَصَلَكِ، وَأَقْطَعَ مَنْ قَطَعَكِ ؟ قالت: بَلَى، قال فذلِكَ، ثم قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: اقرءوا إنْ شِئتُمْ: { فَهَلْ عَسَيْتُمْ إن تَوَلَّيتُم أَنْ تُفسِدُوا فِي الأَرْضِ وتُقطِّعُوا أَرْحامكُمْ أولَئِكَ الذين لَعنَهُم اللّٰهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَى أَبْصَارَهُمْ } ﴿محمد: ٢٢، ٢٣ ﴾ متفقٌ عليه. وفي رواية للبخاري: فقال اللّٰه تعالى: (مَنْ وَصَلَكِ، وَصلْتُهُ، ومنْ قَطَعَكِ قطعتُهُ)

دیسان ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ خودای گەورە ئەم خەڵكو بوونەوەرەی دروست کرد کەلە دروست کردنەکەی لێ بووەوە، خزمایەتی (ڕەحم) هەستایەوەو گوتی: هاتووم پەنا دەگرم بەتۆ لەدەستی ئەو کەسەی دەنگ لەخزمی خۆی دادەبڕێ. فەرمووی: بەڵێ باشە ئایا بەم بەڵێنە رازی دەبی کە ئەوەی مافی تۆ بەجێ بهێنێ منیش مافی ئەو بەجێ دەهێنم، وەئەوەی پێ لەتۆ ببڕێ منیش پێ لەوببڕم؟ ڕەحم گوتی: بەڵێ بەمە ڕازی دەبم، خودا فەرمووی: دەباشە ئەمە بەڵێن بێ لەبەینی منو تۆدا. ئەوجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەگەر حەزیش دەکەن ڕەچاوی ئەم فەرمایشتە لەقورئاندا بزانن ئەم ئایەتە لە قورئاندا بخوێنن.

﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ تَوَلَّيْتُمْ أَنْ تُفْسِدُوا فِي الأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ، أُوْلَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللّٰهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَى أَبْصَارَهُمْ﴾ محمد/٢٢-٢٣.

واتە: دوور نییە ئەگەر ئێوە لەخودا هەڵبگەڕێنەوە لەزەویدا ئاژاوە بەرپابکەنو پەیوەندی خزمایەتی ببڕنو بچنەوە سەر نەریتو کاروباری نەزانی، ئەو بەدکارانە خودا نەفرینو لەعنەتی لێ کردونو کەڕو کوێری کردون.

---

٣ بوخاری (٥٩٨٧) وموسلیم (٢٥٥٤).

لەگێڕانەوەیەکی بوخاریدا فەرمووی: جا خودای گەورە فەرمووی: ئەی خزمایەتی! هەرکەسێ بەینی خۆش بێ لەگەڵ تۆداو تۆ بەسەر بکاتەوە منیش بەینم خۆش دەبێ لەگەڵ ئەوداو ئەو بەسەر دەکەمەوە، وەهەرکەسێ دەنگ لەتۆ دابڕێ منیش دەنگ لەو دادەبڕم.

٣١٦/٥-١ – وعنه رضي اللّٰه عنه قال: جَاءَ رَجُلٌ إلى رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم فقال: يا رسول اللّٰه مَنْ أَحَقُّ النَّاسِ بِحُسنِ صَحَابَتي ؟ قال: (أُمُّك) قال: ثُمَّ منْ ؟ قال: (أُمُّكَ) قال: ثُمَّ مَنْ ؟ قال: (أُمُّك) قال: ثُمَّ مَنْ ؟ قال: (أَبُوكَ) متفقٌ عليه.

وفي رواية: يا رسول اللّٰه مَنْ أَحَقُّ الناس بِحُسْن الصُّحْبَةِ ؟ قال: (أُمُّكَ ثُمَّ أُمُّكَ، ثُمَّ أُمُّكَ، ثمَّ أَباكَ، ثُمَّ أَدْنَاكَ أَدْنَاكَ).

دیسان ئەو فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەت حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! کێ ڕەوا ترین کەسە کە بەجوانی هاوڕێیەتی بکەم؟ فەرمووی: دایکت. گوتی: ئەنجا کێی تر؟ فەرمووی: دیسان دایکت. گوتی ئەنجا کێی تر؟ فەرمووی: دیسانەوە دایکت! گوتی: ئەنجا کێی تر؟ فەرمووی: ئەوجا باوکت! (ش). لە گێڕانەوەیەکا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کێ شایستەترین کەسە کە بەجوانی ڕەفتاری لەگەڵدا بکرێ؟ فەرمووی: دایکت، ئەمجا باوکت، ئەوجا خزمو کەسو کارت بەپێی نزیکو دووریان لێتەوە! (م/تاج).

٣١٧/٦-٦ – وعنه عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (رغِمَ أَنْفُ، ثُم رغِم أَنْفُ، ثُمَّ رَغِمَ أنف مَنْ أدرَكَ أَبَوَيْهِ عِنْدَ الْكِبرِ، أَحدُهُمَا أَوْ كِلاهُما، فَلَمْ يدْخلِ الجَنَّةَ) رواه مسلم.

دیسان لەوەوە، لە حەزرەتەوە (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لووتی بەقوڕدا چێو دووبارەوسێ بارە لووتی بەقوڕدا چێو لووتی بتەوسێتەوە! گوترا: کێ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: ئەو کەسەی کە لەکاتی پیری باوکو دایکی دا دەمێنێو بەبێ بەهانەیەکی ڕەوا ئەوەندە خزمەتیان ناکا کە پێی بچێتە بەهەشت، ئیتر بەکاتی پیری یەکێکیانا بگا یان بەهی هەردووکیاندا (م/تاج).

---

١ بوخاری (٥٩٧١) وموسلیم (٢٥٤٨).

٦ موسلیم (٢٥٥١).

٣١٨/٧-[٧]- وعنه رضي اللّٰه عنه أَن رجلاً قال: يا رسول اللّٰه إنَّ لي قَرابَةً أَصِلُهُمْ وَيَقْطَعُونِي، وَأُحسِنُ إِلَيْهِم وَيُسيئُونَ إليَّ، وأَحْلُمُ عنهُمْ وَيجْهلُونَ عليَّ، فقال: (لَئِنْ كُنْتَ كما قُلْتَ، فَكَأَنَّمَا تُسِفُّهُمُ المَلَّ، ولا يَزَالُ معكَ مِنَ اللّٰهِ ظَهِيرٌ عَلَيْهِمْ ما دمْتَ عَلَى ذَلكَ) رواه مسلم.

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! هەندێ خزمم هەن، من دڵی ئەوان راگیر دەکەم، کەچی ئەوان دڵی من دەڕەنجێنن، وە من چاکەیان لەگەڵ دەکەم کەچی ئەوان خراپەم لەگەڵ دەکەن، وە من چاوپۆشیان لەگەڵ دەکەم کەچی ئەوان ناپیاویم لەگەڵ دەکەن، من چەند باشم بۆ ئەوان، ئەوان ئەوەندە خراپن بۆ من، فەرمووی: ئەگەر وەك خۆت دەڵێیت وابێ، ئەوە تۆ بە پاداشتی باشی خۆت دەگەیت بەڵام بۆ ئەوان وەك ژیلەمۆیان دەرخوارد بدەیت وایە، چونکە لەبەر ئەوەی کە تۆڵەی چاکەی تۆ بەخراپە دەدەنەوە خودا هەر پشتیوانی تۆیەو سەرت دەخا بەسەریاندا! (م).**

٣١٩/٨-[٨] وعن أَنسٍ رضي اللّٰه عنه أَن رسولَ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (مَنْ أَحبَّ أَنْ يُبْسَطَ له في رِزْقِهِ، وَيُنْسأَ لَهُ في أَثرِهِ، فَلْيصِلْ رحِمَهُ) متفقٌ عليه.

**ئەنەس** (رەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: هەرکەسێ حەز دەکا کە رزق و رۆزی زۆر بێ و تەمەنی درێژ بێ با خزم دۆست بێ و سیلەی رەحمی خۆی بەجێ بێنێ (ش).**

٣٢٠/٩- وعنه قال: كَانَ أَبُو طَلْحَةَ أَكْثَر الأَنصار بِالمَدِينَةِ مَالاً مِنْ نَخْلٍ، وكَانَ أَحبُّ أَمْوَالِهِ بِيرْحَاءَ، وكَانتْ مُستقْبِلَة المَسْجِدِ، وكَان رسولُ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يدْخُلُهَا، وَيَشْرَب مِنْ ماءٍ فيها طَيِّبٍ، فَلمَّا نَزلَتْ هذِهِ الآيةُ: { لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ } ﴿ آل عمران: ٩٢ ﴾ قام أَبُو طَلْحة إلى رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم فقال: يا رسولَ اللّٰه إنَّ اللّٰه تَبَارَك وتعالى يقول: { لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ } وَإنَّ أَحب مالى إليَّ بِيرْحَاءَ، وإِنَّهَا صَدقَةٌ للّٰهِ تعالى، أَرجُو بِرَّهَا وذُخْرهَا عِنْد اللّٰه تعالى، فَضَعْهَا يا رسول اللّٰه حيثُ أَراكَ اللّٰه. فقال رسولُ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (بَخٍ، ذلِكَ

---

٧ موسليم (٢٥٥٨).

٨ بوخاری (٥٩٨٦)و موسليم (٢٥٥٧).

مالٌ رابحٌ، ذلِكَ مالٌ رابحٌ، وقَدْ سَمِعْتُ ما قُلتَ، وإِنِّي أَرى أَنْ تَجْعَلَهَا فِي الأَقْرَبِين) فقال أَبُو طَلْحة: أَفعلُ يا رسول اللَّه، فَقَسَمهَا أَبُو طَلْحة فِي أَقارِبِهِ وبني عمِّهِ. متفقٌ عليه.

وَسبق بَيَانُ أَلْفَاظِهِ في بابِ الإِنْفَاقِ مِمَّا يُحِب.

بڕوانه ژماره (١/٢٩٧ز- ٣٧).

١٠/٣٢١-[١٠]- وعن عبد اللَّه بن عمرو بن العاص رضي اللَّه عنهما قال: أَقْبَلَ رجُلٌ إِلى نَبِيِّ اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، فقال: أُبايِعُكَ على الهِجرةِ وَالجِهَادِ أَبتَغِي الأَجرَ مِنَ اللَّه تعالى. قال: (فهَلْ مِنْ والديْكَ أَحدٌ حَيٌّ ؟) قال: نعمْ بل كِلاهُما قال: (فَتَبْتَغِي الأَجْرَ مِنَ اللَّه تعالى؟» قال: نعمْ. قال: (فَارْجعْ إِلى والديْكَ، فَأَحْسِنْ صُحْبَتَهُما. متفقٌ عليه. وهذا لَفْظُ مسلمٍ. وفي روايةٍ لهُما: جاءَ رجلٌ فاسْتَأْذَنَه في الجِهَادِ فقال:(أَحيٌّ والِداكَ ؟ قال: نَعَمْ، قال:(ففِيهِما فَجاهِدْ)).

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) گوتی: قوربان! هاتوومەتە خزمەتت هەتا پەیمان لەگەڵتا ببەستم لەسەر کۆچ کردن بۆ خزمەتی تۆو بۆ خەبات گێڕان‌و غەزاکردن، وە پاداشتی خۆشم هەر لەخودا دەوێ، حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزیش دەکەی خودای گەورە پاداشتت بۆ بنووسێ؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: دە بچۆرەوە بۆلای باوك‌و دایکت‌و بەجوانی رەفتاریان لەگەڵ بکە (ش). لە گێڕانەوەیەکی شەیخەیندا: فەرمووی: دە لە خزمەت کردنی باوك‌و دیکتا تێکۆشە.

١١/٣٢٢-[١١]- وعنه عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: لَيْسَ الْواصِلُ بِالْمُكافِئ وَلَكِنَّ الواصِلَ الَّذي إِذا قَطَعتْ رَحِمُهُ وصلَهَا» رواه البخاري. و(قَطعتْ) بِفَتْحِ القافِ وَالطَّاءِ. وَ (رَحِمُهُ) مَرْفُوعٌ.

دیسان فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەو کەسە خزم‌و دۆست نییە کە بەدەستیاو خزم بەسەر دەکاتەوە، بەڵام خزم دۆست ئەو کەسەیە کە خزمەکەی پەیوەندی لەگەڵیا دەبڕێ، بەڵام ئەو خزمایەتیەکە تازە دەکاتەوە. (بوخاری رەحمەت لە گۆڕی نازداری).

---

١٠ بوخاری (٣٠٠٤)و موسلیم (٢٥٤٩).

١١ بوخاری (٥٩٩١).



٣٢٣/١٢-[١٢]- وعن عائشة قالت: قال رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (الرَّحمُ مَعلّقَةٌ بِالعَرْشِ تَقُولُ: مَنْ وصلني وَصَلَهُ اللّٰه، وَمَن قَطَعَني، قَطَعَهُ اللّٰه) متفقٌ عليه.

**عائيشه** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **لە پێغەمبەرەوە** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: خزمایەتی دامێنی بارەگای خودای گرتووەو دەڵێ: ئەوەی منی دەوێ‌و بەسەرم دەكاتەوە خودایش ئەوی بوێ‌و بەسەری بكاتەوە، وە ئەوەی منی ناوێ‌و پێم لێ دادەبڕێ خودایش ئەوی نەوێ‌و رووی نەداتێ (ش).**

٣٢٤/١٣-[١٣]- وعن أُمِّ المُؤْمِنِينَ ميمُونَةَ بنْتِ الحارِثِ رضي اللّٰه عنها أنّها أَعتَقَتْ وليدةً وَلَم تَستَأْذِنِ النبي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم، فلَمَّا كانَ يومَها الّذي يدورُ عَلَيْهَا فِيه، قالت: يا رسول اللّٰه إنّي أَعْتَقْتُ وليدتي ؟ قال: (أَوَ فعلْتِ ؟) قالت: نَعمْ قال: (أما إنّكِ لو أَعْطَيتِهَا أخوالَكِ كانَ أعظَمَ لأجرِكِ) متفقٌ عليه.

**ئوممولوئمنین، مەیموونەی كچی حارث** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **كەنیزەكێكی خۆی ئازاد دەكاو پرس‌و را بە پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **ناكا، كەسەرەی ئەو رۆژە دێ كە نۆرەی رۆژی خۆی دەبێ لە پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **عەرزی دەكا: ئەرێ دەزانی ئەی پێغەمبەری خودا! كە كەنیزەكەكەمم ئازاد كرد!؟ فەرمووی: كردووتە یا دەتەوێ بیكەی؟ گوتی: بەڵێ كردوومە. فەرمووی: دەبزانە ئەگەر بتبەخشیایە بە خاڵەكانت خێری زیاتر بوو (ش).**

١٤/٣٢٥-[١٤]- وعن أَسمَاءَ بنْتِ أبي بكْرِ الصِّدِّيقِ رضي اللّٰه عنهما قالت: قَدِمتْ عليَّ أُمِّي وهِي مُشركة في عهْدِ رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم فَاسْتَفتَيْتُ رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم قلتُ: قَدِمتْ عَليَّ أُمّي وَهِي راغبةٌ، أَفأَصِلُ أُمِّي ؟ قال: (نَعمْ صِلي أُمَّكِ) متفق عليه.

**ئەسماء** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: لەو سەردەمەدا، كە كافرەكانی قورەیش پەیمانی شەڕوەستانیان لەگەڵ پێغەمبەردا** (درودی خوای لەسەر بێ) **بەستبوو، دایكم، كە ئەوكاتە هێشتا كافر بوو، لەگەڵ باوكیدا هاتبوو، هات بۆ لام، لە پێغەمبەرم پرسی:**

---

١٢ بوخاری (٥٩٨٩)، موسلیم (٢٥٥٥).

١٣ بوخاری (٢٥٩٤)، موسلیم (٩٩٩).

١٤ بوخاری (٢٦٢٠)، موسلیم (١٠٠٣).

قوربان! دایکم هاتووه بۆلام بەتەمایشە کە من دەستگیرۆدەیی بکەم، جا ئایا سیلەی رەحمی ئەو بەجێ بێنم یا نا؟ فەرمووی: بەڵێ سیلەی رەحمی دایکت بەجێ بێنە (ش/تاج).

٣٢٦/١٥-[١٥]- وعن زينب الثقفِيَّةِ امْرأَةِ عبدِ اللّهِ بن مسعودٍ رضي اللّه عنه وعنها قالت: قال رسولُ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (تَصدَّقنَ يا مَعْشَرَ النِّساءِ ولَو مِن حُلِيِّكُنَّ) قالت: فَرجعتُ إلى عبدِ اللّه ابنِ مسعودٍ فقلتُ له: إنَّك رجُلٌ خَفِيفُ ذَات اليَدِ وإنَّ رسولَ اللّهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قدْ أمرنا بالصدقةِ، فأْتِه فاسأَلْهُ، فإن كان ذلك يُجْزِئُ عنّي وَإلاَّ صَرَفْتُهَا إلى غيرِكُمْ. فقال عبدُ اللّهِ: بَلِ ائتِيهِ أَنتِ، فانطَلَقْتُ، فَإذا امْرأَةٌ مِن الأَنصارِ بِبابِ رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم حاجَتِي حاجتُهَا، وكان رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قد أُلقِيتْ عليهِ المهابةُ. فَخرَج علينا بلالٌ، فقُلنَا له: ائتِ رسولَ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، فَأَخْبِرْهُ أَنَّ امْرأَتَيْنِ بِالبَابَ تَسأَلانِكَ: أَتُجزِئُ الصَّدَقَةُ عنْهُمَا على أزواجِهِما وَعلى أَيتامٍ في حُجُورِهِمَا ؟ وَلا تُخْبِرْهُ منْ نَحنُ، فَدَخل بِلالٌ عَلى رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، فَسأَلَهُ، فقال لهُ رسولُ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم (من هما ؟) قالَ: امْرأَةٌ مِنَ الأَنصارِ وَزَيْنبُ. فقالَ رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم «أيُّ الزَّيانِبِ هِي ؟» قال: امرأَةُ عبدِ اللّهِ، فقال رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (لَهُمَا أَجْرانِ: أَجْرُ القرابةِ وَأَجْرُ الصَّدقَةِ) متفقٌ عليه.

زەینەبی ژنی عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودا لەخۆی و بابی بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی ژن گەل! خێرو خێرات بکەن، ئەگەر خشڵی بەری خۆتان کردووە بە خێر بیکەن، فەرمووی: منیش چوومەوە بۆ ماڵەوە بە عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودم گوت: تۆ پیاوێکی دەست کورتی، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) بە ئێمەی ژنانی فەرموو کە خێر بکەن، جا بچۆ بۆلای و لێی بپرسە: ئەگەر خێرەکەم بدەم بە ئێوە بڕیتی خێر دەکەوێ؟ ئەگینا دەیبەم بۆ یەکێکی تر. عەبدوڵلایش (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بەڵکوو خۆت بچۆ بۆ خزمەتی، گوتی: منیش کە چووم ڕوانیم کە ئافرەتێکی ئەنصاریش لەدەرگاکەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ڕاوەستابوو، ئەویش وەك من بۆ هەمان پرسیار هاتبوو،

---

١٥ بوخاری(١٤٦٦)و موسلیم (١٠٠٠).

ئەو سەردەمەیش پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) گەلێ بەسام بوو، لەخوداوە شەرموشكۆی لێ دەكرا، جا بیلال هاتە دەرەوە بۆلامانەو پێمان گوت: بچۆ عەرزی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بكە بڵێ: كە دوو ژن وا لەدەرگادا، پرسیارت لێ دەكەن: ئایا دروستە كە خێرەكانیان بدەن بە مێردەكانیانو بەچەند هەتیوێ كە وان لەلای خۆیانو خۆیان هەق داریانن وە عەرزی مەكە كە ئێمە كێین، جا بیلال رۆیشتەوە بۆ ژوورەوە بۆلای حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: كێو كێن، بیلال فەرمووی: ژنێكی ئەنصاریو زەینەبن، دەفەرموی (دروودی خوای لەسەر بێ): كام زەینەب؟ دەفەرموێ: ژنەكەی ئیبنو مەسعوود، جا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەوە لەباتی پاداشتێ دوو پاداشتیان بۆ هەیە، پاداشتی خزمایەتیو پاداشتی خێر كردن (ش).

٣٢٧/١٦- وعن أبي سُفْيان صخْر بنِ حربٍ رضي اللّٰه عنه في حدِيثِهِ الطَّويل في قصَّةِ هِرقل أَنَّ هِرقْلَ قال لأَبي سفْيان: فَماذَا يأْمُرُكُمْ بِهِ ؟ يَعْني النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم قال: قلت: يقولُ: (اعْبُدُوا اللَّهَ وَحدَهُ، ولا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً، واتْرُكُوا ما يقُولُ آباؤُكمْ، ويأْمُرُنَا بالصَّلاةِ، والصِّدْقِ، والعفَافِ، والصِّلَةِ) متفقٌ عليه.

بڕوانە ژمارە (٣/٥٦ز- ٤).

٣٢٨/١٧-[١٧] وعن أبي ذر رضي اللّٰه عنه قال: قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «إِنَّكُم ستفْتَحُونَ أَرْضاً يُذْكَرُ فِيهَا القِيرَاطُ). وفي روايةٍ: (ستفتَحُونَ مصْر وهِي أَرْضٌ يُسَمَّى فِيها القِيراطُ، فاستَوْصُوا بأَهْلِها خيْراً، فَإِنَّ لَهُمْ ذِمةً ورحِماً). وفي روايةٍ: (فإِذا افْتَتَحْتُموها، فَأَحْسِنُوا إِلى أَهْلِهَا، فَإِنَّ لهُم ذِمَّةً ورحِماً» أَو قال «ذِمَّةً وصِهراً) رواه مسلم. قال العُلَماءُ: الرَّحِمُ التِي لَهُمْ كَوْنُ هَاجَر أُمُّ إِسْماعِيلَ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم مِنْهمْ. «والصِّهْرُ»: كونُ مارِية أُمِّ إِبراهِيمَ ابنِ رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم منهم.

ئەبو ذەڕ (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئێوە لەمەولا فەتحی میصر دەكەن، لەو وڵاتە بەزۆری ناوی قیراط دەبرێو بە زۆری سەوداو مامەڵە بە قیراط دەكرێ، جا هەركاتێ ئەوێتان ئازاد (فتح) كرد زۆر باش بن بۆ خەڵكەكەی، چونكە ئەوان سەرەڕای ئەوەی كە ئەهلی ذیممەنو خاوەنی پەیمانو ڕێزو قەدرن، سەرەڕای ئەمە خزمیشمانن چونكە خاڵوانی حەزرەتی

---

١٧ موسلیم (٢٥٤٣) (٢٢٦)و (٢٢٧).

ئیسماعیلن، کە بابە گەورەی پێغەمبەرە، وە دایکە هاجەرەی دایکی حەزرەتی ئیسماعیل، کە دەبێ بە نەنکە گەورەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر گشتیان) لەوانە، یا فەرمووی: چونکە ئەوان سەرەڕای ئەوەی کە خاوەنی پەیمانو ئەمانن خەزوورانیشمانن چونکە مارییەی قیبطییە، کە دایکی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەرە (درودی خوای لەسەر بێ) لەوانە، واتە هەم خاڵوانی حەزرەتنو هەم خاڵوانی کوڕەکەینی (م).

١٨/٣٢٩-[١٨]- وعن أبي هريرة رضي اللّٰه عنه قال: لما نزلَتْ هذِهِ الآيَةُ: { وَأَنْـذِر عشِيرتكَ الأَقربِينَ } ﴿ الشعراء: ٢١٤ ﴾ دعا رسولُ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قُرَيْشا فاجْتَمعُوا فَعَمَّ، وخَصَّ وقال: «يا بَني عبدِ شَمسٍ، يا بني كَعْب بنِ لُؤَي، أَنقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّار، يَا بني مُرَّةَ بنِ كَعبٍ، أَنْقِذُوا أَنفُسَكُمْ مِن النَّار، يا بني عبْدِ مَنَافٍ، أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّار، يا بَني هاشِمٍ أَنقِذُوا أَنْفُسكُمْ مِنَ النَّار، يا بني عبْدِ المطَّلِبِ أَنْقِذُوا أَنْفُسكُمْ مِن النَّار، يا فاطِمَةَ أَنْقِذي نفْسَكَ منَ النَّار، فَإِني لا أَمْلِكُ لَكُمْ منَ اللّٰه شيْئاً، غَيْر أَنَّ لَكُمْ رحِماً سأَبلُّها بِبلالِها» رواه مسلم.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وأنذر عشيرتك الأقربين﴾الشعراء/٢١٤. واتە: ئەی موحەممەد! خزمە هەرە نزیکەکانت هۆشیار بکەرەوەو بیانترسێنە لە قارو غەزەبی خودا، حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) قورەیشی بانگ کرد، کە کۆبوونەوە، حەزرەت هەم بە شێوەی گشتیو هەم بەشێوەی تایبەتی مەترسی نانە بەرو هۆشیاری کردنەوە، یەکە یەکەو کۆمەڵ کۆمەڵ ناوی هێنانو فەرمووی: ئەی نەوەی عەبدو شەمس! ئەی نەوەی کەعبی کوڕی لوئەی! خۆتان لەئاگری دۆزەخ ڕزگار بکەن، ئەی نەوەی مورەی کوڕی کەعب! خۆتان لە دۆزەخ ڕزگار کەن، ئەی نەوەی عەبدو مەناف! خۆتان لە دۆزەخ ڕزگار کەن، ئەی نەوەی هاشم! خۆت لە دۆزەخ ڕزگار کە، ئەی فاطیمەی کچی موحەممەد خۆت لە دۆزەخ ڕزگار بکە، بزانن کە من لەلای خودا دەسەڵاتی هیچم نییە کە بیکەم بۆ ئێوە، ئەوەندە هەیە لەدنیادا مافی خزمایەتیتان بەجێ دێنم (م).

١٨ موسلیم (٢٠٤).

٣٣٠/١٩-[١٩]- وعن أبي عبد اللّٰه عمرو بن العاص رضي اللّٰه عنهما قال: سمعتُ رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم جِهاراً غيْرَ سِرّ يَقُولُ: (إنَّ آلَ بَني فُلان لَيْسُوا بأَوْلِيائي إنَّما وَلِيِّي اللّٰهُ وصالحُ المؤْمِنِين، ولَكِنْ لَهُمْ رحِمٌ أَبُلُّها بِبلالِها) متفق عليه. واللّفظُ للبخاري.

ئەبو عەبدوڵلا عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودا لە خۆی‌و عەبدوڵلای کوڕی) فەرمووی: لەحەزرەتم ژنەوت بە ئاشکرا نەك بە نهێنی: بەبێ پەردەو پەروا دەیفەرموو: خانەوادەی نەوەی فیسارە کەس پشت‌و پەناو خاوەن‌و سەرداری من نین، وەڵێ پشت‌و پەناو خاوەن‌و سەرداری من تەنیا خودایەو بەس، لەدوا خودا پیاوە باشەکانی موسوڵمانەکان کەسی منن، ئەوەندە هەیە ئەوان مافی خزمایەتیان لەسەرم هەیە، تاماوم لەدنیادا سیلەی ڕەحمیان بەجێ دێنم (ش).

٣٣١/٢٠-[٢٠]- وعن أبي أَيُّوب خالدِ بن زيدٍ الأنصاري رضي اللّٰه عنه أَن رجلاً قال: يا رسولَ اللّٰه أَخْبِرْني بِعملٍ يُدْخِلُني الجنَّةَ، وَيُبَاعِدني مِنَ النَّارِ. فقال النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: «تعبُدُ اللّٰه، ولا تُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً، وَتُقِيمُ الصَّلاَةَ، وتُؤتي الزَّكاةَ، وتَصِلُ الرَّحِم» متفقٌ عليه.

خالیدی ئەنصاری (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پیاوێ عەرزی حەزرەتی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! کارێکم پی بفەرموو، بەکردنی بچمە بەهەشت‌و لە دۆزەخیش دوورم بخاتەوە؟ خۆتان لەدۆزەخ ڕزگار کەن تەنیا خودا دەپەرستیت‌و هیچ هاوبەشی بۆ بڕیار نادەیت‌و کەسوکاری خۆت بەسەردەکەیتەوە (ش).

٣٣٢/٢١-[٢١]- وعن سلْمان بن عامرٍ رضي اللّٰه عنه، عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (إذا أَفْطَرَ أَحَدُكُمْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى تَمرٍ، فَإنَّهُ بركَةٌ، فَإنْ لَمْ يجِد تَمْراً، فَالماءُ، فَإنَّهُ طَهُورٌ) وقال: (الصَّدَقَةُ عَلَى المِسكِينِ صدقةٌ، وعَلَى ذي الرَّحِمِ ثِنْتَان: صَدَقَةٌ وصِلَةٌ».

سەلمان (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (درودی خوای لەسەر بێ): بە خورما بەربانگ بکەنەوە چونکە شتێکی پیرۆزو مووفەڕکە، ئەگەر خورما نەبوو بە ئاو ڕۆژووەکانتان بشکێنن، چونکە ئاو پاك‌و پاکەوەکەرە، خوا حەزکا ڕۆژووەکانتان

---

١٩ بوخاری (٥٩٩٠)، موسلیم (٢١٥).

٢٠ بوخاری (١٣٩٦)، موسلیم (١٣).

٢١ تیرمذي (٦٥٨).

دەبێ بە پاکەوەکەری دەروونو دەرەوەتان. وە فەرموویشی: خێر بە هەزار هەر خێرەو بەس، بەڵام خێر بەخزم دووجار خێرە، چونکە هەم خێری ئاساییەو هەم بەسەرکردنەوەی خزمو خوێشە (ت:ح/ح).

٣٣٣/٢٢-[٢٢]- وعن ابن عمر رضي اللّٰه عنهما قال: كَانَتْ تَحتي امْرأَةٌ، وكُنْتُ أُحِبُّها، وَكَانَ عُمرُ يكْرهُهَا، فقال لي: طَلِّقْها فأبيْتُ، فَأَتَى عَمرُ رضي اللّٰه عنه النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم، فَذكر ذلكَ لَهُ، فقال النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (طَلِّقْهَا) رواه أبو داود، والترمذي وقال: حديث حسن صحيح.

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) فەرمووی: ژنێکم هەبوو، خۆم خۆشم دەویست بەڵام باوکم حەزی لێی نەبوو، پێی گوتم کە تەڵاقی بدەم، منیش قایل نەبووم، جا باوکم ئەمەی عەرزی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کرد، ئەویش پێی فەرمووم: تەڵاقی بدە (د/ت-ح/ح/ص).

من کە وەرگێڕی ئەم نامە پیرۆزەیەم بۆ ئەوەی دایكو باوك بەهۆی تێنەگەیشتن لەم فەرموودە پیرۆزەیەوە، بەهەڵەدا نەچنو بەناهەق وڕك لە منداڵی خۆیان نەگرن کە ژنیان پێ تەڵاق بدەن، ئەم فەرموودەیە لەسەرەتای باسی تەڵاقی تاجولئوصولەوە رادەگوێزمەوە بۆ ئێرە: ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەو کەسەی کە ژنو پیاو، یا باوكو منداڵ، یا بەندەو ئاغا، یا دوو خزم، یا دوو دۆست، بەناهەق لەیەك بکا لە ئێمە نییە. بۆیە دەڵێم:

مەبن بە دڕکی مەمو زین برا
بۆ کوڕو بووکتان ببن بەچرا
نەوەت گوڵێکە موتوربەی دوو ڕەنگ
نەکەی بێ دایکی لێ بکەی بە نەنگ
پەپوولە بە دوو باڵی نەشمیلە
گوڵاو گوڵ دەفڕێ جوانو خنجیلە
باڵێکی ببڕی باڵەکەی تری

---

٢٢ئەبو داوود (٥١٣٨)، تیرمذي (١١٨٩).

بـــۆ ســـەری دەبـــێ بـــە دەردی ســـەری!
بـێ نـازیی کاتـێ بـێ دایکـم ئێسـتاش
مـاکی هـەر مـاوە لـەدڵما بـاش بـاش!
چۆن چـۆن دڵـت هـات جـێم بێڵـی دایـە!
خۆت لەبەهەشـت بـیو مـن لـەم دنیایـە!!
هـــەوری ڕەحمـــەتت هیوامـــە خوایـــە!
بـــۆ دایـــکو بـــاوکم بکـــەی بـــە سایە
فـــەرمودەی حـــەزرەت ڕۆحـــی یاســـایە
فـــامی تـــەواوی پیشـــەی مەلایـــە
مـــەلا چـــی فـــەرموو تـــۆ بڵـــێ وایـــە
دەنـــا مـــارەیی ژنـــت لـێ نایـــە
مەبەســـت لـــە مـــەلا زانـــای دانایـــە
کـــە جێنشـــینەی ڕەســـوڵەڵایە!!
نـەک پـەڕۆ بەسـەر، وێنـەی مـن بـێ فـەڕ
دینـــی بفرۆشـــێ بـــە تـــوورو گێـــزەر!!
مـــن بـــەقوربانی مـــەلاو پـــیلاوی
کـــە هەمیشـــە خـــوا والەبەرچـــاوی*
گـــەلێکم دیـــوە مـــەلای مـــەردی وا
زەوی دەنـــازی بەســـەریا بـــڕوا
داخـــم! ئێســـتاکە لەبـــەر بـــێ نـــازی
لەگۆشـــەی مزگـــەوت وەکـــی شـــابازی
بـــێ پـــەڕو بـــێ بـــاڵ، لـــەناوی لانـــە
بـــوون بـــە نیشـــانەی تـــیری زەمانـــە

---

* ئامازەیە بۆ ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێ: (أن تعبد الله كأنك تراه فإن لم تكن تراه فإنه يراك).

٣٣٤/٢٣-[٢٣]- وعن أبي الدَّرْداءِ رضي اللّٰه عنه أن رَجُلاً أَتَاهُ فقال: إنَّ لي امْرَأَةً وإن أُمّي تَأْمُرُني بِطَلاَقِها ؟ فقال سَمِعْتُ رسول اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يقولُ (الْوالِدُ أَوْسَطُ أَبْوابِ الجَنَّةِ، فَإِنْ شِئْتَ فَأَضِعْ ذلِك الْبابَ، أَوِ احفظْهُ) رواه الترمذي وقال: حديثٌ حسنٌ صحيح.

پیاوێ دەچێ بۆلای ئەبو دەرداء (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەڵێ: ژنێکم هەیە دایکم پێم دەڵێ کە تەلاقی بدەم، ئەبو دەردایش دەڵێ: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەر بێ): باوك‌و دایك دەرگە هەرە باشەکەی بەهەشتن ئیتر تۆیش ئارەزووی خۆتە: ئەگەر حەز دەکەی ئەو دەرگایە لەکیس خۆت بدە، ئەگەر حەزیش دەکەی مسۆگەری بکە بۆ خۆت! (ت-س/ص).

٣٣٥/٢٤-[٢٤]- وعن البراءِ بن عازبٍ رضي اللّٰه عنهما، عن النبي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: «الخَالَةُ بِمَنْزِلَة الأُمِّ» رواه الترمذي: وقال حديثٌ حسن صحيح.

بەراء (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: پوور واتە: خوشکی دایك لە جێگەی دایکە (ت-ح/ص).

٢٥- بڕوانە ژمارە (١٢/١٢ز-١).

٢٦- بڕوانە ژمارە (٢٥٩/٨ز- ٣٢).

٢٧-وفي الباب أحاديث كثيرة في صحيح مشهورة، ومنها: حديث أصحاب الغار وحديث جريج، وقد سبقا، وأحاديث كثيرة في الصحيح حذفتها إختصارا، ومن أهمها: حديث عمرو بن عبسة (رضي الله عنه) المشتمل على جمل كثيرة من قواعد الإسلام وآدابه، وسأذكره بتمامه إن شاء الله تعالى في باب الرجاء قال فيه: دخلت النبي (صلى الله عليه وسلم) بمكة (يعني في أول النبوة) فقلت: ما أنت؟ وذكر تمام الحديث:

بەپشتی خودا ئەم فەرموودەیە لەسەر باسی (باب الرجاء)دا کە دە باسێ لە دوای ئەم باسەوەیە، بەتەواوی تەرجەمە دەکەین.

---

٢٣ تيرمذي (١٩٠١).

٢٤ تيرمذي (١٩٠٥).

## ٤١-باسی نارِەوایی دڵرِەنجاندنی دایكو باوكو دەنگ دابرِین لە كەسوكار
## باب تحريم العقوق وقطيعة الرحم

قال الله تعالى: ﴿فهل عسيتم إن توليتم أن تفسدوا في الأرض وتقطعوا أرحامكم﴾ تەفسیری ئەم ئایەتە لە زنجیرە چل دا رابورد، فەرموودەی چوارەم.

وقال تعالى: ﴿والذين ينقضون عهد الله من بعد ميثاقه، ويقطعون ما أمر الله به أن يوصل ويفسدون في الأرض أولئك لهم اللعنة، ولهم سوء الدار﴾الرعد/١٣.

واتە: ئەو كەسانە كە پەیمانی پتەو لەگەڵ خودادا دەبەستن، كەچی نایبەنە سەرو بێ عەهدو پەیمان دەردەچن، وەشتێ كە خودا فەرمانی كردووە بەكردنی ئەوان نایكەنو تێكی دەدەن، وە چەندەی لە دەستیان بێ لە زەویدا فەسادو ئاژاوەبەرپا دەكەن، ئەو كەسانەی كە ئەمە حاڵو رەفتاریانە لەعنەتی خودایان لێ بێ لەهەردوو جیهاندا، ماڵ وێرانو خانە خراپ خۆیانن.

وقال تعالى: ﴿وقضى ربك أن لا تعبدوا إلاإياه وبالوالدين إحسانا﴾.
بڕوانە ئایەتی پێنجەم لە باسی (٤٠).

٣٣٦/١-[١]– وعن أبي بكرةَ نُفيْع بن الحارثِ رضي اللّٰه عنه قال: قال رسولُ اللّٰه صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «أَلا أُنَبِّئُكمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ ؟» ثلاثاً قُلنا: بلَى يا رسولَ اللّٰه: قال: (الإِشْراكُ بِاللّٰهِ، وعُقُوقُ الْوالِديْن) وكان مُتَّكِئاً فَجلَسَ، فقال:«أَلا وقوْلُ الزُّورِ وشهادُةُ الزُّورِ)فَما زَال يكَرِّرُهَا حتَّى قُلنَا: ليْتهُ سكتْ. متفق عليه.

ئەبو بەكر (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەدی با پێتان بڵێم كە گەورەترین گوناهی گەورە چییە؟ سێ جار لەسەر یەك ئاوای فەرموو، ئێمەیش گوتمان: فەرموو، بفەرموو، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: هاوبەش برِیار دان بۆ خوداو دڵرِەنجاندنی باوكو دایك، حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) لەم كاتەدا شانی دادابوو، جا راست دانیشتو فەرمووی: (وەشایەتی درۆو واتەی درۆی ناهەق). گوتی: ئینجا ئەوەندە ئەم وشەو رِستەیەی دووبارە كردەوە هەتا گوتمان: خۆزگا ئیتر بێ دەنگ دەبوو (ش). لە سایەی خوداوە ئێستا لەناو موسوڵماناندا ئیشراكو هاوبەش برِیاردان بۆ خودا نەماوە، موسوڵمان هەموو تاكپەرستن، ئەو موسوڵمانەی بە زمان بڵێ (لاإله إلا الله محمد رسول الله)وە بەدڵ باوەرِی بەم وشە

---

١ بوخاری (٢٦٥٤)، موسلیم (٧٨).

پیرۆزە هەبێ، ئەوە موسوڵمانە لەسەر دینی ئیسلامەو لەبەر کردنی هەندێ شت، ئایا ڕەوا یا ناڕەوا، بە قسەی ئەم‌و ئەو نە کافر دەبێ‌و نە دادەنرێ بە موشریك‌و فرەخوا. پەنامان بە خوا لەشتی وا.

کاکی برا! موشریك ئەوە نییە کە لەسەر فەتوای هەندێ مەلا، بچێ بۆ دیدەنی گۆڕێ، یامەولوودێ بکا بەنیازی دەفعی بەڵاو خێرەکەی بنێرێ بۆ گیانی وەلیەکی مردوو! ئەمە ئەو پەڕیەکەی گوناهێکی گەورەیەو لەکۆن‌و نوێدا موسوڵمانان بەگشتی کردوویانە. موشریك ئەوەیە کە بەدەم‌و بە دڵ دەڵێ: ﴿أجعل الآلهة الها واحدا ان هذا لشئ عجاب﴾. موشریك ئەوەیە دەڵێ: ﴿أنا أحيي وأميت﴾، ﴿أنا ربكم الاعلى﴾.

من لەسەر سەری خۆم مەرج دەکەم ئەوەی لە دەفتەری نفووسەکەی نوسرابێ موسوڵمان، ئەم پرسیارانە ئاوا وەڵام دەداتەوە: چەند خودا هەیە؟ یەك، ناوی چییە: بە کوردی یا بەزمانی خۆی: خودا، ئەڵلا، یەزدان، کوڕی کچی هەیە؟ نەخێر، هاوەڵی هەیە؟ نەخێر، کێ تۆو ئەم بوونەوەرەی دروست کردووە؟ ئەو خودایەی هەر خۆی خودایەو بەس، قیامەت چییە؟ ئەوەیە خودا هەموومان لەپاش مردن زیندوو دەکاتەوەو خۆی مەحکەمەمان دەکاو بەپێی کردەوەی خۆمان حوکممان دەدا، یا بەڕەحمەتی خۆی ڕەحممان پێ دەکا، پێغەمبەر چییە، ئەویش وەك من عەبدی خودایە، بەڵام خودا کردوویەتی بە ڕابەرێکی باش بۆ ئێمەی موسوڵمانان، قورئان چییە؟ نامەی خودایە، دەستووری دینی ئێمەیە، نوێژ، زەکات، حەج ڕۆژوو چییە؟ رووکنی دینی ئێمەیە، وەلی چییە؟ دۆستی خودایە، هیچی بەدەستە؟ نەخێر، بەڵام دەتوانێ تکاو دووعا لە خودا بکا، ئیتر خودا قەبووڵی دەکا یا نایکا، ئەوە خواستی خۆیەتی، عەبد زۆری لەسەر خودا نییە، نوێژ، ڕۆژوو، حەج، خێر بۆ کێ دەکەی؟ بۆ خودا، عیبادەت بۆ کێ دەکەی؟ بەس بۆ خودا.

ئیتر بەچی بەڵگەو شایەت‌و نیشانەیە هەندێ کەس کۆمەڵ کۆمەڵ موسوڵمانان حوکم دەدەن بە کوفرو شیرك‌و شتی وا. هەتا هەندێ کەسی نا شارەزا شتەکە ئەوەندە بە ئاسان دەزانن لەسەر لاسایی جل‌و بەرگ‌و تاشینی ریش‌و هێشتنەوەی قژی سەر وەك میللەتانی تر کۆمەڵ کۆمەڵ‌و تاك تاك موسوڵمانان کافر دەکەن. إنا لله وإنا إليه راجعون. ئیتر پەنا بە ڕەحمەتی خودا. (وەرگێڕ).

٣٣٧/٢-[٢]- وعن عبد اللّهِ بنِ عمرو بن العاص رضي اللّه عنهما عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: «الْكبائرُ: الإشْراكُ بِاللّه، وعقُوق الْوالِديْنِ، وقَتْلُ النَّفْسِ، والْيمِينُ الْغَموس» رواه البخاري.

**عەبدوڵڵای کوڕی عومەر** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: گوناهە هەرە گەورەکان ئەمانەن: هاوەڵ دانان بۆ خودا، دڵشکاندنو دڵڕەنجاندنی باوكو دایك، وە کوشتنی ئادەمیزاد بە ناڕەوا، وە سوێندی ناهەقی ماڵوێرانکەر کە سوێنخۆر لەناو ئاگری سووردا نوقم دەکا! (ب).**

٣٣٨/٣-[٣]- وعنه أَن رسولِ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (مِنَ الْكبائِرِ شتْمُ الرَّجلِ والِديْهِ) قالوا: يا رسولَ اللّه وهَلْ يشْتُمُ الرَّجُلُ والِديْهِ ؟، قال: (نَعمْ، يَسُبُّ أَبا الرَّجُلِ، فيسُبُّ أَباه، ويسُبُّ أُمَّهُ، فَيسُبُّ أُمَّهُ) متفقٌ عليه.

وفي روايةٍ: (إِنَّ مِنْ أَكْبرِ الكبائِرِ أَنْ يلْعنَ الرَّجُلُ والِديْهِ) قيل: يا رسول اللّهِ كيْفَ يلْعنُ الرجُلُ والِديْهِ ؟، قال: (يسُبُّ أَبَا الرَّجُل، فَيسُبُّ أَبَاهُ، وَيَسبُّ أُمَّه، فيسُبُّ أُمَّهُ)).

**دیسان فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: تاوانێکی گەلێك گەورەیە پیاو جنێو بە باوكو دایکی خۆی بدا، یاران فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خودا! جا چۆن چۆنی پیاو جنێو بە باوكو دایکی خۆی دەدا، بۆ هەیە کەشتی وا بکا؟ فەرمووی: هەیە، ئەوە دەچێ جنێو بە باوكو دایکی کابرایەکی تر دەداو کابراکەیش جمێن بە باوكو دایکی ئەو دەداتەوە، ئاوا دەبێ بە مایەی ئەوە خەڵك جنێویان پێ بدا (ش).**

**لە گێڕانەوەیەکی تردا: تاوانێکی گەلێ گەورەیە پیاو نەفرینو لەعنەت لە باوكو دایکی خۆی بکا، گوترا: جا شتی وا چۆن دەبێ؟! فەرمووی: با دەبێ، هەیە دەچێ جنێو بە باوكو دایکی کەسێ دەداو ئەویش جنێو بە باوك یا بەدایکی ئەو دەداتەوە.**

٣٣٩/٤-[٤]- وعن أبي محمد جُبيْرِ بنِ مُطعِمٍ رضي اللّه عنه أَن رسولَ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: «لا يَدْخُلُ الجَنَّةَ قَاطِعٌ» قال سفيانُ في روايته: يعْني: قاطِع رحِم. متفقٌ عليه.

---

٢ بوخاری (٦٦٥٧).

٣ بوخاری (٥٩٧٣)، موسلیم (٩٠).

جوبەیری کوڕی موطعیم (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوەی ڕشتەی خزمایەتی بپسێنێو سیلەی ڕەحم ببڕێ پێی ناچێتە بەهەشتەوە (ش).

٣٤٠/٥-٥- وعن أبي عِيسى المُغِيرةِ بن شُعْبَةَ رضي اللَّه عنه عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (إنَّ اللَّهُ تعالى حَرَّمَ عَلَيْكُمْ عُقُوقَ الأُمهَاتِ، ومنْعاً وهات، ووأْدَ البنَاتِ، وكَرَهَ لكُمْ قِيل وقالَ، وكثرة السؤالِ، وإضاعة المالِ) متفقٌ عليه.

موغیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خودای گەورە حەرامی کردووە لەسەرتان: دڵ ڕەنجاندنی باوکانو دایکان، وە زیندە بەچاڵکردنی کچان، وەنەدانی مافی سەرتان، وە زەوتکردنی هەقی خەڵکان، وە حەزیش ناکا لەم ڕەفتارانە بۆتان: لە وتی وتیو لە پرسیاری زۆرو لە سواڵ کردنی زۆر، وە لە زایە کردنی ماڵ بە خۆڕایی (ش).

٦- بڕوانە ژمارە (٣١٥/٤).

٧- بڕوانە ژمارە (٣٢٣/١٢).

## ٤٢- باسی گەورەیی چاکەکردن لەگەڵ دۆستو خزمو کەسوکاری باوکو دایکو ژنو خزمانی تر، کە سوننەتە ڕێزیان بگیرێ

## باب فضل بر أصدقاء الأب والأم والأقارب والزوجة وسائر من يندب إكرامه

٣٤١/١-١- عن ابن عمر رضي اللَّه عنهما أَن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (إن أَبرَّ البرِّ أَنْ يصِلَ الرَّجُلُ وُدَّ أَبِيهِ).

٣٤٢/٢-٢- وعن عبدِ اللَّهِ بن دينار عن عبد اللَّه بن عمر رضي اللَّه عنهما أَنَّ رجُلاً مِنَ الأَعْرابِ لقِيهُ بِطرِيق مكَّة، فَسلَّم عَلَيْهِ عَبْدُ اللَّه بْنُ عُمرَ، وحملهُ على حمار كَانَ يركَبُهُ، وأَعْطَاهُ عِمامةً كانتْ على رأْسِهِ، قال ابنُ دِينَار: فقُلنا لهُ: أَصْلَحكَ اللَّه إِنَّهمْ الأَعْرابُ وهُمْ يرْضَوْنَ بِاليسِيرِ. فقال عبدُ اللَّه بنُ عمر: إِنَّ هذا كَان ودّاً لِعُمَرَ بن الخطاب رضي

٤ بوخاری (٥٩٨٤)، موسلیم (٢٥٥٦).

٥ بوخاری (١٤٧٧)، موسلیم (١٧١٥) (١٢).

١ موسلیم (٢٥٥٢).

٢ موسلیم (٢٥٥٢).

اللّٰه عنه، وإِنّي سمِعْتُ رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم يقول: (إِنَّ أَبرَّ البِـرِّ صِـلةُ الرَّجُـلِ أَهْلَ وُدِّ أَبِيهِ).

وفي روايةٍ عن ابن دينار عن ابن عُمَر أَنَّهُ كَانَ إذا خـرج إلى مَكّـةَ كَـانَ لَـهُ حِمـارٌ يَتروَّحُ عليْهِ إذا ملَّ رُكُوب الرَّاحِلَةِ، وعِمامةٌ يشُدُّ بِها رأْسهُ، فَبيْنا هُـو يوْمـا علـى ذلِـكَ الحِمَارِ إذْ مَرَّ بِهِ أَعْرابيٌّ، فقال: أَلَسْتَ فُلانَ بْنَ فُلان ؟ قال: بلَى: فَأَعْطَاهُ الحِمَارَ، فقـال: ارْكَبْ هذا، وأَعْطاهُ العِمامةَ وقال: اشْدُدْ بِهَا رأْسَكَ، فقال لَهُ بَعْضُ أَصْـحابِهِ: غَفَـر اللّٰـه لَكَ، أَعْطَيْتَ هذَا الأَعْرابيَّ حِماراً كنْتَ تَروَّحُ عليْهِ، وعِمامَـةً كُنْـتَ تشُـدُّ بِهَـا رأْسَـكَ؟ فقال: إِنّي سَمِعْتُ رسولَ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَـلّم يُقـولُ: (إِنْ مِـنْ أَبَـرِّ البِـرِّ أَنْ يَصِـلَ الرَّجُلُ أَهْلَ وُدِّ أَبِيهِ بَعْد أَنْ يُولِّيَ» وإِنَّ أَبَاهُ كَانَ صَدِيقاً لِعُمر رضي اللّٰه عنـه، روى هـذِهِ الرِّواياتِ كُلَّهَا مسلم.

له ڕێگەی مەککە عـەرەبێکی دەشـتەکی تووشـی ئـیبن‌و عومـەر (ڕەزای خـودای لەسەر خۆی‌و بابی)دەبێ، ئیبن‌و عومەر چاك‌و چۆنی لەگـەڵ دەکـاو گوێرێژەکـەی ژێـر خۆیی دەداتێ‌و مێزەرەکەی سەری خۆشـی دەداتـێ، ئـەم گوێرێـژە یـەدەك بـوو، ئیبن‌و عومەر ناو بەناو کە لەسواری حوشتر بێـزار دەبـوو بـۆ وچـان سـواری پشـتی ئەو گوێرێژە دەبوو، جـا ئـیبن‌و دینـاری بـرادەری پێـی دەڵێ: خـودا باشـت بـۆ بکـا، ئەمانە دەشتەکین بەکەمیش قایل دەبن، ئـیتر بۆچـی وڵاخـی ژێـر خـۆت‌و مێـزەری خۆتی دەدەیتێ ئەویش فەرمووی: کاتی خۆی باوکی ئەمە دۆستی باوکم بوو، وە بۆ خۆشم لە پێغەمبەرم ژنەوتووە دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەر بێ): چـاکترین چـاکە ئەوەیـە کە ئادەمیزاد کەس‌و کاری ئاشـناو دۆسـت‌و بـرادەری بـاوکی خـۆی بەسـەر بکاتـەوە، ئیتر باوکی هێشتا لە ژیاندا بێ یا مردبێ! (م/تاج) ئەمە بە کورتی پاڵفتەی هەموو گێڕانەوەکان بوو. (وەرگێڕ).

٣٤٣/٣-[٣]- وعن أبي أُسَيْد بضم الهمزة وفتح السين مالِكِ بن ربيعَةَ السَّـاعِدِيِّ رضـي اللّٰه عنه قال: بَيْنا نَحْنُ جُلُوسٌ عِنْدَ رسول اللّٰهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم إذ جاءَهُ رجُلٌ مِنْ بني سَلَمة فقالَ: يارسولَ اللّٰه هَلْ بقى مِن بِرِّ أَبويَّ شيءٌ أَبرُّهُمَا بِهِ بَعدَ مَوْتِهِمَا ؟ فقال: (نَعَمْ،

٣ ئەبو داوود (٥١٤٢).

الصَّلاَة علَيْهمَا، والاسْتِغْفَارُ لَهما، وإنْفادُ عَهْدِهِما، وصِلةُ الرَّحِمِ التي لا تُوصَلُ إلاَّ بِهِمَا، وإِكْرَامُ صَدِيقهما) رواه أبو داود.

**ئەبو ئوسەيد** (رەزای خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: جارێ لە خزمەت حەزرەتدا** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دانیشتبووین، لەو کاتەدا پیاوێکی بەنو سەلەمەیی هاتە خزمەتی، عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا لەپاش مردنیش باوك‌و دایکم چاکەیان لەسەرم دەمێنێ کە پێویست بێ لەسەرم هەقیان بۆ بکەمەوە؟ فەرمووی: بەڵێ، وەك ئەوە نزای باشیان لەپاش مردنیان بۆ بکە، بۆیان لەخودا بپاڕێرەوە، ئەگەر بەڵێنێکی شەرعیان بەکەسێ داوە، بەڵێنەکەیان بۆ جێبەجێ بکە، خزم‌و کەسوکاریان بەسەر بکەرەوە، ڕێزی دۆست‌و برادەریان بگرە. (ئەبو داوود).**

٣٤٤/٤-[٤] - وعن عائشة رضي اللّه عنها قالت: ما غِرْتُ على أَحَدٍ مِنْ نِسَاءِ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم مَا غِرْتُ على خديجَةَ رضي اللّه عنها. ومَا رَأَيْتُهَا قَطُّ، ولَكِنْ كَانَ يُكْثِرُ ذِكْرَهَا، وَرُبَّما ذَبح الشَّاةَ، ثُمَّ يُقَطِّعُهَا أَعْضَاء، ثُمَّ يَبْعثُهَا في صدائِق خدِيجَةَ، فَرُبَّما قلتُ لَهُ: كَأَنْ لَمْ يكُنْ في الدُّنْيَا إلاَّ خديجَةُ، فيقولُ: (إنَّها كَانتْ وكَانَتْ وكَانَ لي مِنْهَا ولَدٌ) متفقٌ عليه.

**عائیشە** (رەزای خودای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: لە هیچ ژنێکی پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **ئەوەندەی خەدیجەی ژنی، هەوێباریم نەکێشاوە، لەگەڵ ئەوەیشا کە من فریای خەدیجە نەکەوتووم، چونکە پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **زۆری ناودەبردو یادی دەکرد، گەلێ جار مەڕێکی سەر دەبڕی، دەیفەرموو: (بەشی دەستە خوشك‌و ئاشناکانی خەدیجە بنێرن!).**

**عائیشە فەرمووی: ڕۆژێ تووڕەی کردم، گوتم: خەدیجە خەدیجە، ئەوەبوو بەچی؟! فەرمووی** (دروودی خوای لەسەر بێ): **(بەدەست خۆم نییە، خۆشەویستی خەدیجە لەخواوە لە دڵما چەسپیوە!) لەگێڕانەوەیەکدا: گەلێ جار عەرزی پێغەمبەرم کرد: دەڵێی ئەم جیهانە کەسی تری تێدا نییە خەدیجە نەبێ! ئەویش فەرمووی** (دروودی خوای لەسەر بێ): **(ئافرەتێکی وەهاو وەها باش بوو، سەرەڕای ئەوەش منداڵم لێی هەبوو). لە گێڕانەوەیەکدا: ڕقم لە پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **نەکێشاوە، لەسەر هیچ ژنێکی، وەکو**

---

٤ بوخاری (٣٨١٦)، موسلیم (٢٤٣٥)و (٢٤٣٧).

لەسەر خەدیجە رقم لێ دەکێشا، خەدیجەیشم هەرگیز نەدیوە. چونکە سێ ساڵ بەر لەوەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) من بگوازێتەوە خەدیجە مردووە، هۆی ئەم ڕقەلێکێشانەم ئەوە بوو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) زۆر یادی خەدیجەی دەکرد (ش/ت/تاج/٥ل/١٥٠).

٣٤٥/٥-[٥]- وعن أَنس بن مالكٍ رضي اللّٰه عنه قال: خَرجْتُ معَ جرير بن عبدِ اللّٰه الْبَجَليِّ رضي اللّٰه عنه في سَفَر، فكَانَ يَخْدُمُني فقلتُ لَهُ: لا تَفْعلْ، فقال: إنِّي قَدْ رَأَيْتُ الأَنصارَ تَصْنَعُ برسُول اللّٰه صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم شَيْئاً آلَيْتُ عَلى نَفْسِي أَنْ لا أَصْحبَ أَحداً مِنْهُمْ إلاَّ خَدمْتُهُ متفقٌ عليه.

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لەگەڵ جەریری کوڕی عەبدوڵڵای ئەل‌بەجەلی دا چووم بۆ سەفەرێ، لەڕێ جەریر خزمەتی دەکردم، گوتم: شتی وا مەکە. فەرمووی: من بەچاوی خۆم دیومە کە یاریدەدەران خزمەتێکی جوانی پێغەمبەریان دەکرد، بەتایبەتی لەکاتی سەفەردا، منیش سوێندم لەخۆم خواردووە ببم بە هاوڕێی هەرکەسێ لە یاریدەدەران لە تۆڵەی ئەو چاکەیاندا کە لەگەڵ پێغەمبەر دەیانکرد خزمەتیان بکەم، دەی تۆش لەوانیو خزمەتی زۆری پێغەمبەرت کردووە، کەواتە جێگەی خۆیەتی کە منیش خزمەتت بکەمەوە (ش).

## ٤٣- باسی ڕێزگرتن‌و قەدر زانینی کەس‌وکاری پێغەمبەر (درودی خودا لە خۆی‌و ڕەزای خودا بەکەس‌و کاری بێ) وە ڕۆشن کردنەوەی قەدرو ڕێزو فەزڵیان
## باب اكرام أهل بيت رسول الله (صلى الله عليه وسلم) وبيان فضلهم

قال الله تعالى: ﴿إنما يريد الله ليذهب عنكم الرجز أهل البيت ويطهركم تطهيرا﴾الأحزاب/٣٣.

واتە: ئەی خانەوادەی موحەممەد! خودا دەیەوێ لەگوناه پاکتان بکاتەوەو دوورتان بخاتەوە لە خراپەو پیسی.

وقال تعالى: ﴿ومن يعظم شعائر الله فإنها من تقوى القلوب﴾ /٢٢.

بڕوانە سەرەتای باسی (٢٧).

٥ بوخاری (٢٨٨٨)، موسلیم (٢٥١٣).

١/٣٤٦-[١]- وعن يزيد بن حيَّانَ قال: انْطَلَقْتُ أنا وحُصيْنُ بْنُ سَبْرَةَ، وعمْرُو بن مُسْلِمٍ إلى زَيْدِ بْنِ أَرقمَ رضي اللّه عنهم، فلَمَّا جَلسْنا إلَيهِ قال له حُصيْنٌ: لَقَد لَقِيتَ يَا زَيْدُ خَيْراً كَثِيراً، رَأَيْتَ رسولَ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم، وسمِعْتَ حَدِيثَهُ، وغَزَوْتَ مَعَهُ، وَصَلّيتَ خَلْفَهُ: لَقَدْ لَقِيتَ يا زَيْدُ خَيْراً كَثِيراً، حَدِّثْنَا يا زَيْدُ ما سمِعْتَ مِنْ رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم. قال: يا ابْنَ أَخِي واللّهِ لَقَدْ كَبِرتْ سِنِّي، وقَدُم عهْدي، ونسِيتُ بعْضَ الذي كنتُ أَعِي مِنْ رسولِ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم، فَمَا حَدَّثْتُكُمْ، فاقْبَلُوا، وَمَالا فَلا تُكَلِّفُونِيهِ ثُمَّ قال: قام رسولُ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم يَوْماً فِينا خطِيباً بِمَاءٍ يُدْعي خُمّاء بَيْنَ مكّةَ وَالمَدِينَةِ، فَحَمِدَ اللّه، وَأَثنى عَلَيْه، ووعَظَ، وَذَكّرَ، ثُمَّ قَالَ: «أَمَّا بعْدُ: ألا أَيُّهَا النَّاسُ، فَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ يُوشِكُ أَنْ يَأْتِيَ رسولُ ربي فَأُجيبَ، وأَنَا تَارِكٌ فِيكُمْ ثقَلَيْنِ: أَوَّلُهما كِتابُ اللّهِ، فِيهِ الهُدى وَالنُّورُ، فَخُذُوا بِكِتابِ اللّه، وَاسْتَمْسِكُوا به» فَحثَّ على كِتَابِ اللّه، ورغَّبَ فِيه. ثمَّ قالَ (وأَهْلُ بَيْتِي، أُذكِّركم اللّه في أهلِ بيْتِي، أذكّركم اللّه في أهلِ بيتي) فَقَالَ لَهُ حُصَيْنٌ: ومَنْ أَهْلِ بَيْتِهِ يا زَيْدُ ؟ أليس نساؤُه من أهلِ بيتِهِ ؟ قال: نساؤُه منْ أهلِ بيتِهِ وَلَكِن أَهْلُ بيْتِهِ منْ حُرِم الصَّدقَة بعْدَهُ، قَال: ومَنْ هُم؟ قَالَ: هُمْ آلُ عليّ، وآلُ عَقِيلٍ، وآلُ جَعْفَر، وَآلُ عبَّاس، قَالَ: كُلُّ هُؤلاءِ حُرِمَ الصَّدقَةَ ؟ قَالَ: نعَمْ. رواه مسلم.

وفي روايةٍ: (أَلا وَإِنِّي تَارِكٌ فِيكُمْ ثَقْلَيْن: أَحدُهَما كِتَابُ اللّه وَهُو حبْلُ اللّه، من اتَّبَعه كَانَ عَلَى الهُدى، ومَنْ تَرَكَهُ كانَ على ضَلالَةٍ).

**یەزیدی كوڕی حەییان فەرمووی: منو حوصەینی كوڕی سەبرەو عەمری كوڕی موسلیم پێكەوە چووین بۆلای زەیدی كوڕی ئەرقەم، كە دانیشتین لە خزمەتیدا حوصەین عەرزی كرد: ئەی زەید! بەڕاستی خێری زۆرت هاتۆتە ڕێ، پێغەمبەرت (درودی خوای لەسەر بێ) بەچاوی خۆت دیوەو، بە گوێی خۆت گوێت لە فەرموودەو فەرمایشتی بووەو، بۆخۆت لە خزمەتیدا غەزات كردووە، نوێژت بەجەماعەت لە پشتییەوە كردووە، بەڕاستی خێری زۆرت بە نصیب بووە ئەی زەید! ئادەی بفەرموو فەرموودەیەكمان بۆ بگێڕەوە كە بەگوێی خۆت لەزاری پێغەمبەرت بیستبێت. فەرمووی: ئەی كوڕی برام! بەخودا پیرو ئیختیار بوومو چووم بەساڵاو هەندێ شتم لەیاد نەماوە لەو شتانەی كە لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ)**

---

١ موسلیم (٢٤٠٨).

وەرمگرتبوون و لەبەرم بوون، جا هەرچی فەرموودەیەکم بۆتان گێڕایەوە ئەوا وەری بگرن، ئەگینا رووم لێ مەنێن بۆ هی تر، ئینجا زەید فەرمووی: رۆژێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەسەر ئاوێ بوو ناوی غەدیر خومم (ئەستێری خومم) بوو، کەوا لە نێوانی مەکەو مەدینەدا، لەوێ هەڵسا وتارێکی بۆمان خوێندەوە، سوپاس و ستایشی خودای بەجوانی کردو پەندو ئامۆژگاری کردین و لەپاشدا فەرمووی: لەپاش ئەمە ئەی موسوڵمانینە! ئەی خەڵکینە! ئاگادار بن و بزانن کە منیش وەك ئێوە ئادەمیزادم و بەسەرهاتی ژین و مردن وەك لەئێوە ڕوودەدا لەمنیش روو دەدا، جا هاکا ڕابەری پەروەردگارم سەری لێدام، خواه درەنگ خواه زوو مردنی خودا یەخەم دەگرێ و منیش دەچم بە پیرییەوەو ملی بۆ کەچ دەکەم، جا لەم حاڵەدە من دوو یادگاری سەنگین و گرانبەهاتان لەناودا بەجێ دەهێڵم، بەباشی ئاگاداریان بن و هەق و مافی خۆیانیان بدەنێ، یەکەمیان کە نامەی خودایە، بەڕاستی بۆ ڕێگەی راست چرایە، ئەمەیان کە قورئانە لەوی تریان گەورەترە، دەی کەمەندی ئەم نامەی خودایە بگرن و بەهیچ جۆرێ بەری مەدەن و بیکەن بەسەرمەشق و هەمیشە رەفت و کاری پێ بکەن، ئیتر گەلێ هانە هانی دان لەسەر پەیرەوی کردنی قورئانی نامەی خودا، ئەوجا فەرمووی: وە ئەوی تریان کەسوکارەکەی خۆمە، ئەم دووەیش هەرگیز لەیەکتری دانابڕێن، تا پێکەوە بەجووت دێنەوە بۆلای خۆم بۆ سەر حەوزی کەوثەر، دەسا کەوایە ئێوەش لەپاش خۆم لەباتی من چاوی خێرتان لێیانەوە بێ و لەبەر خاتری من ڕێزێکی باشیان لێ بگرن و هەمیشە ترسی خواتان لەدڵدا بێ، لەهۆی کەسوکارەکەی منەوە.

جا حوصەین پێی گوت: ئەدی کەسوکاری پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کێ و کێن؟ ئەی زەید! ئایا ژنەکانی بەر کەسوکاری دەکەون و بە کەسوکاری دادەنرێن یان نا؟ فەرمووی: ژنەکانی دادەنرێن بە کەسوکاری، بەم مەعنایە کە خێزانی ئەون و پاك و بێگەردن، بەڵام کەسوکاری راستەقینەی ئەوانەن کە لەپاش خۆی زەکاتیان پێ ناشێ، حوصەین گوتی: دەی ئەوانە کێن؟ ئەی زەید! فەرمووی: ئەوانە بریتین لە نەوەی عەلی و نەوەی عەقیلی برای عەلی و نەوەی جەعفەری باڵدارو نەوەی عەبباسی مامەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ).

گوتی: جا ئەمانە هەموویان زەکاتیان پێ ناشێ؟ زەید فەرمووی: بەڵێ زەکات بەمانە بەهیچیان ناشێ (م/تاج).

٣٤٧/٢-[٢]- وعَن ابنِ عُمرَ رضيِ اللّٰه عنهما، عن أبي بَكْر الصِّدِّيق رضي اللّٰه عنه مَوْقُوفاً عَلَيْهِ أَنَّهُ قَالَ: ارْقُبُوا مُحَمَّدَاً صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم في أَهْلِ بيْتِهِ، رواه البخاري.

ئیبن‌و عومەر لە ئەبو بەکری صدیقەوە (ڕەزای خودا لە خۆی‌و بابی بێ) دەفەرموێ: چاکەی پێغەمبەرتان لەبەرچاو بێ‌و لەبەر خاتری ئەو ڕێزو قەدری کەسوکاری بگرن، ئەوە وەکو دەق ڕێزی موحەممەد خۆی بگرن وایە! (ب).

## ٤٤- باسی ڕێزگرتن‌و قەدر زانینی زاناکان‌و گەورە پیاوان‌و خاوەن پایەکان‌و وە پێشخستنیان لەکەسانی ترو بەچاوی حورمەت تەماشاکردنی کۆڕی دانیشتنیان‌و ئاشکرا کردنی پایەو پلەو مەقامیان بەپێی خۆیان (باب توقير العلماء والكبار وأهل الفضل وتقديمهم على غيرهم ورفع مجالسهم وإظهار مرتبتهم)

قال الله تعالى: ﴿فهل يستوي الذين يعلمون والذين لا يعلمون؟ إنما يتذكر أولوا الألباب﴾الزمر/٩.

واتە: ئەی موحەممەد! بفەرموو هەرگیز نەبووەو نابێ کە زاناو نەزان وەکو یەك وابن‌و داناو نەدان چۆن یەکسان دەبن، لە ڕاستیدا تەنیا خاوەن هۆش‌و گۆشەکان بەباشی لەشت ورد دەبنەوەو پەندی لێ وەر دەگرن.

١/٣٤٨-[١]- وعن أبي مسعودٍ عُقْبَةَ بنِ عمرو البدريِّ الأنصاريِّ رضي اللّٰهُ عنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «يَؤُمُّ الْقَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ لِكتَابِ اللّٰهِ، فَإِنْ كَانُوا في الْقِراءَةِ سَواءً، فَأَعْلَمُهُمْ بِالسُّنَّةِ، فَإِنْ كَانُوا في السُّنَّةِ سَوَاءً، فَأَقْدمُهُمْ هِجْرَةً، فَإِنْ كـانُوا في الهِجْرَةِ سَوَاءً، فَأَقْدَمُهُمْ سِنّاً وَلا يُؤمَّنَّ الرَّجُلُ الرَّجُلَ في سُلْطَانِهِ، وَلا يَقْعُدُ في بيْتِهِ على تَكْرِمتِهِ إلاَّ بِإِذْنِهِ» رواه مسلم. وفي روايةٍ لَهُ: «فَأَقْدمُهُمْ سِلْماً» بَدل «سِنًّا»: أَيْ إسْلاماً. وفي رواية: يَؤُمُّ الْقَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ لِكتَابِ اللّٰهِ، وأَقْدمُهُمْ قِراءَةً، فَإِنْ كَانَتْ قِراءَتُهم سَواءً فَيَؤُمُّهم أَقْدمُهُمْ هِجْرةً، فَإِنْ كَانوا في الهِجْرَةِ سواء، فَلْيُؤمَّهُمْ أَكْبرُهُمْ سِناً».

---

٢ بوخاری (٣٧٥١).

١ موسليم (٦٧٣)و (٢٩١).

ئەبو مەسعوود (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: كێ قورئانی پتر لەبەر بوو با ئەوە پێشنوێژی بۆ گەل بكا، جا ئەگەر هەموو وەك یەك قورئانیان لەبەر بوو با كامەیان باشتر شارەزای سوننەتی پێغەمبەر بوو ئەوەیان بەرنوێژیان بۆ بكا، جا ئەگەر لەمەشیان وەك یەك بوون با كێیان لە پێشتردا كۆچی كردبوو لە وڵاتی كوفرەوە بۆ وڵاتی ئیسلام ئەوەیان بەرنوێژیان بۆ بكا، جا ئەگەر لەوەیشا یەكسان بوون با كامەیان بەتەمەنتر بوو ئەوەیان. لە گێڕانەوەیەكا لەباتی: با كامەیان بەتەمەنتر بوو ئاوایە: با كامەیان لە پێشدا ئیسلام بوو ئەوەیان، وە هەموو كەسێ لە قەڵەمڕەوی خۆیدا دەبێ بەرنوێژی بكاو نابێ كەسی تر لەقەڵەمڕەوی ئەودا بەرنوێژی بكا مەگەر لەسەر ڕەزای ئەو، لەماڵەوەیش لەسەر جێگەو تەختی تایبەتی یەكتری دامەنیشن مەگەر بە ڕەزامەندی خاوەنەكەی (م-ڕەزای خودای لێ بێ).

٢/٣٤٩-[٢]- وعنه قال: كان رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم يَمْسحُ مناكِبَنَـا في الصَّلاةِ وَيَقُولُ: (اسْتَوُوا وَلا تَخْتلِفُوا، فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ، لِيَلِنِي مِنكُمْ أُولوا الأَحْلامِ والنُّهَى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهم، ثُمَّ الذين يلونَهم) رواه مسلم.

دیسان لەوەوە دەفەرموێ: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) لەم پەڕی ریزەوە تا ئەو پەڕی ریز، لە نوێژدا، دەكەوتە ناو ڕیزەكەوەو دەستی دەهێنا بە سنگو بەشانمانداو ڕێكی دەخستینو دەیفەرموو: لە ڕیزا ڕێك بووەستنو نارێك مەوەستنو خێچو خوار مەبن، ئەگینا نارێكیو ناكۆكیتان تێ دەكەوێ، با سالارو هۆشیارو فامیدەكانتان لەمنەوە نزیك ببنەوە، ئینجا ئەوانەی كە لە زرنگیو هۆشیاریدا لەوانی نزیك دەكەنەوە، ئیتر هەروا (م/تاج).

٣/٣٥٠-[٣]- وعن عبد اللّٰه بن مسعودٍ رضي اللّٰه عنه قال: قال رسـول اللّٰـه صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (لِيَلِنِي مِنْكُمْ أُولُوا الأَحْلامِ والنُّهَى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ) ثلاثاً (وإِيَّاكُم وهَيْشَاتِ الأَسْوَاقِ) رواه مسلم.

---

٢ موسلیم (٤٣٢).

٣ موسلیم (٤٣٢).

**عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: با سەلارو هۆشیارو فامیدەکانتان لەمنەوە نزیك ببنەوە، ئینجا ئەوانەی کە لە زرنگیی و هۆشیاریدا لەوانی نزیك دەکەنەوە سێ جار ئاوای فەرموو، وە فەرمووشی: خۆشتان دوور بگرن لە بگرەو بەردەو چەقەچەقی بازاڕ (م).**

**٣٥١/٤-[٤]- وعن أبي يحْيى وَقيلَ: أبي مُحمَّد سَهْلِ بن أبي حثْمة بفتح الحاءِ المهملة وإسكان الثاءِ المثلثة الأنصاري رضي الله عنه قال: انْطَلَقَ عبْدُ اللَّهِ بنُ سهْلٍ وَمُحيِّصَةُ ابْنُ مَسْعُودٍ إلى خَيْبَرَ وَهِيَ يَوْمَئِذ صُلْحٌ، فَتفَرَّقَا. فَأَتَى مُحَيِّصةُ إلى عبدِ اللَّهِ بنِ سَهلٍ وهو يَتشَحَّطُ في دمهِ قَتيلاً، فدفَنَهُ، ثمَّ قَدِمَ المدِينَةَ فانْطَلَقَ عَبْدُ الرحْمنِ بْنُ سَهْلٍ وَمُحَيِّصَةُ وَحُوَيِّصةُ ابْنَا مسْعُودٍ إلى النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّم، فَذَهَب عَبْدُ الرَّحْمنِ يَتكَلَّمُ فقال: «كَبِّرْ كَبِّرْ» وَهُوَ أَحْدَثُ القَوْمِ، فَسَكَت، فَتَكَلَّمَا فقال: (أَتحْلِفُونَ وَتسْتَحِقُّونَ قَاتِلكُمْ ؟) وَذَكَرَ تَمامَ الحدِيث. متفقٌ عليه.**

**سەهلی کوڕی خەثمەی ئەنصاری (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی سەهلو موحەییصەی کوڕی مەسعوود دەچن بۆ خەیبەر، کە لەو کاتەدا خەیبەر لەگەڵ ئێمەدا ئاشت بوو، لەوێ بەناو باخە خورماکانا بڵاو دەبنەوە، وە عەبدوڵڵا دەکوژرێ، کاتێ موحەییصە دەیگاتێ دەڕوانێ وا کوژراوەو خەڵتانی خوێنەو لەناو خوێنی خۆیا گەوزاوە، جا لەوێ دەینێژێو خۆی دەگەڕێتەوە بۆ مەدینە، وە گومان دەخەنە سەر جوولەکەکان جا عەبدولڕەحمانی برایو دوو ئامۆزای- کە موحەییصەو حووەیصەی کوڕی مەسعوود بوون- هاتنە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ڕێزی لەخۆت گەورەتر بگرە یا فەرمووی: با گەورە دەست پێ بکا جا ئەو بێدەنگ بوو، وە ئامۆزاکانی دەستیان بە قسە کرد، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: پەنجا کەس لە ئێوە سوێند بخۆن لەسەر پیاوێ لەوان، ئەو پیاوە پەت دەکرێو دەدرێتە دەستتان لەجیاتی کوژراوەکەتان بیکوژنەوە، گوتیان: شتێ کە بەدیاریەوە نەبووبین ئێمە چۆن سوێندی لەسەر بخۆین! فەرمووی: کەواتە جوولەکەکان پەنجا کەسیان سوێندتان بۆ دەخۆنو بەوە پاکانەتان بۆ دەکەن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! هۆزێکی بێ بڕوانو سوێندی ئەوان کوا بایەخی**

---

٤ بوخاری (٦٨٩٨)، موسلیم (١٦٩٧).

**هەيە، جا پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **خۆی خوێنی کوژراوەکەی لە وشتری زەکات دا (ش/تاج).**

٣٥٢/٥-[٥]– وعن جابرٍ رضي اللّهُ عنه أَنَّ النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم كَانَ يَجْمَعُ بـيْنَ الرَّجُلَيْنِ مِنْ قَتْلَى أُحُدٍ يَعْنِي فِي القَبْرِ، ثُمَّ يَقُولُ: (أَيُّهُما أَكْثَرُ أَخْذاً لِلْقُرْآنِ ؟) فَإِذَا أُشِيرَ لَهُ إِلى أَحَدِهِمَا قَدَّمَهُ فِي اللَّحْدِ. رواه البخاريُّ.

**جابیر** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **شەهیدەکانی غەزای ئوحود، دوو پیاو دوو پیاو لەیەك قەبرا دەیان ناشتن، بەڵام دەیفەرموو: ئەم دوو شەهیدە کامیان قورئانی پتر لەبەرە؟ جا ئەوەیانی لە گۆڕیچکەدا دەخستە پێشەوە کە نیشانی ئەویان دەدا (ب).**

٣٥٣/٦-[٦]– وعن ابن عُمرَ رضي اللّهُ عنهمـا أَنَّ النبـــي صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلّم قـال: (أَرَانِي فِي المَنَامِ أَتَسَوَّكُ بِسِوَاكٍ، فَجَاءَنِي رَجُلان، أَحدُهُمَا أَكْبَرُ مِنَ الآخَرِ، فَنَاوَلْتُ السِّوَاكَ الأَصْغَرَ، فقيلَ لي: كَبِّرْ، فَدَفَعْتُهُ إِلى الأَكْبَرِ مِنْهُمَا) رواه مسلم مُسْنَداً والبخاريُّ تعلِيقاً.

**ئیبن‌و عومەر (ڕەزای خودالەخۆی‌و بابی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: لەخەوما بە دارسیواکێ سیواکم دەکرد، دوو پیاو هاتن بۆلام، یەکێکیان لەوی تریان گەورەتر بوو، ویستم سیواکەکە بدەم بە بچکۆلەکەیان، لە خەوەکەدا پێیان گوتم: بیدە بە گەورەکەیان، منیش دام بە گەورەکەیان (م/ب).**

٣٥٤/٧-[٧]– وعن أبي موسى رضي اللّه عنه قال: قال رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (إِنَّ مِنْ إِجْلاَلِ اللّهِ تعالى إِكْرَامَ ذِى الشَّيْبَةِ المُسْلِمِ، وَحَامِلِ الْقُرآنِ غَيْرِ الْغَالِي فِيهِ، والجَافِي عَنْهُ وإِكْرَامَ ذِي السُّلْطَانِ المُقْسِطِ) حديثٌ حسنٌ رواه أبو داود.

**ئەبو مووسا** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **لە حەزرەتەوە** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: هەر کەسێ قەدرو ڕێزی موسوڵمانانی پیرو کاربەدەستی دادگەرو قورئان خوێن بگرێ بەمەعنا قەدرو ڕێزی خودای گەورە دەگرێ، بەمەرجێ قورئانِ خوێنەکە پێی لێ هەڵنەبڕێ‌و زۆر قووڵی نەکاتەوەو بێزار نەبێ لە خوێندنەکەی (د-ح/ح).**

---

٥ بوخاری (١٣٤٣).

٦ موسلیم (٢٣٧١)، بوخاری (٢٤٦).

٧ ئەبو داوود (٤٨٤٣).

٨/٣٥٥-٨- وعن عَمْرِو بنِ شُعَيْبٍ، عن أَبِيهِ، عن جَدِّه رضي اللّهُ عنهم قال: قال رسولُ اللّه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنَا، وَيَعْرِفْ شَرَفَ كَبِيرِنَا) حديثٌ صحيحٌ رواه أبو داود والترمذي، وقال الترمذي: حديثٌ حسنٌ صحيح.

وفي رواية أبي داود (حَقَّ كَبِيرِنَا).

باپیرەی عەمری کوڕی شوعەیب (ڕەزای خودا لە خۆیو بابیو باپیرەی بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەو کەسەی بەزەیی نەیەتەوە بە بچووکماناو قەدری گەورەمان نەزانێ، ئەوە لە ئێمە نییە (د/ت:ح/ح/ص) لە گێڕانەوەی ئەبو داوددا: مافی گەورەمان نەزانێ.

٩/٣٥٦-٩ - وعن مَيْمُونَ بنِ أبي شَبِيبٍ رحمه اللّهُ أن عَائشَةَ رضي اللّه عنها مَرَّ بِها سَائِلٌ، فَأَعْطَتْهُ كِسْرَةً، وَمرّ بِهَا رَجُلٌ عَلَيْهِ ثِيَابٌ وهَيْئَةٌ، فَأَقْعَدتْهُ، فَأَكَلَ فَقِيلَ لَهَا في ذلكَ ؟ فقالت: قال رسولُ اللّه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (أَنْزِلُوا النَّاسَ مَنَازِلَهُمْ) رواه أبو داود. لكِنْ قال: مَيْمُونٌ لَمْ يُدْرِك عائِشَةَ.

وَقَدْ ذَكَرَهُ مُسْلِمٌ في أَوَّلِ صَحِيحهِ تَعْلِيقاً فقال: وَذُكِرَ عَنْ عائِشَةَ رضي اللّه عنها قالت: أَمرنا رسولُ اللّه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم أَنْ نُنْزِل النَّاسَ مَنَازِلَهُمْ، وَذَكَرَهُ الحاكِمُ أَبُو عبدِ اللّهِ في كِتابِهِ (مَعْرِفَة عُلُومِ الحَدِيث) وقال: هو حديثٌ صحيح.

جارێ سواڵکەرێ هات بۆلای عائیشە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) عائیشە لەتێ نانی داپێی، لەپاش ئەو پیاوێکی پۆشتەو پەرداخی بەقەڵافەت هات بۆلای، عائیشە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) داینا هەتا نانی خوارد، کە بۆ ئەمە لە عائیشەیان پرسی، فەرمووی: چونکە حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەموو کەسێ بەپێی پایەو پلەی خۆی لەناو کۆمەڵا قەدری بگرنو خاتری بزانن (د/موسلیم/ حاکم/ح/ح/ص).

١٠/٣٥٧-١٠- وعن ابن عباسٍ رضي اللّه عنهما قال: قَدِمَ عُيَيْنَةُ بْنُ حِصْنٍ، فَنَزَلَ عَلَى ابنِ أَخِيهِ الحُرِّ بْنِ قَيْسٍ، وَكَانَ مِنَ النَّفَرِ الَّذِينَ يُدْنِيهِم عُمَرُ رضي اللّه عنه، وَكَانَ القُرَّاءُ أَصْحَابَ مَجْلِسِ عُمَرَ وَمُشَاوَرَتِهِ، كُهُولاً كَانُوا أَوْ شُبَّاناً، فقال عُيَيْنَةُ لابْنِ أَخِيهِ: يا ابْنَ

---

٨ ئەبو داوود (٤٩٤٣)، تیرمذي (١٩٢١).

٩ ئەبو داوود (٤٨٤٢).، بڕوانە (مقدمەی موسلیم:١/٦).

١٠ بوخاری (٤٦٤٢)، بڕوانە ژمارە (٥٠ ).

أَخي لَكَ وجْهٌ عِنْدَ هذَا الأَمِيرِ، فَاسْتَأْذِنْ لي عَلَيْهِ، فَاسْتَأْذَنَ لَهُ، فَأَذِنَ لَهُ عُمَرُ رضي اللّه عنه، فلما دَخَل: قال هِي يا ابْنَ الخَطَّابِ: فَوَاللّه مَا تُعْطِينَا الجَزْلَ، وَلا تَحْكُمُ فِينا بِالعَدْلِ، فَغَضِبَ عُمَرُ رضي اللّه عنه حَتَّى هَمَّ أَنْ يُوقِعَ بِهِ، فقال لَهُ الحُرُّ: يَا أَمِيرَ المُؤْمِنِينَ إنَّ اللّه تعالى قال لِنَبِيِّهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: { خُذِ العَفْوَ وَأْمُرْ بِالعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الجَاهِلِينَ } وإن هذا مِنَ الجَاهِلِينَ. واللّهِ ما جاوزَهَا عُمرُ حِينَ تَلاهَا عَلَيْهِ، وَكَانَ وَقَّافاً عِنْدَ كِتَابِ اللّه تعالى. رواه البخاري.

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لە خۆیو بابی بێ) فەرمووی: عویەینەی کوڕی حیصن هات لەلای حوڕی کوڕی قەیس دابەزیو بوو بەمیوانی، حوڕ (کە برازای عویەینە بوو) لەبەر ئەوەی یەکێك بوو لە قورئانخوێنەکان عومەر قەدری دەگرتو لەخۆی نزیکی دەکردەوە، چونکە قورئانخوێنەکان، پیرو لاویان لەتاقمو کۆمەڵی مەجلیسو کۆڕی ڕاوێژی عومەر بوون، جا عویەینە بە حوڕی گوت: ئەی کوڕی برام! تۆ ڕووی لای ئەم فەرمانڕەوایەت هەیەو لە کنی خاترت هەیە کەوایە داوای لێ بکە کە ڕێگەم بدات هەتا بچم بۆلای، ئەویش روخصەتی بۆ خواستو عومەریش ڕێگەی پێ دا، جا کە چووە خزمەتی گوتی: هەی! ئەی کوڕی خەططاب! دەسا بەخودا نە خەڵاتی باشمان دەدەیتێو نە بەعەدالەت دەڕانی لەناومانا!! عومەریش لەم قسە ڕەقە تووڕە بوو، تەنانەت قرمی لێ خۆش کرد کە تەمێی بکا. حوڕ پێی گوت: ئەی میری موسوڵمانان! خودای گەورە بە پێغەمبەری خۆی دەفەرموێ: ﴿خذ العفو وأمر بالعرف وأعرض عن الجاهلين﴾.

واتە: لایەنی نەرمونیانی بگرەو ڕەفتاری شیرینی ئاسان لەخەڵك قبووڵ بکەو پیشەت چاکە بێو ئەمری پێ بکەو دەمە دەمێو چەلەحانێ لەگەڵ نەفامان مەکەو پشت هەڵکە لە دەمەتەقێ لەگەڵ نەزانانا.

دڵنیاش بە کە ئەمە لەو نادانانەیە، کەواتە لێی مەگرەو گوێ بەم قسە قوڕەی مەدە، ئیتر بەخودا کە حوڕ ئەم ئایەتە پیرۆزەی بەسەر عومەردا خوێندەوە، عومەر ڕەق لێی ڕاوەستاو لێی لانەدا، چونکە هەمیشە عومەر لەڕاستی حوکمی نامەی خودا ڕێك ڕادەوەستاو ملی بۆی کەچ دەکرد (ب). (لە پێشەوە ڕابوورد، بڕوانە ژمارە ٥٠).

١١/٣٥٨-[11]- وعن أبي سعيدٍ سَمُرَةَ بن جُنْدبٍ رضي اللّٰه عنه قال: لَقَدْ كنْتُ عَلَى عهْدِ رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم غُلاماً، فَكُنْتُ أحفَظُ عنْهُ، فَمَا يَمْنَعُني مِنَ القَوْلِ إِلاَّ أَنَّ هَهُنَا رِجالاً هُمْ أَسنُّ مِنِّي متفق عليه.

سەمموورەی کچی جوندوب (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: من بەسەرینی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کوڕێکی گەنج بووم، وە شتم لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەبیستو لەبەرم دەکرد، بەڵام لەبەر ئەوەی لەخۆم گەورەتر لەوێ بوو لە خزمەتیا قسەم نەدەکرد (ش).

١٢/٣٥٩-[12]- وعن أَنس رضي اللّٰه عنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (ما أَكْرَم شَابٌّ شَيْخاً لِسِنِّهِ إِلاَّ قَيَّضَ اللّٰه لَهُ مَنْ يُكْرِمُهُ عِنْد سِنِّه) رواه الترمذي وقال حديث غريب.

ئەنەس لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (درودی خوای لەسەر بێ): هەر لاوێ ڕێزی پیرێ بگرێ لەبەر خاتری تەمەنی، مسۆگەر کە خودا هەقی بۆ دەکاتەوەو یەکێکی وای بۆ دەڕەخسێنێ کە لەتەمەنی پیریدا قەدری بگرێ (ت:ح/غريب).

## ٤٥- باسی دیتنی کردنی پیاوچاکانو خێرەوەکەندانو دانیشتن لەگەڵیانو خۆشەویستیو خۆ نزیك كردنەوە لێیانەوەو داوای دینیو دوعاو نزای باش لێیانو سەردانو زیارەت کردنی شوێنە موفەڕکەکان

## باب زيارة أهل الخير ومجالسهم وصحبتهم ومحبتهم وطلب زيارتهم والدعاء منهم وزيارة مواضع الفاضلة

قال الله تعالى: ﴿وإذا قال موسى لفتاه لا أبرح حتى أبلغ مجمع البحرين أو أمضي حقبا﴾الكهف/٦٠.

تا کۆتایی داستانەکەی مووساو خضر...تەماشای ئایەتی یەکەمی باسی (٣٢)بکە.

١/٣٦٠-[1]- وعن أَنسٍ رضي اللّٰهُ عنه قال: قال أبو بكر لِعمرَ رضي اللّٰهُ عنهما بَعْدَ وَفَاةِ رسولِ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: انْطَلِقْ بِنَا إِلى أُمِّ أَيْمنَ رضي اللّٰه عنها نَزُورُهَا كَما كَانَ

---

١١ بوخاری (١٣٣١)بەکورتی، موسلیم (٩٦٤).

١٢ تیرمذي (٢٠٢٣).

رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم يزُورُهَا، فلَمَّا انْتَهيا إِلَيْهَا، بَكَتْ، فَقَالاَ لَهَا: مَا يُبْكِيكِ أَما تَعْلَمِينَ أَنَّ ما عِنْدَ اللّٰهِ خيرٌ لرسولِ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم ؟ فقالت: إِنّي لا أَبْكِي أَنّي لأَعْلَمُ أَنَّ ما عِندَ اللّٰهِ تعالَى خَيرٌ لرَسُولِ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم، ولَكنْ أبْكي أَنْ الوَحْيَ قَدِ انْقَطَعَ مِنَ السَّماءِ. فَهَيَّجَتْهُما على البُكَاءِ، فَجعلا يَبْكِيانِ معهَا. رواه مسلم.

ئەنەس (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لەپاش وەفاتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەبوبەکر بە عومەر دەفەرمویٚ: با بچین بۆلای ئوممو ئەیمەن (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دێنییەکی بکەین، وەك جارانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە دەچوو بۆ سەردانی، کە گەیشتنە لای ئوممو ئەیمەن دەستی کرد بە گریان، ئەوانیش گوتیان: بۆچی دەگریت؟ ئەدی نازانی ئەوەی لای خودایە چاکترە بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ)! فەرمووی: من لەبەر ئەوە ناگریم، دەزانم ئەوەی لەلای خودایە باشترە بۆ پێغەمبەر، بەلام لەبەر ئەوە دەگریم کە سرووش لە ئاسمانەوە کۆتایی هات ئیتر ئەوانیش خرۆشان و هەردووکیان لەگەڵیا دەستیان کرد بە گریان (م). (ئوممو ئەیمەن دایکی شیریی پێغەمبەرە... وەرگێڕ).

٢/٣٦١–[٢] وعن أبي هريرة رضي اللّٰه عنه عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (أَنَّ رَجُلاً زَارَ أَخاً لَهُ في قَرْيَةٍ أُخْرَى، فَأَرْصد اللّٰهُ تعالى على مَدْرجَتِهِ ملَكاً، فَلَمَّا أَتَى عَلَيْهِ قال: أَيْن تُرِيدُ ؟ قال: أُريدُ أَخاً لي في هذِهِ الْقَرْيَةِ. قال: هَلْ لَكَ عَلَيْهِ مِنْ نِعْمَةٍ تَرُبُّهَا عَلَيْهِ ؟ قال: لا، غَيْر أَنّي أَحْبَبْتُهُ في اللّٰهِ تعالى، قال: فَإِنّي رسول اللّٰهِ إِلَيْكَ بأَنَّ اللّٰه قَدْ أَحبَّكَ كَما أَحْبَبْتَهُ فِيهِ) رواه مسلم.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرمویٚ: پیاویٚ دەچیٚ بۆ گوندیٚ بۆ دیدەنی برادەرێکی خۆی، خودا فریشتەییٚ دەنێرێتە سەر ڕێگەکەی، کە دەگاتە لای دەفەرمویٚ: بۆ کویٚ دەچیت؟ دەڵیٚ: دەچم بۆ لای برادەرێکم وا لەم گوندە، فریشتەکە دەفەرمویٚ: ئایا هیچ نیازێکت هەیە پێی؟ دەڵیٚ: خەیر، تەنیا ئەوە نەبیٚ کە ساخ لەبەر ڕەزای خودای گەورە ئەوم خۆش دەویٚ، دەفەرمویٚ: دەمن فرستادەی خودام، منی ناردووە بۆلای تۆ کە پێت بڵێم: کە خودایش تۆی خۆش دەویٚ، چونکە تۆ ئەوت لەبەر خودا خۆش دەویٚ (م).

---

١ موسلیم (٢٤٥٤).

٢ موسلیم (٢٥٦٧).

٣٦٢/٣-[٣]- وعنه قال: قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (مَنْ عَادَ مَرِيضاً أَوْ زَارَ أَخاً لَهُ فِي اللّٰه، نَادَاهُ مُنَادٍ: بِأَنْ طِبْتَ، وطَابَ مَمْشَاكَ، وَتَبَوَّأْتَ مِنَ الجَنَّةِ منْزِلاً) رواه الترمذي وقال: حديثٌ حسنٌ. وفي بعض النسخ غريبٌ.

**دیسان لەوەوە لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەر بێ): هەرکەسێ سەر لە نەخۆشێ بدا، یا دینی برادەرێکی ئایینی خۆی بکا، فریشتەیە لەغەیبەوە لەلایەنی خوداوە بانگی دەکا: هەی خۆشبیت‌و بەخۆشی ئۆغر بکەیت‌و لەبەهەشتا هەوار هەڵدەیت! (ت:ح/ح).**

٣٦٣/٤-[٤]- وعن أبي موسى الأَشعَرِيِّ رضيَ اللّٰهُ عنه أن النبي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (إِنَّما مَثَلُ الجَلِيس الصَّالِحِ وَجَلِيسِ السُّوءِ. كَحَامِلِ المِسْكِ، وَنَافِخِ الْكِيرِ، فَحامِلُ المِسْكِ، إِمَّا أَنْ يُحْذِيَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحاً طَيِّبَةً. ونَافِخُ الكيرِ إِمَّا أَن يحْرِقَ ثيابَكَ وإمَّا أنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحاً مُنْتِنَةً) متفقٌ عليه.

**ئەبو مووسا لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەر بێ): هاوڕێ‌و هاونشینی باش وەك میسك فرۆش وایە، هاوڕێ‌و هاودەمی خراپ وەك مووشەددەمەچی وایە، میسك فرۆش یاخۆت لێی دەکڕی یا خۆی بەشت دەدا، یا هەر هیچ نەبێ بۆنە خۆشەکەی دەچێت بەسەرتا، بەڵام مووشەددەمەچی، واتە: ئاسنگەر، یا جلەکانت دەسووتێنێ، یا بۆ چڕوکێکی پیس دێت بەسەرتا! (ش).**

**لەخزمەت مەلا! کەسێ دانیشێ**
**ڕەنگی پیاوانی خوای لێ دەنیشێ!**
**بۆنی مەیخانەو بۆگەنی بۆی نەو**
**هۆش‌و دڵ‌و چاو زوو دەکەنە خەو***

---

٣ تيرمذي (٢٠٠٩).

٤ بوخاری (٥٥٣٤)، موسلیم (٢٦٢٨).

* بۆی: کەسێکە لە مەیخانەدا مەی دەگێڕێ بەسەر بادە نۆشانا (وەرگێڕ).

٣٦٤/٥-٥- وعن أبي هريرة رضي اللّٰه عنه، عن النبي صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (تُنْكَحُ المَرْأَةُ لأَرْبعٍ: لِمالِهَا، ولِحَسَبِهَا، ولِجَمَالِهَا، ولِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاك) متفقٌ عليه.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: وا باوە لەناو خەڵکا کە ژن لەبەر ئەم چوار شتە مارە دەکرێ‌و دەخوازرێ: لەبەر ئەوە ماڵی هەیە یا لەبەر ئەوە کە خانەدانە، یا لەبەر ئەوە کە جوانە، یا لەبەر ئەوە کە بە ئایینەو خاوەن دینە، جا ئەی ژنخوازی هۆشمەند! تۆ ئافرەتی ئاییندار بەدین لەکیس خۆت مەدە، تا دەستەشکێن نەبیت! (ش).

٣٦٥/٦-٦- وعنْ ابن عباس رضي اللّٰه عنهما قال: قال النبي صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم لِجِبْرِيلَ: (مَا يَمْنَعُكَ أَنْ تَزُورَنَا أَكْثَرَ مِمَّا تَزُورنَا ؟) فَنَزَلَتْ: { ومَا نَتَنَزَّلُ إلاَّ بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَما خَلْفَنَا وما بَيْنَ ذلِكَ } رواه البخاري.

ئیبن‌و عەبباس (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بە جوبرائیل (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: لەبەر چی دیدەنیمان لەمە پتر ناکەی؟ ئیتر بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هات: ﴿وما نتنزل إلا....﴾ ٦٩/١٠. واتە: ئێمە نایینە خوارێ بەفەرمانی پەروەردگاری تۆ نەبێ، لەئەزەل هەتا ئەبەد کاروباری هەردوو جیهان خودا هەمووی دەزانێ‌و هەموو شتێ بەبێ جیاوازی موڵک‌و دروستکراوی خودایە، خودای تۆ خودایەکی داناو زاناو بەئاگایەو هیچ شتێ فەرامۆش ناکا (ب).

٣٦٦/٧-٧- وعنْ أبي سعيدٍ الخُدْرِيِّ رضي اللّٰه عنه، عن النبي صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (لا تُصَاحِبْ إلاَّ مُؤْمِناً، ولا يَأْكُلْ طعَامَكَ إلاَّ تَقِيٌّ). رواه أبو داود، والترمذي بإسْنَادٍ لا بأْس بِهِ.

ئەبو سەعید (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لە حەزرەتەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: تەنیا هاوڕێیەتی موسوڵمانی خاوەن باوەڕ بکە بەس، وە نان‌و ئاویشت تەنیا موسوڵمانی خوداناس بیخوات‌و بەس! (د/ت).

---

٥ بوخاری (٥٠٩٠)، موسلیم (١٤٦٦).

٦ بوخاری (٤٧٣١).

٧ ئەبو داوود (٤٨٣٢)، تیرمذي (٢٣٩٧).

٣٦٧/٨-^٨- وعن أبي هريرة رضي اللّٰه عنه أن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (الرَّجُلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ، فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكم مَنْ يُخَالِلُ). رواه أبو داود. والترمذي بإسنادٍ صحيح، وقال الترمذي: حديثٌ حسنٌ.

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لەسەر بێ) **گوتی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: بنیادەم لەسەر ئایینو کێشی دۆستو برادەری خۆیەتی، کەوایە با باش باش ورد ببێتەوە کە کێ دەگرێ بە دۆستو ئاشنای خۆی! (د/ت/س/ص).**

٣٦٨/٩-^٩- وعن أبي موسى الأَشْعَرِيِّ رضي اللّٰهُ عنه أن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (المَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ). متفق عليه وفي رواية قال قيل للنبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم الرجل يحب القوم ولَمّا يلحق بهم ؟ قال: (المرء مع من أحب).

**ئەبو مووسا** (رەزای خودای لەسەر بێ) **لە حەزرەتەوە** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: پیاو لەقیامەتا لەگەڵ خۆشەویستی خۆیدا دەبێ (ش).**

**وە لە گێڕانەوەیەکا: عەرزی حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **کرا: پیاوی وا هەیە کۆمەڵێکی خۆش دەوێ بەڵام بە کردەوەی باش بەوانا ناگا، ئایا پایەی ئەم جۆرە پیاوە لە قیامەتا چییە؟ فەرمووی** (درودی خوای لەسەر بێ)**: پیاو لە جیهانا کێ خۆشەویستی بێ، لەقیامەتیشدا لەگەڵ ئەودا دەبێ.**

٣٦٩/١٠-^١٠- وعن أنس رضي اللّٰه عنه أن أعرابياً قال لرسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: مَتَى السَّاعَةُ ؟ قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (مَا أَعْدَدْتَ لَهَا ؟) قال: حُب اللّٰهِ ورسولِهِ قال: (أَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ). متفقٌ عليه، وهذا لفظ مسلم.

وفي روايةٍ لهما: مَا أَعْدَدْتُ لَهَا مِنْ كَثِيرِ صَوْمٍ، وَلا صَلاةٍ، وَلا صَدَقَةٍ، وَلَكِنِّي أُحِبُّ اللّٰه وَرَسُولَهُ.

**ئەنەس** (رەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: عەرەبێکی دەشتەکی لە پێغەمبەری** (درودی خوای لەسەر بێ) **پرسی: کەی قیامەتە؟ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی** (درودی خوای لەسەر بێ)**: باشە چیت ئامادە کردووە؟ گوتی: وەنەبێ لە نوێژو ڕۆژوو خێرو صەدەقە زۆرم ئامادە**

---

٨ ئەبو داوود (٤٨٣٣)، تیرمذي (٢٣٧٩).

٩ بوخاری (٦١٧٠)، موسلیم (٢٦٤٠).

١٠ بوختاری (٣٦٨٨)، موسلیم (٢٦٣٩).

کردبێ بۆی، بەڵام دەست مایەی دەستم ئەوەیە کە خوداو پێغەمبەری خودام خۆش دەوێ! فەرمووی: دە تۆ لەگەڵ ئەو کەسانە دەبی کە خۆشت دەوێن (ش/تاج).

۱۱/۳۷۰-[۱۱]- وعن ابنِ مسعودٍ رضي اللّٰه عنه قال: جاءَ رَجُلٌ إلى رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم فقال: يا رسول اللّٰه كَيْفَ تَقُولُ في رَجُلٍ أَحبَّ قَوْماً وَلَمْ يلْحَقْ بِهِمْ ؟ فقال رسولُ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (المَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ) متفقٌ عليه.

مەعناکەی لە دوو حەدیثەکەی پێشیەوە وەردەگیرێ.

۱۲/۳۷۱-[۱۲]- وعن أبي هُريرة رضي اللّٰه عنه عن النبي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (النَّاسُ معَادِنُ كَمَعَادِنِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، خِيَارُهُمْ في الجَاهِلِيَّةِ خِيارُهُمْ في الإِسْلامِ إذَا فَقهُوا. وَالأَرْوَاحُ جُنُودٌ مُجنَّدَةٌ، فَمَا تَعَارَفَ مِنْهَا ائْتَلفَ، وَمَا تَنَاكَرَ مِنْهَا، اخْتَلَفَ) رواه مسلم. وروى البخاري قوله: (الأَرْوَاحُ) إلخ، من رواية عائشة رضي اللّٰه عنها.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: سەرنج دەدەن کە ئەم خەڵکە وەك کانی زێڕو زیو وان، واتە: هەرکەسە ڕەگەزیان دەچێتەوە سەر بنەماڵەیەکی خانەدان، یا بنیچەی دەچێتەوە سەر بەرە بابێکی ناڕەسەن، وە بەزۆریش کردارو ڕەفتارو گوتاریان بەپێی ڕەسەنیو ناڕەسەنییانە، جا بۆیە ئەوانەیان کە لەسەردەمی نەزانی پێش هاتنی ئیسلاما ڕەسەنو باش بوون دیسان لەسەردەمی ئیسلامەتیشدا هەر ئەوانەیان زۆر باشو ڕەسەنن، بەڵام بەمەرجێ شارەزا ببن لە شەریعەت. گیانگەلیش لەناو خۆیانا وەکوو چەن کۆمەڵێ سەربازی قاڵی مەشق پێکراو وان، کە هەر لەسەرەتاوە، لە ئەزەلدا، لە پێش درووستکردنی لەشدا، خودا لەسەر چەند جۆرێکی جیا جیا درووستی کردوونو جۆرە مەشقێکی تایبەتی لە عالەمی ڕۆحدا پێ کردوون، جا بۆیە ئێستایش لە ژیانی دونیادا ئەوانەیان کە بە پێی ئەزەل هاو تەحرو هاولفی یەکترین هۆگری یەکتر دەبنو پێکەوە دەسازێن، ئەوانەشیان لەسەرەتاوە لەعالەمی گیانگەل دا لەیەك جوودا بوون ئەمڕۆکەیش ناموٚیی لەیەکتر دەکەنو دژی یەك دەوەستنەو لەگەڵ یەك ناسازێن! (م/ب).

---

۱۱ بوخاری (٦١٦٨)، موسلیم (٢٦٤٠).

۱۲ موسلیم (٢٦٣٨).

١٣/٣٧٢-[١٣]- وعن أُسيرِ بْنِ عَمْرٍو ويُقَالُ: ابْنُ جابِر (وهو بضم الهمزةِ وفتح السين المهملة» قال: كَانَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ رضي اللّٰه عنه إذا أَتى عَلَيْهِ أَمْدادُ أَهْلِ الْيمنِ سأَلَهُمْ: أَفيُكُمْ أُوَيْسُ بْنُ عَامِرٍ ؟ حتَّى أَتَى عَلَى أُوَيْسٍ رضي اللّٰه عنه، فقال له: أَنْتَ أُوَيْس بْنُ عامِرٍ ؟ قال: نَعَمْ، قال: مِنْ مُرَادٍ ثُمَّ مِنْ قَرَن ؟ قال: نعَمْ، قال: فكَانَ بِكَ بَرَصٌ، فَبرَأْتَ مِنْهُ إلاَّ مَوْضعَ دِرْهَم ؟ قال: نَعَمْ. قال: لَكَ والِدَةٌ ؟ قال: نَعَمْ.

قال سَمِعْتُ رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يقول: (يَأْتِي عليْكُمْ أُوَيْسُ بْنُ عَامِرٍ مع أَمْدَادِ أَهْلِ الْيَمَنِ مِنْ مُرَادٍ، ثُمَّ مِنْ قَرَن كَانَ بِهِ برصٌ، فَبرَأَ مِنْهُ إلاَّ مَوْضعَ دِرْهَم، لَهُ وَالِدَةٌ هُو بِها برٌّ لَوْ أَقْسمَ على اللّٰه لأَبَرَّهُ، فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ يَسْتَغْفِرَ لَكَ فَافْعَلْ) فاسْتَغْفِرْ لي فَاسْتَغْفرَ لَهُ.

فقال له عُمَرُ: أَيْنَ تُرِيدُ ؟ قال: الْكُوفَةَ، قال: أَلا أَكْتُبُ لَكَ إلى عَامِلِها ؟ قال: أَكُونُ في غَبْراءِ النَّاسِ أَحبُّ إِلَيَّ. قال فلما كان من العام المقبل حج رجل من أشرافهم فوافق عمر فسأله عن أوَيسٍ قال: تركته رثَّ البيت قليل المتاع قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول يأتي عليكم أويس بن عامر مع أمداد أهل اليمن من مراد ثم من قرن كان به برص فبرأ منه إلا موضع درهم له والدة هو بها برٌّ لو أقسم على الله لأبرّه فإن استطعت أن يستغفر لك فأفعل فأتى أويسا فقال استغفر لي قال أنت أحدث عهدا بسفر صالح فاستغفر لي قال استغفر لي قال: أنت أحدث عهدا بسفر صالح فاستغفر لي قال: لقيت عمر قال: نعم، فاستغفر له ففطن له الناس فانطلق على وجهه. رواه مسلم.

وفي رواية لمسلم أيضا: عن أسير بن جابر رضي الله عنه أن أهل الكوفة وفدوا على عمر (رضي الله عنه) وفيهم رجل ممن كان يسخر بأويس فقال عمر: هل هاهنا أحد من القرنيين؟ فجاء ذلك الرجل فقال عمر: إنَّ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قد قال إن رجلا يأتيكم من اليَمَن يقال له أويس لا يدع باليَمَن غير أمٍّ له قد كان به بياض فدعا الله تعالى فأذهبه عنه إلاَّ موضع الدِّينار أو الدِّرهم فمن لقيه منكم فليستغفر لكم. عن عمر بن الخطاب (رضي الله عنه) قال: إني سمعت رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يقول إنَّ خير التابعين رجل يقال له أويس وله والدة وكان به بياض فمروه فليستغفر لكم.

---

١٣ موسليم (٢٥٤٢) (٢٢٣)و (٢٢٤)و (٢٢٥).

ئوسەیری کوڕی جابیر (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جاران کە لەشکری کۆمەکیەکانی یەمەن دەهات بۆ عومەر، عومەر (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لێیانی دەپرسی: ئەرێ ئووەیسی کوڕی عامیرتان تێدا نییە؟ هەتا بەم جۆرە پرسیارە ئووەیسی دۆزیەوە، فەرمووی: تۆ ئووەیسی کوڕی عامیریت؟ فەرمووی: بەڵێ ئەوم، فەرمووی: لە خێڵی قەرەنی کە دەچنەوە سەر هۆزی موراد؟ فەرمووی: بەڵێ، فەرمووی: جاران بەڵەك بوویت، بەڵام ئێستا چاك بوویتەوە، تەنیا بەقەد جێگە درەمێکی ماوە؟ فەرمووی: بەڵێ وایە، فەرمووی: دایکت هێشتا ماوە؟ فەرمووی: بەڵێ ماوە، عومەر (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: لەناو ئەو لەشکرانەدا کە لەیەمەنەوە دێن بۆ کۆمەکی‌و یاریدەتان پیاوێ دێ ناوی ئووەیسی کوڕی عامیرە، لەهۆزی قەرەنە کە دەچنەوە سەر عێلی موراد، لە پێشدا هەنێ بەڵەك دەبێ، لە پاشدا چاك دەبێتەوە، بەقەد شوێنی درەمێکی نەبێ، دایکێکی هەیە زۆر بۆی باشە، ئەو ئووەیسە ئەوەندە نازی هەیە لەلای خودای گەورە، ئەگەر سوێند لەسەر شتێ بخوا کە دەبێ خودا ئەو شتەی بۆ بکا، خودا دڵی ناشکێنێ‌و سوێندەکەی ناخات‌و داواکەی جێبەجێ دەکات بۆی، ئەی عومەر! ئەگەر بۆت ڕێکەوت با ئەو پیاوە لەخودا بۆت بپاڕێتەوە چونکە هەمیشە دووعاو نزای ئەو گیرایەو ڕەت نابێتەوە، جا کەواتە ئەی ئووەیس! بۆم بپاڕێرەوە، جا ئەویش بۆی دەپاڕێتەوە. ئەوجا عومەر پێی فەرموو: کوێت دەوێ؟ فەرمووی: کووفە، حەزرەتی عومەر فەرمووی: نامەت بۆ بنووسم بۆ والی‌و فەرمانڕەواکەی یارمەتیت بدا؟ فەرمووی: حەز ناکەم ناوم بکەوێتە ناو ناوانەوە حەز بەناو مەردوومە ڕەش‌و رووتەکە دەکەم. گوتی: لەساڵی ئایندەدا پیاوێکی خانەدانیان هات بۆ حەج، عومەر هەواڵی ئووەیسی لێ پرسی، گوتی: کەمن هاتم ماڵێکی پەڕپووت‌و کەمێ شتومەکی هەبوو، عومەریش فەرموودەکەی پێشەوەی حەزرەتی بۆ گێڕایەوە، جا کە پیاوەکە دەگەڕێتەوە دەچێتە لای ئووەیس‌و پێی دەڵێ: بۆم بپاڕێرەوە، دەڵێ: تۆ تازە لەسەفەری خێر گەڕاویتەوە، تۆ بۆمن بپاڕێرەوە! لەپاشا پێی دەڵێ: دیارە عومەرت دیوەو ئەو ئەم تەگبیرەی بۆ کردوویت؟ دەڵێ: ئا، بەخزمەتی گەیشتم، جا بۆی دەپاڕێتەوە، ئیتر دەردەکەوێت‌و خەڵك پێی دەزانن‌و

باشیەکەی ئاشکرا دەبێو نزاخوازانو خاوەن نیازەکان سەری تێ دەکەن، ئیتر ئەویش سەری خۆی هەڵدەگرێ. (م).

لە گێڕانەوەیەکی تری موسلیمدا هەر لە ئوسەیری کوڕی جابیرەوە، دەڵێ: کاتێ خەڵکی کووفە هاتن بۆلای عومەر پیاوێکیان لەوانە تێدا بوو کە تیزیان بە ئوومیس دەکرد عومەر (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کەس لە قەرەنیەکان لێرە هەیە؟ جا ئەو پیاوە هات عومەر فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەیەمەنەوە پیاوێ دێت بۆلاتان، پێی دەڵێن: ئووەیس، تەنیا دایکێکی دەبێ، کە خۆی دێ بۆ ناو ئێوە، لەیەمەن دایکی بەجێ دێڵێ، ئووەیس لە پێشدا بەڵەك دەبێ لەپاشدا لەخودا دەپاڕێتەوە، خودا چاکی دەکاتەوە، تەنیا جێگەی دینارێکی زەێڕی نەبێ، یا بەقەد شوێنی درەمێکی نەبێ، جا هەرکامێ لەئێوە تووشی ئەو پیاوە بوو، با بۆتان بپاڕێتەوەو داوای لێخۆش بوونتان بۆ بکا. لە گێڕانەوەیەکی تری موسلیمدا لە عومەرەوە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری حەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو: باشترین کەسی چینی دووەمی موسولمانان، کە ناودارو مەشهوورن بە تابیعین، پیاوێکە ناوی ئووەیسە، دایکێکی هەیە زۆر باشە بۆی، لە پێشا بەڵەك دەبێ، لەپاشا چاك دەبێتەوە، داوای لێ بکەن با بۆتان بپاڕێتەوە.

ئەی سەبا! لەو خاکی بەرپێی ئەو ئووەیسی قەرەنە
بۆ شیفا تۆزێ گڵم بۆ بێنە نالەو گوڵشەنە
چاوەڕێی مژدەو خەڵاتم بۆیە چاوم والەڕێ!!
تابڕێژم چاوەکانم لەو کلەی ئەو یەمەنە

١٤/٣٧٣- [١٤] - وعن عمرَ بنِ الخطاب رضي اللّه عنه قال: اسْتَأْذَنْتُ النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم في العُمْرَةِ، فَأَذِنَ لي، وقال: (لا تَنْسَنَا يا أَخَيَّ مِنْ دُعَائِكَ) فقال كَلِمَةً مَا يسُرُّني أَنَّ لي بِهَا الدُّنْيَا. وفي روايةٍ قال: (أَشْرِكْنَا يَا أخَيَّ في دُعَائِكَ). حديثٌ صحيحٌ رواه أَبو داود، والترمذي وقال: حديثٌ حسنٌ صحيحٌ .

---

١٤ ئەبو داوود (١٤٩٨)، تیرمذي (٣٥٦٢).

**عومەری کوڕی خەططاب** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: عەرزی حەزرەتم کرد کە ڕێگەم بدا تا بچم بۆ عەمرە ئەویش ڕێگەی پێدام فەرمووی: ئەی برالەم! لەنزای باشی خۆت فەرامۆشمان مەکە عومەر** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: ئەم وشەیەی حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **کە داوای نزای لەمن کرد بە هەموو موڵكو سامانی دنیا ناگۆڕمەوە. لە گێڕانەوەیەکا: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: (ئەی برای ئازیزم! لەنزای خۆتا هاوبەشیمان بکە) (د/ت:ح) (ش).**

**١٥/٣٧٤-[١٥]- وعن ابن عُمرَ رضي الله عنهما قال: كَانَ النبــي صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم يَزُورُ قُبَاءَ رَاكِباً وَماشِياً، فَيُصلِّي فِيهِ رَكْعَتَيْنِ متفقٌ عليه.**

**وفي روايةٍ: كان النبــي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يَأْتي مَسْجِدَ قُبَاءَ كُلَّ سبْتٍ رَاكِبًا وَمَاشِياً وكَانَ ابْنُ عُمَرَ (رضي الله عنه) يفعله.**

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) **فەرمووی: جاران پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **هەموو شەممەیەك بەپێ، یا بەسواری وڵاخ دەچوو بۆ مزگەوتەکەی قوباء، دوو ڕکات نوێژی سوننەتی تێدا دەکرد، ئیبنو عومەر** (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) **خۆشی ڕۆژی شەممەکان ئاوای دەکرد (ش/تاج).**

## ٤٦-باسی گەورەیی خۆشەویستی، کەلەبەر ڕەزای خودا بێ، وە یەکێك یەکێکی خۆش بوێ با پێی بڵێ، ئەویش چی بڵێ پێی (باب فضل الحب في الله وةالحث عليه و إعلام الرجل من يحبه أنه يحبه وماذا يقول له إذا أعلمه)

**قال الله تعالى: ﴿محمد رسول الله والذين معه أشداء على الكفار رحماء بينهم﴾الى آخر السورة. سورة الفتح-المترجم).**

**وقال تعالى: ﴿والذين تبوؤوا الدار والإيمان من قبلهم، يحبون من هاجر إليهم﴾الحشر/٩.**

**واتە: هەروەها عەجەبتان بێ لەکاری شیرینی ئەو دڵێرمەندانەی کە ناویان دەرکردووە بەناوی ئەنصارو یاریدەدەرانەوە، لەپێش تەشریف هێنانی حەزرەتو کۆچکاراندا، بۆ مەدینەی پیرۆز ئەوان لەوێ هەم نیشتەجێ بوونو هەم ئیسلام بووبوونو هۆگری ئایینی ئیسلام بوو بوون، وە ئەوانەیان خۆش دەوێ کە ساخ لەبەر ڕەزای خودا لەدەست زوڵمو زۆری کوفرو بێ دینی ڕەویان کردووە بۆلای ئەوان.**

---

١٥ بوخاری (١١٩١)، موسلیم (١٣٩٩).

٣٧٥/١-[١]- وعن أَنس رضي اللّٰه عنه عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (ثَلاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ بِهِنَّ حَلاوَةَ الإيمَان: أَنْ يَكُونَ اللّٰهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا، سِواهُما، وأَنْ يُحِبَّ المَرْءَ لا يُحِبُّهُ إلاّ للّٰهِ، وَأَنْ يَكْرَه أَنْ يَعُودَ في الكُفْرِ بَعْدَ أَنْ أَنْقَذَهُ اللّٰهُ مِنْهُ، كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ في النَّارِ) متفقٌ عليه.

**ئەنەس** (ڕەزای خوای لێبێ) **فەرمووی: لەحەزرەتەوە** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: هەرکەسێ ئەم سێ شتەی تیادا بێ تامی شیرینی باوەڕ دەچێژێت: خوداو پێغەمبەری خودای لەهەموو شتێکی تر لا خۆشەویستر بێ، دووەم: هەرکەسێکی خۆش دەوێ ساخ لەبەر رەزای خودای گەورە خۆشی بوێ، سێیەم: چۆنیش حەز ناکا بیخەنە ناو ئاگرەوە، ئاواش حەز نەکات کە جارێکی تر بچێتەوە سەر کوفرو بێ بڕوایی‌و ببێتەوە بەکافر (ش).**

٣٧٦/٢-[٢]- وعن أبي هريرة رضي اللّٰه عنه عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (سبْعَةٌ يُظِلُّهُم اللّٰه في ظِلِّهِ يَوْمَ لا ظِلَّ إلاّ ظِلُّهُ: إمامٌ عادِلٌ، وَشَابٌ نَشَأَ في عِبَادَةِ اللّٰهِ عَزَّ وَجلَّ، وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مَعلَّقٌ بالمَسَاجِدِ ورَجُلان تَحابَّا في اللّٰهِ اجْتَمَعَا عَلَيْه، وَتَفرَّقَا عَلَيْه، ورَجُلٌ دَعَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَال، فقال: إنِّي أَخافُ اللّٰه، وَرَجُلٌ تَصدَّقَ بصَدَقَةٍ، فَأَخْفَاهَا حَتَّى لا تَعْلَمَ شِمَالُهُ ما تُنْفِقُ يَمِينُهُ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللّٰهَ خَالِياً فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ) متفقٌ عليه.

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **لە حەزرەتەوە** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: حەوت تاقم هەن خودا لە ڕۆژی قیامەتا دایان دەنێ لەژێر سێبەری تەخت‌و بارەگا (عرش)ی خۆیدا، لەو ڕۆژەدا کە هیچ سایەو سێبەرێکی تر نییە بێجگە لەسایەو سێبەری خۆی، یەکەم: پادشای عادڵ‌و پێشەوای داد پەروەرو کاربەدەست‌و سەرکاری بەداد، دووەم: لاوێ کە لە عیبادەت‌و خودا پەرستیدا قاڵ بووبێ‌و پێگەیشتبێ‌و بەرەبەرە گەورە بووبێ، سێیەم: پیاوێ کە دڵی ئالوودەی مزگەوت بێ، چوارەم: دوو پیاو کەلەبەر رەزای خودا یەکتریان خۆش بوێ، کاتێ کۆدەبنەوە لەشوێنی ساخ لەبەر رەزای خودا کۆببنەوەو کاتێکیش لەیەك جوێ دەبنەوە، ساخ لەبەر ڕەزای خودا لەیەکتری جیا ببنەوە، لەپاش تەواو بوونی کۆبوونەوەکەیان، پێنجەم: پیاوێ کە ئافرەتێکی خانەدانی خان‌و مانی شۆخی جوان داوای ئیشی خراپی لێ بکاو خۆی تەسلیم بکا، ئەویش نەیکاو پێی بڵێ: من ئیشی بێ شەرعی ناکەم چونکە لەخودا**

---

١ بوخاری (١٦)، (٤٣).

٢ بوخاری (٦٦٠)و موسلیم (١٣٠١).

دەترسم، شەشەم: پیاوێ خێری بەپەنامەکی بکا، کە ئەم دەستی بەو دەستی نەزانی، حەوتەم: پیاوێ کە بەتەنیا خۆی بێ‌و یادی خودا بکاو فرمێسك بەچاویا بێتە خوارەوە لەترسی خودا بگری (ش).

٣٧٧/٣-[٣]- وعنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (إن اللّٰه تعالى يقولُ يَوْمَ الْقِيامةِ: أَيْنَ الْمُتَحابُّونَ بِجَلالِي ؟ الْيَوْمَ أُظِلُّهُمْ فِي ظِلِّي يَومَ لا ظِلَّ إلاَّ ظِلِّي) رواه مسلم.

دیسان لەوەوە لە حەزرەتەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: لە ڕۆژی قیامەتا خودای گەورە دەفەرموێ: ئەو کەسانەی کە لەجیهاندا، لەبەر خاتری من یەکتریان خۆش دەویست لەکوێن بابێن، ئەمڕۆ ڕۆژی ئەوانە، ئەمڕۆ دەستی قەدرو ڕێزیان لێ دەنێم‌و لەسێبەری خۆمدا پەنایان دەدەم، ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە کە جگە لە سێبەری من سێبەری تر نییە (م).

٣٧٨/٤-[٤]- وعنه قال: قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لا تَدْخُلُون الجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، ولا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَوَ لا أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوه تَحَابَبْتُمْ ؟ أَفْشُوا السَّلامَ بينَكم)رواه مسلم.

دیسان فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەو کەسە کە گیانی منی وا لەدەستا تا باوەڕو ئیمان نەهێنن ناچنە بەهەشتەوە، وە باوەڕی تەواویش ناهێنن هەتا یەکتریتان لەبەر خودا خۆش نەوێ، جا کەوای لێهات با ئەو شتەی کە کردنەکەی دەبێ بەهۆی خۆشەویستی یەکتری پێتان بلێم؟ سلاو لەناو خۆتانا پەخش‌و بلاو بکەنەوە (م).

٣٧٩/٥-[٥]- وعنه عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (أَنَّ رَجُلاً زَار أَخاً لَهُ فِي قَرْيَةٍ أُخْرَى، فَأَرْصَد اللّٰهُ لَهُ عَلَى مَدْرَجتِهِ مَلَكاً) وذكر الحديث إلى قوله: (إن اللّٰه قَدْ أَحَبَّكَ كَمَا أَحْبَبْتَهُ فِيهِ) رواه مسلم. وقد سبق بالباب قبله. ژمارە (٣٦١/٢).

٣٨٠/٦-[٦]- وعن البَراءِ بْنِ عَازبٍ رضي اللّٰهُ عنهما عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم أنه قال في الأنصار: (لا يُحِبُّهُمْ إلاَّ مُؤمِنٌ، وَلا يُبْغِضُهُمْ إلاَّ مُنافِقٌ، مَنْ أَحَبَّهُمْ أحبَّه اللّٰهُ، وَمَنْ أَبْغَضَهُمْ أَبْغضَهُ اللّٰه) متفقٌ عليه.

---

٣ موسلیم (٢٥٦٧).

٤ موسلیم (٥٤).

٥ بڕوانە ژمارە (٣٦١/٢).

٦ بوخاری

بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) فەرموی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خۆشەویستی ئەنصارەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) نیشانەی باوەڕی پتەوە، وە ڕق لێبوون و کینەکانیش لێیان نیشانەی دووڕوویی و ناپاکییە، ئەوەی ئەوانی خۆش دەوێ خودایش ئەوانی خۆش دەوێ، وە ئەوەی کە ڕقی لەوانە خودایش رقی لەوە (ش).

٣٨١/٧-[٧]- وعن مُعَاذٍ رضي اللّٰه عنه قال: سمِعتُ رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يقول: قَالَ اللّٰهُ عَزَّ وَجلَّ: المُتحَابُّونَ فِي جَلالِي، لَهُمْ مَنَابِرُ مِنْ نُورٍ يَغْبِطُهُمْ النَّبِيُّونَ وَالشُّهَدَاءُ). رواه الترمذي وقال: حديثٌ حسنٌ صحيحٌ.

موعاذ (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو (درودی خوای لەسەر بێ): خودای گەورەو مەزن دەفەرموێ: ئەو کەسانەی کە لەبەر خاتری مەزناهی و شکۆمەندی من یەکیان خۆش دەوێ وان لەسەر مینبەرگەلێ لە نوور، پێغەمبەران و شەهیدان خۆزگەیان پێ دەخۆن! (ت:ح/ح/ص).

٣٨٢/٨-[٨]- وعن أبي إدريس الخَولانيِّ رَحِمَهُ اللّٰهُ قال: دَخلْتُ مَسْجِدَ دِمَشْقَ، فَإذَا فَتًى بَرَّاقُ الثَّنَايَا وَإذَا النَّاسُ مَعهُ، فَإذَا اختَلَفُوا فِي شَيءٍ، أَسْنَدُوهُ إِلَيْهِ، وَصَدَرُوا عَنْ رَأْيِهِ، فَسَأَلْتُ عَنْهُ، فَقِيلَ: هَذَا مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ رضي اللّٰه عنه، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغدِ، هَجَّرْتُ، فَوَجَدْتُهُ قَدْ سَبَقَنِي بِالتَّهْجِيرِ، ووَجَدْتُهُ يُصَلِّي، فَانْتَظَرْتُهُ حَتَّى قَضَى صلاتَهُ، ثُمَّ جِئْتُهُ مِنْ قِبَلِ وجْهِهِ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، ثُمَّ قُلْتُ: وَاللّٰهِ إِنِّي لأُحِبُّكَ للّٰهِ، فَقَالَ: آللّٰهِ ؟ فَقُلْتُ: أَللّٰهِ، فقال: آللّٰهِ ؟ فَقُلْتُ: أَللّٰهِ، فَأَخَذَنِي بِحَبْوَةِ رِدَائِي، فَجَبَذَنِي إِلَيْهِ، فَقَالَ: أَبْشِرْ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يقول: (قَالَ اللّٰهُ تعالى وَجَبَتْ مَحبَّتِي لِلْمُتَحَابِّينَ فِيَّ، والمُتَجالِسِينَ فِيَّ، وَالمُتَزَاوِرِينَ فِيَّ، وَالمُتَبَاذِلِينَ فِيَّ) حديث صحيح رواه مالِكٌ في المُوطَّإ بإسنادِهِ الصَّحيحِ.

ئەبو ئیدریسی خەولانی (ڕەحمەتی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: چوم بۆ مزگەوتەکەی دیمەشق، تەماشام کرد کەوا لاوێکی دەم و پل جوان مەردوومەکە دەوریان لێ داوە، وە هەموو چاویان لە دەمی ئەوە، پرسیم ئەمە کێیە؟ گوتیان: ئەمە موعاذی کوڕی جەبەلە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) بۆ سبەینێ زوو هاتم بۆ مزگەوت، ڕوانیم ئەو لەمن زووتر

(٣٧٨٣)، موسلیم (٧٥).

٧ (٢٣٩١).

٨ الموطأ (٩٥٣/٣).

**هاتووەو خەریکی نوێژە، چاوەنوارِیم کرد تا نوێژەکەی تەواو کرد، ئینجا لەبەردەمیەوە چووم بۆ لای‌و سلاوم لێ کردو پێم گوت: بەخودا من تۆم زۆر خۆش دەوێ! فەرمووی: ئایا لەبەر خودایە؟ گوتم: بەڵێ لەبەر خودایە، دوو جار. ئەوجا چەمکی عاباکەی گرتم‌و دایکێشام بۆ لای خۆی‌و فەرمووی: دە موژدەت لێ بێ، چونکە لە پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو** (درودی خوای لەسەر بێ): **خودای گەورە دەفەرموێ: خۆشەویستی من پێویست بوو بۆ ئەمانە: یەکەم: بۆ ئەوانەی کە لەناو خۆیاندا لەبەر من یەکتریان خۆش دەوێ، دووەم: بۆ ئەوانەی کەلەبەر ڕەزای من کە بەیەکەوە کۆڕ دەبەستن، سێیەم: بۆ ئەوانەی کە لەبەر خاتری من دیدەنی یەکتری دەکەن، چوارەم: بۆ ئەوانەی کە لەبەر ڕەزای من شت بەیەکتری دەبەخشن، (ئیمامی مالیك رەزای خوای لێ بێ).**

٣٨٣/٩ [٩]- عن أبي كَرِيمَةَ المِقْدَادِ بن مَعْدِ يكَرب رضي اللّٰه عنه عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال (إذَا أَحَبَّ الرَّجُلُ أَخَاهُ، فَلْيُخْبِرْهُ أَنَّهُ يُحِبُّهُ) رواه أبو داود، والترمذي وقال: حديثٌ حسَنٌ.

**میقداری کوڕی مەعدیکەریب** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **لەحەزرەتەوە** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: کاتێ پیاوێ برادەرێکی خۆی خۆشویست با ئاگاداری بکا کە خۆشی دەوێ (د/ت:ح/ح/ص).**

١٠/ ٣٨٤- [١٠]- وعن مُعَاذٍ رضي اللّٰه عنه، أَنَّ رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، أَخَذَ بِيَدِهِ وقال: (يَا مُعَاذُ واللّٰهِ، إنّي لأُحِبُّكَ، ثُمَّ أُوصِيكَ يَا مُعاذُ لا تَدَعنَّ في دُبُرِ كُلِّ صلاةٍ تَقُولُ: اللّٰهُم أَعِنّي على ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ، وحُسنِ عِبَادتِك). حديث صحيحٌ، رواه أبو داود والنسائي بإسناد صحيح.

**موعاذی کوڕی جەبەل** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەستی گرتم‌و فەرمووی: ئەی موعاذ! بەخودا من تۆم زۆر خۆش دەوێ، ئەی موعاذ کەواتە با ئامۆژگاریەکت بکەم: لەپاش هەموو نوێژێ ئەم وشانە بڵێ‌و هەرگیز تەرکیان مەکە، بڵێ: اللهم أعني على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك. واتە: خودایە! یاریدەم**

٩ ئەبو داوود (٥١٢٤)، تیرمذي (٢٣٩٣).

١٠ ئەبو داود (١٥٢٢)و نەسائی (٥٣/٣).

بـده لەسـەر زیکـرو یـادی خـۆت، وە لەسـەر سـوپاس‌و ستایشـی خـۆت، وە لەسـەر بەندەیی‌و پەرستنی خۆت لەسەر شێوەیەکی شیرین‌و جوان (د/ن-ح/ص).

١١/٣٨٥- وعن أنسٍ، رضي الله عنه، أَنَّ رَجُلاً كَانَ عِنْدَ النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، فَمَرَّ بِهِ، فَقال: يا رسول اللّهِ إنِّي لأُحِبُّ هَذا، فقال له النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «أَأَعْلمتَهُ ؟» قَالَ: لا قَالَ: «أَعْلِمْهُ» فَلَحِقَهُ، فَقَالَ: إنّي أُحِبُّكَ في اللّه، فقالَ: أَحبَّكَ الّذِي أَحْبَبْتَنِي لَهُ. رواه أبو داود بإسنادٍ صحيح.

ئەنەس (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پیاوێ لـەلای پێغەمبـەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) رەت بوو، پیاوێکی دیکەش لـەوێ بـوو، گوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! مـن ئـەم پیـاوەم خـۆش دەوێ. فـەرمووی: ئاگـادارت کردۆتـەوە؟ گـوتی: نـەخێر، فـەرمووی: دە ئاگارداری بکەرەوە، پیاوەکەش دوای کەوت‌و گرتییەو پێی گوت: مـن لەبـەر خـاتری خوا تۆم خۆش دەوێ. ئەویش پێی گوت: ئەو کەسەی کە تۆ لەبەر خاتری ئەو منت خۆش دەوێ. ئەو کەسەیش تۆی خۆش بوێ. (د-س/ص).

دەست کێ دەکەوێ بەهرەی گەورەی وا:
خۆشەویستی دۆست لە پێناوی خوا
بۆ ئێمە مانان ئەوەمان بەسە:
نە دوشمنداریـن، نـە دۆستمان کەسە!

## ٤٧- باسی نیشانەی خۆشەویستی خودا، بۆ بەندەی خۆی، وە هاندان لەسەری‌و تێکۆشان لەپێناوی وەدەستهێنانی

## باب حب الله تعالى العبد والحث على التخلق بها والسعي في تحصيلها

قال الله تعالى: ﴿يا أيها الذين آمنوا من يرتد منكم عن دينه فسوف يأتي الله بقوم يحبهم ويحبونه أذلة على المؤمنين أعزة على الكافرين، يجاهدون في سبيل الله ولا يخافونَ لومة لائم، ذلك فضل الله يؤتيه من يشاء والله واسع عليم﴾المائدة/٥٤.

واتە: ئەی موسوڵمانینە! بزانن کە کۆمـەڵێ لـە ئێـوە لـە ئیسلام وەردەگـەڕێن‌و بادەدەنەوە سەر کوفرو دەچنەوە سەر دینە پیسەکەی جارانیان، وەڵێ خودا بێ باکە بەوە هیچی لێ نایە، وە دەست لە یاریدەدەری دینی خۆی هەڵناگرێ، بۆیـە لەمـەولا لەجیاتی ئەو بەدبەخت‌و ئاخر شەڕانە کۆمەڵێکی هەڵبژاردە، دەهێنێ‌و ئیسلامیان دەکا، هەم خودا ئەوانی خۆش دەوێ، هەم ئەوان خودایـان خـۆش دەوێ، نیشانەیان

**وایه لەئاستی موسوڵمانان ملکەچو خزمەتگوزارنو لە ئاستی بێ باوەڕو کافران سەربەرزو دڕکدارن، لە پێناوی بەرزەوە بوونی ئاڵای ئیسلاما، بەسەرو ماڵ، بەدەستو دڵو زمان بەئاشکراو نهێنی، لەخۆشیو ناخۆشیدا تێدەکۆشنو خەبات دەگێڕنو ئاسایش لەخۆیان حەرام دەکەن بۆ یاریدەی ئیسلام، نە لەشیرو تیری دوژمنان دەترسن، نە دەربەستی تانەو تەشەرو تانوتی ناحەزان دێن، ئامانجو ئاواتیان ڕەزای خودایە، زمانی حاڵیان ئەمەیە: دەربەستی هیچی تر نین ڕەزای خوداو پێغەمبەر نەبێ.**

١/٣٨٦-[1]- وعن أبي هريرة رضي اللّٰه عنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلّم: (إنَّ اللّٰه تعالى قال: مَنْ عادَى لي وَلِيّاً، فقدْ آذَنْتُهُ بِالحَرْبِ، ومَا تَقَرَّبَ إليَّ عَبْدِي بِشَيءٍ أَحَبَّ إلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ، وَمَا يَزَالُ عَبْدِي يَتقَرَّبُ إلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ، فَإذَا أَحْبَبْتُهُ، كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذي يَسْمَعُ بِهِ، وَبَصَرَهُ الَّذي يُبْصِرُ بِهِ، وَيَدَهُ الَّتي يَبْطِشُ بِهَا، وَرِجْلَهُ الَّتي يَمْشِي بِها وإنْ سَأَلَني أَعْطَيْتُهُ، وَلَئِنْ اسْتَعَاذَنِي لأُعِيذَنَّهُ) رواه البخاري.

**بڕوانە ژمارە (١/٥٩-ز١١).**

٢/٣٨٧-[2]- وعنه عن النبي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم، قال: (إذَا أَحَبَّ اللّٰهُ تعالى العَبْدَ، نَادَى جِبْرِيل: إنَّ اللّٰه تعالى يُحِبُّ فُلاناً، فَأَحْبِبْهُ، فَيُحبُّهُ جِبْرِيلَ، فَيُنَادى في أَهْلِ السَّماء: إنَّ اللّٰه يُحِبُّ فُلاناً، فَأَحِبوهُ، فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ، ثُمَّ يُوْضَعُ له القَبُولُ في الأَرْضِ) متفقٌ عليه.

وفي رواية لمسلم: قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (إنَّ اللّٰه تعالى إذا أَحبَّ عبْداً دَعا جِبْرِيلَ، فقال: إنّي أُحِبُّ فُلاناً فَأَحْبِبْهُ، فَيُحِبُّهُ جِبْريلُ، ثُمَّ يُنَادِي في السَّماءِ، فَيَقُولُ: إنَّ اللّٰه يُحِبُّ فُلاناً، فَأَحِبُّوهُ فَيُحبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ ثُمَّ يُوضَعُ له القَبُولُ في الأَرْضِ، وإذا أَبْغَضَ عَبداً دَعا جِبْرِيلَ، فَيقولُ: إنّي أُبْغِضُ فُلاناً، فَأَبْغِضْهُ، فَيُبْغِضُهُ جِبْرِيلُ، ثُمَّ يُنَادِي في أَهْلِ السَّماءِ: إنَّ اللّٰه يُبْغِضُ فُلاناً، فَأَبْغِضُوهُ، فَيُبْغِضُهُ أَهْلُ السَّماءِ ثُمَّ تُوضَعُ لـه البَغْضَاءُ في الأَرْضِ).

---

[1] بڕوانە ژمارە (١/٥٩ ز١١).

[2] بوخاری (٣٢٠٩)، موسلیم (٢٦٣٧).

ئــەبو هــورەيرە (ڕەزای خـودای لەسـەر بـێ) فــەرمووی: پێغەمبــەری خــودا (درودی خـوای لەسـەر بـێ) فەرمووی: کاتێ خودای گـەورە بەندەیـەکی خـۆش ویست، بـانگی جوبرائیـل دەکاو دەفەرموێ: ئەی جوبرائیل! خودای گەورە فیسارە بەندەی خۆش دەوێ، دەی تۆیش خۆشت بوێ، ئیتر جوبرائیلیش خۆشی دەوێو جاڕ دەدا بەناو خەڵکی ئاسمانا: خودا فیسارە بەندەی خۆش دەوێ، کەواتە ئێوەیش خۆشتان بوێ، ئیتر خەڵکی ئاسمانیش هەمووی خۆشیان دەوێ، ئەوجا لەناو ئەهلی زەویدا ڕەزای سووكو شیرین دەبێو پەسەند دەکرێ، وەکاتێ ڕقی لەکەسێ بێ جوبرائیـل بـانگ دەکاو دەفـەرموێ: مـن ڕقـم لـە فیسارە کەسـە، دەی تـۆیش ڕقـی لێ بگـرە، جـوبرائیلیش ڕقـی لێ دەگـرێو ئەوجا بەئاسمانا بانگەواز دەکاو دەفەرموێ: خـودای مـەزن ڕقـی لـە فیسـارە کەسـە، ئێوەیش ڕقی لێ بگرن! ئیتر لە زەویشا ڕەزای تاڵ دەبێو لەبەر چاوی خەڵك ئێسکی قورس دەبێ (م).

٣٨٨/٣-[٣]- وعن عائشةَ رضي اللّٰهُ عنها، أَن رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، بعَثَ رَجُلاً عَلَى سريَّةٍ، فَكَانَ يَقْرأُ لأَصْحابِهِ في صلاتِهِمْ، فَيخْتِمُ بِـ { قُلْ هُوَ اللّٰهُ أَحَدٌ } فَلَمَّا رَجَعُوا، ذَكَروا ذلكَ لرسولِ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، فقال: (سَلُوهُ لأِيِّ شَيءٍ يَصْنَعُ ذلكَ ؟) فَسأَلوه، فقَالَ: لأَنَّهَا صِفَةُ الرَّحْمَن، فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَقْرَأَ بِهَا، فقال رسولُ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (أَخْبِرُوهُ أَنَّ اللّٰه تعالى يُحبُّهُ) متفقٌ عليه.

عائیشە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) پیاوێکی کرد بە سەرکردەی لقێكو ناردی بۆ غەزایێ، پیاوەکە هەموو جارێ کە بەرنوێژی بۆ هاوڕێکانی دەکرد، لە کۆتایی قورئان خوێندنی ناو نوێژەکەیا سوورەتی (قل هو الله أحد)ی دەخوێند، کاتێ گەڕانەوە بۆلای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ئـەوەیان گێڕایـەوە بۆی، فەرمووی (درودی خوای لەسەر بێ): پێی بڵێنو لێی بپرسن لەبەر چی وادەکا، کە لێی دەپرسـن دەڵـێ: چـونکە ئـەم سـوورەتە صـیفەتو نیشـانەی خـودای بەخشـندەو میهرەبانە، لەبەر ئەوە حەز دەکەم کە هەمیشە بیخوێنم، جا حـەزرەت (درودی خـوای لەسەر بێ) فـەرمووی: پێـی بڵـێن: کـە خـودایش ئـەوی خـۆش دەوێ لەبـەر ئـەوەی ئـەو سوورەتەی خۆش دەوێ (ش).

٣ بوخاری (٧٣٧٥)، موسلیم (٨١٣).

**بەنـدەی پەسـەندی لای خـوداو بەنـدە**
**لەهەردوو جیهان وەک یەک پەسەندە!**

## ٤٨- باسی هەڕەشە کردن لەو کەسانەی ئازاری پیاوچاکانو لازەبوونانو هەژارانو بیٚ نەوایان دەدەن (باب التحذير من إيذاء الصالحين والضعفة والمساكين)

قال الله تعالى: ﴿والذين يؤذون المؤمنين والمؤمنات بغير ما اكتبسوا فقد احتملوا بهتانا وإثما مبينا﴾الأحزاب/٥٨.

واتە: ئەو کەسانەی کە بە خوتو خۆڕایی بوختان بە پیاو و ژنی موسوڵماناندا دەکەنو بەناڕەوا، بەبێ ئەوەی شتێکیان کردبێ ئازاری دڵیان دەدەن، ئەوە تاوانێکی گەورە دەکەنە ئەستۆی خۆیان.

وقال تعالى: ﴿فأما اليتيم فلاناً تقهر وأما السائل فلاناً تنهر﴾الضحى/١٠.

ئەم ئایەتە لەباسی (٣٣)دا رابوورد.

باسی یازدەهەم فەرموودەی یەکەم: (من عادى لى وليا.....)بڕوانە (١/٥٩ز١١).

باسی (-٣٣-ف-٤+ف-٥+ف-١١+ف-١٢+ف-١٣).

٣٨٩/١- وعن جُندَبِ بن عبد اللّه رضي اللّه عنه قال: قال رسول اللّه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (مَنْ صَلّى صَلاَةَ الصُّبْحِ، فَهُوَ في ذِمَّةِ اللّه، فَلا يَطْلُبَنَّكُمْ اللّهُ مِنْ ذِمَّتِهِ بِشَيءٍ، فَإِنَّهُ مَنْ يَطْلُبْهُ مِنْ ذِمَّتِهِ بِشَيءٍ، يُدْرِكْهُ، ثُمَّ يَكُبُّهُ عَلى وَجْهِهِ في نَارِ جَهَنَّمَ) رواه مسلم.

بڕوانە ژمارە (١١/٢٣٢ز-٢٧)باسی (-٢٧-ف-٤+ف-٥+ف-١١+ف-١٢+ف-١٤).

**خاسـانی خـودا زۆریـان هـەژارن**
**ئازەاریـان بـدەی بـۆ زارت ژارن!**

## ٤٩- باسی ئەوەی کە شەرع ظاهیر بینەو حوکم بەوە دەکرێ کەبەدەرەوەیەو لەبەرچاوە، وەنهێنی دڵو رازی دەروون چییەو چی نییە رووبەرووی خودا دەکرێتەوە (باب إجراء أحكام الناس على الظاهر وسرائرهم الى الله)

قال تعالى: ﴿فإن تابوا وأقاموا الصلاة وآتوا الزكاة فخلوا سبيلهم﴾التوبة/٥.

واتـە: جـا ئەگـەر لەخراپـەی خۆیـان پەشیمان بوونـەوەو لـەکوفرو بـێ دینـی دەستیان هەڵگرتو تەوبەی بەڕاستیان کردو بەڕێكو پێکی نوێژیان کردو بەباشی

زەکاتیان لەماڵەکانیان دا ئیتر دەستیان لێ هەڵبگرن‌و ڕێگەیان پێ مەگرن‌و وازیان لێ بێنن.

٣٩٠/١-[١]- وعن ابن عمر رضي اللّه عنهما، أن رسولَ اللّه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لا إلهَ إلاَّ اللّه، وَأَنَّ مُحَمَّداً رسولُ اللّهِ، ويُقِيمُوا الصَّلاةَ، وَيُؤتوا الزَّكاةَ، فَإذَا فَعَلُوا ذلكَ، عَصَمُوا مِنِّي دِماءَهُمْ وَأَمْوالَهُمْ إلاَّ بِحَقِّ الإسْلام، وحِسابُهُمْ عَلى اللّه تعالى) متفقٌ عليه.

ئیبن‌و عومەر (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: فەرمانم پێ کراوە: کە شەڕبکەم لەگەڵ ئەم خەڵکەدا هەتا شایەتمان دێنن‌و بەزمان دەڵێن: أشهد أن لا الـه الا الله وأن محمد رسول الله. شایەتی دەدەم کە هەر خودا خودایەو خودای تر نییە، ئەگەر بشبێ ڕاست نییەو درۆیە، وە هەروەها شایەتی دەدەم کە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا پێغەمبەری خودایە، وە بەڕێك‌و پێك‌و نوێژ بکەن‌و زەکات بدەن، ئیتر ئەوەی ئاوا بکا ئەوا سەرو ماڵی خۆی لەمن قەدەغە دەکاو خوێن‌و ناموسی‌و ماڵی لەمن حەرام دەبێ، مەگەر لەسەر حەقی شەرعی، وە ئیتر حیساب‌و لێپرسینەوەی نیازی دڵی لەو دنیا لەسەر خودایە (ش).

٣٩١/٢-[٢]- وعن أبي عبدِ اللّه طَارِق بن أُشَيْم، رضي اللّه عنه، قال: سمعتُ رسول اللّه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم يَقُولُ: (مَنْ قال لا إلهَ إلاّ اللّهُ محمدا رسولُ اللّه، وكَفَرَ بِما يُعْبَدُ مِنْ دُونِ اللّهِ، حَرُمَ مالُهُ وَدَمُهُ، وَحِسابُهُ على اللّه تعالى) رواه مسلم.

طاریقی کوڕی ئەشیەم (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ژنەوتم لەزاری حەزرەت خۆی (درودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: هەرکەسێ بەزمان بڵێ: لا اله الا الله، وە بڕوای نەبێ بەو شتانەی کە ناموسوڵمان دەیپەرستێ، ئیتر سەرو سامانی، خوێن‌و ماڵی حەرام دەبێ، لێپرسینەوەی نیازی دڵی لەو جیهان لەسەر خودایە (م).

٣٩٢/٣-[٣]- وعن أبي مَعْبدٍ المِقْدَادِ بن الأَسْوَدِ، رضي اللّه عنه، قال: قلت لرسُول اللّه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم: أَرَأَيْتَ إنْ لَقِيتُ رَجُلاً مِنَ الكُفّارِ، فَاقْتَتَلْنا، فَضَرَبَ إحْدَى يدَيَّ

١ بوخاری (٢٥)، موسلیم (٢٢).

٢ موسلیم (٢٣).

٣ بوخاری (٤٠١٩)و (٦٨٦٥)و موسلیم (٩٥).

بالسَّيْفِ، فقطعها ثُمَّ لاذَ مِنِّي بِشَجَرَةٍ، فقال: أَسْلَمْتُ لِلَّهِ، أَأَقْتُلُهُ يا رسولَ اللَّهِ بَعْدَ أَنْ قالها ؟ فقال: «لا تَقْتُلْهُ»، فَقُلْتُ يا رسُولَ اللَّهِ قطعَ إحدى يَدَيَّ، ثُمَّ قال ذلكَ بَعْدَما قطعَها ؟ فقال: «لا تَقْتُلْهُ، فإنْ قَتَلْتَهُ، فإنَّهُ بمنزِلَتِكَ قَبْلَ أنْ تَقْتُلَهُ. وَإِنَّكَ بِمَنْزِلَتِهِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ كلِمَتَهُ التي قال» متفقٌ عليه.

میقداری كوڕی ئەسوەد (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بە پێغەمبەرم گوت: ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو: ئەگەر تووشی پیاوێکی ناموسوڵمان بووم، وە بوو بەشەڕمان ئەو دەستی خۆی وەشاندو دای لەدەستێکمو دەستی پەڕاندووم، لەپاشا من زۆرم بۆ هێناو لەترسی من خۆی دایە پاڵ درەختێو گووتی: بڕوام هێنا بەخوداو موسوڵمان بووم، ئایا لەم حاڵەدا بیکوژم یا نا؟ فەرمووی: مەیکوژە. عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا دەستێکی پەڕاندم ئەوجا وا دەڵێ؟! فەرمووی: مەیکوژە، خۆئەگەر لەپاش گوتنی ئەو وشەیە سوور زانیت کە بەڕاستیەتیو بۆ فێڵو شتی وا نییە بیکوژیت ئەوە ئەو لەجێگەی پایەی تۆدا دەبێ بەر لەوەی تۆ ئەو بکوژیتو وەك لەوە پێشی تۆ خوێنی پارێزراوو خاوەن ڕێز دەبێ، بەڵام تۆ وەك پێش ئیسلام بوونی ئەو خوێنت بەهەقدەرەکانی ئەو کوژراوە ڕەوایە! (ش).

٣٩٣/٤–[٤] وعن أُسامةَ بن زَيْدٍ، رضي اللَّه عنهما، قال: بعثَنا رسولُ اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم إلى الحُرَقَةِ مِنْ جُهَيْنَةَ، فَصَبَّحْنا الْقَوْمَ عَلى مِياهِهِمْ، وَلحِقْتُ أَنا وَرَجُلٌ مِنَ الأَنْصارِ رَجُلاً مِنهُمْ فَلَمَّا غَشِيناهُ قال: لا إلـهِ إلاَّ اللَّـه، فَكَفَّ عَنْهُ الأَنْصاريُّ، وَطَعَنْتُهُ برُمحِي حَتَّى قَتَلْتُهُ، فَلَمَّا قَدِمْنا المَدِينَةَ، بلَغَ ذلِكَ النبـي صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، فقال لي: «يا أُسامةُ أَقتَلْتَهُ بَعْدَ ما قَالَ: لا إلهَ إلاَّ اللَّهُ ؟ قلتُ: يا رسولَ اللَّهِ إنَّما كَانَ مُتعَوِّذاً، فقَالَ: «أَقَتَلْتَهُ بَعْدَ مَا قَالَ لا إلهَ إلاَّ اللَّهُ؟»» فَما زَالَ يُكَرِّرُها عَلَيَّ حَتَّى تَمَنَّيْتُ أَنِّي لَمْ أَكُنْ أَسْلَمْتُ قَبْلَ ذلِكَ الْيَوْمِ. متفقٌ عليه.

وفي روايةٍ: فَقالَ رسولُ اللَّهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «أَقَالَ: لا إلـهَ إلاَّ اللَّـهُ وَقَتَلْتَـهُ ؟»، قلتُ: يا رسولَ اللَّهِ، إنَّمَا قَالَهَا خَوْفاً مِنَ السِّلاحِ، قال: «أَفَلا شَقَقْتَ عَنْ قَلْبِهِ حَتَّى تَعْلَمَ أَقالَها أَمْ لا؟»» فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا حَتَّى تَمَنَّيْتُ أَنِّي أَسْلَمْتُ يَوْمئذٍ.

---

٤ بوخاری (٤٢٦٩)، موسلیم (٩٦) رقم (١٥٨)و (١٥٩).

**ئوسامەی کوڕی زەید** (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **ناردینی بۆ غەزای خێڵی حورقە (کە لە هۆزی جوهەینەن) وە لەگەڵ دەمە دەمی بەیانا دامان بەسەریانا، منو پیاوێکی ئەنصاری نیشتینە سەر پیاوێ لەوان، تا بەرە بەرە تەنگمان پێ هەڵچنی ئەوجا گوتی: لا الە الا اللە. ئیتر ئەنصاریەکە وازی لێ هێنا، بەڵام من بە ڕمەکەم دامگرت تا کوشتم، جا کە گەڕاینەوە بۆ مەدینە ئەمە گەیشتەوە بە پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی پێم: ئەی ئوسامە! لەپاش ئەوەی کە گوتی: لا الە الا اللە، چۆن کوشتت؟ منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! من وا دەزانم مەبەستی ئەوە بوو خۆی لەکوشتن قوتار بکا. فەرمووی: چۆن کوشتت لەپاش وتنی ئەو وشەیە؟ ئیتر پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **ئەوەندە ئەم وشەیەی دووبارە کردەوە، تەنانەت خۆزگەم خواست کە هەتا ئەو ڕۆژە موسوڵمان نەبوومایە (ش). لە گێڕانەوەیەکا: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: کە گوتی: لا الە الا اللە، ئیتر چۆن کوشتتو چۆن دەستت تێی چوو کە بیکوژی؟ گوتم: قوربان! لە ترسی تیغ وای گوت. فەرمووی: جا نەدەبوو کە دڵی هەڵبدڕی تا بزانی لەبەر ئەوە وای گوتوە یا نا؟ ئیتر پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **هەر ئەم وشەیەی دووبارە دەکردەوە تا لەدڵەوە خۆزگەم خواست کە لەو ڕۆژەدا ئیسلام ببومایە، تا ئەم کەتنەم بە خۆم نەدایێ.**

٣٩٤/٥-[٥]- وعن جُنْدبِ بنِ عبد اللّه، رضي اللّه عنه، أَنَّ رسولَ اللّـه صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم بعثَ بعْثاً مِنَ المُسْلِمِينَ إِلى قَـوْمٍ مِـنَ المُشْـرِكِينَ، وَأَنَّهُـمْ الْتَقَـوْا، فَكَـانَ رَجُـلٌ مِـنَ المُشْرِكِينَ إذا شَاءَ أَنْ يقْصِدَ إِلى رَجُلٍ مِنَ المُسْلِمِينَ قَصَدَ لَهُ فَقتَلَهُ، وأَنَّ رَجُلاً مِن المُسْلِمِينَ قَصَدَ غَفْلَتَهُ، وَكُنَّا نَتَحَدَّثُ أَنَّهُ أُسامَةُ بْنُ زَيْدٍ فلمَّا رَفَعَ عليه السَّيْفَ، قال: لا إله إلاَّ اللّـهُ، فقتَلَهُ، فَجاءَ الْبَشِيرُ إلى رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم، فَسأَلَهُ، وأَخْبَرَهُ، حَتَّى أَخْبَرَهُ خبر الرَّجُلِ كَيْفَ صنَعَ، فَدَعَاهُ فَسأَلَهُ، فقال: (لِمَ قَتَلْتَـهُ ؟) فَقَـالَ: يـا رسـولَ اللّـهِ أَوْجَـعَ فِي المُسْلِمِينَ، وقَتلَ فُلاناً وفُلاناً وسَمَّى له نَفراً وإِنِّي حَمَلتْ عَلَيْهِ، فَلَمَّا رَأَى السَّيْفَ قـال: لا إله إلاَّ اللّهُ. قال رسولُ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (أَقَتَلْتَهُ ؟) قـال: نَعـمْ، قـال: (فَكيْـفَ تَصْنَعُ بلا إِله إِلاَّ اللّهُ، إِذا جاءَت يوْمَ القيامَةِ ؟) قَال يـا رسـولَ اللّـه اسْـتَغْفِرْ لـي. قـال:

---

٥ موسليم (٩٧).

(وكيفَ تَصْنَعُ بِلا إله إلاّ اللّهُ، إذا جاءَت يَوْمَ القِيامَةِ ؟) فَجعَلَ لا يَزِيدُ عَلى أنْ يَقُولَ: (كيفَ تَصْنَعُ بِلا إِلَهَ إلاّ اللّهُ إذا جاءَتْ يَوْمَ القِيامَةِ) رواه مسلم.

جوندوبی کوڕی عەبدوڵلا فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەشکرێکی لە موسوڵمانان نارد بۆ سەر هۆزێ لە بتپەرستان، لە شوێنێکا بەرەنگاری یەك بون پیاوێ لە بتپەرستەکان پەلاماری هەر پیاوێ لە موسوڵمانەکانی دەدا دەیکوشت، تا پیاوێ لە موسوڵمانان فرسەتی لێ هێناو ئاگای لەخۆی نەبوو پەلاماری دا، کە شمشێرەکەی لێ ڕاست کردەوە کابرا گوتی: لا الـه الا الله. ئەویش کوشتی، لەناو خۆمانا واقاو بوو کە ئەو پیاوەی فرسەتی لێ هێناو کابرای کوشت ئوسامەی کوڕی زەید بوو، کاتێ مژدە بەر مزگێنی دا بە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) پرسیاری ڕووداوەکەی لێ کرد، ئەویش چۆن بوو ئاوا بۆی گێڕایەوە، وە سەرگوزشتەکەی کابراکەشی بۆ گێڕایەوە کەچی کردبوو، وە چۆن کوژرا، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) ئوسامەی بانگ کردو لێی پرسی‌و فەرمووی: بۆ کوشتت؟ ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێشی گەیاندبوو بە موسوڵمانان، فیسارەکەس‌و فیسارەکەسی کوشت- وە ناوی چەند شەهیدێکی هەڵدا کە هەموو بەدەستی ئەو کابرایە کوژرابوون- ئیتر منیش هەڵمەتم بۆ بردو تەنگم پێ هەڵچنی، وەلێ کە چاوی بە شمشێری ڕووت کەوت بەسەر سەریەوە بوو، زانی وا سوور دەکوژرێ گوتی: لا الـه الا الله، بە ئومێدی ئەوەی کە دەستی من سارد ببێتەوەو نەیکوژم، فەرمووی: جا کوشتت؟ گوتی: بەلێ، کوشتم، فەرمووی: جا چی لە (لا اله الا الله) دەکەیت، ئەگەر لە ڕۆژی قیامەتا بێ لەلای خودا شکاتت بکا؟ گوتی: قوربان! داوای لێ خۆشبوونم لەخودا بۆ بکە، بەلام پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) هەموو جارێ لەمە زیاتری نەدەفەرموو: جاچی لە (لا الـه الا الله) دەکەیت، ئەگەر لە ڕۆژی قیامەتا بێت‌و لەسەرت ببێ بە داواکارو لەلای خودا شکاتت لێ بکا! (م).

٣٩٥/٦-[٦] وعن عبدِ اللّه بنِ عتبة بن مسعودٍ قال: سَمِعْتُ عُمَر بْنَ الخَطّابِ، رضي اللّه عنه يقولُ: (إنَّ ناساً كَانُوا يُؤْخَذُونَ بالوَحْيِ في عَهْدِ رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم، وإِنَّ الوَحْيَ قَدِ انْقَطَعَ، وإِنَّمَا نَأْخُذُكُمُ الآنَ بِما ظَهَرَ لَنَا مِنْ أَعْمَالِكُمْ، فَمَنْ أَظْهَرَ لَنا خَيْراً،

٦ بوخاری (٢٦٤١).

أَمَّنَّاهُ، وقرَّبناه وَلَيْس لنَا مِنْ سَرِيرَتِهِ شيءٌ، اللّٰهُ يُحاسِبُهُ في سريرَتِهِ، ومَنْ أَظْهَرَ لَنا سُوءاً، لَمْ نأْمنْهُ، وَلَمْ نُصَدِّقْهُ وإِنْ قال إِنَّ سَرِيرَتَه حَسنَةٌ) رواه البخاري.

عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعوود فەرمووی: لە عومەری کوڕی خەططابم بیست ئەیفەرموو:هەندێ کەس لەسەردەمی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێ) سرووش پەردەی لە روو هەڵدەماڵین‌و پێوە دەبوون، وەلێ ئێستا سرووش کۆتایی هاتووەو لەپاش مەرگی حەزرەت ئیتر وەحی بۆ کەسی تر نایێ، لەبەر ئەوە ئێستا بەپێی کردەوەی لەبەر چاوتان رەفتارتان لەگەڵ دەکەین، جا ئەوەی چاکەی لێ ببینین ئەوا متمانەی پێ دەکەین‌و لەخۆمانی نزیك دەکەینەوە، وە بەهیچ جۆرێ هەقمان نییە بەسەر نیازو رازی دڵیەوە، خودا خۆی بەپێی نهێنی دەروونی‌و نیازی دڵی هەق‌و حسێبی لەگەڵ دەکا، وەلێ ئەوەی خراپەی لێ ببینین نە متمانەی پێ دەکەین‌و نە لەخۆمانی نزیك دەکەینەوە، با خۆشی لافی ئەوە لێ بدا: کە گوایە دڵ‌و دەروونی باشەو نیازی پاکە (ب):

بەپێی رووکارە بڕیاری نابین
شەرع ظاهیر بینە، نەوەک زەڕەبین!

## ٥٠- باسی ترسان لەقاری خودا (باب الخوف)

قال الله تعالى: ﴿وإياي فارهبون﴾البقرة/٤٠.

واتە: بەباشی ترسی خواتان هەبێ.

وقال تعالى: ﴿إن بطش ربك لشديد﴾البروج/١٢.

واتە: دڵنیابە کە خودای تۆ زۆر بەتوندو سەختی پەلی خۆی دەوەشێنێ!

وقال تعالى: ﴿وكذلك خذ ربك إذا أخذ القرى وهي ظالمة إن أخذه أليم شديد، إن في ذلك لآية لمن خاف عذاب الآخرة ذلك يوم مجموع له الناس وذلك يوم مشهود وما نؤخره إلا لأجل معدود، يوم يأت لا تكلم نفس إلا بإذنه فمنهم شقي وسعيد، فأما الذين شقوا ففي النار لهم فيها زفير وشهيق﴾هود/١٠٢-١٠٦.

وقال تعالى: ﴿ويحذركم الله نفسه﴾آل عمران/٢٨.

وقال تعالى: ﴿يوم يفر المرء من أخيه وأمه وأبيه وصاحبته وبنيه لكل امرء منهم يومئذ شأن يغنيه﴾عبس/٣٤-٣٧.

وقال تعالى: ﴿يا ايها الناس اتقوا ربكم إن زلزلة الساعة شئ عظيم، يوم ترونها تذهل كل مرضعة عما أرضعت وتضع كل ذات حمل حملها وترى الناس سكارى وما هم بسكارى ولكن عذاب الله شديد﴾الحج/١-٢.

وقال تعالى: ﴿ولمن خاف مقام ربه جنتان﴾الرحمن/٤٦.

وقال تعالى: ﴿ وأقبل بعضهم على بعض يتساءلون، قالوا إنا كنا قبل في أهلنا مشفقين، فمن الله علينا ووقانا عذاب السموم، إنا كنا من قبل ندعوه إنه البر الرحيم﴾الطور/٢٥.

والآيات في الباب كثيرة جدا معلومات، والغرض الإشارة الى بعضها وقد حصل.
مەبەستی سەرەکی لەم ئایەتە پیرۆزەانە لەم شوێنەدا ئەمەیە:

ئەی خەڵکینە! خودا بێ باکە، لە پێش ئێوەوە چەندەها وڵاتی لە ڕێ دەرچووی خاپوور کردووەو تەفرو توونای کردوون، ئێستاش هەرکاتێ ویستی وڵاتێ بەهۆی زوڵمو زۆرو ناهەقییەوە کاول بکا وەك لەمەوپێش کردوویەتی، زۆر بەسەختی دەیهاڕی بەسەر یەکا، هەتا ئەم تۆڵە سەختە ببێ بە پەندو عیبرەت بۆ ئەو کەسانەی کە لەخودا دەترسنو مەترسی سزای ڕۆژی دواییان هەیە، کە ڕۆژێکی وایە ئەو خەڵکە هەموو لەوێ حازرن، ئەو ڕۆژە کاتی دیاریکراوی خۆی هەیە، وەلێ ئەو ڕۆژە کەهات زۆر بەسامە، کەس ڕادەی ناکەوێ کە قسە بکا، کەس ناتوانێ کە نقە بکا، مەگەر خودا ڕێگەی بدا، ئەو خەڵکە هەیانە نەگبەتو بەد بەختن، وە هەیانە خودا پێدراونو بەختەوەرو خۆش بەختن، دیارە کە جێگەی بەد بەختەکان ئاگری دۆزەخەو لەناویا گاهـ هەراو زەناو هەناسە بڕکێیانەو گاهـ نکەنكو هەناسەی سەردیانە، خودا دەتان ترسێنێ لە قاری سەختی خۆی، بزانن ڕۆژێکی سەختی واتان لەبەر، پیاو نایپەڕژێتە سەر برای خۆی، نایپەڕژێتە سەر دایکی، سەر ژنی، سەر کوڕی خۆی، سەر هاوسەری خۆی، نایپەڕژێتە سەر باوکی، ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی وایە هەموو کەسێ پلکاوە بە دەردی خۆیەوە، هەقی بەسەر کەسی ترەوە نییە. ئەی موسوڵمانەکان! لە خودا بترسن، بیری ئەو ڕۆژە سەختانەتان هەبێ کە لە پێشتانن، کە یەکێکیان هاتنی ڕۆژی قیامەتە، کە دەبێ بەفەرتەنەیەکی وا بەردار بەر دەخا، دایك نایپەڕژێتە سەر منداڵی کۆرپەی خۆی، ئەو خەڵکە وا سەرگەردانو پەرۆشو غەمبار دەبن، دەحەپەسێنو سەرسام دەبن

**دەڵێی سەرخۆشن! ئەویش لەتاو توندو تیژی سزای خودا، لەلایەکی تریشەوە ترسی خودا هەروەك دەبێ بەهۆی ئەوە لەقاری خودا بتان پارێزێ، دەشبێ بەهۆی شاد بوون بەبەهەشتی خودا، بۆیە بەهەشتیەکان لەبەهەشتا شانازی دەکەنو باسی ژیانی جیهانی خۆیان لەیەکتری دەپرسنو دەڵێن: ئێمە لەدنیادا کە لەناو کەسوکاری خۆمانا بووین هەمیشە لە خودا دەترساین، ئیتر خودا بە میهری خۆی دەستی رێزی لێ نایەنو نازی گرتینو لێمان خۆش بوو، وە لە گرەی ئاگری دۆزەخ پاراستینی، ئێمە لە دنیادا خودا پەرست بووین، بەڕاستی خودا خودایەکی چاکەو میهرەبانو بەڕەحمە.**

**وأما الآحاديث فكيرة جدا فنذكر منها طرفا وبالله التوفيق:**

٣٩٦/١-[١]- عن ابنِ مسعودٍ، رضي اللّه عنه، قال: حدثنا رسولُ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّم، وهو الصَّادِقُ المصدوقُ: (إنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ في بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْماً نُطْفَةً، ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مثْلَ ذلِكَ، ثُمَّ يُرْسَلُ المَلَكُ، فَيَنْفُخُ فِيهِ الرُّوحَ، وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِماتٍ: بِكَتْبِ رِزْقِهِ، وَأَجلِهِ، وَعمَلِهِ، وَشَقيٌّ أَوْ سعِيدٌ. فَوَ الَّذِي لا إله غَيْرُهُ إنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الجَنَّةِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وبَيْنَهَا إلاَّ ذِراعٌ، فَيَسْبَقُ عَلَيْهِ الْكِتابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، فَيَدْخُلُهَا، وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إلاَّ ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الجَنَّةِ فَيَدْخُلُهَا) متفقٌ عليه.

**عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: پێغەمبەری راستگۆ، کە فەرمایشتی جێگەی باوەڕە** (درودی خوای لەسەر بێ)**: هەر یەکێ لە ئێوە کە خودا درووستی دەکا، چل ڕۆژ بە تۆمەتی (نوطفەیی) لەسکی دایکیا کۆدەکرێتەوەو دەمەێنێتەوە ئینجا بە چل ڕۆژی تریش دەبێ بە پارچە خوێنێکی مەییو، ئنجا بە چل ڕۆژی تریش دەبێ بە پارچە گۆشتێ بەقەد پاروێ، ئنجا گیانی بەبەردا دەکرێ، جا خودای گەورە فەرمان دەکا بەو فریشتەیە کە گیانی دەکا بەبەریا، کە ئەم چوار وشەیە بنووسێ: یەکەم: رزقو رۆزی چیەو چی نییە، دووەم: ئەجەلو ئاکامەی کەیەو کەی نییە، سێیەم: کارو کردەوەی، چوارەم: بەد بەختو بەدکار دەبێ یا**

---

١ بوخاری (٣٢٠٨)، موسلیم (٢٦٤٣).

کامەران و بەختیار دەبێ، دەسا بەو تاقە خودایە کە هەر خۆی خودایە کەسی وا هەیە کردارو ڕەفتاری وەك کردارو ڕەفتاری بەهەشتی وایە، لەخەڵك وایە کە بەهەشتییە، بەڵام نامەی چارەنووسی دەست پێشکەری لێ دەکاو دەست دەکا بەکردنی کاری خەڵکی دۆزەخو دەچێتە ناو دۆزەخەوە، کەسی واشتان هەیە کە بەکردارو ڕەفتار بێ لە دۆزەخی دەچێ، لەخەڵك وایە جەهەنەمییە، بەڵام نامەی چارەنووسی پێش دەستی لێ دەکاو خاتیمەی بەخێر دەگێڕێو ئاخر خێر دەبێو دەست دەکا بە کردنی کردەوەی باشو دەچێتە ناو بەهەشتو دەبێ بە بەهەشتی! (ش).

٣٩٧/٢-[٢]- وعنه قال: قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (يُؤْتَى بِجَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لَهَا سَبْعُونَ أَلْفَ زِمَامٍ، مَعَ كُلِّ زِمَامٍ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ يَجُرُّونَهَا) رواه مسلم.

دیسان فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لە ڕۆژی حەشردا کە دۆزەخ دێنن حەفتا هەزار هەوساری هەیە، وە هەر هەوسارێکی بە حەفتا هەزار فریشتە رایدەکێشن! (م).

٣٩٨/٣-[٣]- وعن النُّعْمَان بن بَشِير، رضي اللّٰه عنهما، قال: سمِعتُ رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، يقول: (إنَّ أَهْوَنَ أَهْلِ النَّارِ عَذَاباً يَوْمَ الْقِيامَة لَرَجُلٌ يُوضَعُ فِي أَخْمَصِ قَدميْهِ جَمْرَتَانِ يغْلي مِنْهُمَا دِمَاغُهُ مَا يَرى أَنَّ أَحداً أَشَدُّ مِنْه عَذَاباً، وَإِنَّه لأَهْوَنُهُمْ عذَاباً) متفق عليه.

نوعمانی کوڕی بەشیر (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: لە ڕۆژی قیامەتا ئەوەی لە هەموو کەسێ سزای سووکترە کابرایەکە دوو پشکۆ ئاگر دادەنێن لەژێر سنگی هەردوو پێیدا، یا لە ژێر بەری پێیدا لەناو چاڵاییەکەیدا، ئیتر مێشکی بەتینی ئەو سکڵانە وەك مەنجەڵی سەر ئاگر دەکوڵێ، لەخۆی وایە کەکەس وەك ئەو سزای سەخت نییە، وەلێ لە ڕاستیدا لەناو دۆزەخیەکانا کەس لەو سزای سووکتر نییە (ش).

---

٢ موسلیم (٢٨٤٣).

٣ بوخناری (٦٥٦١)، موسلیم (٢١٣).

٣٩٩/٤–[٤]– وعن سَمُرةَ بنِ جُنْدبٍ، رضي اللّه عنه، أن نبيَّ اللّه صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلّم قال: (مِنْهُمْ مَنْ تَأْخُذهُ النَّارُ إلى كَعْبَيهِ، ومِنْهُمْ من تأْخُذُهُ إلى رُكْبَتَيْهِ، ومِنْهُمْ من تَأْخُذُهُ إلى حُجْزَتِهِ، ومِنْهُمْ منْ تَأْخُذُهُ إلى تَرْقُوَتِهِ) رواه مسلم.

**سەموورەی کوڕی جوندوب** (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: لە دۆزەخا دۆزەخیی وا هەیە ئاگر دەدا لە قولەپێی، هی وا هەیە ئاگر دەدا لە ئەژنۆی، هی وا هەیە تا پشتێنەی نوقم دەبێ لەناو ئاگردا، هی واش هەیە تا بینەقاقای لە ئاگردا دەچەقێ! (م).**

٤٠٠/٥–[٥]– وعن ابنِ عمر رضي اللّه عنهما أن رسولَ اللّه صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلّم قال: (يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ العالَمِينَ حَتَّى يَغِيب أحَدُهُمْ في رَشْحِهِ إلى أَنْصَافِ أُذُنَيهِ) متفقٌ عليه.

**ئیبن و عومەر** (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: کاتێ مەردوم لە گۆڕ هەڵدەستنەوە دەچن بۆ دەشتی مەحشەر، هی وایان هەیە تا بناگوێی لە ئارەقی خۆیا نوقم دەبێ! (ش).**

٤٠١/٦–[٦]– وعن أنس، رضي اللّه عنه، قال: خَطَبَنا رَسول اللّه صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلّم، خُطْبَةً ما سَمِعْتُ مِثْلَها قطُّ، فقال: (لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قلِيلا ولبَكَيْتمْ كَثِيراً) فَغَطَّى أَصْحابُ رسول اللّهِ صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلّم وجُوهَهمْ، وَلَهُمْ خَنِينٌ. متفقٌ عليه.

وفي رواية: بَلَغَ رسولَ اللّه صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلّم عَنْ أَصْحابِهِ شَيءٌ فَخَطَبَ، فقال: (عُرِضَتْ عَلَيَّ الجَنَّةُ والنَّارُ، فَلَمْ أَرَ كَاليَوْمِ في الخَيْرِ وَالشَّرِّ، ولَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعلَمُ لَضحِكْتُمْ قلِيلاً، وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيراً) فَما أَتَى عَلَى أَصْحَابِ رسول اللّه صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلّم يومٌ أَشَدُّ مِنْهُ غَطَّوْا رُؤُسهُمْ وَلَهُمْ خَنِينٌ.

**ئەنەس** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دوانێکی جوانی بۆ داین هەرگیزاو هەرگزیز دوانی وا بەتام و چێژم نەبیستووە، فەرمووی: ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بیزانن کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان! ئیتر یارانی**

---

٤ موسلیم (٢٨٤٥).

٥ بوخاری (٦٥٣١)و موسلیم (٢٨٦٢).

٦ بوخاری (٤٦٢١)، موسلیم (٢٣٥٩).

حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دایان لە پرمەی گریانو سەری خۆیان داپۆشی! (ش) لە گێڕانەوەیەکدا: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەلایەنی یارانیەوە شتێکی پێگەیشتەوە وتارێکی داو فەرمووی: بەهەشتو دۆزەخم پێ نیشان دران، لەبارەی خێرو شەڕەوە وەك ئەمرۆ خێرم نەدیوە، ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بیزانن کەم پێدەکەنینو زۆر دەگریان. ڕۆژی وا سەختو دیژواری تر لە هاوڕێیانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) رووی نەداوە، ئەوەندە پەرۆشو پەرێشان بوون هەموو سەری خۆیان داپۆشی.

٤٠٢/٧-[٧] وعن المِقْدَاد، رضيَ اللّه عنه، قال: سَمِعْتُ رسولَ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يَقُولُ: (تُدْني الشَّمْسُ يومَ القِيامَةِ مِنَ الخَلْقِ حتَّى تَكُونَ مِنْهُمْ كَمِقْدَارِ مِيل) قَالَ سُلَيمُ بْنُ عَامِرِ الرَّاوِي عنْ المِقْدَاد: فَوَاللّهِ مَا أَدْري ما يَعْني بالميـلِ، أَمَسَـافَةَ الأَرضِ أَمِ الميـلِ الَّـذي تُكْتَحَلُ بِهِ العيْنُ (فَيكُونُ النَّاسُ عَلَى قَدْرِ أَعْمالِهِمْ في العَرَق، فَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إلى كعْبَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إلى رُكْبَتَيْهِ، ومِنْهُمْ منْ يَكون إلى حِقْوَيْهِ ومِنهُمْ مَنْ يُلْجِمُهُ العَرَقُ إلجاماً) وأَشَارَ رسول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم بِيدِهِ إلى فِيه. رواه مسلم.

میقداد (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لە حەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو: لە ڕۆژی قیامەتا خۆر لە دروستکراوانی خوا نزیك دەبێتەوە بە ئەندازەی میلێ سولەیمی کوڕی عامیر کە لە میقدادەوە فەرموودەکە دەگێڕێتەوە فەرمووی: بەخودا نازانم مەبەستی لە میل ئەو میلەیە کە زەوی پێ دەپێورێ، یا ئەو میلەیە کە چاوی پێ دەڕێژرێو پێشی دەگوترێ: میلچیوك. بچینەوە سەر فەرمایشتەکەی حەزرەت، فەرمووی: خۆر لە مەخلوقات نزیك دەبێتەوە بەئەندازەی میلێ، ئیتر هەموو کەسێ بە پێی کردەوەی خۆی لەناو ئارەقی خۆیا دەبێ، هەیانە تا هەردوو ئەژنۆی، هەیانە تا کورتە کەلەکەی، هەشیانە تا لالغاوەی ئارەق پەنگ دەخواتەوە! (م).

٤٠٣/٨-[٨] وعن أبي هريرة، رضيَ اللّه عنه، أنَّ رسولَ اللّهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (يَعْرَقُ النَّاسُ يَوْمَ القِيامَةِ حتَّى يذْهَب عَـرَقُهُمْ في الأَرْضِ سَـبْعِينَ ذِراعـاً، ويُلْجِمُهُـمْ حَتَّى يَبْلُغَ آذانَهُمْ) متفقٌ عليه.

---

٧ موسلیم (٢٨٦٤).

٨ بوخاری (٦٥٣٢)، موسلیم (٢٨٦٣).

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: لە ڕۆژی ژیانەوەدا ئەو خەڵکە دەکەونە سەخڵەتیەکی واوە ئارەق دەکەن، ئارەقێکی زۆر زۆر، تەنانەت حەفتا باڵ ئارەقیان بەناخی زەویدا دەچێتە خوارەوە، لەلایەکی تریشەوە پەنگاوی ئارەقی لەشیان وا ئەوق دەکاتەوە تا دەگاتە لالغاوەیان، گەلێ جار دەگاتە بناگوێیان! (ش).**

٤٠٤/٩-٩- وعنه قال: كنا مع رسول اللّٰه صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم إذ سَمِعَ وَجْبَةً فقال: (هَلْ تَدْرُونَ ما هذا؟» قُلْنَا: اللّٰه وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قال: هذا حَجَرٌ رُمِيَ بِهِ في النَّارِ مُنْذُ سَبْعِينَ خَرِيفاً فَهُوَ يهْوِي في النَّارِ الآنَ حَتَّى انْتَهَى إِلى قَعْرِهَا، فَسَمِعْتُمْ وجْبَتَها» رواه مسلم.

**دیسان فەرمووی: جارێ لەخزمەتی حەزرەتدا بووین، تەپپەیەکی ژنەوت، فەرمووی: دەزانن ئەم گرمەیە چی بوو؟ گوتمان: خوداو پێغەمبەری خودا خۆیان باش دەزانن! فەرمووی: ئەمە بەردێ بوو، حەفتا ساڵە فڕەدراوەتە ناو دۆزەخەوە، لەوساوە هەر بەناو دۆزەخا بەردەبێتەوە تا ئێستا لەم دەمەدا گەیشتە بنیو دای لە بنەکەیو ئەوە دەنگی ترپەی ئەو بوو کە گوێتان لێی بوو (م-خ).**

٤٠٥/١٠-١٠- وعن عَدِيِّ بنِ حاتمٍ، رضي اللّٰه عنه، قال: قال رسولُ اللّٰه صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (ما مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إلاَّ سَيُكَلِّمُهُ رَبُّهُ لَيْس بيْنَهُ وبَيْنَهُ تَرْجُمَانٌ، فَيَنْظُرُ أَيْمنَ مِنْهُ، فلا يَرَى إلاَّ ما قَدَّمَ، وينظر أشأم منه فلا يرى إلا ما قدم، وينْظُرُ بيْنَ يَدَيهِ، فَلا يَرى إلاَّ النَّارَ تِلْقَاءَ وَجهِهِ، فاتَّقُوا النَّارِ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ) متفقٌ عليه.

**تەرجەمەی ئەم فەرموودەیە ڕابوورد لەباسی (الحث على الأزدياد من الخير= ز-١٣ف- ١٣٩/٢٣).**

٤٠٦/١١-١١- وعن أبِي ذَرّ، رضي اللّٰهُ عنه، قال: قال رسولُ اللّٰه صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (إِنِّي أَرى مالا تَرَوْنَ، أَطَّتِ السَّماءُ وحُقَّ لَهَا أَنْ تَئِطَّ، مَا فِيهَا موْضعُ أَرْبعِ أَصَابعَ إِلاَّ وَمَلَكٌ واضِعٌ جبهتهُ ساجِداً للّٰهِ تَعَالى، واللّٰه لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ، لضَحِكْتُمْ قَلِيلاً،

---

٩ موسليم (٢٨٤٤).

١٠ بوخاری (٦٠٢٣)، موسلیم (١٠١٦)ئەم فەرموودەیە جارێکی تر لە ژمارە (١٣٩/٢٣) بە تۆزێ جیاوازییەوە ڕابوورد.

١١ تیرمذي (٢٣١٣).

وَلَبكَيْتُمْ كَثِيراً، وما تَلَذَّذتُم بِالنِّسَاءِ عَلَى الْفُرُشِ وَلَخَرجْتُمْ إلى الصُّعُداتِ تَجْأَرُون إلى اللّٰه تَعالى) رواه الترمذي وقال: حديثٌ حسن.

**له ئـەبو زەڕەوە** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **لـە پێغەمبـەرەوە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: من شتی وا دەبینم کە ئێوە نایبینن، ئاسمان چرکە چرکی دێ، وە حەقیشێتی کە چرکە چرك بکا، چونکە هەموو شوێن چوار پەنجەیەکی فریشتەیەك توێلی لێ داناوەو کرنووش بۆ خوای گەورە دەبا، بە خودا ئەوەی کە من دەزانم ئەگەر ئێوە بیزانن زۆر کەم پێدەکەنین‌و زۆر باش دەگریان، وە لەگەڵ خێزانی خۆتان لەسەر نوێن کەیفتان نەدەکرد، بەڵکوو هەڵدەڕژانە دەرەوەو رووتان دەکردە ڕێگەو بانەکان‌و لەو دەشت‌و هەردە هاوارتان دەبردە بەر خودا (ت:ح/ح).**

٤٠٧/١٢- [١٢]– وعن أبي بَرْزَةَ بِراءٍ ثم زاي نَضْلَةَ بنِ عُبَيْدٍ الأَسْلَمِيِّ، رضي اللّٰه عنه، قال: قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (لا تَزُولُ قَدمَا عبْدٍ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ عُمْرِهِ فِيمَ أَفْنَاهُ، وَعَنْ عِلْمِهِ فِيم فَعلَ فِيهِ، وعَنْ مالِهِ منْ أَيْنَ اكْتَسبهُ، وَفِيمَ أَنْفقَهُ، وَعَن جِسْمِهِ فِيمَ أَبْلاهُ) رواه الترمذي وقال: حديث حسن صحيح.

**ئەبو بەرزە** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەتا بەندە کە لەبەردەمی دادگای خودادا رادەوەستێ لە شوێنی خۆی ناجولێ هەتا ئەم چوار پرسیارەی لێ دەکرێ: تەمەنی خۆتت بەچی بەسەر برد، ئەو زانستەی کە هەت بوو چیت پێی کرد، وە ئەو ماڵەی کەهەت بوو چۆنت پەیدا کردو لەکوێ هێنات‌و لەچیدا خەرجت کرد، وە لەشی خۆت لەچیدا نیوداشت کرد. (ت:ح/ح/ص).**

٤٠٨/١٣- [١٣]– وعن أبي هريرة، رضي اللّٰه عنه ، قال: قرأ رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: { يوْمَئذٍ تُحدِّثُ أَخْبارَهَا } ثم قال: (أَتَدْرُونَ مَا أَخبَارُهَا ؟) قالوا: اللّٰهُ ورَسُولُهُ أَعْلَمُ. قال: «فإنَّ أَخْبَارَها أَنْ تَشْهَدَ عَلَى كُلِّ عَبْدٍ أَوْ أَمةٍ بِمَا عَمِلَ عَلَى ظَهْرِهَا، تَقُولُ: عَمِلْتَ كَذَا وكَذَا في يَوْمِ كَذَا وَكَذَا، فَهذِهِ أَخْبَارُهَا) رواه التِّرمِذِي وقال: حديثٌ حسنٌ .

---

١٢ تيرمذي (٢٤١٩).

١٣ تيرمژی (٢٣٥٠).

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەمـەی خوێندەوە ﴿يومئذ تحدث اخبارها﴾ ئەوجا فەرمووی: ئایا دەزانـن ئەو هـەواڵو پەیامو خەبەرانەی کە زەوی دەیدا بە پێی ئەم ئایەتە چییەو چی نییە؟ گوتیان: خوداو پێغەمبەر خۆیان باش دەزانن، فەرمووی: ئەوەیە زەوی شایەتی دەدا لە هەموو بەندەیێ، چ پیاو چ ژن، کە چی کردووە لەسەر پشتی: دەڵێ: تۆ لەو ڕۆژەو لەو ڕۆژەدا ئەوەو ئەوەت کردووە، مەبەست ئەمەیە کە خودا لە قورئانا دەفەرمویٚ: ﴿يومئذ تحدث اخبارها﴾العاديات/٤. واتە: لەو ڕۆژەدا زەوی هەموو هەواڵەکانی خۆی دەگێڕێتەوە. (ت/ح/ح/ص).

١٤/٤٠٩–[١٤]– وعن أبي سعيدٍ الخُدْريِّ، رضي اللّٰه عنه، قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (كَيْفَ أَنْعَمُ وَصَاحِبُ الْقَرْنِ قَدِ الْتَقَمَ الْقَرْنَ، وَاسْتَمَعَ الإِذْنَ مَتَى يُؤْمَرُ بِالنَّفْخِ فَيَنْفُخُ) فَكَأَنَّ ذلِكَ ثَقُلَ عَلى أَصْحَابِ رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم فقالَ لَهُمْ: (قُولُوا: حَسْبُنَا اللّٰه وَنِعْمَ الْوَكِيلُ) رواه الترمذي وقال حديثٌ حسنٌ.

ئـەبو سـەعیدی خـودری (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: من چۆن خۆشی بکەمو بە خۆشی ڕابوێرم، لە کاتێکدا کە ئیسرافیل شاخی صووری گرتووە بە دەمیەوەو گوێی هەڵخستووەو چاوەڕوانی فەرمانی خودایە کە ئەمری پێ بفەرمویٚو یەکسەر فوو بکا بە صووردا‌و قیامەت بەرپا ببێ. وەکوو ئەم فەرمایشتە زەحمەت بێ بەلای یارانەوە، بۆیە فەرمووی: بڵێن:حسبنا الله ونعم الوكيل: تەنیا خودامان بەسەو خودا خۆی باشترین پشتو پەنایە (ت/ح/ح).

١٥/٤١٠–[١٥]– وعن أبي هريرة، رضي اللّٰه عنه قال: قال رسول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (مَنْ خَافَ أَدْلَجَ، وَمَنْ أَدْلَجَ، بَلَغَ المَنْزِلَ ألا إنَّ سِلْعَةَ اللّٰهِ غَالِيةٌ، أَلا إنَّ سِلْعة اللّٰهِ الجَنَّةُ) رواه الترمذي وقال :حديثٌ حسنٌ.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لە پێغەمبـەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفـەرمویٚ: کەسێ ترسی هەبێ شەو دەگرێ بە دەمەوە، ئەوەیشی شەو بگرێ بەدەمەوە دەگاتە هەوار، هۆشیارو دڵنیابن کە کاڵای خودا گرانبەهایە، بزانن کە مەبەست لە کاڵای گرانبەهای خودا بەهەشتە (ت/ح/ح).

١٤ تيرمذي (٢٤٣٣).

١٥ تيرمذي (٢٤٥٢).

١٦/٤١١–[١٦] – وعن عائشةَ، رضي اللّٰه عنها، قالت: سمعتُ رسول اللّٰه صَلّى اللّٰه عَلَيْه وسلّم، يقول: «يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حُفَاةً عُراةً غُـرْلاً» قُلْـتُ: يـا رسـول اللّٰـه الرِّجَالُ والنِّسَاءُ جَمِيعاً يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، ؟ قال: «يا عَائِشَةُ الأَمرُ أَشَدُّ من أَنْ يُهِمَّهُم ذلك».

وفي روايةٍ: «الأَمْرُ أَهَمُّ مِن أَن يَنْظُرَ بعضُهُمْ إِلى بَعْضٍ» متفقٌ عليه. «غُرلاً» بضَمِّ الغَيْنِ.

عائیشه (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لـە پێغەمبـەرم بیسـت دەیفـەرموو (درودی خوای لەسەر بێ): لە ڕۆژی قیامەتا مەردوم کە گلێردەکرێنەوە (حەشر دەکرێن) بـە پـێی پـەتیو بە رووتو قووتی بەخەتەنە نەکراوی حەشر دەکرێن، منـیش عـەرزیم کـرد: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! جـا ئـەو پیـاوو ژنانـە هـەموویان بەیەکـەوە چـۆن تەماشـای شەرمگای یەکتری ناکەن؟ فەرمووی: ئەی عائیشە! کێ دەیپەرژێتە سەر شتی وا، لـە ڕۆژی وا سەختا کێ بیر لە شتی وا دەکاتەوە. لە گێڕانەوەیەکا: کار لەوەدا نییـە کـە خەڵك بی پەرژێتە سەر ئەوە تەماشای یەکتری بکەن (ش).

---

١٦ بوخاری (٦٥٢٧)، موسلیم (٢٨٥٩).

# پێرستی سەرباسەکان

# رياض الصالحين

من كلام سيد المرسلين ( صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم )
باخچەی پیاوچاکان لەفەرموودەکانی پێغەمبەر ( د.خ )

دانراوی:
ئیمامی نەوەوی ( شرف الدین یحیی )

وەرگێڕانی
نوری فارس حەمە خان

محمود أحمد محمد
پێیدا چۆتەوەو سەرپەرشتی لەچاپدانی کردووە

بەرگی دووەم-چاپی سێهەم



★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★★.★.★.★.★.★.★.★.


- ناوى كتێب: ﴿ رياض الصالحين﴾
- دانراوى: ئیمامى نەوەوى
- وەرگێڕانى: نورى فارس حەمە خان
- پێداچوونەوەو سەرپەرشتى لەچاپدانى: محمود أحمد محمد
- تیراژ: ٣٠٠٠ دانە
- ژمارەى سپاردن: ( ١٧٥- ساڵى ٢٠٠٦ز )
- چاپو دیزاین: ( روبار حسين ).
- چاپخانەو ئۆفسێتى تیشك.
- ساڵى چاپ: ١٤٢٧ ك -٢٠٠٦ز

## ٥١- باسی هیواو ئومێد به میهری خودای گەورە[*] - باب الرجاء

قال الله تعالى: {قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ – الزمر/٥٣}.

وقال تعالى: {وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ – سبأ/١٧}.

وقال تعالى: {إِنَّا قَدْ أُوحِيَ إِلَيْنَا أَنَّ الْعَذَابَ عَلَى مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّى – طه/٤٨}.

وقال تعالى: {وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ الأعراف/١٥٦}.

**خودای گەورە بە حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: ئـەی موحەممـەد! لەسـەر زمانی من بە بەندەکانم بڵێ کە خودا پێتان دەفەرموێ: ئەی بەندەکانی خودا! ئەی کەسانێ کە زوڵم و زۆرێکی زۆر زۆرتان لـەخودی خۆتـان کـردووە، بـەکردنی تـاوان و بەقەبووڵی کوفر، لە رەحمەتی خودا نائومێد مەبن، چونکە خودا دەتوانی لەهەموو گوناهێ خۆش ببێ، رەحمەتی خودا هەموو شتێکی داپۆشیوە، بەڵام عەزاب و ئێش و ئازار لە ئەنجاما بۆ ئەو کەسانەیە کە دین بە درۆ دەزانـن و تەوبـە ناکـەن و ئیسلام نابن و هەتا دەمرن پشت لەحەق دەکەن.**

٤١٢/١[1]- عَنْ عُبَادَةَ بنُ الصامتِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسلَّم): (مَنْ شَهِدَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَأَنَّ عِيسَى عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ وَكَلِمَتُهُ، أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ، وَرُوحٌ مِنْهُ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ وَالنَّـارُ حَـقٌّ، أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ عَلَى مَا كَانَ مِنَ الْعَمَلِ). وَفِي رِوَايَةٍ لمسلم: (مَنْ شَهِدَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّـهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ النَّارَ):

**عوبادەی کوڕی صامیت** (رەزای خودای لێ بێ) **لە پیغەمبەرەوە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفـەرموێ: هەرکەسێ شـایەتی بـدا کەبێجگـە لـە یـەزدانی پـاك خـودای تـر نیـەو هـەربۆخۆی**

---

[*] هەتا خوێنەری ئازیز، بە ئاسانی ئەو فەرموودانە بدۆزێتەوە، کە دووبارەن و لەپێشەوە رابوردوون، دەڵێین: بەرگی یەکەم – چاپی یەکەم و چاپی دووەمی – لە زنجیرە (٥٠)دا، تەواو دەبێ، وە هەتا ژمارە (١٤١/١٦)ی تیادایە. بەرگی دووەم – چاپی یەکەم و چاپی دووەم لە زنجیرە (٥١)ەوە دەست پێدەکا، هەتا زنجیرە (١٦١) وە هەتا ژمارە (٩٤٧/٢)ی تیادایە. بەرگی یەکەم چاپی یەکەم بەهۆی ژمارەی فەرموودەکە و ژمارەی زنجیرەکەیەوە دەدۆزرێتەوە.

وەرگێڕ: نوری فارس ٢٠٠٠/٤/٢٠

[1] بوخاری (٣٤٣٥)و موسلیم (٢٨).

خودایەو تاكو تەنیایەو هاوبەشی نیە، وەشایەتی بدا كە موحەممەد بەندەو پیغەمبەری خودایە، وەعیسای كوڕی مەریەمیش بەندەو پیغەمبەری خودایە بە فەرموودەی خودا لە مەریەم بووە، بەبێ باب و، ڕەحمەتێكەو خودا ناردوویەتی، وەشایەتی بدا كەبەهەشت ڕاستەو دۆزەخ ڕاستە، هەركەسێ ئەم شایەتیە بدا لەسەر ئەم شێوەیە خودا دەیخاتە بەهەشتەوە، ئیتر كردەوەی هەرچی بێ (ش= بوخاریو موسلیم) لەگێڕانەوەیەكی موسلیمدا: هەركەسێ شایەتی بدا كە هەر خودا خودایەو موحەممەد پیغەمبەری خودایە خودا لەئاگری دۆزەخ حەرامی دەكا.

٤١٣/٢ [٢] وَعَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عليْه وسَلَّم): يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا وَأَزِيدُ، وَمَنْ جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَجَزَاؤُهُ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا أَوْ أَغْفِرُ، وَمَنْ تَقَرَّبَ مِنِّي شِبْرًا تَقَرَّبْتُ مِنْهُ ذِرَاعًا، وَمَنْ تَقَرَّبَ مِنِّي ذِرَاعًا تَقَرَّبْتُ مِنْهُ بَاعًا، وَمَنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً، وَمَنْ لَقِيَنِي بِقُرَابِ الأَرْضِ خَطِيئَةً لاَ يُشْرِكُ بِي شَيْئًا لَقِيتُهُ بِمِثْلِهَا مَغْفِرَةً. رواه مسلم.

ئەبو زەڕ (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: هەركەسێ چاكەیێ بكا من دەقات چاكەی دەدەمەوە، یا بەزیاتریش تۆڵەی بۆ دەكەمەوە، وەهەر كەسێ خراپەیێ بكا پاداشتەكەی یەك بەیەكە، لەوانەیشە كە بی پۆشم بۆی، ئەگەر كەسێ بستێ لەمن نزیك بێتەوە، من باڵێ لەو نزیك دەبمەوە، ئەگەر كەسێ باڵێ لەمن نزیك بێتەوە من دوو باڵ لەو نزیك دەبمەوە، ئەگەر كەسی بەرۆیشتنی ئاسایی بێ بۆلای من، من بەلۆقە دەچم بۆلای ئەو، ئەگەر كەسێ پڕ بەزەوی تاوانی هەبێو بەو هەموو تاوانەوە بێ بۆ دیوانی من، منیش بەپڕ لێخۆشبوونەوە دەچم بەپیریەوە، بەمەرجێ هاوبەشم بۆ پەیدا نەكاو لەسەر ئیمانو باوەڕ بەخودا بمرێ (م).

٤١٥/٣ [٣] وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عليْه وسَلَّم) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْمُوجِبَتَان؟ فَقَالَ: (مَنْ مَاتَ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ وَمَنْ مَاتَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ النَّارَ). رَوَاهُ مُسْلِم.

---

[٢] موسلیم (٢٦٨٧).

[٣] موسلیم (٩٣).

جابير (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو دوو شتە چیو چین کە یەکێکیان دەبێ بەهۆی چوونە بەهەشتو ئەوی تریان دەبێ بەهۆی چوونە دۆزەخ؟ فەرمووی: هەرکەسێ لەسەر ئیمانو باوەڕ بەخودا بمرێو هیچ هاوبەش دانەنێ بۆخودا ئەوە دەچێتە بەهەشت، وە هەرکەسێ هاوبەش بۆ خودا دابنێو لەسەر ئەو حاڵە بمرێو تەوبەی لێ نەکا، ئەوە دەچێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە (م).

٤/٤١٥[٤]- وَعَنْ أَنَسُ (بْنُ مَالِكٍ) (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) ومُعَاذٌ رَدِيفُهُ عَلَى الرَّحْلِ قَالَ: يَا مُعَاذُ قَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ وَسَعْدَيْكَ -ثَلاثًا- قَالَ: ما مِنْ عَبْدٍ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ صِدْقًا مِنْ قَلْبِهِ إِلاَّ حَرَّمَهُ اللّٰهُ عَلَى النَّار، قَالَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَفَلاَ أُخْبِرُ بِها النَّاسَ فَيَسْتَبْشِرُوا قَالَ إِذًا يَتَّكِلُوا، فَأَخْبَر بِها مُعاذٌ عِنْدَ مَوْتِهِ تَأَثُّمًا. متفقٌ عَلَيْهِ:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ موعاذی کوڕی جەبەل لەپاشکۆی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) سوار بوو بوو، ولاخەکەی ژێریان کورتانی پێوە بوو، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی موعاذ! موعاذ فەرمووی: بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! سەرم لەرێتایە سێ جار ئەمەی فەرموو جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەربەندێ شایەتی بدا بەزمانو بەدڵ باوەڕی پێی هەبێ، کە هەر خودا خودایەو موحەممەد فروستادەی ئەوە، ئیتر خودا هەم لەشو هەم گیانی ئەو کەسە قەدەغە دەکا لەسەر ئاگری دۆزەخ. ئەویش عەرزی کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! بۆ ئەم موژدە خۆشە بە خەڵك رانەگەیەنم، تا خۆشییان تێ بکەوێ. فەرمووی: ئاخر سارد دەبنەوەو پشتی لێ دەکەنەوە، جا موعاذ لەکاتی سەرەمەرگا ئەم فەرموودەیەی راگەیاندو گێڕایەوە بۆ موسوڵمانان، نەبادا بە شاردنەوەی ئەم زانستو عیلمە گوناهبار ببێ (ش).

٥/٤١٦[٥]- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَوْ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيّ (رَضِيَ اللّٰهُ تعالى عَنْهُما) شَكُّ الرَّاوِي، ولا يَضُرُّ الشَّكُّ في عينِ الصَّحابيّ لأَنَّهُمْ كُلُّهُمْ عدولٌ، قَالَ: لَمَّا كَانَت

---

[٤] بوخاری (١٢٨)و موسلیم (٣٢).

[٥] موسلیم (٢٧)و (٤٥).

غَزْوَةُ تَبُوكَ أَصَابَ النَّاسَ مَجَاعَةٌ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ أَذِنْتَ لَنَا فَنحَرْنَا نَوَاضِحَنَا فَأَكَلْنَا وَادَّهَنَّا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): افْعَلُوا، (قَالَ) فَجَاءَ عُمَرُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ فَعَلْتَ قَلَّ الظَّهْرُ، وَلَكِنِ ادْعُهُمْ بِفَضْلِ أَزْوَادِهِمْ، ثُمَّ ادْعُ اللَّهَ لَهُمْ عَلَيْهَا بِالْبَرَكَةِ لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَ فِي ذَلِكَ البَرَكَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): نَعَمْ قَالَ فَدَعَا بِنِطَعٍ فَبَسَطَهُ ثُمَّ دَعَا بِفَضْلِ أَزْوَادِهِمْ قَالَ فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِكَفِّ ذُرَةٍ (قَالَ) وَيَجِيءُ الآخَرُ بَكَفِّ تَمْرٍ، وَيَجِيءُ الآخَرُ بِكِسْرَةٍ، حَتَّى اجْتَمَعَ عَلَى النِّطَعِ مِنْ ذَلِكَ شَيْءٌ يَسِيرٌ، فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) (عَلَيْهِ) بِالْبَرَكَةِ، ثُمَّ قَالَ: خُذُوا فِي أَوْعِيَتِكُمْ، قَالَ: فَأَخَذُوا فِي أَوْعِيَتِهِمْ حَتَّى مَا تَرَكُوا فِي الْعَسْكَرِ وِعَاءً إِلاَّ مَلأُوهُ وَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا وَفَضِلَتْ فَضْلَةٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ لاَ يَلْقَى اللَّهَ بِهِمَا عَبْدٌ غَيْرَ شَاكٍّ فَيُحْجَبَ عَنِ الْجَنَّةِ.
رواه مسلم.

**ئەبو هورەیرە (یا ئەبو سەعیدی خودری)* فەرمووی: لەغەزای تەبووکا خەڵکەکە تووشی برسێتییەکی سەخت بوونو خواردەمەنی تەواو تەواو هاتە کزیی، گوتیان: ئەی رابەری خودا! ئەگەر رێگامان پێ بدەیت ئەوا وشترەکانمان سەردەبڕین، هەم گۆشتەکەیان دەخۆینو هەم بەزەکەشیان دەکەین بە پیوو رۆن؟**

**حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: باشە وا بکەن، بەڵام لەپاشا عومەر** (رەزای خودای لێ بێ) **هات فەرمووی: ئەی رەهبەری خودا! ئەگەر ئەمە بکەی وشتری سواری کەم دەبێ، بەڵام بانگیان بکە با ئەو پاشەڕۆکەی لەنانە بەرەکانیاندا ماوە بیهێننو تۆ نزا بەسەریدا بخوێنە، کە خودا پیتو فەڕی تێ بخات بۆیان، سا بەشکو خودا پیتو فەڕی تێ بخات، پیغەمبەریش** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: (بەڵێ باشە). ئەوجا پیغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەستووری دا کەوڵێکیان بۆی هێناو رایخستو دەستوری دا ئەو بنبۆڵو پاشەڕۆکەی لەناو توێشەرەبەرەکانیانا مابوو هێنایان، پیاوی وا هەبوو**

---

* دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: راوی گومانی بۆ پەیدابووە لەنێوانی ئەبو هورەیرەو ئەبو سەعیددا، بەڵام لەبەرئەوەی کە ئەم دوو زاتە هەردووکیان صەحابەن، صەحابەش هەموو عادڵن زەرەری نیە.

٢٠٠٠/٤/١٥ (وەرگێڕ)

**لەپێ گەنمەشامی دەهێنا، هی واش هەبوو پڕ لالویچێ خورمای دەهێنا، یەکی تر کەرتە نانێکی دەهێنا، هەتا لەم هەڕەمەیە هەنی شت کۆکرایەوەو دانرا لەسەر کەوڵەکە، فەرمووی: ئەوجا پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **نزای پیتو فەڕی بەسەریدا خوێند، لەپاشا فەرمووی: دەی ئێنجا هەڵیگرنو بیکەنە دەفرەکانتانەوە! فەرمووی: ئیتر ئەوانیش دەستیان کرد بە لێبردنیو هەر کەسەی لێی دەکردە جەواڵەکەی خۆی، هەتا لەناو لەشکرەکەدا دەفرو جەواڵ نەما کە لەو توێشەیە پڕی نەکەن، فەرمووی: دەستیشیان کرد بە لێخواردنی لێیان خوارد هەتا تێربوون، کەچی هێشتا لەو پاشخوانە بەرماوە هەر مابوو!**

**ئەوجا حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: گەواهو شایەتی دەدەم کە هەر یەزدان خودایە، وە من پێغەمبەری خودام، هەر بەندەیێ –بەم دوو وشەیە– بچێتەوە دیداری خودا، بەمەرجێ شكو گومانی تیایاندا نەبێ، ئەو بەندەیە نائومێد نابێ لەبەهەشت! (م).**

٦/٤١٧[٦]– وَعَنْ عِتْبَانَ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) وَهُوَ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْرًا قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّي لِقَوْمِي بِبَنِي سَالِمٍ، وَكَانَ يَحُولُ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ وَادٍ إِذَا جَاءَتِ الأَمْطَارُ فَيَشُقُّ عَلَيَّ اجْتِيَازُهُ قِبَلَ مَسْجِدِهِمْ، فَجِئْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقُلْتُ لَهُ: إِنِّي أَنْكَرْتُ بَصَرِي وَإِنَّ الْوَادِيَ الَّذِي بَيْنِي وَبَيْنَ قَوْمِي يَسِيلُ إِذَا جَاءَتِ الأَمْطَارُ فَيَشُقُّ عَلَيَّ اجْتِيَازُهُ فَوَدِدْتُ أَنَّكَ تَأْتِي فَتُصَلِّي مِنْ بَيْتِي مَكَانًا أَتَّخِذُهُ مُصَلًّى فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) سَأَفْعَلُ فَغَدَا عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَأَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) بَعْدَ مَا اشْتَدَّ النَّهَارُ فَاسْتَأْذَنَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَأَذِنْتُ لَهُ، فَلَمْ يَجْلِسْ حَتَّى قَالَ أَيْنَ تُحِبُّ أَنْ أُصَلِّيَ مِنْ بَيْتِكَ؟ فَأَشَرْتُ لَهُ إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي أُحِبُّ أَنْ أُصَلِّيَ فِيهِ فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَكَبَّرَ وَصَفَفْنَا وَرَاءَهُ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ وَسَلَّمْنَا حِينَ سَلَّمَ فَحَبَسْتُهُ عَلَى خَزِيرٍ يُصْنَعُ لَهُ فَسَمِعَ أَهْلُ الدَّارِ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فِي بَيْتِي، فَثَابَ رِجَالٌ مِنْهُمْ حَتَّى كَثُرَ الرِّجَالُ فِي الْبَيْتِ، فَقَالَ رَجُلٌ (مِنْهُمْ): مَا فَعَلَ مَالِكٌ لاَ أَرَاهُ! فَقَالَ رَجُلٌ (مِنْهُمْ) ذَلِكَ مُنَافِقٌ لاَ يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): لاَ تَقُلْ ذَاكَ أَلاَ تَرَاهُ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ يَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللَّهِ

---

[٦] بوخاری (٤٢٥)و موسلیم (٣٣).

تَعَالى؟! فَقَالَ: اللّٰـهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَـمُ، أَمَّـا نَحْـنُ فَوَاللّٰـهِ لاَ نَـرَى وُدَّهُ وَلاَ حَدِيثَـهُ إلاَّ إلَـى الْمُنَافِقِينَ: فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): فَإِنَّ اللّٰهَ قَدْ حَرَّمَ عَلَى النَّارِ مَنْ قَـالَ: لاَ إِلَهَ إلاَّ اللّٰهُ يَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللّٰهِ. متفقٌ عَلَيْهِ.

**عیتبانی کوڕی مالیك** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی:** بەرنوێژیم بۆ هۆزەکەم دەکرد — کەهۆزی بەنی سالمن — کەباران دەباری، شیوێ لەنێوانماندا بوو، لافاوی وا هەڵدەسا، ڕێگـەی ڕێبـواری نـەدەداو بەئاسـانی نـەم دەتـوانی لێـی بپەڕمـەوەو بچـم بـۆ مزگەوتەکـەیان، جـا چـوومە خزمـەتی پیغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) و عـەرزیم کـرد: قوربـان! چاوم پـەکی کـەتووەو شـیوەکەی ناوەنـدی خـۆم‌و خزمەکانیشـم کـەباران دەبارێ لافاوی هەڵدەسێ‌و بەئاسانی ناتوانم بپەڕمەوەو چەمەکە بوار نادات، لەبـەر ئەوە حەز دەکـەم کـە تەشـریف بێنـی بـۆ مـاڵم، لەشـوێنێکا نوێـژ بکـەی هـەتا ئـەو شـوێنە پـیرۆزە بکـەم بـە نوێـژگا بۆخـۆم، پیغەمبـەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: (باشە دێم) بۆ سبەینێ پیغەمبەرو ئەبوبەکر هاتن، کە هـاتن دەمـەو نیـوەڕۆ بـوو، پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) داوای ڕێگەپێدانی خواسـت کەبێتـە ژورەوە، مـنیش ڕێگـەم پێی دا، دانەنیشت تا فەرمووی: لەکوێدا پێت خۆشە کە لەناو ماڵەکەتا نوێژ بکەم؟ منیش ئەو شوێنەم نیشانی دا کە حەزم دەکرد نوێژی تیا بکا بۆ موفەڕکی، ئـەوجا پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ڕووەو قیبلـە ڕاوەسـتاو ئەڵلاهوئەکبـەری نوێـژ دابەسـتنی کرد، ئێمـەیش لەپشتیەوە ریزبـووین‌و لەگـەڵیا نوێـژمان دابەسـت، ئـیتر دوو ڕکات نوێژی بۆمان کردو سڵاوی دایەوەو ئیمەیش سڵاومان دایەوە لەدوا ئەوەوە، مـنـیش حەزرەتم گل دایەوە کە پەلۆولەی پیوی بۆ بکەین، ئـیتر خـەڵکی گەڕەکەکـە زانیـان کـە پیغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لـەماڵی منـە، پیاوگـەلێکی زۆریـان هـاتن‌و لەماڵـەوە کۆبوونەوە. پیاوێ گوتی: ئـەوە مالیـك لەکوێیـە بۆچـی دیـار نیـە؟ پیـاوێکی تـریش گوتی: ئەوە ناپاکەو خوداو پیغەمبەری خودای خۆش ناوێ. پیغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: وامەڵێ نابینی کە دەڵێ (لاَ إِلَـهَ إلاَّ اللّٰـهُ) وە مەبەسـتی پێـی ڕەزای خودای گەورەیە. پیاوەکەیش گوتی: خواو پیغەمبـەری خـودا باشـتر دەزانـن، بـەڵام بەخودا ئێمە وا دەبینین کە دۆستایەتی‌و قسەی هەر بۆ ناپاکەکانـە. پیغەمبـەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: دەسا ئەوکەسـەی بڵێ (لاَ إِلَـهَ إلاَّ اللّٰـهُ) وە مەبەسـتی پێـی ڕەزای خودا بێ، خودا ئەو کەسە لەئاگر یاساخ دەکا (ش).

٤١٨/٧[٧]- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللَّهُ تعالى عَنْهُ) قَالَ: قَدِمَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بِسَبْيٍ فَإِذَا امْرَأَةٌ مِنَ السَّبْيِ تَسْعَى، إذَا وَجَدَتْ صَبِيًّا فِي السَّبْيِ أَخذتْهُ فَأَلْصَقَتْهُ بِبَطْنِهَا وَأَرْضَعَتْهُ فَقَالَ (لَنَا) رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): أَتَرَوْنَ هَذِهِ الْمَرْأَة طَارِحَةً وَلَدَهَا فِي النَّارِ؟ قُلْنَا: لاَ وَاللَّهِ، فَقَالَ: أللَّه أَرْحَمُ بِعِبَادِهِ مِنْ هَذِهِ بِوَلَدِهَا. متفق عليه.

عومەری کوڕی خەطاب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەغەزایەك هاتەوە هێندێ ئافرەتی بەتالانی گیراوی هێنایەوە، ئافرەتێ لەدیلەکان منالێ بەبەر بوو، بەلام منالەکەی لێی بەجێمابوو، هرۆیی منالەکەی دەکرد، لەبەرئەوە هەر دەسوڕایەوە بەناو ژنە دیلەکاندا، کە منالێکی کۆرپەی شیرەخۆری دەست دەکەوت لەجیاتی منالەکەی خۆیو لەحەیبەتی ئەو ساوایەی هەلدەگرتو دەینووساند بەسینگو بەرۆکی خۆیەوەو مەمکی دەدایە.

پیغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئایا بەڕای ئێوە ئەم ئافرەتەی کە ئێستا ئەوەندە بە پەرۆشە بۆ منالەکەی، ئەگەر منالەکەی دەست بکەوێتەوە توڕی دەداتە ناو ئاگرەوە؟ گوتمان: نەبەخوا شتی وا ناکا. جا فەرمووی: دەسا خودا بۆ بەندەکانی خۆی گەلێ بەرەحمترە لەم ژنە بەرابەر بە منالەکەی (ش).

٤١٩/٨[٨]- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ تعالى عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): لَمَّا خَلَقَ اللَّهُ الْخَلْقَ كَتَبَ فِي كِتَابٍ فَهُوَ عِنْدَهُ فَوْقَ الْعَرْشِ: إنَّ رَحْمَتِي تَغْلِبُ غَضَبِي. وفي روايةٍ: غَلَبَتْ غَضَبِي، وفي روايةٍ: سَبَقَتْ غَضَبِي. متفق عليه.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) لە پیغەمبەرەوە دەفەرموێ: کاتێ خودای گەورەو بەشکۆ بڕیاریدا ئەم خەلكو جیهانو بوونەوەرە دروست بکا، لەنامەیەکا نووسی: رەحمەتو میهرەبانی من پێش رقو خەشمم دەکەوێ، بەحری رەحمەتم هەرکاتێ هاتە جۆشو خرۆش، ئاگرو بلێسەی کورەی رقو غەزەبم دەکوژێنێتەوە، ئەو نامەیەیش کە ئەم بەلێنەی خودای تیا نووسراوە لەلای خودا خۆیەتی لەسەرو تەختو بارەگا (عەرش)ەوە دایناوە! (ش).

---

[٧] بوخاری (٥٩٩٩)و موسلیم (٢٧٥).

[٨] بوخاری (٧٤٠٤) موسلیم (٢٧٥١).

٩/٤٢٠[٩] وَعَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) يَقُولُ: جَعَلَ اللّٰهُ الرَّحْمَةَ مِائَةَ جُزْءٍ، فَأَمْسَكَ عِنْدَهُ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ، وَأَنْزَلَ فِي الأَرْضِ جُزْءًا وَاحِدًا، فَمِنْ ذَلِكَ الْجُزْءِ تَتَرَاحَمُ الْخَلاَئِقُ حَتَّى تَرْفَعَ الدَّابَّةُ حَافِرَهَا عَنْ وَلَدِهَا خَشْيَةَ أَنْ تُصِيبَهُ. وفي روايةٍ: إنَّ لِلّٰهِ تعالى مِائَةَ رَحْمَةٍ أَنْزَلَ مِنْهَا وَاحِدَةً بَيْنَ الْجِنِّ وَالإِنْسِ وَالْبَهَائِمِ وَالْهَوَامِّ، فَبِهَا يَتَعَاطَفُونَ، وَبِهَا يَتَرَاحَمُونَ، وَبِهَا تَعْطِفُ الْوَحْشُ عَلَى وَلَدِهَا، وَأَخَّرَ اللّٰهُ تعالى تِسْعًا وَتِسْعِينَ رَحْمَةً يَرْحَمُ بِهَا عِبَادَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَرَوَاهُ مُسْلِم أَيْضاً مِنْ روايةِ سَلْمان الفارسيّ (رَضِيَ اللّٰهُ تعالى عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): إنَّ لِلّٰهِ تعالى مِائَةَ رَحْمَةٍ فَمِنْهَا رَحْمَةٌ بِهَا يَتَرَاحَمُ الْخَلْقُ بَيْنَهُمْ، وَتِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ. وَفِي روايَةٍ: إنَّ اللّٰهَ تعالى خَلَقَ (يَوْمَ خَلَقَ) السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ مِائَةَ رَحْمَةٍ، كُلُّ رَحْمَةٍ طِبَاقَ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، فَجَعَلَ مِنْهَا فِي الأَرْضِ رَحْمَةً، فَبِهَا تَعْطِفُ الْوَالِدَةُ عَلَى وَلَدِهَا وَالْوَحْشُ وَالطَّيْرُ بَعْضُهَا عَلَى بَعْضٍ فَإِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ أَكْمَلَهَا بِهَذِهِ الرَّحْمَةِ:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: ژنەوتم لە حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: خودای گەورە رەحمەتو میهرەبانی کردووە بەسەد بەشەوە، نەوەدو نۆ بەشیانی لای خۆی هێشتۆتەوە، وە تاقە یەك بەشیانی ناردۆتە خوارەوە بۆ ناو زەوی، ئیتر ئەمەی کە دەبینین مەخلووقات لەناو خۆیانا رەحم بەیەکتری دەکەنو بەزەییان بە یەکتریدا دێتەوە، ئەمە هەمووی بەشێکە لەو تاقە بەشە، تەنانەت ئەوەیشە کە ولاخ سمی خۆی دەپارێزێ نەبادا بەر بەچکەکەی بکەوێ ئەوەیش هەر لەو بەشەیە. لەگێڕانەوەیەکدا: خودا سەد رەحمەتی هەیە، یەك رەحمەتی لەو سەدە داناوە لەناو پەریو جنۆکەو ئادەمیزادو گیانلەبەرانو جانەوەرو مارو مێرودا، ئیتر بەهۆی ئەم تاقە رەحمەتەوەیە کە ئەم شتانە لەناو خۆیاندا میهر لەگەڵ یەکتر دەنوێننو بەزەییان بەیەکدا دێتەوە، تەنانەت ئەوەیش کە درندە بەزەیی بە بەچکەی خۆیدا دێتەوە هەر بەهۆی ئەم تاقە رەحمەتەوەیە، بەلام نەوەدو نۆ رەحمەتی تری هەیە هەڵی گرتوون بۆ رۆژی قیامەت، لەو رۆژەدا رەحمیان پێ دەکا بە بەندەکانی خۆی! (ش).**

---

**[٩] بوخاری (٦٠٠٠)و موسلیم (٢٧٥٢)ء رواه مسلم برقم (٢٧٥٣)و (٢١) من رواية سلمان الفارسي (رضى الله عنه).**

ئیمامی موسلیم (رەزای خودای لێ بێ) هەمان فەرموودەی لە سەلمانی فارسیشەوە (خودا لیی رازی بێ) دەگێڕێتەوە: فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خودای گەورە سەد رەحمەتی هەیە، یەکێ لەو رەحمەتانە ئەمەیە کە دروستکراوانی خودا لەناو خۆیاندا رەحمی بەیەکتری پێ دەکەن، وە نەوەدو نۆشی داناوە بۆ رۆژی قیامەت. لەگێڕانەوەیەکا: ئەو رۆژەی کە خودا ئاسمانەکان‌و زەوی دروست کرد، سەد رەحمەتیشی دروست کرد، هەر رەحمەتێکیان پڕ ناوەندی ئاسمان‌و زەوی دەبێ، یەکێکی لێیان لەناو زەویدا داناوە، هەر بەهۆی ئەو رەحمەتەوەیە کە دایکە رەحم بە بەچکەی خۆی دەکا، وە دڕندەو باڵندەو مەل‌و مۆر لەناو خۆیانا رەحم بەیەکتری دەکەن، کە رۆژی قیامەتیش هات ئەم رەحمەتەیش دەخاتە پاڵ ئەوانی تر!

١٠/٤٢١[١٠]- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فِيمَا يَحْكِي عَنْ رَبِّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى قَالَ: أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْبًا فَقَالَ: اللّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي، فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْبًا، فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ، ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ فَقَالَ: أَيْ رَبِّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْبًا فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ، قَدْ غَفَرْتُ لِعَبْدِي فَلْيَفْعَلْ ما شاءَ. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ:

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە فەرموودەیەکی قودسیدا، لە پەروەردگاری گەورەو سەروەری خۆیەوە دەگێڕێتەوە، کە خوا دەفەرموێ: بەندەیێ گوناهێ دەکا لەپاشا دەڵێ: خودایە! پەشیمانم، لێم خۆش بە، خودای پیرۆزو گەورەیش دەفەرموێ: ئەم بەندەیەی من وەك ئەم گوناهەی کردووە، دەیشزانێ کە خودایەکی وای هەیە دەتوانێ هەم لە گوناه خۆش بێ‌و هەم لەسەر گوناه تۆڵە بستێنێ، دیسان ئەو بەندەیە تێ هەڵ دەچێتەوەو گوناهێکی تر دەکاتەوەو دەڵێتەوە: خودایە! پەشیمانم، لە گوناهم خۆش بە. دیسان خودای پیرۆزو گەورەیش دەفەرموێتەوە: ئەم بەندەیەی من وەك ئەم گوناهەی کردووە دەیشزانێ کە خودایەکی وای هەیە دەتوانێ هەم لە گوناه خۆشبێ‌و هەم لەسەر گوناه تۆڵە بستێنێ، دەی ئیتر هەرچی ئارەزوو دەکا با بیکا، مادام ئەمە حاڵیەتی: گوناه دەکات‌و تەوبەی لێ دەکا، وا لێی خۆش بووم (ش).

[١٠] بوخاری (٧٥٠٧)و موسلیم (٢٧٥٢).

١١/٤٢٢[11]- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): وَالَّذِى نفْسِي بِيَدِهِ لَوْ لَمْ تُذْنِبُوا لَذَهَبَ اللّٰهُ بِكُمْ وَلَجاءَ بِقَوْمٍ يُذْنِبُونَ فَيستَغْفِرُونَ اللّٰهَ تعالى فَيغْفِرُ لهُمْ. رواه مسلم:

**ديسانەوە فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: بەو کەسەی کە گیانی منی وا لەدەستا، دیارە کە ئەو کەسە خودای گەورەیە، ئەگەر گریمان ئێوە گوناه نەکەن خودا ئێوەی لادەبردو جۆرە کەسانێکی تری وای دەهێنا، کە گوناه بکەن و له خودا بپاڕێنەوە، بۆئەوەی خودا لێیان خۆش بێ! (م).**

١٢/٤٢٣[12]- وَعَنْ أَبِي أَيُّوبَ خالِدِ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللّٰهُ تَعالَى عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) يَقُولُ: لَوْلاَ أَنَّكُمْ تُذْنِبُونَ، لَخَلَقَ اللّٰهُ خَلْقًا يُذْنِبُونَ فَيَسْتَغْفِرُونَ فَيَغْفِرُ لَهُمْ. رواه مسلم:

**خالیدی کوڕی زەید** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: ژنەوتم لە حەزرەتی پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: ئەگەر ئێوە گوناهتان نەکردایە، خودا دروستکراوێکی تری دروست دەکرد، کە گوناهیان بکردایەو لە خودا بپاڕانایەتەوە کە لێیان خۆش ببێ، وە خوداش لێیان خۆش دەبوو (م).**

١٣/٤٢٤[13]- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ تَعالَى عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا قُعُودًا مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) مَعَنَا أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما) فِي نَفرٍ، فَقَامَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) مِنْ بَيْنِ أَظْهُرِنَا، فَأَبْطَأَ عَلَيْنَا، فَخَشِينَا أَنْ يُقْتَطَعَ دُونَنا، فَفزِعْنا فَقُمْنَا، فَكُنْتُ أَوَّلَ مَنْ فَزِعَ، فَخَرَجْتُ أَبْتَغِي رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) حَتَّى أَتَيْتُ حَائِطًا لِلأَنْصَارِ، وذكر الحديث بطوله إلى قوله: فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): اذْهَبْ فَمَنْ لَقِيتَ مِنْ وَرَاءِ هَذَا الْحَائِطِ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ مُسْتَيْقِنًا بِهَا قَلْبُهُ فَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ. رواه مسلم:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لەدەوری پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دانیشتبووین ئەبوبەکرو عومەرو چەند کەسێکی تریشمان لەگەڵدا بوون،**

---

[11] موسلیم (٢٧٤٩).

[12] موسلیم (٢٧٤٨).

[13] موسلیم (٣١).

پیغەمبەر (درروودی خوای لەسەر بێ) لەناومان دەرچوو، نەهاتەوە بۆ ناومان هەتا درەنگی پێ چوو، جا مەترسی ئەوەمان لێ نیشت کە لێمان بڕ بکرێو خوانەخواستە شتێکی بەسەر بێ، ئیتر تەواو شپرزەبووینو بەشڵەژاوی راپەڕین، وەمن یەکەم کەس بووم کەراپەڕیم، جا دەرچوومو دەستم کرد بەگەڕان بەشوێن پیغەمبەردا، هەتا گەیشتمە لای باخێکی پیاوێکی ئەنصاری، لەبەرەی بەنی نەجار، وە خولامەوە بەدەوری شورەکەیدا بەشکم دەرگایەك بدۆزمەوە، بەڵام دەرگام نەدۆزیەوە، روانیم جۆگەیەك لە کارێزەکەوە هەلگیراوەو دێ تا لەژێر حەسارەکە لە کەلەبەرێکی بچوکەوە دەڕواتە ناو باخەکە، ئیتر خۆم لوول داو لەو کەلێنەوە خۆم کرد بەژوردا، کەچوومە ژورەوە حەزرەتی (درروودی خوای لەسەر بێ) لەوێ بوو، فەرمووی: ئەوە ئەبوهورەیرەیت؟ گوتم: بەڵێ ئەوم ئەی پیغەمبەری خودا! فەرمووی: ئەوە چیتە بۆ واشڵەژاوی؟ عەرزیم کرد: تۆ لەناومانا بوویتو تەشریفت هەڵساو نەهاتیتەوەو درەنگت بەسەرهات، ترسی ئەوەمان لێ نیشت کە خوانەخواستە بەتەنیا فرصەتت لێ بێنن، لەبەر ئەوە شڵەژاوین وە من یەکەم کەس بووم کەراپەڕیمو هاتووم بۆ سۆراخی تۆ، وە وەکوو رێوی خۆم لوول داو لەم کونەوە خۆم کرد بەم بێستانەدا، وە خەڵکەکەی تریش وا لەدوای منەوە دێن. فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە! ئەوجا هەردوو سۆڵەکەی خۆیی دا بەمن، هەتا ببێ بەنیشانە لەسەر ئەوە کە ئەم موژدەیە لە پیغەمبەر خۆیەوەو فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە! ئەم دوو سۆڵەکەی من بەرە، وە هەر کەسێکت لەو دیو ئەو باخەوە پێ گەیشت مژدەی بەهەشتی بدەرێ، بەمەرجێ شایەتی بداو بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) بەس خودا خودایەو هیچ خودایەکی تر نیه. (م - رەزای خودای لێ بێ).

١٤/٤٢٥[١٤]- وَعَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو ابْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) تَلاَ قَوْلَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ فِي إِبْرَاهِيمَ ﴿رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ فَمَنْ تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي﴾ الآيَةَ. وَقَوْلَ عِيسَى (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) ﴿إِنْ تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِنْ تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ فَرَفَعَ يَدَيْهِ وَقَالَ: اللَّهُمَّ أُمَّتِي أُمَّتِي وَبَكَى، فَقَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: يَا جِبْرِيلُ اذْهَبْ إِلَى مُحَمَّدٍ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَرَبُّكَ

---

[١٤] موسلیم (٢٠٢).

أَعْلَمُ فَسَلْهُ مَا يُبْكِيهِ؟ فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ (عَلَيْهِ السَّلاَم فَسَأَلَهُ فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بِمَا قَالَ وَهُوَ أَعْلَمُ فَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى: يَا جِبْرِيلُ اذْهَبْ إِلَى مُحَمَّدٍ فَقُلْ: إِنَّا سَنُرْضِيكَ فِي أُمَّتِكَ وَلاَ نَسُوءُكَ. رواه مسلم.

**عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **ئەم فەرمایشتەی خودای خوێندەوە، کەباسی ئیبراهیم دەکا** (درودی خوای لەسەر بێ) **کە دەفەرموێ:** {رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي – إبراهيم/٣٦}. **تا کۆتایی، وە ئەم ئایەتەشی خوێندەوە کە عیسا** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** {إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ – المائدة/١١٨}. **ئەوجا هەردوو دەستی خۆی بەرزکردنەوە بەرەو ئاسمان و فەرمووی: ئەی خودایە! ئومەتەکەم – ئەی خودایە ئومەتەکەم، ئەوجا دەستی کرد بەگریان. خودای گەورەو شکۆمەند فەرمووی: ئەی جوبرەئیل! بڕۆ بۆلای موحەممەد لێی بپرسە لەبەر چی دەگری - دیارە کەخودا خۆی دەزانێ لەبەر چی دەگری – جوبرەئیلیش هات بۆلای پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **هەرچەندە کە خودا بۆخۆی زۆرباش دەزانێ کە پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **چی گوتبوو بەڵام حەزرەت چی فەرموو بوو بۆ جوبرەئیلی گێڕایەوە. سەرەنجام خودای گەورە فەرمووی: ئەی جوبرەئیل! بڕۆرەوە بۆلای موحەممەدو پێی بڵێ: کە ئێمە لەبارەی ئومەتتەوە بەدڵی تۆ دەکەین و دڵت ناشکێنین! (م).**

**١٥/٤٢٦**[١٥] عَنْ مُعَاذِ بن جبَلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ رِدْفَ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَلَى حِمَارٍ. وَذَكَرَ الحديث. **بڕوانە ژمارە (٤١٥/٤ باسی/٥١).**

**١٦/٤٢٧**[١٦]– وَعَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالى عَنْهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: الْمُسْلِمُ إِذَا سُئِلَ فِي الْقَبْرِ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ﴾ متفقٌ عليهِ.

---

[١٥] بوخاری (٧٣٧٣)و موسلیم (٣٠)و (٤٩).

[١٦] بوخاری (٤٦٩٩)و موسلیم (٢٨٧١).

بەراء (رەزای خودای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: موسوڵمان لەگۆڕدا پرسیاری لێ دەکرێ: خودای تۆ کێیە؟ دین‌و ئاینت چییە؟ پێغەمبەرت کێیە؟ ئەویش دەڵێ: خودای من ئەللایە: ئاینم ئیسلامە، پێغەمبەرم موحەممەدە، جا ئەمە کە خودای گەورە تەوفیقی موسوڵمان لەناو گۆڕدا دەدا بۆ ئەم وڵامانە، مەعنای ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ – إبراهيم/٢٧﴾. واتە: خودای گەورەو مەزن بەهۆی وتارە جوانە دامەزراوەکەوە کە فەرموودەی پیرۆزی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ)یە کە ئەم فەرمایشتە پیرۆزە خوا خۆی ناوی دەبا بە (القول الثابت – واتە: دامەزراوو پایەدار) واتە: خوای مەزن بەهۆی ئەم وشە بەرزەوە موسوڵمانان رزگار دەکا لەهەموو مەینەت‌و تەنگ‌و چەڵەمێ، لەدونیاو لەقیامەتدا، لەکوێ تێیان گیراو زۆریان بۆ هات پەنا دەبەنە بەر وشەی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ) ئیتر خودا پەنایان دەدا (ش/تاج).

٤٢٨/١٧[١٧]– عَنْ أَنَسِ (بْنِ مَالِكٍ) (رَضِيَ اللَّهُ تعالى عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: إِنَّ الْكَافِرَ إِذَا عَمِلَ حَسَنَةً أُطْعِمَ بِهَا طُعْمَةً مِنَ الدُّنْيَا، وَأَمَّا الْمُؤْمِنُ فَإِنَّ اللَّهَ يَدَّخِرُ لَهُ حَسَنَاتِهِ فِي الآخِرَةِ وَيُعْقِبُهُ رِزْقًا فِي الدُّنْيَا عَلَى طَاعَتِهِ. وفي رِوايةٍ: إِنَّ اللَّهَ لاَ يَظْلِمُ مُؤْمِنًا حَسَنَةً يُعْطَى بِهَا فِي الدُّنْيَا وَيُجْزَى بِهَا فِي الآخِرَةِ وَأَمَّا الْكَافِرُ فَيُطْعَمُ بِحَسَنَاتِ مَا عَمِلَ لِلَّهِ تَعَالَى فِي الدُّنْيَا حَتَّى إِذَا أَفْضَى إِلَى الآخِرَةِ لَمْ تَكُنْ لَهُ حَسَنَةٌ يُجْزَى بِهَا. رواه مسلم.

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (درودی خوای لەسەر بێ): کافر ئەگەر چاکەیەك بکا، لەباتی ئەوە لەجیهاندا پارووییەکی دەدرێتێ، وڵێ ئیماندار خودای گەورە پاداشتی چاکەکانی بۆ هەڵدەگرێ بۆ دواڕۆژو لەجیهانیشدا لەسەر تاعەت‌و خواپەرستی بەرزق‌و رۆژییەکی پاك تۆڵەی بۆ دەکاتەوە، لەگێڕانەوەیەکا: خودا نارەوایی لە چاکەی موسوڵمانان ناکا، بەڵکوو هەم لە جیهانداو هەم لەدواڕۆژدا، لەتۆڵەی ئەوەدا بەش‌و بارەی باشی دەدرێتێ، وەڵێ بێ بڕوا لەباتی ئەو چاکانەی کە دەیانکات بۆ خودا لەدونیادا دەمی شیرین دەکرێ، تا کاتێ دەچێ بۆ قیامەت چاکەی نامێنێ کە خوا تۆڵەی بۆ بکاتەوە (م).

---

[١٧] موسلیم (٢٨٠٨)و (٥٦)و (٥٧).

١٨/٤٢٩[١٨] وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): مَثَلُ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ كَمَثَلِ نَهرٍ جَارٍ غَمْرٍ عَلَى بَابِ أَحَدِكُمْ يَغْتَسِلُ مِنْهُ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسَ مَرَّاتٍ. رواه مسلم:

**جابير** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەم پێنج نوێژانە کە خودا دایناوە لەسەرتان وەك چەمێکی خوڕی زۆر وایە، کە لە بەردەرگاکەتانا بێو هەموو رۆژێ پێنج جار خۆتانی تیا بشۆن (م).**

١٩/٤٣٠[١٩]– وَعَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ تعالى عَنْهُما) قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: مَا مِنْ رَجُلٍ مُسْلِمٍ يَمُوتُ فَيَقُومُ عَلَى جَنَازَتِهِ أَرْبَعُونَ رَجُلاً لاَ يُشْرِكُونَ بِاللَّهِ شَيْئًا إِلاَّ شَفَّعَهُمُ اللَّهُ فِيهِ. رواه مسلم:

**ئیبنو عەبباس** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو** (دروودی خوای لەسەر بێ): **هەر پیاوێ لە موسوڵمانان کە دەمرێ، چل پیاو – کە هیچ شەریكو هاوبەش بۆ خودا پەیدا نەکەن – نوێژی مردوو لەسەر تەرمەکەی بکەن بێگومان کە خودا تکایان لێ گیرا دەکا بۆی (م).**

٢٠/٤٣١[٢٠]– عَنْ ابْنُ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فِي قُبَّةٍ نَحْوًا مِنْ أَرْبَعِينَ. فَقَالَ: أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا رُبُعَ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟ قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟ قُلْنَا: نَعَمْ (قَالَ: أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُواشَطْرَ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟ قُلْنَا: نَعَمْ) قَالَ: وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ إِنِّي لأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا نِصْفَ أَهْلِ الْجَنَّةِ وَذَاكَ أَنَّ الْجَنَّةَ لاَ يَدْخُلُهَا إِلاَّ نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ، وَمَا أَنْتُمْ فِي أَهْلِ الشِّرْكِ إِلاَّ كَالشَّعْرَةِ الْبَيْضَاءِ فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الأَسْوَدِ، أَوْ قَالَ: الشَّعْرَةِ السَّوْدَاءِ فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الأَحْمرِ. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ:

**ئیبنو مەسعوود** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: دەوری چل کەس بووین، لە خزمەتی پێغەمبەردا** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەدەوارێکا بووین فەرمووی: ئایا رازی دەبن کە ئێوە چواریەکی هەموو خەڵکی بەهەشت بن؟ گوتمان: بەڵێ: فەرمووی: ئەی قایيل دەبن**

---

[١٨] موسليم (٦٦٨).

[١٩] موسليم (٩٤٨).

[٢٠] بوخاری (٦٥٢٨)و موسليم (٢٢١)و (٣٧٦)و (٣٧٧).

كە ئێوە سێیەکی هەموو دانیشتوانی بەهەشت بن؟ گوتمان: بەڵێ: فەرمووی: بەو کەسەی کە گیانی موحەممەدی والە دەستا دەسا من ئومێد دەکەم کە ئێوەی گەلی ئیسلام نیوەی گشت بەهەشتییەکان بن، چونکە بڕیاری خودای گەورەیە کەسێ بڕوادار نەبێ پێی ناچێتە بەهەشت، وەئێوەش لەچاو ئەو خەڵکەی تردا کە هاوبەش بۆ خودا دادەنێن، وەك تاقە موویەکی سپی وان کە بە پێستی گایەکی رەشەوە بێ، یان فەرمووی: وەك موویەکی رەش وان لە پێستی گایەکی سووردا (ش).

٢١/٤٣٢[21]- وَعَنْ أَبِي مُوسَى الأَشعريّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلّم): إذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ دَفعَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ إِلَى كُلِّ مُسْلِمٍ يَهُودِيًّا أَوْ نصْرَانِيًّا فَيقُولُ هَذَا فكَاكُكَ مِنَ النَّارِ. وفي روايةٍ عنهُ عَنِ النَّبيّ قَالَ: يُجيءُ يوم القيامَةِ ناسٌ من المُسلمينَ بذنوبٍ أمثالَ الجِبالِ يغفرها الله لَهُمْ. رواه مسلم:

ئەبو مووسای ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کە رۆژی قیامەت هات هەر موسوڵمانەی خودا سەرو جوولەکەیێ، یان سەرو گاورێکی دەداتێو دەفەرموێ: ئەمە لەباتی تۆ لە دۆزەخدا بێ، لەگێڕانەوەیەکی تری ئەودا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەرۆژی قیامەتا موسوڵمانی وا هەیە کە دێ، گوناهی وا لەگەڵ خۆی دێنێ بەقەد کێوێ دەبێ، کەچی خودا لێیان خۆش دەبێ، (م).

٢٢/٤٣٣[22] عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قَالَ: سَمِعْتَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلّم) يَقُولُ: يُدْنَى الْمُؤْمِنُ مِنْ رَبِّهِ حَتَّى يَضَعَ عَلَيْهِ كَنَفَهُ، فَيُقَرِّرُهُ بِذُنُوبِهِ، فَيَقُولُ: أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا؟ أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا؟ فَيَقُولُ: رَبِّ أَعْرِفُ، قَالَ: فَإِنِّي سَتَرْتُهَا عَلَيْكَ فِي الدُّنْيَا، وَأَنَا أَغْفِرُهَا لَكَ الْيَوْمَ، فَيُعْطَى صَحِيفَةُ حَسَنَاتِهِ. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ:

ئیبنو عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم (دروودی خوای لەسەر بێ) ژنەوت دەیفەرموو: رۆژی قیامەت موسوڵمان لەخوداوە نزیك دەخرێتەوە، هەتا خودا بەرەحمەتی خۆی پەردەی سیتری خۆی دەدا بەسەریداو لە پەنای خۆیا پەنای دەدا،

---

[21] موسلیم (٢٧٦٧)و (٥٠)و (٥١).

[22] بوخاری (٤٦٨٥)و موسلیم (٢٧٦٨).

جا خودا يەكە يەكە پێ دەنێ لەگوناهەكانیو گشت جارێ پێی دەفەرموێ: ئایا ئەم گوناهەت لەبیرە؟ ئەویش هەموو جارێ دەڵێ: لەیادمە، ئەی خودایە! خودا دەفەرموێ: هەر وەكوو لەجیهاندا بۆم پۆشیویت، ئەمڕۆكەش ئەوا لێت خۆش بووم لێی. ئەوجا نامەو دەفتەری چاكەكانی خۆیی دەدرێتێ! (ش).

٢٣/٤٣٤[٢٣] وَعَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً أَصَابَ مِنَ امْرَأَةٍ قُبْلَةً، فَأَتَى النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَأَخْبَرَهُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى ﴿وَأَقِمِ الصَّلاَةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ﴾ فَقَالَ الرَّجُلُ: أَلِي هَذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: لِجَمِيعِ أُمَّتِي كُلِّهِمْ. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

ئیبنو مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پیاوێ ماچێ لەئافرەتێ دەسەنێ، لەپاشان هات بۆ لای پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وە ئەمەی بۆ باس كرد، جا خودا ئەمەی نارده خوارەوە: ﴿وَأَقِمِ الصَّلاَةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ – هود/١١٤﴾. واتە: هەموو شەوو رۆژێ پێنج فەرزەكان لەكاتی خۆیانا بكەن، ئەم نوێژانە لە كردەوە هەرە باشەكانی ئێوەن، بزانن كە یاسایەكی خودایییە كە كردەوەی باشو كاری چاكە فریای خاوەنیان دەكەونو هەمیشە كردەوەی خراپو تاوان لادەبەن، پیاوەكەش گوتی: ئەی پیغەمبەری خودا! ئەمە هەر بۆ من وایە؟ فەرمووی: ئەم حوكمە بۆ گشت ئومەتەكەمە، بۆ هەموویان هەر وایە، چاكە خراپە دەسڕێتەوە (ش).

٢٤/٤٣٥[٢٤]– عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَصَبْتُ أَحَدًا فَأَقِمْهُ عَلَيَّ، وَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ قَالَ: فَصَلَّى مَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَلَمَّا قَضَى الصَّلاَةَ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَصَبْتُ حَدًّا، فَأَقِمْ فِيَّ كِتَابَ اللَّهِ، قَالَ: هَل حَضِرْتَ مَعَنا الصَّلاَةَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: قَدْ غَفَرَ لَكَ؟ مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) عەرزی كرد: قوربان! شایستەی حەددی شەرعی بووم، دەی بفەرموو كە ئەو

---

[٢٣] بوخاری (٤٦٨٧)و موسلیم (٢٧٦٣).

[٢٤] بوخاری (٤٦٨٧)و موسلیم (٢٧٦٣).

حەددەم لەسەر جێبەجێ بکرێ. جا کە نوێژ بوو، پیاوەکە لەگەڵ پیغەمبەردا بەجەماعەت ئەو نوێژەی کرد، کاتێ نوێژەکە تەواو بوو دیسانەوە کابرا گوتی: ئەی پیغەمبەری خودا! شایستەی حەددی شەرعی بووم، کەواتە بەپێی نامەی خودا تۆڵەی ئەو حەددەم لێ بسێنە، فەرمووی: ئایا تۆ لەگەڵ ئێمەدا ئەم نوێژەت بەجەماعەت کرد یان نا؟ گوتی: بەڵێ: لەگەڵ ئێوەدا ئەم نوێژەم بەکۆمەڵی کرد. فەرمووی: دە خوا لەو تاوانەت خۆش بووە (ش).

٤٣٦/٢٥- لەپێشەوە لەباسی (بيان كثرة طرق الخير)دا رابورد. تەماشای ژمارە (١٤٠/٢٤ز - ١٣) بکە.

٤٣٧/٢٦- بڕوانە ژمارە (١٦/٤ز - ٢).

٤٣٨/٢٧[٢٥]- وَعَنْ أَبِي نَجِيحٍ عَمْرُو بْنُ عَبَسَةَ - بِفَتْحِ العَيْنِ والبَاءِ - السُّلَمِيُّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كُنْتُ وَأَنَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ أَظُنُّ أَنَّ النَّاسَ عَلَى ضَلالَةٍ وَأَنَّهُمْ لَيْسُوا عَلَى شَيْءٍ وَهُمْ يَعْبُدُونَ الأَوْثَانَ فَسَمِعْتُ بِرَجُلٍ بِمَكَّةَ يُخْبِرُ أَخْبَارًا فَقَعَدْتُ عَلَى رَاحِلَتِي فَقَدِمْتُ عَلَيْهِ فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مُسْتَخْفِيًا جُرَءَاءُ عَلَيْهِ قَوْمُهُ فَتَلَطَّفْتُ حَتَّى دَخَلْتُ عَلَيْهِ بِمَكَّةَ فَقُلْتُ لَهُ: مَا أَنْتَ؟ قَالَ: أَنَا نَبِيٌّ، فَقُلْتُ: وَمَا نَبِيٌّ؟ قَالَ: أَرْسَلَنِي اللَّهُ، فَقُلْتُ: وَبِأَيِّ شَيْءٍ أَرْسَلَكَ؟ قَالَ: أَرْسَلَنِي بِصِلَةِ الأَرْحَامِ وَكَسْرِ الأَوْثَانِ وَأَنْ يُوَحَّدَ اللَّهُ لا يُشْرَكُ بِهِ شَيْءٌ، قُلْتُ لَهُ: فَمَنْ مَعَكَ عَلَى هَذَا؟ قَالَ: حُرٌّ وَعَبْدٌ، قَالَ: وَمَعَهُ يَوْمَئِذٍ أَبُو بَكْرٍ وَبِلَالٌ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) مِمَّنْ آمَنَ بِهِ، فَقُلْتُ: إِنِّي مُتَّبِعُكَ، قَالَ: إِنَّكَ لاَ تَسْتَطِيعُ ذَلِكَ يَوْمَكَ هَذَا أَلاَ تَرَى حَالِي وَحَالَ النَّاسِ؟ وَلَكِنِ ارْجِعْ إِلَى أَهْلِكَ فَإِذَا سَمِعْتَ بِي قَدْ ظَهَرْتُ فَأْتِنِي، قَالَ: فَذَهَبْتُ إِلَى أَهْلِي وَقَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) الْمَدِينَةَ وَكُنْتُ فِي أَهْلِي فَجَعَلْتُ أَتَخَبَّرُ الأَخْبَارَ وَأَسْأَلُ النَّاسَ حِينَ قَدِمَ الْمَدِينَةَ حَتَّى قَدِمَ عَلَيَّ نَفَرٌ مِنْ أَهْلِ يَثْرِبَ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ، فَقُلْتُ: مَا فَعَلَ هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي قَدِمَ الْمَدِينَةَ؟ فَقَالُوا: النَّاسُ إِلَيْهِ سِرَاعٌ وَقَدْ أَرَادَ قَوْمُهُ قَتْلَهُ فَلَمْ يَسْتَطِيعُوا ذَلِكَ. فَقَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فَدَخَلْتُ عَلَيْهِ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتَعْرِفُنِي؟ قَالَ: نَعَمْ أَنْتَ الَّذِي لَقِيتَنِي بِمَكَّةَ، قَالَ: فَقُلْتُ: بَلَى، فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ أَخْبِرْنِي عَمَّا عَلَّمَكَ اللَّهُ وَأَجْهَلُهُ أَخْبِرْنِي عَنِ الصَّلاَةِ؟ قَالَ: صَلِّ صَلاَةَ الصُّبْحِ ثُمَّ أَقْصِرْ عَنِ الصَّلاَةِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ حَتَّى تَرْتَفِعَ فَإِنَّهَا تَطْلُعُ حِينَ تَطْلُعُ بَيْنَ

[٢٥] موسليم (٨٣٢).

قَرْنَىْ شَيْطَان وَحِينَئِذٍ يَسْجُدُ لَهَا الْكُفَّارُ ثُمَّ صَلِّ فَإِنَّ الصَّلاَةَ مَشْهُودَةٌ مَحْضُورَةٌ حَتَّى يَسْتَقِلَّ الظِّلُّ بِالرُّمْحِ ثُمَّ أَقْصِرْ عَنِ الصَّلاَةِ فَإِنَّ حِينَئِذٍ تُسْجَرُ جَهَنَّمُ فَإِذَا أَقْبَلَ الْفَيْءُ فَصَلِّ فَإِنَّ الصَّلاَةَ مَشْهُودَةٌ مَحْضُورَةٌ حَتَّى تُصَلِّيَ الْعَصْرَ ثُمَّ أَقْصِرْ عَنِ الصَّلاَةِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ فَإِنَّهَا تَغْرُبُ بَيْنَ قَرْنَىْ شَيْطَان وَحِينَئِذٍ يَسْجُدُ لَهَا الْكُفَّارُ قَالَ: فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ فَالْوُضُوءَ حَدِّثْنِي عَنْهُ؟ قَالَ: مَا مِنْكُمْ رَجُلٌ يُقَرِّبُ وَضُوءَهُ فَيَتَمَضْمَضُ وَيَسْتَنْشِقُ فَيَنْتَثِرُ إِلاَّ خَرَّتْ خَطَايَا وَجْهِهِ وَفِيهِ وَخَيَاشِيمِهِ ثُمَّ إِذَا غَسَلَ وَجْهَهُ كَمَا أَمَرَهُ اللَّهُ إِلاَّ خَرَّتْ خَطَايَا وَجْهِهِ مِنْ أَطْرَافِ لِحْيَتِهِ مَعَ الْمَاءِ ثُمَّ يَغْسِلُ يَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ إِلاَّ خَرَّتْ خَطَايَا يَدَيْهِ مِنْ أَنَامِلِهِ مَعَ الْمَاءِ ثُمَّ يَمْسَحُ رَأْسَهُ إِلاَّ خَرَّتْ خَطَايَا رَأْسِهِ مِنْ أَطْرَافِ شَعْرِهِ مَعَ الْمَاءِ ثُمَّ يَغْسِلُ قَدَمَيْهِ إِلَى الْكَعْبَيْنِ إِلاَّ خَرَّتْ خَطَايَا رِجْلَيْهِ مِنْ أَنَامِلِهِ مَعَ الْمَاءِ فَإِنْ هُوَ قَامَ فَصَلَّى فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَمَجَّدَهُ بِالَّذِي هُوَ لَهُ أَهْلٌ وَفَرَّغَ قَلْبَهُ لِلَّهِ إِلاَّ انْصَرَفَ مِنْ خَطِيئَتِهِ كَهَيْئَتِهِ يَوْمَ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ). فَحَدَّثَ عَمْرُو بْنُ عَبَسَةَ بِهَذَا الْحَدِيثِ أَبَا أُمَامَةَ صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ لَهُ أَبُو أُمَامَةَ: يَا عَمْرَو بْنَ عَبَسَةَ انْظُرْ مَا تَقُولُ! فِي مَقَامٍ وَاحِدٍ يُعْطَى هَذَا الرَّجُلُ؟ فَقَالَ عَمْرٌو يَا أَبَا أُمَامَةَ لَقَدْ كَبِرَتْ سِنِّي وَرَقَّ عَظْمِي وَاقْتَرَبَ أَجَلِي وَمَا بِي حَاجَةٌ أَنْ أَكْذِبَ عَلَى اللَّهِ وَلاَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) لَوْ لَمْ أَسْمَعْهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِلاَّ مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا حَتَّى عَدَّ سَبْعَ مَرَّاتٍ مَا حَدَّثْتُ بِهِ أَبَدًا وَلَكِنِّي سَمِعْتُهُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ. رواهُ مُسْلِمٌ.

**ئەبو نەجیح کوڕی عەبەسەی ئەلسولەمی** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: هەر لەسەردەمی نەزانیدا من دەمزانی کە ئەو خەڵکە سەرلێ شێواوە گومڕانو ئەوە دین نیە کە ئەوان وان لەسەری کە بتان دەپەرستنو دارو بەرد بەخودا دەزانن جا زۆری پێ نەچوو کە بەرگوێم کەوت کەوا لەمەککە پیاوێ پەیدا بووە هەواڵی گەورە گەورە دەدا، جا بەسواری وڵاخەکەم چووم بۆ خزمەتی، کەڕوانیم پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **خۆی شاردۆتەو هۆزەکەی لێی پڕنو بەخوێنی سەری تینوون، لەبەر ئەوە زۆر بەنەزاکەت بەدزکە خۆم گەیاندە خزمەتی، کەلەناو مەککەو لەماڵێکدا خۆی حەشار دابوو عەرزیم کرد: تۆ چیت؟ فەرمووی: (من پێغەمبەرم) گوتم: پێغەمبەر چییە؟ فەرمووی: خودا منی رەوانە کردووە. گوتم: ئەو پەیامەی کە خودا بەتۆدا رەوانەی کردووە قسە لەچی دەکا؟ فەرمووی: پەیامەکەم ئەوەیە: پەیوەندیی خزمایەتی بکەمو سیلەی رەحم بەجێ بهێنمو بتان بشکێنم، یەزدانی تاک بەتاقە**

خوای هەقی بێ هاوەڵ بزانم. گوتم: باشە هەتا ئێستا کەسێ باوەڕی پێت هێناوە، وە ئەوانەی کە لەگەڵتان چ کارەنو کێن؟ فەرمووی: بەڵێ خەڵکم لەگەڵن تێکەڵن، هەیانە ئازادە، هەیانە کۆیلەیە، فەرمووی: ئەو سەردەمە ئەبوبەکرو بیلال (رەزای خودایان لێ بێ) موسوڵمان بوو بوون.

عەرزیم کرد: دەی باشە منیش دێمە سەر دینت، فەرمووی: باشە، بەڵام ئێستا ئەوەت بە ئاشکرا بۆ ناکرێ، نابینی من خۆم حاڵم چۆنە بەدەست ئەو خەڵکەوە؟ بڕۆرەوە بۆ ناو ماڵو منالی خۆت، هەرکاتێ بیستت کە من خۆم ئاشکرا کردووە وەرەوە بۆ لام، ئیتر منیش ڕۆیشتمەوە بۆ ناو کەسو کارەکەمو لەوێ مامەوە هەتا پیغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) تەشریفی برد بۆ مەدینە، لەو ماوەیەدا هەر سوسەی هەواڵی ئەوم دەکردو هەرکەسێکم دەدی کە لە مەدینەوە دەهات هەواڵی پیغەمبەرم لێ دەپرسی، هەتا ڕۆژێ چەند کەسێکی لەخەڵکی مەدینە هاتن گوتم: ئەرێ ئەو پیاوەی کەهاتووە بۆ مەدینە چی بەسەرهاتو دەنگوباسی چییە؟ گوتیان: مەردووم زۆر خێرا دەچن بەدەنگیەوەو شوێنی دەکەون، هۆزەکەی ویستبوویان کە بیکوژن، بۆیان نەکوژرابوو، جا منیش چووم بۆ خزمەتی بۆ مەدینەو چوومە خزمەتیو گوتم: ئەی پیغەمبەری خودا! ئایا دەمناسیتەوە یانا؟ فەرمووی: بەڵێ تۆ ئەو پیاوەی کە لە مەککە یەکمان دی. گوتم: دە قوربان! هەندێ لەو زانستە کەخودا فێری تۆی کردووەو من هیچی لێ نازانم فێرم بکە، بفەرموو هەواڵی چۆنێتیی نوێژم پێ بفەرموو، فەرمووی: نوێژی بەیانی بکە، ئەوجا واز لە نوێژکردن بهێنە هەتا خۆر بە ئەندازەی ڕمێ لە ئاسۆ بەرز دەبێتەوە، چونکە لەمکاتەدا خۆر لەنێوانی دوو شاخەی شەیتانەوە هەڵ دێ، واتە: لەمکاتەدا شەیتانو دەستەی شەیتان دەکەونە جرتو فرتو زاڵ دەبن، هەر بۆیەکیشە لەو دەمەدا بێبڕواکان سوژدەی بۆ دەبەنو خۆر دەپەرستن! کەواتە: با کوڕنووشی ئێمەو کوڕنووشی ئەوان یەك نەگرن. لەوەودوا نوێژ بکەن، نوێژی ئەم دەمە فریشتە دێنە دیاریو شایەتی باش بۆ نوێژ خوێن دەدەن، هەتا ئەو دەمەی کە سێبەری ڕمی داچەقاو بە قنجی لەشوێنی تەختا لە کەمییەو سێبەرەکەی لەوە کەمتر ناکا هەر نوێژ بکە، ئەوجا واز لەنوێژ بێنە، چونکە لەم کاتەدا دۆزەخ وەك تەندوور دادەخرێ، جا کاتێ سێبەری لای ئێوارە داهاتو خۆر بە دیمەن لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدا نوێژی نیوەڕۆ بکە،

نوێژی ئەم کاتە فریشتە ئامادەی دەبن‌و شایەتی بۆ نوێژکەر دەدەن، هەتا نوێژی عەسریش دەکەی هەروایە، هیچ نوێژێ لەم ماوەیەدا ناباشی نییە، کە نوێژی عەسرت کرد ئیتر نوێژی تر مەکە تا خۆر ئاوا دەبێ، ئەوەتا لەو دەمەدا خۆر پەرستەکان کڕنووشی بۆ دەبەن، فەرمووی: جا گوتم: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! دەی بفەرموو باسی دەستنوێژیشم پێ بفەرموو؟ فەرمووی: هەرکەسێکتان ئاوی دەستنوێژەکەی ئامادە بکا، ئەوجا ئاو لەدەمی‌و لە لووتی رابداو هنگ بکا، ئیتر هەرچی گوناهی دەموچاوو دەم‌و کونە لووتەکانیەتی هەڵدەوەرێن‌و بەردەبنە خوارەوە، کاتێ روخساری دەشوا، لەسەر ئەو شێوەیە کەخوا فەرمانی پێ کردووە، مسۆگەر هەرچی گوناهی دەموچاوویەتی، لە نووکی ریشیەوە، لەگەڵ ئاوەچۆڕەکەدا هەڵ دەوەرن‌و دەکەونە خوارەوە، کاتێ دەستەکانی تا ئانیشکەکانی دەشوات هەرچی گوناهی دەستەکانیەتی لە نووکی پەنجەکانیەوە لەگەڵ ئاوەچۆڕەکەدا هەڵ دەوەرێن، کاتێ سەری تەڕدەکا هەرچی گوناهی سەریەتی لەنووکی مووەکانیەوە لەگەڵ چۆڕاوگەی ئاوەکەدا دادەکەون! کاتێ هەردوو قاچی هەتا هەردوو قاپەڕەقەڵەی دەشوا، هەرچی گوناهی قاچەکانیەتی لەنووکی پەنجەکانیەوە لەگەڵ چۆڕاوگەی ئاوەکەدا هەڵدەوەرێن، جا دوا ئەمە ئەگەر هەڵسایەوە نوێژیشی بەو دەستنوێژە کرد، وە سوپاس‌و ستایشی خوای گەورەی کردو، بەشێوەیێ کە هەر شایستەی خوابێ ستایشی جوانی خوای گەورەی کرد، وە دڵی خاڵی کرد لە پەیوەندی لەگەڵ غەیری خواداو بە تەواوی دڵی لەلای خودا بوو، ئیتر لەپاش ئەو نوێژە وا لەگوناه پاك دەبێتەوە وەك ئەو رۆژەی کە لەدایك دەبێ! جارێ عەمری کوڕی عەبەسە ئەمەی باس کرد بۆ ئەبو ئومامە، کە ئەویش هاوڕێی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بوو، ئەبو ئومامە فەرمووی: ئەی عەمری کوڕی عەبەسە! بزانە ئەم قسەیە تۆ دەیکەی کوێ دەگرێتەوە؟! چۆن لەیەك جێگەداو بەیەك هەڵوێستی ئاوا، بە دەستنوێژێك‌و دوو رکات نوێژ، خودا ئەم هەموو خەڵاتە دەدا بە بەندە! عەمریش فەرمووی: ئەی ئەبو ئومامە! خۆت دەزانی کە پیرو ئیختیار بووم‌و ئێسکم ناسك بۆتەوەو ئاکامم نزیك بۆتەوە، دیارە کە لە حاڵی وادا هیچ کارێکم بەدرۆ هەڵبەستن بەدەم پێغەمبەرەوە نییە، دەی ئەم فەرموودەیەم نەك جارو دوو جارو سێ جارو چوار جارو پێنج جارو شەش جارو حەوت جار لە پێغەمبەر

بيستووه، بەڵكوو لەمەیش زیاتر لێیم بیستووە بۆیە دەیگێڕمەوە، دەنا هەرگیز نەیم دەگێڕایەوە. {موسلیم (رەزای خودای لێ بێ) گێڕاویەتەوە}.

٢٨/٤٣٩[٢٦]– ٦١٠٥ – قَالَ مُسْلِمٌ وَحُدِّثْتُ عَنْ أَبِى أُسَامَةَ وَمِمَّنْ رَوَى ذَلِكَ عَنْهُ إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعِيدٍ الْجَوْهَرِىُّ حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ حَدَّثَنِى بُرَيْدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ عَنْ أَبِى بُرْدَةَ عَنْ أَبِى مُوسَى عَنِ النَّبِىِّ –صلى الله عليه وسلم– قَالَ (إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِذَا أَرَادَ رَحْمَةَ أُمَّةٍ مِنْ عِبَادِهِ قَبَضَ نَبِيَّهَا قَبْلَهَا فَجَعَلَهُ لَهَا فَرَطًا وَسَلَفًا بَيْنَ يَدَيْهَا وَإِذَا أَرَادَ هَلَكَةَ أُمَّةٍ عَذَّبَهَا وَنَبِيُّهَا حَىٌّ فَأَهْلَكَهَا وَهُوَ يَنْظُرُ فَأَقَرَّ عَيْنَهُ بِهَلَكَتِهَا حِينَ كَذَّبُوهُ وَعَصَوْا أَمْرَهُ).

ئەبو مووسا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خودای گەورە ئەگەر خواستی خێرو نیازی باشی هەبێ بە نەتەوەیێ لە بەندەکانی خۆی ئەوە لەپێش ئەوانەوە رەوانەی دەکا تا لە بەهەشتا پێشوازییان لێ بکا، بەلام ئەگەر خودا ویستی نەتەوەیێ لەناوبدا ئەوە لەژیانی پیغەمبەرەکەیانا لەبەرچاوی ئەو سزاو ئازاریان دەداو تۆڵەیان لێ دەستێنێ‌و لەناویان دەبا، وە بەوە چاوو دڵی ئەو پیغەمبەرە رۆشن دەکاتەوە، لەسەر ئەوەی کە بەدرۆیان دەخستەوەو بێ گوێییان دەکرد (م/تاج).

**٥٢- باسی فەزڵ‌و گەورەیی هیواو ئومێد بە کەرەمی خوا - باب فضل الرجاء**

قال اللّٰه تعالى إخباراً عن العبد الصالح: {وأفوض أمري إلى اللّٰه إن اللّٰه بصير بالعباد، فوقاه اللّٰه سيئات ما مكروا – غافر/٤٤ – ٤٥}.

واتە: کاروباری خۆمم سپارد بە خوداو خۆم دایە دەست خودا، دڵنیام کە خودا چاوی خێری لە بەندە باشەکانی خۆی هەیە، ئیتر ئەوە بوو خودا پاراستی‌و لەو فرۆفێڵە پیسەی ئەوان قوتاری کرد.

١/٤٤٠[٢٧]– ناوەڕۆکی ئەم فەرموودەیە لەم دوو باسەدا لەپێشەوە رۆیشت: (باب التوبە) فەرموودەی سێیەم، باسی پێش ئەم باسە فەرموودەی دووەم لێرەدا لەسەرتاوە ئاوایە: وعن أبي هريرة (رضيَ اللّٰه تعالى عنه) عن رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ

---

[٢٦] موسلیم (٢٢٨٨).

[٢٧] بوخاری (٧٤٠٥)و موسلیم (٢٦٧٥) بڕوانە: ژمارە (١٥/٣)و ژمارە (٤١٣/٢).

وسَلَّم) أَنَّهُ قال: قالَ اللَّه عَزَّ وَجلَّ: (أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدي بي، وأَنَا مَعَهُ حَيْثُ يَـذْكُرُني) تا كۆتای فەرموودەكە. واتە: ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوادای لیٚ بیٚ) فەرمووی: حەزرەت (درووەدی خـوای لەسەر بیٚ) فـەرمووی: خـودای تـاك‌و شـكۆمەند لـە فەرموودەیـەكی قودسـیدا دەفەرمویٚ: بەندەی من گومانی چۆن بیٚ بەمن، مـن وا دەبم، لەگـەڵیا، لـەو شـویٚن‌و كاتەدا كـە ئـەو نـاوی مـن دەبـاو یـادو زیكـری مـن دەكـا لـەو دەم‌و حەلـەدا مـن وام لەگەڵیا! (م/ تاج). بڕوانـە: (١٥/٣ ز - ٢)و (٤١٣/٢ ز - ٥١)

٤٤١/٢[٢٨]- وعن جابِر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَمعَ النَّبِـيّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) قَبْلَ موْتِهِ بثلاثَةِ أَيَّامٍ يقولُ: (لا يموتن أَحَدُكم إِلاَّ وَهُوَ يُحْسِنُ الظَّنَّ باللَّه عـزَّ وَجَـلَّ) رواه مسلم:

جابیر (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) فەرموی: لە پیٚغەمبەر خۆیم بیست لە پیٚش مردنیدا بە سیٚ ڕۆژ دەیفەرموو (درووەدی خوای لەسەر بیٚ) مەمرن تا ئومیٚدی باشتان قـەوی دەبـیٚ بـە كـەرەمی خودای گەورەو سەروەر! (م).

٤٤٢/٣[٢٩]- وعن أَنسِ بْنُ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالى عَنْهُ) قال: سمعـتُ رسـولَ اللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يقول: قال اللَّه تعالى: يَا ابْنَ آدَمَ إِنَّكَ مَا دَعوْتَني وَرَجوْتَني غَفرْتُ لَكَ عَلى ما كَانَ مِنكَ ولا أُبَـالِي، يـا ابـن آدمَ، لَـوْ بَلغَـتْ ذُنُوبُـكَ عَنَـانَ السـماءِ، ثـم اسْتَغْفَرْتَني غَفَرتُ لَكَ، يَا ابْنَ آدَم، إِنَّكَ لَو أَتَيْـتَني بِقُـرابِ الأَرْضِ خطايـا، ثُـمَّ لَقِيْـتَني لا تُشْرِكُ بِي شَيْئاً، لأَتَيْتُكَ بِقُرَابِهَا مَغْفِرَةً. رواه الترمذي وقال: حديث حسن:

ئەنەس (ڕەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: لە پیٚغەمبەرم بیست دەیفەرموو: خودای گـەورە لە فەرموودەیەكی پیرۆزی خۆیدا دەفەرمویٚ: ئـەی ئـادەمیزاد! هـەتا تـۆ هـاوارم بـۆ بیٚنی‌و ئومیٚد بە من بیٚ‌و چاوت لە قـاپی ڕەحمـەتی مـن بـیٚ، منـیش لـە تـۆ خـۆش دەبم، ئیتر كارو كردەوەت هەرچی بیٚ دەربەست نیم‌و هـەر لیٚـت خـۆش دەبم، ئـەی ئادەمیزاد! ئەگەر بیٚت‌و تاوانەكانت ئەوەنـدە زۆرو گەورە بن بگەنە قەراغ‌و كەناری ئاسمان، وەلیٚ منت لە یاد بـیٚ‌و داوای لیٚخۆشـبوونم لیٚ بكـەی ئـەوا لیٚـت خـۆش دەبم، ئەی ئادەمیزاد! ئەگەر كاتیٚ دیٚیت بۆ دیوانی من نزیكەی پڕبـە زەوی تـاوان لەگـەڵ

---

[٢٨] موسلیم (٢٨٧٧).

[٢٩] تیرمژی (٣٥٣٤).

خۆت بێنی بەمەرجێ هاوبەشت بۆ دانەنابم‌و لەسەر ئیمان‌و باوەڕی ساغ بمرێت ئەوا منیش یەك بەیەك لە تاوانەکانت خۆش دەبم (ت – ح/ ح).

**٥٣ باسی کۆکردنەوەی ترس‌و هیوا لەدڵ دا - باب الجمع بين الخوف والرجاء**

اعلم أن المختار للعبد في حال صحته أن يكون خائفاً راجياً، ويكون خوفه ورجاؤه سواء، وفي حال المرض يُمَحِّضُ الرجاء. وقواعد الشرع من نصوص الكتاب والسنة وغير ذلك متظاهرة على ذلك:

دانەر ئیمامی نەوەوی (ڕەزای خودای مەزنی لێ بێ) **دەفەرمووێ: ئەی برای موسوڵمان. بزانە کەوا پەسەندە بۆ بەندە کە لە حاڵی ساغیدا هەم ترسی هەبێ‌و هەم ئومێدی هەبێ، وە هەردوو لایان چوون یەك بێ، وەلێ لەکاتی نەخۆشیدا ئومێدی گەورەی بە بەخششی خودا قەوی بێ، یاساکانی شەریعەت، بەپێی دەقی ئایەتی قورئان کە نامەی خودایەو بەپێی دەقی سوننەتی پێغەمبەرو بەپێی سەرچاوەکانی تری ئایین هەموو پشتیوانی ئەم فەرمایشتە دەکەن.**

قال اللّٰه تعالى: {فلا يأمن مكر اللّٰه إلا القوم الخاسرون – الأعراف:٩٩}.

وقال تعالى: {إنه لا ييأس من روح اللّٰه إلا القوم الكافرون – يوسف/٨٧}.

وقال تعالى: {يوم تبيض وجوه وتسود وجوه – آل عمران/١٠٦}.

وقال تعالى: {إن ربك لسريع العقاب وإنه لغفور رحيم – الأعراف/١٦٧}.

وقال تعالى: {إن الأبرار لفي نعيم وإن الفجار لفي جحيم – الإنفطار/١٣ – ١٤}.

وقال تعالى: {فأما من ثقلت موازينه فهو في عيشة راضية، وأما من خفت موازينه فأمه هاوية –القارعة/٦–٩}.

والآيات في هذا المعنى كثيرة: فيجتمع الخوف والرجاء في آيتين مقترنتين أو آيات أو آية:

**واتاو مەبەستی ئایەتە پیرۆزەکان بەگشتی: خودای مەزن لەم ئایەتانەدا دەدا بەگوێی مەردومی خاوەن هۆش‌و گۆشدا، کە لە مەکری خودا ئەمین نەبن‌و هەمیشە لەقاری خودا بترسن‌و بەهیچ جۆرێ لەخۆیان بایی نەبن، وە ئەوەیان لەبەر چاو بێ کە ڕۆژی دێ چاك‌و خراپ دەردکەوێ، چاکەکاران ڕوویان سپی دەبێ، وەك ئەستێرەی ئاسمان سەریان بەرز دەبێ‌و ڕوخساریان گەش دەبێ، وەلێ زۆر کەسانی تر هەن ڕوویان ڕەش دەبێ‌و سەریان حیزو شۆڕ دەبێ. ئیتر دەستەی**

چاكان وان لەناو نازو نيعمەتاو، گوزەرانێكی خۆش‌و باش‌و پەسەندو نايابيان هەيە، چونكە خاوەنی كردەوەی باشن‌و، تای تەرازوی خێريان قورس‌و گران بووە، بەڵام دەستەی بەدكاران وان لەناو ئاگری سووری دۆزەخدا، چونكە لەبەر بێ فەڕی بەهۆی تاوانی زۆرەوە تای تەرازوی خێريان سوك دەبێ‌و بەدی‌و خراپی‌و كاری خراپەيان زياترە لە چاكەكەيان.

١/٤٤٣ [٣٠]- وعن أبي هريرة (رضي اللّٰه عنه) أنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قال: لَوْ يَعْلَمُ المُؤْمِنُ مَا عِنْدَ اللّٰهِ مِنَ العُقُوبَةِ ما طَمِعَ بجَنَّتِهِ أَحَدٌ، وَلَوْ يَعْلَمُ الكَافِرُ مَا عِنَد اللّٰهِ مِنَ الرَّحْمَةِ مَا قَنطَ مِنْ جَنَّتِهِ أَحَدٌ. رواه مسلم:

ئەبو هورەيرە (رەزای خودای لێ بێ)لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەگەر بێت‌و موسوڵمان بزانێ كە تۆڵەو سزای خودا چەندە زۆرەو خودای گەورە چەندە بێ باكە ئيتر كەس بەتەمای بەهەشت نەدەبوو، هەروەها ئەگەر بێت‌و كافريش بزانێ كە دەرووی رەحمەتی خودا چەندە گەورەيە ئەوا ئەويش لەبەهەشت نائومێد نەدەبوو! (م).

٢/٤٤٤ [٣١]- وعن أبي سَعيد الخدريِّ (رضي اللّٰه عَنه) أنَّ رسولَ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قال: إذا وُضِعتِ الجَنَازَةُ واحْتَمَلَهَا النَّاسُ أَو الرِّجَالُ عَلى أَعْنَاقِهم، فَإِنْ كانَتْ صالِحَةً قالَتْ: قَدِّمُوني قَدِّمُوني، وَإنْ كانَتْ غَير صالحةٍ، قالَتْ: يا ويْلَها، أَيْنَ تَذْهَبُونَ بَها؟ يَسْمَعُ صَوتَها كُلُّ شيءٍ إلاَّ الإِنْسَانُ، وَلَوْ سَمِعَهُ لَصَعِقَ. رواه البخاري.

ئەبو سەعيد (خودا لێی رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: كاتێ تەرمی مردوو دادەنرێ لەناو دارە تەرما، وە پياوان هەڵی دەگرن‌و دەينێنەوە سەرشانيان تا بيبەن بۆ سەر گۆڕستان بۆ ناشتن، لەو كاتەدا ئەگەر مردووەكە مرۆڤێكی باش بێ دەڵێ: زووكەن، زوو بمبەن! وەڵێ ئەگەر مردووەكە مرۆڤێكی باش نەبێ دەڵێ: هەی هاوار! خۆو رۆ! ئەوە بۆ كوێم دەبەن؟

حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەم كاتەدا هەموو شتێ دەنگی دەبيستێ ئادەميزاد نەبێ، ئەگەر ئادەميزاد گوێی لەم هات‌و هاوارەی بێ لەترسا دەتۆقێ‌و

[٣٠] موسليم (٢٧٥٥).
[٣١] بوخاری (١٣١٤).

زەنـدەقی دەچێ (بوخاریو نەسائی، لەسەر فەرمودەی تاجولئوصول ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە).

٣/٤٤٥ [٣٢]– وعن ابن مسعودٍ (رضي اللّه عنه) قالَ: قال رسولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): الجَنَّةُ أَقْرَبُ إلى أَحَدِكُمْ مِنْ شِرَاكِ نَعْلِه وَالنَّارُ مِثْلُ ذلك. رواه البخاري.

ئیبنو مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ لە ئێوە بگری بەهەشت لەبەرەزوانەی پێڵاوەکانی لێی نزیکترە، وە دۆزەخیش هەر وایە! (ب).

## ٥٤ - باسی گەورەیی گریان لەترسی خوا - باب فضل البكاء خشية الله تعالى وَشَوقا إليهِ

قال اللّه تعالى: {ويخرون للأذقان يبكون ويزيدهم خشوعاً – الإسراء/١٠٩}.

واتە: زانایانی میللەتەکانی پێش هاتنی قورئان هەر کاتێ ئایەتەکانی ئەم قورئانە پیرۆزەیان بەسەردا دەخوێندرێتەوە لەپەو روو کڕنووش دەبەن بۆ خوداو کوڵی گریانیان هەڵدەستێو ئەم قورئانە دەبێ بە مایەی دلگەرمیو ملکەچیو سەردانەواندیان بۆ فەرمانەکانی خودا.

وقال تعالى: {أفمن هذا الحديث تعجبون، وتضحكون ولا تبكون –النجم/٥٩ – ٦٠}.

واتە: ئەوە ئێوە لەباتی ئەوەی بە ژنەوتنی ئەو بەڵێنو هەڕەشانەی کە وان لەناو ئەم قورئانەدا دەست بکەن بەگریانو بگرین، کەچی بەلاتانەوە سەیرەو لەبەر ئەوە بڕوای پێ ناکەنو گاڵتەتان پێی دێ لەبەرئەوە پێی پێ دەکەنن.

١/٤٤٦ [٣٣]– وعَن أبي مَسعودٍ (رضي اللّه عنه) قالَ: قال لي النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): اقْرَأْ عليَّ القُرآنَ، قلتُ: يا رسُولَ اللّه أَقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ؟ قالَ: فَإني أُحِبُّ أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْري، فقرَأْتُ عليه سورَةَ النِّساء، حتى جِئْتُ إلى هذِهِ الآية: {فَكَيْفَ إذا جِئْنا مِنْ كُلِّ أُمَّة بِشَهيد وجِئْنا بِكَ عَلى هَؤلاءِ شَهيداً} قال: حَسْبُكَ الآنَ، فَالْتَفتُّ إليْهِ. فَإذا عَيْناهُ تَذْرِفان. متفقٌ عليه.

ئیبنو مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرموو: هەندێ قورئانم بۆ بخوێنە! عەرزیم کرد: قوربان! قورئان بۆ تۆ هاتووەو من بۆتی

---

[٣٢] بوخاری (٦٤٨٨) بڕوانە ژمارە (١٠٥) کە لەپێشەوە رابورد.

[٣٣] بوخاری (٤٥٨٢)و موسلیم (٨٠٠).

بخوێنم؟ فەرمووی: حەز دەکەم یەکێکی تر بیخوێنێ‌و من گوێی لێ بگرم، ئیتر منیش سورەتی نیسائم بۆی خوێند، تا گەیشتمە ئەم ئایەتە: {فَكَيْفَ إذا جِئْنا مِنْ كُلِّ أُمَّة بِشَهيد وجِئْنا بِكَ عَلى هَؤلاءِ شَهيداً - النساء/٤١}.

واتە: دەبێ حاڵی ئەو کافرانە چۆن بێ، لە ڕۆژی قیامەتا، لەو کاتەدا کە لەهەموو میللەتێ شایەتێ دێنین، شایەتی دەدا لەسەر کوفرو بێ بڕوایو نامەردی ئەوان، وە تۆیش دەهێنین‌و دەتکەین بە شایەت لەسەر ئەوان. کە گەیشتمە ئەمێ ئیتر فەرمووی: ئیتر بەسە، کەچی تەماشایم کرد وا ئەسرین هۆن هۆن بەچاوەکانیا دێتە خوارەوە (ش).

٢/٤٤٧[٣٤]- وعن أنس (رضي اللّه عنه) قال: خَطَبَ رَسُولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) خُطْبَةً مَا سَمِعْتُ مِثْلَهَا قَطُّ فقالَ: لَوْ تعْلمُونَ ما أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كثيراً، قال: فَغَطّى أَصْحَابُ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) وُجُوهَهُمْ ولهمْ خَنِينٌ. متفقٌ عليه. وَسَبَقَ بَيَانُهُ في بابِ الخَوفِ. بڕوانە: (٤٠١/٦).

٣/٤٤٨[٣٥]- وعن أبي هريرة (رضي اللّه عنه) قال: قالَ رسُولُ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): لايَلِجُ النَّارَ رَجُلٌ بَكَى مِنْ خَشْيَةِ اللّه حَتَّى يَعُودَ اللَّبَنُ في الضَّرْعِ وَلا يَجْتَمعُ غُبَارٌ في سَبِيلِ اللّه ودُخانُ جَهَنَّمَ. رواه الترمذي وقال: حديثٌ حسنٌ صحيحٌ.

ئەبو هوڕەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ لەترسی خودا دڵی پڕ ببێ‌و ساغ لەبەر ڕەزای خودا بگری ئیتر دوو پێی ناچێتە ناو ئاگری دۆزەخەوەو زۆر ستەمە کە ڕێگەی بکەوێتە ناو دۆزەخ، وەك چۆن ستەمە کە شیری دۆشراو جارێکی تر بچێتەوە ناو گوانی ئاژەڵ، تۆزو گەردی خەبات‌و تێکۆشانیش لەڕێگەی خودادا لەگەڵ دوکەڵی دۆزەخدا قەد یەك ناگرن، ئەوەی تۆزی ڕێگەی خەبات‌و تێکۆشان بچێ بەسەریدا لەم جیهانەدا لەو جیهانەدا دوکەڵی دۆزەخ ناچێ بەسەریدا (ت - ح/ ح/ ص).

٤/٤٤٩[٣٦]- وعن أبي هريرة (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) قالَ: عَنِ النَّبِيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قَالَ: سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللّهُ في ظِلّهِ يَوْمَ لا ظِلَّ إلاّ ظِلُّهُ: إمامٌ عادِلٌ وشابٌّ نَشَأَ في عِبادَةِ

---

[٣٤] بوخاری (٤٦٢١)و موسلیم (٢٣٥٩).

[٣٥] تیرمیذي (١٦٣٣)و (٢٣١٢).

اللّٰه تعالى ورَجُلٌ قَلْبُهُ مُعلَّق بالمَساجِدِ ورَجُلان تَحابَّا في اللّٰه اجتمَعا عَلَيهِ وتَفرَّقا عَلَيهِ ورجَلٌ دعتْهُ امْرأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وجَمال فقَالَ: إنّي أخافُ اللّٰه، ورَجُلٌ تَصدَّقَ بِصَدَقَة فأخْفاها حتَّى لا تَعْلَمَ شِمالهُ ما تُنْفِقُ يَمِينهُ ورَجُلٌ ذكَرَ اللّٰه خالِياً فَفَاضَتْ عَيْناهُ. متفقٌ عليه: (بڕوانه: ٢/ ٣٧٦)

٤٥٠/٥[٣٧]– وعَن عبد اللّٰه بنِ الشِّخِّير (رضي اللّٰه عنه) قال: أَتَيْتُ رسُولَ اللّٰه (صلّى اللّٰه عَلَيْهِ وسَلَّم) وَهُو يُصلّي ولجوْفِهِ أزيزٌ كأزيزِ المِرْجَلِ مِنَ الْبُكَاءِ. حديث صحيح. رواه أبو داود والتّرمذيُّ في الشَّمائِل بإسنادٍ صحيحٍ:

**عەبدوڵلای کوڕی شێخخیر** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: چووم بۆ خزمەت حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **ڕوانیم وا خەریکە نوێژ دەکا، لەناو دڵەوە وەکوو مەنجەڵی سەر ئاگر لەترسی خودا کوڵی گریانی نەدەنیشتەوەو وەکوو سەماوەر گیزەی دەهات (د/ ت – ح/ ص).**

٤٥١/٦[٣٨]– وعن أنسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي اللّٰه عنه) قال: قالَ رسُولُ اللّٰه (صَلّى اللّٰه عَلَيْه وسَلَّم): لأُبَيِّ بن كَعْبٍ (رضي اللّٰه عنه) إنّ اللّٰه عزّ وجلّ أمَرني أنْ أقْرأَ علَيْكَ: ﴿لَمْ يَكُن الّذينَ كفَرُوا﴾ قَالَ: وَسَمَّاني؟ قال: نَعَمْ. فَبكى أُبيٌّ. متفقٌ عليه. وفي رواية: فَجعَلَ أُبيٌّ يَبْكي:

**ئەنەس** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **بە ئوبەی کوڕی کەعبی فەرموو: خودای گەورەو سەروەر فەرمانی پێ کردووم کە سورەتی ﴿لَمْ يَكُن الّذِينَ كَفَرُوا﴾ت بەدەرس لەلا بخوێنم، ئوبەی فەرمووی: خودا بۆخۆی ناوی منی هێنا بۆت؟ فەرمووی: بەڵێ: ئیتر ئوبەی لەخۆشی ئەوەی کە خودا ئەو دەستی قەدرو ڕێزەی لێناوە دەستی کرد بەگریان (ش).**

٤٥٢/٧[٣٩]– انْطَلِقْ بنا إلى أُمِّ أيمَن... الخ. بڕوانە (١/ ٣٦٠).

---

[٣٦] بوخاری (٦٦٠) بڕوانە ژمارە (٢/٣٧٦).

[٣٧] ئەبو داوود (٩٠٤)، تیرمیذي (٣١٥) لە کیتابی (الشمائل)یدا.

[٣٨] بوخاری (٣٨٠٩)و موسلیم (٧٩٩).

[٣٩] بڕوانە (١/٣٦٠).

٤٥٣/٨[٤٠]– وعن ابن عَمَر (رضي اللّٰه عنهما) قال: لَمَّا اشْتَدَّ بِرَسُول اللّٰه (صلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَجَعُهُ، قيلَ لَهُ فِي الصَّلاةِ، فقال: مُرُوا أَبا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بالنَّاس، فقالتْ عائشةُ (رضي اللّٰه عنها): إنَّ أَبَا بَكْرٍ رَجُلٌ رَقيقٌ إذا قَرَأَ القُرآنَ غَلَبَهُ البُكاءُ، فقال: مُرُوهُ فَلْيُصَلِّ، وفي رواية عن عائشةَ (رضي اللّٰه عنها) قَالَتْ: قلتُ: إنَّ أَبا بَكْرٍ إذا قامَ مقامَك لَم يُسْمع النَّاس مِنَ البُكَاءِ. متفقٌ عليه:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ نەخۆشینەکەی حەزرەت تەواو گران بوو، لەبارەی بەرنوێژیی نوێژەکانەوە قسەیان لەگەڵ حەزرەت کرد، فەرمووی: لەزمانی منەوە فەرمان بکەن بە ئەبوبەکر با لەجیاتی من بەرنوێژییەکە بکا بۆ مەردومەکە، عائیشەش (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەبوبەکر پیاوێکی دڵنەرمە ئەگەر لەجێگەی تۆدا ڕابووەستێ لەبەر گریان خۆی بۆ ڕاناگیرێ‌و ناتوانێ بەرنوێژیی بۆ خەڵکەکە بکا، بەڵام عائیشە لە دڵەوە مەبەستی ئەوە بوو کە باوکی لەم کاتی سەرەمەرگەدا لەجێگەکەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نەوەستێ، نەبادا خەڵکەکە بڵێن: ئەبوبەکر پێی ڕەش بوو، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەوە: فەرمان بکەن بە ئەبوبەکر تا بەرنوێژییەکە بۆ خەڵکەکە بکا (ش).

٩/٤٥٤[٤١]– وعن إبراهيمَ بن عبدِ الرَّحمن بن عوفٍ أَنَّ عبدَ الرَّحمن بنَ عَوْفٍ (رَضيَ اللّٰه عنهُ) أُتِيَ بطَعام وكانَ صائماً فقالَ: قُتِلَ مُصْعَبُ بنُ عُمَيرٍ (رضيَ اللّٰه عنه) وهُوَ خَيْرٌ مِنِّي، فَلَمْ يُوجَدْ لَه ما يُكَفَّنُ فيهِ إلاَّ بُرْدَةٌ إنْ غُطِّي بِها رَأْسُهُ بَدَتْ رِجْلاه، وإنْ غُطِّيَ بها رِجْلاه بَدَا رأْسُهُ، ثُمَّ بُسِطَ لَنَا مِنَ الدُّنْيَا ما بُسِطَ أَوْ قالَ: أُعْطِينَا مِنَ الدُّنْيا مَا أُعْطِينَا قَدْ خَشِينَا أَنْ تَكُونَ حَسَنَاتُنا عُجِّلَتْ لَنا. ثُمَّ جعَلَ يَبْكي حَتَّى تَركَ الطَّعامَ. رواهُ البخاري.

ئیبراهیمی کوڕی ئەوڕەحمانی کوڕی عەوف (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوکم بەڕۆژو بوو، کە نانی بەربانگیان بۆ دانا فەرمووی: موصعەبی کوڕی عومەیر (ڕەزای خوای لێ بێ) کە لەمن باشتر بوو، کە لە غەزای ئوحوددا شەهید کرا، هیچ نەبوو بیکەن بە کفنی، عاباکەی خۆی نەبێ، بۆیان کرد بە کفن، بەڵام بە تەواوی بەشی

---

[٤٠] بوخاری (٦٦٤) موسلیم (٤١٨)و (٩٤).

[٤١] بوخاری (١٢٧٤).

کفنەکەی نەدەکردو هەموو لەشی دانەدەپۆشی، ئەگەر دەیاندا بەسەر سەریا قاچەکانی دەردەکەوتن، ئەگەر دەیاندا بە قاچەکانیا سەری دەردەکەوت!! هەتا حەزرەت (درودو صەلاتو سەلامی خودای گەورەو مەزنی لێ بێو سەرو ماڵو منداڵ بالآگەردانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێو خودا بە میهرو رەحمەتی خۆی چاومان بە دیتنی ئەو گۆڕە پیرۆزە برێژێو لەخاكو پای شەهیدانی بەدرو ئوحوددا، لەهەر دوو جیهاندا پەناممان بدا، لەژێر ئالآ بەرزەکەی ئەودا) فەرمووی: بە عاباکە لای سەری داپۆشنو پووشی سوڕناتك (ئیذخەر)یش بدەن بەسەر قاچەکانیدا. وەلێ ئەوەتا ئێمە جیهان هاتووە بەپیرمانەوە، دەترسین ئەوەیش لەبەر ئەوە بێ: کە پاداشتی چاکەکانمان خرابێتە ئەم دنیاو پێش خرابێو بەشمان بەو دنیاوە نەبێ. ئیتر ئەوڕەحمان دەستی کرد بەگریانو دڵی پڕ بووو وازی لەنانەکە هێنا (ب/ تاج).

١٠/٤٥٥[٤٢]— وعن أبي أُمامة صُدَيِّ بْنِ عَجلانَ البـاهِلِيِّ (رضـيَ اللّـه عنـه) عـن النَّبـيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قال: لَيْسَ شَيءٌ أَحَبَّ إلى اللّٰه تعالى من قَطْـرَتَين. وأَثَـرَيْن: قَطْرَةُ دُمُوعٍ من خَشيَةِ اللّٰه وَقَطرَةُ دَمٍ تُهرَاقُ في سَبيلِ اللّٰه تعالى وأما الأثران فأثر في سبيل الله تعـالى وَأَثَرٌ في فَرِيضَةٍ منْ فَرَائِضِ اللّٰه تعالى. رواه الترمذي وقال: حديثٌ حسنٌ.

صودەیی کوڕی عەجلان کە ناوی دەرکردووە بە ئەبو ئومامە فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هیچ شتێ لەلای خودا وەك ئەم دوو دڵۆپەیەو ئەم دوو شوێنەوارو نیشانەیە پەسەندو خۆشەویست نییە. دڵۆپێ فرمێسك کە لەبەر ترسی خودا بێو دڵۆپێ خوێن کە لەبەر رەزای خوا برێژرێ، مەبەست لەم دوو شوێنەوارەکانیش یەکەم وارسو ئەثەرو شوێن پایێ کە ساخ لەبەر رەزای خودا بێو لەڕێگەی ئەودا بێ، دووەم ئەپەری ئەو شوێن پایانە کە لە پێی بەندە بەجێ دەمێنن، کاتێ کە خەریکی کردنی فەرزێ لە فەرزەکانی خودای گەورە دەبێ (ت: ح/ ح)...

---

[٤٢] تيرميذي (١٦٦٩).

١١/٤٥٦(٤٣)- حديث العِرْباض بنِ سارِيةَ (رضي اللّٰه عنه) قال: وعَظَنا رسُول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) مَوْعِظَةً وَجِلَتْ منها القُلُوبُ وذَرَفْت منْهَا العُيُونُ. وقد سبق في باب النهي عن البدع. بڕوانه: (٢/ ١٥٧).

**٥٥- باسی گەورەیی‌و خێری هەژاریی‌و دڵنەدان بەخۆشی دونیاو زوهدو نەویستنی خۆشی ئەم جیهانەو بار سووكی لە ژیانی جیهاندا**

**باب فضل الزهد في الدنيا والحث على التقلل منها وفضل الفقر**

قال اللّٰه تعالى: { إنما مثل الحياة الدنيا كماء أنزلناه من السماء فاختلط به نبات الأرض مما يأكل الناس والأنعام، حتى إذا أخذت الأرض زخرفها وازَّيَّنَتْ وظن أهلها أنهم قادرون عليها أتاها أمرنا ليلاً أو نهاراً فجعلناها حصيداً كأن لم تغن بالأمس، كذلك نفصل الآيات لقوم يتفكرون – يونس/٢٤}.

وقال تعالى: {اعلموا أنما الحياة الدنيا لعب ولهو وزينة وتفاخر بينكم وتكاثر في الأموال والأولاد، كمثل غيث أعجب الكفار نباته، ثم يهيج فتراه مصفراً، ثم يكون حطاماً، وفي الآخرة عذاب شديد، ومغفرة من اللّٰه ورضوان، وما الحياة الدنيا إلا متاع الغرور – الحديد/٢٠}.

وقال تعالى: {واضرب لهم مثل الحياة الدنيا كماء أنزلناه من السماء فاختلط به نبات الأرض فأصبح هشيماً تذروه الرياح، وكان اللّٰه على كل شيء مقتدراً. المال والبنون زينة الحياة الدنيا، والباقيات الصالحات خير عند ربك ثواباً وخير أملاً – الكهف/٤٥-٤٦}.

وقال تعالى: {زين للناس حب الشهوات من النساء والبنين والقناطير المقنطرة من الذهب والفضة والخيل المسومة والأنعام والحرث، ذلك متاع الحياة الدنيا، والله عنده حسن المآب – آل عمران/١٤}.

وقال تعالى: {يا أيها الناس إن وعد اللّٰه حق فلا تغرنكم الحياة الدنيا ولا يغرنكم بالله الغرور – فاطر/٥}.

وقال تعالى: {ألهاكم التكاثر، حتى زرتم المقابر، كلا سوف تعلمون، ثم كلا سوف تعلمون، كلا لو تعلمون علم اليقين – التكاثر/١ – ٥}.

---

(٤٣) بڕوانە ژمارە (١٥٧/٢).

وقال تعالى: {وما هذه الحياة الدنيا إلا لهو ولعب، وإن الآخرة لهي الحيوان لو كانوا يعلمون – العنكبوت/٦٤}.

والآيات في الباب كثيرة مشهورة:

لەڕاستیدا ماناو راڤەو مەبەستی وشەو ئایەتو رستەو عیبارەتی قورئانی پیرۆز زۆر قووڵو وردەو هەتا بڵێی پڕ مەعناو سەیرو عەجیبە، لەبەر ئەوە هەروا کارێکی ئاسانی ئاسایی نیە، کە هەرکەسێ هەڵسێ هەروا لە خۆیەوە بەسانایی بتوانێ قەڵەمێ دەست بداتێ و پارچە کاغەزێ بێنێ و بە بێ سێ و دوو شانی پیابکاو بەکەیفی خۆی قەڵەمی لێ ڕابداو بڵێ: ئەمە واو ئەوە وا، قورئان فەرمایشتی پیرۆزی یەزدانی مەزنە، قسەی ئاسایی بێ سەروپایی ئادەمیزاد نیە، بەندە ئەم لایەنە زۆر باش دەزانم، بۆیە بەوپەڕی دڵنیاییەوە دەڵێم: هەموو وشەیێ لەوشەکانی قورئانی پیرۆز هەڵدەگرێ کە زانایەکی گەورە ئوطروحەی لەسەر بنووسێو دوکتۆرای لەسەر وەربگرێو تەخەصصووصی تیا بکاو لەو تاقە وشەیەدا ببێ بە پسپۆڕ، بگرە لەوەپتریش، کەسێ دەتوانێ باسێکی دوورو درێژی راستو دروستو خۆشو باش لەسەر پەیوەندیو تەجانوسو پێکەوە جۆشخواردنی پیتەکانی یەك وشە بنووسێ، بەڵێ بەندە دڵنیام کە قورئان کۆمپیتەری بوونەوەرە. ئەمە لەلایێ، لەلایەکی تریشەوە قورئان هەروەك دەستوورو یاسای ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، گەلێ رازو سڕو نهێنی زۆر سەیری تری تیادایە، کە بەرەبەرە لەبوارێکی لەباردا خودای گەورە لەبەر حیکمەتێ پەردە لەسەر ئەو نهێنیە لادەباو ئەو سیڕە ئاشکرا دەکا، وەك خۆی فەرموویەتی: {سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ – فصلت/٥٣}.

بەڵێ: - ئەگەر زانای خۆی هەبێ – قورئان جامی جەمو نومایە، وەك ئاوێنەیەکی بالا نوما هەموو شتێکی تیادا دەبینرێ! بەڕاستی قورئان سەهلی مومتەنیعەو ئاسانی گرانە، لەهەمووی سەیرترو جوانتر ئەوەیە سەرتاپای قورئانی پیرۆز بە فەرمایشتێکی بەهێزی وا دامەزراوە، پڕ لەنەغمەی خۆشو ئاوازی شیرین، لەبەر ئەوە نەگوێ لەبیستنی تێر دەبێو نەچاو لەتەماشا کردنی تێر دەخوا، ئیعجازی قورئان لەباوەڕی منا لەم سێ شتەدایە:

یەکەم: مەعناو مەبەستی بەرز.

دووەم: بەلاغەتو فەصاحەتی لەفظەکانی.

سـێیەم: بەسـەدەها یاسـاو دەسـتووری تیادایـە، کەبەشـێوەیەکی رەسـا، بەفەرمایشتێکی دامەزراو باسی ئەسراری بوونەوەرو چۆنیەتی رودانی دیاردە سروشتییەکان دەکات، بەسەدەها یاساو دەستووری تیادایە لە بابەتە زانستیو هونەریو جوانکاریو پزیشکییەکان، لەمەسەلەی زمانەوانیو دەنگوباسی مێژوویيو باسو خواستی جوگرافیاییو لە ئیلاهییاتو خودا شوناسیو بەندە ناسی، هەروەك بۆیەکەم جار لەمێژوودا پەردەی لەسەر گەلێ شتی نهێنیو غەیبیو حەقائیقی عیلمی هەڵداوەتەوە! لە حەقیقەتا نهێنیو رازی پیتو وشەو رستەی قورئان حەقیقەتێکی راستو دروستە، وە ئەوەی لە عیلمی حوروفی قورئان بزانێ پێویستی بەهیچ نامێنێ. گەرچی من خۆم هیچی لێ نازانم.

جا کە ئەمەمان زانی ئەوسا دەڵێین: ئەوەی بڵێ قورئان تەرجەمە دەکرێ ئەوە مەبەستی ئەوەیە کە بە زمانێکی تر راڤەو شەرحو تەفسیر دەکرێ، دەنا لایەنی ئیعجازی لەفظیو لایەنی ئیعجازی سیری تەرکیبو تەئلیفی حوروفەکانیو ئەو رازو نهێنیو غەیبییاتەی کە لە قودسییەتو پیرۆزی قورئاندا هەیە ئەوە تەرجەمە ناکرێ نە بە عەرەبی، نە بە زامانێکی تر. بۆ نموونە وشەی (الله) لە قورئاندا بەم شێوەیە دەنووسرێ وە بەم شێوەیە دەخوێندرێتەوە (ئەڵلاھ)، لەبەر ئەوە ئەگەر وشەی (الله) لە عەرەبیدا بە (ألاه) نووسرا ئەوە ئەو سیرو قودسییەتەی نامێنێ کە (الله) هەیەتی، چونکە ئیملاو رێنووسی قورئان دەخلێکی باڵای هەیە لە ئیعجازی قورئاندا، چۆن فاریزەو کەوانەو زائیدو ناقیص رۆڵێکی گەورە دەبینن لە کۆمپیتەردا پیتی وشە قورئانیەکانیش ئاوەها رۆڵێکی گرنگ دەبینن، بەڵام ئەوەی بڕوای بە کۆمپیتەر نەبێ، لەبەر ئەوەی کە نەیدیوە، وەك ئەو کەسە وایە کە ئینکاری ئیعجازی تەرکیبو تەئلیفی پیتەکانی قورئان بکا، چونکە هیچی لێ نازانێ.

جا لەسەر ئەم ئەساسو بنیاتە تەرجەمەی قورئان هەتا پاراوترو تێرو تەسەلترو بەرزتر بێ باشترو پەسەندترە، چونکە مەبەست لەم تەرجەمە ئەوەیە کە خوێنەر چەژ لەمەعناو مەبەستی قورئانەکە وەربگرێو بەپێی بواری گونجاوو بەپێی توانای پیرۆزیو بەرەکەت لەمەعنای قورئانەکە وەربگرێ، ئینجا بالەم

چەشمەندازەوە دەست بکەین بە روونکردنەوەی مەبەستەکانی ئایەتەکان، ئایەتە پیرۆزەکان بەتێکرایی واتە:

(بێگومان ژیانی جیهان لەبەرچاوی ئینسان گەلێ شیرین‌و جوانە، داستانێکی گەلێ دلگیرو رەنگینە ژین لەسەر زەمین شاگوڵی باخی بوونە، بەڵام ژینی جیهان لەگەڵ ئەوەدا کە مەودای کەمە، کەچی زۆرتر ئەو خەڵکە دەستخەرۆ دەکا چونکە لەداستانی شەستەبارانێ دەکاو کە سەر رووی زەوی بکا بە باخاکێی رازاوە، پڕ لە گژوگیاو گوڵ‌و گوڵزارو دارو درەخت‌و میوەی شیرین‌و دانەوێڵەی خۆش، کە دەست بدا هەم بۆ خواردن‌و رابواردنی ئادەمیزادو هەم دەست بدا بۆ خواردەمەنی‌و ئالفی گیانلەبەرانی تر، ئیتردنیا پەرستەکان بەهەلی بزانن‌و وەك مێش‌و مەگەزێ بئالێنە شیرینی ئاوا بووروکێنە رەنینی بەری ئەو باخە خەملیوەو وەك چۆن پەروانە بەشەو بە رۆشنایی‌و مۆم شەوارە دەکەوێ، هەتا بەگڕی ئاگرەکە دەسووتێ ئەوانیش ئاوا بەجووتە پێوە لەناو لیتەی خۆشەویستی دونیادا وەك کەری ناو قوڕ دەچەقن‌و بەعەقڵی خۆیان دەڵێن: باخ‌و بۆلاخ‌و گوڵ‌و گوڵزارو خۆشی نازو نیعمەت ئاوا دەبێ‌و بەس، نان ئەو نانەیە ئەمڕۆ لەخوانە، تا لەدەستم نەچووە با تێر تێری لێ بخۆم‌و خۆمی لێ کەیل‌و مەست‌و شەیدا بکەم.

بەڵام لەپڕ لەناکاو بەکوفرە کونێ بەفەرمانی خودای داناو زانا باخ دەبێ بە داخ‌و گوڵ دەبێ بەگڵ‌و خۆشی دەبێ بەناخۆشی کە لە خەوی خاو خەبەر دەبنەوە دەکەونە ناو ناڕەحەتی‌و ئێش‌و ئازارو ناخۆشییەکی واوە دەڵێی بەحەیاتیان خۆشیان بەچاو نەدیوە، بزانن ژینی ئەم جیهانە بە بێدینی ساخ وەك گاڵتەو گەپی منالان وایە، کەف‌و کوڵێکەو فشێکەو کەش‌و فیزو دەعیەو هەوایە، وەشانازی‌و خۆهەلکێشانە بەماڵ‌و منالەوە بەلام ئەوەی لەدونیادا وەك ئاژەڵ بژی، هەر بخواو بخەوێ وە پەندو ئامۆژگاری لەدین وەرنەگرێ ئەوە بەزوویی خۆی بەنائومێدی دەبینێتەوە، دوچاری سزای سەختی رۆژی دوایی دەبێ، وەلێ ئەو خوا پێداوانەی کە بەپێی یاسای خودایی لەژیانا رەفتارو کردار دەکەن‌و بەپێی شەریعەتی خودا سوودو خۆشی لە بەهرەکانی جیهان وەردەگرن‌و جیهان دەکەن بەمەزاری پیرۆزی پاشەڕۆژیان ئەوانە خودا لێیان ڕازی دەبێ، لە گوناهیان خۆش دەبێ، کارو کردەوەیان بەفیڕۆ ناڕوا، پاداشیان زایە نابێ.

بەڵێ ژینی جیهان گەلێ کەس تەفرە دەدا، بەخشییەکەی دەستەشکێنی دەکا، وەك سەرابی دوور دەسخەڕۆی دەکا، کەوایە ئەمەتان لەبەرچاو بێ، دونیا هەوێی قیامەتە، بەبزەیی سەر لێوی پڕ لەفڕوفێڵی نەخەڵەتێن‌و نەبن بەداوای دونیاوە.

لەهەمان کاتدا خودا زینەت‌و نازداری‌و خۆشی ئەم ژیانەی لە بەندە باشەکانی خۆی قەدەغە نەکردووە، دروستە بۆ بەندەباشەکانی خودا لەززەت‌و خۆشی‌و سوودی رەواو بەهرەی باش‌و بەشی خۆیان لەماڵی حەلاڵ‌و لە منداڵ‌و خێزانی رەحمەت وەربگرن، دەتوانن بەجوانی جیهان‌و ژینی خۆیان برازێننەوە، ئەمانە هەمیشە کردوویانە بەپیشە خودای خۆیان لەیادە، بەتەمای پاداشتی باشی خودای گەورەو مەزن بەکاری باش‌و بەرەفتاری جوان‌و بە گفتاری شیرین خۆیان لەبارەگای خودا نزیك دەکەنەوەو لەجیهانا بە سەربەرزی‌و مەردی دەژین‌و کامەرانی‌و سەرفرازی ئەو جیهانیش مسۆگەر دەکەن.

وەلێ ئاژەڵ مەشرەبەکان ماڵ‌و منداڵ کە زینەتی دونیایە لەباتی ئەوەی ببن بەرەحمەت بۆیان دەبن بەهۆی ژێرکەوتن‌و دەستەشکێنی بۆیان،وەك دێوجامە چاو بەستیان لێ دەکا،لەناکاودا لوتیان دەتەقێ بەبەردی ئەلحەداو کارلەکار دەترازێ،دادو فوغان سود ناداو بەدەستی دۆستی خۆیان ئاور لەژیانی جاویدانی دوارۆژی خۆیان بەردەدەن!

هەتا ئێوارە بڵێن: خودایە! مۆڵەتم بدە،تەوبە دەکەم،کاری باش دەکەم، تازە کار لە کار ترازاوە،مردن کەیە خەی بەندەیەکی گرت ئیتر قوتاری نابێ‌لەچنگی و دەمرێ‌و کردەوەی دنیای چ چاك چ خراپ لەگەڵیا دەڕواتە ناو گۆڕەکەیەوە. بزا نن ئادەمیزاد بەسروشت حەزی لەشتی خۆش‌و شەهەواتە،شەیتانیش ئەوەندەی تردنەی دەدات‌و شێرەی دەکا لەسەر دنیا پەرستی، ژن‌و منداڵ‌و پارەو پولی زۆرو مشەو کەڵەکە کراوو زێڕو زیوو ڕەوگە ماینی جوان وقەشەنگ‌و ئاژەڵ و مەزرا ئەمانە لەم جیهانەدا قیبلەی ڕازاوەی ئەو خەڵکەن، بەلێ ئەمانە ئەگەر هی ڕەحمەت بن ئەوە مایەی بەختەوەری‌و خۆشگوزەرانی هەردوو جیهانن، بەلام زۆربەی مەردووم بەخۆشەویستی پتر لەئەندازەی ئەمانە ماڵوێران‌و دەستەخەڕۆیە. تا لە ئەنجاما خودا لەخۆی دەڕەنجێنێ‌و تووشی رۆژی رەش دەبێ‌و پاداشتی باشی لای خودای لەکیس دەچێ!

بزانن فەرمودەی خودا یەکەو رەدبوونەوەی نیە، بەڵێنی راستەو هەڕەشەی خۆی دێنێتە دی، کەواتە دەخیل سەد دەخیل ژیانی دونیایی چەند رۆژە دەستەشکێنتان نەکاو بەجوانیو رازاوەی درۆینەی خۆی تەفرەتان نەداو بۆ جەرگو سییەك وشترێك مردار مەکەنەوە.

تەماشا بکەن، تۆزێ شەرم بکەن، نابینن کە چەندە لەخودا ددووور کەوتونەتەوەو بەدەمو دەست پەلاماری پڕو پیتی جیهانتان داوە، هەتا لوتان دەدا لەبەردی ئەلحەد هەر خەریکی کۆکردنەوەی پارەو پولنو وێردی سەر دەمتان دینارو درهەمە. شتی وامەکەن، ئەوە پەشیمانی لەدوایە، رۆژێ دێ کە بڕوا بەقسەی ئەم قورئانە دەکەنو هەموو شتێ بەچاوی خۆتان دەبینن‌و ئەوسا دەزانن کە ئێوە هەڵە بوونو فەرمایشتی خودا راستە، وە ئەوکاتە بەهەشتو دۆزەخ بەچاوی سەر دەبینن‌و پڕ بەدەمو پڕ بەدڵ دەڵێن: ژیان بەڕاستی بەس ژیانی دواڕۆژەو بەس! ئەوەی کە لێی نائومێد بێ وەکوو زیندوو نەبێ وایە!)

لێرەدا عەرزی ئێوەی ئازیزو بەڕێز دەکەم: ئەم جۆرە تەفسیرە جیایە لەتەفسیری ئاسایی، کە تەرجەمەو تەفسیرەکە بەپێی ئایەتەکەو سەبەبی نوزوول‌و موفرەداتە لوغەوییەکەو نەظمی قورئانەکە بێو بەس. بەڵکوو ئەم جۆرە تەفسیرە بریتییە لەپاڵفتەی ئەو باسەی کە ئەم ئایەتە باسی دەکا لەگەڵ رەچاو کردنی گەلێ ئایەتو فەرموودەی تر کە قسەیان لەو باسە کردووە، وەك بەندە لەم شوێنەدا ناوەڕۆكو مەبەستی ئەم ئایەتو فەرموودانەی ترم لەگەڵ ئەم ئایەتانەی ئێرەدا موتوربەو شەتل کردووە، وە ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێ کە باسەکە زۆر درێژە دەکێشێ، دەنا ڕستە بە ڕستە ئەم تەفسیرەی سەرەوەم بەئایەتو فەرمایشتی زاناکان تەئیید دەکرد:

﴿يا بني آدم خذوا زينتكم عند كل مسجد وكلوا واشربوا ولا تسرفوا إنه لا يحب المسرفين. قل من حرم زينة الله التي أخرجها لعباده والطيبات من الرزق قل هي للذين آمنوا في الحياة الدنيا﴾، ﴿ولكل أمة أجل﴾. ﴿إن رحمة الله قريب من المحسنين﴾. ﴿ولو أن أهل القرى آمنوا واتقوا لفتحنا عليهم بركات من السماء والأرض﴾. ﴿وذر الذين اتخذوا دينهم لعبا ولهوا وغرتهم الحياة الدنيا﴾. ﴿وقالوا: إن هي إلا حياتنا الدنيا وما نحن

بمبعوثين﴾. ﴿صم وبكم في الظلمات﴾. ﴿واعلموا أنما أموالكم وأولادكم فتنة﴾. ﴿ولكن أكثر الناس لا يشكرون﴾. ئەم ئەندازەيە بەسە.

١/٤٥٧[٤٤]– عن عمرو بنِ عوفٍ الأَنْصاريِّ (رضي اللّٰه عنه) أَنَّ رسولَ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بَعَثَ أَبا عُبيدةَ بنَ الجرَّاحِ (رضي اللّٰه عنه) إلى البَحْرَيْن يَأْتي بِجزْيَتِها فَقَدِمَ بِمالٍ منَ البحْرَين، فَسَمِعَت الأَنصَارُ بقُدومِ أبي عُبَيْدَةَ، فوافَوْا صَلاةَ الفَجْرِ مَعَ رسول اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَلَمَّا صلى رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) انْصَرفَ فَتعَرَّضُوا لَهُ، فَتَبَسَّمَ رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) حِينَ رَآهُمْ، ثُمَّ قَال: أَظُنُّكُم سَمِعتُم أَنَّ أَبَا عُبَيْدَةَ قَدِمَ بِشَيء مِنَ الْبَحْرَيْن؟ فقالوا: أَجَل يا رسول اللّٰه فقَال: أَبْشِرُوا وأَمِّلُوا ما يَسرُّكُمْ، فواللّٰه ما الفقْرَ أَخْشَى عَلَيْكُمْ. وَلكنّي أَخْشى أَنْ تُبسَطَ الدُّنْيا عَلَيْكُم كما بُسطَتْ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، فَتَنافَسُوهَا كَمَا تَنَافَسُوهَا. فَتهْلِكَكُمْ كَمَا أَهْلَكَتْهُمْ. متفقٌ عليه:

**عەمری کوڕی عەوفی ئەنصاری** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحی نارد بۆ بەحرەین، کە سەرانەکەی بێنێ، کەهاتەوە بازێ سامانی لەگەڵ خۆی هێنابوو، یاریدەدەران بەمەیانزانی، سبەینێ لەپاش نوێژی بەیانی حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **ویستی بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، بەلام ئەوان بۆ بەش روویان لێنا.**

**حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **سەرنجێکی دانو زەردە خەنەیێ گرتیو فەرمووی: وا دەزانم کە بیستووتانە ئەبو عوبەیدە شتێکی لە بەحرەینەوە هێناوە! گوتیان: ئەرێ! ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: دەی موژدەتان لێ بێو بەتەمای موژدەی خۆشتریش بن، بەخوا ئیتر من ترسی ئەوەم نەماوە کە وەکی جاران هەژاریو نەبوونی پەرێشانتان بکا، بەڵکوو بەپێچەوانەوە مەترسی ئەوەتان لێ دەکەم کە جیهان بێ بەپیرتانەوەو روو بکەنە خۆشی دونیا، ئەوسا دونیا ببێ بەقیبلەتانو پەلاماری بدەنو باوەشی پیا بکەنو دونیا سەرتان بخوا، هەروەك چۆن لەممەو پێش کە رووی کردە نەتەوەکانی پێش ئێوە ئەوانیش تێی وروکانو گیرۆدەی داوی بوونو ئەوە بوو لەئەنجاما لەناوی بردن! (ش).**

---

[٤٤] بوخاری (٣١٥٨)و موسلیم (٢٩٦١).

٤٥٨/٢[٤٥]- وعن أبي سعيدٍ الخدريِّ (رضيَ اللّٰه عنـه) قـالَ: جَلَسَ رسـول اللّٰـه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَلى المِنْبَرِ وَجَلسْنَا حَوْلَهُ. فقال: إنَّ مِمَّا أَخافُ عَلَيْكُم مِنْ بَعْدِي مَا يُفْتَحُ عَلَيْكُمْ مِن زَهْرَةِ الدُّنيا وَزِينَتها. متفقٌ عيه:

**ئەبو سەعیدی خودری** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەسەر دوانگە دانیشت، ئێمەش لەدەوری دانیشتین، فەرمووی: یەکێ لەوشتانەی کە مەترسیم لێی هەیە کەلە پاش خۆم لەناوتان بەرێ لەو خۆشیو گەشیو نازو نیعمەتەیە کە لەم دونیادا دێتە ڕێتان (ش).**

٤٥٩/٣[٤٦]- وَعنه أَنَّ رسولَ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قـال: إنَّ الـدُّنْيا حُلْـوَةٌ خَضِرَةٌ وَإِنَّ اللّٰه تَعالى مُسْتَخْلِفكُم فِيهَا، فَيَنْظُرُ كَيْفَ تَعْمَلُونَ فاتَّقُوا الدُّنْيَا واتَّقُوا النِّسَـاءِ. رواه مسلم: **بڕوانە: ژمارە (٧٠/٢ ز - ٦).**

٤٦٠/٤[٤٧]- وعن أَنسٍ (رضيَ اللّٰه عنه) أَنَّ النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) قـال: اللَّهُمَّ لا عَيْشَ إلاَّ عَيْشُ الآخِرَةِ. متفقٌ عليه:

**ئەنەس** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەی خودایە! خۆت ئاگات لێیە ژین ژینی دوارۆژەو بەس! (ش).**

٤٦١/٥[٤٨]- وعنهُ عن رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قال: يَتْبَعُ المَيِّـتَ ثَلاثَـةٌ: أَهْلُهُ وَمالُهُ وَعَمَلُهُ: فَيَرْجِعُ اثْنَان وَيَبْقَى وَاحدٌ: يَرْجِعُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ وَيَبْقَى عَمَلُهُ. متفقٌ عليه: **بڕوانە (١٠٤/١٠ — ز - ١١).**

٤٦٢/٦[٤٩]- وعنه قال: قال رسولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (يُؤْتِيَ بَأَنْعَم أَهْلِ الدُّنْيَا مِن أَهْلِ النَّار يَوْمَ الْقِيامَةِ، فَيُصْبَغُ في النَّارِ صَبْغَةً ثُمَّ يُقَالُ: يا ابْنَ آدمَ هَلْ رَأَيْتَ خيراً قطُّ؟ هَلْ مَرَّ بِكَ نَعيمٌ قَطٌّ ؟ فيقول: لا واللّٰه يارَبِّ. وَيُؤْتِى بأَشَدِّ النَّاسِ بُؤْساً في الدُّنْيَا مِنْ أَهْلِ

---

[٤٥] بوخاری (١٤٦٥)و موسلیم (١٠٥٢)و (١٢٣).

[٤٦] موسلیم (٢٧٤٢).

[٤٧] بوخاری (٦٤١٣)و موسلیم (١٨٠٥).

[٤٨] بوخاری (٦٥١٤)و موسلیم (٢٩٦٠).

[٤٩] – رواه مسلم في كتاب صفة القيامة والجنة والنار، باب طلب الكافر الفداء بملء الأرض ذهبا. بڕوانە صەحیحی موسلیم بە شەرحی نەوەوی بەرگی /١٧ل/ ١٤٩. ٢٠٠٠/٥/٤ وەرگێڕ.

الجَنَّةِ فَيُصْبَغُ صَبْغَةً فِي الجَنَّةِ، فَيُقَالُ لَهُ: يا ابْنَ آدمَ هَلْ رَأَيْتَ بُؤْساً قطٌّ؟ هَلْ مَرَّ بِكَ شِدَّةٌ قَطٌّ؟ فيقولُ: لا وَاللَّه مَا مَرَّ بِي بُؤْسٌ قَطٌّ، وَلا رَأَيْتُ شِدَّةً قطٌّ) رواه مسلم.

**دیسان فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەتدا کێها لەدونیادا زۆر خۆشی بووەو لەوپەڕی نازو نیعمەتدا بووە، بەڵام لەو دونیا لەدۆزەخدایە دەیهێنن لەئاگر هەڵی دەکێشن، وەکوو جلێ هەڵی بکێشی لە ڕەنگ ئاوا، ئەوجا پێی دەگوترێ: ئەی ئادەمیزاد!! ئایا ئەوەتی تۆ هەی هەرگیز خۆشیت بینیوە؟ دەڵێ: نە بەو خوایە ئەی پەروەردگارم! بەحەیاتم چاوم بەخۆشی نەکەوتووە. وە لە دانیشتووەکانی بەهەشتیش کامیان لەجیهاندا زۆر لەتەنگانەو ناخۆشیدا بووە، دەیهێننو وەك چۆن جلێ هەڵبکێشرێ لە ڕەنگ ئاوا هەڵی دەکێشن لەنازو بەهرەی بەهەشتو ئەوسا پێی دەڵێن: ئەوەتی تۆ هەی ئایا قەت ناخۆشیت دیوە؟ هیچ سەختیو تەنگانەیەکت هاتۆتە ڕێ؟ دەڵێ: نە بەو خوایە، نە ناخۆشیم تووشبووەو نە تەنگانەم دیوە! (ئیمامی موسلیم)** (ڕەزای خودای لێ بێ).

٤٦٣/٧[٥٠] - وعن المُسْتَوْرِدِ بن شدَّادٍ (رَضِيَ اللَّه عنه) قال: قال رسولُ اللَّه (صَلَّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم): مَا الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ مِثْلُ مَا يَجْعَلُ أَحدُكُمْ أُصْبُعَهُ فِي الْيَمِّ. فَلْيَنْظُرْ بِمَ يَرْجِعُ؟) رواه مسلم.

**موستەوریدی کوڕی شەدداد** (خۆشنوودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: حەزرەت (درودو سلاوو صەلاتو ڕەحمەتو سۆزی خودای گەورەو مەزنی لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم جیهانە لەچاو ئەو جیهانی تردا وەك ئەوە وایە کە یەکێکتان پەنجەیێ بژەنێ بەناو ئاوی دەریادا، دەی باش سەرەنج بدەن کە بەقەد چەندێ ئاو لەو دەریایە هەڵدەگرێ! (م — ڕەزای خودای لێ بێ).**

٤٦٤/٨[٥١] - وعن جابر (رضِيَ اللَّه عنهُ) أَنَّ رسولَ اللَّه (صَلَّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم) مرَّ بِالسُّوق وَالنَّاسُ كتفَيْهِ، فَمَرَّ بِجَدْيٍ أَسَكَّ مَيِّتٍ، فَتَنَاوَلَهُ، فَأَخَذَ بِأُذُنِهِ، ثُمَّ قَالَ: (أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنْ يَكُونَ هَذَا لَهُ بِدِرْهَمٍ؟) فَقَالوا: مَا نُحِبُّ أَنَّهُ لَنَا بِشَيْءٍ، وَمَا نَصْنَعُ بِهِ ؟ ثم قال:

---

[٥٠] - موسلیم (٢٨٥٨).

[٥١] - موسلیم (٢٩٥٧).

(أتُحِبُّونَ أنَّهُ لَكُمْ؟ قَالُوا: وَاللّٰهِ لَوْ كَانَ حَيًّا كَانَ عَيْباً، إنَّهُ أسَكٌ. فكَيْفَ وَهو مَيِّتٌ، فقال: (فوَ اللّٰه للدُّنيا أهْونُ عَلى اللّٰه مِنْ هذا عَلَيْكُمْ) رواه مسلم.

**جابیر** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: ڕۆژێ حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **لەناو بازاڕدا ڕەت بوو، موسوڵمانەکانیش لەم شان و شانییەوە لەگەڵی دەڕۆیشتن، دای بەلای گیسکێکی کەڕیلەی مردارەوە بوودا، کوێچکەی گیسکەکەی گرت و فەرمووی: کامتان بەدرەمێ ئەمەی دەوێ؟ یاران فەرموویان: بە بەلاشیش کەسمان نامانەوێ، جا ئەوە چی لێ بکەین؟ دیسان فەرمووی: حەز دەکەن هی ئێوە بێ یان نا؟ عەرزیان کرد: بەخودا مەگەر ئەگەر زیندووش بێ هەر عەیبدارە، چونکە کەڕیلەیە، ئیتر بەمردارەوە بوویی چۆن دەمانەوێ؟ فەرمووی:** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەسا بە یەزدانی پاك ئەم دونیایە لەلای خودای گەورە گەلێ سوك و بێ خێرترە، هەتا ئەم گیسکە لەکن ئێوە! (م).**

٤٦٥/٩[٥٢] - وعن أبي ذرّ (رَضِيَ اللّٰه عنه) قال: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ النَّبيّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) في حَرَّةٍ بالمدينة فَاسْتَقْبَلَنَا أُحُدٌ فقال: يا أَبَا ذَرّ قلت: لَبَّيْكَ يا رسول اللّٰه. فقال: (مَا يَسُرُّني أنَّ عِنْدِي مِثل أُحُدٍ هذا ذَهباً تَمْضِي عَلَيَّ ثَلاثَةُ أَيَّامٍ وعِنْدِي مِنْهُ دِينَارٌ، إلاَّ شَيْءٌ أَرْصُدُهُ لِدَيْنٍ، إلاَّ أَنْ أَقُولَ بِهِ في عِبَادِ اللّٰه هكَذَا وَهَكَذا) عن يَمِينِهِ وعن شماله ومن خلفه، ثم سار فقال: (إنَّ الأَكْثَرِينَ هُمُ الأَقَلُّونَ يَومَ القيامةِ إلاَّ مَنْ قَالَ بالمَال هكَذا وهكذا) عن يمينه، وعن شماله، ومِنْ خَلفه (وَقَليلٌ مَا هُمْ). ثم قال لي: (مَكَانَك لاَ تَبْرَحْ حتَّى آتيك). ثم انْطَلَقَ في سَوادِ اللَّيْلِ حتى تَوَارَى، فسمِعْتُ صَوْتاً قَدِ ارْتَفعَ، فَتَخَوَّفْتُ أَنْ يَكُون أَحَدٌ عَرَضَ للنَّبيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَأَرَدْتُ أَنْ آتِيَهُ فَذَكَرْتُ قوله: (لا تَبْرَحْ حتَّى آتيك) فلم أَبْرَحْ حتَّى أَتَاني، فَقُلْتُ: لقد سَمِعْتُ صَوتاً تَخَوَّفْتُ منه، فَذَكَرْتُ له. فقال: (وَهَلْ سَمِعْتَهُ؟) قلت: نَعَم، قال: (ذَاكَ جِبريلُ أَتاني فقال: مَن ماتَ مِنْ أُمتِكَ لاُيشرِكُ باللّٰه شَيئاً دَخَلَ الجَنَّةَ، قلتُ: وَإنْ زَنَي وَإنْ سَرَقَ؟ قَال: وَإنْ زَنَى وَإنْ سَرَقَ) متفقٌ عليه. وهذا لفظ البخاري.

**ئەبو ذەڕ** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: جارێ لەخزمەتی حەزرەتدا بە خڕەبەرداوییەکی مەدینەدا دەڕۆیشتین، ڕوومان لە ئوحود بوو، فەرمووی: ئەی ئەبو ذەڕ! گوتم: بفەرموو قوربان! وام لەخزمەتتا. فەرمووی: ئەگەر بەقەد ئەم**

---

[٥٢] بوخاری (٦٤٤٣)و موسلیم (٩٤).

کێوی ئوحوده زێڕم هەبێ حەز ناکەم کە لەسێ ڕۆژ زیاتر هیچی لەلام بمێنێ مەگەر ئەو ئەندازەیە کە بۆ دانەوەی قەرز دایبنێم، حەز دەکەم کە ئەو کێوە زێڕە بەهەر چوار لادا، ئاواو ئاواو ئاوا، بەڕاستو چەپو لەبەردەمو لەدواوە بەناو بەندەکانی خودادا بیبەخشمەوە. ئەوجا کەمی ڕۆیشتو فەرمووی: بێگومان ئەوانەی لەجیهاندا زۆریان هەیە لەڕۆژی هەستانەوەدا کەمیان هەیە، مەگەر ئەو داراو دەوڵەمەندانەی کەماڵی ڕەحمەتیان هەیەو دریغی لێ ناکەنو بەهەر چوار لای خۆیاندا خێرو خێراتو پیاوەتی لێ دەکەن، ئەوە ئەو خودا پێداوانە لەو دونیاش وەك ئەم دونیا دەوڵەمەندن، وەلێ ئەم جۆرە بەختەوەرانە گەلێ گەلێ کەمن! ئەوجا بەمنی فەرمووی: لێرە لە شوێنی خۆت مەبزووە تا دێمەوە بۆلات. ئیتر بەو تاریکە شەوە ملی ڕێی گرتو ڕۆیشت، تا لەبەرچاوم ون بوو، زۆری پێ نەچوو دەنگێ بەرگوێم کەوت، بەرەبەرە دەنگەکە بەرزەوە دەبوو، ترسم لێ نیشت کە خوانەخواستە شتێ تووشی حەزرەت بووبێو کەسێ پەلاماری دابێ، جا خەریك بوو بچم بەهاوارییەوە، بەلام کە بیری ئەوەم کەوتەوە کە فەرمووی پێم، لەشوێنی خۆت مەجولێ تا دێمەوە بۆ لات ئیتر ئەمرەکەیم نەشکاندو لەجێگەی خۆم جوڵەم نەکرد هەتا تەشریفی هاتەوە. ئەوجا باسی ترسەکەی خۆمم بە تەواوی بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: ئەدی گوێت لێ بوو؟ عەرزیم کرد: ئەرێ. فەرمووی: ئەوە جوبرائیل بوو، هات بۆ لام، ئەم موژدە خۆشەی بۆم هێنا، فەرمووی: کە هەرکەسێ لە ئومەتم لەسەر ئیمان بمرێو لەسەر شیركو کوفر نەمرێ لەبەهەشت نائومێد نابێو سەرەنجام دەچێتە بەهەشت. منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! با حیزیی‌و دزیش بکا؟ فەرمووی: بەڵێ با زیناش بکاو، با دزیش بکا (ش) ئەمە گفتەی بوخارییە.

١٠/٤٦٦(٥٣)- وعن أبي هريرة (رضي اللّٰه عنه) عنْ رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عليْهِ وسَلّم) قال: (لو كان لي مِثلُ أُحُدٍ ذَهَباً، لَسرَّني أَنْ لا تَمُرَّ عَلَيَّ ثَلاثُ لَيالٍ وَعِنـدِي منه شَيءٌ إلاَّ شَيءٌ أُرْصِدُه لِدَينٍ) متفقٌ عليه:

لەزیمنی فەرموودەکەی پێشەوە مەزموونەکەی ڕۆیشت.

(٥٣)- بوخاری (٦٤٤٥)و موسلیم (٩٩١).

١١/٤٦٧(٥٤)- وعنه قال: قال رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): انْظُرُوا إلى مَنْ هَوَ أَسفَلُ منْكُمْ وَلا تَنْظُرُوا إلى مَنْ فَوقَكُم فهُوَ أَجْدرُ أَن لا تَزْدَرُوا نعمةَ اللّٰه عَلَيْكُمْ متفقٌ عليه وهذا لفظ مسلم. وفي رواية البخاري (إذا نَظَر أَحَدُكُمْ إلى مَنْ فُضلَ عليهِ في المالِ وَالخَلْقِ فلْيَنْظُرْ إلى مَنْ هو أَسْفَلُ مِنْهُ).

**دیسان فەرمووی: سەروەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: تەماشای حاڵی خۆتان خوارتر بکەن، تەماشای لەخۆتان بەرەوژورتر مەکەن، چونکە ئەگەر وا نەکەن لەوانەیە ئەو نازو بەهرانەی کە بەپێی حاڵ خودا داونی پێتان لەبەرچاوتان بکەون و بەکەمیان بزانن! (ش) ئەمە گفتەی موسلیمە، گێڕانەوەی بوخاری: ئەگەر کەسێ لە ئێوە تەماشای حاڵو ماڵی کەسێکی تری کرد، کەماڵو مناڵو حاڵو رەنگو رووی لەخۆی باشتر بوو، با تەماشای حاڵی خوارخۆشیەوە بکا، نەبادا دڵ لەدڵ بداو ناسوپاس دەرچێو شوکری بەهرەی خودا نەکاو خۆی بەهەرە خواروو بزانێ.**

١٢/٤٦٨(٥٥)- وعنه عن النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قال: (تَعِسَ عبْدُ الدِّينَارِ وَالدِّرْهَمِ وَالقطيفَةِ وَالخَمِيصَةِ، إنْ أُعطِيَ رضي، وَإنْ لَمْ يُعطَ لَمْ يَرْضَ) رواه البخاري:

**دیسان فەرمووی: سەروەر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پارە پەرستی پوولەکی شرەخۆر داوەشێ، هەر چاوی لەزێڕو زیوو جلو بەرگی قەیفەو رازاوەیە، هەتا چاوی لەدەستتەو تەماعی پێتە لێت رازییە کلکەلەقێت بۆ دەکا، هەر کە تەمای پێت نەما ئیتر لووتەلایە (ب).**

١٣/٤٦٩(٥٦)- وعنه (رضي اللّٰه عنه) قال: لَقَدْ رَأَيْتُ سبعِين مِنْ أَهْلِ الصُّفَّةِ، ما مِنْهُم رَجُلٌ عليه رداءٌ، إمَّا إزَارٌ، وإمَّا كِسَاءٌ، قدْ ربطُوا في أَعْنَاقِهِمْ، فَمنْهَا مَا يَبْلُغُ نِصفَ السَّاقَيْن. ومنْهَا ما يَبْلُغُ الكَعْبين. فَيجْمَعُهُ بيدِهِ كراهِيَةَ أَنْ تُرَى عوْرَتُه. رواه البخاري:

**دیسان فەرمووی: بەچاوی خۆم حەفتا کەسم لەدانیشتوانی صوففە دیوە، ئەو حەفتا پیاوە هیچ کامێکیان سەرپۆشاکیان نەبووە، یەکی بەرکۆشێ یان**

---

(٥٤) بوخاری (٦٤٩٠)و موسلیم (٢٩٦٣)و (٩).

(٥٥) بوخاری (٢٨٨٦).

(٥٦) بوخاری (٤٤٢).

شاڵینەیەکیان هەبوو، بەچمکێکی دەیان بەست بە گەردنیانەوە، هەبوو ئەو تاقە لۆجلە دەگەیشتە نیوەی لاقەکانی، هەبوو دەگەیشتە هەردوو قولە پێی، بەدەستی دەیدایەوە بەسەر کۆشیا، نەوەکوو شەرمگای ببینرێ! (ب).

١٤/٤٧٠[٥٧]- وعنه قال: قال رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): الدُّنْيا سِجْنُ المُؤْمِنِ وجنَّةُ الكَافِرِ. رواه مسلم:

فەرموویەوە: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: دونیا زیندانی موسوڵمانە بەهەشتی کافرە! (م).

١٥/٤٧١[٥٨]- وعن ابن عمر (رضي اللّٰه عنهما) قال: أَخَذ رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): بِمَنْكِبَيَّ فقال: كُنْ في الدُّنْيا كأَنَّكَ غريبٌ، أَوْ عَابِرُ سبيلٍ. وكَانَ ابنُ عمرَ (رضي اللّٰه عنهما) يقول: إذَا أَمْسيْتَ، فَلا تَنْتظِرِ الصَّباحَ وإذَا أَصْبحْتَ، فَلا تَنْتَظِرِ المَساءَ، وخُذْ منْ صِحَّتِكَ لمَرضِكَ ومِنْ حياتِكَ لِموتكَ. رواه البخاري:

ئیبنو عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سەروەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستی لەسەر شانم داناو فەرمووی: لەدونیادا خۆت بە غەریب دابنێ، یان وا دانێ کە رێبواریو بەزوویی سەفەرەکەت کۆتایی دێ. ئیبنو عومەر (رەزای خودای لێ بێ) هەمیشە دەیفەرموو: ئێوارە بەتەمای بەیانی مەبەو بەیانی بەتەمای ئێوارە مەبە!

وەکاتی لەش ساغیت بەهەل‌و فرصەت بزانەو تا لەشت ساغە تێکۆشەو زەخیرەو ئازووقە بخە بۆ کاتی نەخۆشی، وە ژیانیشت بەهەل بزانەو تێکۆشەو زەخیرە بخە بۆ پاش مردن! (ب).

١٦/٤٧٢[٥٩]- وعن أبي الْعبَّاس سَهْلِ بنِ سعْدٍ السَّاعديِّ (رضي اللّٰه عنه) قال: جاءَ رجُلٌ إلى النَّبيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فقالَ: يا رسول اللّٰه دُلَّني علَى عمَلٍ إذا عَمِلْتُهُ أَحبَّني اللّٰه، وأَحبَّني النَّاسُ، فقال: (ازْهَدْ في الدُّنيا يُحِبَّكَ اللّٰه، وَازْهَدْ فِيمَا عِنْدَ النَّاسِ يُحبَّكَ النَّاسُ). حديثٌ حسنٌ رواه ابن مَاجَه وغيره بأَسانيد حسنةٍ:

---

[٥٧]- موسلیم (٢٩٥٦).

[٥٨]- بوخاری (٦٤١٦).

[٥٩]- ئیبنو ماجه (٤١٠٢)و حاکم (٣١٣/٤).

سەهل (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) عەرزی کرد: قوربان! کارێکم پێ نیشان بدە هەتا بۆ خۆم بیکەم، کە ببێ بەهۆی ئەوە هەم خودا خۆشمی بوێ، هەم خەڵکیش خۆشمی بوێ، فەرمووی: گوێ بەدونیا مەدەو دونیات نەوێ ئەوا خودا خۆشی دەوێی وە چاوت لەدەستی خەڵك نەبێ‌و بەتەمای شتیان مەبە ئیتر ئەوانیش خۆشیان دەوێی! (ئیبنو ماجە – س/ح).

١٧/٤٧٣[٦٠]– وعن النُّعْمَان بن بَشيرٍ (رضيَ اللّه عنهما) قالَ: ذَكَرَ عُمَرُ بْنُ الخطّاب (رضي اللّه عنه) ما أصابَ النَّاسُ مِنَ الدُّنْيَا، فقال: لَقَدْ رَأَيْتُ رسول اللّه (صَلّى اللهُ عليْهِ وسلّم) يَظَلُّ الْيَوْمَ يَلْتَوي ما يَجِدُ مِنَ الدَّقَلِ ما يَمْلأُ بِهِ بطْنَهُ. رواه مسلم:

نوعمانی کوڕی بەشیر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: عومەری کوڕی خەططاب (رەزای خودای لێ بێ) باسی ئەوەی فەرموو کە چۆن ئەو خەڵکە کەوتوونەتە خۆشی‌و رابواردنی جیهانەوە، فەرمووی: ئەمە حاڵی ئێوەیە، بەڵام من بەچاوی خۆم پیغەمبەرم دیوە (دروودی خوای لەسەر بێ) رۆژ تا ئێوارێ لەبرسانا سکی خۆی هەڵدەگوشی پڕ بەسکی خۆی خورمای قەسپی دەستگیرنەدەبوو تا بیکا بەژەمێ‌و بیخوات! (م).

١٨/٤٧٤[٦١]– وعن عائشةَ (رضي اللّه عنها) قالت: تُوفِّيَ رسولُ اللّه (صَلّى اللهُ عليْهِ وسلّم) وما في بَيْتي مِنْ شَيْءٍ يَأْكُلُهُ ذُو كَبِدٍ إلاّ شَطْرُ شَعيرٍ في رَفٍّ لي، فَأَكَلْتُ مِنْهُ حَتَّى طَال عليَّ، فَكِلْتُهُ فَفَنِيَ. متفقٌ عليه:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ حەزرەت (سەرو ماڵ‌و منداڵ‌و هەست‌و نەست بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێ) لەدونیا دەرچوو ئەوەی گیانلەبەر پێی بژی لەناو رەفەکەما نەبوو، هەنێ جۆ نەبێ تا ماوەیەکی زۆر هەر لێم دەخواردو هەر تەواو نەدەبوو، تا لێی وەڕس بووم، چووم کێشام ئیتر پیت‌و فەڕو بەرەکەتەکەی نەماو تەواو بوو (ش – خا = بوخاری‌و موسلیم، رەزای خودایان لێ بێ).

١٩/٤٧٥[٦٢]– وعن عمر بنِ الحارث أخي جُوَيْرِية بنْتِ الحَارثِ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رضي اللّه عنهما) قال: مَا تَرَكَ رسولُ اللّه (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عِنْدَ مَوْتِهِ دِيناراً وَلا دِرْهَماً،

---

(٦٠) موسلیم (٢٩٧٨).

(٦١) بوخاری (٣٠٩٧)و موسلیم (٢٩٧٣).

(٦٢) بوخاری (٢٧٣٩).

ولا عَبْداً، وَلا أَمَةً، وَلا شَيْئاً إلاَّ بَغْلَتَهُ الْبَيْضَاءَ الَّتِي كَان يَرْكَبُهَا، وَسِلاحَهُ، وَأَرْضاً جَعَلَهَا لابْنِ السَّبِيلِ صَدَقَةً. رواه البخاري:

**عەمری کوڕی حاریث کە برای جووەیریەی کچی حاریثی خێزانی پیغەمبەر بوو، درودی خودا لەسەر پیغەمبەرو رەزای خودا لەوان بێ فەرمووی: کاتێ کە پیغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **مرد، نەپوول و پارەو نەزێڕو زیوو نە بەندەو کەنیزەك و نە هیچی تری لەپاش بەجێ نەما، تەنیا هێسترە سپێکەی نەبێ، کەلە ژیانی خۆیدا سواری دەبوو، لەگەڵ چەکەکەی، پارچەیێ زەویشی هەبوو کردبووی بە وەقف بۆ رێبوار (ب).**

٢٠/٤٧٦ [٦٣]- وعن خَبَّابِ بن الأَرَتِّ (رضي اللّٰه عنه) قال: هَاجَرْنَا مَعَ رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) نَلْتَمِسُ وَجهَ اللّٰه تعالى فَوَقَعَ أَجْرُنا على اللّٰه، فَمِنَّا مَنْ مَاتَ وَلَمْ يأْكُلْ مِنْ أَجرِهِ شَيْئاً. مِنْهُم مُصْعَبُ بن عَمَيْر (رضي اللّٰه عنه) قُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ، وَتَرَكَ نَمِرَةً، فَكُنَّا إِذَا غَطَّيْنَا بِهَا رَأْسَهُ، بَدَتْ رِجْلاهُ، وَإِذَا غَطَّيْنَا بِهَا رِجْلَيْهِ، بَدَا رَأْسُهُ، فَأَمَرَنَا رَسُولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنْ نُغَطِّيَ رَأْسَهُ، وَنَجْعَلَ عَلَى رِجْلَيهِ شَيْئاً مِنَ الإِذْخِرِ، ومِنَّا مَنْ أَيْنَعَتْ لَهُ ثَمَرَتُهُ. فَهُوَ يَهدبنا، متفقٌ عليه:

**خەبباب** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: ئێمە کاتی خۆی کە رەومان کرد لە مەککەوە بۆ مەدینە مەبەستمان لێی رەزای خودای گەورە بوو، لەبەر ئەوە پاداشتمان کەوتە سەر خودا، هەمان بوو کۆچی دوایی کردو هیچی لەپاداشی باشی خۆی لەم دونیایە نەخواردو هەمووی لەپێش خۆیەوە رەت کرد بۆ ئەو دونیا، یەکێك لەو خوداپێداوانە موصعەبی کوڕی عومەیر بوو،** (خودای لێ رازی بێ) **کە لە رۆژی شەڕی چیای ئوحوددا کوژرا، عابایەکی کێرکێڕی لێ بەجێما کردمان بەکفنی، کە دەماندا بەسەر قاچیدا سەری دەردەکەوت، کە دەماندا بەسەر سەریدا قاچەکانی دەردەکەوت، ئیتر حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: کە لەناو گۆڕەکەیدا بە عاباکەی خۆی لای سەری داپۆشن و هەنێ سورناتکە بدەین بەسەر قاچەکانیدا. هەیشمانە کە باخەکەی خەملیوەو خۆش حۆش بەرەکەی دەرنێ! (متفق علیه).**

---

[٦٣]- بوخاری (١٢٧٦)و موسلیم (٩٤٠).

٤٧٧/٢١(٦٤)– وعن سَهْلِ بن سَعْد السَّاعديِّ (رضي اللّٰه عنه) قال: قال رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (لَوْ كَانَت الدُّنْيَا تَعْدِلُ عِنْدَ اللّٰه جَنَاحَ بَعُوضَةٍ، مَا سَقَى كَافراً منْها شَرْبَةَ مَاءٍ) رواه الترمذي. وقال حديث حسن صحيح:

**سەهل** (رەزای خودای لێ بێ) **لە حەزرەتەوە دەفەرموێ: ئەگەر ئەم دونیایە لەلای خودا بایەخی باڵی مێشولەیەکی هەبوایە، یەك قوم ئاو چییە لێی نەدەدا بەهیچ کافرێ (واتە: ئەوە کە کافرو تاوانبار دەبینرێن وان لەوپەڕی نازو نیعمەتو خۆشیدا، ئەوە لەبەر نازداریو قەدرو رێزی خۆیان نییە کە وان لەو خۆشییەدا، بەڵکوو لەبەر بێ قەدریو بێ بایەخی دونیایە. پەڕۆ شڕ بەکەڵکی چی دێ؟ مەگەر دۆم بیکا بەکڵاش. (ت – ح/ح/ص).**

٤٧٨/٢٢(٦٥)– وعن أبي هُرَيْرَة (رضي اللّٰه عنه) قال : سمعتُ رسولَ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يقول: أَلاَ إِنَّ الدُّنْيَا مَلْعُونَةٌ، مَلعون مَا فيها، إلاَّ ذِكْرَ اللّٰه تعالى، ومَا وَالاَهُ وَعالماً وَمُتَعلّماً. رواه الترمذي وقال: حديثٌ حسنٌ:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: بزانن کە دونیاو هەرچی لەدونیادایە هەمووی لەعنەتو نەفرین لێکراوە، ئەم دوو شتەی لێ دەرچێ:**

**یەکەم: یادو زیکری خوداو ئەوەی دەبێ بەمایەی رەزای خودای گەورە.**

**دووەم: مامۆستاو فەقێ (ت – ح/ح).**

**دیارە ئەوەی دەبێ بەمایەی رەزای خودا ئەمانە دەگرێتەوە: ماڵو منداڵی رەحمەتو کەسابەتی حەڵاڵو پێنج روکنەی ئیسلامو راگرتنی یاسی ئاین بەگشتی، تەنانەت خۆ لادانیش لەبێ شەرعی هەر بە تاعەتی خودا دادەنرێو بەر ئەم فەرموودە پیرۆزە دەکەوێ.**

٤٧٩/٢٣(٦٦)– ٤٧٩– وعن عَبْدِ اللّٰه بن مسعودٍ (رضي اللّٰه عنه) قال: قال رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): لا تَتَّخِذُوا الضَّيْعَةَ فَتَرْغَبُوا في الدُّنْيا. رواه الترمذي وقال: حديثٌ حسنٌ:

---

(٦٤) تيرميذي (٢٣٢١).

(٦٥)- تيرميذي (٢٣٢٣).

ئیبنو مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ماڵپەرست مەبن‌و خوو مەدەنە باخ‌و بۆلاخ‌و زەوی‌و زار، مەبادا دونیا ببێ بە ئاواتتان! (ت: ح/ح).

٤٨٠/٢٤[٦٧]– وعن عبدِ اللّٰه بنِ عمرو بنِ العاص (رضي اللّٰه عنهما) قال: مرَّ عَلَيْنا رسولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) وَنحنُ نُعالِجُ خُصًّا لَنا فقال: ما هذا؟ فَقُلْنا: قَدْ وَهِي، فَنحْنُ نُصْلِحُه، فقال: ما أَرَى الأَمْرَ إلاَّ أَعْجَلَ مِنْ ذلكَ. رواه أبو داود، والترمذيُّ بِإسناد البخاريِّ ومسلم، وقال الترمذيُّ: حديثٌ حسنٌ صحيحٌ.

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لەلامانەوە رابورد، زنجێکمان هەبوو پەرپووت بوو بوو، خەریکبووین بیرازمان دەکردو فەرمووی: ئەمە چییە؟ گوتمان: قوربان! زنجەکەمان شلۆق بووە، وا چاکی دەکەینەوە، فەرمووی: کێ دەڵێ کە ئێوە ئەوەندە دەژین تا ئەم کوخە دەڕوخێ! من لەو باوەڕەدام کە تەمەن ئەوەندەی بە بەرەوە نییەو دوور نیە کە هێرشی مەرگ زووتر یەخەتان نەگرێ! (د/ت – س/ص/ح/ح).

٤٨١/٢٥[٦٨]– وعن كَعْبِ بنِ عِياضٍ (رضي اللّٰه عنه) قال: سمعتُ رسولَ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) يقول: إنَّ لِكُلِّ أُمَّةٍ فتنةً، فِتنَةُ أُمَّتي المَالُ. رواه الترمذي وقال: حديثٌ حسنٌ صحيحٌ.

کەعب فەرمووی: ژنەوتم لە سەروەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: هەر گەلێ فیتنەیەکی تایبەتی بووە، فیتنەی ئومەتی من ماڵە! (ت – ح/ح/ص).

٤٨٢/٢٦[٦٩]– وعن أبي عمرو، ويقالُ: أبو عبدِ اللّٰه، ويقال: أبو لَيْلى عُثْمانُ بنُ عَفّانَ (رضي اللّٰه عنه) أَنَّ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قال: لَيْسَ لابْن آدمَ حَقٌّ في سِوى هَذِهِ الخِصَال: بَيْتٌ يَسْكُنُهُ، وَثَوْبٌ يُوَارِي عَوْرَتَهُ وَجِلْفُ الخُبزِ، وَالمَاءِ. رواه الترمذي وقال: حديث صحيح.

---

[٦٦]- تیرمیذي (٢٣٢٩).

[٦٧]- ئەبو داود (٥٢٣٦)و تیرمیذی (٢٢٣٦).

[٦٨]- تیرمیذي (٢٣٣٧).

[٦٩]- تیرمیذي (٢٣٤٢).

**عوثمان** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: سەروەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئادەمیزاد تەنیا مافی ئەم چەند شتەی هەیەو بەس: خانوویێ تیا دانیشێت، جلکێ شەرمو عەورەتی بشارێتەوە، نانی وشكو ئاو (ت – ح/ص).**

٤٨٣/٢٧[٧٠]– وعنْ عبْدِ اللّه بنِ الشِّخِّيرِ (بكسر الشين والخاءِ المشددةِ المعجمتين) (رضي اللّه عنه)، أَنَّهُ قَالَ : أَتيْتُ النَّبيَّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)وهُوَ يَقْرأُ : { أَلْهَاكُمُ التَّكاثُرُ } قال: (يَقُولُ ابنُ آدَم: مَالي، مَالي، وَهَل لَكَ يَا ابن آدمَ مِنْ مالِكَ إلاَّ مَا أَكَلت فَأَفْنَيْتَ، أو لبِستَ فَأَبْلَيْتَ، أَوْ تَصَدَّقْتَ فَأَمْضيْتَ؟) رواه مسلم.

**عەبدوڵڵای کوڕی شیخخیر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: چوومە خزمەتی حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **خەریك بوو سوورەتی (ئەلهاکوموتتەکاثور)ی دەخوێند، فەرمووی: ئادەمیزاد هەر دەکوڕوزێتەوەو دەڵێ: ماڵەکەم واو ماڵەکەم وا، ئاخر پێم نالێی ماڵەکەت کامەی هی تۆیە؟! ئەم سێ شتەی لێ دەرچێ:**

**یەکەم: ئەوەی کە دەیخۆیی‌و لەناوی دەبەی.**

**دووەم: ئەوەی کە دەیپۆشی‌و کۆنی دەکەی.**

**سێیەم: ئەوەی کە دەیکەی بەخێرو پاشەکەوتی دەکەی (م).**

٤٨٤/٢٨[٧١]– وعن عبدِ اللّه بن مُغَفَّلٍ، (رضي اللّه عنه)، قال : قال رجُلٌ للنَّبِيِّ ص: يارسولَ اللّه، واللّه إنِّي لأُحِبُّكَ، فقالَ : (انْظُرْ ماذا تَقُولُ ؟) قال : وَاللّه إنِّي لأُحِبُّكَ، ثلاثَ مرَّاتٍ، فقال : (إنْ كُنْتَ تُحبُّني فَأَعِدَّ للفقر تِجْفافاً، فإنَّ الفَقْر أَسْرَعُ إلى من يُحِبُّني مِنَ السَّيْل إلى مُنْتَهَاهُ) رواه الترمذي وقال حديث حسن.

**عەبدوڵڵای کوڕی مەغەففەل** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پیاوێ بە حەزرەتی گوت: ئەی پێغەمبەری خودا! بەخودا من تۆم زۆر خۆش دەوێ، پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئاخر باش وردبەرەوە کە قسەکەت کوێ دەگرێتەوە! سێ جار ئەم گفتوگۆیەیان دووبارە کردەوە، ئەوجا حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەگەر بەڕاستی تۆ منت خۆش دەوێ ئەوا پەلاسێ وەك نەرمەزین ئامادە بکە بۆ خۆت، چونکە هەژاری وەك شاسوار، سواری شانت دەبێ، لەڕاستیدا هەژاری – وەك لافاوی**

---

[٧٠] موسلیم (٢٩٥٨).

[٧١] تیرمیذي (٢٣٥١).

بەرۆژوور كە چۆن خێرا دەگاتە ناو ئاوەڕۆكەی – ئەویش ئاوا، بگرە خێراتریش دەگاتە سەر ئەو كەسەی كە منی خۆش دەوێ! (ت – س/ص).

٤٨٥/٢٩[٧٢]- وعن كَعبِ بنِ مالكٍ، (رضي اللّٰه عنه)، قال : قال رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (مَاذِئْبَان جَائعَانِ أُرْسِلا في غَنَم بأَفْسَدَ لَهَا مِنْ حِرْصِ المَرْءِ على المَالِ وَالشَّرفِ لِدِينهِ) رواه الترمذي وقال : حديث حسن صحيح.

**كەعب** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: دوو گورگی برسی بکەونە ناو رانێ، ئەوەندەی ئەم دوو شتە زیان بەدین و ئایینی پیاو دەگەیەنن، ئەو دوو گورگە ئەوەندە زیان بەو رانە ناگەیەنن: یەکەم حەریسیی و سووربوون لەسەر ماڵ، دووەم: حەریس بوون لەسەر پایە بەرزیی و دونیایی! (ت – ح/ح/ص).**

٤٨٦/٣٠[٧٣]- وعن عبدِ اللّٰه بن مَسْعُودٍ (رضي اللّٰه عنه)، قال : نَامَ رسولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)على حَصِيرٍ فَقَامَ وَقَدْ أَثَّرَ في جَنْبِهِ، قُلْنَا : يا رَسُولَ الله لو اتَّخَذْنَا لكَ وِطَاءً، فقال : (مَالي وَلِلدُّنْيَا ؟ مَا أَنَا في الدُّنْيَا إلاَّ كَراكبٍ اسْتَظَلَّ تحتَ شَجرَةٍ ثُمَّ رَاحَ وَتَرَكَهَا). رواه الترمذي وقال : حديث حسن صحيح.

**ئیبنو مەسعوود** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەسەر حەسیرێ نوستبوو، کە هەڵسا حەسیرەکە چەقیبووە لاتەنیشتیی و جێگەی تەڵەکانی لاقەبرغەی چاڵ کردبوو، گوتمان: قوربان! بریا دۆشەکێکمان بۆ دروست دەکری! فەرمووی: من لەکوێ و دونیا لەکوێ! حاڵی من لەم جیهانەدا وەك حاڵی سوارێکی رێبوار وایە، کە لە ژێر سێبەری دارێکا وچانێ بگرێ و پشوویێ بداو لەپاش کەمێ بڕواو بەرێی خۆیەوەو درەختەکە بەجێ بێڵێ! (ت – س/ص).**

٤٨٧/٣١[٧٤]- وعن أبي هريرة (رضي اللّٰه عنه)، قال : قال رسولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (يَدْخُلُ الفُقَراءُ الجَنَّةَ قَبْلَ الأَغْنِيَاءِ بِخَمْسِمائَةِ عَامٍ) رواه الترمذي وقال : حديث صحيح.

---

[٧٢]- تیرمیذي (٢٣٧٦).

[٧٣]- تیرمیذي (٢٣٦٧).

[٧٤]- تیرمیذي (٢٣٥٢).

ئـەبو هـورەيرەوە (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پیغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: هـەزارانی موسـوڵمانان بـەپێنـج سـەد سـاڵ لـەپێش دەوڵەمەندەكانـەوە دەچـنە بەهەشت! (ت/ح/ح/ص).

٤٨٨/٣٢[٧٥] - وعن ابن عَبَّاسٍ، وعِمْرَانَ بن الحُصَيْن، رضي اللّه عنهم، عن النَّبيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال: (آطَّلَعْتُ في الجَنَّةِ فَرَأَيْت أَكْثَرَ أَهلِهَا الفُقَراءَ. وَاطَّلَعْتُ في النَّارِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّساءَ) متفقٌ عليه. من رواية ابن عباس :ورواه البخاري أيْضاً من روايةِ عِمْرَان بنِ الحُصَيْن..

ئیبنـو عـەبباس‌و عیمـران (رەزای خودایـان لێ بێ) فـەرموویان: حـەزرەت (درووودی خوای لەسـەر بێ) فەرمووی: سەرەنجی ناو بەهەشتم دا: تەماشام كرد زۆربەی خەڵكەكەی لەهەژارانی جیهان بوون، سەرەنجی ناو دۆزەخیشم دا روانیم زۆربەی خەڵكەكەی لەژنانی جیهان بوون (ش - رەزای خودایان لێ بێ).

٤٨٩/٣٣[٧٦] - وعن أُسامةَ بنِ زيدٍ رضيَ اللّه عنهما، عن النَّبيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال : (قُمْتُ عَلى بَاب الجَنَّةِ، فَكَانَ عَامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا المَساكينُ. وأَصحَابُ الجِدِّ مَحْبُوسُونَ، غَيْرَ أَنَّ أَصحَابَ النَّار قَد أُمِرَ بِهِمْ إلى النَّارِ) متفقٌ عليه: و (الجَدُّ) الحَظُّ وَالغِنَى. وقد سبق بيان هذا الحديث في باب فضلِ الضَّعَفَةِ. بڕوانه (٧/٢٥٨/٣٢ز).

٤٩٠/٣٤[٧٧] - وعن أبي هريرة، (رضي اللّه عنه)، عن النَّبيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال : (أَصْدَقُ كَلِمَةٍ قَالَهَا شَاعِرٌ كَلِمَةُ لَبِيدٍ : أَلا كُلُّ شيْءٍ ما خَلا اللهَ بَاطِلُ. متفقٌ عليه.

ئـەبو هـورەيرەوە (رەزای خـودای لێ بێ) فـەرمووی: حـەزرەت (درودو صـەلات‌و سـەلامی خودای گەورەی لەسەر بێ، خۆی‌و كەس‌و كارو یارانی) فەرمووی: راستترین وشەیێ كە شاعیر بە شیعر گوتبێتی ئەم شیعرەی لەبیدە كە دەڵێ:

ألأكـل شـيئ مـا خـلا الله باطـل
وكـــل نعـــيم لا محالـــة زائـــلُ

---

[٧٥] بوخاری (٣٢٤١)و موسلیم (٢٧٣٧).

[٧٦] بڕوانە: (٧/٢٥٨/ ز ٣٢).

[٧٧] بوخاری (٣٨٤١)و موسلیم (٢٢٥٦).

ئــــەم دنيايـــــە كــــاو بايــــە
هەرچـــى تيايـــە بـــێ بەقايـــە!
هــــيچو پـــووچو بـــێ ئەنوايـــە
ئــەوەی راســت بــێ بــەس خودايــە!

(ش – خا = شەيخان: بوخاریو موسليم، (رەزای خودايان لێ بێ)

## ٥٦ – باسی خێرو بەهرەی برسێتیو سادەیی گوزەرانو ژينی زبر. وە كەم كردنەوەی خواردنو كەم نۆشينو نەكردنی جلو بەرگی كەشخەو پشتگوێ خستنی ئارەزووەكانی دەروون[1]

## باب فضل الجوع وخشونة العيش والأقتصاد على القليل من المأكول والمشروب والملبوس وغيرها من حظوظ النفس وترك الشهوات

قال الله تعالى: {فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلَاةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا، {إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَأُوْلَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ شَيْئًا – مريم/٥٩ – ٦٠}.

واتە: وەچەيەكی نارەسەنی نانەجيبی وايان لەپاش كەوتەوە، شوێنی هەواو هەوەسی نەفسو شەيتان كەوتنو وازيان لەنوێژ هێنا، كە كۆڵەكەی دينەو شوێن ئارەزوبازی كەوتن، ئەوانە هەروا بەئاسانی قوتاريان نابێ، لەقيامەتا تووشی رۆژی رەشی خۆيان دەبنو دەكەونە شيوی غەييەوە كەوا لەناو ناخی دۆزەخدا، بەڵام دەرگەی تەوبە هەميشە وازە، ئەوەی لە خراپەی خۆی پەشيمان ببێتەوەو بگەڕێتەوە بۆلای خوداو لە كردەوەی خراپ واز بێنێو دەست بكا بە كردنی كاری باش، ئيتر خودا دەرووی رەحمەتی لێ دەكاتەوەو دەيخاتە بەهەشتەوەو كەمو زۆر ستەمو زۆری لێ ناكاو پاداشی باشی خۆی بەتەواوی وەردەگرێ. {فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ فِي زِينَتِهِ قَالَ الَّذِينَ يُرِيدُونَ الْحَيَاةَ الدُّنيَا يَا لَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَا أُوتِيَ قَارُونُ إِنَّهُ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ، وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ اللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا – القصص/٧٩ – ٨٠}.

---

[1] تكايە بڕوانە بەرگی نۆ تاجوول ئوصوول: ل – ٣١٥ هەتا ٣٤١ بۆ فامی تەواو ئەم بابەتە. ٢٠٠٠/٤/٢٩ (وەرگێڕ).

قاروون خۆی رازانەوەو لەگەڵ دەستو پێوەندەکەی خۆیدا بەسواری وڵاخی کەشخە بە کەشوفشێکەوە هاتە دەرەوەو دەستی کرد بەخۆ نواندن بە بەرچاوی هۆزەکەیەوە، ئەوانەی کە ئاشقی ژیانی بێ بەقای ئەم جیهانەن، یەکسەر پڕ بەدەم خۆزگەیان پێ خواستو گوتیان: ئای لەم بەختەوەرە، خۆزگا ئێمەیش وەك قاروون ئاوا داراو دەوڵەمەندو دەست ڕۆییو دەبووین، بەڕاستی بەختێکی زۆر گەورەو شانسێکی زۆر چاکی هەیە. وەلێ زاناو داناکان فەرموویان: ماڵ خراپینە، خۆزگە بەچی دەخوازن، کەی ئەوە ماڵی رەحمەتە، ئەوە هۆی تورەیی خودایە، بزانن کە ئەوەی دەبێ بەمایەی رەزای خوداو دەبێ بەهۆی بەشو بارەی باشو پاداشتی چاك لەلای خودا لەهەردوو جیهاندا، ئەوە مایەی خێرو خۆشییە بۆ ئەو موسوڵمانەی کە کردەوەی باش دەکا بە ئومێدی سۆزو رەحمەتی خودا.

وقال تعالى: {ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ – التكاثر/٨} . ماناکەی لەپێشەوە رابورد.

وقال تعالى: {مَّن كَانَ يُرِيدُ الْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُ فِيهَا مَا نَشَاء لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُ جَهَنَّمَ يَصْلاهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا – الإسراء/١٨} .

واتە: ئەو کەسەی کە کاروکردەوەی بۆ رەزای خودا نییەو بۆ خۆشیو رابواردنی ئەم دوو سێ رۆژەی ژیانی دونیایە ئەوە دوور نیە کە بۆ بازێ لەم دونیاپەرستانە لەم دونیا بێ بەقایەدا لەسەر خواستنی خۆمان هەنێ لە خۆشی دونیایان پێ بدەین، لەپاشا لەو دونیا لەناو ئاگری دۆزەخدا بوسووكو ترۆیی دوور لەرەحمەت دەیانگەوزێنین.

والآيات في الباب كثيرة معلومة. ئایەتی تری لەم بابەتە زۆرنو زانراون.

٤٩١/١[٧٨] - وعن عائشةَ، رضي اللّه عنها، قالت : ما شَبعَ آلُ مُحمَّدٍ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)مِنْ خُبْزِ شَعِيرِ يَوْمَيْنِ مُتَتابِعَيْنِ حَتَّى قُبِضَ. متفقٌ عليه. وفي رواية : مَا شَبعَ آلُ مُحمَّد (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)مُنْذُ قَدِمَ المَدِينة مِنْ طَعامِ البرِّ ثَلاثَ لَيالٍ تِباعاً حَتَّى قُبِض.

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خێزانی موحەممەد (دروودی خودای گەورەی لەسەر بێ) هەتا ئەو رۆژەی موحەممەد (دروودی خودای گەورەی لەسەر بێ) وەفاتی کرد نەبووە دوو رۆژ لەسەریەك تێر سکی خۆیان نانی جۆ بخۆن. (ش) لەگێڕانەوەیەکا: لەو کاتەوە کە پیغەمبەر (دروودی

---

[٧٨] بوخاری (٥٤١٦)و موسلیم (٢٩٧٠) (٢٠)و (٢٢)

خوای لەسەر بێ) **کۆچی کرد لەمەککەی پیرۆزەوە بۆ مەدینەی نازدار تا ئەو رۆژەی کە خودا بردییەوە بۆلای خۆی لەم ماوەیەدا خێزانەکەی سێ شەو لەسەریەك تێر سکیان نانی گەنمیان نەخواردووە! (ش/ت/تاج).**

٤٩٢/٢[٧٩]- وعن عُرْوَةَ عَنْ عائشة رضي اللّٰه عنها، أَنَّهَا كَانَتْ تقُولُ : وَاللّٰه يا ابْنَ أُخْتِي إِنْ كُنَّا لَنَنْظُرُ إلى الهِلال ثمَّ الهِلال. ثُمَّ الهلال ثلاثةُ أَهِلَّةٍ في شَهْرَيْن. وَمَا أُوقِدَ في أَبْيَاتِ رسول اللّٰه (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)نارٌ. قُلْتُ : يَا خَالَةُ فَمَا كَانَ يُعِيشُكُمْ ؟ قالتْ : الأَسْوَدَان : التَّمْرُ وَالمَاءُ إلاّ أَنَّهُ قَدْ كَانَ لرسول اللّٰه (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)جِيرانٌ مِنَ الأَنْصَارِ. وَكَانَتْ لَهُمْ مَنَائِحُ وَكَانُوا يُرْسِلُونَ إلى رسول اللّٰه (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)مِنْ أَلبانها فَيَسْقِينَا. متفقٌ عليه.

**عوروە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: عائیشە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: ئەی خوشکەزای خۆم! بەخودا جاری وابووە سێ مانگی یەك شەوەمان لەسەر یەك دیوە، کە دەق دەکاتە دوو مانگی رێك، لە ماوەی ئەو دوو مانگەیەدا ئاگر لەماڵەکانی خێزانەکانی پیغەمبەردا** (درودی خوای لەسەر بێ) **نەکراوەتەوە. عوروە فەرمووی: منیش گوتم: ئەی باشە پووری! بەچی دەژیان؟ فەرمووی: تەنها لەسەر خورماو ئاوی روت دەژیاین! بەڵام چەند ماڵێکی ئەنصاریی هاوسای پیغەمبەر بوون، ئاژەڵی بەشیریان هەبوو، جا لەشیری ئەوانە بەشی پیغەمبەریان دەدا، ئەویش ئەو شیرەی دەرخواردی ئێمە دەدا (ش/ت).**

٤٩٣/٣[٨٠]- وعن أبي سعيدٍ المقْبُريِّ عَنْ أبي هُرَيرةَ (رضي اللّٰه عنه). أَنه مَرَّ بِقَوم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ شَاةٌ مَصْلِيةٌ. فَدَعَوْهُ فَأَبَى أَنْ يَأْكُلَ، وقال : خَرج رسول اللّٰه (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)من الدنيا ولَمْ يشْبعْ مِنْ خُبْزِ الشَّعِيرِ. رواه البخاري.

**سەعیدی مەقبوری فەرمووی: ئەبو هورەیرەوە** (رەزای خودای لێ بێ) **لەلای پیاوگەلێکەوە رەت بوو، مەڕێکی برژاویان لەبەر دەستدا بوو، خولکیان کرد کە لەگەڵیان بخوات، ئەویش رازی نەبوو کەلێی بخوات و فەرمووی: منیش گۆشتی بریانی بخۆم و پیغەمبەریش** (درودی خوای لەسەر بێ) **تا لەدونیا دەرچوو تێری نەخوارد لەنانی جۆ، شتی وا چۆن دەبێ! (ب – خ).**

---

[٧٩]- بوخاری (٢٥٦٧) و موسلیم (٢٩٧٢).

[٨٠]- بوخاری (٥٤١٤).

٤٩٤/٤[٨١]- وعن أنسٍ (رضي اللّٰه عنه)، قال : لَمْ يأْكُل النَّبيّ (صلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسلّم)على خِوَانٍ حَتَّى مَاتَ، ومَا أَكَلَ خُبزاً مرَقَّقاً حَتَّى مَاتَ. رواه البخاري. وفي روايةٍ له : ولا رَأَى شَاةً سَمِيطاً بِعَيْنِهِ قطُّ.

**ئەنەس (خۆشنوودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودو سڵاوی خودای لەسەر بێ) هەرگیز لەسەر مێز نانی نەخوارد تا وەفاتی کرد، وە تا لەدونیاش دەرچوو نانی تێری نەخوارد (ب).**

**لەگێڕانەوەیەکی تری بوخاریدا: من ئاگام لێ بێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هەتا گەیشتەوە بەحوزوری یەزدانی پاك قەت بەچاوی خۆی نە نانی تێری دیبوو، نەبەرخی بریانی دیبوو! (ب/تاج).**

٤٩٥/٥[٨٢]- وعن النُّعمان بن بشيرٍ رضي اللّٰه عنهما قال : لقد رَأَيْتُ نَبِيَّكُمْ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وما يَجِدُ مِنْ الدَّقَلِ ما يَمْلأُ به بَطْنَهُ، رواه مسلم.

**نوعمانی کوڕی بەشیر (ڕەزای خودای گەورە لەخۆیو بابی) فەرمووی: ئەوەتانێ لەخواردنو خواردنەوە، لەعەیشو نۆشی باشو خۆش چیتان دەوێ هەیە، لەگەڵ ئەوەدا بەچاوی خۆم حەزرەتی پێغەمبەرم دیوە، ڕۆژ تا ئێوارێ سکی خۆی دەگوشی پڕ بەسکی خۆی خورمای قەسپی دەستگیر نەدەبوو تا بیخوات (م/تاج).**

٤٩٦/٦[٨٣]- وعن سهل بن سعدٍ (رضي اللّٰه عنه)، قال : ما رَأى رُسولُ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)النّقيُّ منْ حِينَ ابْتعَثَهُ اللّٰه تعالى حتَّى قَبَضَهُ اللّٰه تعالى، فقيل لَهُ هَلْ كَانَ لَكُمْ في عهْد رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)مَناخلُ ؟ قال : ما رأى رسولُ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)مُنْخَلاً مِنْ حِينَ ابْتعَثَهُ اللّٰه تَعَالَى حَتَّى قَبَضُه اللّٰه تعالى، فَقِيلَ لهُ : كَيْفَ كُنْتُمْ تأْكُلُونَ الشَّعِيرَ غيرَ منْخُولٍ ؟ قال : كُنَّا نَطْحُنَهُ ونَنْفُخُهُ، فَيطيرُ ما طارَ، وما بَقِي ثَرَّيْنَاهُ. رواه البخاري.

---

[٨١] بوخاری (٥٤١٥).

[٨٢] موسلیم (٢٩٧٨).

[٨٣] بوخاری (٥٤١٣).

گوترا بەسەهل: ئايا پيغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نانی تيری ئاردە سپی خواردووە؟ فەرمووی: پيغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەوكاتەوە خودا كردی بە پيغەمبەر تا ئەو رۆژەی چووەوە ديداری خودا چاوی بەنانی سپی نەكەوتووە، وەپێشيان گوت: ئەی بەسەرينی پيغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئايا هێڵەكتان هەبووە؟ فەرمووی: نەء، نەمان بوو، گوتيان: ئەی جۆتان چۆن چارە دەكرد؟ بەبێ بێژانەوە چۆن دەخورا؟ فەرمووی: دەمان هاڕیو لەپاشا كە دەمان ويست بيكەين بەنان فوومان لێ دەكرد، جا ئەوەی با دەيبرد دەيبردو ئەوەشی دەمايەوە دەمانگرتەوە بەهەويرو دەمانشێلا دەمانكرد بەنان (ب - خ).

٤٩٧/٧[٨٤]- وعن أبي هُريرةَ (رضي اللّه عنه)قال : خَرَجَ رَسُولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)ذاتَ يَوْمٍ أَوْ لَيْلَةٍ، فَإذا هُوَ بِأَبي بكْرٍ وعُمَرَ رضي اللّه عنهما، فقال : (ما أخْرَجَكُما مِنْ بُيُوتِكُما هذِهِ السَّاعَةَ؟) قالا : الجُوعُ يا رَسولَ اللّه. قالَ : (وَأنا، والّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لأَخْرَجَنِي الّذِي أَخْرَجَكُما. قُوما) فقَاما مَعَهُ، فَأَتَى رَجُلاً مِنَ الأَنْصارِ، فإذا هُوَ لَيْسَ في بيتِهِ، فَلَمَّا رَأَتْهُ المرأَةُ قالَتْ : مَرْحَباً وَأَهْلاً. فقال لها رَسُولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (أَيْنَ فُلانٌ) قالَتْ : ذَهَبَ يَسْتَعْذِبُ لَنا الماءَ، إذْ جاءَ الأَنْصاريُّ، فَنظَرَ إلى رَسُول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)وَصاحِبَيْهِ، ثُمَّ قالَ: الحَمْدُ للّه، ما أَحَدٌ اليَوْمَ أَكْرَمَ أَضْيافاً مِنِّي فانْطَلَقَ فَجاءَهُمْ بِعِذْقٍ فِيهِ بُسْرٌ وتَمْرٌ ورُطَبٌ، فقال : كُلُوا، وَأَخَذَ المُدْيَةَ، فقال لَهُ رسُولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (إيَّاكَ وَالحَلُوبَ) فَذَبَحَ لَهُمْ، فَأَكلُوا مِنَ الشَّاةِ وَمِنْ ذلكَ العِذْقِ وشَرِبُوا. فلمَّا أَنْ شَبِعُوا وَرَوُوا قال رسولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)لأَبي بكرٍ وعُمَرَ رضي اللّه عنهما : (وَالّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَتُسْأَلُنَّ عَنْ هذَا النَّعيمِ يَوْمَ القِيامَةِ. أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُيُوتِكُمُ الجُوعُ، ثُمَّ لَمْ تَرْجِعُوا حَتَّى أَصابَكُمْ هذا النَّعِيمُ) رواه مسلم.

ئەبو هورەيرەوە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: رۆژێ پيغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەكاتێكی وادا لەماڵ دەردەچێ كە عادەتی نابێ لەو كاتەدا لەماڵ دەربچێ، يان كەس لەو كاتەدا بچن بۆ لای، جا ئەبوبەكر هات بۆ لای، فەرمووی: ئەی ئەبوبەكر! چی تۆی هێنا؟ فەرمووی: هاتووم دێنی پيغەمبەری خودا بكەمو تێر تەماشای روخساری نازداری بكەم، جا زۆری نەخاياند كە عومەريش هات فەرمووی: ئەی

---

[٨٤]- موسليم (٢٠٣٨).

عومەر تۆ چی هێناویتی؟ فەرمووی: برسێتی؟ ئەی پیغەمبەری خودا؟ فەرمووی: بەڕاستی من هەست بە شتێکی وا دەکەم.

ئینجا چوون بۆ ماڵی ئەبوهەیثەمی کوڕی تەییهانی ئەنصاری، ئەم پیاوە باخە خورماو رانە مەڕی زۆری هەبوو، بەلاّم نۆکەری نەبوو، کە چوون خۆی لەماڵ نەبوو، جا ژنەکەی کە پیغەمبەری دی زۆر بەگەرم بەخێرهاتنی کردنو گوتی: خۆشهاتن ماڵ ماڵی خۆتانە. گوتیان: بەژنەکەی: مێردەکەت کوا لەکوێیە؟ گوتی: چوو ئاوی خواردنەوەمان بۆ بێنێ، جا زۆری پێ نەچوو کە ئەبو هەیثەم هاتەوە کوندەیەکی بەکۆڵەوە بوو، کوندەکەی داناو هات دەستی کردە ملی پیغەمبەرو خۆش خۆش پێی دەگوت: باوكو دایکم بەقوربانت بن، ئەوجا بردیانی بۆ ناو باخەکەیو لەوێ رایەخێکی بۆ راخستنو چوو هێشوویێ خورمای هێناو داینا بۆیان. پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: دەبا لە روتابەکەی هەندێکت هەڵبژاردایە بۆمان، گوتی: قوربان! مەبەستم ئەوەیە کە بۆ خۆتان بە ئارەزووی خۆتان هەم لە روتابەشیرینەکەیو هەم لەهاڵە ترشەکەی هەڵبژێرنو بیخۆن. ئیتر لەو خورمایەیان خواردو لە ئاوی کوندەکەیان کرد بەسەریدا. جا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە ئەمە لەو نیعمەتانەیە کە لە رۆژی قیامەتدا پرسیارتان لێ دەکرێ لەبارەیانەوەو موحاسەبە دەکرێن لەسەری، سێبەری فێنكو تەڕە خورمای خۆشو ئاوی ساردی سازگار (نازو نیعمەت لەمە باشتر دەبێ چی بێ) کەواتە ئەمە بەر ئەو ئایەتە دەکەوێ کە دەفەرموێ: {ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ – التكاثر/٨} واتە: لەپاشان: سوێند دەخۆم لە رۆژی قیامەتدا موحاسەبە دەکرێن لەسەر ئەو نیعمەتانەی کە خودا لە دونیادا داونی پێتان. ئەوجا ئەبو هەیثەم دەستی دایە کێردێ، ئاژەڵێکیان بۆ سەربڕێ، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئاژەڵی شیردار سەرنەبڕی.

ئینجا گیسکێکی سەربڕی بۆیانو دروستی کردو هێنای داینا بۆیان. جا کە لەو گیسکەو لەو هێشووەو لەو ئاوە تێرو تەسەلەیان خوارد، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەوە: بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەسە لە رۆژی قیامەتدا لەبارەی ئەم نیعمەتەوە پرسیارتان لێ دەکرێتەوە، لەپێشەوە برسێتی لە ماڵ دەمری پەڕاندوون کەچی ئاوا بەتێرو تەسەلی دەگەڕێنەوە بۆ ماڵ (م/تاج) لەگێڕانەوەی تردا: ئەبو

هەیثەم کە دێتەوە چاوی بە پیغەمبەرو دوو هاوڕێکەی دەکەوێ دەڵێ: سوپاس بۆ خودا، ئەمڕۆ کەس نییە کە وەك من ئاوا میوانی ئازیزو بەرزو بەڕێزی هەبێ.

٤٩٨/٨[٨٥]- وعن خالدِ بنِ عُمَرَ العَدَوِيِّ قال : خَطَبَنا عُتْبَةُ بنُ غَزْوانَ، وكانَ أميراً على البَصْرَةِ، فحمِدَ اللّٰهَ وأثْنى عليْهِ، ثُمَّ قالَ : أمَا بعْدُ، فإنَّ الدُّنْيا آذَنَتْ بصُرْمٍ، ووَلَّتْ حَذَّاءَ، ولَمْ يَبْقَ منها إلاَّ صُبَابَةٌ كَصُبابَةِ الإناءِ يتصابُّها صاحِبُها، وإنَكُمْ مُنْتَقِلُونَ مِنْها إلى دارٍ لا زَوالَ لَهَا، فانْتَقِلُوا بِخَيْرِ ما بِحَضْرَتِكُم فإنَّهُ قَدْ ذُكِرَ لَنا أنَّ الحَجَرَ يُلْقَى مِنْ شَفِيرِ جَهَنَّمَ فَيَهْوِي فِيهَا سَبْعِينَ عاماً لا يُدْرِكُ لَها قَعْراً، واللّٰهِ لَتُمْلأَنَّ.. أَفَعَجِبْتُمْ،؟ ولَقَدْ ذُكِرَ لَنَا أنَّ ما بَيْنَ مِصْراعَيْنِ مِنْ مَصاريعِ الجَنَّةِ مَسيرةَ أَرْبَعِينَ عاماً، وَلَيَأْتِيَنَّ عَلَيها يَوْمٌ وهُوَ كَظِيظٌ مِنَ الزِّحامِ، وَلَقَدْ رَأَيْتُنِي سابعَ سَبْعَةٍ مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)مالَنا طَعامٌ إلاَّ وَرَقُ الشَّجَرِ، حتى قَرِحَتْ أَشْداقُنا، فالْتَقَطْتُ بُرْدَةً فشَقَقْتُها بيْني وَبينَ سَعْدِ بن مالكٍ فَاتَّزَرْتُ بِنِصْفِها، وَاتَّزَر سَعْدٌ بنِصفِها، فَمَا أَصْبَحَ اليَوْمَ مِنَّا أَحَدٌ إلاَّ أَصْبَحَ أَمِيراً عَلى مِصْرٍ مِنَ الأَمْصَارِ. وإِنِي أَعُوذُ باللّٰهِ أَنْ أَكُونَ فِي نَفْسِي عَظِيماً. وعِنْدَ اللّٰهِ صَغِيراً. رواهُ مسلم.

خالیدی کوڕی عەمری ئەل — عەدەوی فەرمووی: عوتبەی کوڕی غەزوان، کاتێ فەرمانڕەوایی بەصرە بوو، وتارێکی بۆمان دا، ستایش‌و سوپاسی خودای گەورەی کردو فەرمووی: پاش سوپاسی خودا، وا جیهان ملی پێوە ناوەو نیشانەی کۆتایی‌و تەواوبوونی دەرکەوتووە، بەزوویی دەبڕێتەوە، ئەوەی ماوە لەدونیا لە چاو ئەوەیدا کە ڕۆیشتووە وەك خڵتەی بن جام وایە، کە خاوەنەکەی لە هەر چوار لای جامەکەوە کۆی بکاتەوە تا بەتەواویی دایچۆڕێنێ.

بزانن کە ئێوە لەم جیهانە بێ بەقایەوە دەگوێزنەوە بۆ خانەی ئێجگاریی، کە بڕای بڕانەوەی نییە، دەی کەوایە زوو کەن هەتا هەل لەکیس نەچووەو دەرفەت ماوە هەرچی چاکەیەکتان لەدەست دێ دریغی لێ مەکەن‌و لەپێش خۆتانەوە بیکەن‌و ڕەتی بکەن‌و بۆ ئەو دونیا، چونکە خانەی ئێجگاریتان ئەوێیە، لەوێ کارتان بەچاکە زۆر زۆرە، لەبەر ئەوەی کە ڕۆژی ڕەشی زۆرتان لەپێشەوەیەو ڕێگەی سەختتان لەبەرە، گەیشتۆتەوە بە ئێمە کە بەردی لەسەر لێواری دۆزەخەوە گلێر دەکرێتەوە، حەفتا ساڵ لەسەر یەك بەبێ وەستان هەر گولۆر دەبێتەوە کەچی

---

[٨٥]- موسلیم (٢٩٦٧).

هێشتا هەر ناگاتە بنی! دە قەسەم بەزاتی خودا ئەم دۆزەخە بەم گەورەییە پڕ پڕ دەبێ! ئەوە وا دیارە کەئێوە لەم باسە سەرسام دەبن؟!

دەسا لەلایەکی تریشەوە باسکراوە بۆمان: کە بەهەشت زۆر زۆر گەورەو پانو پۆڕو بەرینە، لەم لاشیپانی دەرگاکانییەوە هەتا ئەو لاشیپانەکەی چڵ ساڵە ڕێیە، دەی سا بەخوا ڕۆژێ دەبێ کە هەموو دەرگاکانی بەهەشت جمەیان دێ لەوانەی کە لێیانەوە دەچنە ژورەوەو لەبەر قەرەباڵغی دەروازەکانی بەهەشت جمەیان دێو مەردووم بە پاڵپەستۆ دەچنە ژورەوە کەس بەخۆشیو ناخۆشی جیهان نەنازێو دەستخەڕۆ نەبێ، ڕۆژێ بوو ئێمە حاڵمان وابوو، بەخۆمەوە حەوت کەس بووین، لە خزمەت پێغەمبەردا بووین (درودی خودای لێ بێ) ئەوەی پێی بڵێی خواردەمەنی نەمان بوو، گەڵای دارو درەختی ئەو بیابانە نەبێ، ئەوەندە گەڵاو دارمان خواردبوو لەتاو برسێتی، لالغاومان تەرەکی بوو، بوو بوو بە برین.

ئەمەیش حاڵی پۆشتەو پەرداخیمان بوو، ڕووتو ڕەجاڵ بووین، عابایەکمان پەیدا کرد، کردم بەدوو کەرتەوە، نیوەیم بۆ خۆم لەباتی دەرپێ کرد بە بەرکۆشو پێچام بەلای خوارووممەوە، ئەو نیوەکەی تریشم دا بە سەعدی کوڕی مالیك ئەویش کردی بە بەرکۆشو پێچای بەخۆیەوە لەجیاتی دەرپێ، ئەوساکە ئەمە حاڵمان بوو ئەوە خواردنەکەمان بوو، ئەوەیش جلی شاییو شینمان بوو، ئەوەتانێ ئێستایش هەرکەسێ لە ئێمە دەبینی یان فەرمانڕەوایی سەر شارێکە، یان پادشای سەر وڵاتێکە، خودایە! باییمان نەکەیو پەنامان بدەی لەوە کە هەوا بکەینو لەدڵی خۆماندا خۆمان بەزل بزانینو لەلای تۆیش بچووكو بێ وەچ بین!

بیشزانن کە هەموو پەیامێکی پێغەمبەران پاش خۆیان لە پاش ماوەیێ، لە حاڵێکەوە دەگۆڕێ بۆ خاڵێکی تر، بەتایبەتی حاڵی فەرمانڕەواکانیان تەواو دەگۆڕێ، تەنانەت لە ئەنجامدا دەوڵەتی ئیسلام دەبێ بە پادشاییو سەڵتەنەتو ڕەفتاری بەرزی سەردەمی پێغەمبەرایەتی لەناو فەرمانڕەواکاندا بەحاڵ شوێنەواری دەمێنێ، دڵنیام کە بە چاوی خۆتان ئەمەی من دەیڵێم، لە فەرمانڕەواکانی پاش ئێمە دەیبینن! لە پاش ئەوە کە بە تەجروبەو ئەزموون لە حاڵی ئێمەو ئەوان بە باشی حاڵی دەبنو بە بەراورد ئەمەتان بۆ دەردەکەوێ. (ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیەیە لە صەحیحی موسلیمدا لە بەرگی هەژدەدا، لە(كتاب الزهد)دا.

٤٩٩/٩[٨٦]- وعن أبي موسى الأَشْعَريِّ (رضي اللّٰه عنه)قال : أَخْرَجَتْ لَنا عائِشَةُ رضي اللّٰهُ عنها كِساء وَإِزاراً غَلِيظاً قالَتْ : قُبِضَ رسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) في هـذين. متفقٌ عليه.

ئـەبو مووسـای ئەشـعەری (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: جـارێ عائیشـه (رەزای خـودای لێ بـێ) عابایـەك‌و دەرپێیـەكی ئەسـتووری زبـری دەرهێنـاو نیشـانی دایـن‌و فـەرمووی: حەزرەت (درودی خوای گەورەی لەسەر بێ) كه وەفـاتی فـەرموو ئـەم دوو پارچـەی لەبەردا بوو (ش).

٥٠٠/١٠[٨٧]- وعنْ سَعد بن أبي وَقّاص. (رضي اللّٰه عنه)قال : إنّي لأَوّلُ العَـربِ رَمَـى بِسَهْمٍ في سَبِيلِ اللّٰهِ، وَلَقَدْ كُنا نَغْزُو مَعَ رسول اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)ما لَنا طَعَـامٌ إلاّ وَرَقُ الحُبْلَةِ. وَهذا السَّمَرُ. حَتى إنْ كانَ أَحَدُنا لَيَضَعُ كما تَضَعُ الشاةُ مالَهُ خَلْـطٌ. متفـقٌ عليه.

سەعدی كوڕی ئەبو وەققاص (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: من یەكـەم كـەس بـووم لـه عەرەب، كه یەكەم تیرم هاویشت له ڕێگەی خودادا، حاڵیشمان گـەلێ پـەڕپووت بـوو، گەلێ جار لەگەڵ حەزرەتدا (دروودی خوای لەسەر بێ) كه دەچـووین بـۆ غـەزا خۆراكمـان تـەنیا بـەرو گـەڵای داره كێویلـەی ئـەو بیابانـه بـوو، كـه خواردنیـان گـەلێ زەحمەتـه (*) تەنانەت وامان لێ هاتبوو كه سـەراومان دەكـرد، دانیشتنەكەمان وشـك‌و پچـڕ پچـڕ بوو، كوڵۆ كوڵۆ دەوەستا، دەق وەك پشقلی مەڕ ئاوابوو، كەچـی ئێـستا هـۆزی بـەنی سەعد سەرزەنشتی من دەكەن لەسەر ئایینداریی! بەڕاستی ئەگەر قسەكەیان ڕاست بێ‌و سەرزەنشتەكەیان لەسەر هەق بێ‌و گومـانی درۆ نـەبێ، مـەعنای وایـه كـه مـن نائومێد دەرچووم‌و خوانەخواسته ڕەنجم بابردوویەتی! (ش/تاج).

---

[٨٦]- بوخاری (٣١٠٨)و موسلیم (٢٠٨٠).

[٨٧]- بوخاری (٣٧٢٨)و موسلیم (٢٩٦٦).

(*) ڕەنگ بێ حوبلـه بـەری تـەنگز بـێ، كـه درەختێكـی دڕكاوییـه، بـەرێكی تـاڵی هەیـه وەك چـواله تاڵـه وایـه، بەخۆشـكراوی دەخـورێ، ڕەنـگ بـێ (سـەمەر)یـش دار مـوغیلان بـێ، بـەڵام سـەموورەكەی بەیعەتولریضوان – لەسەر فەرمایشتی شەرحی تاجولئوصول – بـەرگی چوارەم لاپـەڕە (٢٣٦) دارمـۆز بوو، بەڵام من مەبەستم ئەوەیه كه خوێنەری دەقه كوردییەكه لەكورۆكی باسەكه بگا، بۆیـه بـه لازمـی مەعنایان، مەعنایانم لێك دایەوە. (وەرگێڕ).

٥٠١/١١[٨٨] وعن أبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّه عنه). قال : قال رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم): (اللّهُمَّ اجْعَلْ رزْقَ آلِ مُحَمَّدٍ قُوتاً) متفقٌ عليه.

ئـەبو هـورەيرەوە (رەزای خـوادای لێ بێ) فـەرمووی: حـەزرەت (درووودی خـوای لەسەر بێ) دەیفـەرموو: خودایە! رزق و رۆژی خێزان و کەسوکاری موحەممەد ئەوەندە بدە کەسەروبەر پێی بژین و بەس (ش).

٥٠٢/١٢[٨٩] وعن أبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّه عنه)قال : واللّه الذي لا إلهَ إلاّ هُوَ، إنْ كُنْتُ لأعتمدُ بِكَبِدِي على الأرْضِ مِنَ الجُوعِ، وإنْ كُنْتُ لأشُدُّ الحجَرَ على بَطْنِي مِنَ الجُوعِ. وَلَقَدْ قَعَدْتُ يوْماً على طَرِيقِهِمُ الذي يَخْرُجُونَ مِنْهُ، فَمرَّ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم)، فتبَسَّمَ حِينَ رَآنِي، وعَرَفَ ما في وجْهِي وما في نَفْسِي، ثُمَّ قال : (أبا هِرّ،،) قلتُ : لَبَّيْكَ يا رسولَ اللّه، قال : (الحَقْ) ومَضَى، فاتَّبَعْتُهُ، فدخَلَ فاستَأْذَنَ، فَأُذِنَ لي فدَخَلْتُ، فوَجَدَ لَبَناً في قَدحٍ فقال: (مِنْ أيْنَ هذَا اللّبَنُ ؟) قالوا : أَهْدَاهُ لَكَ فُلانٌ أَو فُلانة قال : (أَبا هِرّ،،) قلتُ : لَبَّيْكَ يا رسول اللّه، قال : (الحق إلى أَهْلِ الصُّفّةِ فادْعُهُمْ لي). قال : وأَهْلُ الصُّفّةِ أَضيافُ الإسْلامِ، لا يَأْوُون عَلَى أَهْلٍ، ولا مَالٍ، ولا على أَحَدٍ، وكانَ إذَا أَتَتْهُ صدقَةٌ بَعَثَ بِهَا إلَيْهِمْ. ولَمْ يَتَناوَلْ مِنْهَا شَيْئاً، وإذَا أَتَتْهُ هديَّةٌ أَرْسلَ إلَيْهِمْ وأَصابَ مِنْهَا وَأَشْرَكَهُمْ فيها، فَساءَنِي ذلكَ فَقُلْتُ : وما هذَا اللّبَنُ في أَهْلِ الصُّفّةِ ؟ كُنْتَ أَحَقَّ أَن أُصِيب منْ هذا اللّبَنِ شَرْبَةً أَتقوَّى بِهَا، فَإذا جاءُوا أَمَرنِي، فكُنْتُ أَنا أُعْطِيهِمْ، ومـا عَسَـى أَن يـبْلُغَني مـنْ هـذا اللّبَنِ، ولَمْ يَكُنْ منْ طَاعَةِ اللّه وطَاعَةِ رسوله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)بدٌّ. فأَتيتُهُم فـدَعَوْتُهُمْ، فأَقْبَلُوا واستَأْذنوا، فَأَذِنَ لَهُمْ وَأَخذُوا مَجالِسَهُمْ مِنَ الْبَيْتِ قال : (يا أَبا هِرّ،،) قلتُ : لَبَّيْكَ يا رسولَ اللّه، قال : (خذْ فَأَعْطِهِمْ) قال : فَأَخَذْتُ الْقَدَحَ فَجعَلْت أُعْطِيهِ الرَّجُلَ فَيشْرَبُ حتَّى يَرْوَى، ثُمَّ يردُّ عليَّ الْقَدَحَ، فَأُعطيهِ الآخرَ فَيَشْرَبُ حَتَّى يروَى، ثُمَّ يَرُدُّ عَليَّ الْقَدحَ، حَتَّى انْتَهَيتُ إلى النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)، وَقَـدْ رَوِيَ الْقَـوْمُ كُلُّهُـمْ، فَأَخَـذَ الْقَـدَحَ فَوَضَعَهُ على يَدِهِ، فَنظَرَ إليَّ فَتبَسَّمَ، فقال : (أَبا هِرّ) قلتُ : لَبَّيْكَ يـا رسـول اللّـه قـال : (بَقِيتُ أَنَا وَأَنْتَ) قلتُ صَدَقْتَ يا رسولَ اللّه، قال : (اقْعُدْ فَاشْرَبْ) فَقَعَـدْتُ فَشَـرِبْتُ : فقال : (اشرَبْ) فشَرِبْت، فما زال يَقُولُ : (اشْرَبْ) حَتَّى قُلْتُ : لا وَالّذِي بعثكَ بالحَقِّ ما

---

[٨٨] بوخاری (٦٤٦٠) و موسلیم (١٠٥٥).

[٨٩] بوخاری (٦٤٥٢).

أَجِدُ لَهُ مسْلَكاً، قال : (فَأَرِني) فأَعطيْتهُ الْقَدَحَ، فحمِدَ اللّٰه تعالى، وَسَمَّى وَشَربَ (الفضلَةَ) رواه البخاري.

ئەبو هورەیرەوە (رەزای خودای گەورەی لێ بێ) فەرمووی: بەو خودایەی کە کەسی لەرەنگ نیە، گەلێ جار وام بەسەر هاتووە لەتاو برسێتی خۆم کوتاوە بە زەویدا، یان لەتاو برسێتی بەردم شەتەك داوە بەسەر سکمەوە، رۆژێ لەسەر رێی موسوڵمانان‌دا دانیشتم لەسەر ئەو رێگەیەی کە لێوەی دەچوون بۆ مزگەوت (سا بەشکوو بەبیانووی شتێکەوە یەکێکیان لەگەڵ خۆی بمباتەوە تێر نان‌و ئاوم بکا، جا ئەبوبەکر هات، ئایەتێکی قورئانم لێ پرسییەوە، مەبەستم ئەوە بوو کە ئەو پرسیارە بکەم بە بیانوو، تا بمبا تێرم بکا، بەڵام رۆیشت‌و تێری نەکردم، عومەریش رەت بوو ئەویش هەر وا تا پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەلامەوە رەت بوو، کە منی دی زەردەخەنەیێ گرتی‌و تێگەیشت کە چی لەدڵمایەو بۆ وا رەنگم گۆڕاوە، فەرمووی: ئەی ئەبو هیرِ! گوتم: فەرموو بفەرموو ئەی پیغەمبەری خودا! سەرم لە رێتایە، فەرمووی: شوێنم کەوە منیش دوای کەوتم، تا چووە ماڵەوەو روخصەتی بۆ منیش خواست‌و منیش لەگەڵیا چوومە ماڵەوەو روانی هەندێ شیر لە جامێکدایە.

فەرمووی: ئەم شیرەمان لە کوێ بوو؟ گوتیان: ماڵی فیسارەکەس بە دیاری بۆ تۆیان ناردووە، فەرمووی: ئەبو هیر! گوتم: بفەرموو قوربان! سەرم لە رێتایە، فەرمووی: ئادەی خێرا بڕۆ دانیشتووەکانی صوففەم بۆ بانگ بکە. گوتی: دانیشتووەکانی صوففە ئەوانە بوون کە میوانی ئیسلام بوون، کەس‌وکارو ماڵ‌و منال‌و خانەخوێ‌و ئەمانەیان نەبوو، حەزرەت (درودو سلاّوو صەلات‌و سەلام‌و بەرەکات‌و رەحمەتی خودای گەورەو مەزنی لەسەر بێ) یاسای وا بوو ئەگەر خێر (صەدەقە)ی بۆ بهاتایە دەینارد بۆ ئەوان‌و خۆی دەستی بۆ نەدەبرد، بەڵام ئەگەر دیاریی بۆ بهاتایە دەینارد بە شوێنیانداو خۆیشی لێی دەخواردو بەشی ئەوانیشی لێ دەدا، منیش ئەمجارە لەبەر کەمی شیرەکە ئەم بانگکردنەم پێ ناخۆش بوو، لەدڵی خۆمدا گوتم: ئەم تۆزە شیرە چیە بۆ ئەو هەموو خەڵکەی کە وان لە صوففە (ئەم کەم‌و ئەوان زۆر بەچی دەردێکیان دەخوا) ئەمە بە من رەواتر بوو کە ژەمێکی لێ بخۆمەوەو هەناوێکم تێ بێتەوە پێی، خۆ کاتێ هاتیشن حەزرەت (درودی لەسەر بێ) فەرمانم پێ دەکاو دەبێ من شیرەکە بەسەریاندا بگێڕم، جا

کەوابێ دەبێ چی لەم شیرە کەمە بە من بپرێ، وەلێ فەرمانی خوداو فەرمانی پیغەمبەری خوا چاری نییەو دەشێ جێبەجێ بکرێ، بۆیە چووم بانگم کردن، ئەوانیش هاتن‌و داوای رێگەپێدانیان کردو پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) رێگەی دانیشتنی پێدان‌و لەماڵەوە دانیشتن‌و کۆڕیان بەست لەهۆدەکەدا، فەرمووی: ئەی ئەبو هیر! عەرزیم کرد: بفەرموو قوربان! فەرمووی: ئادەی جامە شیرەکە هەلگرەو شیریان بدەرێ، منیش جامەکەم هەلگرت‌و گەڕانم بەسەریانەوە، دەمدا بە هەر پیاوێ لێی دەخواردەوە تا پاراو دەبوو، ئەوجا جامەکەی دەدامەوە، هەتا گەیشتمە سەر پیغەمبەر خۆی (دروودی خوای لەسەر بێ) پیاوگەل هەموو تێر شیریان خواردەوە، جا جامەکەی وەرگرت‌و لەسەر دەستی دایناو سەیرێکی منی کردو زەردەیەکی کردو فەرمووی: ئەی ئەبو هیر! گوتم: بەڵێ قوربان! فەرمووی: ماینەوە خۆم‌و خۆت! گوتم: بەڵێ راست دەفەرمووی، فەرمووی: دەدانیشە بخۆرەوە، منیش دانیشتم‌و خواردمەوە، فەرموویەوە دیسان بخۆرەوە، دیسان خواردمەوە، ئیتر هەر دەیفەرموو: زیاتر بخۆرەوە، تا خۆم گوتم: ناخۆمەوە، بەو کەسەی تۆی کردووە بە پیغەمبەری راست‌و دروست‌و لەگەڵ ئەم ئایینە راستەدا رەوانەی کردووی ئیتر جێگەی ناکرێتەوە بۆم ئیتر چۆن زیاتر بخۆمەوە! فەرمووی: (دروودی خوای لەسەر بێ) دە بیدە بە منیش. منیش جامەکەم دایێ جا سوپاس‌و ستایشی کردو ناوی خودای هێناو ماوەکەیی خواردەوە. (ب/تاج).

٥٠٣/١٣[٩٠] - وعن مُحَمَّدِ بنِ سِيرينَ عن أبي هريرةَ، (رضي اللّه عنه)، قال : لَقَدْ رأَيْتُني وإِنّيَ لأَخِرُّ فِيما بَيْنَ مِنْبَر رسولِ اللّه صلى الله عليه وسلم إلى حُجْرَةِ عائِشَةَ رضي اللّه عنها مَغْشِيّاً عَلَيَّ، فَيجِيءُ الجَائي، فَيَضَعُ رِجْلَهُ عَلى عُنُقي، وَيرَى أَنّي مَجْنونٌ وما بي مِن جُنُونٍ، وما بي إلاَّ الجُوعُ. رواه البخاري.

موحەممەدی کوڕی سیرین (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێکیان لەلای ئەبو هورەیرە بووین، دوو پارچە کەتانی لەبەردا بوو، بە گڵەبەرانە رەنگ کرابوو، هنگی کردە ناوو دوو تویێ یەکێکیانەوەو فەرمووی: بەه بەه! ئەبو هورەیرە بە کەتان لووت دەسڕێ! رۆژێکیش بوو لە بەینی مینبەرەکەی پیغەمبەرو هۆدەکەی

---

[٩٠] بوخاری (٧٣٢٤).

عائیشەدا دەکەوتمو لەبەر بێ هێزی دەبورامەوە، هاتوچۆکەریش دەهات پێی دەنا بە ملمدا، لەو وایە کە فێم لەگەڵدایە، وە هیچ فێشم لەگەڵ نەبوو، بەلام هەناوم تیا نەمابوو لە برسانا لەسەر خۆم دەچووم (ب/تاج/٣١٨/٩).

٥٠٤/١٤[٩١]- وعن عائشةَ، رضيَ اللّٰه عنها، قَالَتْ : تُوُفِّيَ رسولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)ودِرْعُهُ مرْهُونَةٌ عِند يهودِيّ في ثَلاثِينَ صاعاً منْ شَعِيرٍ. متفقٌ عليه.

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کاتێ وەفاتی کرد، زرێیەکی هەبوو، لەلای کابرایەکی جوولەکە، داینابوو لە بارمتەدا، لەجیاتی سی مەن جۆ، کە وەری گرتبوو بۆ بژێویی خێزانەکەی (ش/تاج) وەك لەمەوبەر عەرزم کرد، ئەو زیادانەی کە لە تەرجەمەکەدا رەچاو دەکرێ، لە ریوایەتەکانی تاجولئوصول وەرمەم گرتوون، بۆیە لەکۆتای فەرموودەکانا ئاماژە بۆ تاج دەکەم. با لەم لایەنەوە برای خوێنەری ئازیز دڵنیا بێ. لەخوا بەزیاد بێ ئەم فەرموودانە وا پەخش و پرش و بلاوبوونەتەوە بەناو موسوڵماندا، وەك ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان گەیشتوونەتە پلەی تەواتور، لەم سەردەمەی ئێمەدا، تازە کەس رادەی ئەوەی ناکەوێ تێچەنی درۆو نادروستی خۆی لەناو دووتوێی فەرموودەکانی حەزرەتدا (درودی خوای لەسەر بێ) شەتڵ بکاو بەنیازی دەست تێوەدان بەمرازی گلاوی خۆی بکا. (وەرگێر).

٥٠٥/١٠[٩٢]- وعن أَنس (رضي اللّٰه عنه)قال : رَهَنَ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)دِرْعَهُ بِشَعِيرٍ، ومشيتُ إلى النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)بِخُبْزِ شَعيرٍ، وَإهَالَةٍ سَنِخَةٍ، وَلَقَدْ سمِعْتُهُ يقُولُ : (ما أَصْبحَ لآلِ مُحَمَّدٍ صاعٌ ولا أَمْسَى وَإنَّهُم لَتِسْعَةُ أَبْيَاتٍ) رواه البخاري.

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) زرێیەکەی خۆی لەبارمتەی هەنێ جۆدا دانا، جارێکیش نانی جۆو هەنێ رۆنە زەنگی پیوم بۆ حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) برد، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: خێزانەکانی موحەممەد (درودی خوا لەسەر خۆیو رەزای خودا لە خێزانەکانی) یەك مەن خۆراکیان لەماڵدایە چ بۆ بەیانیو چ بۆ ئێوارەیان، ئەوکاتەش حەزرەت نۆ ماڵی هەبوو (ب).

---

[٩١]- بوخاری (٢٩١٦)و موسلیم (١٦٠٣).

[٩٢]- بوخاری (٢٠٦٩).

٥٠٦/١٦[٩٣]- وعن أبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّٰه عنه)، قال : لَقَدْ رَأَيْتُ سبْعِينَ مِنْ أَهْلِ الصُّفَّةِ، ما مِنْهُم رَجلٌ عَلَيهِ رِدَاء، إمَّا إزارٌ وإمَّا كِسَاءٌ، قَدْ ربطُوا في أَعْنَاقِهم مِنهَا ما يَبْلُغُ نصف السَّاقَيْنِ، وَمِنهَا ما يَبلُغُ الكَعْبَينِ، فيجمعُهُ بِيَدِهِ كَراهِيَةَ أَن تُرَى عَوْرَتُهُ. رواه البخاري.

لەباسی (فضل الزهد)دا رابورد، فەرموودەی سیازدەهەم. ژمارە (٤٦٩/١٣ — ز - ٥٥).

٥٠٧/١٧[٩٤]- وعن عائشةَ رضي اللّٰه عنها قالت : كَانَ فِرَاشُ رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْه وسَلَّم)مِن أدَمٍ حشْوُهُ لِيف. رواه البخاري.

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: رایەخەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە لە سەری دەخەوت بەرگەکەی چەرم بوو، ناواخنەکەی ریشوو بوو. (ب/تاج).

٥٠٨/١٨[٩٥]- وعن ابن عمر رضي اللّٰه عنهما قال : كُنَّا جُلُوساً مَعَ رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)إذْ جاءَ رَجُلٌ مِن الأَنْصار، فسلَّم علَيهِ، ثُمَّ أَدبرَ الأَنْصَارِيُّ، فقال رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (يَا أَخَا الأَنْصَارِ، كَيْفَ أَخِي سعْدُ بنُ عُبادةَ ؟) فقال : صَالِحٌ، فقال رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (مَنْ يعُودُهُ مِنْكُمْ ؟) فَقام وقُمْنا مَعَهُ، ونَحْنُ بِضْعَةَ عشَر ما علَينَا نِعالٌ وَلا خِفَافٌ، وَلا قَلانِسُ، ولا قُمُصٌ نمشي في تلكَ السِّبَاخِ، حَتَّى جِئْنَاهُ، فاسْتَأْخَرَ قَوْمُهُ مِنْ حوله حتَّى دنَا رسولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وَأَصْحابُهُ الَّذِين مَعهُ. رواه مسلم.

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە خزمەتی حەزرەتدا (دروودی خوای لەسەر بێ) دانیشتبووین، پیاوێکی ئەنصاری هات سڵاوی لێ کردو گەڕایەوە، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی کاکەی ئەنصاری! سەعدی کوڕی عوبادەی برام چۆنە؟ گوتی: باشە. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کێ دێ بچین بۆ هەواڵ پرسینی؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) خۆی هەڵسا، ئێمەیش نزیکەی دە پانزە کەسێ بووین، لە خزمەتیدا چووین، بەپێی پەتی، بەبێ پێڵاوو سۆڵ بەناو ئەو بەیارە شۆرەکاتەدا

---

[٩٣] بوخاری (٤٤٢)، (٤٦٩/١٣ — ز ٥٥).

[٩٤] بوخاری (٦٤٥٦).

[٩٥] موسلیم (٩٢٥).

**ملی ڕێمان گرتبوو، تا گەیشتینە كنی، كڵاوو كراسیشمان نەبوو، ئیتر خزمەكانی خۆی چوونە دواوەو پیغەمبەرو یارانی چوونە بەرەوە بۆ لای. (موسلیم).**

٥٠٩/١٩[٩٦]- وعن عِمْرانَ بنِ الحُصَينِ رضي اللّه عنهما، عن النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)أنه قال: (خَيْرُكُمْ قَرني، ثُمَّ الَّذينَ يلونَهم، ثُمَّ الَّذينَ يلُونَهُم) قال عِمرَانُ: فمَا أَدري قال النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)مَرَّتَيْن أو ثَلاثاً (ثُمَّ يَكُونُ بَعدَهُمْ قَوْمٌ يشهدُونَ ولا يُسْتَشْهَدُونَ، وَيَخُونُونَ وَلا يُؤْتَمَنُونَ، وَيَنْذِرُونَ وَلا يُوفُونَ، وَيَظْهَرُ فِيهمْ السِّمَنُ) متفقٌ عليه.

**پرسیاركرا لە حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) چ كەس باشە؟ فەرمووی: باشترینی ئێوە چینی هاوچەرخی منە، ئینجا چینی دوای ئەوان، ئینجا چینی دوای ئەوانیش. ئەوجا هۆزێ پەیدا دەبن لەدوای ئەوان، كۆ ناكەنەوە لە شایەتیو سوێندخواردنو تێكەڵو پێكەڵیان دەكەن بەسەر یەكا، كەس داوای شایەتی دانیان لێ ناكا، كەچی لەخۆیانەوە لووت دەبەنە پێشەوەو دەبن بە شایەتو شایەتی دەدەن، هەروەها گزیو ناپاكیو دەغەڵی دەكەنو جێگەی بتمانەو باوەڕ پێ كردن نین، فوتوو (نەذر) دەكەنو جێبەجێی ناكەن، وە قەڵەویی لەناویاندا بڵاودەبێتەوە (ش/تاج) گێڕانەوەی ئێرەی ریاض عیمرانی كوڕی حوصەین دەفەرموێ: جا باش نازانم كە حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لەپاش چینی خۆی دوو چینی تری فەرموو، یان سێ چینی تری فەرموو. (وەرگێڕ).**

٥١٠/٢٠[٩٧]- وعن أبي أُمامة (رضي اللّه عنه)قال: قال رسولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (يا ابْنَ آدمَ: إنَّكَ إنْ تَبْذُل الفَضلَ خَيْرٌ لَكَ، وَأَن تُمْسِكهُ شرٌّ لَكَ، ولا تُلامُ على كَفَافٍ، وَابدأ بِمنْ تَعُولُ) رواه الترمذي وقال: حديث حسن صحيح.

**لەئەبو ئومامەوە (رەزای خوای لێ بێ) حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزاد! ئەوەی لە خۆتو خێزانت زیادە ئەگەر بیبەخشی ئەوە خێرێكەو بۆ خۆتی دەكەی، خۆ ئەگەر هەڵی بگریو نەیكەی بە خێرو دەسمایەی خێر، ئەوە شەڕێكەو بۆ خۆتی هەڵدەگری، لەسەر گوزەرانێكیش كە سەرو بەربێو بەپێی حاڵ**

---

[٩٦]- بوخاری (٢٦٥١)و موسلیم (٢٥٢٥).

[٩٧]- تیرمیذي (٢٣٤٤).

بێ، کەس سەرزەنشتت ناکا. لە خێزانو خزمی خۆشتەوە دەست بکە بەخێر کردن. (ت/ح/ح/ص).

٥١١/٢١[٩٨] - وعن عُبَيد اللّٰه بِن مِحْصَن الأَنْصاريِّ الخَطْمِيِّ (رضي اللّٰه عنه)قال : قال رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (مَنْ أَصبح مِنكُمْ آمِناً في سِرْبِهِ، معافى في جَسدِهِ، عِندهُ قُوتُ يَومِهِ، فَكَأَنَّمَا حِيزَتْ لَهُ الدُّنْيَا بِحذافِيرِها. رواه الترمذي وقال: حديثٌ حسنٌ.

عوبەیدوڵلای کوڕی موحصین لە باوکیەوە، (ڕەزای خودایان لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (درودی خوای لەسەر بێ) هەر کامێکتان لە خۆی ئەمین بێو مەترسی لەگیانی خۆی نەبێو لەشی ساغ بێو نانو ئاوی ئەو ڕۆژەی هەبێ کە تیایەتی، ئیتر وەکوو هەموو جیهان، بەگشت خۆشییەکانیەوە، هی ئەو بێ وایە! (ت: ح/ح/تاج).

٥١٢/٢٢[٩٩] - وعن عبدِ اللّٰه بن عمرو بن العاص رضي اللّٰه عنهما، أَن رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قال: (قَدْ أَفلَحَ مَن أَسلَمَ، وكَانَ رِزقُهُ كَفافاً، وَقَنَّعَهُ اللّٰه بِمَا آتَاهُ) رواه مسلم.

عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: بەڕاستی سەرفرازو ڕزگار ئەو کەسەیە کە موسوڵمان بێو ڕزقو ڕۆژیی سەروبەر بەپێی حاڵ بێو بە بەشی خودا قایل بێ (م).

٥١٣/٢٣[١٠٠] - وعن أبي مُحَمَّد فَضَالَةَ بنِ عُبَيْد الأَنْصَارِيِّ (رضي اللّٰه عنه)، أَنَّهُ سَمِعَ رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يَقُولُ : (طُوبَى لِمَنْ هُدِيَ إِلى الإِسلام، وَكَانَ عَيْشُهُ كَفافاً، وَقَنِعَ) رواه الترمذي وقال : حديثٌ حسن صحيح.

ئەبو موحەممەد (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: خۆشی لەو بەختەوەرەی کەشارێگەی ڕاستی ئیسلام دەگرێو گوزەرانی سەرو بەر دەردەچێو بەبەشی خۆی دەساچێ، ئەبو موحەممەد دەفەرموێ: بەگوێی خۆم فەرمایشتەم لەدەمی حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) ژنەوت. (ت/ح/ح/ص).

---

[٩٨] تيرميذي (٢٣٤٧).

[٩٩] موسليم (١٠٥٤).

[١٠٠] تيرميذي (٢٣٥٠).

٥١٤/٢٤[١٠١]- وعن ابن عباس رضي اللّٰه عنهما قال : كان رسولُ اللّٰه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يَبِيتُ اللَّيَالِيَ المُتَتَابِعَةَ طَاوِياً، وَأَهْلُهُ لا يَجِدُونَ عَشاءَ، وَكَانَ أَكْثَرُ خُبْزِهِمْ خُبْزَ الشَّعِيرِ. رواه الترمذي وقال : حديثٌ حسنٌ صحيح.

**ئیبنو عەبباس** (رەزای خودا لەخۆیو باوکی) **دەفەرموێ: گەلێ جار وا دەبوو، پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **خۆیو خێزانی چەن شەو لەسەریەك بەسكی خاڵی سكیان هەڵدەگوشیو بەبرسێتی بەبێ شێو سەریان دەنایەوە، نانیشیان بەزۆری نانی جۆ بوو! (ت: ح/ح/ص).**

٥١٥/٢٥[١٠٢]- وعن فضَالَةَ بنِ عُبَيْدٍ (رضي اللّٰه عنه)، أن رسول اللّٰه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)كَانَ إذَا صَلَّى بِالنَّاسِ يَخِرُّ رِجَالٌ مِنْ قَامَتِهِمْ فِي الصَّلاةِ مِنَ الخَصَاصةِ وَهُمْ أَصْحابُ الصُّفَّةِ حَتَّى يَقُولَ الأَعْرَابُ : هُؤُلاءِ مَجَانِينُ، فَإِذَا صلى رسول اللّٰه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)انْصَرفِ إلَيْهِمْ، فقال : (لَوْ تَعْلَمُونَ ما لَكُمْ عِنْدَ اللّٰه تعالى، لأَحْبَبْتُمْ أَنْ تَزْدادُوا فاقَةً وَحَاجَةً) رواه الترمذي، وقال حديثٌ صحيحٌ.

**فوضالە** (رەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: گەلێ جار حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **كە بەرنوێژی بۆ مەردوومەكە دەكرد، زۆر پیاو — لەدانیشتوانی صوففە — لەناو نوێژەكەدا لەكاتی راوەستاندا، لەبەر نەبوونیو تینی برسێتی بەردەبوونەوەو لاڵو پاڵ دەكەوتن، تەنانەت عەرەبە سارانشینەكان، كە لە حاڵیان ئاگادار نەبوون، دەیانگوت: ئەمانە شێتن بۆیە وا دەكەن! حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **كە نوێژەكەی تەواو دەكرد دەچوو بەلایانەوەو پێی دەفەرموون: ئەگەر دەتانزانی كە لەلای خودای گەورە، لەپاداشتی ئەح حاڵەتاندا چی بەهرەو نازو نیعمەتێكتان بۆ دانراوە، ئەوا بەدڵ حەزتان دەكرد كە ئەوەندەی تر بارتان گران بێو پتر رەشو رووتو رەجاڵ بن! (ت:ح/ص).**

**فەخرە بۆ حەزرەت (الفقر فخري)**
**بۆ تۆیش بەمەرجێ رێگەی ئەو بگری**
**وەلێ — بۆ ئەمڕۆ — وا دەڵێن نووری**
**چەپی لە كوفر كەمە هەژاری!!**

---

[١٠١]- تيرميذي (٢٣٦١).

[١٠٢]- تيرميذي (٢٣٦٩).

٥١٦/٢٦[١٠٣] - وعن أبي كَرِيمَةَ المِقْداد بن معْدِ يكَرِب (رضي اللّه عنه)قال : سمِعتُ رسول اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يقولُ : (مَا ملأَ آدمِيٌّ وِعَاءً شرّاً مِنْ بَطنِه، بِحسْبِ ابن آدمَ أُكُلاتٌ يُقِمْنَ صُلْبُهُ، فإنْ كَانَ لا مَحالَةَ، فَثلُثٌ لطَعَامِهِ، وثُلُثٌ لِشرابِهِ، وَثُلُثٌ لِنفَسِهِ). رواه الترمذي وقال : حديث حسن.

**ميقداد** (رەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی حەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو** (درودی خوای لەسەر بێ) **بەدترین جەوالێ کە ئادەمیزاد پڕی بکا ورگیەتی! بەڕاستی ورگپەروەریی زۆر خراپە، ئادەمیزاد (ئەگەر راستت دەوێ) چەند پارووێ سەروزیادیەتی، واتە: ئەوەندەی بەسە کە بەری دڵی بگرێو بنیادی رابگرێ! خۆ ئەگەر هەر چاری نەبوو، ویستی زۆر بخوا ئەوە با وا بکا: سکی بکا بە سێ بەشەوە: بەشێکی بۆ خواردن، بەشێکی تری بۆ خواردنەوە، ئەو بەشەکەی تریشی بۆ هەناسەدانی! (ت:ح/ح).**

٥١٧/٢٧[١٠٤] وعن أبي أُمَامَةَ إِيَاسِ بنِ ثَعْلَبَةَ الأَنْصَارِيِّ الحارثِيِّ (رضي اللّه عنه)قال : ذَكر أَصْحابُ رَسولَ اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يوْماً عِنْدَهُ الدُّنْيَا، فقال رسول اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (أَلا تَسْمَعُونَ ؟ أَلا تَسْمَعُونَ ؟ إِنَّ الْبَذَاذَةَ مِنَ الإِيمَانِ إِنَّ الْبَذَاذَةَ مِنَ الإِيمَانِ) يعْنِي: التَّقَحُّلَ. رواه أبو داود. **ئەبو ئومامە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: رۆژێ لە خزمەتی حەزرەتدا یارانی (درودی خودا لە خۆیو خۆشنوودی خودا لە یارانی) باسی جیهانیان کردو ناویان هێنا ناوەوە، حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: گوێتان لێ بێ، گوێتان لێ بێ، پەڕپووتیو خاکێتی نیشانەی باوەڕی ساغە، واتە: ریپاڵیو شڕۆڵەییو شڕەپۆشیو دڵمردوویی.**

٥١٨/٢٨[١٠٥] - وعن أبي عبدِ اللّه جابر بن عبد اللّه رضي اللّه عنهما قال : بَعَثَنَا رسولُ اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وَأَمَّرَ عَلَينَا أَبَا عُبَيْدَةَ (رضي اللّه عنه)، نتَلَقَّي عِيراً لِقُرَيْش، وَزَوّدَنا جِراباً مِنْ تَمرٍ لَمْ يجِدْ لَنا غَيْرَهُ، فَكَانَ أَبُو عُبَيْدَةَ يُعْطِينَا تَمْرةً تَمْرَةً، فَقِيل : كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ بِهَا ؟ قَال : نَمَصُّهَا كَمَا يَمَصُّ الصَّبِيُّ، ثُمَّ نَشْرَبُ عَلَيهَا مِنَ المَاءِ، فَتَكْفِينَا

---

[١٠٣] تیرمیذي (٢٣٨١).

[١٠٤] ئەبو داوود (٤١٦١).

[١٠٥] موسلیم (١٩٣٥).

يَوْمَنَا إِلَى اللَّيْلِ، وكُنَّا نَضْرِبُ بِعِصِيِّنا الخَبَطَ، ثُمَّ نَبُلُّهُ بِالْمَاءِ فَنأْكُلُهُ. قال : وانْطَلَقْنا على ساَحِلِ البَحْرِ، فرُفِعَ لنَا على ساحِلِ البَحْرِ كهَيْئَةِ الكَثِيبِ الضخم، فأَتيْنَاهُ فإذا هِي دَابَّةٌ تُدْعى العَنْبَرَ، فقال أَبُو عُبَيْدَةَ : مَيْتَةٌ، ثُمَّ قال : لا، بلْ نحْنُ رسُلُ رسُول اللَّـه (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، وفِي سبيلِ اللَّه، وقَدِ اضْطُرِرتمْ فكلُوا، فَأَقَمْنَا عليْهِ شَهْراً، ونَحْنُ ثلاثُمائة، حتَّى سَمِنَّا، ولقَدْ رَأَيتُنَا نَغْتَرِفُ من وقْبِ عَيْنِهِ بالْقِلالِ الدُّهْنَ ونَقْطَعُ منْهُ الْفِدَرَ كالثَّوْرِ أَو كقَدْرِ الثَّوْرِ.

ولَقَدْ أَخَذَ مِنَّا أَبُو عُبَيْدَةَ ثَلاثَةَ عَشَرَ رَجُلاً فأَقْعَدَهُم في وقْبِ عَيْنِهِ وأَخَذَ ضِلَعاً مِنْ أَضْلاعِهِ فأَقَامَهَا ثُمَّ رَحَلَ أَعْظَمَ بَعِيرٍ مَعَنَا فمرّ منْ تَحْتِهَا وتَزَوَّدْنَا مِنْ لَحْمِهِ وَشَائِقَ، فلَمَّا قدِمنَا المدِينَةَ أَتَيْنَا رسول اللَّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فذَكَرْنَا ذلكَ لَه، فقال : (هُوَ رِزْقٌ أَخْرَجَهُ اللَّه لَكُمْ، فَهَلْ معَكمْ مِنْ لحْمِهِ شَيء فَتطْعِمُونَا ؟) فَأَرْسلْنَا إلى رسول اللَّه (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)مِنْهُ فَأَكَلَهُ. رواه مسلم.

**جابیر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: سێ سەد سوار بووین، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح سەر لەشکرمان بوو، پیغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **ناردینی، منەی کاروانێکی کافرەکانی قوڕەیشمان دەکرد، تاقە هەمانەیێ خورمای هەبوو، ئەوی دا پێمان ئیتر هیچی تری نەبوو تا بماندانێ، ئەبو عوبەیدەش بە دەسەنە دەنکە خورمای دەداینێ. گوترا: جا ئەو قلە خورمایە بە دەردی چی دەخوارد! گوتی: وەك منالْ دەمان مژیو ئاومان بەسەردا دەخواردەوە، بەشی ئەو رۆژە تا ئێوارەمانی دەکرد، تووشی برسێتییەکی سەختی وا بووین، لەتاوانا بەگەڵا کوتك گەڵادارمان دەوەراندو کەمێ بەئاو تەڕمان دەکردو ئەوجا دەمان خوارد! جا بۆیە ئەو سوپایەیان ناونا سوپای گڵاداروەران، (جەیشولخەبەط) فەرمووی: لەقەراخ دەریاکەوە رۆیشتین لە پڕ تەماشامان کرد وا شتێ دەڵێی تەپۆڵکە لی گەورەیە لە قەراخ دەریاکەوە قوت بۆتەوە، کە گەیشتینە لای روانیمان دەعبایەکە پێی دەڵێن نەهەنگی ئاوی، لە پێشا ئەبو عوبەیدە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: ئەمە مردارەوە بووە، مردارەوە بوویش حەرامە، لەپاشا فەرمووی: نەء، حەرام نییە، بەڵکوو ئێمە فروستادەی پیغەمبەری خوداین** (دروودی خوای لەسەر بێ) **وە لەرێگەی خودادا تێ دەکۆشینو سەرەڕای ئەوەیش ئێمە لێقەوماوو ناچاریشین، مردارەوە بوویش بۆ ناچار رەوایە، کەواتە بخۆن. ئێمە — کە سێ سەد کەس بووین — یەم مانگی رەبەق لەسەری دامان کوتاو دەستمان کرد**

بەخواردن لێی تا قەڵەو بووینەوە، بەچاوی خۆم دیم رۆنمان بەگلێنەو سوێنە لەکاسەی چاوی هەڵدەگۆزی، پارچەی وامان لێ دەکردەوە بەقەد لاشەی گایێ، ئەبو عوبەیدە سیازدە پیاوی لێ جیاکردینەوەو لەناو بۆشایی کالانەی چاویدا داینیشاندن! ئەبو عوبەیدە فەرمانی کرد پەراسوویێ لە پەراسووەکانی ئەو نەهەنگەیان راست کردەوەو پەراسووەیەکی تریشیان بەرامبەری راست کردەوەو نووکەکانیان نووساندن بەیەکەوە لەچەشنی دوو لاشیپانەی دەروازە، وشترێکی زەبەللاحی گەورەمان پێ بوو کۆپانیان لێ کرد، درێژترین پیاویش لەناو سوپاکەدا بە فەرمانی ئەبو عوبەیدە سواری ئەو وشترە درێژە داهۆڵە بوو، بەئاسانی بەژێر ئەو دوو پەراسووانەدا رۆیشت!

چەند پارچەیەکی توێ کراوی نیوە کوڵاومان لە نەرمە گۆشتەکەی لەگەڵ خۆمان بردەوە، کە چووینەوە بۆ مەدینە، چووینە لای پیغەمبەرو ئەم باسەمان عەرزی کرد، فەرمووی: ئەوە رۆژییەك بووە خودا بۆی رەخساندوون، ئەگەر لەو گۆشتە لە کنتان ماوە دەرخواردی ئێمەیشی بدەن، ئێمەیش بەشی پیغەمبەرمان نارد لێی، پیغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) خۆی لێی خوارد (م/تاج).

٥١٩/٢٩[١٠٦] - وعن أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ رضي اللّٰه عنها قالت : كانَ كُمُّ قمِيصِ رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)إلى الرُّصْغِ رواه أبو داود، والترمذي، وقال : حديث حسن.

ئەسمای کچی یەزید (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سەردەستی قۆڵی جلو بەرگی پیغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) هەتا مووچەی دەستی بوو (د/ت/تاج) ئیمامی تیرمیذي (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: فەرموودەیەکی حەسەنە.

٥٢٠/٣٠[١٠٧] - وعن جابر (رضي اللّٰه عنه)قال : إنَّا كُنَّا يَوْمَ الخَنْدَق نَحْفِرُ، فَعَرضَتْ كُدْيَةٌ شديدَةٌ فجاءُوا إلى النَّبيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فقالوا : هَذِهِ كُدْيَةٌ عَرَضتْ في الخَنْدق. فقال: (أَنَا نَازِلٌ) ثُمَّ قَامَ وبَطْنُهُ معْصوبٌ بِحَجرِ، وَلَبِثْنَا ثَلاثَةَ أَيَّام لا نَذُوقُ ذَوَاقاً، فَأَخَذَ النَّبيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)المِعْول، فَضرَب فعادَ كَثيباً أَهْيَلَ، أَوْ أَهْيَمَ.

---

[١٠٦] ئەبو داوود (٤٠٢٧)و تیرمیذي (١٧٦٥).

[١٠٧] بوخاری (٤١٠١)و موسلیم (٢٠٣٩).

فقلتَ : يا رسولَ اللّه ائْذَن لي إلى البيتِ، فقلتُ لامْرَأَتي : رَأَيْتُ بِالنَّبِـيِّ (صـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)شَيْئاً مافي ذلكَ صبْرٌ فَعِنْدَكِ شَيْءٌ ؟ فقالت : عِنـدِي شَـعِيرٌ وَعَنـاقٌ. فـذَبَحْتُ العَنَاقَ، وطَحَنْتُ الشَّعِيرَ حَتَّى جَعَلْنَا اللحمَ في البُرْمَة، ثُمَّ جِئْـتُ النَّبِـيَّ (صـلّى اللهُ عليْـهِ وسَلَّم)وَالعجِينُ قَدْ انْكَسَرَ والبُرْمَةُ بيْنَ الأثَافِيِّ قَد كَادَتَ تَنْضجُ.
فقلتُ : طُعَيِّمٌ لي فَقُمْ أَنْت يا رسولَ اللّـه وَرَجُـلٌ أَوْ رَجُـلان، قـال : (كَـمْ هُـو ؟) فَذَكَرتُ له فقال : (كَثِير طيب، قُل لَهَا لا تَنْزِعِ البُرْمَةَ، ولا الخُبْزَ مِنَ التَّنُّور حَتّـى آتـي) فقال : (قُومُوا) فقام المُهَاجِرُون وَالأَنْصَارُ، فَدَخَلْتُ عليها فقلـت : وَيْحَـكِ جَـاءَ النَّبِـيِّ (صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وَالمُهَاجِرُونَ، وَالأَنْصارُ وَمن مَعَهم، قالت : هَـل سَـأَلَك ؟ قلـتُ : نعم، قال : (ادْخُلوا وَلا تَضَاغَطُوا) فَجَعَلَ يَكْسِرُ الخُبْزَ، وَيَجْعَلُ عليهِ اللحمَ، وَيُخمِّرُ البُرْمَة والتَّنُّورَ إذا أَخَذَ مِنْهُ، وَيُقَرِّبُ إلى أَصْحَابِهِ ثُمَّ يَنْزِعُ فَلَمْ يَزَلْ يَكْسِرُ وَيَغْرِفُ حَتَّـى شَـبِعُوا، وَبَقِيَ مِنه، فقال: (كُلِي هذَا وَأَهدي، فَإِنَّ النَّاسَ أَصَابَتْهُمْ مَجَاعَةٌ) متفقٌ عليه.

**جـابير** (رەزای خـودای لێ بـێ) **فــەرمووی: ڕۆژی غــەزای خەنــدەق، لــەکاتی هەڵکەنــدنی خەنەکەکــەدا ســەرەنجم دا پیغەمبــەر** (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) **تــەواو برســیبوو، لــەو کاتــەدا تەمتــەمێ هاتــە ڕێــی خەندەقەکــە، چــوونە لای حــەزرەت** (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) **گوتیــان قوربان! خەندەقەکە تەمتەمێکی هاتۆتەبـەر، فـەرمووی: وا خـۆم دەچـمە خـواردوە بۆی، حەزرەت کە هەڵسا لەبەر برسێتی سکی خۆی بە بەردێ جەڕانـدبوو! چـونکە سێ ڕۆژ بوو ئەوەی پێی بگوترێ نـان‌و ئـاو چەشـکەمان نـەکردبوو، پیغەمبـەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **دەستی دایە پاچـەکەو مـاڵی بەتاوێرەکـەدا ئـیتر ئـەو گابـەردە وردوخـاش بوو بوو بە خاك‌و خۆڵ، گوتم: ئەی پیغەمبەری خودا! ڕێگەم بدە دەچم بۆ ماڵەوە، کەچوومەوە بـە ژنەکـەم گـوت: هیچمان هەیـە؟ دەبینـم پیغەمبـەر** (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) **تەواو برسیەتی، لەبەر ئەوە ئارامم لێ هەڵگیراو، ئـەویش هەمانەیـەکی هێنـا مـەنێ جۆی تیابوو، بەرخۆڵەیـەکی دەسـتەمۆشمان هـەبوو ئەویشـم سـەربڕی، جـا تـا ئـەو جۆکـەی هـاڕی منـیش بەرخەکـەم جنـی‌و کردمـە نـاو دیزەیەکـەوەو هـەردووکمان پێکـەوە لێ بووینــەوە، کــە چــوومەوە بــۆلای پیغەمبــەر** (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) **هەویرەکـە هەڵهاتبوو، گۆشتەکەیش بەسەر سێ کوچکەوە بوو، بەسەر ئاگرەکەوە خەریك بـوو پێ دەگەیشت، ژنەکەم گوتی: ها ڕوو زەردم نەکەی، نەچی پیغەمبەرو ئـەو هـەموو عەشاماتە کە لەگەڵیایەتی هـەموویان خوڵك بکەی‌و ئـەو هـەموو خەڵکـە برژێنـی**

بەسەرمدا، چونکە نان‌و چێشتەکە کەمەو بەشی ئەوەندە ناکا، منیش چووم بە چپە عەرزیم کرد: ئەی پیغەمبەری خودا! بەرخۆلەیەکمان سەربڕیوەو مەنێ جۆشمان هاڕیوە، خۆت‌و چەند کەسێ بفەرموون وەرن بۆ نیوەڕۆ، حەزرەت (صەلات‌و سەلام‌و درودی خودای گەورەی لەسەر بێ) فەرمووی: زۆرو پاکە، بەژنەکەت بڵێ: قازانەکە دانەگرێ‌و نانەکەیش لە تەندوورەکە نەکاتەوە هەتا خۆم دێم، جا فەرمووی: ئادەی هەستن، جا کۆچکەران‌و یاریدەدەران هەموو هەڵسان، پیغەمبەر وەپێشیان کەوت‌و بەرەو ماڵی ئێمە کەوتنە ڕێ. کە چوومەوە ژنەکەم گوتی: واو وات لێ بێ بۆ وات کرد؟ گوتم: من هەر ئەوەم گوت بە پیغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کە خۆت گوتت (کە وام گوت گوتی: کەوابێ خوداو پیغەمبەری خودا، خۆیان باشتر حاڵەکە دەزانن). کە حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) گەیشتە بەرەوە فەرمووی: بچنە ماڵەوە، وەلێ کەڵەکە مەکەن، ژنەکەم هەویرەکەی هێنا بۆ پیغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) تفی پیرۆزی خۆی تێ کردو نزای پیرۆزی بەسەردا خوێندو ئەنجا چوو بۆلای مەنجەڵەکەو تفی کردە ناو ئەویش‌و نزای پیرۆزی بەسەردا خوێندو فەرمووی: ژنێکی نانکەری تریش بانگ بکەن تا نانت لەگەڵدا بکاو چێشتەکەش بەئەسکوێ لە مەنجەڵەکە تێ بکەو لەسەر ئاگرەکە دایمەگرە! حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) خۆی کولێرەکەی دەووڵی‌و مەرگەکەیشی دەکرد بەسەریدا، هەموو جارێ کە نانی تێ دەکرد بۆ دەستەیێ سەری قازان‌و تەندوورەکەی دادەپۆشییەوەو ئەو نانەی کە تێ کرابوو دەینارد بۆ هاوڕێکانی، ئەوجا سەری لادەدانەوەو نانی تێ دەکردەوە بۆیان لەسەر شێوەی پێشوو، ئیتر هەروەها تا هەموو تێریان خواردو لەبەریان مایەوەو پەڕیان لێی گرت، کەچی لە سایەی خوداوەو بەرەکەتی موعجیزەی پیغەمبەرەوە هێشتا مەنجەڵەکەمان وەك خۆی مابوو قوڵتەی دەهات، وە هەویرەکەشمان وەك خۆی مابوو کەمی نەکردبوو، حەزرەت (سەرو ماڵ‌و مناڵ بە قوربانی گەردی بەر ئاستانەی پیرۆزی بێ) فەرمووی: هەم خۆتان لێی بخۆن‌و هەم بەدیاری‌و دەسەنە بەشی دەرو دراوسێ‌و خەڵکی تریشی لێ بنێرن، چونکە ساڵەکەی گرانییەوەو، مەردووم ڕەجاڵ‌و برسین، جابیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەوانەی لەگەڵ حەزرەتدا لێیان خوارد هەزار کەس بوون. (ش/تاج).

٥٢١/٣١[١٠٨]- وعن أنس (رضي اللّه عنه)قال : قال أبو طَلْحَةَ لأُمِّ سُلَيم : قَد سَمعتُ صَوتَ رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)ضَعِيفاً أعرفُ فِيهِ الجُوعَ، فَهَل عِندَكِ مِن شيءٍ ؟ فقالت : نَعَمْ، فَأَخْرَجَتْ أَقَراصاً مِن شَعيرٍ، ثُمَّ أَخَذَت خِمَاراً لَهَا فَلَفَّتِ الخُبزَ بِبَعضِه، ثُمَّ دَسَّتْهُ تَحْتَ ثَوبي وَرَدَّتْني بِبَعضِه، ثُمَّ أَرْسَلَتْنِي إلى رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)، فَذَهَبتُ بِهِ، فَوَجَدتُ رسولَ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)جالِساً في المَسْجِدِ، ومَعَهُ النَّاسُ، فَقُمتُ عَلَيهِمْ، فقالَ لي رسولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (أَرْسَلَكَ أبو طَلْحَةَ ؟) فقلت : نَعم، فقال: (أَلِطَعَام) فقلت : نَعَم، فقال رسولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (قُومُوا) فَانْطَلَقُوا وَانْطَلَقْتُ بَيْنَ أَيديهِم حَتَّى جِئتُ أَبَا طَلْحَةَ فَأَخبَرتُهُ، فقال أَبُو طَلْحَةَ : يا أُمَّ سُلَيمٍ : قَد جَاءَ رسولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)بالنَّاسِ وَلَيْسَ عِنْدَنَا ما نُطْعِمُهُمْ ؟ فقالَتْ : اللّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. فَانطَلَقَ أَبو طَلْحة حَتَّى لَقِيَ رسولَ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)، فَأَقبَلَ رسولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)مَعَه حَتَّى دَخَلا، فقال رسولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (هَلُمِّي ما عِندَكِ يا أُمَّ سُلَيْم) فَأَتَتْ بِذلكَ الخُبْزِ، فَأَمَرَ بِهِ رسولُ اللّه فَفُتَّ، وعَصَرَت عَلَيه أُمُّ سُلَيمٍ عُكَّةً فَآدَمَتْهُ، ثُمَّ قال فِيهِ رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)ما شاءَ اللّه أَنْ يَقُولَ، ثُمَّ قَالَ : (ائذَن لِعَشَرَةٍ) فَأَذِنَ لَهُم، فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا ثُمَّ خَرَجُوا، ثم قال : (ائذَن لِعَشَرَةٍ) فَأَذنَ لهم، فَأَكَلُوا حتى شَبِعُوا، ثم خَرَجوا، ثُمَّ قال : (ائذَنْ لِعَشَرَةٍ) فَأَذِنَ لَهُم حتى أَكل القَوْمُ كُلُّهُم وَشَبِعُوا، وَالْقَوْمُ سَبْعونَ رَجُلاً أَوْ ثَمانُونَ. متفق عليه.

وفي روايةٍ : فما زال يَدخُلُ عشرَةٌ وَيَخرُجُ عشرَةٌ، حتى لم يَبْقَ مِنهم أَحَدٌ إلا دَخَلَ، فَأَكَلَ حتى شَبِعَ، ثم هَيَّأَهَا فَإِذَا هِي مِثلُهَا حِينَ أَكَلُوا مِنها.

وفي روايةٍ : فَأَكَلُوا عَشَرَةً عَشَرَةً، حتى فَعَلَ ذلكَ بِثمانِينَ رَجُلاً ثم أَكَلَ النَّبِيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)بعد ذلكَ وَأَهْلُ البيت، وَتَركُوا سُؤراً.

وفي روايةٍ : ثمَّ أفضَلُوا ما بَلَغُوا جيرانَهُم.

وفي روايةٍ عن أَنسٍ قال : جِئتُ رسولَ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يوْماً فَوَجَدتُهُ جَالِساً مع أَصحابِهِ، وَقَد عَصَبَ بَطْنَهُ بِعِصابَةٍ، فقلتُ لِبَعضِ أَصحَابِهِ : لِمَ عَصَبَ رسولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)بطْنَهُ ؟ فقالوا : مِنَ الجُوعِ.

---

[١٠٨]- بوخارى (٣٥٧٨)و موسليم (٢٠٤٠).

فَذَهَبْتُ إلى أبي طَلحَةَ، وَهُوَ زَوْجُ أُمِّ سُليمِ بنتِ مِلحَانَ، فقلتُ : يَا أَبتَاه، قد رَأَيْتُ رسولَ اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)عَصبَ بطنَهُ بِعِصَابَةٍ، فَسَأَلتُ بَعضَ أَصحَابِهِ، فقالوا : مِنَ الجُوعِ. فَدَخل أَبُو طَلحَةَ على أُمِّي فقال : هَل مِن شَيءٍ ؟ قالت : نعم عِندِي كِسَرٌ مِنْ خُبزٍ وَتمرَاتٌ، فإِنْ جاءَنَا رسول اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وَحْدهُ أَشبَعنَاه، وإِن جَاءَ آخَرُ معه قَلَّ عَنهمْ، وذَكَرَ تَمَامَ الحَديث.

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەبو طەلحە فەرمووی بە ئوممو سولەیم: گوێم لەدەنگی پێغەمبەر بوو (دروودی خوای لەسەر بێ) دەنگی کزبوو، دەزانم کە لەبەر برسێتی وا کزە، ئایا هیچت لەلا هەیە کە بۆی بنێرین؟ گوتی: بەڵێ، جا چەند کولێرەیەکی جۆی دەرهێناو بەلایەکی لەچکەکەی پێچایەوەو خستیە بن دەستی منو ئەولای لەچکەکەیی تێوە ئالاندم تا نانەکان دەرنەکەونو کەس پێیان نەزانێ، ئەنجا ناردمی بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە چووم روانیم لە مزگەوتە، خەڵکەکە وان لە خزمەتیدا منیش بە دیاریانەوە راوەستام، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: ئەبو طەلحە ناردوویتی؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: نانی پیادا ناردووی؟ عەرزیم کرد: بەڵێ، جا فەرمووی: بەوانەی کە لە خزمەتیدا بوون، هەڵسن با بچین بۆ ماڵی ئەبو طەلحە، ئەوەی ناردوویەتی بۆ ئێرە لەوێ دەیخۆین!

جا ئەوان کەوتنە رێو منیش پێش ئەوان گەڕامەوە بۆ لای ئەبو طەلحەو حاڵەکەم تێگەیاند، ئەویش بە ئوممو سولەیمی فەرمووی: ئەی ئوممو سولەیم! پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) خەڵکەکەی وا هێناو هات، ئێمەیش نانی ئەم حەمکە خەڵکەمان نیە جا چار چییە؟ ئەویش فەرمووی: مەترسە روو زەردیمان بەسەر نایەت، کاری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بێ حیکمەت نیە، خوداو پێغەمبەری خودا لە ئێمە باشتر ئاگایان لە حاڵەکە هەیە! ئیتر ئەبو طەلحە خۆی چوو بە پیری پێغەمبەرەوەو لەگەڵیا هاتەوە بۆ ماڵەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی ئوممو سولەیم! خواردنت چی هەیە بی هێنە، ئەویش کولێرەکانی هێنا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستووری دا وردیان کردن، ئوممو سولەیمیش رۆیشت هێزۆڵکەیەکی هێناو هەنێ رۆنی تیادا بوو، هەڵی گوشی بەسەر نانە ولەکەداو پێی چەور کردو بوو بە پێخۆری و بوو بە چنگاڵ، ئەوسا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەوەندەی خودا حەزکا دوعای بەسەردا خوێندو فەرمووی: فەرموو لە دە کەس بکە، فەرموویان لە

ده كەس كردو ده چوونه ژوورەوەو تا تێریان خوارد چنگاڵیان خواردو ئینجا چوونه دەرەوە، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هەموو جارێ دەیفەرموو: رێگەی ده كەسی تریش بدە، وە ده كەسی تر دەچوونه ژوورەوە تێر چنگاڵیان دەخواردو دەهاتنه دەرەوە، هەتا پیاوەكان هەموویان تێرو پڕ نانو رۆنیان نۆش كرد، ژمارەیان دەوری حەفتا هەشتا پیاوێ دەبوو (ش/تاج) لەگێڕانەوەیەكی تردا دەفەرموێ: لەدواییدا حەزرەت خۆی نانی خواردو خێزانەكەی ئەبو طەلحەیش لێیان خواردو هێشتا لەبەریشیان مایەوەو بەشی دەرو دراوسێشیان لێدا.

لەگێڕانەوەیەكی تری ئەنەسدا: رۆژێ چوومە خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لەناو یارانیدا بوو، بەشەتەكێ سكی خۆی شەتەك دابوو، كە لە هاوڕێیانم پرسی حەزرەت بۆ وای كردووە، فەرموویان: لەبرساندا، چوومەوە بۆلای ئەبو طەلحەی زڕبابم، كە مێردی ئوممو سولەیمی كچی میلحان بوو كە دایكی من بوو، گوتم: بابە! حەزرەت حاڵی واو وایە، ئەبو طەلحەش بەدایكمی فەرموو: هیچت لەلا هەیە، گوتی: چەند لەتێ كولێرەو چەند قلێ خورمامان هەیە، ئەگەر تەنیا حەزرەت خۆی تەشریف بێنێ ئەوا بەشی دەكا، بەڵام ئەگەر یەك كەسی تری لەگەڵدا بێ، بەشیان ناكا... ئەوجا فەرموودەكەی پێشووی بەتەواوی گێڕایەوە.

## ٥٧ – باسی قنیاتو رەوشپاكیو میانەڕەوی لە گوزەرانداو باسی دارایی بەخت كردنو خراپیی سوڵكردنو دەرووزە

## باب القناعة والعفاف والأقتصاد في المعيشة والأنفاق وذم السوال من غير ضرورة

قال الله تعالى: { وما من دابة في الأرض إلا على الله رزقها } .

واتە: رزقو (رۆژی)ی هەموو گیانداری، خودا – بەبەخشندەییو میهرەبانیی خۆی – گرتوویەتە ئەستۆی خۆی، كەواتە هەڵپە هەڵپو چاوچنۆكی هۆی بێ تەوەككولییە، بەڵام هەوڵی رەوا جێگەی خۆیەتی.

وقال تعالى: { للفقراء الذين أحصروا في سبيل الله لا يستطيعون ضرباً في الأرض يحسبهم الجاهل أغنياء من التعفف تعرفهم بسيماهم لا يسألون الناس إلحافاً } .

واتە: ئەو خێرو خێراتو زەكاتەی كە دەیدەن، یان دەیكەن بەخێر بیبەخشن بەو هەژارانەی كە خۆیان تەرخان كردووە لەرێگەی خوداداو لێبڕاون بۆ خودا، وەك خەباتگێڕانو دانیشتوانی صوففە، كە ئەمانە ئەوەندە عیزەتی نەفسو

دەروونێکی پڕ جەوهەریان هەیەو لەبەر هێژایی خۆیان پیاوی حاڵ نەزان گومانی ئەوەیان پێ دەبا کە دەوڵەمەندن، چونکە ئەوەندە خۆ بە دوور دەگرن لە دەرووزەو سواڵکردن، تۆ ئەی پیغەمبەری خۆشەویست! هەروا تۆ ئەی قسە لەگەڵ کراو! ئەو هەژارە سەربەرزانە بەشێوەی مەردانەیاندا دەناسی، چونکە ناوچەوانێکی پاکیان هەیە، نوێژکەرو نوورانین، لازەبوونو کەم دەستو پەرپووتنو بێ بەرگیو دەست تەنگییان پێوە دیارە، ئەو هەژارە دمرووزە نەکەرانە یان هەر داوای شت ناکەن لە مەردووم، یان ئەگەر داواشی بکەن بەتووتڕکی نانووسێن بە کوڵکی خەڵکەوە!

وقال تعالى (: { والذين إذا أنفقوا لم يسرفوا ولم يقتروا، وكان بين ذلك قواماً }.

واتە: ڕەوشتو صیفەتێکی تری بەندە خوداپێداوەکانی خودای میهرەبان ئەوەیە بەخشندەو سەخین، بەلام دەست شڕو دەست بڵاونین، بەپێی توانا، بەشێوەیەکی وا کە نە شیش بسوتیو نە کەباب، بۆ رەزای خودا خێرو خێرات دەکەن.

وقال تعالى: { وما خلقت الإنس والجن إلا ليعبدون، ما أريد منهم من رزق وما أريد أن يطعمون }.

واتە: حیکمەتی ئەساسی لەدروستکردنی بەرەی جنۆکەو بەرەی مرۆڤدا ئەوەیە کە روو لە خودا بنو عیبادەتو بەندەیی ساغی خودا بکەنو خودا بناسن، دەنا مەبەست ئەوە نیە کە رزقو رۆژیی بۆ من پەیدا بکەن، خۆ خوداو بەندە ئاغاو نۆکەر نین، فەرموودەی زۆر لەم بابەتە لەپێشەوە رەت بوو، بەتایبەت لەم دوو باسەی پێشەوەدا.

وأما الأحاديث فتقدم معظمها في البابين السابقين. ومما لم يتقدم:

٥٢٢/١[١٠٩]- عن أبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّه عنه) عن النَّبيّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قال: (لَيس الغِنَي عَن كَثْرَةِ العَرضِ، وَلَكِنَّ الغِنيَ غِنَي النَّفسِ) متفقٌ عليه.

---

[١٠٩] بوخاری (٦٤٤٦) و موسلیم (١٠٥١).

**ئەبو هورەیرەوە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: دەوڵەمەندیی بە زۆریی ماڵو دارایی نییە، بەڵام دەوڵەمەندیی بە بەرچاوتێریی و دڵتێرییە. (ش).**

٥٢٣/٢[١١٠]- وعن عبد اللّٰه بن عمرو رضي اللّٰه عنهما أَن رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال : (قَدْ أَفلَحَ مَنْ أَسلَمَ، وَرُزِقَ كَفَافاً، وَقَنَّعَهُ اللّٰه بما آتاهُ) رواه مسلم.

**لەباسی پێشوودا رابورد، فەرموودەی بیستو دووەم/ فەرموودەی: (لقد أفلح من أسلم...). بڕوانە ژمارە: (٢٢/٥١٢ز - ٥٦).**

٥٢٤/٣[١١١]- وعن حَكيم بن حِزَام (رضي اللّٰه عنه)قال : سَأَلْتُ رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم)فَأَعطَاني، ثم سَأَلْتُهُ فَأَعطَاني، ثم سَأَلْتُهُ فَأَعطَاني، ثم قال : (يا حَكيمُ، إنَّ هذا المَالَ خَضِرٌ حُلْوٌ، فَمن أَخَذَهُ بِسَخَاوَةِ نَفس بُورِكَ لَهُ فِيه، وَمَن أَخَذَهُ بإِشرَافِ نَفس لَم يُبَارَكْ لهُ فيهِ، وكَانَ كَالَّذي يَأْكُلُ ولا يَشْبَعُ، واليدُ العُلْيا خيرٌ مِنَ اليَدِ السُّفلَى) قال حَكيمٌ فقلتُ : يا رسول اللّٰه وَالَّذِي بَعثَكَ بالحَقِّ لا أَرْزَأُ أَحداً بَعدَكَ شَيْئاً حَتَّى أُفارِقَ الدُّنيا، فَكَانَ أَبُو بكرٍ (رضي اللّٰه عنه)يَدْعُو حَكيماً لِيُعطيَهُ العَطَاءَ، فَيأْبَى أن يَقْبَلَ مِنْهُ شَيْئاً. ثُمَّ إنَّ عُمر (رضي اللّٰه عنه)دَعَاهُ لِيُعطيَهُ، فَأَبَى أَن يَقْبلَهُ. فقال : يا مَعشَرَ المُسْلمينَ، أُشْهِدُكُم على حَكيمٍ أَنِي أَعْرِضُ عَلَيه حَقَّهُ الَّذِي قَسَمَهُ اللّٰه لَهُ في هذا الْفيءِ، فيأْبَى أَن يَأْخُذَهُ. فَلمْ يَرْزَأْ حَكيمٌ أَحداً مِنَ النَّاسِ بَعْدَ النَّبيّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم)حَتَّى تُوُفي. متفقٌ عليه.

**حەكیمی كوڕی حیزام** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: جارێ داوای بەشم لە پیغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **كرد، ئەویش بەشی دام، دیسان داوام لێ كردەوە دیسانەوە بەشی دامەوە، لە پاشان فەرمووی: ئەی حەكیم! راستە كە ماڵ مێوەیەكی سەوزو شیرینو خۆشە، بەڵام بزانە ئەوەی بەبەرچاو تێریی و دڵتێریی وەری بگرێ، خودا بەرەكەتو پیتو فەڕی بۆ تێ دەخاو ئەو ماڵە خێر دەداتەوە، وەلێ ئەوەی كە بە خوازەڵۆكیو چاوچنۆكی هەڵپە هەڵپی بۆ دەكاو قرمو مرخی لێ خۆش دەكاو چاوی تێ دەبڕێ تا دەیسەنێ، بەشێوەیەكی وا لەوەودوایش خاوەنەكەی چاوی لەدوایەتی، ئەوە ئەو ماڵە پیتو بەرەكەتی بە حەوادا دەچێ! ئیتر ئەو كەسە كە ئەوە حاڵیەتی**

---

[١١٠] بڕوانە (٢٢/٥١٢ز - ٥٦).

[١١١] بوخاری (١٤٧٢)و موسلیم (١٠٣٥).

وەك ژەمەنبوردەی لێ دێ، هەر دەخواو هەر تێر نابێ! دیارە کە دەستی سەروو دەستی خێرکەرە یان ئەو دەستەیە کە بێز لە دەرووزە دەستی ژێروو کەدەستی دەروەزە دەکاتەوە. دیارە کە دەستی سەروو لەکەرە گەلێ باشترە، حەکیم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کە ئەمەم لە حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) ژنەوت گوتم: ئەی رەهبەری خودا! بەو کەسەی کە تۆی کردووە بە پێغەمبەرێکی راستو دروستو رەوانەی کردووی لەگەڵ ئەو ئایینە راستەدا ئیتر لە پاش تۆ تا لە جیهان دەردەچم شت لەکەس وەرناگرم، لەپاش حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەبوبەکرو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) لەکاتی جێنشینی (خەلافەت)ی خۆیاندا بەشی خۆیان لە دەستکەوتی جەنگی (فەیأ) دەدایەوە بەڵام حەکیم تا مرد بزگوڕێکی لەکەس وەرنەگرت، عومەریش شایەتی لێ گرتو فەرمووی: ئەی گەلی موسوڵمانینە! ئێوە بە شایەتت بن، ئەوەتا من بەبەرچاوی ئێوەوە لەم دەستکەوتە بەشی خۆیی دەدەمێ، وەك ئەو پشکەی کە خودا بۆی داناوە، بەڵام حەکیم خۆی وەری نەگرت (ش).

٥٢٥/٤[١١٢] - وعن أبي بُردَةَ عن أبي موسى الأشعَريِّ رضي اللّه عنه قال : خَرَجْنَا مَعَ رَسُول اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)في غَزوَةٍ، ونَحْنُ سِتَّةُ نَفَرٍ بيْنَنَا بَعِيرٌ نَعْتَقِبهُ، فَنَقِبتْ أَقدامُنا، وَنَقِبَتْ قَدَمِي، وَسَقَطَتْ أَظْفاري، فَكُنَّا نَلُفُّ عَلى أَرْجُلِنا الخِرَقَ، فَسُميت غَزوَةَ ذاتِ الرِّقاعِ لِما كُنَّا نَعْصِبُ عَلى أَرْجُلِنَا الخِرَقَ، قالَ أَبو بُردَةَ : فَحَدَّثَ أَبو مُوسَى بِهَذا الحَديثِ، ثُمَّ كَرِهَ ذلكَ، وقالَ : ما كنْتُ أَصْنَعُ بِأَنْ أَذْكُرهُ، قالَ : كَأَنَّهُ كَرِهَ أَنْ يَكُونَ شَيْئاً مِنْ عَمَلِهِ أَفْشاهُ. متفقٌ عليه.

ئەبو مووسا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە خزمەتی حەزرەتدا (دروودی خوای لەسەر بێ) چووین بۆ غەزایێ، تاقمەکەی من شەش کەس بووین، تاقە وشترێکمان بەرکەوتبوو، هەر شەشمان بەسەرە بەرو دوا سواری دەبووین، گوتی: ئەوەندە بە پێی پەتی رێگەمان بڕی پێمان کوتراو توێخی بەردا، منیش قاچەکانم توێکیان بەرداو نینۆکەکانم کەوتن، لەتاواندا لەبەر بێ پێڵاویی‌و لەبەر گەرما پەڕۆمان بە قاچمانەوە دەپێچا، بۆیە ئەو غەزایە ناونرا غەزای ذاتوڕڕیقاع، واتە: غەزا پەڕۆینە! ئەبو بوردە دەیفەرموو: باوکم ئەم سەرگورشتەی گێڕایەوە، کەچی لە

[١١٢] بوخاری (٤١٢٨)و موسلیم (١٨١٦).

پاشا گێڕانەوەکەی پێ ناخۆش بوو، دەیفەرموو: من ئەم قسەیەم بۆ کرد، گوتی: وەك بلێی پێی ناخۆش بێ باسی کاری چاکەی خۆی بکا، تا نەبێ بە چاوەو روالەت (ش).

٥٢٦/٥[١١٣]- وعن عمرو بن تَغْلِب بفتح التاءِ المثناةِ فوقَ وإسكان الغين المعجمة وكسر اللام رضي اللّه عنه، أنَّ رَسُولَ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)أُتِـيَ بِمَـال أَوْ سَبْـيٍ فقسَّمهُ، فَأَعْطَى رجالاً، وتَرَكَ رجالاً، فَبلَغَهُ أَنَّ الَّذِينَ تَرَكَ عَتبُوا، فَحَمِدَ اللّه، ثُمَّ أَثْنى عَلَيه، ثُمَّ قال : (أَمَا بَعدُ، فَوَاللَّهِ إِنِّي لأُعْطِي الرَّجُلَ وَأَدَعُ الرَّجُلَ، والَّـذِي أَدَعُ أَحَـبُّ إِلـيَّ مِـنَ الَّـذي أُعْطِي، وَلكِنِّي إِنَّمَا أُعْطِي أَقوَاماً لِما أَرى في قُلُوبِهِمْ مِن الجَزعِ والهَلَع، وَأَكِلُ أَقْواماً إلى ما جعَلَ اللّه في قُلُوبِهِمْ مِنَ الغِنِي والخَيْرِ، مِنْهُمْ عَمْرُوُ بنُ تَغلِبَ) قال عمرُو بنُ تَغْلِب : فواللّه ما أُحِبُّ أَن لي بِكَلِمةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)حُمْرَ النَّعَمِ. رواه البخاري.

عەمری کوڕی تەغلیب (خوا لێی رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هەندێ ماڵی تالانی یان ئافرەتی تالانی بۆ هاتبوو، جا بەشی هەندێ پیاو دەداو بەشی هەندی پیاو نادا، لەدوایی دا پێی دەگاتەوە کە ئەوانەی بەشی نەداون گلەیی دەکەن، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) سوپاسو ستایشی خودای کردو فەرمووی: لەپاش پەسنی خودا، من گەلێ جار وا دەبێ بەشی هەندێ کەس دەدەمو بەشی هەندی کەسی تر نادەم، بەلام لە دلێشەوە ئەوانەم خۆشتر دەوێ کە بەشیان نادەم، دەزانن ئەمە لەبەر چی وایە؟ هەندێ کەس دەیانبینم هەر هەلپە دەکەنو چاوبرسینو چاوچنۆکن، منیش لەبەر ئەوە بەشیان دەدەم هەتا دلیان رابگرمو بیانکەم بە دۆستی ئیسلام، وەلێ بەشی هەندێ کەسی تر نادەم چونکە پشتەستوورم لەوە کە ئەوانە بەرچاوتێرنو خێرخوان، ئیتر دەیاندەمە دەست ئەو بەرچاوتێرییو خێرخواییەی خۆیان، یەکێك لەم مەردە چاوتێرو دلێرانە عەمری کوڕی تەغلیبە! عەمری کوڕی تەغلیب دەیفەرموو: بەخودا ئەم وشە مەدحەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەهەموو رانە وشترە سوورەکانی عەرەبی ناگۆڕمەوە کە نایابترینو باشترین ماڵو سامانی عەرەبانن (ب).

---

[١١٣] بوخاری (٩٢٣).

٥٢٧/٦[١١٤] - وعن أبي عبدالرحمن معاوية بن أبي حَكيمِ بن حِزامٍ (رضـي اللّـه عنـه)أَنَّ النَّبـيّ (صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قالَ : (اليدُ العُليا خَيْرٌ مِنَ اليَدِ السُّفْلى، وابْـدَأ بمَـنْ تعُـولُ، وخَيْرُ الصَّدَقةِ ما كان عنْ ظَهْرِ غِني، ومَنْ يَسْتَعْففْ يُعفَّهُ اللّه، ومَنْ يَسْتغْن يُغْنِهِ اللّه) متفقٌ عليه. وهذا لفظ البخاري، ولفظ مسلم أخصر.

لەباسی (النفقة على العيال)دا رابورد، دوا فەرمووودەی باس. بڕوانە (٢٩٦/٨ز - ٣٦).

٥٢٨/٧[١١٥] وعن سفيانَ صَخْرِ بن حَرْبٍ (رضي اللّه عنه)قال : قال رسولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْه وسَلَّم): (لا تُلْحِفُوا في المسأَلَةِ، فوَاللّه لا يَسْأَلُني أَحَـدٌ مِـنْكُمْ شَـيْئاً، فَتُخـرِجَ لَـهُ مَسْأَلتُهُ مِنِّي شَيْئاً وَأَنا لَهُ كارِهٌ، فَيُبارَكَ لَهُ فيما أَعْطَيْتُهُ) رواه مسلم.

موعاوييە (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: لەسـواڵ کردنـدا وەڕك مەگرن، سا بەو خودایە هەرکەسێ بە زۆری سواڵ شتێ لـەمن بسێنێ کە خۆم پێم خۆش نەبێو بەحوسنو ڕەزای خۆم نەبێ، زۆر ستەمە کەپیتو فەڕی تێ بکەوێ بۆی! (م).

٥٢٩/٨[١١٦] وعن أبي عبدِ الرحمنِ عَوف بن مالك الأَشْجَعِيِّ (رضي اللّه عنه)قالَ : كُنَّا عِنْدَ رسُول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)تِسعَةً أَوْ ثمانيةً أَوْ سَبْعَةً، فَقَال : أَلاَ تُبَايِعُونَ رَسُولَ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وكُنَّا حَدِيثي عَهْدٍ بِبيْعَةٍ، فَقُلْنا : قَدْ بايعْناكَ يا رسُولَ اللّـهِ، ثـم قال : (ألا تبايعون رسول الله ؟) فبسطنا أيدينا وقلنا قد بايعناك يا رسول الله فَعَلاَم نَبَايِعُكَ ؟ قال : (على أنْ تَعْبُدُوا اللّه ولا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً، والصَّلَوَاتِ الخَمْس وتسمعوا وَتطيعُوا الله) وَأَسرَّ كلمَةً خَفِيَةً : (وَلاَ تَسْأَلُوا النَّاسِ شَيْئاً) فَلَقَدْ رَأَيتُ بَعْضَ أُولئـكَ النَّفَـرِ يَسْـقُطُ سَوْطُ أَحدِهِمْ فَما يَسْأَلُ أَحَداً يُناوِلُهُ إِيَّاهُ رواه مسلم.

عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: یان نۆ یـان هەشـت یـان حەوت کەس بووین، لە خزمـەت حەزرەتـدا (دروودی خوای لەسەر بێ) تـازە پـەیمانمان لەگەڵدا بەستبوو، کەچی فەرمووی: ئەوە بۆ بـەیعـەت ناکـەن لەگـەڵ پێغەمبـەری خـودادا؟! ئێمـەش گوتمـان: خــۆ تـازە پــەیمانمان داوە بــە تــۆ، ئــەی پێغەمبــەری خــودا!

[١١٤] بڕوانە (٢٩٦/٨ز ٣٦).

[١١٥] موسلیم (١٠٣٨).

[١١٦] موسلیم (١٠٤٣).

فەرموویەوە: ئەوە بۆ پەیمان ناکەن لەگەڵ پیغەمبەری خودادا؟! ئێمەش دەستمان رایەڵاو گوتمان: قوربان! پەیمانمان داوە پێت، ئیتر لەسەر چی پەیمانت بدەینێ؟ فەرمووی: لەسەر ئەوە کە بەس خودا بەساغی بپەرستن‌و هیچ هاوبەش‌و هاورێی بۆ پەیدا نەکەن، وە پێنج نوێژە فەرزەکان بەجوانی بکەن‌و بەگوێی فەرمانڕەوای خۆتان بکەن، بەمەرجێ لە فەرمانی خودا دەرنەچن، وە ئەم وشەیەشی بە دەنگی نزم چپان بەگوێماندا: وە هیچ شتێ لەکەس سواڵ مەکەن، عەوف فەرمووی: هەندێ لەو دەستەیەم لەوەدوا دەدی، کە داردەست‌و قەمچییان لەدەست دەکەوتە خوارەوە، لەکەس داوایان نەدەکرد کە بیداتەوە دەستیان، نەبادا ئەوەیش بەر سواڵ بکەوێ، خۆیان دادەنەوینەوە یان دادەبەزین‌و هەڵیان دەگرتەوە (م).

٥٣٠/٩[١١٧]- وعن ابن عمر رضي اللّه عنهما أنَّ النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال : (لاَ تَزَالُ المَسأَلَةُ بِأَحَدِكُمْ حَتى يَلْقى اللّه تعالى ولَيْسَ في وَجْهِهِ مُزْعةُ لَحْمٍ) متفقٌ عليه.

ئیبنو عومەر (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: پیاوی واتان هەیە هەر خەریکی دەرووزەیە، هەتا لە رۆژی زیندووەدا کە دێ بۆ دیوانی خودای گەورە، بۆ لێپرسینەوە یەك پرزۆڵە گۆشت بە روویەوە نامێنێ، لەو دەشتی مەحشەرەدا خودا مۆری سواڵکەریی دەنێ بەروویاو دەموچاوی یەکپارچە ئێسقانی رووتی بێ گۆشت دەبێ! (ش).

٥٣١/١٠[١١٨]- وعنه أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال وهو على المِنبر، وذكر الصَّدقَةَ والتَّعَفُّفَ عَنِ المسأَلَةِ : (اليَد العلْيا خَيْرٌ مِنَ اليَدِ السُّفْلى) وَاليَد العُليا هِيَ المُنفِقة، والسُّفْلَى هِيَ السَّائِلَة. متفقٌ عليه.

دیسان فەرمووی: پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەسەر دوانگە (مینبەر) باسی خێرکردنی فەرموو، لەگەڵ وەسپی پارێز کردن لە سواڵ‌و فەرمووی: دەستی سەروو لە دەستی ژێروو باشترە، دەستی سەرەوەیش دەستی خێرکەرە، دەستی ژێرەوەیش دەستی دەرووزەکەرە! (ش).

[١١٧] بوخاری (١٤٧٤)و موسلیم (١٠٤٠).

[١١٨] بوخاری (١٤٢٧)و موسلیم (١٠٣٣).

١١/٥٣٢[١١٩] - وعن أبي هُريرة (رضي اللّٰه عنه)قال : قال رسُولُ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (مَنْ سَأَلَ النَّاس تَكَثُّراً فَإِنَّمَا يَسْأَلُ جَمْراً، فَلْيسْتَقِلَّ أَوْ لِيَسْتَكْثِرْ) رواه مسلم.

**ئەبو هورەیرەوە** (رەزای خودای لێ بێ) **لە حەزرەتەوە** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: ئەوەی بەشی خۆی هەبێو کەچی بۆ کۆمەڵکردنی ماڵ کە چڵکی دەستە دەرووزە بکاو روو لە خلەو بلە بنێ، ئەوە ماڵ کۆناکاتەوە، بەڵکوو پشکۆی ئاگری دۆزەخ لەخۆی کەڵەکە دەکا، ئیتر ئارەزووی خۆیەتی کەم کۆدەکاتەوە یان زۆر (م/تاج).**

١٢/٥٣٣[١٢٠] - وعن سَمُرَةَ بن جُنْدبٍ (رضي اللّٰه عنه)قال : قال رسُولُ اللّٰه صلى اللّٰه عليه وآله وسَلَّم : (إنَّ المَسألَةَ كَدٌّ يكُدُّ بها الرَّجُلُ وجْهَهُ، إلاّ أَنْ يَسأَلَ الرَّجُلُ سُلْطاناً أَوْ في أَمْرٍ لابُدَّ مِنْهُ) رواهُ الترمذي وقال : حديث حسن صحيح.

**سەموورە لە حەزرەتەوە** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: سواڵکردن ئابڕووی پیاو دەبا، مەگەر بۆ کەسێ کە داوای بەشی شەرعی خۆی لە فەرمانڕەوا بکا، وەك زەکاتو خومسو ماڵی بەیتولمال، یان لەبەر ناچاریی بێ ئەوە قەیناکا (ت/ح/ح/ص).**

١٣/٥٣٤[١٢١] - وعن ابن مسعودٍ (رضي اللّٰه عنه)قال : قال رسُولُ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (مَنْ أَصابَتْهُ فَاقَةٌ فَأَنْزَلَهَا بِالنَّاسِ لَمْ تُسَدَّ فاقَتُهُ، وَمَنْ أَنْزَلَها باللّٰه، فَيُوشِكُ اللّٰهُ لَهُ بِرزقٍ عاجِلٍ أَوْ آجِلٍ) رواهُ أبو داود، والترمذي وقال : حديث حسن.

**ئیبنو مەسعوود** (رەزای خودای لێ بێ) **لە حەزرەتەوە** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: کەسێ لەکاتی لێقەمانو هەژاریدا پەلاماری خەڵك بداو دامێنی ئەمو ئەو بگرێو هانا بۆ ئادەمیزاد بەرێو خودای گەورە فەرامۆش بکا، ئەوە بەو جۆرە دەردی دەرمان ناکرێ، بەڵام ئەو کەسەی کە لەم حاڵەتانەدا کاری خۆی رووبەرووی خودا دەکاتەوە، ئەوە خودا بە زوویی دەیحەسێنێتەوە، یاخود زوو یان درەنگ دەوڵەمەندی دەکا (د/ت:ح/ح - تاج).**

---

[١١٩] موسلیم (١٠٤١).

[١٢٠] تیرمیذي (٦٨١).

[١٢١] ئەبو داوود (١٦٤٥)و تیرمیذي (٢٣٢٧).

٥٣٥/١٤[١٢٢]- وعَنْ ثَوْبَانَ (رضي اللّٰه عنه)قال : قال رسُولُ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (مَنْ تَكَفَّلَ لي أَن لا يسْأَلَ النَّاسَ شَيْئاً، وَأَتَكَفَّلُ له بالجَنَّة ؟) فقلتُ : أنا، فكَانَ لا يسْأَلُ أَحَداً شَيْئاً، رواه أبو داود بإسنادٍ صحيح.

**ثەوبان** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درووودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: کێ مەرجم لەگەڵ دەکا کە هیچ لەخەڵك داوا نەکا هەتا منیش بەپشتی بەخشش و (کەرەم)ی خوا بەڵێنی بدەمێ؟ منیش گوتم: من، ئیتر لەوەدوا ثەوبان داوای شتی لەکەس نەدەکرد هەتا مرد (د – س/ص) لە دەلیلولفالیحینی شەرحی ریاض الصالحين دا دەفەرموێ: رێ دەکەوت ثەوبان بەسواریی قەمچی لەدەست دەکەوتە خوارەوە، بەکەسی نەدەگوت کە بیداتەوە دەستی، خۆی لەوڵاخەکەی دادەبەزی و هەڵی دەگرتەوە! (وەرگێڕ).**

٥٣٦/١٥[١٢٣]- وعن أبي بِشْر قَبِيصَةَ بن المُخَارِق (رضي اللّٰه عنه)قال : تَحمَّلْت حَمالَةً فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)أَسْأَلُهُ فيها، فقال : (أَقِمْ حَتَّى تَأْتِينا الصَّدَقَةُ فنأْمُرَ لكَ بها) ثُمَّ قال : (يا قَبِيصَةُ إنَّ المَسْأَلَةَ لا تَحِلُّ إلاَّ لأَحَدِ ثلاثَةٍ : رَجُلٌ تَحمَّلَ حَمالَةً، فَحلَّتْ لَهُ المَسْأَلَةُ حَتَّى يُصيبَها، ثُمَّ يُمْسِكُ. ورجُلٌ أَصابَتْهُ جائحَةٌ اجْتاحَتْ مالَهُ، فَحلَّتْ لَهُ المَسْأَلَةُ حَتَّى يُصِيبَ قِواماً مِنْ عيْش، أَوْ قال : سِداداً مِنْ عَيْش، ورَجُلٌ أَصابَتْهُ فاقَة، حتى يقُولَ ثلاثَةٌ مِنْ ذَوي الحِجَى مِنْ قَوْمِهِ : لَقَدْ أَصابَتْ فُلاناً فاقَةٌ، فحلَّتْ لَهُ المسْأَلةُ حتَّى يُصِيبَ قِواماً مِنْ عَيْش، أَوْ قالَ: سِداداً مِنْ عَيْشٍ. فَمَا سِواهُنَّ مِنَ المَسأَلَةِ يا قَبِيصَةُ سُحْتٌ، يأَكُلُها صاحِبُها سُحْتاً) رواهُ مسلم.

**قەبیصە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: باربوویەکم لەئەستۆی خۆم گرتبوو، واتە: چووبوومە ژێر چەردەیێ ماڵ کەبیدەم لەپێناوی ناوبژی کردنی دوو دەستەی ناکۆکا، جا چوومە خزمەتی حەزرەت** (درووودی خوای لەسەر بێ) **داوای پیتاکم لێ کرد بۆ ئەم مەبەستە، فەرمووی: بمێنەرەوە تا زەکاتمان بۆ دێ، ئەوسا بەشت دەدەم لێی، ئینجا فەرمووی: ئەی قەبیصە! دەروزە دروست نیە، بۆ ئەم سێ شتە نەبێ: بۆ پیاوی دروستە کەچووبێتە ژێر ئەندازەیێ ماڵ بۆ کوژانەوەی ئاژاوەیێ، بۆ ئەمە دروستە**

---

[١٢٢] **ئەبو داوود (١٦٤٣).**

[١٢٣] **موسلیم (١٠٤٤).**

كە ئەوەندە پیتاك كۆبكاتەوە تا ئەو ئەندازەیە پەیدا دەكاو ئیتر دەبێ واز بێنێ، بۆ پیاوێكیش كە قۆرتێ هاتبێ بەسەریداو هەژار كەوتبێ، بۆ ئەمیش دروستە ئەوەندە پیتاك كۆبكاتەوە، تا گوزەرانی پێی دەچێ بەڕێوە، یان فەرمووی: هەتا گوزەرانی پێ دەكا، بۆ پیاوێكیش كە سێ پیاوی هۆشیار - كە لە هۆزی خۆی - شایەتی هەژاری بۆ بدەنو بڵێن: بەخودا فیسارەكەس هەژارو نابووت بووە، جا بۆ ئەمیش دروستە ئەوەندە باربوویی وەربگرێ تا گوزەرانی پێی دەچێ بەڕێوە، یان فەرمووی: تا گوزەرانی پێ دەكا، ئەی قەبیصە! ئیتر لەمە بترازێ سواڵەو ناڕەوایەو خاوەنەكەی بە ناڕەوایی دەیخوا (م).

٥٣٧/١٦[١٢٤] وعن أبي هريرة (رضي اللّه عنه)أنَّ رسُولَ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال : (لَيْسَ المِسْكِينُ الّذِي يطُوفُ عَلى النّاسِ تَرُدُّهُ اللُّقْمَةُ واللُّقْمَتان، وَالتَّمْرَةُ والتَّمْرَتَان، وَلَكِنَّ المِسْكِينَ الّذِي لا يجِدُ غِنًى يُغنِيه، وَلاَ يُفْطَنُ لَهُ، فَيُتَصدَّقَ عَلَيْهِ، وَلاَ يَقُومُ فيَسْأَلَ النَّاسَ) متفقٌ عليه.

لە ئەبو هورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەژاری بەڕاستی ئەوە نیە كە دەرگاو ماڵەو ماڵ دەسوڕێتەوەو خەڵك خێری پێ دەكەن، لێرەو لەوێ بەپاروویێ دوو پاروو، یان بە دەنكێ دوو دەنك خورما دەستی پێوە دەنێن، بەڵام هەژاری تەواو شایستەی زەكاتە ئەو كەسەیە كە خۆی ئەوەندە دارایی نیە كە بەشی بكاو كەسیش پێی نازانێ تا زەكاتی بداتێو دەسگیرۆیی بكا، خۆیشی لەبەر قەدر گرتنی خۆی ناچێ سواڵ لەمو لەو بكا! (ش).

## ٥٨ - شت وەرگرتن دروستە، ئەگەر بەسواڵو چاوتێبڕین نەبێ
## باب جواز الأخذ من غير مسألة ولا تطلع إليه

٥٣٨/١[١٢٥]- عَنْ سالِمِ بن عبدِ اللّهِ بنِ عُمَرَ، عَنْ أَبيهِ عبدِ اللّه بن عُمَرَ، عَنْ عُمَرَ رضي اللّه عنهم قال : كان رسولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يُعْطِيني العطَاءَ، فَأَقُولُ : أَعطِهِ مَن هو أَفقرُ إِلَيهِ مِنّي، فقال : (خُذهُ، إِذَا جاءَكَ مِن هذا المَالِ شَيءٌ، وَأَنْتَ غَيرُ مُشْرِفٍ ولا

[١٢٤] بوخاری (١٤٧٩)و موسلیم (١٠٣٩).

[١٢٥] بوخاری (١٤٧٣)و موسلیم (١٠٤٥).

سَائِلٍ، فَخُذْهُ فتموَّلْهُ فَإن شِئتَ كُلْهُ، وإن شِئْتَ تَصْدَقْ بِهِ، وَمَا لا، فَلا تُتبِعْهُ نَفْسَكَ) قال سالمٌ : فَكَانَ عَبدُ اللّٰه لا يسأَلُ أحداً شَيْئاً، وَلا يَرُدُّ شَيئاً أُعْطِيه. متفقٌ عليه.

**عومـەر** (رەزای خودای لێ بێ) **فـەرمووی: جـاران پێغەمبـەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **کـە لـە تـاڵان بەشی دەدام دەمگوت: قوربان! ئەمە بدە بە کەسێ کە ئەو لە من پتر پێویستی پێی هەبێ، ئەومیش دەیفەرموو:** (دروودی خوای لەسەر بێ) **ئەگـەر لـەم ماڵـە شـتێکت پـێ درا، وەری بگرە، بەمەرجێ چاوی تێ نەبڕیو داوای نەکەی ئەگینا خۆتی تێ مەگەیەنە. سالم دەیفـەرموو: عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەر دەسـتووری وابـوو: داوای شـتی لەکـەس نەدەکرد، بەڵام هەرچی پێ دەدرا وەری دەگرتو ڕەتی نەدەکردەوە (ش).**

## ٥٩ – باسی هاندان لەسەر ئەوەی پیاو لەبەری ڕەنجەشانی خۆی بخواتو واز لە سواڵو داوای دەسەنە بێنێ

## باب الحث على الأكل من عمل يده والتعفف به عن السوال والتعرض للأعطاء

قال اللّٰه تعالى: { فإذا قضيت الصلاة فانتشروا في الأرض وابتغوا من فضل اللّٰه } الآية.

**واتە: کاتـێ نوێـژی هـەینی کـرا لەنوێـژ بوونـەوە، ئـیتر وەك ئاسایی بڵاوەی لێ بکەنو بچن بەلای کاری خۆتانەوەو مشووری ئەو رزقو ڕۆژییەی خۆتان بخۆن کـە خودا لە سایەی خۆیەوە دەتان داتێ، لەهەموو حاڵو بارو دۆخێکیشا یـادو ذیکـری خودا کاتو شوێنی بۆ نییە، تەنانـەت لـەناو ئاودەستیشدا سوننەتە ذیکـری خـودا بکرێو سەراوکەر بڵێ (أعوذ بالله من الخبث والخبائث).**

٥٣٩/١[١٢٦]- وعنْ أبي عبدِ اللّٰه الزُّبَيْرِ بنِ العوَّامِ (رضي اللّٰه عنه)قالَ : قالَ رسولُ اللّٰـه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (لأَنْ يَأْخُذَ أَحدُكُم أَحبُلَهُ ثُمَّ يَأْتِيَ الجَبَلَ، فَيَأْتِيَ بِحُزْمَةٍ مِن حَطَبٍ عَلى ظَهرِهِ فَيَبيعَهَا، فَيَكُفَّ اللّٰه بها وَجْهَهُ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَن يَسأَلَ النَّاسَ، أَعطَوْهُ أَوْ مَنَعُـوهُ) رواه البخاري.

**عەبدوڵڵای کوڕی زوبـەیری کـوڕی عـەووام (خـوا لێیـان ڕازیـی بـێ) فـەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەسە کەسـێ لە ئێوە گوریسێ هەڵبگرێو بچێ بۆ ئەو کەژەو بەکۆڵ کۆڵـەدار بێنـێو بیفرۆشـێو خۆی پێ ڕزگار بکا لەچاو بـەرمژێری ئـەمو ئـەو، هێشتا ئـەوەی گـەلێ لـەوە باشـترە**

---

[١٢٦] بوخاری (١٤٧١).

**کەبچێ دەست لەمەردووم پان بکاتەوە، ئیتر ئەو مەردوومە بەشی بدەن یان بەشی نەدەن، هەر ئیشکردنەکە بەقەدرترە لەسوالکردنەکە! (ب/تاج).**

٥٤٠/٢[١٢٧]- وعن أبي هُريرة (رضي اللّٰه عنه) قال : قال رسولُ اللّٰـه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (لأَنْ يحتَطِبَ أَحَدُكم حُزمَةً على ظَهرِه، خَيْرٌ من أَنْ يَسأَل أَحَداً، فَيُعْطِيَه أَو يمنَعَهُ) متفقٌ عليه.

**مەئالی ئەم فەرموودەیەش وەکی فەرموودەی پێشوو وایە.**

٥٤١/٣[١٢٨]- وعنه عنِ النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قال : (كان دَاوُدُ عليهِ السَّلامُ لا يَأْكُل إلاّ مِن عَملِ يَدِهِ) رواه البخاري.

**ئەبو هورەیرەوە** (رەزای خودای ل بیّ) **لە حەزرەتەوە** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: داوود پیغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەر لەبەری رەنجەشانی خۆیی دەخواردو بەس (بوخاری رەحمەت لە گۆری نازداری).**

٥٤٢/٤[١٢٩]- وعنه أَن رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قال : (كَانَ زَكَرِيَّا عليه السَّلامُ نجَّاراً) رواه مسلم.

**دیسان ئەو فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: زەکەرییا پیغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **دارتاش بوو (م).**

٥٤٣/٥[١٣٠]- وعن المِقدَام بن مَعْدِ يكَربَ (رضي اللّٰه عنه)، عن النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قال : (مَا أَكَلَ أَحَدٌ طَعَاماً خَيْراً مِن أَنْ يَأْكُلَ مِن عمَلِ يَدِهِ، وَإِنَّ نَبِيَّ اللّٰـه دَاوُدَ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) كان يَأْكلُ مِن عَمَلِ يَدِهِ) رواه البخاري.

**میقدام** (رەزای خودای ل بیّ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: هیچ نانێ وەك ئەوە باش نییە کە مرۆڤ لەبەری رەنجەشانی خۆی بخوات، داوود کە پیغەمبەری خودا بوو، (درودی لەسەر بێ) هەر لەبەری رەنجەشانی خۆیی دەخوارد (ب).**

---

[١٢٧] بوخاری (١٤٧٠) و موسلیم (١٠٤٢).

[١٢٨] بوخاری (٢٠٧٣).

[١٢٩] موسلیم (٢٣٧٩).

[١٣٠] بوخاری (٢٠٧٢).

**٦٠ - باسی سەخاوەتو بەخشینەوەو ماڵ بەخت کردن لە ڕێگەیەکی باشەوە. بەپشتی خودای گەورە - باب الكرم والجود والأنفاق في وجوه الخير ثقة بالله تعالى**

قال الله تعالى: { وما أنفقتم من شيء فهو يخلفه }.

وقال تعالى: { وما تنفقوا من خير فلأنفسكم، وما تنفقون إلا ابتغاء وجه اللّه. وما تنفقوا من خير يوف إليكم وأنتم لا تظلمون }.

وقال تعالى: { وما تنفقوا من خير فإن اللّه به عليم }.

**تێکڕایی واتای ئایەتە پیرۆزەکان ئاوایە: هەرچی بەخت دەکەن، لەڕێگەی باشەوە، بەمەرجی ئەوەی بۆ ڕەزای خودا بێ، ئەوە خێرێکەو بۆ خۆتانی دەکەن، خودا پاشەکەوتی دەکا بۆتان، لەم جیهانەدا یان لەو جیهانەکەی تردا یان لە هەردوو جیهاندا تۆڵەتان بۆ دەکاتەوەو بەزیادەوە هەقتان بۆ دەکاتەوە، بزانن خێر کەم بێ یان زۆر بێ لای خودا ون نابێ، خودا ئاگای لە هەموو شتێکە، گرنگ ئەوەیە کە ئێوە نیازتان پاك بێو ئەو ماڵەی دەیبەخشن حەڵاڵ بێو بەچاوەو ڕواڵەتو منەت کردن پاداشی باشی خۆتان پووچ نەکەنەوە.**

٥٤٤/١[١٣١]- وعَن ابنِ مسعودٍ (رضي اللّه عنه)، عن النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال : (لا حَسَدَ إلاَّ في اثنتين: رَجُلٌ آتاهُ اللّه مَالاً، فَسَلَّطَه عَلَى هَلَكَتِهِ في الحَقّ، وَرَجُلٌ آتاه اللّه حِكْمَةً، فَهُوَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُها) متفقٌ عليه.

**ئیبنو مەسعوود** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: حەسوودیو بەخیلی بەکەس دروست نیە بەم دوو کەسە نەبێ:**

**یەك: بەپیاوێ خودا ماڵی ڕەحمەتی بداتێو خۆشی دەستی تێ بچێ لەڕێگەی ڕاستدا داغانی بکا.**

**دوو: بەپیاوێ کە خودا دانایيو پەندیاریيو زانستی بەسوودی پێ بدا، جا هەم خۆی ڕەفتاری پێ بکاو هەم لە نێوانی خەڵکا حوکمی پێ بکا هەم فێری خەڵکی تریشی بکا، بەتایبەتی فێرخوازانی (ش) مەبەست لە حەسوودی و بەخیلی پێ بردن: خۆزگە پێ بردنە.**

---

**(١٣١) بوخاری (٧٣)و موسلیم (٨١٦).**

٥٤٥/٢[١٣٢]- وعَن عَدِيِّ بنِ حاتم (رضـي اللّـه عنـه)أَن رسـول اللّـه (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسلّم)قال : (اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمرةٍ) متفقٌ عليه.

**ديسـان فـەرمووى: حـەزرەت** (دروودى خـواى لەسـەر بـێ) **فـە رمـووى : كامتـان مـاڵى ميراتبەرەكەى لەماڵى خۆى خۆشتر ئەوێت؟ عەرزيان كرد: قوربان هەموومان ماڵى خۆمانمان لە ماڵى ميراتبەرەكەمان خۆشتر دەوێ، فەرمووى** (دروودى خواى لەسەر بێ): **دەبـزانن ماڵى ئادەميزاد كە بەكەڵكى هەردوو جيهانى بێ ئەو ماڵەيەتى كەلەپێش خۆيـەوە رەتى دەكا و رەوانەى دەكا بۆ ئـەو دنيـا، مـاڵى ميراتبەرەكەيشى ئـەو ماڵەيـە كەبـە (هەزار چنگەكرێ) هەر كۆى دەكاتەوە تـا لـەپڕ دەمـرێ و ماڵەكەى لـەدواى بـەجێ دەمێنێ و دەبێ بەهى ميراتگر (ب).**

٥٤٦/٣[١٣٣]— **لەباسـى** (كثـرة طـرق الخـير)**دا رابـورد، باسـى/١٣، فـەرموودەى/٢٤. بڕوانە (٣٩/٢٣ز - ١٣).**

٥٤٧/٤[١٣٤]— وعن جابر (رضي اللّه عنه)قال : ما سُئِل رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)شَيئاً قَطُّ فقالَ : لا. متفقٌ عليه

**جابير ( ڕەزاى خواى لێ بێ) فەرمووى: هەرگيز نەبووە كە شتێ لـە پێغەمبـەر** (دروودى خواى لەسەر بێ)**) داوا بكرێ و بلێ: نا! (ش).**

٥٤٨/٥[١٣٥]- **لەباسى** (النفقه على العيال)**دا رابورد.**

٥٤٩/٦[١٣٦]— وعنه أَن رسولَ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قـال : (قال اللّه تعالى : أَنفِق يا ابْنَ آدمَ يُنْفَقْ عَلَيْكَ) متفقٌ عليه.

**ئـەبوهورەيرە** (رەزاى خـوداى لێ بـێ) **فـەرمووى: حـەزرەت** (دروودى خـواى لەسـەر بـێ) **فـەرمووى: خوداى گەورە لەفەرمودەيەكى قودسيدا (فەرمايشتێكى پيرۆز)دا دەفـەرموێ: ئـەى**

[١٣٢] بوخارى (٦٤٤٢).

[١٣٣] بوخارى (٦٠٢٣)و موسليم (١٠١٦).

[١٣٤] بوخارى (٦٠٣٤)و موسليم (٢٣١١).

[١٣٥] بڕوانە: (٢٩٥/٧ز ٣٦).

[١٣٦] بوخارى (٥٣٥٢)و موسليم (٣٩٣).

ئادەمیزاد! دەستت بەخێرکردن نەترسێ، تا تۆ بۆ ڕەزای خودا ماڵ بەخت بکەی خودایش ڕزق و ڕۆژی تۆ گوشاد دەکا و زیاتر ماڵی ڕەحمەت دەڕێژێ بەسەرتا (ش).

٥٥٠/٧[١٣٧]– وعنْ عبد اللّهِ بن عَمْرو بن العَاصِ رضي اللّه عنهُما أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): أَيُّ الإسلامِ خَيْرٌ ؟ قال : (تُطْعِمْ الطَّعَامَ، وَتَقْرَأُ السَّلامَ عَلى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لم تَعْرِفْ) متفقٌ عليه.

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێت)فەرمووی: پیاوێ لە حەزرەتی پرسی: کام شت لە ئیسلامەتیدا زۆر خێرە؟ فەرمووی: ئەو ڕەوشتەی کەنانبدەبی، وە سڵاویش لەهەموو کەسێ بکەی، بی ناسیتو نەیناسیت (ش).

٥٥١/٨[١٣٨]– لەباسی (كثرة طرق الخير)دا رابورد، فەرموودەی (أربعون خصله). بڕوانە (٢٢/ ١٣٨ز – ١٣).

٥٥٢/٩[١٣٩]– (فضل الجوع وخشونة العيش)دا رابورد= ز- ٥٦ف – ٢٠. بڕوانە (٢٠/ ٥١٠ز- ٥٦).

٥٥٣/١٠[١٤٠]- وعن أَنسٍ (رضي اللّه عنه)قال : ما سُئِلَ رسُولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)عَلَى الإسْلام شَيئاً إِلّا أَعْطاه، وَلَقَدَ جاءَه رَجُلٌ فَأَعطاه غَنماً بَينَ جبَلَين، فَرجَعَ إلى قَومِهِ فَقَالَ : يَا قَوْمِ أَسْلِمُوا فَإِنَّ مُحَمداً يُعْطِي عَطَاءَ مَنْ لا يَخْشَى الفقْرَ، وَإِنْ كَانَ الرَّجُلُ لَيُسلِمُ مَا يُرِيدُ إِلاَّ الدُّنْيَا، فَمَا يَلْبَثُ إِلاَّ يَسِيراً حَتَّى يَكُونَ الإسْلامُ أَحبَّ إِلَيه منَ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا. رواه مسلم.

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموی: بە خاتری ئیسلام هەرچیان لەحەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ)داوا دەکرد دەیدا، جارێ پیاوێ هاتە خزمەتی رانیکی زۆری دایێ، پڕبەبەینی دوو کێو دەبوو، کابرا کە گەڕایەوە بۆ ناو هۆزی خۆی گوتی: خزمینە! تازووە ئیسلام ببن و سامانێکی باش بۆ خۆتان پێکەوە بنێن، بەڕاستی موحەممەد بەشێوەیەکی وا دەسەنە دەدا، وەك بڵێی پشتی بەخودای خۆی ئەستوور بێ و

---

[١٣٧] بوخاری (١٢)و موسلیم (٣٩).

[١٣٨] بڕوانە: (٢٠/٥١٠ز-٥٦).

[١٣٩] موسلیم (١٠٣٦).

[١٤٠] موسلیم (٢٣١١).

لەهەژاری نەترسێ! هەر لەم ڕوانگەیەوە بوو کە بازێ کەس کە ئیسلام دەبوون مەبەستیان ڕۆشن دەبۆوە بەرە بەرە وای لێ دەهات ئایینی ئیسلام لەدونیا و هەموو سامانی دنیا پێ خۆشتر بوو (م).

٥٥٤/١١[١٤١]- وعن عُمَرَ (رضي اللّه عنه)قال : قَسَمَ رسولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَسْماً، فَقُلتُ : يا رسولَ اللّه لَغَيْرُ هَؤُلاَءِ كَانُوا أَحَقَّ بِهِ مِنْهُم ؟ قال : (إِنَّهُمْ خَيَّرُوني أَن يَسأَلُوني بالْفُحشِ فَأُعْطِيَهم أَوْ يُبَخِّلُوني، وَلَستُ بِبَاخِلٍ) رواه مسلم.

عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) ماڵێکی دابەش کرد، عەرزیم کرد: قوربان! بەخودا لەمانە لەپێشتر هەبوون بۆ ئەم سامانە! فەرمووی: ڕاستیەکەی ئەمانە بەزۆرە خەریی خۆیان ناچاریان کردم: کەیا دەبێ بەشیان بدەم یا دەبێ چووك و بەخیل دەربچم، ڕژدی و چرووکی لەمنەوە دوورە کەواتە ناچار بەشم پێدان! (م).

٥٥٥/١٢[١٤٢]— وعن جُبَيْرِ بنِ مُطعِمٍ (رضي اللّه عنه)أنه قال : بَيْنَمَا هُوَ يسِيرُ مَعَ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)مَقْفَلَهُ مِن حُنَيْنٍ، فَعَلِقَهُ الأَعْرَابُ يسأَلُونَهُ، حَتَّى اضْطَرُّوهُ إلى سَمُرَةٍ فَخَطَفَتْ رِدَاءَهُ، فَوَقَفَ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فقال : أَعْطُوني رِدَائِي، فَلَوْ كَانَ لي عَدَدُ هذِهِ العِضَاهِ نَعَماً، لَقَسَمْتُهُ بَيْنَكُمْ، ثم لا تَجِدُوني بَخِيلاً وَلا كَذَّاباً وَلا جَبَاناً) رواه البخاري.

جوبەیری کوڕی موطیعم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی حەزرەتدا (درروودی خوای لەسەر بێ) بووم لەغەزای حونەین دەگەڕایەوە، عەرەبە بەدوەکان تێی ئاڵان داوای دەسەنە و بەشیان لێ دەکرد، تەنگیان پێ هەڵچنی و ئاڵاندیانە بنجێ دڕکەزی، عاباکەی ئاڵا لە بنکە دڕکەزییەکەوە، ئەوجا وەستاو فەرمووی (درروودی خوای لەسەر بێ): عاباکەمم بدەنەوە، ئەگەر بە قەد ژمارەی ئەم دڕکەزیانە ئاژەڵم و بوایە هەمووم دابەش ئەکرد بەسەرتانا، قەت بەرژدی و چرووکی و درۆزنی و ترسنۆکی من نابینن (ب).

---

[١٤١] موسلیم (١٠٥٦).

[١٤٢] بوخاری (٣١٤٨).

٥٥٦/١٣[١٤٣]- وعن أبي هُريرة (رضي اللّٰه عنه)أنّ رسولَ اللّٰه (صلّى الله عليه وسلّم)قال : (مَا نَقصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ، وَمَا زَادَ اللّٰهُ عَبْداً بعَفْوٍ إلاَّ عِزّاً، وَمَا تواضع أحدٌ للّٰهِ إلاّ رَفَعَهُ اللّٰهُ عَزَّ وجلَّ) رواه مسلم.

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوداى لێ بێ) **لەحەزرەتەوە دەفەرمێ** (دروودى خواى لەسەر بێ) **ماڵ بەبەخشین و خێرکردن کەم ناکا، بەندەی خوداش - بەچاوپۆشی و لێبوردن- خودا زیاتر پایەی بەرز دەکا، ئەو کەسەیشی لەبەرخودا خاکی و بێ هەوا بێ و خۆی بەکەم بگرێ مسۆگەر کە خودا پایەبەرزتری دەکا! (م).**

٥٥٧/١٤[١٤٤]- وعن أبي كَبشَةَ عُمرو بنَ سَعدِ الأَنماريِّ (رضي اللّٰه عنه)أنه سمع رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلّم)يقولُ : (ثلاثَةٌ أُقْسِمُ عَلَيهنَّ وَأُحَدِّثُكم حَديثاً فاحْفَظُوهُ : مَا نَقَصَ مَالُ عَبدٍ مِن صَدَقَةٍ، وَلا ظُلِمَ عَبْدٌ مَظْلَمَةً صَبَرَ عَلَيها إلاَّ زَادَهُ اللّٰهُ عِزّاً، وَلا فَتح عَبْدٌ باب مَسأَلَةٍ إلاَّ فَتحَ اللّٰه عَلَيْهِ باب فقْرٍ، أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا. وَأُحَدِّثُكم حَديثاً فاحْفَظُوهُ. قال إنَّمَا الدُّنْيا لأَرْبَعَةِ نَفَرٍ:

عَبدٍ رَزَقَه اللّٰه مَالاً وَعِلْماً، فَهُو يَتَّقي فِيهِ رَبَّهُ، وَيَصِلُ فِيهِ رَحِمَهُ، وَيَعْلَمُ للّٰهِ فِيه حقا فهذَا بأفضَل المَنازل.

وَعَبْدٍ رَزَقَهُ اللّٰه عِلْماً، وَلَمْ يَرْزُقهُ مَالاً فَهُوَ صَادِقُ النِّيَّةِ يَقُولُ : لَو أَنَّ لي مَالاً لعملْتُ بِعَمَل فُلان، فَهُوَ نِيَّتُهُ، فَأَجْرُهُمَا سَوَاءٌ.

وَعَبْدٍ رَزَقَهُ اللّٰهُ مَالاً، وَلَمْ يرزُقْهُ عِلماً، فَهُوَ يَخبِطُ في مالِهِ بغَير عِلمٍ، لا يَتَّقي فِيهِ رَبَّهُ وَلا يَصِلُ رَحِمَهُ، وَلا يَعلَمُ للّٰهِ فِيهِ حَقا، فَهَذَا بِأَخْبَثِ المَنَازل.

وَعَبْدٍ لَمْ يرزُقْهُ اللّٰه مَالاً وَلا عِلْماً، فَهُوَ يَقُولُ : لَوْ أَنَّ لي مَالاً لَعَمِلْتُ فِيهِ بعمَل فُلانٍ، فَهُوَ نِيَّتُهُ، فوِزْرُهُمَا سَوَاءٌ) رواه الترمذي وقال : حديث حسن صحيح.

**ئەبو کەبشەی ئەنصاریی** (ڕەزای خوداى لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر دەفەرموێ** (درووودی خوای لەسەر بێ)**: سوێند لەسەر ئەم سێ شتە دەخۆم، ئێوەش ئەم قسەیەی کەلەم بارەیەوە بۆتانی دەکەم لەبەری بکەن: یەکەم: ماڵی بەندە بەخێرکردن کەم ناکات. دووەم: هەرکەسێ یەکێ زۆر و ستەمی لێ بکا و ئەویش سەبر و ئارام بگرێ لەبەر باری**

[١٤٣] موسلیم (٢٥٨٨).

[١٤٤] تیرمیذي (٢٣٢٦).

خـودادا، خـودا سـەربەرزی دیـن و دونیـای دەکـا، سێیەم: هەرکەسێ دەرگـای سـواڵ لەخۆی بکاتەوە خودا دەرگای هەژاریی بـۆ دەکاتـەوە! یـا حـەزرەت (درووودی خـوای لەسەر بێ) قسـەیەکی ئـاوای فـەرموو، فەرمووشـی: گـوێ بگـرن قسـەیەکی تریشـتان بـۆ دەکـەم ئەویش لەبەر بکەن جا فـەرمووی: جیهـان بـۆ ئـەم چـوار کەسـەیە: یەکـەم کەسـێ خودا ماڵی ڕەحمەت و عیلم و زانستی بەپیت و بەبەرەکەتی پێ بەخشیبێ، ئەویش تـەقوای خودایـان پـێ بکـا و، سـیلەی ڕەحمیـان پـێ بـەجێ بێنـێ و مـاف و هـەقی خودایان لێ بـدا، ئەمـە گـەورەترین پایـەی هەیـە، دووەم: کەسـێ خـودا زانستی پـێ ببەخشێ بـەڵام مـاڵ و دارایـی نـەداتێ ئـەویش بـەنیازێکی پـاك بڵـێ: خۆزگـە مـاڵم دەبـوو منـیش وەك فیسـارەکەس خێـر و خێـراتم پـێ دەکـرد، ئەمـە بـەهۆی نیـازی پاکیەوە لەگەڵ کەسی یەکەمدا لەپاداشتدا چوونیەکن، سێیەم: کەسـێ خـودا مـاڵی پێ بدا، بەڵام عیلمو زانستی پێ نەدا، جا بۆ خۆی بەنادانی چەپو گووپی تیا بکاو تەقوای خودای پێ نەکاو مافی خزمو خوێشی لێ نـەداو، سـیلەی ڕەحمـی پـێ بـەجێ نـەهێنێ و مافی خودای لێ نەدا، ئا ئەمە پیسـترین پایـەی هەیـە، چـوارەم: بەنـدەیێ، خودا نەماڵ و نە زانستی پێ نـەدابێ، کەچـی بـۆ نەگبـەتی بڵـێ: بریـا مـاڵم دەبـوو منیش وەك فیسارەکەس بەنەفامیی خـەرجم دەکـرد، جـا ئـەم نەگبـەتـە – بـەهۆی نیـازی پیسـیەوە – لەتۆڵـەی تاوانـا، لەگـەڵ کەسـی سـێیەمدا چـوون یـەکن! (ت: ح/ح/ص).

٥٥٨/١٥[١٤٥]- وعن عائشة رضي اللّٰه عنها أَنَّهُمْ ذَبَحُوا شَاةً، فقالَ النَّبِـيّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (مَا بَقِيَ مِنها؟) قالت : ما بقي مِنها إِلاَّ كَتِفُهَا، قال : (بَقِي كُلُّهَا غَيرَ كَتِفِهَا) رواه الترمذي وقال حديث صحيح.

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ مەڕێکمان سەر بـڕی بـوو پێغەمبـەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هیچی لێ ماوە؟ گوتم: بەس شانێکی ماوە، فەرمووی: (هـەمووی ماوە ئەو شانەی نەبێ) (ت: ح/ح/ص).

٥٥٩/١٦[١٤٦]- وعن أَسماءَ بنتِ أبي بكرِ الصديق رضـي اللّٰـه عنهمـا قالـت : قـال لـي رسولُ اللّٰه (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (لا تُوكِي فَيوكِيَ اللّٰهُ عَلَيْكِ). وفي روايـةٍ (أَنفِقِـي أَو

---

[١٤٥] تیرمیذي (٢٤٧٢).

أَنْفَحِي أَو أَنْضِحِي، وَلا تُحْصي فَيُحْصِيَ اللّٰه عَلَيكِ، وَلا تُوعِي فيوعِيَ اللّٰهُ عَلَيْكِ) متفقٌ عليه.

**ئەسمای کچی ئەبوبەکری صەدیق** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **پێی فەرمووم: خێر بکەو بیبەخشەرەوە، مەیکەرە کیسەو توورەکەو پریاسکەوەو، دەرگاکەی بە دەمبێن مەبەستەو، پارەوپووڵی زۆر بەبێ سوودێکی رەوا کەڵەکە مەکە، ئەگینا خودایش لەتۆی دەگرێتەوە! (ش).**

٥٦٠/١٧[١٤٧]- وعن أبي هريرة (رضي اللّٰه عنه)أنه سَمِع رسولَ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يَقُولُ : (مَثَلُ البَخِيلِ والمُنْفِقِ، كَمَثَلِ رَجُلَيْنِ عَلَيْهِمَا جُبَّتَانِ مِن حَديد مِنْ ثُدِيِّهما إلى تَرَاقِيهمَا، فَأَمَّا المُنْفِقُ، فَلا يُنْفِقُ إلاّ سَبَغَتْ، أَوْ وَفَرَتْ على جِلدِهِ حتى تُخْفِيَ بَنَانَهُ، وتَعْفُوَ أَثَرَهُ، وَأَمَّا البَخِيلُ، فَلا يُرِيدُ أَنْ يُنْفِقَ شَيْئاً إلاّ لَزِقَتْ كُلُّ حَلْقَةٍ مَكَانَها، فَهُو يُوَسِّعُها فَلا تَتَّسِعُ) متفقٌ عليه.

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: ژنەوتم لە حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: پیاوی رەزیل‌و پیاوی بەخشندە (سەخی) مانەندی دوو پیاو وان، کەیەکی سەرو زریەی ئاسنینی تەسکیان لەبەر دابێ، لە مەمکیانەوە بێ تا ددانەی سنگیان، جا جار لەگەڵ جاردا کە بەخشندەکە شتێ دەبەخشێ زرێیەکەی کشی دێ‌و گوشادو گەورە دەبێ تا وای لێ دێ لەبەر پێی دەخشێ (وەك چۆن جلی شۆڕ شوێن پێ کوێر دەکاتەوە خێرو خێرات‌و بەخشندەییش ئاوا گوناهو تاوانی خاوەنەکەی دادەپۆشێ)! بەڵام پیاوی رەزیل‌و چرووك هەرکاتێ ویستی خێرێ بکا، یان شتێ ببەخشێ، ئەڵقەی زریەکەی دێتەوە یەك‌و زیاتر قوڵفەکانی تەسك دەبنەوە، هەتا بەرەبەرە هەردوو دەستی شەتەك دەدرێن بە بەربینیەوە! فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: جا رەزیلەکە هەر هەوڵ‌و تەقەلا دەدات کە کشی بێنێ بەڵام ناتوانێ! (ش/تاج).**

---

[١٤٦] بوخاری (١٤٣٣)و موسلیم (١٠٢٩).

[١٤٧] بوخاری (١٤٤٣)و موسلیم (١٠٢١).

٥٦١/١٨[١٤٨]- وعنه قال : قال رسولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (مَنْ تَصَدَّقَ بِعدْلِ تَمْرَةٍ مِنْ كَسْبٍ طَيِّبٍ، ولا يَقْبَلُ اللّٰهُ إلاّ الطَّيِّبَ فَإنَّ اللّٰه يقْبَلُهَا بِيَمِينِهِ، ثُمَّ يُرَبِّيهَا لِصَاحِبِها، كَمَا يُرَبِّي أَحَدُكُمْ فَلُوَّهُ حتى تَكُونَ مِثْلَ الجَبَلِ). متفقٌ عليه:

**دیسان فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **ئەوەی خێرێ بکا لە حەلاڵ — چونکە هەرچی حەلاڵ نەبێ خودا وەری ناگرێ — ئەوەی خێرێ بکا لە حەلاڵ خودای میهرەبان بەدەستی راستی خۆی وەری دەگرێ، با دەنکە خورمایەکیش بێ، جا ئەو خێرە لەناو لەپی پەروەردگاری میهرەبانا نەشو نماو گەشە دەکا، وەك چۆن یەکێ لەئێوە جوانوو ماینێ یان پارێنە وشترێ بۆ خۆی پەروەردە بکا، خودایش ئەو خێرە ئاوا پەروەردە دەکا، گریمان ئەگەر دەنکە خورمایێ بێ بەقەد کێوێ گەورە دەبێ (ش/تاج).**

٥٦٢/١٩[١٤٩]- وعنه عن النَّبيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال : بيْنَما رَجُلٌ يَمشِي بِفَلاةٍ مِن الأَرض، فَسَمِعَ صَوتاً فِي سَحَابَةٍ : اسقِ حَدِيقَةَ فُلان، فَتَنَحَّى ذلكَ السَّحَابُ فَأَفْرَغَ مَاءَهُ في حَرَّةٍ، فإذا شرجة من تِلْكَ الشِّراجِ قَدِ اسْتَوعَبَتْ ذَلِكَ الماءَ كُلَّهُ فَتَتَبَّعَ الماءَ، فإذا رَجُلٌ قَائِمٌ فِي حَدِيقَتِهِ يُحَوِّلُ المَاءَ بمِسحَاتِهِ، فقالَ له : يا عَبْدَ اللّٰهِ ما اسْمُكَ قال : فُلانٌ، للاسْمِ الَّذِي سَمِعَ فِي السَّحَابَةِ، فقالَ له : يَا عَبْدَ اللّٰهِ لِمَ تَسْأَلُنِي عَن اسْمِي ؟ فَقَال : إني سَمِعْتُ صَوتاً فِي السَّحَابِ الذي هذَا مَاؤُهُ يقُولُ : اسقِ حَدِيقَةَ فُلان لإسمِكَ، فما تَصْنَعُ فِيهَا ؟ فقال : أما إذْ قُلْتَ هَذَا، فَإني أَنْظُرُ إلى ما يَخْرُجُ مِنها، فَأَتَصَدَّقُ بثُلُثِه، وآكُلُ أَنا وعِيالي ثُلُثاً، وأردُّ فِيها ثُلثَهُ. رواه مسلم.

**دیسان فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: جارێ پیاوێ لە بیابانێکەوە، دەڕۆیشت، گوێی لە دەنگێ بوو، لەناو پەڵەیێ هەوردا، بە هەورەکەی دەفەرموو: باخەکەی فیسارەکەس ئاو بدە، ئیتر هەورەکە دەسبەجێ لەلایەکەوە کۆبووەوەو هەرچی ئاوێکی تیا بوو هەڵی رژاندە ناو تاوێرەڵانێکەوە لەولاشەوە ئاوەڕۆگەیێ، کە لەناو چەند ئاوەڕۆگەیەکی تردا بوو، ئەو بارانـاوەی هەموو گرتە خۆی و بردی، ئەویش شوێنی کەوت ڕوانی وا پیاوێ، لەباخەکەیا بە بێڵێکەوە وەستاوە، لەم دێراوەوە بۆ ئەو دێراو ئاوەکە دەگوێزێتەوە بە بێڵەکەی، پێی گوت: ئەی بەندەی خودا! ناوت چییە؟ گوتی: ناوم ئەوەیە، ڕێك ئەو ناوەی گوت کە لەناو**

---

[١٤٨] بوخاری (١٤١٠)و موسلیم (١٠١٤).

[١٤٩] موسلیم (٢٩٨٤).

هەورەکەوە بیستی، گوتی: ئەی بەندەی خودا! تۆ بۆ لەناوی من دەپرسی؟ گوتی: دەنگێکم بیست لەناو پەڵەیێ هەوردا، کە ئەمە ئاوەکەیەتی تۆ ئەم باخەیەی پێ ئاو دەدەی دەیفەرمووە: ئەی هەور! باخەکەی فیسارەکەس ئاو بدە، کە ئەم ناوەش ناوی تۆیە، ئەوە بەری ئەم باخە چی لێ دەکەی کە لە خوداوە ئاوا چاودێری دەکرێ؟ فەرمووی: مادەم وات گوت ئەوا منیش بۆت روون دەکەمەوە بەرهەمی ئەم باخە دەکەم بە سێ بەشەوە: سێ یەکێکی دەکەم بە خێر، خۆم و خێزانەکەیشم سێ یەکێکی دەخۆین و ئەو سێ یەکەکەی تریشی دەچێنمەوە بە خۆیەوە! (م).

**٦١ – باسی جڵەوگیری لە رژدیی و چرووکی - باب النهي عن البخل والشح**

قال الله تعالى: { وأما من بخل واستغنى، وكذب بالحسنى، فسنيسره للعسرى، وما يغني عنه ماله إذا تردى }.

واتە: بەڵام ئەو کەسەی کە رژدو بێ ئەمەك بێ و گوێ بە فەرمانی خودا نەداو، بگرە خۆی بە بێ نیاز بزانێ لەخوداو، باوەڕ بە پلەی باش نەکا، کە بریتیە لە هەموو شتێکی هەق و راست و دروست، وەك وشەی (لا إله إلا الله) و ئایینی ئیسلام، ئەوە ئێمەیش ئامادەی دەکەین بۆ ئەنجامی خراپ، کاتێکیش کە پاشووی دادەچێ، سەری تیا دەچێ و ماڵ و دارایی بەدەردی هیچی ناخوات.

وقال تعالى: { ومن يوق شح نفسه فأولئك هم المفلحون }.

واتە: هەر کەسێ، بە تەوفیقی خودا خۆی بپارێزێ لە چاوچنۆکی و بەرچاوتەنگی و، بەرچاوی تێر بێ و لەپێناوی جیهان و خۆشی ژیانی جیهانا خودا لەخۆی نەڕەنجێنێ و ئەرکی ماڵی و جەستەیی خۆی بەجێ بێنێ، بەڕاستی ئەم جۆرە مەردە خودا پێداوانە سەربەرز و سەرفرازی هەردوو ژیانن، لە هەدوو جیهانا، فەرموودەیەکی زۆر لە بابەتی ئەم باسە لە پێشەوە رابوورد، بەتایبەتی لەباسی پێش ئەم باسەدا.

وأما الأحاديث فتقدمت جملة منها في الباب السابق.

٥٦٣/١[١٥٠]- بڕوانە ژمارە: (١/٢٠٣ز – ٢٦).

---

[١٥٠] بڕوانە ژمارە: (١/٢٠٣ز - ٢٦).

## ٦٢ - باسی نەدارا پەروەردەیی (ئیثار)وەدەستگیرۆدەیی (مواسات)
## باب الايثار والمواساة

قال اللّٰه تعالى: { ويؤثرون على أنفسهم ولو كان بهم خصاصة }.

واتە: بۆ ئەو موسوڵمانە یاریدەدەرانەیشە لە پێش کۆچ و ڕەوی کۆچکەرانا بۆ شاری مەدینە، ئەوان ماڵ و حاڵی خۆیان هەبوو، لەناو خانە و لانەی خۆیانا دامەزرابوون و، ئەمانیش کە پێیان دەگوترێ ئەنصار، بەر لە هاتنی ئەوان، کە پێیان دەگوترێ: موهاجیر، هۆگری ئیمان و ئیسلامەتی و باوەڕ بوون بوون وەك ئەوان بۆیەکا کاتێك خەڵکی مەککە و کەسانی تر کۆچیان کرد بۆ لایان ئەوان زۆر بە گەرم و گوڕی و گەلێ بەسۆز و شەوق و خۆشەویستی و خۆشییەوە بەخێرهاتن و پێشوازیان لێ کردن و، بەسەر و بەماڵ تێ دەکۆشین بۆ خۆشی و کامەرانی ئەوان زیاتر لەخۆیان هەرچی خێر و خۆشیەکی دین و دونیایان دەست کەوێ پێیان خۆشە و بەخیلی و حەسوودی و ڕژدیان پێ نابەن، با خۆشیان نەداراو کەم دەست بن لەگەڵ ئەوەشا هەموو یاریدە و دەستگیرۆیێ داماوان و لێقەوماوان وە پێش خۆیان دەخەن! بەڕاستی سەربەرز و سەرفراز کەسێکە کەلە بەندی کۆت و زنجیری ڕژدی و چرووکی دەروونی خۆی ڕزگاری ببێ!

وقال تعالى: { ويطعمون الطعام على حبه مسكيناً ويتيماً وأسيراً } إلى آخر الآيات.

واتە: ڕەوشتێکی پەسەندی تری ئەو بەندە خودا پێداوانە ئەوەیە لەبەر ڕەزای خودا، نان و ئاو دەدەن بە هەژاران و هەتیوان و لێقەوماوان.

١/٥٦٤[151] -وعن أبي هُريرة (رضي اللّٰه عنه)قال : جَاءَ رَجُلٌ إلى النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فقال : إني مَجْهُودٌ، فأَرسَلَ إلى بَعضِ نِسائِهِ، فَقَالت : والَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ ما عِندِي إلاَّ ماءٌ، ثُمَّ أَرْسَلَ إلى أُخْرَى. فَقَالَتْ مِثْلَ ذَلِكَ، حتَّى قُلْنَ كُلُّهنَّ مِثل ذَلِكَ : لا وَالَّذِي بعثَكَ بِالحَقِّ ما عِندِي إلاَّ ماءٌ. فقال النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (من يُضِيفُ هَذا اللَّيْلَةَ ؟) فقال رَجُلٌ مِن الأَنْصارِ : أَنَا يَا رَسُولَ اللّٰهِ، فَانْطَلَقَ بِهِ إلى رحْلِهِ، فَقَال لامْرَأَتِهِ : أَكرِمِي : ضَيْفَ رسولِ اللّٰهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم.

وفي رواية قال لامرأَتِهِ : هل عِنْدَكِ شَيءٌ ؟ فَقَالَتْ : لا، إلاَّ قُوتَ صِبيانِي قَال : عَلِّليهمْ بِشَيءٍ وإذا أَرَادُوا العَشَاءَ، فَنَوِّميهِم، وإِذا دَخَلَ ضَيْفُنَا، فَأَطفِئي السِّرَاجَ، وأَرِيهِ أَنَّا

---

[151] بوخاری (٣٧٩٨)و موسلیم (٢٠٥٤).

نأْكُلُ، فَقَعَدُوا وأَكَلَ الضَّيفُ وبَاتا طَاوِيَيْن، فَلَمَّا أَصْبح، غَدَا على النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم): فقال: (لَقَد عَجِبَ اللّٰه مِن صَنِيعِكُمَا بِضَيفِكُمَا اللَّيْلَةَ) متفقٌ عليه.

ئەبو هورەیرە (خۆشنوودی خودای گەورەی لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لە برسانا لاکەی سەرم دێ، ئەویش یەکە یەکە ناردی بۆ خواردن بۆ لای هاوسەرەکانی، بەڵام یەك بەیەك فەرموویان: بەو کەسە کە تۆی کردووە بە رابەری راستو دروست، ئاو نەبێ هیچی ترمان لەلا دەست ناکەوێ، ئەوجا فەرمووی: ئای بۆ پیاوێ ئەم شەو ئەم کابرایە بکا بەمیوانی خۆی، رەحمەتی خودای لێ بێ، جا پیاوێ لە یاریدەدەران (ئەنصار) هەڵسا گوتی: قوربان! من میوانداری دەکەم، ئیتر کابرای بردەوەو لەماڵەوە بەژنەکەی خۆی گوت: ژنەکە! ئەمە میوانی پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر با) رێزی بگرە، ژنەکەی گوتی: بەخودا بەس خۆراکی منداڵەکان گومان دەبەم، گوتی: بەشتێ بیان خەڵەفێنە، کاتێك منداڵەکان داوای شێویان کرد، بیانخەوێنە کە نانەکەت بۆ ئێمە دانا خۆشت وەرە، بەبیانووی چرا چاککردنەوە، چراکە بکوژێنەوە، وای نیشان دەدەین لەگەڵ ئەودا دەخۆین (دەست دەبەین بۆ نانەکەو دەیبەین بۆ دەمانو بەدرۆ دەم دەجوڵێنین) ئەمشەو خۆمان بەسکی حاڵی شەو دەکەینەوە، با میوانەکەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بێ خزمەت نەبێو نانەکەی بەتێرو تەسەلی بخوا، ژنەکەیش وای کرد، خۆیان دانیشتنو میوانەکە نانەکەی خوارد، بۆ بەیانی کە پیاوەکە چووەوە بۆ خزمەت حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەڕاستی، ئەمشەو، خودای باڵادەستو شکۆدار سەیری هات لەکاری شیرینی ئێوە کە لەگەڵ میوانەکەتانا کردتان (ش).

٥٦٥/٢[١٥٢]- وعنه قالَ: قالَ رسولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (طَعَامُ الاثـنَين كـافي الثَّلاثَةِ، وطَعامُ الثَّلاثَةِ كافي الأَربَعَةِ) متفقٌ عليه.

وفي رواية لمسلمٍ (رضي اللّٰه عنه)، عن النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم)قـال: (طَعَامُ الوَاحِدِ يَكفي الاثْنَين، وطَعَامُ الاثْنَينِ يَكْفي الأربَعَةَ وطَعَامُ الأرْبعةِ يَكفي الثَّمَانِيَةَ).

[١٥٢] بوخاری (٥٣٩٢)و موسلیم (٢٠٥٨)و (٢٠٥٩).

دیسان لەوەوە، لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: نانی دوو کەس بەشی سێ کەس دەکا، وە نانی سێ کەس بەشی چوار کەس دەکا (ش)، لە گێڕانەوەیەکی موسلیمدا لە جابیرەوە، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ:نانی یەك کەس بەشی دوو کەس دەکا، وە نانی دوو کەس بەشی چوار کەس دەکا، وەنانی چوار کەس بەشی هەشت کەس دەکا.

٥٦٦/٣[١٥٣]- وعن أبي سعيدٍ الخُدريِّ (رضي اللّٰه عنه)قال : بينَمَا نَحْنُ في سَفَرٍ مَعَ النَّبيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)إذ جَاءَ رَجُلٌ علي رَاحِلَةٍ لَهُ، فَجَعَلَ يَصْرِفُ بَصَرَهُ يَمِيناً وَشِمالاً، فَقَال رسولُ اللّٰه (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (مَنْ كَانَ مَعَهُ فَضْلُ ظَهرٍ فَليَعُدْ بِهِ عَلى مَنْ لا ظَهْرَ لَهُ، وَمَن كانَ لَهُ فَضْلٌ مِن زَادٍ، فَليَعُدْ بِهِ على مَن لا زَادَ لَهُ) فَذَكَرَ مِن أَصْنَافِ المَالِ مَا ذَكَرَ حتَّى رَأَيْنا أَنَّهُ لا حَقَّ لأحدٍ مِنَّا في فَضْلٍ) رواه مسلم.

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا لە خزمەتی حەزرەتدا بووین پیاوێ بە سواری وڵاخێ هات، هەر سەیری ئەم لاو لای خۆی دەکرد، سا بەشکو کەسێ یارمەتییەکی بدا، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ وڵاخی سواری زیادەی هەیە، با بیدات بەو کەسەی کە وڵاخی نیە، هەرکەسیش توێشەی زیادەی هەیە با بیدات بەو کەسەی کە توێشەی نیە، ئیتر حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) باسی زیادەماڵی زۆری کرد، لەهەموو جۆرێ، تەنانەت هاتینە سەر ئەو باوەڕە کە کەسمان مافمان لەماڵی زیادەدا نیە (م).

٥٦٧/٤[١٥٤]- وعن سَهلِ بنِ سعدٍ (رضي اللّٰه عنه)أنَّ امرَأَةً جَاءَت إلى رسول اللّٰه (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)بِبُردةٍ مَنسُوجَةٍ، فقالت : نَسَجتُها بِيَديَّ لأكْسُوكَهَا، فَأَخَذَهَا النَّبيّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)مُحتَاجاً إليها، فَخرَجَ إلَينا وَإنَّهَا إزارُهُ، فقال فُلانٌ اكسُنِيهَا مَا أَحسَنَها، فَقَال: (نَعَمْ) فَجلَس النَّبيّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)في المجلِس، ثُمَّ رَجَعَ فَطَواهَا، ثُمَّ أَرسَلَ بِهَا إليْهِ : فَقَالَ لَهُ القَوْمُ : ما أَحسَنْتَ، لَبِسَهَا النَّبيّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)مُحْتَاجاً إليها، ثُمَّ سَأَلتَهُ، وَعَلِمت أَنَّهُ لا يَرُدُّ سَائِلاً، فَقَالَ : إني وَاللّٰهِ ما سَأَلْتُهُ لأَلْبَسَها، إِنَّمَا سَأَلْتُهُ لِتَكُونَ كَفَني. قال سَهْلٌ : فَكانت كَفَنَهُ. رواه البخاري.

---

[١٥٣] موسلیم (١٧٢٨).

[١٥٤] بوخاری (١٢٧٧).

سەهل (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئافرەتێ پارچەیە شاڵی هێناو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم پارچە شاڵەم بەدەستی خۆم چنیوەو، بۆم هێناوی، هەتا بۆخۆت لەبەری بکەی، پێغەمبەریش لێی وەرگرت، پێویستیشی بەشاڵەکە هەبوو، رۆژێ ئەو شاڵەی کردبوو بە دەرپێ‌و تەشریفی هات بۆ ناومان، جا پیاوێ لە پیاوگەل دەستی دا لە قوماشەکەی‌و گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم شاڵەم بدەرێ تا لە لەبەری بکەم، فەرمووی: (باشە) جا چەند حەزی خودای لەسەر بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەوەندە لەناو کۆڕەکەدا مایەوە، لە پاشان گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، لەوێ شاڵەکەی پێچایەوەو ناردی بۆی، خزمانیش پێیان گوت: جوان نەبوو، کە داوای ئەو شاڵەت لێ کرد، ئەو خۆی ئاتاجی پێی هەبوو، ئەوەبوو لەبەری کردبوو، تۆ خۆت دەزانیت کە ئەو داواکار نائومێد ناکا، کەوابوو نەدەبوو داوات بکردایە، ئەویش گوتی: بەخودا بۆ ئەوەم داوا نەکردووە کە لەبەری بکەم وە ئێوە دەزانن، بەڵام بۆ ئەوە داوایم کردووە کە ئەو رۆژەی دەمرم ببێ بەکفنم. سەهل فەرمووی: وەبوو بە کفنی‌و ئاواتەکەی هاتە دی! (ب/تاج).

٥٦٨/٥[١٥٥]- وعن أبي موسى (رضي اللّٰه عنه)قال : قال رسولُ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (إنَّ الأشعَرِيين إذَا أَرملُوا في الْغَزْوِ، أَو قَلَّ طَعَامُ عِيَالِهم بالَمدِينَةِ، جَمعُوا ما كَانَ عِندَهُم في ثَوبٍ وَاحدٍ، ثُمَّ اقتَسَمُوهُ بَيْنَهُم في إِنَاءٍ وَاحِدٍ بالسَّوِيَّةِ فَهُم مِنِّي وَأَنَا مِنهُم) متفقٌ عليه.

ئەبو مووسای ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هۆزی ئەشعەرییەکان مەردایییەکیان هەیە، ئەگەر لە غەزادا توێشوویان هاتە کزی، یاخود لەناو شاردا نان‌و خۆراکی خێزانیان هاتە کەمی دێن ئەوەی ماوە لەکنیان هەموو لە دەفرا کۆ دەکەنەوە، ئەوجا بە قاپێ، بەحاجەتێ لە بەینی خۆیانا وەك یەك، یەکسان، بەشی دەکەن، ئەوان لە منن‌و من لەوانم (ش).

## ٦٣ - باسی گەلەهەرەوەز لە کاروباری دوارۆژدا کۆ کردنەوەی ئەو شتانەی کە پیرۆزو موفەڕکن - باب التنافس في أمور الآخرة والاستكثار مما يُتبرَكُ فيه

قال اللّٰه تعالى: { وفي ذلك فليتنافس المتنافسون} . (المطففين/٢٦).

[١٥٥] بوخاری (٢٤٨٦)و موسلیم (٢٥٠٠).

**واته: با بۆ گەیشتن بەم پایە بڵندە گەلە هەرەوەرز بکەنو لەپێناوی کاری وا پیرۆزدا پیاوچاکانو تێکۆشەران خۆیان ماندوو بکەن.**

٥٦٩/١[١٥٦] - وعن سهلِ بنِ سعدٍ (رضي اللّٰه عنه)أن رسولَ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم)أُتِيَ بِشَرابٍ، فَشَرِبَ مِنهُ وعَن يَمِينِهِ غُلامٌ، وعَن يسارِهِ الأَشْيَاخُ، فقال لِلْغُلام : (أَتأْذنُ لي أن أُعْطِيَ هُؤلاءِ؟ فَقالَ الغُلامُ : لا وَاللّٰهِ يا رسُولَ اللّٰه لا أُوثِرُ بِنَصيبي مِنكَ أَحَداً، قال: فتَلّهُ رسولُ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم) في يَدِهِ. متفقٌ عليه.

**سەهل** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: جارێ جامێ خواردنەوەیان هێنا بۆ پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **خۆی لێی خواردەوە، لەلای ڕاستییەوە کوڕێکی لاوی لێ بوو لەلای چەپیشییەوە پیرەکان دانیشتبوون، بە کوڕە گەنجەکەی فەرموو: ئایا رازی دەبیت کە خواردنەوەکە لەپێش تۆدا بدەم بەمانە؟ کوڕەکەش – کە ئیبنو عەبباس بوو – گوتی: نەبەخوا، ئەی پێغەمبەری خودا! بەشی خۆم لە بەرماوی پیرۆزی تۆ بەکەس نادەم. پێغەمبەریش** (دروودی خوای لەسەر بێ) **جامەکەی دایە دەستی (ش).**

٥٧٠/٢[١٥٧] - وعن أبي هريرة (رضي اللّٰه عنه)عَنِ النَّبيّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال : (بيْنَا أَيُّوبُ عليه السلام يَغتَسِلُ عُرياناً، فَخرَّ عَلَيْهِ جَرادٌ مِن ذَهَبٍ، فَجعَلَ أَيُّوبُ يَحثِي في ثَوبِهِ. فناداهُ رَبُّهُ عَزَّ وَجلَّ : يَا أَيُّوبُ، أَلَم أَكُنْ أَغْنَيْتُكَ عمَّا تَرى ؟، قال : بَلَى وَعِزَّتِكَ، وَلكِن لا غِنَى بي عَن بَرَكَتِكَ) رواه البخاري.

**ئەبو هوڕەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: جارێ ئەییوب (سڵاوی لێ بێ) بە ڕووتی خۆی دەشۆرد، لەو کاتەدا کولەی زێڕی بەسەردا باری، ئەییوب بەمشت دەیکردە ناو جلەکەی، خودای پەروەردگاری بالادەستو شکۆدار فەرمووی: ئەی ئەییوب! ئەدی من لەمەی دەیدینی بێ هەوەجێم نەکردبووی!؟ فەرمووی: با، بە گەورەیی تۆ چۆن دەفەرمووی وایە، بەڵام مەبەستم ماڵی دونیا ماشینەوە نیە، مەبەستم ئەوەیە ئەمە پیتو فەڕو بەرەکەتی تۆیە، منیش هەرگیزاو هەرگیز بێ نیاز نیم لە پیتو فەڕی تۆ! (ب).**

---

[١٥٦] بوخاری (٢٤٥١)و موسلیم (٢٠٣٠).

[١٥٧] بوخاری (٣٣٩١).

**٦٤- باسی باشیێتی دەوڵەمەندی سوپاسگوزار کە بریتیە لەو کەسە سامانی حەڵاڵ پەیدا دەکاتو بە شێوەیەکی ڕەوا خەرجی دەکا**

**باب فضل الغني الشاكر وهو من آخذ المال من وجه وصرفه في وجوهه المأمور بها**

قال اللّٰه تعالى: { فأما من أعطى واتقى، وصدق بالحسنى، فسنيسره لليسرى }. (الليل/٥-٧).

واتە: هەر کەسێ خێرخوازو بەخشندەو لە خودا ترس بێو باوەڕی بە پلەی هەرە جوان هەبێ، کە وشەی (لا إله إلا الله)یە کە کلیلی بەهەشتەو مایەی ڕەزای خودایە، ئەوە ئێمە دەیخەینە سەر ڕێگەی باشی ڕزگاری، کە ڕێك دەچێت بۆ سەر بەهەشت!

وقال تعالى: { وسيجنبها الأتقى، الذي يؤتي ماله يتزكى، وما لأحد عنده من نعمة تجزى، إلا ابتغاء وجه ربه الأعلى، ولسوف يرضى }.

واتە: لە سایەی خودای میهرەبانەوە ئەم خودا پێداوانەی کە ترسی خودایان لە دڵدایەو ماڵی خۆیان دەبەخشن لەبەر ڕەزای خوداو زەکات دەدەنو منەت بەسەر کەسدا ناکەنو مەبەستیشیان دەستیاو نییەو چاکەی کەسیان بەسەرەوە نییە، تا بەم خێرو زەکاتەیان هەقی بۆ بکەنەوە، بەڵکوو کارەکەیان ساخ بۆ ڕەزای زاتی خودای گەورەو هەرە بالایە، ئا ئەم خودا پێداوانە لەسایەی خوداوە دوورن لە ئاگری دۆزخ، وە خوا یار بێ ڕۆژ بەدڵی ئەوان دەبێ!

وقال تعالى: { إن تبدوا الصدقات فنعما هي، وإن تخفوها وتؤتوها الفقراء فهو خير لكم، ويكفر عنكم من سيئاتكم، والله بما تعملون خبير }. (البقرة/٢٧١).

وقال تعالى: { لن تنالوا البر حتى تنفقوا مما تحبون، وما تنفقوا من شيء فإن اللّٰه به عليم } (آل عمران/٩٢). والآيات في فضل الإنفاق في الطاعات كثيرة معلومة.

تێکڕای واتای ئەم دوو ئایەتە پیرۆزەیە ئاوایە خێرو خێراتو چاکە، چ بە پنهانی بنو، چ بە ئاشکرا بن، شتی چاکنو هۆی خۆشنوودی خودان، گرنگ ئەوەیە نیازتان پاك بێو ماڵەکەتان حەڵاڵ بێو بیدەن بە هەژارانێ کە شایانی ئەوە بن، ئیتر کەمو زۆری بەپێی حاڵ زۆر گرنگ نیە، وەلێ خێری گەورەو باشو نایاب ئەوەیە کە باشو نایابی سامانەکانتان بێ، نەك بچن هەرچی ئایەخە ئەوە بکەن بە خێر، خودا ئاگای لە هەموو شتێکە.

١/٥٧١[(١٥٨)] – فەرمووده‌ى (لاحسد الا في.... ) بڕوانه ١/٥٤٤ ز/٦٠).

٥٧٢/١[(١٥٨)] - وعن عبدِ اللّهِ بنِ مسعودٍ (رضي اللّه عنه)قال : قالَ رسولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلّم): (لا حَسَدَ إلاّ في اثنَتَيْنِ : رَجُلٌ آتاهُ اللّهُ مَالاً، فَسَلَّطَهُ على هَلَكتِهِ في الحَقِّ. ورَجُلٌ آتاه اللّهُ حِكْمَةً فُهو يَقضِي بها ويُعَلّمُهَا) متفقٌ عليه وتقدم شرحه قريباً.

٥٧٢/٢[(١٥٩)] - وعن ابْنِ عمر رضي اللّه عنهما عن النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال : (لا حَسَد إلاّ في اثنَتين : رَجُلٌ آتاهُ اللّه القُرآنَ، فهو يَقُومُ بِهِ آنَاءَ اللّيلِ وآنَاءَ النّهارِ. ورَجُلٌ آتاهُ اللّه مَالاً. فهوَ يُنْفِقهُ آنَاءَ اللّيْلِ وآنَاءَ النَّهارِ) متفقٌ عليه.

**ئیبنو عومەر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: خۆزگە پێ بردن بەس بەم دوو کەسە دروستە: یەکەم پیاوێ خودا فێری قورئانی کردبێ‌و ئەم خەلاتە مەزنەی پێ بەخشیبێ، ئەویش بە شەو بە رۆژ پێی هەڵدەستێ‌و لەنوێژا دەیخوێنێ، دووەم: پیاوێ خودا ماڵی رەحمەتی پێ بەخشیبێ، ئەویش درێخی لێ نەکاو بەشەو بە رۆژ خێرو چاکەی لێ بکا (ش).**

٥٧٣/٣[(١٦٠)] - وعَن أبي هُريرة (رضي اللّه عنه)أنَّ فُقَرَاءَ المُهَاجِرِينَ أَتَوْا رسولَ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم). فقالوا : ذَهَبَ أَهْلُ الدُّثُورِ بالدَّرَجاتِ العُلَى. والنَّعِيمِ المُقِيمِ. فَقَال : (ومَا ذَاكَ ؟) فَقَالُوا : يُصلُّونَ كمَا نُصَلِّي، ويَصُومُونَ كمَا نَصُومُ. ويَتَصَدَّقُونَ ولا نَتصَدَّقُ، ويَعتِقُونَ ولا نَعتقُ فقال رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (أَفَلا أُعَلّمُكُمْ شَيئاً تُدرِكُونَ بِهِ مَنْ سبَقَكُمْ، وتَسْبِقُونَ بِهِ مَنْ بَعْدَكُمْ ولاَ يَكُونُ أَحَدٌ أَفْضَلَ مِنْكُم إلاّ مَنْ صَنَعَ مِثلَ ما صَنَعْتُم ؟) قالوا : بَلَى يا رسولَ اللّه، قَالَ : (تُسبحُونَ، وتحمَدُونَ وتُكَبِّرُونَ، دُبُرَ كُلِّ صَلاة ثَلاثاً وثَلاثِينَ مَرَّةً) فَرَجَعَ فُقَرَاءُ المُهَاجِرِينَ إلى رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)، فَقَالُوا : سَمِعَ إخْوَانُنا أَهْلُ الأموَالِ بِمَا فَعلْنَا، فَفَعَلوا مِثْلَهُ ؟ فَقَالَ رسولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (ذلك فَضْلُ اللّهِ يُؤتيهِ مَن يشَاءُ) متفقٌ عليه، وهذا لفظ روايةِ مسلم.

---

(١٥٨) بڕوانه ژماره: (٥٤٤١/١ ز - ٦٠).

(١٥٨) بڕوانه ژماره: (٥٤٤١/١ ز - ٦٠).

(١٥٩) بوخاری (٥٠٢٥)و موسلیم (٨١٥).

(١٦٠) بوخاری (٨٤٢)و موسلیم (٥٩٥).

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی:** هەژارانی کۆچکەران (موهاجرین) هاتن بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) **گوتیان:** ئەی پێغەمبەری خودا! هەرچی پایەی بەرزو نازو نیعمەتو بەهرەی پایەدار هەیە هەمووی داراو دەوڵەمەندەکان دەیبەن بۆ خۆیان! فەرمووی: چۆن؟ عەرزیان کرد: چونکە ئەوان وەك ئێمە نوێژ دەکەنو وەك ئێمە رۆژو دەگرنو سەرەڕای ئەوەیش ماڵیان هەیە خێرو خێراتی لێ دەکەنو بەندی لێ دەکڕنو بۆ رەزای خودا ئازادی دەکەن، بەڵام ئێمە ماڵمان نیە، لەبەر ئەوە نەخێرمان پێ دەکرێو نە بەندەمان بۆ ئازاد دەکرێ. **پێغەمبەریش** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی:** دەبا شتێکتان فێربکەم کە ئەوانەی پێ دەگرنەوە، کە پێشتان کەوتن، وە هەمیشەیش پێش ئەوانە دەکەون کە ئێستا وان لەدواتانەوە، وە کەس لە ئێوە باشتر نابێو کەس وەك ئێوە ئاوا باش نابێ، مەگەر کەسێ کە وەك ئێوە بکا، **گوتیان:** فەرموو بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: لەپاش هەموو نوێژێکی فەرزەوە سیو سێ جار (سبحان الله)و سیو سێ جار (الحمد الله)و سیو سێ جار (الله أكبر) بکەن، گوتی: دیسانەوە هەژارانی کۆچکەران گەڕانەوە بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) **گوتیان:** برا موسوڵمانە دەوڵەمەندەکانمان ئەوەیان بیستۆتەوە کە ئێمە دەیکەین وە ئەوانیش وەك ئێمە هەمان شت دەکەن! **پێغەمبەریش** (دروودی خوای لەسەر بێ) بەم بۆنەیەوە ئیشتیشهادی بەم ئایەتە پیرۆزەیە کردو فەرمووی: (ذلك فضل الله يؤتيه من يشاء – المائدة/٥٤). واتە: ئەوە لە سایەو فەزڵو گەورەیی خوداوەیە، لەگەڵ هەر کەسێکا کە مەیلی هەبێ دەیکا (ش).

**٦٥ – باسی بیرکردنەوە لە مردنو هیوا کورتی - باب ذكر الموت وقصر الأمل**

قال الله تعالى: {كل نفس ذائقة الموت، وإنما توفون أجوركم يوم القيامة. فمن زحزح عن النار وأدخل الجنة فقد فاز، وما الحياة الدنيا إلا متاع الغرور}. (آل عمران/١٨٥).

وقال تعالى: { وما تدري نفس ماذا تكسب غداً، وما تدري نفس بأي أرض تموت}. (لقمان/٣٤).

وقال تعالى: { فإذا جاء أجلهم لا يستأخرون ساعة، ولا يستقدمون}. (الأعراف/٣٤).

وقال تعالى: { يا أيها الذين آمنوا لا تلهكم أموالكم ولا أولادكم عن ذكر اللّه، ومن يفعل ذلك فأولئك هم الخاسرون، وأنفقوا مما رزقناكم من قبل أن يأتي أحدكم الموت فيقول: رب لولا أخرتني إلى أجل قريب فأصدق وأكن من الصالحين، ولن يؤخر اللّه نفساً إذا جاء أجلها، والله خبير بما تعملون }. (المنافقون/٩-١١).

وقال تعالى: { حتى إذا جاء أحدهم الموت قال: رب ارجعون لعلي أعمل صالحاً فيما تركت. كلا إنها كلمة هو قائلها، ومن ورائهم برزخ إلى يوم يبعثون، فإذا نفخ في الصور فلا أنساب بينهم يومئذ ولا يتساءلون. فمن ثقلت موازينه فأولئك هم المفلحون، ومن خفت موازينه فأولئك الذين خسروا أنفسهم في جهنم خالدون، تلفح وجوههم النار، وهم فيها كالِحُون. ألم تكن آياتي تتلى عليكم فكنتم بها تكذبون! } إلى قوله تعالى { قال كم لبثتم في الأرض عدد سنين؟ قالوا: لبثنا يوماً أو بعض يوم فاسأل العادين. قال: إن لبثتم إلا قليلاً لو أنكم كنتم تعلمون، أفحسبتم أنما خلقناكم عبثاً وأنكم إلينا لا ترجعون؟! }. (امؤمنون/٩٩-١١٠).

وقال تعالى: { ألم يأن للذين آمنوا أن تخشع قلوبهم لذكر اللّه وما نزل من الحق، ولا يكونوا كالذين أوتوا الكتاب من قبل فطال عليهم الأمد فقست قلوبهم، وكثير منهم فاسقون }. (الحديد/١٦). والآيات في الباب كثيرة معلومة.

تێکڕای واتای ئایەتەکان: واتە: هەموو کەسێ، هەرچی گیانداره تامی تاڵاوی مەرگ دەچێژێ، کەس لە چنگی مردن قوتاری نابێ، دەردی بێ دەرمانە، مردن برای گەورەیە کاتی بۆ نیە، کەس نازانێ کەی دەمرێو لەکوێ دەمرێ، هەرکاتێ مردن بەرۆکی بەکەسێ گرت ئیتر یەخەی بەرنادات! ئەو کاتە ئاواتی بەلاشو خۆزگەی نابەجێ سوودی نیە، کەواتە ئەی موسوڵمانینە! مشووری خۆتان بخۆنو بزانن مردنتان لە پێشەو لەپاش مردنیش چەند گێرەو کێشە، ماڵو منالی غەزەب دەستخەڕۆو دەستە شکێنتان نەکەنو لە زیکرو یادی خودا بێ ئاگاتان نەکەنو، ڕەزای خودا مەگۆڕنەوە بە خۆشەویستی ماڵو منال، بزانن لە پاش مردن بەرزەخە، حەشرە، نەشرە، ژینەوەیە واتە: بەعثە، لێپرسینەوەیە، پردی سیراطە، تەرازوو (میزان)ە، مەحکەمەیە، جا لەپاش ئەم هەموو کەینو بەینە ئەو کەسەی بە چنگەکرەو پەلەپڕوزە لەچنگی ئاگری سوری دۆزەخ قوتاری ببێو، بەهەشتی بەنصیب ببێ، بەڕاستی سەربەرزو سەرفرازو کامەرانو شادومان خۆیەتی، ئەو

دەمە زۆر بە باشی دەزانێ کە ژیانی جیهان دانەو داوەو ئادەمیزادی نەفامو کورتبینی پێ هەڵخەڵەتاوە! کەواتە: تا مەودا ماوەو هەل لەدەست نەچووە بەدەمو بەدەستو بەدڵ تێکۆشنو بەسەرو بەماڵ خودا لەخۆتان رازی بکەن، نەبادا وەك هەندێ کەس لەخۆتان لەکاتی سەرەمەرگدا خۆزگەی بەلاش بخوازنو بڵێن: پەروەردگارم! بریا کەمێ مەودات دەدام، مەرگت ماوەیێ دوادەخستم، هەتا خێرو چاکە وەپێش خۆم بخەمو، واز لە خراپە بێنمو ببم بە مرۆڤێکی باش! بەڵام تازە کار لەکار ترازاوە، بۆ ئێوە ئەجەل (ئاکام) بەچی دەزانن، کە دەتانەوێ هەروا بە ئاسانی بەری بگرن؟!:

وەک کێو دەڕووخێ ئاکام لە ناکاو ... ناگەڕێتەوە، چون تیری تەقاو!
تۆ ماسی ناو تۆڕ، چنگی مەرگیش گاز! ... ریشەکەنتەکا، وەک پۆڕی دەم باز
ئەوجا دەتداتە دەست گۆڕی تاریک ... تەنگو شێدارو قووڵکەلەو باریک
گەر بە نصیب بێ لۆیێ کفنی جاو ... بەرگی غەریبیت تازەیەو تەواو!!
مەبەست لە هەڵبەست هاندانی هەستە ... دەروون بەربەس کا لە هەرچی پەستە
ئایا دەزانێ رۆژ بە رۆژ نووری! ... لە مردن نزیک لە خودا دووری!
باس باسی مەرگە، ئەوەک بەهەڵە ... بفەرموو: نووری لە باس بوو هەڵە!
خامە! زمانی هەستی، دە هەستە ... هەڵبەست بنووسە، تا هەل لەدەستە
وەکی وەسیێتێ مەلا بۆ خەستە ... خامە پێی فەرمووم: ئەم شیعرە بەستە:-
دڵ بە کەرویشکەی خەیاڵ پێپەستە:- ... خەیاڵی کۆچی رەوان لە جەستە!!

هەروەك لەلایەکی تریشەوە، کافرەکان لە سەرەمەرگا بەدەم گیانەڵاوە دەڵێنو دەپاڕێنەوە: پەروەردگارم! پەشیمانم، بە فریشتەکانت بفەرموو: مۆڵەتم بدە، سا بەشکوو فریای خۆم بکەومو هەڵەی خۆم هەڵبگرمەوە، دەست بکەم بەکاری باشو، رووی رەشی خۆم سپی بکەمەوە، نەخێر، ئەمە خەیاڵ پڵاوە، تازە کار لەکار ترازاوە، با بۆخۆی هەر بڵێ، قسەی وا بەدەردی ناخوا، تازە ئێوە لە دونیا دەرچوونو پەردەی خودایی تا رۆژی زینەوە بەرێ لێ بریونەتەوە!

ئەی مەردووم! رۆژی سەختی وا واتان لەبەرەنەبێتەوە، کە بۆ دوا جار فوو دەکرێ بە صووردا، هەموو شپرزە دەبنو کەس سەر کەسی ناپەرژێ، ئیتر بنەچەو خزمایەتیو کەسایەتی سوودی نامێنێ، وەك نەبێ وایە، تا کەی چاكو خراپی

خۆتان نافامن‌و جیهان بەریتەو پیتەو زەرقی‌و بەرقی خۆی هەڵتان دەخەڵەتێنێ، لەرۆژی قیامەتا کارو کردەوەتان هەمووی بە تەرازووی خێرو شەڕ دەکێشرێ، ئەو تەرازووە بەموویێ سەر ناکات، جا ئەوانەی خاوەنی بیروباوەڕی باش بوون‌و کردەوەی باشیان کردووە ئەوانە سەنگین‌و سەلارو بەڕێزو بەقەدر دەبن، وەلێ ئەوانەی بیروباوەڕیان خراپ بووبێ‌و کارو کردەوەیان ناشیرین بووبێ، شاد دەبن بە دۆزەخ‌و دەبێ بە زیندانیان هەتا هەتایە، سەرەڕای ڕەزیلی‌و بێ ڕێزیی‌و ئێش‌و ئازاری زۆری هەمە جۆریش گڕی ئاگری سووری دۆزەخ دەمووچاویان باوەشێن دەکاو لێویان وەك داری سووتەمەرۆو کوڵەوژی تەنوور هەڵدەقرچێ، پێشیان دەگوترێ: ئەمە تۆڵەی بێ گوێی خۆتانە کە ئایەتەکانی خوداتان بۆ دەور دەکرایەوە، گاڵتەتان پێ دەهات‌و بەدرۆتان دەزانی.

ئەوانیش لەتەریقیدا دەڵێن: پەروەردگاری ئێمە! بەدبەختی‌و چارەڕەشی خۆمان تووشی ئەم رۆژە رەشەی کردووین، پێ لە تاوانی خۆمان دەنێین، وا سەرمان کردبووە نەگبەتی لێمان بوو بوو بەخو پیشە، تا حاڵمان گەیشت بەم حاڵە پیسە، بەڕاستی سەرلێ شێواوو لەڕێ دەرچوو بووین، وەلێ ئێستا راستیمان بۆ دەرکەوت، بە چاوی خۆمان، بەگوێی خۆمان هەموو شتێکمان بۆ دەرکەوت، ئامان خودایە! لەم ئاگرە دەرمان بێنە، پەیمانت دەدینێ کە ئیتر نافەرمانیت نەکەین، ئەمجارەش تاقیمان بکەرەوە، ئەگەر درۆمان کردەوەو چووینەوە سەرباری بەڕەبۆر، ئەوا خۆمان مۆری ستەمگەریی‌و زۆرداریی بەخۆمانەوە دەنێین، زوڵم‌و زۆر لەخودی خۆمان دەکەین، خودا چغەیان لێ دەکاو، دەفەرموێ: چغەتان لێ بێ وەك سەگ، ئەمە جێگەتانە هەتا هەتایە، جارێکی تر ئەم قسەیە لەرووی منا نەکەنەوە، ئەوەبوولەدنیادا کۆمەڵێ لە بەندە باشەکانی من هەمیشە لە من دەپاڕانەوەو بەسۆزی دڵ دەیانگوت: پەروەردگارمان! باوەڕمان هێناوە،دەی تۆیش لە تاوانمان خۆش ببە، گوناهمان بپۆشەو ڕحم بەحاڵمان بفەرمووو، بەڕاستی تۆباشترین خاوەن میهرەبانیت‌و لەهەموو کەسێ بەرەحمتریت، کەچی ئێوە لاقرتیتان پێ دەکردن‌و پێیان پێ دەکەنین‌و گاڵتەتان بە کارەکەیان دەهات، ئەوەبوو بەهۆی ئەم رەوشتە پیسەتانەوە لەگەڵ ئەو خودا پێداوانەدا یادو زیکری منتان فەرامۆش کردو بەدەستی خۆتان ئاگرتان بەماڵی خۆتانەوە نا، وەلێ ئەمرۆ ئەوان بە پاداشتی باشی

خۆیـان گەیشتوون‌و شـادومان بـوون بـەمرازی خۆیـان بـە بـەری صـەبری خۆیـان شـادومان بـوون‌و نائومێـدیی‌و رووڕەشـیش بـۆ ئێـوە ماوەتـەوە، ئـەوجا دەفـەرموێ: لەسەر زەوی چەند ساڵ مانەوە ئەو ماوەیە ئەوەی دەهێنا کە خۆتـان تووشی ئـەم گۆبەنە بکەن بۆی؟ دەڵێن: ئەوەنـدە نـەبوو زۆر کـەم بـوو، ژینـی جیهانمـان لەچاو ژینی ناخۆشی بـێ بڕانـەوی ئێستامانا، وەك دڵۆپ‌و دەریـا وایـە، هـەموو یـەك دوو ڕۆژێ بـوو، بگـرە کـەمتریش، ئەگـەر دەتـەوێت تـەحقیقی بکـەی لـە فریشـتەکانی سەرمان بپرسە، کە هەموو شتێکی ئێمەیان دەژمارد، ئەویش دەفەرموێ: بەڕاستی چاك خۆتان دەستەپاچە کردووە ئەگەر بەخۆتان بزانن، ژینی نەبڕاوەی پڕ خێـرو خۆشی بەهەشتی خۆتان لە پێناو چەند ڕۆژێکی کەما، گۆڕیوەتەوە بەم ژینە پیسە ئەی بەدبەختینە! لاتان وابوو ئێمـە بـۆ هەوانتـە ئێوەمـان دروسـت کـردووە، واتـان دەزانی دروست کردنتان بێ هودەو بۆش‌و پووچەو لەپاش مردن ژینەوە نییەو ئاوا لەم حاڵەتی کەساسی‌و داماوییەدا نایەنەوە بەردەستی خۆمان. موسـوڵمانینە! ئـەوا ئەو خەڵکەی تر بێ ئاگاو کاس‌و بێ هۆش‌و گۆشـن، ئێـوە چـی؟ پـاش ئـەم شـەرحی حاڵ‌و باسی مردن‌و گۆڕو مەینەتیانەی کە لە پێشتانە نابـێ هۆشـی بکەنـەوە، لایـە لە بەندەیی‌و طاعەت‌و ذیکری خودا بکەنەوە، ئەگەر ئێستا کـاتی ئـەوە نـەبێ ئـەی کەی کاتی ئەوەیە؟ بـزانن غـەیب هـەر خـودا دەیزانـێ، کـەس نازانـێ سـبەینێ چـی تووش دەبێ، نـەمان‌و ئاکام‌و مەرگ‌و مردن شـەرمیان لەکـەس نیـە، هـەموو هـۆزێ، گشت میللەتێ، گشت کەسێ ماوەیەکی بۆ دانراوە کەتـەواوبوو خۆشـی تـەواو دەبـێ، کەواتە خۆتان لە خاوەن نامەکانی پێش خۆتان جیابکەنەوە، وەك ئەوان مەبن، کە بەرەبەرە لە خودا دوورکەوتنەوەو دڵیان بەزەق‌و بەرقی جیهان خۆش بوو، بەهۆی ئەوەوە دڵیان ڕەش‌و ڕەق بوو زۆربەیان لە ڕێگەی ڕاست لایـان دا، ئێـوە وەك ئـەوان مەبن، بەڵکوو ڕوو لـەخودا بکـەن‌و بـەدڵێکی نـەرمی پـڕ لەسـۆزەوە پـەلاماری یـادو ذیکری خودا بدەن‌و خەریکی ذیکرو فیکـرو یـادی خـودا بـن‌و، دڵ بدەنـە قورئـان‌و ئەو سوننەتە پڕ داناییەی کە بە موحەممەدا بۆتان ڕەوانە کراوە، ئـەم دووە بکـەن بە بەرنامەی ژیانتان، تا لە هەردوو جیهاندا بحەوێنەوە.

٥٧٤/١[١٦١]- وعن ابن عمر رضي اللّٰه عنهما قال : أَخَذَ رَسولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)بِمنكِبي فَقَالَ : (كُنْ في الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ أَو عابرُ سَبِيلٍ) وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ رضي اللّٰه عنهما يقول : إذا أَمسَيتَ، فَلا تَنْتَظِرِ الصَّبَاحَ، وَإذَا أَصْبَحْتَ، فَلا تَنْتَظِرِ المَسَاءَ، وخذ مِن صِحَّتِكَ لمَرَضِك وَمِن حَيَاتِكَ لموتِكَ) رواه البخاري.

**لەباسی (باب الزهد في الدنيا)دا رابورد، فەرموودەی یازدەهەم، زنجیرەی — ٥٥ — بڕوانە: (٤٧١/١٥ز - ٥٥).**

٥٧٥/٢[١٦٢]- وعنه أنَّ رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال : (ما حَقُّ امْرِيءٍ مُسلِمٍ لَهُ شَيءٌ يُوصِي فِيهِ. يبيتُ لَيْلَتَيْنِ إلاَّ وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ) متفقٌ عليه. هذا لفظ البخاري.

وفي روايةٍ لمسلم : (يَبِيتُ ثَلاثَ لَيَالٍ) قال ابن عمر : مَا مَرَّتْ عَلَيَّ لَيْلَةٌ مُنذُ سَمِعتُ رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال ذلِكَ إلاَّ وَعِنْدِي وَصِيَّتِي.

**دیسان فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: هەر موسوڵمانێ شتێکی هەبێ، کە بیەوێ راسپێریی (وەصیەت)ی بۆ بکا هەق وایە دوو شەوی بەسەردا تێ نەپەڕێ هەتا وەصیەتنامەکەی بەنووسراوەیی لەلای خۆی دادەنێ (ش) ئەمە گفتی بوخارییە، لەگێڕانەوەیەکی موسلیمدا دەفەرموێ: هەق وایە سێ شەوی بەسەردا تێ نەپەڕێ، ئیبنو عومەر (خوا لێیان رازیی بێ) دەیفەرموو: ئەوەتی ئەم فەرموودەیەم لە پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **ژنەوتووە، شەوێ نەبووە کە وەصیەتەکەمم نەبووبێ.**

٥٧٦/٣[١٦٣]- وعن أنس (رضي اللّٰه عنه)قال : خَطَّ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)خُطُوطاً فقال : (هَذا الإنسَانُ وَهَذا أَجَلُهُ. فَبَيْنَما هو كَذلِكَ إذ جَاءَ الخَطُّ الأَقْرَبُ) رواه البخاري.

**ئەنەس** (خوا لێی رازیی بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **چەند خەتێکی کێشا، فەرمووی: ئەم یەکەیان ئادەمیزادەو، ئەمەشیان هیواو ئاواتەکەیەتیو، ئەمەشیان ئاکامەکەیەتی، لەو کاتەدا کە ئاوا خەریکەو هەر ساتەی لەسەر بارێکەو بەدووای**

[١٦١] بڕوانە (٤٧١/١٥ ز ٥٥).

[١٦٢] بوخاری (٢٧٣٨)و موسلیم (١٦٢٧).

[١٦٣] بوخاری (٦٤١٨).

هیوای دوورو درێژدا وێڵە، لەپڕ خەتە نزیکەکەیان دەگاتە سەری‌و مردن پڕی پیا دەکاو یەخەی پێ دەگرێ (ب).

٥٧٧/٤[١٦٤]- وعن ابنِ مسعُودٍ (رضي الله عنه)قال : خَطَّ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)خَطًّا مُرَبَّعاً، وخَطَّ خَطًّا في الْوَسَطِ خارِجاً مِنْهُ، وَخَطَّ خُطَطاً صِغَاراً إلى هَذَا الَّذِي في الوَسَطِ مِنْ جَانِبِهِ الَّذِي في الوَسَطِ، فَقَالَ : (هَذَا الإنسَانُ، وَهَذَا أجَلُهُ مُحِيطاً بِهِ أو قَد أَحَاطَ بِهِ وَهَذَا الَّذِي هُوَ خَارِجٌ أَمَلُهُ وَهَذِهِ الْخطَطُ الصِّغَارُ الأَعْرَاضُ، فَإِنْ أَخْطَأَهُ هَذَا، نَهَشَهُ هَذا، وَإِنْ أَخْطَأَهُ هَذا نَهَشَهُ هَذَا) رواه البخاري.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) خەتێکی چوار گۆشەی کێشاو، لەناو ئەو خەتە چوارگۆشەیەوە خەتێکی تری درێژی ڕاکێشا تا دەرەوە، ئینجا لەدیوی ناوەوە چەند خەتێکی تری وردی لەسەر خەتەکەی ناوەوە کێشا، ئەوجا فەرمووی: (درودی خوای لەسەر بێ) ئەم خەتەیان کەوا لەناو خەتە چوارگۆشەکەداو خەتە وردەکانی لەسەرە ئەمەیان وێنەی ئادەمیزادەو، ئەم خەتە چوارگۆشەشیان وێنەی ئاکامەکەیەتی، ئەوەتانێ بەری لێ بڕیوەتەوەو لەهەر چوارلاوە ئابڵۆقەی داوە، یان فەرمووی: گەمارۆی داوەو دەوری گرتووەو ئەم خەتەشیان دەرچووەتە دەرەوە هیواکەیەتی‌و، ئەم خەتە وردانەش دەردو بەڵاو مەینەتین، جا ئەگەر لە هەندێ لەم دەردو بەڵایانەش قوتاری بوو لەهەندێکی تریان قوتاری نابێ‌و وەك مارو گەزەندە دەیگەزێ! (ب)[*]

---

[١٦٤] بوخاری (٦٤١٧).




[*] ئەم شکڵە ئەو وێنەیە:

بە بۆچوونی بەندە، ئەم شکڵە بەلگەیەکی ڕۆشنی ترە لەسەر ئەوە کە: (بڕیاری وێنەکێشان بەپێی دروستی‌و نادروستی مەبەست‌و نیاز دەگۆڕێ) چونکە ئەم شەکڵە خۆی جۆرێکە لەوێنە، هێماو ڕەمزی شتی گیاندارو بێ گیانی تێدایە، بەهەر حاڵ ئەمە نموونەیەکە جوانە لەسەر وێنەی ڕەوا، کەواتە: کورت‌و پوخت: (هەر وێنەیێ بۆ مەبەستێکی ڕەوا بێ، ڕەوایە، هەر وێنەیێ بۆ مەبەستێکی ناڕەوابێ

٥٧٨/٥- وعن أبي هريرة (رضي اللّٰه عنه)أَنَّ رَسُولَ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال : (بَادِرُوا بِالأَعْمَال سَبْعاً، هَل تَنْتَظِرُونَ إلاَّ فَقْراً مُنْسِياً، أَو غِنَى مُطغِياً، أَوْ مَرَضاً مُفسِداً، أو هَرَماً مُفَنِّداً، أَو مَوتاً مُجْهِزاً، أَو الدَّجَّالَ، فَشَرُّ غَائِبٍ يُنْتَظَرُ، أَوِ السَّاعَةَ وَالسَّاعَةُ أَدْهَى وأَمَرُّ ؟،) رواهُ الترمذي وقال : حديثٌ حسنٌ.

لەبەرگی یەکەما، لە زنجیرە دەدا رابورد، (بادروا بالأعمال سبعا...) باسی (المبادره إلى الخيرات). بڕوانە (٩٣/٧ز - ١٠).

٥٧٩/٦[١٦٥]- وعنه قالَ : قالَ رسولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (أَكْثِرُوا ذِكْرَ هَاذِمِ اللَّذَّاتِ) يَعني المَوْتَ، رواه الترمذي وقال : حديثٌ حسنٌ.

ئەبو هوڕەیرە (ڕەزای خوادای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەزۆری یادی خۆشیپسێنەکە بکەنەوە، واتە: یاددی مردن بکەن! (ت:ح/ح).

٥٨٠/٧[١٦٦]- وعن أبي بن كعب (رضي اللّٰه عنه): كانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)إذا ذَهبَ ثُلثُ اللّيْلِ، قامَ فقالَ : (يا أَيها النَّاسُ اذْكُرُوا اللّٰه جَاءَتِ الرَّاجِفَةُ تَتْبَعُهَا الرَّادِفَةُ، جاءَ المَوْتُ بما فِيهِ، جاءَ المَوْتُ بما فِيهِ) قلتُ : يا رَسُولَ اللّٰهِ إني أكْثِرُ الصَّلاةَ عَلَيْكَ، فَكَمْ أَجْعَلُ لكَ مِن صَلاتي ؟ قال: (ما شِئْتَ) قُلْتُ الرُّبعَ ؟ قال : (ما شِئْتَ، فَإنْ زدتَ فَهُوَ خَيْرٌ لكَ) قُلتُ : فَالنِّصْفَ ؟ قالَ (ما شِئْتَ، فإنْ زِدْتَ فهو خَيرٌ لَكَ) قُلْتُ : فالثلثَين ؟ قالَ : (ما شِئْتَ، فإنْ زِدْتَ فهو خَيرٌ لكَ) قُلْتُ : أَجْعَلُ لكَ صَلاتي كُلَّها ؟ قال : إذاً تُكْفي هَمَّكَ، ويُغْفَرُ لكَ ذَنْبُكَ) رواه الترمذي وقال : حديث حسن.

ئوبییەی کوڕی کەعب (خوا لێی ڕازیی بێ) فەرمووی: دەستووری حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) وابوو کە دوو سێیەکی شەو دەڕۆیشت، گەلێ جار هەڵدەساو دەیفەرموو: (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەی خەڵکینە! ئەی ئادەمیزادینە! زیکرو یادی خودا بکەن، واهات نەفخەی یەکەم کە جیهان سەرتاپا دێنێتە لەرزەو تەکانو جموجووڵ، بەشوێنی دا دێ، نەفخەی دووەم کە ئاسمان بەخۆیی‌و هەرچی تیادایە هەموو وەك زەوی دەکەونە

---

نارەوایە!) بڕوانە: تاج بەکوردی، بەرگی نۆیەم، لاپەڕە/٣٠٤ ز — ٩٧ف — ٤+ف — ٥. وە بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم بابەتە بڕوانە تاج، کوردی/١٦٤/٤. (وەرگێڕ).

[١٦٥] تيرميذي (٢٣٠٧).

[١٦٦] تيرميذي (٢٣٠٨).

جووڵەجووڵو کەوتنە خوارەوە، ئەی مەردومینە! واهات مردن بەخۆیو کێشمە کێشمیەوە، واهات مردن بە خۆیو کێشمەکێشمیەوە! گوتم: قوربان! من صەڵاوات زۆر دەدەم لە دیداری تۆ، جا کاتێ دەستم کرد بە تاعەتکردن چەنێ دانێم لەکاتی طاعەتم بۆ صەڵاواتدان لەسەر تۆ؟ فەرمووی: چەند خۆت ئارەزوو دەکەی، گوتم: کەواتە چواریەکی وەختەکەم صەڵاوات لەسەر تۆ دەدەم، فەرمووی: (درودی خوای لێ بێ) ئارەزووی خۆتە، حەز دەکەی زیاتری بکە، ئەوە باشترە بۆت، گوتم: دە نیوەی؟ فەرمووی: (درودی خوای لەسەر بێ) مەیلی خۆتە، حەز دەکەی زیاتری بکە، ئەوە باشترە بۆت، گوتم: دوو سێیەکی؟ فەرمووی: (درودی خوای لەسەر بێ) ئارەزووی خۆتە حەز دەکەی زیاتری بکە، باشترە بۆت، گوتم: دە طاعەتکردنم هەموو تەرخان دەکەم بۆ صەڵاواتدان لەسەر تۆ، فەرمووی: دەی کەوابێ خەمی هیچت نەبێ، وە خودا لە هەموو گوناهەکانت خۆش دەبێ. واتە: صەڵاواتی زۆر لەسەر پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ) دەبێ بەمایەی خێرو خۆشی هەردوو جیهان (ت:ح/ح).

**٦٦ – باسی دیدەنی پیاوان بۆ سەر گۆڕستان سوننەتە، دێنیکەری گۆڕ چی بڵێ:**

**باب استحباب زيارة القبور للرجال وما يقوله الزائر**

٥٨١/١[١٦٧]- عن بُرَيْدَةَ، (رضي اللّٰه عنه)، قال : قال رسُولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيارَة القُبُورِ فَزُوروها) رواهُ مسلم. وفي رواية (فمن أراد أن يزور القبور فليزر فإنها تذكرنا بالآخرة).

بورەیدە (خوا لێی ڕازی بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوە بوو لەمەو پێش نەهیم لێ دەکردن لەدیدەنی گۆڕستان، بەڵام بزانن: ئەوا خودای گەورە ڕێگەی منی داوە کە دیدەنی گۆڕی دایکم بکەم، کەوابوو ئیتر ئێوەیش دیدەنی گۆڕستان بکەن، چونکە دیمەنی گۆڕو گۆڕستان یادی قیامەت تازە دەکاتەوە! (م/تاج).

٥٨٢/٢[١٦٨]- وعن عائشَةَ رضي اللّٰهُ عنها قالت : كان رسُولُ اللّٰهِ، (صَلّى اللهُ عَلَيْه وسَلَّم)، كُلَّما كان لَيْلَتها منْ رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَخْرُجُ مِنْ آخرِ اللَّيْلِ إِلى

---

[١٦٧] موسليم (٩٧٧).

[١٦٨] موسليم (٩٧٤).

البقيع، فيقُولُ : (السَّلامُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤمِنِينَ، وأَتاكُمْ ما تُوعَدُونَ، غَداً مُؤَجَّلُونَ، وإِنَّا إِنْ شاء اللّهُ بِكُمْ لاحِقُونَ، اللّهُمَّ اغْفِرْ لأَهْلِ بَقِيعِ الغَرْقَدِ) رواهُ مسلم.

عائیشه (خوا لێی ڕازیی بێ) فەرمووی: هەموو جارێ کە سەرەی شەوی من بوایە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەکۆتایی شەودا دەردەچوو، بۆ دێنی گۆڕنشینەکانی گۆڕستانی بەقیعو بۆیان دەپاڕایەوەو دەیفەرموو: (السَّلامُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤمِنِينَ، وأَتاكُمْ ما تُوعَدُونَ، غَداً مُؤَجَّلُونَ، وإِنَّا إِنْ شَاءَ اللّهُ بِكُمْ لاحِقُونَ، اللّهُمَّ اغْفِرْ لأَهْلِ بَقِيعِ الغَرْقَد):

سڵاوتان لێ بێ مەبەستم لەو موسوڵمانانەیە کە ئەم گۆڕستانە بووە بەماڵی دواڕۆژیان ئەی مردووەکان! ئەو بەڵێنەی پێتان درابوو کە ئەو زیندووانەی لەدوای ئێوەوە دێن، خواناخوا زووو یان درەنگ ئەوانیش دەمرنو دێن بۆ لاتان ئەوا ئەو بەڵێنە رۆژ بەرۆژ دیتە جێو هەر رۆژەی دەستەیێ دێن بۆلاتان، ئێمەیش – خوا حەز کا – پێتان دەگەینەوە، خودایە! لەدانیشتوانی گۆڕستانی بەقیع خۆش ببە (م/تاج).

٥٨٣/٣[١٦٩]- وعن بُرَيْدَةَ (رضي اللّه عنه)، قال : كَانَ النَّبِيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يُعَلِّمُهُمْ إذا خَرَجُوا إلى المَقابِرِ أَنْ يَقُولَ قَائِلُهُم : (السَّلامُ عَلَيكُمْ أَهْلَ الدِّيارِ مِنَ المُؤْمِنِينَ والمُسْلِمِينَ وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللّهُ بِكُمْ لاَحِقُونَ، أَسْأَلُ اللّه لَنَا وَلَكُمُ العافِيَةَ) رواه مسلم.

بورەیدە (خوا لێی ڕازیی بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) یارانی فێر دەکرد، کاتێ دەڕۆن بۆ گۆڕستانەکان قسەکەریان بفەرمووێ: (السلام عليكم أهل الديار من المؤمنين والمسلمين، وإنا إنشاءالله بكم لاحقوق، اسأل الله لنا ولكم العافية):

سڵاوتان لێ بێ ئەی دانیشتوانی ئەم خانەیانە، لە موسوڵمانو خاوە باوەڕتان، ئێمەش – خودا یار بێ – هاکا پێتانەوە نیشتینو هاتین بۆلاتان، داوای ئاسوودەییو خێرو خۆشی لە خودا دەکەم، بۆ خۆشمانو بۆ ئێوەش (م).

---

[١٦٩] موسلیم (٩٧٥).

٥٨٤/٤[١٧٠] - وعن ابن عَبَّاسٍ، رَضيَ اللّه عنهما، قال : مَرَّ رسُولُ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)بِقُبور بالمَدِينَةِ فَأَقْبَلَ عَلَيْهِمْ بوَجْهِهِ فقالَ : (السَّلامُ عَلَيْكُمْ يا أَهْلَ القُبُورِ، يَغْفِرُ اللّهُ لَنا وَلَكُمْ، أَنْتُم سَلَفُنا ونَحْنُ بالأَثَرِ) رواهُ الترمذي وقال : حديثٌ حسن.

ئیبنو عەبباس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەلای گۆڕستانێکی مەدینەوە تێپەڕی، رووی تێ کردن‌و فەرمووی: سڵاوو دروود لە ئێوە ئەی دانیشتوانی ئەم گۆڕستانە! خودا لە ئێمەش‌و لە ئێوەش خۆش بێ، ئێوە پێشینانی ئێمەن‌و ئێمەیش بەشوێن ئێوەدا وا دێین (ت:ح/ح).

لەبەر ئەوەی ئەم بابەتە زۆر هەست بزوێنە ئەم روون کردنەوەی لەسەر دەنووسین:

١. دێنی گۆڕو گۆڕستان سوننەتە، بۆ ژن‌و بۆ پیاو، بەمەرجێ بێ شەرعی تیادا روو نەدات، حەزرەتی عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) دێنی گۆڕی مێردو باوك‌و برای خۆی کردووە، پێغەمبەریش گوتەی کاتی دێنی گۆڕستانی فێرکرد، وەك لە صەحیحی موسلیمدا دەفەرمویٚ.
٢. سڵاو کردن لەمردوو سوننەتە، ناوهێنانیان، بەناوی خۆیان، بەناوی گۆڕستانەکەیانەوە دروستە، وەك: سڵاوت لێ بێ ئەی پێغەمبەری خودا، ئەی باوکە، ئەی دایە.. تاد ئەی دانیشتوانی گۆڕستانی شێمحێدین...
٣. ئاراستەکردنی قسەو گفتوگۆ بۆ مردوو دروستە، قسە کردن لەگەڵیانا دروستە.
٤. لەکاتی سڵاوکردن‌و قسە کردن لەگەڵ دانیشتوانی گۆڕستانداو پاڕانەوە بۆیان، روو تێ کردنیان سوننەتە.
٥. دروستە گۆڕستان ناو بنرێ.
٦. دێنی گۆڕ، مردن یاد دەخاتەوە، دڵ نەرم دەکا.
٧. دێنی گۆڕستان لەشەودا سوننەتە.
٨. دێنی کەس‌وکار، هی مردووی خۆیان سوننەتە. وەك دایك‌و باوك‌و براو خوشك‌و هاوسەر...تاد. چونکە پێغەمبەر خۆی دێنی گۆڕی دایکی کردووە.

[١٧٠] تیرمیذي (١٠٥٣)

٩. لەڕاستیدا زۆر شت هەیە لێکۆڵینەوەی زۆرو قووڵ کردنەوەی زۆرباش نیە، کەواتە: ڕەشە خەڵكو عەوام زەحمەتە لەم جۆرە شتانە بەتەواوی تێ بگەن، ئەوەی کردوویانە بەعادەتو پێچەوانەی فەرمانی ڕۆشنی شەرع نیە، ڕێ لێ گرتنی کارێکی ناباشە.

چونکە مۆدێرن کردنی هەموو تەصەروفێکی عەوام سەر بۆ پێچەوانەی مەبەست دەکێشێ، بڕوانە: شەرحی صەحیحی موسلیم – نەوەوی ج/٣ص ١٣٧، ج/٧ص ٤١، تاج الاصول ج/١ص ٣٨١ کوردییەکەی ل – ٥٩١ز – ٢٢٧. مغنی المحتاج. شەرحی منهاج، ج/١ص ٣٦٥، ج/٣ص ٦٩، فتح المعین ص٥١، فیقهی ئاسان بە کوردی، بەرگی یەکەم، لاپەڕە/٤٠٠ هەتا ٤٠٧ (باسی سەردانی مزگەوتەکەی پێغەمبەرو مەرقەدی پیرۆزی) ٢٠٠٠/٥/٥ (وەرگێڕ).

## ٦٧ باسی ئەوە خراپە مەرگ بە ئاوات بخوازێ، مەگەر لەترسی تووشبوونی ئاژاوەی ئایینی، ئەوە قەیدی نیە

## باب كراهيه تمنى الموت بسبب ضر نزل به ولا بأس به لخوف الفتنة في الدين

٥٨٥/١[١٧١] عنْ أبي هُريرة (رضي اللّه عنه)أنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قالَ : (لا يَتمَنَّ أَحَدُكُمُ المَوْتَ إمَا مُحسِناً، فَلَعَلَّهُ يَزْدادُ، وَإمَّا مُسِيئاً فَلَعَلَّهُ يَسْتَعْتِبُ) متفقٌ عليه، وهذا لفظ البخاري.

وفي روايةٍ لمسلم عن أبي هُريْرةَ (رضي اللّه عنه)عَنْ رسُول اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال : (لا يَتمَنَّ أَحَدُكُمُ المَوْتَ، وَلا يَدْعُ بِهِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَهُ، إنَّهُ إذا ماتَ انْقَطَعَ عَمَلُهُ، وَإنَّهُ لا يَزيدُ المُؤْمِنَ عُمْرُهُ إلاَّ خيْراً).

ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازیی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەر بێ) کەستان مەرگ بە ئاوات مەخوازن، چونکە ئەوەی خوی باشەو پیاوچاکە سا بەڵکوو باشتر دەبێو پتر چاکە دەکا، ئەوەیشی خۆی خراپەو پیاو خراپە سا بەشکوو خودای گەورە مۆڵەتی بدا تا تەوبە دەکاو دەگەڕێتەوە! (ش) ئەمە گفتی بوخارییە، گێڕانەوەی موسلیم ئاوایە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازیی بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کەستان خۆزگە بۆ مردن نەخوازێو بەر لەوەی خۆی بێ داوای

[١٧١] بوخاری (٥٦٧٣)و موسلیم (٢٦٨٢).

نەكا، چونكە كە مرد كردەوەی دەبڕێتەوە، تەمەنی درێژیش بۆ موسوڵمان هەر خێری پتر دەكا.

٥٨٦/٢[١٧٢]- وعن أنسٍ (رضي اللّٰه عنه)قال : قالَ رسولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): لا يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ المَوْتَ لِضُرّ أَصابَهُ فَإنْ كانْ لابُدَّ فاعِلاً، فَلْيَقُل : اللّٰهُمَّ أحْيِني ما كانَتِ الحَياةُ خَيْراً لي، وتَوَفَّني إذا كانَتِ الوفاةُ خَيراً لي) متفقٌ عليه.

٥٨٧/٣[١٧٣]- وعَنْ قَيسِ بن أبي حازمٍ قال : دَخَلْنا عَلى خَباب بنِ الأَرَتِّ (رضي اللّٰه عنه)نَعُودُهُ وَقَدِ اكْتَوى سَبْعَ كَيَّاتٍ فقال : إنَّ أَصْحابنا الّذِينَ سَلَفُوا مَضَوْا، ولَم تَنْقُصْهُمُ الدُّنْيا، وإنَّا أَصَبْنَا ما لا نَجِدُ لَهُ مَوْضِعاً إلاَّ التراب ولَوْلاَ أنَّ النَّبيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)نهانَا أنْ نَدْعُوَ بالمَوْتِ لَدعَوْتُ بِهِ ثُمَّ أَتَيْناهُ مَرَّةً أُخْرَى وهُوَ يَبْني حائطاً لَهُ، فقال : إنَّ المُسْلِمَ لَيُؤْجَرُ في كُلِّ شَيءٍ يُنْفِقُهُ إلاَّ في شَيءٍ يَجْعَلُهُ في هذا التراب. متفقٌ عليه، وهذا لفظ رواية البخاري.

قەیس (خوا لێی ڕازیی بێ) فەرمووی: چووین بۆلای خەبباب، نەخۆش بوو، سەرمان لێ دا، لە حەوت لاوە سكی خۆی داخ كردبوو، فەرمووی: ئەو هاوڕێیانەمان كە سەریان نایەوەو لەدونیا دەرچوون لە پێش ئێمەوە، دونیا لە پاداش و پایەی بەرزی ئەوانی هیچ كەم نەكردەوە، وەڵێ ئێمە ئەوەندە ماڵو سامانمان دەست كەوتووە لە خاكا نەبێ جێگەی نابێتەوە (مەگەر لەترسی دزو درۆزن لەناو خاكا بیشارینەوە) پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) یاساخی كردووە لێمان كە مەرگ بە ئاوات بخوازین، ئەگینا مەرگی خۆم بە ئاوات دەخواست، لەوەودوا جارێكی تریش چووینەوە بۆلای، خەریك بوو دیوارێكی خۆی دروست دەكرد، فەرمووی: موسوڵمان هەرچی صەرف بكاو مەبەستی ڕەزای خودا بێ پاداشی باشی لەسەر وەردەگرێ، مەگەر شتێ لە خۆڵو قوڕدا خەرج بكرێو بۆ خانوو صەرف بكرێ (ش).

## ٦٨ – باسی پارێزو سڵ كردن لە گوناهو دوورگرتن لەشتی گوماندار
## باب الورع وترك الشبهات

قال اللّٰه تعالى: { وتحسبونه هيناً وهو عند اللّٰه عظيم } .

---

[١٧٢] بوخاری (٥٦٧١)و موسلیم (٢٦٨٠) بڕوانە (ژمارە: ١٦/٤٠ز- ٣)

[١٧٣] بوخاری (٥٦٧٢)و موسلیم (٢٦٨١).

**واتـه: ئێـوه ئـهو بوختانـه گهورهیـه بـه شـتێكی سـووكو ئاسـان دادهنـێنو كردووتانه به بنێشتهی خۆشهی خۆتـان، وهلحـاڵ ئـهوه لای خـودای گـهورهو مـهزن دادهنرێت به تاوانێكی زۆر زل.**

وقال تعالى: { إن ربك لبالمرصاد }.

**واته: خودا واله كهمينى تاوانباردا، هاكا تهقانى به بناگوێدا.**

٥٨٨/١[١٧٤] - وعن النُّعمان بن بَشيرٍ رضيَ اللَّه عنهما قال : سمِعْتُ رسُولَ اللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يقُولُ : (إنَّ الحَلاَلَ بَيِّنٌ، وإنَّ الحَرامَ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهمـا مُشْـتَبِهاتٌ لاَ يَعْلَمُهُـنَّ كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ، فَمَن اتَّقَى الشُّبُهاتِ، استْبَرَأَ لِدِينِهِ وعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ في الشبُهاتِ، وقَـعَ في الحَرامِ، كَالرَّاعي يرْعى حَوْلَ الحِمى يُوشِكُ أَنْ يَرْتَع فِيهِ، أَلاَ وإنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى، أَلاَ وَإنَّ حِمَى اللَّهِ مَحارِمهُ، أَلاَ وإنَّ في الجسَدِ مُضغَةً إذا صَـلَحَت صَـلَحَ الجسَـدُ كُلُّـهُ، وَإذا فَسَدتْ فسدَ الجَسَدُ كُلُّهُ : أَلاَ وَهِي القَلْبُ) متفقٌ عليه. ورَوَياه مِنْ طُرُقٍ بأَلْفاظٍ مُتَقارِبَةٍ.

**نوعمـانی كـوڕی بهشـير** (رهزای خودای لێ بێ) **فـهرمووی: بـهگوێی خـۆمـم بيسـتم لـهزاری پێغهمبهر (درودو سلاوی خودای گـهورهی لێ بـێ) دهيفـهرموو: شـتی حـهڵاڵ ديـارو ئاشكرايهو بۆخۆی هاوار دهكا كه حهڵاڵه، حهراميش بهههمان شێوه، بهڵام لهم نـاو بهينهدا ههندێ شت هـهن دووبـهينينو لهههنـدێ ڕووهوه هـهردوولا دهچـن، لهبـهر ئـهوه گـهلێ كـهس حوكمهكـهيان نـازانن (بـهڵام زانايـانی ئـايين لـهپاش پـهيجۆریو لێكۆڵينهوهيـهكی بـاش حوكمهكـهيان دهدۆزنـهوهو بڕيـار دهدهن كـه حـهڵاڵن يـان حهرامن) جا ئهوهی كه خـۆی بپـارێزێ لـه شـتی شوبههدارو گومـان لێكـراو، ئـهوه ئايينو نامووسی خـۆی لهنـهنگـو لكه دهپـارێزێ. بـهڵام ئـهوهی كـه تـووخنی شـتی شـوبههدارو گومـان لێكـراو دهكـهوێ خوانهخواسـته تووشـی دهبـێ بـه شـتی حهراميشهوه، وهك چۆن شوان ئهگهر ران له دهوروبهری پاكژو پاوهنـد بلـهوهڕێنێ بهرهبهره رانهكه له پاوهندهكهيش دهلهوهڕێ. باش ئاگادارين! كـه هـهموو پادشـايێ بهستو پاوهندێكی تايبهتی خۆی ههيه، بزانن كه بهستو پاوهنـدی خـودايش ئـهو شتانهيه كه حهرامی كردوون!**

---

[١٧٤] بوخاری (٥٢)و موسليم (١٥٩٩)

باش ئاگاداربن كه گوڵمەیەك گۆشت هەیە لەناو جەستەدا ئەگەر ئەو گوڵمە گۆشتە سازو باش بوو ئەوا جەستەیش هەمووی سازو باش دەبێ، بەڵام ئەگەر ئەو گوڵمەیە خراپ بوو ئەوا جەستەیش هەمووی خراپ دەبێ، بزانن كە ئەو گوڵمەیە بریتیە لە دڵ، دڵی پاكو جەستەی پاك دڵی پیسو جەستەی ناپاك (ش).

٢/٥٨٩[175]- وعن أنس (رضي اللّه عنه)أَنَّ النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)وَجدَ تَمْرَةً في الطَّرِيقِ، فقالَ: (لَوْلاَ أَنِّي أَخافُ أَنْ تَكُونَ مِنَ الصَّدَقَةِ لأَكَلْتُها). متفقٌ عليه.

ئەنەس (خوا لێی رازیی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر لەسەرڕێی دەنكێ خورمای دۆزییەوە فەرمووی: نەبادا هی زەكات بێ ئەگینا دەیمخوارد (ش).

٣/٥٩٠[176]- وعن النَّوَّاسِ بن سَمعانَ (رضي اللّـه عنـه)عـن النَّبـيّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم)قال : (البِرُّ حُسنُ الخُلُقِ وَالإِثمُ ما حاكَ في نفْسِكَ، وكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلعَ عَلَيْهِ النَّـاسُ) رواه مسلم.

نەواسی كوڕی سەمعان (خوا لێی رازیی بێ) فەرمووی: لەبارەی چاكەو خراپەوە لە پێغەمبەرم پرسی (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: چاكە بریتیە لەخوی شیرینو رەفتاری جوان! زۆربەی چاكە برییتیە لەرەوشت بەرزیی، خراپەیش بریتیە لەو شتەی دڵ ئاوی پێ ناخواتەوە لێی دوو دڵیت كە بێگەردە یان نا، لەبەر ئەوەی حەز ناكەی كەس پێی بزانێ! (م).

٤/٥٩١[177]- وعن وابصةَ بنِ مَعْبِدٍ (رضي اللّه عنه)قال : أَتَيْتُ رسولَ اللّـه (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)فقال: (جِئْتَ تسأَلُ عنِ البِرِّ ؟) قلت : نعم، فقال : (اسْتَفْتِ قَلْبَكَ، البِرُّ : ما اطْمَأَنَّتْ إِلَيْهِ النَّفْسُ، واطْمَأَنَّ إِلَيْهِ القَلْبُ، والإِثمُ ما حاكَ في النَّفْسِ وتَرَدَّدَ في الصَّدْرِ، وإِنْ أَفْتَاكَ النَّاسُ وَأَفْتَوكَ) حديثٌ حسن، رواهُ أحمدُ، والدَّارَمِيُّ في (مُسْنَدَيْهِما).

وابیصەی كوڕی مەعبەد (خوا لێی رازیی بێ) فەرمووی: چوومە خزمەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: دەزانم هاتووی لەسەرچاوەی چاكە دەپرسیت، گوتم: بەڵێ وایە، فەرمووی: پرسیار لەدڵی خۆت بكەو رای دڵی خۆت وەربگرە، دڵ پێش ئەوەی

---

(175) موسلیم (٢٠٥٥)و موسلیم (١٠٧١).

(176) موسلیم (٢٥٥٣).

(177) المسند للأمام أحمد ٢٨٨/٤ وسنن الدرامی ٢٤٥/٢ — ٢٤٦.

تاوان نووری بکوژێنێتەوە، بەسروشت هەست بەچەشنی چاكو خراپ دەكا، لەگەڵ ئەوەیشدا چاكە ئەوەیە دڵو دەروون متمانەی پێ بكەن، گوناهیش ئەوەیە كە لە دەروونا جێی نەبێتەوە، دڵ پێی نەكرێتەوەو ببێ بەهۆی دوو دڵیو دڵەڕاوكێ، سەرەڕای ئەوەیش نەفامو نەزانەكانیش ڕای لەسەر دەدەنو پێت دەڵێن: ئەمە هەقەو بەهەڵە فەتوا لەسەر فەتوات بۆ دەدەن! ئەوەوی دەفەرموێ: فەرموودەیەكی جوانە، ئیمامی ئەحمەدو شێخی داریمی (رەزای خودایان لێ بێ) لە دوو موسنەدەكەی خۆیاندا گێڕاویانەتەوە.

٥٩٢/٥[١٧٨] وعن أبي سِرْوَعَةَ بكسر السين المهملة وفتحها عُقْبَةَ بنِ الحارِثِ (رضي اللّٰه عنه)أَنَّهُ تَزوَّجَ ابْنَةً لأبي إهاب بن عَزيز، فأَتَتْهُ امْرَأَةٌ فقالت : إنِّي قَد أَرْضَعْتُ عُقْبَةَ وَالتي قَدْ تَزوَّجَ بها، فقال لَها عُقبةُ : ما أَعْلَمُ أَنَّكِ أَرضَعْتِني وَلاَ أَخْبَرتِني، فَرَكبَ إلى رسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّم)بالمَدِينَةِ، فَسَأَلَهُ، فقال رسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّم): (كَيْفَ، وَقَدْ قِيلَ ؟،) ففارقَهَا عُقْبَةُ ونكَحَتْ زَوْجاً غيرَهُ. رواهُ البخاري.

ئەبو سیروەعە فەرمووی: عوقبەی كوڕی حاریث (خوا لێی ڕازیی بێ) فەرمووی: ژنێكم مارە كرد، كچی ئەبو ئیهابی كوڕی عەزیز بوو، كەچی ئافرەتێكی ڕەشمان لێ پەیدا بوو دەیگوت: مەمكم داوە بەهەردووكتان، منیش پێیم گوت: من تا ئێستا ئاگام لەشتی وا نییە كە تۆ مەمكت بەمن دابێ، وە بەمنیشت نەگوتووە، جا هەڵسامو سووار بووم چووم بۆ مەدینە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ئەمەم عەرزی كردو گوتم: ئەم ژنە درۆ دەكا، كەچی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ڕووی كرد بەولاوە، منیش لەولاوە چوومە بەردەمیو عەرزیم كردەوە: ئەم ژنە درۆ دەكا. جا فەرمووی: چی لێ دەكەی ئەو بە قسەی خۆی دەڵێ گوایە شیری داوە بەهەردووكتان ئیتر چۆن لەگەڵ ئەو ژنەدا دڵت بەرایی دەدا كۆببیتەوە، واز لەو ئیشە بێنە، گوتی: ئیتر لێی جیابوومەوەو بۆ دڵنیایش تەڵاقم دا ئەویش شووی كرد بەكابرایەكی تر (بوخاری/تاج).

---

[١٧٨] بوخاری (٨٨).

٥٩٣/٦(١٧٩) - وعن الحَسَنِ بن عَليّ رضيَ اللّهُ عنهما، قال : حَفِظْتُ مِنْ رَسُول اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (دَعْ ما يَرِيبُكَ إلى مَا لا يرِيبُك) رواهُ الترمذي وقال حديث حسن صحيح.

لەباسی (باب الصديق)دا رابورد، فەرموودەی (دع ما يريبك الى...) بڕوانە: (٢/٥٥ز - ٤).

٥٩٤/٧(١٨٠) - وعن عائشةَ رضيَ اللّهُ عنها، قالت : كانَ لأبي بَكْرٍ الصَّدِّيق، (رضي اللّه عنه)غُلامٌ يُخْرِجُ لَهُ الخَرَاجَ وكانَ أبو بَكْرٍ يأْكُلُ مِنْ خَرَاجِهِ، فَجاءَ يَوماً بشَيءٍ، فأَكَلَ مِنْهُ أَبو بَكْرٍ، فَقَالَ لَهُ الغُلامُ : تَدْرِي مَا هَذا ؟ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: وما هُوَ ؟ قَالَ : كُنْتُ تَكَهَّنْتُ لإنْسَانٍ في الجاهِلِيَّةِ ومَا أُحْسِنِ الكَهَانَةَ إلاّ أَنّي خَدَعْتُهُ، فَلَقِيني، فَأَعْطاني بذلك هَذَا الذي أَكَلْتَ مِنْهُ، فَأَدْخَلَ أَبُو بَكْرٍ يَدَه فقَاءَ كُلَّ شَيءٍ في بَطْنِهِ، رواه البخاري.

عائیشە (خودا لێی خۆشنوود بێ) فەرمووی: باوکم ئەبوبەکری صەدیق (خوا لێی ڕازیی بێ) غوڵامێکی هەبوو، ڕۆژانەی دەدا بە ئەبوبەکر ئیتر هەرچی تری پەیدا دەکرد بۆ خۆی بوو، ئەبوبەکریش گەلێ جار لەو ڕۆژانەیەی دەخوارد، ڕۆژێ غوڵامەکە لەباتی ڕۆژانەکەی سەری شتێکی بۆ هێنا، ئەویش لێی خوارد، جا غوڵامەکەی پێی گوت: دەزانی ئەمە چییە؟ فەرمووی: بۆچی چی بوو؟ گوتی: لەسەردەمی نەفامی (نەزانی: جاهلیەت)دا، جارێ فالّم بۆ مرۆڤێ گرتەوەو گەرچی فالگرتنەوەیش باش نازانم، بەڵام خۆم لێ کرد بە کوڵە نانی (کاهین)و خەڵەتانم، جا تووشی بووم لەباتی ئەوە ئەم شتەی دا پێم کەوا تۆ لێت خوارد، ئەمەی تۆ خواردت بەفاڵ گرتنەوەو بە فێڵ پەیدا کراوە، ئیتر ئەبوبەکر پەنجەی کرد بە قوڕگی خۆیاو خۆی ڕشانەوەو هەرچی لەناو سکیدا بوو هەڵی هێنایەوە! (ب).

٥٩٥/٨(١٨١) - وعن نافِعٍ أَنَّ عُمَرَ بنَ الخَطَّابِ (رضي اللّه عنه)، كَانَ فَرَضَ للْمُهاجِرِينَ الأَوَّلِينَ أَربَعَةَ آلافٍ، وفَرَضَ لابْنِهِ ثلاثَةَ آلافٍ وخَمْسَمائةٍ، فَقِيلَ لَهُ : هُوَ مِنَ المُهاجِرِينَ فَلِم نَقَصْتَهُ؟ فقال : إنَّما هَاجَر بِهِ أَبُوه يَقُولُ : لَيسَ هُوَ كَمَنْ هَاجَرَ بِنَفْسِهِ. رواهُ البخاري.

(١٧٩) تيرميذي (٢٥٢٠).

(١٨٠) بوخاری (٣٨٤٢).

(١٨١) بوخاری (٣٩١٢).

نافع (خوا لێی ڕازیی بێ) فەرمووی: عومەری کوڕی خەتتاب (خۆشنوودی خودای لەسەر بێ) کاتێ جێنشین (خەلیفە) بوو، بۆ کۆچەرە پێشینەکان سەری چوار هەزار درەمی مووچەو بەرات بڕینەوە، بەڵام بۆ عەبدوڵڵای کوڕی سێ هەزارو پێنج سەد درەمی مووچە بۆ بڕیبۆوە، جا پێیان گوت: خۆ ئەویش لە کۆچکارانە وەك ئەوان لە مەککەوە، بۆ پاراستنی ئایینی خۆی، کۆچی کردووە بۆ لای پێغەمبەری خودا لە مەدینەی پیرۆز، کەواتە بۆ کەمی بۆ دادەنێی؟ فەرمووی: ئاخر ئەو دایكو باوکی کۆچیان پێ کردووەو لەکاتی کۆچ کردندا منداڵ بووەو شوێن دایكو باوکی کەوتووە، واتە: مەبەستی عومەر (خوا لێی ڕازیی بێ) ئەوە بوو ئەو کەسەی بەهۆی کەسێکی ترەوە کۆچی کردبێ وەکوو ئەوە نییە کە سەربەخۆ خۆی کۆچی کردبێ، لەبەر ئەوە بۆ دووربینی (احتیاط) کەمتری بۆ دادەنا (ب).

٥٩٦/٩[١٨٢] - وعن عطِيَّةَ بنِ عُرْوَةَ السَّعْدِيِّ الصَّحَابِيِّ (رضي اللّٰه عنه)قالَ. قال رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)(لايبلغ العبدُ أَنْ يكون من المتقين حتى يَدَعَ مالا بَأْس بِهِ حَذراً مما بِهِ بَأْسٌ )). رواهُ الترمذي وقال : حديثٌ حسن.

عەطییە (خوا لێی ڕازیی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: بەندە هەتا لەترسی ئەوەی کە تووشی خراپە نەبێ واز لەهەندێ شتی تریش نەهێنێ، کە بە ظاهیری شەرع ڕەوایە بێ گەردەو دروستە، بەندە هەتا لەترسی خودا ئەمە حاڵی نەبێ، ناگاتە پایەو پلەو ریزی بەرزی پیاوچاکانو تەقواکاران! (ت:ح/ح).

## ٦٩ – گۆشەگیریی لەکاتی خراپ بوونی خەڵكو ڕۆژگارا سوننەتە، هەروا لەترسی ئاژاوەی ئایینیو تووشبوونی نارەواییو شتی گوماندارو ئەم جۆرە شتانە

## باب استحباب العزلة عند فساد الناس والزمان أو الخوف من فتنة في الدين أو وقوع في حرام وشبهات ونحوها

قال اللّٰه تعالى: { ففروا إلى اللّٰه إنّي لكم منه نذير مبين } . (الذاريات/٥٠).

واتە: لەدەست هەموو شتێکی خراپو لەتاو تۆڵەی سەختی خراپەو تاوان تا زوو لەدەستیان ڕابکەنو ڕوو لەتاعەتی خودا بکەن، درەنگە، من زۆر باش لەم لایەنەوە ترستان دەخەمە بەر.

[١٨٢] تیرمیذي (٢٤٥٣).

٥٩٧/١[١٨٢]- وعن سعد بن أبي وقّاص (رضي اللّه عنه)، قال : سَمِعْتُ رَسُولَ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يَقُول: (إنَّ اللّه يحِبُّ العَبدَ التَّقِيَّ الغَنِيَّ) رواه مسلم.

سەعد (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: خودا بەندەی لەخودا ترسی دەوڵەمەندی شاراوەی خۆش دەوێ! (م) ئیمامی نەوەوی (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: مەبەست لە دەوڵەمەندیی دڵتێریی‌و دەوڵەمەندیی دەروونە وەك لە فەرموودەیەکا لە پێشەوە رابورد.

٥٩٨/٢[١٨٤]- وعن أبي سعيد الخُدريِّ (رضي اللّه عنه)قال : قال رَجُلٌ أَيُّ النَّاس أفضَلُ يارسولَ اللّه ؟ قال : (مُؤْمِنٌ مجَاهِدٌ بِنَفسِهِ وَمَالِهِ في سبيل اللّه) قال : ثم من ؟ قال : (ثم رَجُلٌ مُعتَزِلٌ في شِعْبٍ مِن الشِّعَاب يَعبُدُ رَبَّهِ). وفي روايةٍ (يتَّقِي اللّه. ويَدَع النَّاسَ مِن شَرِّهِ) متفقٌ عليه.

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ عەرزی حەزرەتی کرد: قوربان! ئەی رەوانە کراوی خودا! کام کەسە پایەی هەرە بەرزە؟ فەرمووی: ئەو موسوڵمانەی کە بەسەرو بە ماڵ لەرێگەی خودادا غەزا بکا یان لە پێناوی سەربەرزیی ئایینا بەگیان‌و بە سامان تێبکۆشێ، گوتی: ئەی لە پاش ئەو کێی تر پایەی لەلای خودا زۆر بەرزە؟ فەرمووی: ئەو موسوڵمانەی کەلە پەنایەکا خودای خۆی بەجوانی دەپەرستێ‌و لە قەرەباڵغی کەنار دەگرێ، لە گێرانەوەیەکا، وە لە خودای خۆی دەترسێ‌و ئازاری کەسیش ناداو شەری خۆی لەمەردووم لادەدا (ش).

٥٩٩/٣[١٨٥]- وعنه قالَ : قال رسولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (يُوشِكُ أَنْ يَكُونَ خَيْرَ مَالِ الُمسْلِم غَنَمٌ يَتَّبَّعُ بهَا شَعَفَ الجِبَال. ومواقِعَ القَطْرِ يَفِرُّ بِدينِهِ مِن الفِتَنِ) رواه البخاري:

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هاکا ئەو رۆژە هات کە مەردووم دەکەونە چەرخێکی خراپی واوە پیاوی موسوڵمان لەبەر ئاژاوەی زۆرو لەتاو ئاشووب‌و فەرتەنە بەئایینی خۆیەوە رەو دەکاو هەڵدێ‌و شوێن ئاژەڵ‌و

[١٨٢] موسلیم (٢٩٦٥)، بڕوانە (٥٢٢).

[١٨٤] بوخاری (٢٧٨٦)و موسلیم (١٨٨٨).

[١٨٥] بوخاری (١٩).

گەلەڕانی خۆی دەکەوێ‌و بە لوتکەی شاخەکان‌و بە لەوەڕگاکانەوە گڕیان دەدا، ئەم ڕانە لەو ڕۆژەدا باشترین ماڵی ئەو موسوڵمانە گۆشەگیرەیە! (ب).

٦٠٠/٤[١٨٧]- وعنْ أبي هُريرة (رضي اللّه عنه). عن النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال : (ما بَعثَ اللّه نَبيًّا إلاّ رَعَى الْغَنَمَ) فَقَال أَصْحابُه : وَأَنْتَ ؟ قَالَ : (نَعَمْ، كُنْت أَرْعَاهَا عَلى قَرارِيطَ لأَهْلِ مَكَّةَ) رواه البخاري.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەموو پێغەمبەرێ کە خودا ڕەوانەی کردبێ شوانی ڕانی کردووە! یارانیشی (رەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: هەتا تۆیش؟ فەرمووی: بەڵێ منیش، بەچەند قرانێ ڕانم بۆ خەڵکی مەککە دەلەوەڕاند! (بوخاری، ڕەحمەت لە گۆڕی نازداری).

٦٠١/٥[١٨٧]- وعنه عَنْ رسولِ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)أنه قـال : (مِـنْ خَـيرِ مَعَـاشِ النَّاسِ رَجُلٌ مُمْسِكٌ عِنَانَ فَرسِهِ في سَبِيلِ اللّه، يَطيرُ عَلى مَتنِه، كُلَّمَا سَمِعَ هَيْعَةً أَوْ فَزْعَةً، طارَ عَلَيْهِ يَبْتَغِي الْقَتلَ، أَو المَوْتَ مظَانَّه، أَوْ رَجُلٌ في غُنيمَةٍ في رَأْسِ شَعَفَةٍ مِن هَذهِ الشَّعَفِ، أَوْ بطنِ وادٍ مِن هَذهِ الأَوديَةِ، يُقِيم الصَّلاةَ ويُؤتي الزَّكاةَ، ويَعْبُد رَبَّهُ حتَّى يَأْتِيَهُ اليَقِينُ لَيسَ مِنَ النَّاسِ إلاَّ في خَيْرٍ) رواه مسلم.

دیسان فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: باشترین گوزەرانی مەردووم گوزەرانی ئەو پیاوەیە، کە شێرانە جڵەوی ماینەکەی بەدەستەوەبێ‌و هەمیشە ئامادە بێ بۆ غەزا لەڕێگەی خودادا، هەر کە لەگەڵ هاوارێ، یان هاتوهاوارێکی بەر گوێ کەوت گورج فڕکەی لێ بکاتە سەرپشتی ماینەکەی‌و کۆ لە مردن‌و کوشتن نەکاتەوەو کوێ خەتەرو مەترسی لێ بکرێ خۆی بۆ بکوتێ، وەها ئاشقی شەهیدبوون بێ، یان گوزمرانی ئەو پیاوەیە کە برکێ ئاژەڵی وردەی هەیە، لە لوتکەی شاخێکدا، یان لەناو دۆڵێ لەم دۆڵانەدا بەخێویان دەکاو دوور دەگرێ لەخراپەو خراپەکاران، لەگەڵ ئەوەشدا نوێژێکی جوان دەکاو خۆ بەباشی زەکات دەداو ئاوا خودای خۆی دەپەرستێ هەتا مردن – کە شتێکی ڕوون‌و ئاشکراو بێ گومانە لەسەر ئەو حاڵە باشە – دەگاتە سەری، لەو ماوەیەدا دەخڵی بەسەر کەسەوە نییە، مەگەر بەچاکە! (موسلیم، ڕەزای خودای لێ بێ).

---

(١٨٧) موسلیم (١٨٨٩).

(١٨٧) موسلیم (١٨٨٩).

**٧٠ - باسی خێری تێكەڵی‌و هامشۆی یەكتریی‌و حازربوونی جومعەو جەماعەت‌و كۆمەڵگای خێری مەردووم‌و كۆڕی زانست‌و یادو زیكریان‌و سەردان لە نەخۆشیان‌و ئامادەبوونی تەرمی مردوویان‌و یارمەتی‌و دڵدانەوەی نەداراو ئاتاجیان‌و شارەزاكردنی نەزانیان‌و وێنەی ئەمانەو شتی تریش كە سوودی كۆمەڵ‌و ئادەمیزادی تیابێ. وەك فەرمان كردن بەچاكەو جڵەوگیری لە خراپە. بۆ كەسێ توانای ئەوەی هەبێ. وە خۆ دووربگرێ لە ئازاردان‌و ئارام بگرێ لەسەر ئازاری خەڵك:**

**باب فضل الاختلاط بالناس وحضور جمعهم وجماعاتهم ومشاهد الخير ومجالس الذكر معهم وعيادة مريضهم وحضور جنائزهم ومواساة محتاجهم وإرشاد جاهلهم وغير ذلك من مصالحهم لمن قدر على الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر وقمع نفسه عن الإيذاء والصبر على الأذى.**

يقول المؤلف الإمام النووي (رضوان الله تعالى عليه): اعْلم أَن الاخْتِلاط بالنَّاس على الوَجْهِ الذي ذَكَرْتُهُ هو المختار الذي كان عليه رسول اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)وسائرُ الأَنبياءِ صلواتُ اللّهِ وسلامُه عليهم، وكذلك الخُلفاءُ الرَّاشدونَ، وَمَنْ بعدهُم من الصَّحَابةِ والتَّابعينَ، ومَنْ بَعدَهُم من عُلَمَاءِ المسلمينَ وأَخْيارهم، وهو مَذْهَبُ أَكْثَرِ التَّابعينَ ومَنْ بعدَهُم، وَبِهِ قَالَ الشَّافعيُّ وأَحْمَدُ، وأَكْثَرُ الفُقَهَاءِ رضي اللّه عنهم أجمعين:

ئیمامی نەوەوی (ڕەزای خودای گەورەی لێ بێ‌و پڕ گۆڕی پیرۆزی لەنوورو ڕەحمەتی خودای مەزن بێ) دەفەرموێ: ئەی برای موسوڵمان! بزانە تێكەڵی‌و ئاموشۆ‌و گوزەران لەگەڵ مەردوومدا لەسەر ئەو شێوەیەی كە گوتمان پەسەندی خوداو پێغەمبەروگشت پێغەمبەرەكانی ترە (درووودەكانی خوداو ڕەحمەت‌و میهری خودایان لێ بێ) هەروا پەسەندو هەڵبژاردەی جێنشینە شارەزاكان‌و یارانی پێغەمبەرو چینی دووەمی موسوڵمانان (كە پێیان دەگوترێ تابیعین)و زانایان‌و پیاوچاكانی موسوڵمانانە، لەهەموو چەرخێكا، هەروا،، ڕێباز (مذهب)ی ئیمامی شافیعی‌و ئیمامی ئەحمەدو زۆربەی زۆری زانا شەرعزانەكان، خۆشنوودی خودا لەهەموویان بێ.

قال تعالى : { وتَعاوَنُوا عَلَى البِرِ والتَّقْوَى } ﴿ المائدة : ٢ ﴾ والآيات في معنى ما ذكرته كثيرة معلومة.

ئیمامی نەوەوی بۆ چەسپاندنی فەرمایشتەكەی خۆی ئەم ئایەتە دەكا بەشایەت‌و بەڵگەو دەفەرموێ: ئەوەتا خودای مەزن ئەمە دچەسپێنێ‌و دەفەرموێ: ئەی موسوڵمانینە! پشتی یەكتری بگرن‌و لەسەر كاری چاكەو كردەوەی باش گەلەوەرز بكەن‌و بەكۆمەڵی هەموو خێرو باشەیێ بكەن!. هەروەك گەلێ ئایەتی پیرۆزی تر لەم بابەتەوە هەیەو زاناكان دەیانزانن!

### ٧١ - باسی بێ هەوایی‌و خاکیتی‌و ملکەچ کردن بۆ موسوڵمانان:
### باب التواضع وخفض الجناح للمؤمنين

قال اللّٰه تعالى: { واخفض جناحك لمن اتبعك من المؤمنين } . (الشعراء/٢١٥)

ئەی پێغەمبەری بەڕێزو خۆشەویست! ببە بە سەرمەشقێکی جوان بۆ گەلی خۆت‌و باڵی میهرەبانیی خۆت بۆ موسوڵمانان دانەوێنەو نەرم‌و نیان بە لەگەڵیان.

وقال تعالى: { يا أيها الذين آمنوا من يرتد منكم عن دينه فسوف يأتي اللّٰه بقوم يحبهم ويحبونه، أذلة على المؤمنين أعزة على الكافرين } . (المائدة/٥٤).

ئەی کەسانێ باوەڕتان هێناوە! بە ئیسلام هەرکەسێ لەئێوە لە ئیسلام هەڵگەڕێتەوە بزانن ئیسلام بەوە نافەوتێ، ئیسلام ئایینی خودایە، خودا خۆی لە فەوتان دەیپارێزێ، بەڵکوو خودا بەڕەحمەتی خۆی لەباتی ئەوان کۆمەڵێ دێنێ بۆ سەر ئەم ئیسلامە، کە خودا ئەوانی خۆش دەوێ‌و ئەوانیش خودایان خۆش دەوێ، نیشانەیان ئەمەیە لەگەڵ موسوڵمانانا نەرم‌و نیان‌و لەئاستیان گەردن کەچن، بەڵام لەگەڵ بێ بڕواو خودانەناسانا تا بڵێی بەزەبرو زەنگ‌و زاڵ‌و نەبەردو توندوتیژن.

وقال تعالى: { يا أيها الناس إنا خلقناكم من ذكر وأنثى، وجعلناكم شعوباً وقبائل لتعارفوا" إن أكرمكم عند اللّٰه أتقاكم } . (الحجرات/١٣).

واتە: ئەی مەردووم! ئێوەمان دروست کردووە لە پیاوێك‌و ژنێ، کە ئادەم‌و حەووان، وە ئێوەمان کردووە بە چەند گەل‌و هۆزو نەتەوەیێ، هەتا لەناو خۆتانا ببن بە دۆست‌و ناسیاوی یەکتری‌و هۆگری یەکتر ببن، ئەمە بارو حاڵی رەگەزو بنەچەتانە، هەموو چڵ‌و پەل‌و لقی یەك درەختی دوو پەلن، لەلای خودای گەورەیش ئەو کەسەتان زۆر بەڕێزو نازدارە کە پتر لەخودا دەترسێ‌و خۆی لەبێ گوێیی ئەو زاتە مەزنە دەپارێزێ.

وقال تعالى: { فلا تزكوا أنفسكم هو أعلم بمن اتقى } . (النجم/٣٢).

واتە: نەپەسن‌و مەدحی خۆتان بکەن‌و نە بە کارو کردەوەتان فیزو دەعیە بکەن‌و نەخۆتان بەبێ تاوان‌و بێ گەرد دابنێن، خودا خۆی زۆر باش بەندەی خۆی دەناسێ، ئیتر چ پێویست بەخۆ هەڵکێشانی درۆیە.

وقال تعالى: { ونادى أصحاب الأعراف رجالاً يعرفونهم بسيماهم قالوا: ما أغنى عنكم جمعكم وما كنتم تستكبرون، أهؤلاء الذين أقسمتم لا ينالهم اللّٰه برحمة؟! ادخلوا الجنة لا خوف عليكم ولا أنتم تحزنون} . (الأعراف/٤٨-٤٩).

واته: خەڵكی ئەعراف، - ئەعراف بریتیە لە چڵەپۆپەی ئەو شورایەی کە لە نێوانی دۆزەخو بەهەشتدایە، - بانگی پیاوگەلێ دەکەنو پێیان دەڵێن: کوا کۆمەڵو تاقمەکەتان کە پێیانەوە دەنازین، کوا کەشو فشەکەتانو مایەی فیزو دەعیە زلییەکەتان، دیارە ئەوە هەمووی هیچو پووچ بوو بە دەردی ئەم رۆژەتان ناخوا، ئەوەتانێ ئەو کۆمەڵە موسوڵمانە هەژارانە کە ئێوە سوێنی قورستان دەخواردو دەتانگوت: خودا رووی رەحمەت لەمانە ناکا، ئەوەتانێ ئەو هەژارانە بەهەشتیان بۆ ئامادە کراوە، ئێوەش ئەمە حاڵتانە، لەسایەی خوداوە بەکوێرای چاوی ئێوەوە لە هەموو لایەکەوە فەرموویان لێ دەکرێو پێیان دەفەرموون: بفەرموون بە خێرو خۆشیو بەڕوسووریو سەربەرزییەوە بەبێ ترسو بەبێ خەمو خەفەت بڕۆنە ناو بەهەشتەوە، خەڵکی ئەعراف ئەوە پیاوگەلە بەدبەختە بەشێوەی دزێو چارەی بەدیانا دەناسنەوە.

٦٠٢/١[١٨٨]- وعنِ عِيَاضِ بنِ حِمَارِ (رضي اللّٰه عنه)قال : قال رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (إنِ اللّٰه أَوحَى إِلَيَّ أَنْ تَوَاضَعُوا حتى لا يَفْخَرَ أَحَدٌ عَلَى أَحدٍ، ولا يَبغِيَ أَحَدٌ على أَحَدٍ) رواه مسلم.

عیياضی کوڕی حیمار (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خودا سروشی بۆ ناردووم: کە گەلێ خاکیو بێ هەوا بنو خۆتان بە کەم بگرن، بەجۆرێکی وا کە کەس شانازی بەسەر کەسا نەکاو، کەس زۆرو ستەمو ناهەقی لەکەس نەکا (م).

٦٠٣/٢[١٨٩]- لەباسی (الكرم والجود)دا رابورد، فەرموودەی: (وما نقصت صدقة من مال...) بڕوانە (١٤/٥٥٧ز -٦٠).

٦٠٤/٣[١٩٠]- وعن أَنسٍ (رضي اللّٰه عنه)أَنَّهُ مَرَّ عَلَى صِبيانٍ فَسَلَّم عَلَيْهِم وقال : كَانَ النَّبيّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يَفْعَلُهُ. متفقٌ عليه.

---

[١٨٨] موسليم (٢٨٦٥).

[١٨٩] موسليم (٢٥٨٨). بڕوانە: (١٤/ ٨٨٧ز -٦٠).

[١٩٠] بوخاری (٦٢٤٧)و موسليم (٢١٦٨).

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) جارێ لەلای تاقمێ منداڵەوە رەت بوو سڵاوی لێ کردن‌و فەرمووی: جارێ لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) دەڕۆیشتم، لەلای تاقمێ منداڵەوە رەت بوو سڵاوی لێ کردن (ش/تاج).

٦٠٥/٤[١٩١]- وعنه قال : إنْ كَانَتِ الأَمَةُ مِن إمَاءِ المَدِينَةِ لَتَأْخُذُ بِيَدِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، فَتَنْطَلِقُ بِهِ حَيثُ شَاءَتْ. رواه البخاري.

دیسان فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەوەندە بێ هەوا بوو، جاری وا دەبوو یەکێ لە کەنیزەکەکانی مەدینە دەستی پێغەمبەری دەگرت‌و بۆ کوێ کاری پێی هەبوایە دەیبرد بۆ ئەوێ! (ب).

٦٠٦/٥[١٩٢]- وعن الأسوَد بن يَزيدَ قال : سُئِلَتْ عَائِشَةُ رضيَ اللّه عنها : ما كَانَ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يَصنعُ في بَيْتِهِ ؟ قالت : كان يَكُون في مِهْنَةِ أَهْلِهِ يَعني : خِدمَةِ أَهلِه فإذا حَضَرَتِ الصَّلاة، خَرَجَ إلى الصَّلاةِ، رواه البخاري.

ئەسوەدی کوڕی یەزید (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە عائیشەی هاوسەری حەزرەتم پرسی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە لە ماڵەوە دەبوو خەریکی چی بوو؟ فەرمووی: خەریکی خزمەتی خێزانەکەی بوو، مەبەستی عائیشە ئەوە بوو کە حەزرەت کاتێ لە ماڵەوە دەبوو ئیشی ناو ماڵی دەکرد وەك ئەوە چێشتی دەکرد، گسکی دەدا، ئاژەڵی دەدۆشی، جلی پینە دەکرد، جلی خۆی دەدۆزیی، ئالیکی دەدا بە ئاژەڵ، وشتری ئەشکێڵ دەکرد، لەگەڵ کارەکەردا نانی دەخوارد، هەویری لەگەڵدا دەشێلا، شمەکی خۆی لەبازاڕەوە دەهێنایەوە لەماڵەوە ئەمە کاری بوو کە کاتێکیش نوێژ دەبوو دەچوو بەلای نوێژەوەو بەزوویی دەیکرد (ب/تاج).

٦٠٧/٦[١٩٣]- وعن أبي رِفَاعَةَ تَميم بن أُسَيدٍ (رضي اللّه عنه)قال : انْتَهَيْتُ إلى رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وهو يَخْطُبُ. فقلتُ : يا رسولَ اللّه، رجُلٌ غَريبٌ جَاءَ يَسْأَلُ عن دِينِهِ لا يَدري مَا دِينُهُ ؟ فَأَقْبَلَ عَليَّ رسولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وتَركَ خُطْبَتَهُ

---

[١٩١] بوخاری (٦٠٧٢).

[١٩٢] بوخاری (٦٧٦).

[١٩٣] موسلیم (٦٧٦).

حتى انتَهَى إِلَيَّ، فَأُتي بِكُرسِيّ، فَقَعَدَ عَلَيهِ، وجَعَلَ يُعَلِّمُني مِمَّا عَلَّمَه اللّه، ثم أَتَى خُطْبَتَهُ، فَأَتَمَّ آخِرَهَا. رواه مسلم.

**تەمیمی کوڕی ئوسەید** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: چووم بۆ خزمەتی حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەو کاتەدا خوتبەی دەدا، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! پیاوێکی ئاوارەو غەریبم هاتووم دەمەوێ خۆم فێری ئایینی خۆم بکەمو پرسیارم هەیە لەم لایەنەوە؟ پێغەمبەریش** (دروودی خوای لەسەر بێ) **وازی لە خوتبەی جومعەکەی هێناو هات بۆ لای منو کورسییەکیان بۆ هێناو دانیشت، لەو شەریعەتو یاسای ئایینە کە خودا فێری خۆی کردبوو منیشی فێر کردوو ئیسلام بووم، ئەوجا چووە شوێنی خۆیو دوایی وتارەکەی تەواو کرد (موسلیم — ڕەزای خودای لێ بێ).**

**٦٠٨/٧**[١٩٤] **- لەباسی (الأمر بالمحافظة على السنة)دا رابورد. فەرموودەی: (أمر بعلق الأصابع والصحة...) بڕوانە (١٦٤/٩ز -١٦).**

**لێرەدا ئەمەی پترە: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **کە شتی شلو لینجی دەخوارد بە سێ پەنجە دەیخواردو لەدواییدا ئەو سێ پەنجەیەی دەلێسایەوە.**

**٦٠٩/٨**[١٩٥] **- بڕوانە (٦٠٠/٤ز -٦٩).**

٦١٠/٩[١٩٦] - وعنهُ عن النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال : لَوْ دُعِيتُ إلى كُراعٍ أَوْ ذِراعٍ لقبلتُ. وَلَوْ أُهْدِى إِلَيَّ ذِراعٌ أَو كُراعٌ لَقَبِلْتُ) رواهُ البخاري.

**ئەبو هوڕەیرە فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەگەر خولکم بکەن بۆ سەرپاچەش دەچم، یاخود بەدیاری بۆمبێنن وەری دەگرم (ب/تاج).**

٦١١/١٠[١٩٧] - وعن أَنس (رضي اللّه عنه)قال : كَانَتْ نَاقَةُ رَسُول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)العَضْبَاءُ لاَ تُسبَقُ، أَو لا تكَادُ تُسْبَقُ، فَجَاءَ أَعْرابيٌّ عَلى قَعُودٍ لـهُ، فَسبقَها، فشَقَّ ذلك عَلى المُسْلِمِينَ حَتَّي عَرفَهُ النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)فقَالَ: (حَقٌّ عَلى اللّهِ أَنْ لا يَرْتَفِعَ شَيء مِنَ الدُّنْيَا إلاَّ وَضَعَهُ) رواهُ البخاري.

---

[١٩٤] موسليم (٢٠٣٨).

[١٩٥] بڕوانە (٦٠٠/٤ز -٦٩).

[١٩٦] بوخاری (٢٥٦٨).

[١٩٧] بوخاری (٢٨٧٢).

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) وشترە مێچکەیەکی هەبوو ناوی عەضباء بوو، لەبەر خێرایی ولاخ نەبوو پێشی بکەوێ، یان فەرمووی: مەگەر چۆنها ولاخ پێشی بکەوتایە، کەچی رۆژێ عارەبێکی بەدەوی لەو لابەلایەوە بەسواری نۆبەنە وشترێکی سرك هات پێش عەضباء کەوت، موسوڵمانەکان ئەمەیان گەلێ لەبەر گران بوو، کە حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) بەحاڵەکەی زانی، فەرمووی: بووە بە پێویست لەسەر خودا کە هەرچی لەم جیهانە، سەربەرز بکاتەوە، زوو یان درەنگ خودا سەری پێ دادەنەوێنێتەوە (ب).

**٧٢- باسی دەعیە: لەخۆبایی بوون زۆر نارەوایە - باب تحريم الكِبْر والإعجاب**

قال اللّٰه تعالى: { تلك الدار الآخرة نجعلها للذين لا يريدون علواً في الأرض ولا فسادا والعاقبة للمتقين (القصص/٨٣).

واتە: خانەی دوارۆژ ئەو خانە مەزنەیە کە تەرخانی دەکەین بۆ ئەو خاوەن باوەڕانەی خۆیان دەپارێزن لە فیزو دەعیەو لوت زلیو لەسەر زەوی ستەمو زوڵمو زۆرو خراپەو ئاژاوە بەرپا ناکەن، بزانن بڕیاری یەزدان وایە هەمیشە سەرەنجام ئەو کەسانە سەردەکەون کە تەقواکارن.

وقال تعالى: { ولا تصعر خدك للناس ولا تمش في الأرض مرحاً، إن اللّٰه لا يحب كل مختال فخور } .(لقمان/١٨).

واتە: وە هەرگیز لەبەر فیزو دەمار روو لەمەردووم گرژ مەکەو بەچاوی سووك تەماشایان مەکە، بەڵکوو هەمیشە بەپێی حاڵ روو خۆشو نەرمو نیانو ناسك بە، بەکەشو فشو لەنجەو لارەوە بەسەر زەویدا مەڕۆ لەخاك دروست بووی خاکی بە، بزانە خودا مرۆڤی بەفیزی دەعیە زلی خۆشناوێ.

وقال تعالى: { إن قارون كان من قوم موسى فبغى عليهم، وآتيناه من الكنوز ما إن مفاتحه لتنوء بالعصبة أولي القوة، إذ قال له قومه لا تفرح إن اللّٰه لا يحب الفرحين } إلى قوله تعالى: { فخسفنا به وبداره الأرض الآيات}. (القصص/٧٦-٨١).

واتە: بەڕاستی قاروونی بازرگانی جوولەکە کە لە کۆمەڵی مووسا پێغەمبەر بوو، گەلێ داراو دەوڵەمەند بوو، دوایی گومڕابوو، بەرەبەرە داوای سەرداریو گەورەیی دەکردو دەستی کرد بە زۆرو ستەم لە هۆزی خۆی، ئەوەندەمان ماڵو

دارایی دابوو پێی کلیلی دەرگای گەنجینەکانی ئەوەندە قورس بوون، کۆمەڵێکی بەهێز بەزەحمەت هەڵیان دەگرتن، گەلەکەی پێیان گوت: بەم ماڵی دونیایە کە هەتە مەنازە، ماڵ وەفای نیە بۆ کەس، خودا ئەوانەی خۆش ناوێ کە بە ناهەق کەیف خۆش دەبن، تۆ ئەگەر راست دەکەی بەم ماڵە جوانە کە خودا پێی داوی مایەی خۆشیی‌و کامەرانی پاشەرۆژتی پێ مسۆگەر بکە، خێری لێ بکە، پیاوەتی پێ بکە، بەشی خۆیشت بەخۆشی بەشێوەیەکی ڕەوا لەدونیادا ڕاببوێرە، هەمیشە پیشەت چاکە بێ‌و چاکەو پیاوەتی بکە، وەکوو خودا ئەو هەموو خێرو بێرو نازو بەهرەیەیی ڕژاندووە بەسەرتا، لەسوپاسی ئەو چاکەیەی خودادا تۆیش باش‌و میهرەبان بە لەگەڵ بەندەکانی ئەودا، ئاگات لە خۆت بێ ئاژاوە مەگێڕە، خراپە بەرپا مەکە لەسەر رووی زەوی، چونکە خودا ڕقی لە بەدکارە، کەچی ئەو نامەردە گوتی: من ئەم ماڵەم بەشان‌و باهوی خۆم پەیدا کردووە، بەزانایی خۆم‌و بەڕەنجەشانی خۆم پەیدام کردووە، خودای چی؟ دەبوو ئەو نامەردە ئەوەی لەبەرچاو بوایە کە خودا لە پێش ئەوەوە چەندین زەبردارو ستەمکارو دەوڵەمەندو ساماندارى لەوی بەهێزتر لەناو بردووە، کە کۆمەڵەو دەستەو بەستەو پارەو پوولیان لەو زۆرتر بوون، کاتێ کاتی ئەوە هات تاوانبار لەناو ببرێ پرسیار لە تاوانیان ناکرێ، لەپاش ئەم گشتە ئامۆژە شیرینە کەچی ئەو بەدبەختە لە کەلی شەیتان نەهاتە خوارەوە، رۆژێ خۆی رازاندەوەو لەگەڵ دەستەو بەستەکەیدا بە کەشخەو کەش‌و فشەوە بەناو خەڵکەکەدا دەسوڕانەوە، ئەوانەی کە ئاشقی ژیانی دونیایی بێ بەقان دەیانگوت: خۆزگەمان بەقاروون، بەڕاستی بەختەوەرو بەختێکی گەورەو شانسێکی چاکی هەیە! ئەوانەیش کە خودا زانستی پیرۆزی پێ دابوون دەیانفەرموو: خانە خراپینە! ماڵتان وێران بێ! خۆزگە بە چی دەخوازن، ئەوە ماڵی غەزەبە، سەرەنجامی تیاچوونە، ماڵ‌و پارە ئەوەیە کە لەلای خودا پاداشتی باشی هەبێ، ئەوەیشە بە نصیبی خاوەن باوەڕەکان دەبێ، کە خاوەنی کردەوەی باشیشن،، کە بەصەبرو خۆگرتن وەدەستی دێنن! جا کاتێکیان زانی قاروون بەخۆیی‌و کۆشك‌و تەلارییەوە، بەخۆی‌و ماڵ‌و سامانییەوە خودای گەورە رۆی چواند بەناخی زەویدا.

١/٦١٢[١٩٨]- وعن عبدِ اللّهِ بن مسعُودٍ (رضي اللّه عنه)، عن النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال : (لا يَدْخُل الجَنَّةَ مَنْ كَانَ في قَلْبِهِ مثْقَالُ ذَرَّةٍ مَنْ كِبرٍ) فقال رَجُلٌ : إنَّ الرَّجُلَ يُحبُّ أَنْ يَكُونَ ثَوْبُه حسناً، ونعلهُ حسنا قال : (إِنَّ اللّه جَمِيلٌ يُحِبُّ الجَمالَ الكِبْـرُ بَطَـرُ الحَقِّ وغَمْطُ النَّاسِ) رواه مسلم.

**عەبدوللّای کوڕی مەسعوود** (رەزای خودای لێ بێ) **فـەرمووی: پێغەمبـەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فـەرمووی: ئـەوەی بەقـەی تۆسقاڵێ دەعیـەو دەمـار لـەدڵیا بـێ ناچێتە بەهەشـت، پیـاوێکیش گـوتی: قوربـان! پیـاوی وا هەیـە حـەز دەکـا بـەرگی جوان بـێ پێڵاوی کەشخە بێ، ئەی ئەوە حاڵی چۆنە؟ فەرمووی: ئەوە قەیدی نیەو بەر فیـزو دەمـار ناکـەوێ، ئـەوە جـوانیی خۆشەویستییە، ئـەوەیش قەیـدی نییـە، ئەگـەر بـۆ فیـزو دەعیـە نـەبێو تەحـەدوث بـە نیعمـەتی خـودا بـێ، چونکە خـودا بۆخـۆی جوانـەو حەزیشی لە جوانییە، بەڵام دەمارو دەعیە هەق پێشێل کردنـەو خـەڵك بەسـووك دانانە! (ن).**

٢/٦١٣[١٩٩]- (ب-١ز-١٦، ف-٤) باسی (الأمر بالمحافظة على السنة). **فەرموودەی:** (أن رجلا أكل عند رسول الله بشماله..).

**٣/٦١٤[٢٠٠]- (ب١ز٣٣ف١) باسی (فضل ضَعفَةِ المسلمينَ).**

**٤/٦١٥[٢٠١]- (ب١ز٣٢ - ف٣) باسی (فضل ضَعفَةِ المسلمينَ).**

٥/٦١٦[٢٠٢]- وعن أبي هُريرة (رضي اللّـه عنـه)أَن رسـولَ اللّـه (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم)قال : (لا يَنْظُرُ اللّه يَوْمَ القِيامةِ إلى مَنْ جَرَّ إِزارَه بَطَراً) متفقٌ عليه.

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فـەرمووی: ئـەوەی جلی خۆی بۆ دەعیـەو دەمـار بەسـەر زەویـدا بـەکێش بکـا، خـودا لـەڕۆژی قیامـەتا بەچاوی ڕەحمەت تەماشای ناکا (ش).**

---

[١٩٨] موسلیم (٩١).

[١٩٩] بڕوانە (١٥٩/٤ز ١٦).

[٢٠٠] بڕوانە (٢٥٢/١ز ٣٢).

[٢٠١] بڕوانە (٢٥٤/٣ز ٣٢).

[٢٠٢] بوخاری (٥٧٨٨)و موسلیم (٢٠٨٧).

٦١٧/٦[٢٠٣]- وعنه قال: قالَ رسُولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (ثلاثةٌ لا يُكَلِّمُهُمُ اللّه يَوْمَ القِيامَةِ، وَلا يُزَكِّيهِمْ، وَلاَ يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ، وَلَهُمْ عَذابٌ أَلِيمٌ : شَيْخٌ زانٍ، ومَلِكٌ كَذَّابٌ، وعائلٌ مُسْتَكْبِرٌ) رواهُ مسلم:

**دیسان فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەم سێ کەسە لە ڕۆژی قیامەتا خودا نە قسەیان لەگەڵ دەکاو نە وەسپیان دەکاو نە بەچاوی مەرحەمەت تەماشایان دەکا، سەرەڕای ئەوەیش سزایەکی بەسوێشیان بۆ دەبڕێتەوە: پیری شەڕواڵپیس‌و، پاشای درۆزن‌و هەژاری لووتبەرز (م).**

٦١٨/٧[٢٠٤]- وعنه قال : قال رسولُ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (قال اللّه عزَّ وجلَّ : العِزُّ إِزاري، والكِبْرياءُ رِدَائِي، فَمَنْ يُنَازِعُني في واحدٍ منهُما فقدْ عذّبتُه) رواه مسلم:

**خودای باڵا دەست‌و شکۆمەند دەفەرموێ: گەورەیی‌و مەزناهی عاباو کەوای خۆمن‌و مافی کەسی تریان پێوە نییە، ئەوەی لەسەر یەکێ لەم دوانە گەڕو تەشقەڵەم پێ بکا تووڕی دەدەمە ناو ئاگری دۆزەخەوە (م/تاج)[*].**

٦١٩/٨[٢٠٥]- وعنْه أَنَّ رسولَ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال : (بيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشي في حُلَّةٍ تُعْجِبُه نفْسُه، مرَجِّلٌ رأسَه، يَخْتَالُ في مَشْيَتِهِ، إِذْ خَسَفَ اللّهُ بِهِ، فهو يَتَجلْجَلُ في الأَرْضِ إِلى يومِ القِيامةِ) متفقٌ عليه.

**دیسان فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: جارێ کابرایێ دەستێ بەرگی کەشخەی بەدڵی خۆی لەبەردا دەبێ، بە کەش‌و فشێکەوە بەناز دەڕۆیی، سەری شانە کرابوو، ئا لەم کاتەدا خودا رۆی چۆیاند بەناخی زەویدا وە هەتا ڕۆژی قیامەت هەر قوڵتەی دێ‌و بەناخی زەویدا رۆدەچێ (ش).**

---

[٢٠٣] موسليم (١٠٧).

[٢٠٤] موسليم (٢٦٢٠).

[*] لە ئەصڵەکەدا دەفەرموێ: ریداو ئیزار، واتە: کراس‌و دەرپێ، یاخود پۆشاک‌و لەشپۆش، بەڵام ئەم تەعبیرە کە بڵێین: خودای گەورە دەفەرموێ: گەورەیی‌و مەزنایەتی کراس‌و دەرپێی منن، لە کوردیدا زۆر لەبار نییە، چونکە کراس‌و دەرپێ هەموو کەس لەبەریان دەکا، بەڵام کەواو عابا هەر بۆ گەورە پیاوانە.

[٢٠٥] بوخاری (٥٧٩٠)و موسلیم (٢٠٨٨).

٩/٦٢٠[٢٠٦]- وعن سَلَمَة بن الأَكْوع (رضي اللّه عنه)قال : قال رسُولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (لا يزَالُ الرَّجُلُ يَذْهَبُ بِنفسِهِ حَتَّى يُكْتَبَ في الجَبَّارينَ، فَيُصِيبُهُ ما أَصابَهمْ) رواهُ الترمذي وقال : حديث حسن:

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: پیاوی وا هەیە هەرخۆی هەڵدەبڕێو دەمار دەکا، تا بەرە بەرە دەچێتە ریزی ملهوڕانەوە، ئیتر وەك ئەوان خودا تووشی تۆڵەی سەختی دەکا (ت:ح/ح).

**٧٣- باسی رەوشت جوانیو خوو شیرینی - باب حسن الخلق**

قال اللّه تعالى: { وإنك لعلى خلق عظيم} . (ن/٤).

واتە: ئەی پێغەمبەری خۆم! بەڕاستی تۆ زۆر خووت جوانەو رەفتارت شیرینەو رەوشتت بەرزە.

وقال تعالى: { والكاظمين الغيظ، والعافين عن الناس والله يحب المحسنين} آل عمران/١٣٤.

واتە: رەوشتێکی تری ئەو تەقواکارانە ئەوەیە رقی خۆیان دەخۆنەوەو بە ئاگری رقو قین کەس ناسووتێنو سەلارو هێمنو لەسەرخۆنو دڵیان فراوانەو تەنگە جیقڵدانە نینو چاوپۆشی لە هەڵەی مەردووم دەکەن، بزانن کە خودا هەموو چاکە کارێکی خۆش دەوێ.

١/٦٢١[٢٠٧]- وعن أَنسٍ (رضي اللّه عنه)قال :كانَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)أَحْسنَ النَّاسِ خُلقاً.متفقٌ عليه.

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەهەموو کەسێ رەفتاری شیرینتر بوو (ش).

٢/٦٢٢[٢٠٨]- وعنه قال : مَا مَسِسْتُ دِيباجاً ولاَ حَرِيراً أَلْيَنَ مِنْ كَفِّ رسُول اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)، وَلاَ شَمَمْتُ رائحةً قَطُّ أَطْيَبَ مِن رَسُول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)، وَلَقَدْ خَدَمْتُ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)عشْرَ سِنِينَ، فما قَالَ لي قَطٌّ : أُفٍ، ولا قالَ لِشَيْءٍ فَعلْتُهُ : لِمَ فَعَلْتَهُ؟ ولا لشيءٍ لَمْ افعَلْهُ : أَلاَ فَعَلْتَ كَذا ؟ متفقٌ عليه:

---

[٢٠٦] تيرميذي (٢٠٠١).

[٢٠٧] بوخاری (٦٢٠٣)و موسليم (٢١٥٠).

[٢٠٨] بوخاری (٣٥٦١)و موسليم (٢٣٣٠)و (٢٣٠٩).

دیسان فەرمووی: هەرگیزاو هەرگیز دەستم لەهیچ شتێ نەداوە — نە دێباجو نە ئاوریشمو نە هیچی تر — کە وەك دەستو جەستەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئاوا نەرمو شلو ناسكو نازداربن، وە هەرگیز بۆنی هیچ شتێکم نەکردووە — نە عەنبەرو نە میسكو نە هیچی تر — کە بۆنی لەبۆنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) خۆشتر بووبێ، دە ساڵی رەبەقیش — چ لەماڵەوەو چ لەسەفەردا — من خزمەتی ئەو زاتەم کردووە، قەت نەبووە پێم بفەرموێ ئۆف داد لەدەست تۆ!بەخودا چیم کردبێو چیم نەکردبێ نەیفەرمووە پێم: بۆ ئەمەت وا کردووە، یا بۆ ئەوەت وا نەکردووە! (ش/تاج).

٦٢٣/٣[٢٠٩]- وعن الصَّعبِ بنِ جَثَّامَةَ (رضي اللّٰه عنه)قال : أَهْدَيْتُ رسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)حِمَاراً وَحْشِياً، فَرَدَّهُ عليَّ، فلمّا رأى مَا في وَجْهي قالَ : (إنَّا لَمْ نَرُدَّهُ عَلَيْكَ إلاَّ لأَنَّا حُرُمٌ) متفقٌ عليه:

صەعبی کوڕی جەثامە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە ئیحرامدابوو، کەرە کێوییەکم بەدیاری بۆ برد، دایەوە بەسەرماو وەری نەگرت، کە روانی رەنگم گۆڕاو لەبەرم گرانبوو، فەرمووی: لەبەر ئەوە لێت وەرناگرین، چونکە لە ئیحرامداین، ئەگینا لێمان وەردەگرتیت (ش).

٦٢٤/٤[٢١٠]- بڕوانە (٣/٥٩٠ز٦٨).

٦٢٥/٥[٢١١]- وعن عبدِ اللّٰهِ بن عمرو بن العاص رضي اللّٰه عنهما قال : لم يكن رسولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فَاحِشاً ولا مُتَفَحِّشاً. وكانَ يَقُولُ : (إنَّ مِن خِيارِكُم أَحْسَنَكُم أخلاقاً) متفقٌ عليه.

عەبدوڵلای کوڕی عەمر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) زمانی زۆر پاکبوو، هەرزەگۆو هەرزە نەبوو، زۆرجاران دەیفەرموو: بەشێکن لەهەرە باشەکانی ئێوە ئەو کەسانەتان کە خوو رەفتاریان زۆر جوانو شیرینە (ش).

٦٢٦/٦[٢١٢]- وعن أبي الدرداءِ (رضي اللّٰه عنه): أَن النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قالَ : (ما من شَيءٍ أَثْقَلُ في ميزَانِ المُؤمِنِ يَومَ القِيامة مِن حُسْنِ الخُلُقِ. وإنَّ اللّٰه يُبغِضُ الفَاحِشَ البَذِيِّ) رواه الترمذي وقال : حديث حسن صحيح.

---

[٢٠٩] بوخاری (١٨٢٥)و موسلیم (١١٩٣).

[٢١٠] بڕوانە (٣/٥٩٠ز٦٨).

[٢١١] بوخاری (٣٥٥٩)و موسلیم (٢٣٢١).

ئەبو دەردا (رەزای خودای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لەرۆژی ژینەوەدا گرانترین شت لەتای خێری تەرازووی کێشانی خێرو شەڕی بەندەی موسوڵماندا خوو شیرینیو رەفتار جوانییە! حەزرەت فەرمووشی: بەڕاستی خودای گەورە رقی لەهەرزەگۆی زمان پیسە! (ت:ح/ص).

٦٢٧/٧[٢١٣]– وعن أبي هُريرة (رضي اللّٰه عنه)قال : سُئِلَ رسولُ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)عَنْ أَكثرِ مَا يُدْخلُ النَّاس الجَنَّةَ ؟ قال : (تَقْوى اللّٰهِ وَحُسنُ الخُلُق وَسُئِلَ عن أكثر مَا يُدْخِلُ النَّاسَ النَّارَ فَقَالَ: (الفَمُ وَالفَرْجُ). رواه الترمذي وقال : حديث حسن صحيح.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەریان پرسی: ئەوەی دەبێ بە مایەی چوونە ناو بەهەشت بەزۆری چییە؟ فەرمووی: ئەم دوو شتەیە: یەکەم: لە خودا ترسان. دووەم: رەفتاری جوان، لێشیان پرسی ئەی چی دەبێ بەهۆی چوونە دۆزەخ بەزۆری؟ فەرمووی: دەمو دامەن! (ت:ح/ح/ص).

٦٢٨/٨[٢١٤]– لەبەرگی یەکەمدا لە باسی (والوصية بالنساء)دا رابورد، فەرموودەی: (أَكْمَلُ المُؤمِنِينَ إيمَاناً...). بڕوانە: (٦/٢٧٨ز –٣٤).

٦٢٩/٩[٢١٥]– وعن عائشةَ رضيَ اللّٰه عنها، قالت سمعت رسولَ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يقول : (إنّ المُؤْمِنَ لَيُدْرِكُ بِحُسنِ خُلُقِه درَجةَ الصائمِ القَائمِ) رواه أبو داود.

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: بەڕاستی پیاوی خاوەن باوەڕی بڕوادار، بەهۆی خووی شیرینو رەوشتی جوانەوە، دەگاتە پایەی رۆژووەوانی شەونوێژکەر، کە گەورەترین پایەیە. (ئەبو داود رەحمەتی خوای لێ بێ).

١٠/٦٣٠[٢١٦]– وعن أبي أُمَامَة الباهِلِيِّ (رضي اللّٰه عنه)قال : قال رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (أنا زَعِيمٌ ببَيتٍ في ربَضِ الجنَّةِ لِمَنْ تَرَكَ المِراءَ. وَإنْ كَانَ مُحِقّاً،

---

[٢١٢] تیرمیذی (٢٠٠٢).

[٢١٣] تیرمیذي (٢٠٠٥).

[٢١٤] تیرمیذي (٢٦١٥)ء (٣٨٩٢).

[٢١٥] ئەبو داود (٤٧٩٨).

وَببيتٍ في وَسَطِ الجنَّةِ لِمَنْ تَرَكَ الكَذِبَ، وإن كَانَ مازِحاً، وَببيتٍ في أعلى الجَنَّةِ لِمَن حَسُنَ خُلُقُهُ) حديث صحيح، رواه أبو داود بإسناد صحيح.

ئەبو ئومامەی باهیلی فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ واز لە دەمبازیو دەمەدەمێ بێنێ — با لەسەر هەقیش بێو قسەی ئەو راست بێ، قسەی بەرامبەرەکەی هەڵە بێ — خۆم دەبم بە کەفیلی کۆشكو تەلارێ لەو پەڕی بەهەشتەوە، هەرکەسێکیش واز لەدرۆ بێنێ — با بە گاڵتەشەوە بێ — خۆم دەبم بە دەستەبەری خانووبەرەیێ بۆی لەناوەڕاستی بەهەشتدا هەرکەسێکیش خووی خۆی جوان کا خۆم دەبم بە دەستەبەری کۆشکێ بۆی لەلای ژووروی بەهەشتەوە (د — ح/ص).

١١/٦٣١[٢١٧]– وعن جابر (رضي اللّه عنه)أن رسول اللّه (صَلّى اللهُ علَيْهِ وسَلّم)قال : (إن مِنْ أَحَبِّكُم إليَّ، وَأَقْرِبِكُمْ مِنِّي مَجلساً يومَ القِيامَةِ، أَحَاسِنَكُم أخلاقاً. وإنَّ أَبغَضَكُم إلَيَّ وَأَبْعَدكُم مِنِّي يومَ الْقِيامةِ، الثَّرْثَارُونَ والمُتَشَدِّقُونَ وَالمُتفَيْهِقُونَ) قالوا : يا رسول اللّه قَدْ عَلِمْنَا الثَرْثَارُونَ وَالمُتَشَدِّقُونَ، فَمَا المُتفيْهِقُونَ ؟ قال : (المُتَكَبِّرُونَ) رواه الترمذي وقال: حديث حسن.

جابیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەو کەسانەتان کە ڕەوشتیان زۆر جوانە بەشێکن لەو کەسانەتان کە لە ڕۆژی قیامەتا زۆر خۆشەویستن لەلای منو لە ڕۆژی حەشرو لەکاتی کێشانی خێرو شەڕو لەسەر حەوزی کەوسەرو لە بەهەشتا زۆر نزیکن لەدیوانی منەوە.

وەسازندەو دەمەوەرو دەم هەراشو قسە زلەکانیش هەندێکن لەو کەسانەتان کە لە ڕۆژی قیامەتدا زۆر ڕەقم لێیانەو زۆرم دەدزێنو زۆر دوورن لە دیوەخانی منەوە، عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! دەزانین کە سازندەو دەمەوەرو دەم هەراشەکان کێنو مانای چییە، بەڵام ئەی مەبەست لە قسەزلەکان کێیە؟ فەرمووی: فیز زلەکانن (ت:ح/ح).

---

[٢١٦] ئەبو داود (٤٨٠٠).

[٢١٧] تیرمیذي (٢٠١٩).

وروى الترمذي عن عبد اللّٰه بن المبارك رحِمه اللّٰه في تَفْسير حُسْنِ الخُلُق قال : هُوَ طلاقةُ الوجه. وبذلُ المَعرُوف، وكَفُّ الأَذَى.

**تیرمیذی** (ڕەزای خودای لێ بێ) **دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵلای کوڕی موبارەکەوە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرمووێ: خووشیرینی برێتییە لەڕوو خۆشیو چاکەکردن بەدەستو بە زبانو وازهێنان لە ئازاری خەڵك.**

**٧٤- باسی سەلاریو لەسەرخۆییو نەرمو نیانی - باب الحلم والأناة والرفق**

قال اللّٰه تعالى: { والكاظمين الغيظ، والعافين عن الناس والله يحب المحسنين }. (آل عمران-١٣٤).

وقال تعالى: { خذ العفو، وأمر بالعرف، وأعرض عن الجاهلين }. (الأعراف/١٩٩).

وقال تعالى: { ولا تستوي الحسنة ولا السيئة، ادفع بالتي هي أحسن، فإذا الذي بينك وبينه عداوة كأنه ولي حميم" وما يلقاها إلا الذين صبروا، وما يلقاها إلا ذو حظ عظيم }. (فصلت/٣٤-٣٥).

وقال تعالى: {ولمن صبر وغفر، إن ذلك من عزم الأمور}. (الشورى/٤٣).

**تەفسیری ئایەتەکان لەپێشەوە رابوردن، سێیەمیان نەبێ کە ئەمە راڤەکەیەتی: چاکەو خراپە یەکسانو چوونیەك نین، چاکە زوو یا درەنگ ئەنجامێکی زۆرباشی دەبێ، خراپەیش زوو یادرەنگ ئەنجامێکی زۆر خراپی دەبێ، بیکە بەسەرمەشق بە رەوشتی بەرزو، بەکاری جوان بەری خووی خراپو ئیشی خراپ بگرە، بە بلاوکردنەوەی رەفتاری جوانو برەو پێدانی کاری باش خراپە ریشەکەن بکەن لە ولاتا، جا ئەگەر وابکەی کاتێکت زانی دوژمنی سەرت دەبێ بەدۆستی گیانی بەگیانیت ئەم خووە شیرینە بەهەموو کەس ناکرێ، کە بەرابەریی خراپە بەچاکە بکا، مەگەر هەر بەوکەسە خودا پێداوانە بکرێ کە هێمنو لەسەرخۆو بەئارامنو صەبرو خۆگرییان کردووە بە پیشەی هەمیشەیی خۆیان.**

١/٦٣٢[٢١٨]- وعن ابنِ عَبَّاسٍ رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُما قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللّٰـه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْه وسلّم)لأَشَجِّ عبْدِ القَيْس: (إنَّ فيك خَصْلَتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللّٰهُ: الحِلْمُ وَالأَنَاة)رَواهُ مُسلم.

---

[٢١٨] موسلیم (١٧)و (١٨)و (٢٥).

**ئیبنو عەبباس** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **بە ئەشەججی هۆزی عەبدولقەیسی فەرموو: دوو ڕەوشتی جوان لە تۆدا هەن خودا خۆشی دەوێن و رەزای لەسەریانە، کە بریتین لە هێمنی و سەلاری و لەسەرەخۆیی (م).**

٦٣٣/٢[٢١٩]- وعن عائشة رضي اللّٰه عنها قالت : قال رسول اللّٰه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (إِنَّ اللّٰه رفيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ في الأَمْرِ كُلّه) متفقٌ عليه.

**عائیشە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: بێگومان خودا بۆخۆی نەرم و نیانەو لە هەموو شتێکا نەرم و نیانی پێ خۆشە (ش).**

٦٣٤/٣[٢٢٠]- وعنها أَن النَّبـيّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال : (إِنَّ اللّٰهَ رَفِيـقٌ يُحِـبُّ الرِّفقَ، وَيُعْطِي على الرِّفق مالا يُعطي عَلى العُنفِ وَما لا يُعْطِي عَلى ما سِوَاهُ) رواه مسلم.

**دیسان فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: خودا بۆخۆی نەرم و نیانەو نەرم و نیانی پێ خۆشەو رەزای لەسەریەتی، ئەو پاداش و بەخششەی خودا دەیدا بە بەندەی خۆی لە پاداشی نەرم و نیانیدا لە پاداشی هیچی تردا پاداشی وا باشی ناداتێ، نە لە پاداشی توندو تیژیداو نەلە پاداشی هیچی تردا (م).**

٦٣٥/٤[٢٢١]- وعنها أَن النَّبـيّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال : (إِنَّ الرِّفقُ لا يكُونُ في شيءٍ إِلاّ زَانَهُ، وَلا يُنْزَعُ مِنْ شَيءٍ إِلاّ شَانَهُ) رواه مسلم.

**دیسان فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: نەرمی و نەزاکەت لە هەر شتێکا بێ جوانی دەکا، نەرمی و نەزاکەتیش لەهەر شتێکا نەبێ ناشیرینی دەکا (م).**

٦٣٦/٥[٢٢٢]- وعن أبي هريرة (رضي اللّٰه عنه)قال : بَال أَعْرَابيٌّ في المسجد، فقامَ النَّاسُ إِلَيْه لِيَقَعُوا فِيهِ، فقال النَّبـيّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم): دَعُوهُ وأَرِيقُوا على بَوْلِهِ سجْلاً مِنْ مَاءٍ، أَوْ ذَنُوباً مِن مَاءٍ، فَإِنَّما بُعِثْتُم مُيَسِّرِينَ ولَمْ تُبْعَثُوا مُعَسِّرِينَ) رواه البخاري.

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: عەرەبێکی دەشتەکی هەڵسا لەناو مزگەوتەکەی پێغەمبەردا** (دروودی خوای لەسەر بێ) **گمێزی کرد، چەند کەسێ هەڵسان بۆی و**

---

[٢١٩] بوخاری (٦٠٢٤)، موسلیم (٢١٦٥).

[٢٢٠] موسلیم (٢٥٩٣).

[٢٢١] موسلیم (٢٥٩٤).

[٢٢٢] بوخاری (٢٢٠).

تێیان خوڕی: کوڕە! نەکەی، خەریکبوون جمێنی پێ بدەن، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: وازی لێ بێنن چونکە نۆ موسوڵمانەو شێوازو دەستوورەکانی ئیسلام هێشتا بەباشی فێر نەبووە، بەلام سەتڵێ ئاو یان دۆڵچەیە ئاو بکەن بەشوێنی میزەکەیدا، خودای گەورە بۆیە منی کردووە بە پێغەمبەری ئێوە کە کار ئاسان بکەن، نەوەك کار گران بکەن، کەواتە: چاو لە نەزان بپۆشن‌و بەنەزاکەت فێری یاساکانی ئیسلامی بکەن (ب – رەحمەت لە گۆڕی).

٦٣٧/٦[٢٢٣]– وعن أنس (رضي اللّه عنه)عن النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال : (يسِّرُوا وَلا تُعَسِّروا. وَبَشِّرُوا وَلا تُنَفِّرُوا) متفقٌ عليه.

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کار ئاسان بکەن‌و کار گران مەکەن، موژدەی خۆش بەخەڵك بدەن‌و بە هەڕەشەو گوڕەشەی زۆر خەڵك لە دین مەتەکێننەوە (ش).

٦٣٨/٧[٢٢٤]– وعن جرير بن عبد اللّه (رضي اللّه عنه)قال : سمعتُ رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يقُولُ : (مَنْ يُحْرَمِ الرِّفْقَ يُحْرِمِ الخيْرَ كُلَّهُ) رواه مسلم.

جەریر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: هەرکەسێ بێ بەش بێ لە نەرم‌و نیانی ئەوە بەڕاستی بێ بەش بووە لەو گشت خێرو بێرە زۆرەیە (م).

٦٣٩/٨[٢٢٥]– فەرموودەی: (لا تَغْضَبْ فَرَدَّدَ مِرَاراً...). بڕوانە: (ب – ١ز – ٣ف –٢٥).

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ بە پێغەمبەری وت: ئامۆژگاریم بکە، ئەویش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (تووڕە مەبە)، پیاوەکە چەند جارێ داواکەی خۆی دووبارە کردەوە، پێغەمبەریش هەر دەیفەرموو: (تووڕە مەبە). (ب – رەحمەت لە گۆڕی).

---

[٢٢٣] بوخاری (٦٩)و موسلیم (١٧٣٤).

[٢٢٤] موسلیم (٢٥٩٢).

[٢٢٥] بوخاری (٦١١٦)، بڕوانە: (٢٥/٤٩ز -٣)

٩/٦٤٠[٢٢٦]- وعن أبي يعلَي شدَّاد بن أَوسٍ (رضي اللّه عنه)، عن رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال : (إنَّ اللّه كَتَبَ الإحسَانَ على كُلِّ شيءٍ، فإذا قَتلتُم فأَحسِنُوا القِتْلَةَ وَإِذَا ذَبحْتُم فَأَحْسِنُوا الذِّبْحة وليُحِدَّ أَحَدُكُم شَفْرَته وَلْيُرِحْ ذَبيحَتَهُ) رواه مسلم.

شەددادى كوڕى ئەوس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دوو شتم لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) خۆیەوە لەبەرکردووە، فەرمووی: (دروودی خوای لەسەر بێ) خودا چاکەی لەسەر هەموو شتێ نووسیوە. وە فەرمانی کردووە کە هەموو شتێ بە ڕێكو پێكیو لەسەر شێوەیەکی جوانو ڕەوا بکرێ، جا کەوابوو ئەگەر کەسێکتان لەتۆڵەی کەسێکی کوژراودا کوشتەوە، یا بە حەددی شەرعی کوشتتان ئەوە لەسەر شێوەیەکی باش بیکوژنەوەو لەوکاتەدا بەنەزاکەت بن لەگەڵیاو ئەگەر داوای شتێکی کرد لەپێش کوشتنیدا بیدەنێو شایەتومانی پێ بێنن، تا لەسەر ئیسلامەتی بمرێ، وە ئەگەر شتێکتان سەربڕی لەسەر شێوەیەکی باش سەری ببڕن، وەتیغەکەتان تیژ بکەنو پشووی کوشتیەکەتان بدەنو زیادە ئازاری مەدەن (م).

١٠/٦٤١[٢٢٧]- وعن عائشة رضي اللّه عنها قالت : مَا خُيِّر رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)بَينَ أَمْرينِ قَطُّ إلاَّ أَخذَ أَيْسَرَهُمَا، مَا لَم يَكُن إثماً، فإنْ كَانَ إثْماً كَانَ أَبعد النَّاس مِنْهُ. ومَا انتَقَمَ رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)لِنَفْسِهِ فِي شَيءٍ قَطُّ، إلاَّ أَن تُنتَهكَ حُرْمَةُ اللّهِ، فَينتَقِم للّهِ تعالى. متفقٌ عليه.

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەگەر خۆی بکرایە بە سەرپشك لەنێوانی کردنی دوو کاردا، کە کارێکیان لەوی تریان ئاسانتر بوایە هەمیشە ئاسانەکەیانی هەڵدەبژارد بەمەرجێ ئەو کارە گوناه نەبوایە، ئەگینا لەهەموو کەس زیاتر لێی دوور دەکەوتەوە، هەرگیزیش پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هەقو تۆڵە سەندنێ کە پەیوەندی تایبەتی بە خودی خۆیەوە هەبوایە نەی دەسەندو کابرای دەبەخشی، مەگەر کەسێ قەدرو ڕێزی شەرعیەتی خودای گەورەو مەزنی بشکاندایە، ئەوە بۆ خودا تۆڵەی ئەوەی لێ دەسەند (ش).

[٢٢٦] موسلیم (١٩٥٥).

[٢٢٧] بوخاری (٣٥٦٠)و موسلیم (٢٣٢٧).

١١/٦٤٢[٢٢٨]- وعن ابن مسعود (رضي اللّٰه عنه)قال : قال رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (أَلا أَخْبِرُكُمْ بِمَنْ يَحْرُمُ عَلى النَّارِ أَوْ بِمَنْ تَحْرُمُ عَلَيْهِ النَّارُ ؟ تَحْرُمُ على كُلِّ قَرِيبٍ هَيِّنٍ لَيِّنٍ سَهْلٍ). رواه الترمذي وقال : حديثٌ حسنٌ.

**ئیبنو مەسعوود** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئاگادارەوە بن! با پێتان بڵێم کە کێ لە ئاگر قەدەغەیە؟ یان ئاگر لەکێ قەدەغەیە؟ بزانن ئاگر قەدەغەیە لەهەموو کەسێ کە لە خەڵك نزیكو نەرمو نیانو ئاسان خوا بێ (ت:ح/ح).**

## ٧٥- باسی لێبوردنو چاوپۆشی کردن لە نادانایان - باب العفو والإعراج عن الجاهلين

قال اللّٰه تعالى: { خذ العفو، وأمر بالعرف، وأعرض عن الجاهلين }. (الأعراف/١٩٩)

وقال تعالى: { فاصفح الصفح الجميل }. (الحجر/٨٥).

وقال تعالى: { وليعفوا وليصفحوا، ألا تحبون أن يغفر اللّٰه لكم؟ }. (النور/٢٢).

وقال تعالى: { والعافين عن الناس، والله يحب المحسنين }. (آل عمران/١٣٤).

وقال تعالى: {ولمن صبر وغفر، إن ذلك من عزم الأمور} والآيات في الباب كثيرة معلومة.

**تەفسیری ئەم ئایەتانە لە پێشەوە رابورد.**

١/٦٤٣[٢٢٩]- وعن عائشة رضي اللّٰه عنها أنها قالت للنبيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): هل أَتى عَلَيْكَ يَوْمٌ كَانَ أَشدَّ مِنْ يوم أُحُدٍ ؟ قال : (لَقَدْ لَقِيتُ مِنْ قَومِكِ مالقيت، وكَانَ أَشدُّ ما لَقِيتُ مِنْهُمْ يوْمَ العقَبَةِ، إذْ عرَضتُ نَفسِي على ابْنِ عَبْدِ يَالِيلَ ابن عبْدِ كُلال، فلَمْ يُجبني إلى ما أَرَدْتُ، فَانْطَلَقْتُ وَأَنَا مَهْمُومٌ على وَجْهي، فلَمْ أَسْتَفِقْ إلاّ وَأَنا بقرن الثَّعالِبِ، فرفَعْتُ رأْسِي، فَإذا أَنَا بسحابَةٍ قَد أَظلَّتني، فنَظَرتُ فَإذا فِيها جِبريلُ عليه السلام، فنَاداني فقال : إنَّ اللّٰه تعالى قَد سَمِع قَولَ قومِك لَكَ، وَما رَدُّوا عَلَيكَ، وَقد بعثَ إلَيك ملَكَ الجبال لِتأْمُرهُ بما شِئْتَ فِيهم فَنادَانِي ملَكُ الجِبَال، فَسلَّمَ عَليَّ ثُمَّ قال : يا مُحَمَّدُ إنَّ اللّٰه قد سمعَ قَولَ قَومِكَ لَكَ، وأَنَا مَلَكُ الجِبالِ، وقَدْ بَعثَني رَبِّي إلَيْكَ لِتأْمُرَني بِأَمْرِكَ، فَمَا شئتَ

[٢٢٨] تيرميزى (٢٤٩٠).

[٢٢٩] بوخارى (٣٢٣١)و موسليم (١٧٩٥).

: إنْ شئْتَ : أَطْبَقْتُ عَليهمُ الأَخْشَبَيْن) فقال النَّبـيّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (بلْ أَرْجُو أَنْ يُخْرِجَ اللّه مِنْ أَصْلابِهِم منْ يعْبُدُ اللّه وَحْدَهُ لا يُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً) متفقٌ عليه.

**عائیشه** (رهزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا لە رۆژی ئوحود ناخۆشترت بەسەر هاتووە؟ فەرمووی: ئەم هۆزەی تۆ تووشی دەردی سەریو ئێشو ئازاری زۆریان کردووم، بەتایبەتی لە رۆژەکەی عەقەبەدا تەواو سەغڵەتیان کردم، مەبەستم ئەو رۆژەیە خۆم پێشکەشی ئیبنو عەبدویالیلی کوڕی عەبدو کولال کردو داوام لێی کرد کە خۆیو هۆزەکەی ببن بە پەناگای ئیسلام، بەڵام مەرازمیان نەدا، ئیتر بە غەمباری کەوتمە ڕێو بەبێ ئاگا ڕێگەم گرتەبەرو ڕۆیشتم کە هۆشم هاتەوەو بە ئاگا هاتمەوە تەماشام کرد وا لە قەرنوثەعالیبم کە سەرم هەڵبڕی تەماشام کرد وا پەڵێ هەور لەڕاست سەرمەوە ڕاوەستاوە سێبەری بۆ کردووم، کە سەرەنجم دا جوبرەئیلم بینی لەناویدا** (دروودی خوای لەسەر بێ) **بانگی کردو فەرمووی: خودای گەورە ئاگای لێ بوو کە هۆزەکەت چیان پێ گوتیتو چۆنیان وەڵام دایتەوە، ئەوا فریشتەی کێوانی بۆ ناردووی، چی فەرمانێکت هەیە پێی بفەرموو: چۆن تۆ حەز دەکەی ئاوایان لێ دەکا، ئەوجا فریشتەی سەرکاری سەر کێوانیش بانگی کردمو سڵاوی لێ کردمو فەرمووی: ئەی موحەممەد! خودا ئاگای لێ بوو کە هۆزەکەت چۆن بە ناشیرینی وەڵامیان دایتەوە، من فریشتەی سەرکاری سەر چیاکانمو کێو چیاکان هەمووی بەدەستی منە، خودا منی ناردووە بۆلای تۆ فەرمانت بەچییە تا جێبەجێی بکەم، ئەگەر ئارەزووی دەکەی هەردوو کێوەکەی ئەبو قوبەیس قەیقوعان تەبگ دەکەم بەسەریاندا، پێغەمبەریش** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرمووێ: خەیر! شتی واناکەم! بەڵکوو من ئومێد دەکەم کەخودا لەپشتی ئەمانە وەچەیێ بخاتەوە کە ئەوان خوداپەرست بنو بەتاکو تەنیایی بزاننو هیچ هاوبەشی بۆ دانەنێن! (ش).**

٢/٦٤٤[٢٣٠] – وعنها قالت : ما ضرَبَ رسول اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)شيْئاً قَطُّ بِيَدِهِ، ولا امْرَأَةً ولا خادِماً، إلاَّ أَنْ يُجاهِدَ في سَبِيلِ اللّهِ، وما نِيل منْهُ شيء قَطٌّ فَينتَقِم مِنْ صاحِبِهِ إلاَّ أَنْ يُنتَهَكَ شَيْء مِن مَحَارِمِ اللّهِ تعالى : فَيَنْتَقِمَ للّهِ تعالى. رواه مسلم.

---

[٢٣٠] **موسليم (٢٣٢٨).**

دیسان عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **بەدەستی خۆی هەرگیز لە هیچ کەسی نەداوە، نەلە گیاندارو نەلە ژنو لە نۆکەر، مەگەر لەکاتی غەزادا بەدەستی خۆی لەشتی دابێ، ئەو ئێشو ئازارەیش کە لەخەڵکەوە تووشی دەبوو لەخاوەنەکەی دەبووردو تۆڵەی لێ نەدەسەند، وەك ئەوە سەریان شکاندو ددانیان خستو گەلێ ناخۆشی تریش، مەگەر ڕێزی یاسا ڕێزدارەکانی خودا شکابێ، ئەوە بۆ حەقی خودا تۆڵەی لەو تاوانبارە دەسەند (م).**

٣/٦٤٥[٢٣١]- وعن أنس (رضي اللّٰه عنه)قال : كُنتُ أَمْشِي مَعَ رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وعليه بُردٌ نَجْرَانيٌّ غلِيظُ الحَاشِيةِ، فأدركَهُ أَعْرَابيٌّ، فَجبذهُ بِرِدَائِهِ جَبْذَةً شَديدةً، فنظرتُ إلى صفحة عاتِقِ النَّبيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، وقَد أَثَّرَت بِها حَاشِيةُ الرِّداءِ مِنْ شِدَّةِ جبذَتِهِ، ثُمَّ قال : يَا مُحَمَّدُ مُرْ لي مِن مالِ اللّٰهِ الذي عِندَكَ. فالتَفَتَ إِلَيْهِ، فضحِكَ، ثُمَّ أمر لَهُ بعطَاءٍ. متفقٌ عليه.

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەڕۆیشتم بەڕێدا، شاڵێکی نەجرانی بەراوێز ئەستووری بەسەر شانەوە بوو، عارەبێکی دەشتەکی پێی گەیشت، یەخەی پۆشاکەکەی پێغەمبەری گرتو بەتوندی وا ڕایکێشا لاملی حەزرەتی دابڕی! ئەوجا پێی گوت: لەم ماڵە کەهی خودایەو لەلای تۆیە بەشم بدە، پێغەمبەریش** (دروودی خوای لەسەر بێ) **ڕووی تێکردو بەدەمیەوە پێکەنیو فەرمانی کرد کە بەشی بدەنو خەڵاتێکی بکرێ (ش).**

٤/٦٤٦[٢٣٢]- وعن ابن مسعود (رضي اللّٰه عنه)قال : كأَنِّي أَنظُرُ إلى رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يحْكِي نَبِيّاً مِن الأَنبياءِ، صلوَاتُ اللّٰهِ وَسلامُه عَلَيهم، ضَرَبَهُ قَومُهُ فأدموهُ، وهُوَ يَمسَحُ الدَّمَ عَنْ وَجهِهِ، ويقول : (اللَّهُمَّ اغفِرِ لِقَومي فَإِنَّهُم لا يَعْلَمُونَ) متفقٌ عليه. **لەبەرگی یەکەم دا لە زنجیرەی سێ دا ڕابورد.**

٥/٦٤٧[٢٣٣]- **فەرموودەی** (لَيس الشَّديدُ بِالصُّرعَةِ...) **بڕوانە: (٢١/٤٥ز-٣).**

---

(٢٣١) بوخاری (٥٨٠٩)و موسلیم (١٠٥٧).

(٢٣٢) بوخاری (٢٤٧٧)و موسلیم (١٧٩٢): (٢٦/١٣ز-٢).

(٢٣٣) بوخاری (٦١١٤)و موسلیم (٢٦٠٩).

## ٧٦- باسی خۆڕاگرتن لەژێر باری ئازاردا - باب احتمال الأذى

ئایەتی {والكاظمين الغيظ...} و {ولمن صبر وغفر} لەدوو باسەکەی پێش ئەم باسەدا رابورد.

٦٤٨/١- فەرموودەی {إِنَّ لي قَرَابَةً أَصِلُهم ويَقطَعوني} بڕوانە (٣١٨/٧ز-٤٠). چەند فەرموودەیەکی تریش لەم بابەتە لەباسی پێشەوەدا رابورد.

## ٧٧- باسی تووڕە بوون لەسەر ئەوە کە ڕێزی یاسا ڕێزدارەکانی خودای گەورە نەگیرێ. وەهاتنە قسە لەسەر ئایینی خوداو لەسەرکردنەوەی
## باب الغضب إذا انتهكت حرمات الشرع والانتصار لدين الله تعالى

قال اللّٰه تعالى: { ومن يعظم حرمات اللّٰه فهو خير له عند ربه }.

وقال تعالى: { إن تنصروا اللّٰه ينصركم ويثبت أقدامكم } (محمد/٧).

ئەگەر ئێوە یاریدەی دینی خودا بدەن خوداش یاریدەی ئێوە دەدا بەسەر دوژمنی خۆتاناو لەکاتی غەزاو بەندەیی کردندا پێ دامەزراوو پایەدارتان دەکا.

وفي الباب حديث عائيشة السابق في العفو (٦٤١ز-٧٤).

٦٤٩/١[٢٣٥]- وعن أبي مسعود عقبة بن عمرو البدريِّ (رضي اللّٰه عنه)قال : جاءَ رَجُلٌ إلى النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، فقال : إنِّي لأتَأَخَّر عَن صَلاةِ الصُّبْحِ مِن أجْلِ فلانٍ مِما يُطِيل بِنَا، فمَا رأيت النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) غَضِبَ في موعِظَةٍ قَطٌّ أَشدَّ مِمّا غَضِبَ يَومئذٍ، فقال : يَا أَيهَا النَّاس : إنَّ مِنكم مُنَفِّرين. فأَيُّكُمْ أَمَّ النَّاسَ فَليُوجز، فإِنَّ مِنْ ورائِهِ الكَبيرَ والصَّغيرَ وذا الحَاجَةِ) متفق عليه.

ئەبو مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ گوتی: بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا من لەبەر فیسارەکەس لەنوێژی بەیانی دوادەکەوم چونکە ئەوەندەی درێژ دەکاتەوە پێمان! ئەبو مەسعوود فەرمووی: هەرگیز لە پەند دادان و ئامۆژگاری کردندا وەك ئەو ڕۆژە پێغەمبەرم ئاوا بە تووڕەیی نەبینیوە، ئەوجا فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): ئەی خەڵکینە! هەندێ لەئێوە مەردووم دەڕەوێنێتەوەو بە نوێژی دوورو درێژ خەڵك لە مزگەوت و نوێژی جەماعەت دەتەکێننەوە، جا هەرکامێکتان پێش نوێژی هەر نوێژێ دەکا بۆ ئەم خەڵکە با نوێژێکی کورتی پوختیان بۆبکا، چونکە

---

[٢٣٥] بوخاری (٧٠٢)و موسلیم (٤٦٦).

ئەوانــە هەيانــە لاوازبوونــە، هەيانــە پــيرە، هەيانــە ئــيش‌و كــارى تــرى هەيــەو، پەلەيــەتى، بــەلام ئەگــەر يــەكێكتان بەتــەنيا بۆخــۆى نوێــژى دەكــرد ئــەوا چــەنێ حەزدەكا ئەوەندەى درێژ بكاتەوە (ش/تاج).

٢/٦٥٠[٢٣٦]- وعن عائشة رضي اللّٰه عنها قالت : قدِمَ رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم)مِنْ سفرٍ، وقَد سَتَرْتُ سَهْوَةً لي بقِرامٍ فَيهِ تَمَاثِيلُ، فَلمَّا رآهُ رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم) هتكَهُ وتَلوَّنَ وجهُهُ وقال : (يَا عائِشَةُ : أَشَدُّ النَّاسِ عَذَاباً عِند اللّٰهِ يوم القيامةِ الّذين يُضاهُونَ بِخَلقِ اللّٰهِ) متفق عليه.

عائيشــە (ڕەزاى خـوداى لێ بێ) فــەرمووى: حــەزرەت (دروودى خـواى لەسـەر بێ) لەســەفەر بــوو، كــە تەشريفى هاتەوە هات بۆلاى من، كولێنێكم هــەبوو، پەردەيــەكم پيــادابوو پەردەكــە وێنەى پێوەبوو، كە پێغەمبەر (دروودى خـواى لەسـەر بێ) ئــەوەى دى دڕى‌و ڕەنگــى گــۆڕاو ڕووى گرژبــوو، فــەرمووى: ئــەى عائيشــە! ئەوانــەى كــە لەقيامــەتا ســزاو ئــێش‌و ئازاريــان لەهــەموو كــەس ســەختترە ئــەو كەســانەن كــە دەيانــەوێ لاسكايى خــودا بكەنــەوەو لەشــێوەى دروســتكراوەكانى ئــەو شــت دروســت بكــەن. عائيشــە فــەرمووى: ئــيتر پەردەكەمان دادڕى سەرينێ دوو سەرينمان لێ دروست كرد (ش/تاج).

٣/٦٥١[٢٣٧]- وعنها أَنَّ قريشاً أَهَمَّهُم شَأْنُ المرأةِ المَخزُومِية التي سَرقَت فقــالوا : من يُكلِّمُ فيها رسولَ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم)؟ فقالوا : مَن يجترِيءُ عليهِ إلا أُسامةُ بنُ زيدٍ حِبُّ رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم) ؟ فَكَلَّمهُ أُسامةُ، فقالَ رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (أَتشفعُ في حدّ مِن حُدُودِ اللّٰهِ تعالى ؟،) ثم قــامَ فَاختَطَــبَ ثــم قــال : (إنمــا أَهْلَكَ من قبلكُم أَنَّهُم كانُوا إذَا سرقَ فِيهم الشَّريفُ تَركُوهُ، وإذا ســرق فِــيهِم الضَّــعِيفُ أَقامُوا عليهِ الحدَّ، وايْمُ اللّٰه، لو أنَّ فاطمَة بنت محمدٍ سرقَتْ لقَطَعْتُ يَدهَا) متفقٌ عليه.

ديسان فەرمووى: ژنێكــى مــەغزوومى دزى كردبــوو، قــوڕەيش زۆر بەتــەنگيــەوە بوون، گوتيان: بەكێ بڵێين كە لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودى خـواى لەسـەر بێ) قسەبكا؟ گوتيــان: كێ پڕكێشى ئەوە دەكا لە ئوسامە بەولاوە، كە خۆشەويستى پێغەمبەرە (دروودى خـواى لەسـەر بێ) جا كاتێ كە ئوسامە ئەوەى عەرز كرد فەرمووى: چۆن تكادەكەى بــۆ جێبــەجێ

[٢٣٦] بوخارى (٥٩٥٤)و موسليم (٩٢).

[٢٣٧] بوخارى (٦٧٨٨)و موسليم (١٦٨٨).

نەكردنی حەددێكی شەرعی كە خودا خۆی دایناوە؟ دوایی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) هەستاوە، دوانێكی فەرموو، فەرمووی: ئەی خەڵكینە! دەزانن بۆچی نەتەوەكانی پێش ئێوە لەناوچوون؟ چونكوو كاتێ پیاوێكی خانەدان لەناویانا دزی بكردایە حەددیان لێ نەدەدا، سوێندم بە یەزدانی پاك ئەگەر فاتیمەی كچی موحەممەدیش دزی بكا دەستی دەبڕم (ش)، لە تاجدا دەفەرموێ: ئینجا فەرمانی فەرموو دەستی ژنەكەیان بڕی. (وەرگێڕ).

٦٥٢/٤[٢٣٨]- وعن أنس (رضي اللّٰه عنه)أن النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)رَأى نُخامَةً في القِبلةِ. فشقَّ ذلكَ عَلَيهِ حتَّى رُؤِي في وجهِهِ، فَقَامَ فَحَكَّهُ بيَدِهِ فقال : (إن أحَدكم إذا قَام في صَلاتِه فإنَّهُ يُناجِي ربَّه، وإنَّ ربَّهُ بينَهُ وبَينَ القِبْلَةِ، فلا يَبْزُقَنَّ أحدُكُم قِبلَ القِبْلَةِ، ولكِن عَنْ يَسَارِهِ أوْ تحْتَ قدَمِهِ) ثُمَّ أخَذَ طرفَ رِدائِهِ فَبصقَ فِيه، ثُمَّ ردَّ بَعْضَهُ على بعْضٍ فقال : أَو يَفْعَلُ هكذا متفقٌ عليه:

ئەنەس (خودای گەورەو مەزنی لێ خۆشنوود بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لەناو مزگەوتا بەڕووی قیبلەوە بەڵغەمێكی چاو پێكەوت زۆری لەبەر گرانبوو هەستا بەدەستی خۆی بەشتێ كڕاندی ئەوجا فەرمووی: ئێوە كە لەناو نوێژدا رادەوەستن ئەوا لەگەڵ پەروەردگاری خۆتانا قسەی پەنهانی خۆتان دەكەن‌و گفتوگۆ لەگەڵ ئەو زاتە مەزنەدا دەكەن، كەوابوو لەڕووی رووگەوە تفو بەڵغەم‌و چڵم رۆمەكەن، چونكە خودا، كە رەزای ئەو مەبەستی ئێوەیە، لەو نوێژەدا وا لەنێوانی ئێوەو رووگەكەتانا، ئیتر چۆن كاری وا ناشیرین دەكەن، بەڵام ئەگەر هەر چارتان نەبوو لەلای چەپتانەوە یان لەژێر پێتانا تف رۆ بكەن‌و بەخۆڵ‌و چەوی ناو مزگەوتەكە دایپۆشن ئینجا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) چمكی لەشپۆشەكەی خۆی گرت‌و تفی كردو، وڵییەوە بەسەریەكاو فەرمووی: یاخود ئاوا بكەن (ش/تاج).

دانەر (پڕ گۆڕی پیرۆزی لە نووری خودای گەورە بێ) دەفەرمووێ: كاتێ بۆی هەیە لەلای چەپیەوە، یان لە ژێر پێیدا تف رۆ بكا كە لەناو مزگەوتا نەبێ، بەڵام لەناو مزگەوتا ئەگەر تف رۆ بكا دەبێ بیكاتە جلەكەیەوە. قسەی دانەر (رەزای خودای لێ بێ) تەواو، مەبەست لەم جۆرە فەرمانەی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەوەیە كەفێری

---

[٢٣٨] بوخاری (٤٠٥)و موسلیم (٥٥١).

ڕێزگرتنی مزگەوتمان بکا، نەوەك فێری دەستووری تف ڕۆکردنمان بکا، کەواتە چ لەناو مزگەوتا، چ لەدەرەوەی مزگەوت، مەردوم دەبێ بەجۆرێکی وا تف ڕۆ بکا کە نەبێ بەهۆی بێ ڕێزیی بۆ خودا، یان بۆ خۆی، یان بۆ خەڵکی تر، لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا پاکوخاوێنی گەلێ پەرەی سەندووە، خاولیو دەستەسڕو کرێنستو شتی لەم بابەتە بۆ دەمو لوت سڕین زۆرە. وەلێ مەبەستم ئەوە نیە کە بڵێم: بابەتی ئەم فەرموودەیە بەسەرچووە، ئەوانەی قسەی وا بێجێ دەکەن نابەجا دەکەن، لەکرۆکی مەبەست تێ ناگەن، بەدەمو بەدەستو بەدڵو بەهەڵ هەوڵ دەدەن کە یاساکانی ئیسلام — بۆ نیازی پیسی خۆیان — زەدەدار بکەن! ڕەحمەت لەوەی گوتوویە:

تا کۆن بێ بۆنی خۆش دەبێ گوڵاو

دەریا بەدەمی سەگ نابێ گڵاو

**٧٨- باسی ئامۆژگاریی کاربەدەستان کە نەرمو نیان بن لەگەڵ ژێردەستەی خۆیانداو دڵسۆزو میهرەبان بن لەگەڵیاناو گزیو فێڵیان لێ نەکەنو باریان گران نەکەنو بەرژەوەندیی ئەوان پشتگوێ نەخەنو گوێ بەخۆیانو کاروباریان بدەن:**

**باب أمر ولاة الأمور بالرفق برعاياهم ونصيحتهم والشفقة عليهم والنهي عن غشهم والتشديد عليهم وإهمال مصالحهم والغفلة عنهم وعن حوائجهم**

قال تعالى: { إن الله يأمر بالعدل والإحسان وإيتاء ذي القربى، وينهى عن الفحشاء والمنكر والبغي، يعظكم لعلكم تذكرون } (النحل/٩٠).

واتە: یەزدانی مەزن دەفەرمووێ: خودا فەرمان دەدا بە میانەکاریو ئەمردەکا بە عەداڵەتو دادپەروەریی، هەروەها فەرمان دەکا بە چاکەکردنو بە بەشدانی خزمو خوێش، وە بەرگیریو جڵەوگیریی دەکا لە گفتارو کرداری خراپو ناپەسەند، وە لەستەمگەرییو دەستدرێژیی، خودا ئامۆژگاریتان دەکا بەهیوای ئەوە بیربکەنەوە لەپاشەڕۆژی خۆتان.

١/٦٥٣[٢٣٩]- بڕوانە (٢٨٣/٣ز٣٥)، فەرموودەی (كُلُّكُم راعٍ، وكُلُّكُمْ...).

٢/٦٥٤[٢٤٠]- وعن أبي يَعْلى مَعْقِل بن يَسَارٍ (رضي الله عنه)قال : سمعتُ رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰه عَلَيْهِ وسَلّم)يقول : (ما مِن عبدٍ يسترْعِيهِ اللّٰه رعيَّةً، يَمُوتُ يومَ يموتُ وهُوَ

---

[٢٣٩] بڕوانە (٢٨٣/٣ز٣٥).

غَاشٌ لِرَعِيَّتِهِ، إلاَّ حَرَّمَ اللّه علَيهِ الجَنَّةَ) وفي روايةٍ : (فَلَم يَحُطهَا بِنُصْحِهِ لم يجِد رَائحَة الجَنَّة). وفي روايةٍ لمسلم : (ما مِن أَمِيرٍ يَلِي أُمورَ المُسلِمينَ، ثُمَّ لا يَجهَدُ لَهُم، ويَنْصحُ لَهُم، إلاَّ لَم يَدخُل مَعَهُمُ الجَنَّةَ):

مەعقیلی کوڕی یەسار نەخۆش بوو، عوبەیدوڵلای کوڕی زیاد (کە فەرمانڕەوای بەصرە بوو) چوو بۆ لای بۆ سەرخۆشی لێ کردنی، مەعقیل پێی فەرمووو: گوێ بگرە فەرموودەیەکی پێغەمبەرت بۆ بگێڕمەوە کە خۆم لێم بیستووە دەیفەرموو: (درودی خوای لەسەر بێ) هەر کاربەدەستێ ببێ بە گەورەیی دەستەیێ لە موسوڵمانانو گزیو ناپاکییان لێ بکاو لەسەر ئەو حاڵە بەردەوام بێ تا دەمرێ ئەوە بێگومان کە خودا بەهەشتی لێ قەدەغە دەکا (ش/تاج) لە گێڕانەوەیەکدا: هەر بەندەیێ خودا بیکا بە سەرگەورەی کۆمەڵێو بەباشیو دڵسۆزیی سەرەوکاریی کاروباریان نەکا، بێگومان کە ئەو بەندەیە بۆنی بەهەشت ناکا. لە گێڕانەوەیەکی موسلیمدا هەر فەرمانڕەوایێ ببێ بە سەروکاری کاروباری موسوڵمانان، وەلێ بەپێی توانای خۆی بۆیان تێ نەکۆشێو ئامۆژگاری خێریان نەکا، بێگومان کە ئەوان دەچنە بەهەشت ئەویان لەگەڵدا نابێ.

٣/٦٥٥[٢٤١]- وعن عائشة رضي الله عنها قالت : سمعت رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يقول في بيتي هذا : (اللهم من وَلي من أمر أُمتي شيئاً فشق عليهم فاشقق عليه. ومن وَلِيَ من أمر أمتي شيئاً فرفق بهم فارفق به) رواه مسلم.

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە حەزرەتم بیست، لەم ماڵەی مندا دەیفەرموو: ئەی خودایە! هەر کەسێ بووبە سەرەوکاری شتێ لە کاروباری گەلی ئیسلامیی منو خراپ بوو بۆیانو سەخڵەتی کردن، تۆیش خراپ بە بۆ ئەوو سەخڵەتی کە، وە هەر کەسێ بووبە سەرەوکاری شتێ لە کاروباری گەلی ئیسلامی منو باش بوو بۆیانو دڵی پێیان سووتا، تۆیش باش بە بۆیو دڵت پێی بسووتێ (م).

٤/٦٥٦[٢٤٢]- وعن أبي هريرة (رضي اللّه عنه)قال : قال رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (كَانَت بَنُو إسرَائِيلَ تَسُوسُهُمُ الأَنْبياءُ، كُلَّما هَلَكَ نبي خَلَفَهُ نبي، وَإِنَّهُ لا نبي

---

[٢٤٠] بوخاری (٧١٥٠)و موسلیم (١٤٢).

[٢٤١] مسلیم (١٨٢٨).

بَعدي، وسَيَكُونُ بَعدي خُلَفاءُ فَيكثُرُونَ) قالوا : يَا رسول اللّٰه فَما تَأْمُرُنَا ؟ قال : (أَوفُوا بِبيعَةِ الأَوَّل فالأَوَّل، ثُمَّ أَعطُوهُم حَقَّهُم، وَاسأَلوا اللّٰه الذي لَكُم، فَإنَّ اللّٰـه سـائِلُهم عمَّـا استرعاهُم) متفق عليه.

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فـەرمووی: جـاران نەوەی ئیسرائیل، پێغەمبەران دەیانبردن بەڕێوەو سەرپەرشتی کاروباریان دەکردن، هەر کاتێ پێغەمبەرێ فەوتی دەکرد، گورج پێغەمبەرێکی تر لەجێگەی دادەنیشت، بەڵام ئاشکرایە کە لەپاش من پێغەمبەری تـر نابـێ، وەلێ جێنشین دەبـن‌و زۆریش دەبن (نەك کەم)، یاران گوتیان: جا فـەرمانت بـە چییە پێیـان‌و ئـەرکی سەرشانی ئێمە چییە لەگەڵیانا؟ فەرمووی: یەك لەدوای یەك پەیمانیان بدەنێ، با هیچ کاتـێ بێ ئیمام‌و بێ سەرۆك نەبن، وەلێ لەهەر چەرخێکا کێ لەپێش پێشـەوە، پـەیمانتان دابـێ ئــەوە جێنشـینی ڕاسـتەقینەیە، وە پەیمانەکەیشـیان ببەنــە سـەرو مـافی خۆیـانیان بدەنێ‌و لـە فـەرمانیان دەرمەچن! وە ئـەو مافـەی خۆیشتان کـە هەتانـە لەسـەر ئــەوان لــەخودای داوا بکــەن، بێگومــان کــە ئــەوانیش لــەلای خوداوەنــد بەرپرسیارن دەرهەق بەژێردەستەکانیان کە خودا ئەوانی کردووە بەشوانیان (ش).**

٦٥٧/٥[٢٤٣]– باسی (الأمر بالمعروف والنهي عـن المنكـر) فـەرموودەی (إنَّ شَرَّ الرِّعاءِ الحُطَمةُ...)، بڕوانە: (١٩٢/٩ز-٢٣).

٦٥٨/٦[٢٤٤]– وعن أبي مريمَ الأَزدِيِّ (رضي اللّٰه عنه)، أنه قَالَ لمعَاوِيةَ (رضي اللّٰه عنه): سَمِعتُ رسولَ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يقول : (من ولاَّهُ اللّٰـه شَـيئاً مِـن أُمـورِ المُسلِمينَ فَاحتَجبَ دُونَ حَاجتهِم وخَلَّتِهم وفَقـرِهم، احتَجَـب اللّٰـه دُونَ حَاجَتِـه وخَلَّتِـهِ وفَقرِهِ يومَ القِيامةِ) فَجعَل مُعَاوِيَةُ رجُلا على حَوَائِجِ الناسِ. رواه أبو داودَ، والترمذي.

**ئــەبو مەریــەمی ئــەزدی** (رەزای خودای لێ بێ) **بــە موعاوییــەی فــەرموو: لــە پێغەمبــەرم بیست دەیفەرموو: هەر کەسێ ببێ بە سـەرەوکاری شـتێ لـە کاروبـاری موسـوڵمانان دەرگای خۆی دابخا لە هەژاران‌و دامـاوان‌و لەوانـەی کـە ئـیش‌و کاریـان پێـی هەیـەو**

---

[٢٤٢] بوخاری (٣٤٥٥)و موسلیم (٦٨٤٢).

[٢٤٣] بڕوانە (١٩٢/٩ز ٢٣).

[٢٤٤] ئەبو داوود (٢٩٤٨) تیرمیزی (١٣٣٢).

نەیەڵێ بگەنە لای‌و سکالای حاڵی خۆیان بکەن، هەتا بەپێی شەرع دادیان بپرسێ، خودا لەرۆژی قیامەتا دەرگای خۆی لەئاستی هەژاری‌و ئیش‌و کاروباری ئەو دادەخا، ئیتر موعاوییە پیاوێکی دانا بۆ جێبەجێ کردنی ئیش‌و کاری خەڵك، هەتا — ئەگەر بەخۆشی جێبەجێ نەکرا — بیگەیەنێ بە موعاوییە (د/ت).

**٧٩- باسی کاربەدەستی دادپەروەر - باب الوالي العادل**

قال اللّٰه تعالى: { إن اللّٰه يأمر بالعدل والإحسان وإيتاء ذي القربى } الآية.

وقال تعالى: { وأقسطوا إن اللّٰه يحب المقسطين } (الحجرات/٩).

واتە: لەهەموو شتێکا بەدادو دادپەروەربن، چونکە خودا لە ئادەمیزادی دادپەروەر زۆر رازییە.

١/٦٥٩[٢٤٥]– لە زنجیرە چل‌و شەشدا، لەباسی (فضل الحب في الله)دا رابورد، فەرمووده‌ی: (سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللّٰه في ظِلِّهِ...). بڕوانە: (٢/٣٧٦ز –٤٦).

٢/٦٦٠[٢٤٦]– وعن عبد اللّٰهِ بن عمرو بن العاص رضي اللّٰهُ عنهما قال : قال رسولُ اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (إنَّ المُقسِطينَ عِنْدَ اللّٰهِ عَلى مَنابِرَ مِنْ نورٍ : الَّذِينَ يعْدِلُونَ في حُكْمِهِمْ وأَهليهِمْ وما وُلُّوا) رواهُ مسلم.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خودا لێیان رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: رۆژی قیامەت دادپەروەران لە خزمەتی خودادان، وان لەسەر مەشخەڵی نوور، (وان لەدەستە ڕاستی خودای میهرەبانەوە، هەردوو دەستی خودایش هەر دەستە ڕاستە چونکە مەبەست ئەوەیە کە نازو نیعمەت‌و بەهرەی خودا ڕژاوە بەسەریاناو بوون بەژێر نازو سۆزو رەحمەتی خوداوە، ئەوەندە نازیان لێ گیراوە ئەوەندە پلەوپایەی بەرزیان پێ خەڵات کراوە، ئەگینا مەبەست ئەوە نییە کە خودا وەك ئێمە دوو دەستی هەیە، یەکێکیان راست‌و یەکێکیان چەپ) دادپەروەران ئەو کەسانەن کە بەحەق‌و عەدالەت حوکم دەکەن‌و بڕیاری ڕاست دەدەن‌و لەناو خاو خێزان‌و کەس‌وکاری خۆیاندا دادپەروەرن‌و لەگەڵ ژێر دەستەی خۆیاندا بەدادن (م/تاج).

---

[٢٤٥] بڕوانە: (٢/٣٧٦ز ٤٦).

[٢٤٦] موسلیم (١٨٢٧).

٣/٦٦١[٢٤٧]- وعَن عوفِ بن مالكٍ (رضي اللّٰه عنه)قال : سمِعْتُ رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يقولُ : (خِيارُ أئمتكُمْ الّذينَ تُحِبُّونهُم ويُحبُّونكُم، وتُصَلّونَ عليْهِم ويُصلّونَ عليْكُمْ، وشِرارُ أئِمّتِكُم الّذينَ تُبْغِضُونهُم ويُبْغِضُونَكُمْ، وتَلْعُنونَهُمْ ويلعنونكم) قال : قُلْنا يا رسُول اللّهِ، أفَلا نُنابِذُهُمْ ؟ قالَ : (لا، ما أقَامُوا فِيكُمُ الصّلاةَ، لا، ما أقامُوا فيكُمُ الصّلاة) مسلم.

عەوفی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: پێشەواو کاربەدەستە هەرە باشەکانتان ئەوانەن کە ئێوە ئەوانتان خۆش دەوێ و ئەوان ئێوەیان خۆش دەوێ، هەم ئێوە دوعاو نزای باش بۆ ئەوان دەکەن و هەم ئەوان بۆ ئێوەی دەکەن، وەپێشەواو کاربەدەستە خراپەکانتان ئەوانەن کە هەم ئێوە رقتان لەوانەو هەم ئەوان رقیان لەئێوەیە، وە هەر دوولایش – چ ئێوەو ئەوان – لەعنەت و نەفرین لەیەکتری دەکەن، ئێوە لەوان ئەوان لەئێوە، فەرمووی: یاران عەرزیان کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا تاوی شمشێریان لێ نەدەین؟فەرمووی: هەتا نوێژتان بۆ بکەن نەء! کاتێ کارێ لەسەر کارێکی خۆتان پەسەند ناکەن ئەوە بێز لەو کارە ناپەسەندەی بکەنەوەو بەس، بەلام بەکەمترین هۆ لەفەرمانیان دەرمەچن و دەست لەبەگوێ کردنیان مەکێشنەوە (م/تاج).

٤/٦٦٢[٢٤٨]- وعَنْ عِيَاضِ بن حِمار (رضي اللّٰه عنه)قالَ : سمِعْت رَسُول اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يقولُ : (أَهْلُ الجَنّةِ ثَلاثَةٌ : ذُو سُلْطان مُقْسِطٌ مُوَفّقٌ، ورَجُلٌ رَحِيمٌ رَقيقُ القَلْبِ لِكُلِّ ذِي قُرْبَى وَمُسْلِمٍ، وعَفِيفٌ مُتَعَفِّفٌ ذُو عِيَالٍ) رواهُ مسلم.

عەیاضی کوڕی حیمار (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە حەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو: (درودی خوای لەسەر بێ) ئەم سێ تاقمە بەهەشتین: یەکەم خاوەن دەسەلاتی دادپەروەری بۆ هاتوو (موووەفەق)، دووەم: پیاوی میهرەبانی دڵنەرم بۆ هەموو خزم و کەس و کاری خۆی و بۆ هەموو موسوڵمانێ، سێیەم کەسێ خێزانێکی زۆری کەوتبێ بەسەردا لەگەڵ ئەوەشدا دڵ و دەروونێکی تێری وەهای هەبێ بێزبکاتەوە لەسواڵ (م).

(٢٤٧) موسلیم (١٨٥٥).

(٢٤٨) موسلیم (٢٨٦٥).

**٨٠- بە گوێ كردنی كاربەدەستەكان ئەركی سەرشانی هەموو موسوڵمانێكە. بەمەرجێ لەكاری نارەوادا نەبێ، چونكە لەكاری نارەوادا دروست نییە بەگوێیان بكرێ**
**باب وجوب طاعة ولاة الأمور في غير معصية وتحريم طاعتهم في المعصية**

قال اللّٰه تعالى: { يا أيها الذين آمنوا أطيعوا اللّٰه، وأطيعوا الرسول، وأولي الأمر منكم }.

١/٦٦٣[٢٤٩]- وعن ابن عمر رضي اللّٰهُ عنهما عَن النَّبيّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قال : (عَلى المَرْءِ المُسْلِم السَّمْعُ والطّاعَةُ فِيما أَحَبَّ وكِرَهَ، إلاَّ أنْ يُؤْمَرَ بمَعْصِيَةٍ فَإذا أُمِرَ بِمعْصِيَةٍ فَلاَ سَمْعَ وَلا طاعَةَ) متفقٌ عليه.

**ئیبنو عومەر** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: پیاوی موسوڵمان لەسەریەتی كە گوێڕایەڵو فەرمانبەر بێو لەفەرمانی گەورەی خۆی دەرنەچێ، ئیتر ئەو كارەی پێ خۆش بێ یان نا، بەمەرجێ فەرمانی پێ نەكرێ بەگوناهو خراپە، بەڵام ئەگەر فەرمانی پێ كرا بەگوناهو خراپە ئەوە نابێ بەگوێی بكا (ش).**

٢/٦٦٤[٢٥٠]- وعنه قال : كُنَّا إذا بايَعْنَا رسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم) علَى السَّمْعِ والطّاعةِ يقُولُ لَنا : (فيما اسْتَطَعْتُمْ) متفقٌ عليه.

**دیسان فەرمووی: جاران كە پەیمانمان دەدا بە پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەسەر ئەوە پەیمانمان دەدایە كە لە قسەی دەرنەچینو فەرمانبەریی بكەین، پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەینایە سەر دەممانو فێری دەكردین كە بڵێین: ئەوەندەی كەلە توانامان‌دا هەیە، لەفەرمانی خوداو پێغەمبەر دەرناچین (ش).**

٣/٦٦٥[٢٥١]- وعنهُ قال : سَمِعْتُ رسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم) يقول : (مَنْ خلَعَ يَداً منْ طَاعَةٍ لَقِيَ اللّٰه يوْمَ القيامَةِ ولاَ حُجَّةَ لَهُ، وَمَنْ ماتَ وَلَيْس في عُنُقِهِ بيْعَةٌ ماتَ مِيتةً جَاهِلِيَّةً) رواه مسلم.

**دیسان فەرمووی** (رەزای خودای لێ بێ) **حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: هەركەسێ پەیمان بدا بەفەرمانڕەواییو لە پاشا لە فەرمانی دەرچێو دەست بكێشێتەوە لە بەگوێ كردن (ئیطاعە)ی، ئەوە لەرۆژی قیامەتدا كە دەگاتەوە بەدیداری خودا هیچ**

---

[٢٤٩] بوخاری (٧١٤٤)و موسلیم (١٨٣١).

[٢٥٠] بوخاری (٧٢٠٢)و موسلیم (١٨٦٧).

[٢٥١] موسلیم (١٨٥١).

بەهانەیەکی ڕەوایی نیە کە خۆی پێ قوتار بکا لە ئۆباڵی ئەو پەیمان شکاندنە، وە هەر کەسێ بمرێ بەبێ پەیمانبەستن لەگەڵ فەرمانڕەوایی ئیسلامدا ئەوە بەنەزانی دەمرێ، وەکی مردنی سەردەمی نەزانی (م).

٤/٦٦٦[٢٥٢]- وعَن أنَسٍ (رضي اللّٰه عنه)قال : قال رسُولُ اللّٰـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم): (اسْمَعُوا وأطيعوا، وإنِ استُعْمِلَ علَـيْكُمْ عبْـدٌ حبشـيٌّ، كَـأَنَّ رَأْسَـهُ زَبِيبَـةٌ) رواه البخاري.

ئەنـەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: حـەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: هەمیشـە بـەگوێی فـەرمانڕەواکانی خۆتـان بکـەن و لەفـەرمانیان دەرمەچـن، ئەگـەر چـی بەندەیەکی ڕەشی حەبەشیش بێ، کە سەری بەقەد دەنکە مێوژێ بێ، ئاوا خڕو ڕەش و بچووک و بێ نموت بێ! (ب).

٥/٦٦٧[٢٥٣]- وعن أبي هريرة (رضي اللّٰه عنه)قال : قالَ رسُـولُ اللّٰـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (عليْكَ السَّمْعُ وَالطَّاعـةُ في عُسْـرِكَ ويُسْـرِكَ وَمنْشَـطِكَ ومَكْرِهِـكَ وأَثَـرَةٍ عَلَيْك) رواهُ مسلم.

ئـەبو هـوڕەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: لەسەرتە ئەی موسوڵمان! گوێڕایەڵ و فەرمانبەری فەرمانڕەوایی خـۆت بـی، لـەکاتی خۆشی و ناخۆشیتا، لەحاڵی ئاسوودەی و تەنگانەدا، ئەگەر چی فەرمانڕەواکانت خـۆ خۆییشت لەگەڵدا بکەن و نازی ئەم و ئەو بدەن بەسەر تۆدا (م).

٦/٦٦٨[٢٥٤]- وعن عبدِ اللّٰهِ بن عَمرو رضي اللّٰه عنهما قال : كُنَّا مَع رسول اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) في سَفَرٍ، فَنزَلْنا منْزِلاً، فَمِنَّا منْ يُصلحُ خِباءَهُ، ومِنَّـا مـنْ ينْتَضِـلُ، وَمِنَّا منْ هُوَ في جَشَرِهِ، إذْ نادَى مُنَادي رسـول اللّٰـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم): الصَّـلاةُ جامِعةٌ. فاجْتَمعْنَا إلى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فقال : (إنَّهُ لَمْ يَكُنْ نبي قَبْلـي إلاَّ كَانَ حقا علَيْهِ أنْ يَدُلَّ أُمَّتَهُ عَلى خَيرِ ما يعْلَمُهُ لهُمْ، ويُنذِرَهُم شَرَّ ما يعلَمُهُ لهُم، وإنَّ أُمَّتَكُمْ هذهِ جُعِلَ عَافيتُها في أَوَّلِها، وسَيُصِيبُ آخِرَهَا بلاءٌ وأُمُورٌ تُنكِرُونَهَـا، وتجـيءُ فِـتَنٌ يُرقِّـقُ

---

[٢٥٢] بوخاری (٧١٤٢).

[٢٥٣] موسلیم (١٨٣٦).

[٢٥٤] موسلیم (١٨٤٤).

بَعضُها بَعْضاً، وتجيء الفِتْنَةُ فَيقُولُ المؤمِنُ : هذِهِ مُهْلِكَتِي، ثُمَّ تَنْكَشِفُ، وتجيءُ الفِتنَةُ فَيقُولُ المُؤْمِنُ : هذِهِ هذِهِ، فَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُزَحْزَحَ عن النَّارِ، ويُدْخَلَ الجَنَّةَ، فَلْتَأْتِهِ منيته وَهُوَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ رواهُ مسلم.

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (خۆشنوودی خودایان لەسەر بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا لە خزمەتی حەزرەتدا بووین (دروودی خودای لێ بێ) لەشوێنێ لاماندا و بارو بنەمان خست، هەر کەسەمان خەریکی کارێ بوو، هەمان بوو خەریکی چاتۆڵەکەی بوو، هەمان بوو نیشانی نابووەوە، تیری پێوە دەنا، هەمان بوو وڵاخەکەی دادەکرد لەناو مۆڵەکەیاندا، ئالەم کاتەدا جارچی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) جاڕیدا: ئەی موسوڵمانینە! کۆ ببنەوە بۆ نوێژ، ئیتر لەلای حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) کۆبووینەوە فەرمووی: لەپێش منەوە ئەرکی سەرشانی هەموو پێغەمبەرێ بووە، ئەوەی خێری ئومەتەکەی تیابێ، بەپێی ئاگای خۆی، نیشانیان بدا، هەروەها ئەوەی خراپ بێ بۆیان، بەپێی ئاگای خۆی پێیان بڵێ و بیانترسێنێ لێی. ئەم گەلەی ئێوەیش لەسەرەتایەوە ئاسوودەو سەرفرازەو لە ئاژاوەی ئایین بەدوورە، بەڵام بەڵاو وەی تووشی دواییەکەی دەبێ، هەروەها هەندێ کاروباری ناهەموارو مەینەتو ناخۆشیتان تووش دەبێ، لەبەرئەوەی ناڕەوان بەگەندیان ناکەن!

جا فەرتەنەو ئاژاوە بەرودوا بەرپادەبن و پەیتا پەیتا بەدوای یەکدا دێن، لەچاو ئاژاوە تازەکاندا ئاژاوە کۆنەکان نان و رۆنن، ئەوەی دێ ئەوەندە بەدە ئەوەی پێش خۆی لەبیردەباتەوە، فیتنەی واگەورەدێ، موسوڵمان دەفەرمووێ: لەمەیان قوتارم نابێ ئەمە دەمفەوتێنێ، بەڵام دەڕەوێتەوەو ئاژاوەیەکی لەو خراپتر دێ و موسوڵمانەکە دەفەرمووێ: ئەمەیان خۆیەتی! ئەمەیان سەرم دەخوا، کەواتە: ئەی ئەو کەسەی حەزدەکەی لەئاگری دۆزەخ قوتارتبێ و بچیتە بەهەشتێ، باوەڕت بەخودای خۆت هەبێ و یەخەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەرمەدە هەتا مردن، باوەڕت بەخوداو رۆژی دوایی قەوی بێ و بەشێوەیەکی وا بجولێرەوە لەگەڵ ئەو خەڵکەدا کە حەزدەکەی ئەو خەڵکەیش ئاوا بجولێنەوە لەگەڵ تۆدا، ئەو کەسەی کە پەیمان دەدا بە پێشەوایی و دەست دەنێتە ناو دەستی بە دەم و بە دڵ و پشتیوانی دەکا، ئیتر با تاسەربێ بەپێی تەوانا بەگوێی بکا، گەر دنیابوو کابرایێ تر پەیدابوو، شەڕی پێ دەفرۆشت و گەڕی تێ ئاڵاند ئەوە بدەن لەگەردنی (م).

٦٦٩/٧[٢٥٥]- وعَن أبي هُنَيْدةَ وائِلِ بن حُجْرٍ (رضي اللّٰه عنه)قالَ : سأَلَ سَلَمةُ بنُ يزيدَ الجُعْفيُّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم)، فقالَ : يا نبي اللّٰهِ، أرَأيْتَ إنْ قَامَتْ علَيْنا أُمراءُ يَسألُونَا حقَّهُمْ، ويَمْنَعُونَا حقَّنا، فَمَا تَأْمُرُنَا ؟ فَأَعْرَضَ عنه، ثُمَّ سألَهُ، فَقَال رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم)(اسْمَعُوا وأطِيعُوا، فإنَّما علَيْهِمْ ماحُمِّلُوا وعلَيْكُم ما حُمِّلْتُمْ) رواهُ مسلم.

**وائیلی کوڕی حوجر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: سەلەمەی کوڕی یەزیدی جەعفی لە پیغەمبەری پرسی، گوتی: ئەی پیغەمبەری خودا! پێمان بفەرموو: گریمان لەم جۆرە کەسانە بوو بە فەرمانڕەوا بەسەرمانەوە کە داوای حەقی خۆیانمان لێ دەکەن و دەیانەوێ ئێمە بەگوێیان بکەین، بەڵام حەق و مافی خۆمانمان نادەنێ، نە بەشە ماڵی خۆمان دەدەنێ و نەدەربەستی بەرژەوەندیی ئێمەن، دەی لە بارودۆخی ئاوادا فەرمانمان بەچی پێ دەکەی؟ پیغەمبەریش** (دروودی خوای لەسەر بێ) **خۆی لە وەڵامی پرسیارەکە کەڕ کرد، بەڵام ئەو دیسان لێی پرسیار کردەوە، ئەوجا حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: گوێڕایەڵ بن و فەرمانبەرداریی فەرمانڕەواکانتان بکەن و بەدرۆ و بەڕاست بیانوویان پێ مەگرن، ئەرکی سەرشانی ئەوان شتێکە و ئەرکی سەرشانی ئێوە شتێکی ترە، بەمەهانەی ئەوەی کە ئەوان بە ئەرکی سەرشانی خۆیان هەڵناسن، ئێوە ئەرکی سەرشانی خۆتان واز لێ مەهێنن (م).**

**٦٧٠/٨[٢٥٦]- لەباسی (صەبردا، لە زنجیرەی سێدا رابورد، فەرموودەی: (إنَّهَا ستَكُونُ بعْدِي أَثَرَةٌ، وأُمُورٌ تُنْكِرُونَهَا...) بڕوانە: (٢٧/٥١ز -٣).**

٦٧١/٩[٢٥٧]- وعن أبي هريرة (رضي اللّٰه عنه)قال : قال رسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللّٰه، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ عَصَى اللّٰه، وَمَنْ يُطِعِ الأمِيرَ فَقَدْ أطَاعَني، ومَنْ يعْصِ الأمِيرَ فَقَدْ عَصَانِي) متفقٌ عليه.

**لە ئەبو هورەیرەوە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پیغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: هەرکەسێ فەرمانبەرداریی من بکا ئەوە فەرمانبەرداریی خودا دەکا، چونکە من**

---

[٢٥٥] موسلیم (١٨٤٦).

[٢٥٦] بوخاری (٧٠٥٢)، موسلیم (١٨٤٣).

[٢٥٧] بوخاری (٧١٣٧)، موسلیم (١٨٣٥).

هەموو شتێ لەسەر فەرمانی ئەو دەکەم، هەر کەسێ لەمن یاخی ببێ ئەوە لە خودای گەورە یاخی دەبێ، وەهەرکەسێ فەرمانبەرداریی فەرمانڕەوا بکا ئەوە رێك فەرمانبەریی من دەکا، وەهەرکەسێ لە فەرمانی فەرمانڕەوا دەرچێ ئەوە لە فەرمانی من دەردەچێ (ش).

١٠/٦٧٢[٢٥٨]- وعن ابن عباس رضي اللّٰه عنهما أن رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال : (من كَرِه مِنْ أَمِيرِهِ شيْئاً فَلْيَصبِر، فإِنَّهُ مَن خَرج مِنَ السُّلطَان شِبراً مَاتَ مِيتَةً جاهِلِيةً) متفقٌ عليه.

**ئیبنو عەبباس** (رەزای خودای لێ بێ) **لە حەزرەتەوە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەگەر کەسێ شتێکی دی لە فەرمانڕەواکەی، وە ئەو شتەی بەدڵ نەبوو با ئەوە نەکا بەبەهانە بۆ هەڵکردنی بەیداخی یاخێتیو نەیکا بەبیانووی تێکدانی کۆمەڵەی موسوڵمانان، بەڵکوو با ددان بەخۆیا بگرێ، چونکە ئەوکەسەی یەك بست لە کۆمەڵی موسوڵمانان جیاببێتەوەو لەسەر ئەو حاڵە بمرێ ئەوە بەنەزانیی دەمرێ، وەك مردنی سەردەمی نەزانیی پێش ئیسلام (ش).**

١١/٦٧٣[٢٥٩]- وعن أبي بكر (رضي اللّٰه عنه)قال : سمعت رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يقول : (مَن أَهَانَ السُّلطَانَ أَهَانَهُ اللّٰه) رواه الترمذي وقال : حديث حسن.
وَفِي البابِ أحاديثٌ كَثيرَةٌ في الصّحيح، وَقَدْ سَبَقَ بَعْضُها في أبواب:

**ئەبو بەکر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لەرەوانەکراوی خودام بیست دەیفەموو: هەر کەسێ بێ رێزیو سووکی بەخاوەن دەسەڵاتی رەوا بکا خودایش سووکییو بێ رێزیی بەسەرشانی ئەو دێنێ! (ت:ح/ح).**

### ٨١- باسی نەهی کردن لە داواکردنی سەرداریی، مەگەر لەبەر ناچاریی. وەك ئەوە کەسێ تر نەبێ وەك ئەو باش بێ

### باب النهي عن سؤال الإمارة واختيار ترك الولايات إذا لم يتعين عليه أو تدعُ حاجة إليه

قال اللّٰه تعالى:{تلك الدار الآخرة نجعلها للذين لا يريدون علواً في الأرض ولا فساداً،والعاقبة للمتقين} . لەباسی (تحريم الكبائر)دا رابورد.

---

[٢٥٨] بوخاری (٧١٤٣)، موسلیم (١٨٤٩).

[٢٥٩] تیرمیذي (٢٢٢٥).

١/٦٧٤[٢٦٠]- وعن أبي سعيد عبد الرحمن بن سَمُرةَ (رضي اللّٰه عنه)، قال : قال لي رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (يَا عَبدَ الرَّحمن بن سَمُرَةَ : لا تَسأَل الإمارَةَ، فَإنَّكَ إن أُعْطِيتَها عَن غَيْر مسأَلَةٍ أُعنتَ عليها، وإن أُعطِيتَها عَن مسأَلةٍ وُكِلتَ إلَيْها، وإذَا حلَفْتَ عَلى يَمِين، فَرَأَيت غَيرها خَيراً مِنهَا، فَأْتِ الذي هُو خيرٌ، وكفِّر عَن يَمينِكَ) متفقٌ عليه.

ئەوڕەحمانی کوڕی سەمووره (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: ئەی ئەوڕەحمانی کوڕی سەمووره! داوای فەرمانڕەوایی مەکە، چونکە ئەگەر لەسەر داواکردنی خۆت سەرکاریی وەربگری لێت دەبی بە بار، وەلێ ئەگەر بەبی ئەوە کە خۆت هەوڵی بۆ بدەی بکرێی بە فەرمانڕەوا ئەوا خودا زاڵت دەکا بەسەریدا، ئەی ئەوڕەحمان! ئەگەر لەسەر شتێ سوێندت خوارد، وە لەپاشا تەماشات کرد کە لەو شتە باشتر هەیە، ئەوە بڕێتی (کەفارەت)ی سوێندەکەت بدەو ئەوە بکە کە بە باشتری دەزانی (ش/تاج).

٢/٦٧٥[٢٦١]- وعن أبي ذر (رضي اللّٰه عنه)قال : قال لي رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (يا أبا ذر أَرَاكَ ضعِيفاً، وإني أُحِبُّ لكَ ما أُحِبُّ لِنفسي، لا تَأَمَّرنَّ على اثنَيْن ولا تولّيَنَّ مال يتِيمٍ) رواه مسلم.

ئەبو ذڕ (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: ئەی ئەبو ذەڕ! دەبینم تۆ پیاوێکی لازەبوونی، ئەوەی بۆ خۆم پێم خۆشە، بۆ تۆیش پێم خۆشە، کەواتە توخنی ئەم دوو کارە مەکەوە: نە سەرکاری بکە، ئەگەر لەسەر دوو کەسیش بوو، نە ببە بە سەرپەرشتی ماڵی هەتیو (موسلیم).

٣/٦٧٦[٢٦٢]- وعنه قال : قلت : يا رسول اللّٰه ألا تَستعمِلُني ؟ فضَرب بِيدِهِ على منْكِبي ثُمَّ قال: (يا أبا ذرّ إنَّكَ ضَعِيف، وإنَّهَا أَمانة، وإنَّها يوم القيامَة خِزْيٌ ونَدَامةٌ، إلاَّ من أخَذها بِحقِّها، وأدى الذي عليهِ فِيها) رواه مسلم.

---

[٢٦٠] بوخاری (٧١٤٦)و موسلیم (١٦٥٢).

[٢٦١] موسلیم (١٨٢٦).

[٢٦٢] موسلیم (١٨٢٥).

**دیسان فەرمووی: عەرزی پیغەمبەرم کرد: ئەی پیغەمبەری خودا! بریا دەتکردم بەسەرکاری کاریّ، پیغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەستی دا بەسەر شانماو فەرمووی: ئەی ئەبو ذەڕ! تۆ پیاوێکی لازەبوونی، وەلحالّ ئەم کارەیش لە جیهاندا ئەمانەتەو لەرۆژی قیامەتا پەشیمانیی لەدوایەو هۆی تەریقییە مەگەر بۆ کەسیّ کەبەهەق وەری بگریّو بەهەق پیّی هەلّسیّو مافی خۆیی بداتیّ (م).**

٦٧٧/٤[٢٦٣]– وعن أبي هُريرة (رضي اللّٰه عنه)أن رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قال: (إنّكم ستحرِصون على الإمارةِ، وستَكُونُ نَدامَة يوْم القِيامَةِ) رواهُ البخاري.

**ئەبو هورەیرەوە** (ڕەزای خودای لیّ بیّ) **دەگێڕێتەوە: کە حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بیّ) **دەفەرمویّ: ئێوە زۆر سوورو، حەریصو مجێزن لەسەر فەرمانڕەوایی‌و سەرداریی، ولحالّ ئەم شتە لەرۆژی قیامەتا پەشیمانیی لەدوایە، بەلّیّ دایەنی چاکە بەلاّم لەشیر بڕینەوەکەی گەلیّ ناخۆشە! (ب/تاج).**

## ٨٢– باسی هاندانی کاربەدەستو قازی‌و دادوەرو پاشاو کاربەدەستانی تر کە هەرکەسەیان، سەرو وەزیرو شالیارو یاریدەری باش بۆخۆیان دابنێن‌و. هۆشیارکردنەوەیان لە هاوڕێیانی بەدۆ خراپ

## باب حَثّ السلطان والقاضي وغيرهما من ولاة الأمور على اتخاذ وزير صالح وتحذيرهم من قرناء السوء والقبول منهم

قال اللّٰه تعالى: { الأخلاء يومئذ بعضهم لبعض عدو إلا المتقين } (الزخرف/٦٧).

**واتە: دۆستی ئەم جیهانە لەرۆژی قیامەتدا، لەیەکتری دەبن بەدوژمن، چونکە بۆیان روون دەبێتەوە کە ئەو دۆستییەیان هۆی ئەو سزایەیانە، وەلیّ کەسانیّ کە لە دونیادا لەبەر ڕەزای خودا یەکتریان خۆش دەویّ‌و لەخودا دەترسن، ئەوانە لەودونیایش دۆستی‌و خۆشەویستییەکەیان دەمێنیّ‌و بگرە بەهێزتریش دەبیّ!**

٦٧٨/١[٢٦٤]– عن أبي سعيدٍ وأبي هريرة رضي اللّٰه عنهما أن رسولَ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال: (مَا بَعَثَ اللّٰهُ مِن نبي، ولا استَخْلَف مِنْ خَليفَةٍ إلاّ كَانَتْ لَهُ بِطَانَتان: بِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالْمَعْرُوفِ وَتَحُضُّهُ عليه، وبِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالشَّرِّ وتَحُضُّهُ عليهِ والمَعصُومُ مَن عَصَمَ اللّٰهُ) رواه البخاري.

---

[٢٦٣] **بوخاری (٧١٤٨).**

[٢٦٤] **رواه البخاري في كتاب الأحكام، باب بطانة الإمام وأهل مشورته (ج/٢٤ص٢٦٩، العيني المترجم).**

لە ئەبو سەعیدو ئەبو هورەیرەوە (رەزای خودایان لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: خودا هەر پیغەمبەرێکی رەوانە کردبێ، وە هەر کەسێکی کردبێ بەجێنشین، دوو تاقمە دەستو پێوەندی هەبووە: تاقمەیەکیان رێگەی چاکەی نیشان دەداو هانی دەدا لەسەر گرتنی رێگەی چاکە، وە تاقمەکەی تریان رێگەی خراپەی نیشان دەداو گاڵی دەدا لەسەر گرتنی رێگەی خراپە، پاكو پاکیزەییش تەنیا ئەو کەسەیە کە خودای گەورە بیپارێزێو بەمیهرەبانیی خۆی لەخراپە دووری بگرێ (بوخاری، رەحمەت لەگۆڕی نازداری).

٢/٦٧٩[٢٦٥]- وعن عائشة رضي اللّٰه عنها قالتْ : قال رسولُ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسلّم) : (إذا أرَادَ اللّٰه بالأمِيرِ خيراً، جَعَلَ له وزيرَ صِدق، إن نَسي ذكَّرهُ، وإن ذكَرَ أعَانَهُ. وَإذا أرَاد بهِ غَيرَ ذلك جعَلَ له وَزيرَ سُوءٍ، إن نَسيَ لم يُذَكِّره، وَإن ذكَرَ لم يُعِنْهُ). رواه أبو داود بإسناد جيدٍ على شرط مسلم.

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ خوداوەندی گەورە خواستی خێری بە فەرمانڕەوایێ هەبوو، ئەوا وەزیرێکی باشی راستاڵی بۆ دەڕەخسێنێ، ئەگەر خۆی لەیادی نەبوو، یان سەری لە ئیشێ دەرنەدەچوو، وەزیرەکە یادی دەخاتەوەو رێنمایی دەکا، ئەگەر خۆشی لەیادی بوو ئەویش یارمەتی دەدا، بەڵام کاتێ خواستی خێری پێی نەبوو ئەوا وەزیرێکی خراپی بۆ دادەنێ، ئەگەر خۆی لەیادی نەبوو ئەویش نایخاتەوە یادی، ئەگەر خۆیشی لەیادی بوو ئەو یارمەتی دەدا (د — س/ج).

**٨٣- کەسێ خۆی داوای سەرداری بکا ناکرێ بەسەردار هەروەها قازیتیو شتی تری لەم بابەتەیش هەر وایە**

**باب النهي عن تولية الإمارة والقضاء وغيرهما من الولايات لِمن سألها أو حرص عليها فعرّض بها**

١/٦٨٠[٢٦٦]- عن أبي موسى الأشعريِّ (رضي اللّٰه عنه)قال : دخلتُ على النَّبيِّ (صَلّى اللّٰه عَلَيْهِ وسلّم)أنَا وَرَجُلان مِنْ بني عَمِّي، فقال أحَدُهُمَا : يا رسولَ اللّٰه أمِّرنَا على بعضِ مَا ولاّكَ اللّٰه، عزَّ وجلَّ، وقَال الآخرُ مِثْلَ ذلكَ، فقال : (إنَّا واللّٰه لا نُولّي هذا العَمَلَ أحداً سَأله، أو أحداً حَرَص عليه). مُتّفقٌ عَلَيْهِ.

---

[٢٦٥] ئەبو داوود (٢٩٣٢).

[٢٦٦] بوخاری (١٧٣٣).

**ئەبو مووسا** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆم‌و دوو پیاو – لە ئامۆزاکانم – چووینە خزمەتی حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **پیاوێکیان گوتی: ئەی پیغەمبەری خودا! بمانکە بە سەرکاری شتێ لەو شتانە کە خودا سپاردوونی بەتۆو تۆی کردووە بەخاوەنیان، تا تۆیش بیان سپێری بەکەسی شایان، ئەوی تریشیان هەمان قسەی کرد، فەرمووی:** (درودی خوای لەسەر بێ) **بەخودا هەرکەسێ خۆی هەوڵ بدا بۆ ئەم ئیشە، یان سوور (حەریص) بێ لەسەری، ئێمە ئەو کەسە ناکەین بەسەرکاری (ش).**

## ٨٤- نامەی وێڵە جوانەکان (ئەدەب) - کتاب الأدب
## باسی پەسەندیی شەرم‌و شکۆو خووگرتن پێیانەوە
## باب الحياء وفضله والحثّ على التخلق به

٦٨١/١[(٢٦٧)]– عن ابْنِ عُمَرَ رضي اللّه عنهما أَنَّ رسولَ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)مَرَّ عَلَى رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ وَهُوَ يَعِظُ أَخَاهُ في الحَيَاءِ، فَقَالَ رسُولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (دَعْهُ فإِنَّ الحياءَ مِنَ الإِيمانِ) متفقٌ عليه.

**ئیبنو عومەر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پیغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **لەلای پیاوێکەوە رەت بوو، ئەنصاریی بوو، خەریك بوو ئامۆژگاریی برادەرێکی خۆی دەکرد، لەسەر ئەوە کە زۆر شەرمنە، پیغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **پێی فەرموو: وازی لێ بێنە چونکە شەرم‌و حەیا بەشێکە لەباوەڕو ئیمان! (ش).**

٦٨٢/٢[(٢٦٨)]– وعن عِمْران بن حُصَيْن، رضي اللّه عنهما، قال: قال رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (الحياءُ لا يَأْتي إلاَّ بِخَيْرٍ) متفق عليه.

وفي رواية لمسلم: (الحَياءُ خَيْرٌ كُلُّهُ) أَوْ قَالَ: (الحَيَاءُ كُلُّهُ خَيْرٌ).

**عیمرانی کوڕی حوصەین** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پیغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: شەرم هەر خێر دێنێ (ش)، لەگێڕانەوەیەکی موسلیمدا: شەرم هەمووی هەر خێرە یان فەرمووی: شەرم خێرە هەمووی.**

٦٨٣/٣[(٢٦٩)]– **فەرموودەی:** (الإِيمَانُ بِضْعٌ وسَبْعُونَ) **لەبەرگی یەکەما لەباسی (بيان كثرة طرق الخير)دا رابورد. بڕوانە: (٩/١٢٥ز –١٣).**

---

[(٢٦٧)] بوخاری (٢٤)و موسلیم (٣٦).

[(٢٦٨)] بوخاری (٦١٧٧) و موسلیم (٣٧).

٤/٦٨٤- وعن أبي سعيد الخُدْرِيِّ (رضي اللّه عنه)، قال: كان رسول اللّـه (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)أَشَدَّ حَيَاءَ مِنَ الْعَذْرَاءِ فِي خِدْرِهَا، فَإِذَا رأى شَيْئاً يَكْرَهُه عَرَفْنَاهُ فِي وَجْهِهِ. متفقٌ عليه.

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەگەورە کچی ناو پەردە بەشەرمو بەحەیاتر بوو، ئەگەر حەزی لەشتێ نەبوایە بەروویا دەمزانی (ش).

٥ — قالَ الْمُؤَلِّف الإمامُ النَوَوِيّ — رِضْوانُ اللّهِ تَعَالى عَلَيْهِ —: وَرَوَيْنا عَنِ الإمام أبي الْقاسِمِ الجُنَيْدِ، رَحِمَهُ اللّهُ تَعَالى، قالَ: الْحَيـاءُ رؤيَـةُ الآلاءِ (أيّ الـنّعَم) وَرؤْيَـةُ التَّقصـيرِ، فيَتوَلَّدُ بَيْنَهُما حالَةٌ تُسَمَّى حياءً واللّه أعْلَمُ:

دانەر — واتە پێشەوا نەوەوی، غەریقی رەحمەتی خودای لێ بێ — دەفەرموێ: فەرمایشتێکی ئیمامی جونەیدی بەغدادی هەیە، ئێمە لەوەوە گێڕاومانەتەوە، دەفەرموێ: شەرمی بەڕاستی ئەوەیە کە بەندە نازو نیعمەتو بەهرەی خودا کە داوێتی پێی ببینێ‌و رەچاوی بکا وە لەهەمان کاتا ببینێ کەناتوانێ سوپاسی ئەو چاکانەی خودا بکا، جا لە ئەنجامی ئەم دوو سەرنجەوە حاڵەتێ پەیدا دەبێ، پێی دەگوترێ: شەرم.

## ٨٥- باسی پۆشینی نهێنی (سرپۆش) - باب حفظ السر

قال اللّه تعالى: { وأوفوا بالعهد إن العهد كان مسؤولاً} (الإسراء).

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: هەموو پەیمانێکی خۆتان ببەنە سەر، چونکە پەیمان لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێ.

١/٦٨٥[٢٧١]- وعن أبي سعيد الخُدْرِيِّ (رضي اللّه عنـه)قـال : قـال رسـول اللّـه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (إنَّ مِنْ أَشَرِّ النَّاسِ عِنْدَ اللّهِ مَنْزِلَة يَوْمَ الْقِيامَةِ الرَّجُـل يُفضِـي إلى المَرْأَةِ وَتُفضِي إلَيهِ ثُمَّ يَنْشُرُ سِرَّهَا) رواه مسلم.

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: رۆژی قیامەت لەلای خودا کەس وەك ئەو پیاوە جێگەی خراپ نییە کە

---

[٢٦٩] بوخاری (٩)و موسلیم (٣٥).

[٢٧١] موسلیم (١٤٢٧).

لەگەڵ ژنەکەیدا سەردەکەن بەیەکداو، لەسەرجێ باسی سەرجێیو شتی وادەکەن، کەچی دەچێ ئەو باسو خواسە بۆ خەڵکی تر دەگێڕێتەوەو رازو نهێنی ژنەکەی پەخشو بڵاودەکاتەوە (م).

٦٨٦/٢[٢٧٢] – وعن عبد اللّٰه بن عمر رضي اللّٰه عنهما أن عمر (رضي اللّٰه عنه)حين تَأَيَّمتْ بِنْتُهُ حفْصةُ قال : لقيتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّان (رضي اللّٰه عنه)، فَعرَضْتُ عليْهِ حفصةَ فَقلتُ : إنْ شِئتَ أنكَحْتُكَ حَفْصَةَ بِنْتَ عُمرَ؟ قال: سَأَنْظُرُ في أمْرِي فَلبِثْتُ ليالِيَ، ثُمَّ لَقِيني، فقال: قد بدا لي أنْ لا أَتَزَوَّجَ يوْمي هذا، فَلَقِيتُ أبا بَكْرٍ الصِّديقَ (رضي اللّٰه عنه). فقلتُ: إن شِئْتَ أَنكَحْتُكَ حَفْصةَ بنْتَ عُمَر، فصمتَ أبو بكْر (رضي اللّٰه عنه)، فلَمْ يرْجِعْ إليَّ شَيْئاً، فَكُنْتُ عَلَيْهِ أوجَد مِنِّي على عُثْمانَ، فَلَبِثْتُ ليَالي، ثُمَّ خطَبهَا النَّبيّ (صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّم)، فَأَنْكَحْتُها إيَّاهُ، فلَقِيني أبُو بكْرٍ فقال: لَعلَّك وجَدْتَ عليَّ حِينَ عَرضْتَ عليَّ حفْصة فَلَمْ أَرْجعْ إلَيكَ شَيْئاً؟ فقلت: نَعمْ. قال: فإنهُ لَمْ يَمْنعْني أنْ أرْجعَ إلَيْكَ فيما عرضْتَ عليَّ إلاّ أنّي كُنْتُ عَلِمْتُ أنَّ النَّبيّ (صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّم)ذكرَها، فلَمْ أَكُنْ لأَفْشِي سِرَّ رسول اللّٰه (صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّم)، ولوْ تَركَهَا النَّبيّ (صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّم)لقَبِلْتُهَا، رواه البخاري:

ئیبنو عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خونەیسی کوڕی خوذافەی ئەل – سەهەمی کەیەکێك بوو لەیارانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەمەدینە، مرد، حەپسەی ژنی کە کچی عومەر بوو بێوەژن کەوت، عومەر (رەزای خودای لێ بێ) دەیفەرموو: حەپسەم پێشکەشی عوسمان کرد، عوسمان گوتی: بابیرێ لەکاری خۆم بکەمەوە ئەوسا وەڵامت دەدەمەوە، جا لەپاش چەند شەوێ عوسمان تووشم بوو گوتی: وا بەباشی دەزانم کەئێستا ژن نەهێنم، جا تووشی ئەبوبەکری صدیق بووم، گوتم: ئەگەر ئارەزوو دەکەی حەپسەت لێ مارە دەکەم، ئەبوبەکر بێ دەنگ بوو هیچ قسەی نەکرد، منیش لەدڵی خۆمەوە لە ئەبوبەکر زیاتر دڵگیر بووم تا لەعوسمان، هەتا چەند رۆژێکی پێ چوو ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) داخوازی حەپسەی کرد بۆ خۆی، منیش مارەییم بڕی لێی، لەوەدوا ئەبوبەکرم تووش بوو گوتی: رەنگە دڵگیر بووبیت لێم لەسەرئەوە کە حەپسەت پێشکەش کردپێمو من وەڵامم

[٢٧٢] بوخاری (٤٠٠٥).

نەدایتەوە؟ گوتم: بەڵێ وایە، گوتی: دەسا من لەبەرئەوە وەڵامم نەدایتەوە بۆ ئەوکارە چونکە دەمزانی کە پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەتەمایەتی، خۆ نەیش دەبوو کە نهێنیی پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئاشکرا بکەم، ئەگینا من لەدڵی خۆمەوە بەتەمابووم ئەگەر ئەو نەیەوێ من بۆ خۆم بیخوازم (ب).

٣/٦٨٧[٢٧٣]- وعن عائشة رضي اللّه عنها قالتْ : كُنَّ أَزْوَاجُ النَّبيّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم) عنْدهُ، فَأَقْبلتْ فاطِمةُ رضي اللّه عنها تَمْشِي. مَا تَخْطيءُ مِشْيتُهَا مِنْ مِشْيَةِ رسول اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)شَيْئاً، فَلَمَّا رآها رَحَّبَ بها وقال: (مرْحباً بابنَتي) ثُمَّ أَجْلَسها عنْ يمينِهِ أَوْ عنْ شِمالِهِ. ثُمَّ سارَّها فَبكتْ بُكَاءً شديداً، فلَمَّا رَأى جَزَعَها سَارَّها الثَّانية فَضحكَت، فقلت لها: خصَّك رسول اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)مِن بيْنِ نِسائِهِ بالسَّرار، ثُمَّ أَنْتِ تَبْكين؟ فلَمَّا قَام رسولُ اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)سأَلْتُهَا : ما قَال لكِ رسولُ اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)؟ قالت : ما كُنْتُ لأُفْشِي عَلى رسول اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)سِرَّهُ. فلَمَّا تُوُفِّيَ رسولُ اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قلتُ : عَزَمْتُ عَلَيْكِ بِمَا لي عَلَيْكِ مِنَ الحَقّ، لَمَا حدَّثْتني ما قال لكِ رسولُ اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)؟ فقالتْ : أَمَّا الآنَ فَنعم، أَما حِين سَارَّني في المَرَّةِ الأولى فأَخْبرني (أَنَّ جِبْريل كَان يُعارِضُهُ القُرْآن في كُلِّ سَنَةٍ مرَّة أَوْ مرَّتَيْن، وأَنَّهُ عَارَضهُ الآنَ مَرَّتَيْن، وإِني لا أُرَى الأَجَل إلاَّ قدِ اقْتَرب، فاتَّقِي اللّه واصْبِري، فَإِنَّهُ نِعْم السَّلَف أَنَا لكِ) فَبَكَيْتُ بُكَائيَ الذي رأيْتِ، فلَمَّا رَأى جَزعِي سَارَّني الثَّانيةَ، فقال: (يَا فَاطمةُ أَما تَرْضِينَ أَنْ تَكُوني سيِّدَةَ نِسَاء المُؤْمِنِينَ، أوْ سَيِّدة نِساءِ هذهِ الأُمَّةِ ؟) فَضحِكتُ ضَحِكي الذي رأَيْتِ، متفقٌ عليه. وهذا لفظ مسلم:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەنەخۆشی سەرەمەرگا ژنەکانی پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هەموویان لەکنی کۆبووبوونەوە، لەوکاتەدا فاطیمەی کچی هات، شێوەی ڕۆیشتنەکەی کوتومت لەشێوەی ڕۆیشتنی پیغەمبەر خۆیی دەکرد، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خۆش هاتی، مەرحەبا لەکچی خۆم، ئەوجا لەلای راستی خۆیەوە، یا لەلای چەپی خۆیەوە داینیشان، لەپاشا بەنهێنی قسەیەکی بۆیکرد، فاطیمە واشڵەژاو گریا دیسان چپەیەکی تری بۆکرد، ئەمجارە فاطیمە دەستی کرد بە پێکەنین، منیش پێیم گوت: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) بەسەر ئێمەدا دەچێ قسەی

[٢٧٣] بوخاری (٣٦٢٣)، موسلیم (٢٤٥٠) (٩٨).

پـەنهانی بـۆ تـۆ دەکـا، کەچـی تـۆیش دەگریـتو لەپاشـا پێدەکـەنیت؟ جـا کاتـێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە کوڕەکە هەڵسا پرسیارم لێی کرد: ئـەوە پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) چی فەرموو پێت؟ گوتی: بۆ من نـەهاتووە کـە نهێنـی پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئاشکرا بکەم، منیش گوتم: شتی وام نـەدیوە وەك ئەمـەی ئـەمڕۆ تـۆ کـردت، گریانو پێکەنین ئاوا بەرودوا بەسـەریەکەوە، کاتـێ حـەزرەت (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) گیـانی پاکی سپارد، گوتم: توو ئەو هەقەی کەمن هەمە لەسەر تۆ، کە هاوسـەری بـاوکتمو دایکی موسوڵمانانم، ئەگەر پێم نەڵێیت کـە حـەزرەت (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) ئـەوجارە چـی پێ فـەرموویت؟ گـوتی: بـەڵێ باشـە ئێسـتا قەیـدی نییـە پێـت دەڵـێم، کـە لـەجاری یەکەما چپەی لەگەڵ کردم پێی فەرمووم: کە جوبرائیل لەمـەوپێش هـەموو سـاڵێ یەك جار دەوری قورئانی لەگەڵدا دەکردمەوە، لەمانگی ڕەمـەزانا گـوێی لێ دەگـرتم، بـەڵام ئەمساڵدووجار دەوری قورئـانی لەگەڵـدا کردمـەوە، جـا وادەزانم کـە ئاکـامم هـاتووە، تـۆش یەکـەم کـەس دەبـی لـە کـەسوکارم کـەدێی بـۆلام، وەمـن بـەرایی‌و پێشـڕەوی چـاکم بـۆ تـۆ، دەی تـۆیش لـەخودا بترسـەو لـەکاتی مردنـی منـدا ددان بەخۆتا بگرەو کاری نـاڕەواو ناشایسـتە مەکـە، ئـەوەبوو لەبەرئـەوە منـیش دەسـتم کرد بەو گریانە دوور لەبێ شەرعییەی کەدیت، جا کە حـەزرەت (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) دی من پەرۆش بووم دیسان بەچپە فەرمووی پێم: ئەی فاطیمە! ئەدیی باشـە تـۆ ڕازی نابی بەوە کەتۆ سەرگەورەی ژنانی بڕوادارەکـان بیـت یـا فـەرمووی: کـەتۆ گـەورەی ژنـانی ئـەم ئوممەتـە بیـت، جـا ئـەوەبوو منـیش لەخۆشـی ئـەوە پێکـەنیم، بـەو شێوەیەی کەتۆ دیت. (ش) لەتاجدا ئەم پترییەی هەیـە: گفتـەی (ت)و (ب) ئاوایـە: لەپاشـا گـوتی پـێم کـەمن سـەرگەورەی خانمـە بەهەشـتییەکانم، مەریـەمی کچـی عیمرانی لێ دەرچێ، ئەوەبوو منیش پێکەنیم.

٤/٦٨٨[٢٧٤]– وعن ثابتٍ عن أنس، (رضي اللّٰه عنه)قال : أَتى عليَّ رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وأَنا أَلْعبُ مع الْغِلْمان، فسلَّمَ عَلَيْنا، فَبَعَثَني في حاجة، فَأَبْطأْتُ على أُمِّي، فَلَمَّا جِئـتُ قالـت : مـا حَبَسَـكَ ؟ فقلـتُ : بَعَثَني رسـولُ اللّٰـه (صَـلّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم)لحَاجَةٍ، قالت : ما حَاجَتهُ ؟ قلت : إِنَّهَا سرٌّ. قالـتْ: لا تُخبِرَنَّ بسِر رسـول اللّٰـه

[٢٧٤] موسليم (٢٤٨٢)، بوخاری (٦٢٨٩).

(صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)أحداً. قال أَنَسٌ : واللّهِ لوْ حدَّثْتُ بِهِ أحَداً لحدَّثْتُكَ بِهِ يَا ثابِت. رواه مسلم. وروى البخاري بَعْضَهُ مُخْتصراً:

**ثابيت** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: ئەنەس** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لەناو كوڕاندا خەريك بوو يارىم دەكرد، پيغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **هات بۆ لامو ناردمی بۆ كارێكی خۆی كە چوومەوە بۆ ماڵەوە دايكم فەرمووی: بۆ درەنگ هاتيتەوە، گوتم:پيغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **ناردمی بۆ كارێ، فەرمووی: ئيشەكەی چی بوو؟گوتم:ئيشێكی نهێنييە، فەرمووی: نهێنيی پيغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **بەكەس مەڵێ، ئەنەس فەرمووی: ئەی ثابيت! - بەخودا — ئەگەر ئەو نهێنييەم بۆ كەسێكی تر بگێڕايەتەوە بۆ تۆيشم دەگێڕايەوە! (م/ب).**

**٨٦- باسی ئەمەكداريیو پەيمان بردنە سەرو جێبەجێ كردنی بەڵێن:**
**باب الوفاء بالعهد وإنجاز الوعد**

قال اللّه تعالى: { وأوفوا بالعهد إن العهد كان مسئولاً }.
وقال تعالى: { وأوفوا بعهد اللّه إذا عاهدتم } (النحل/٩١).
وقال تعالى: { يا أيها الذين آمنوا أوفوا بالعقود } (المائدة/١).

**واتە: يەزدانی مەزن دەفەرموێ: ئەی كەسانێ كە خاوەنی باوەڕو ئيمانن! هەموو ئادو پەيمان بەستن (عقد)ێكی خۆتان ببەنە سەر.**

وقال تعالى: { يا أيها الذين آمنوا لم تقولون ما لا تفعلون؟...}.

**تەفسيری ئەم ئايەتە لەباسی (تغليظ عقوبة من أمربمعروف أو نهى عن منكر وخالف قوله فعله) رابورد.**

**١/ ٦٨٩[٢٧٥]- فەرموودەی:** (آيَةُ المُنَافِقِ ثَلاثٌ... تاد) **بڕوانە (١/١٩٩ز - ٢٥).**

**٢/ ٦٩٠[٢٧٦]-** وعن عبدِ اللّهِ بن عمرو بن العاص رضي اللّه عنهما، أنَّ رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال: (أرْبع مِنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقاً خَالِصاً. ومنْ كَانَتْ فِيه خَصلَةٌ مِنْهُنَّ كانَتْ فِيهِ خَصْلَة مِن النِّفاق حَتَّى يَدَعَهَا : إذا اؤْتُمِنَ خَان، وإذَا حدَّثَ كذَبَ، وَإذا عَاهَدَ غَدَر، وَإذا خَاصَم فَجَرَ). متفقٌ عليه:

---

[٢٧٥] بڕوانە (١/١٩٩ز ٢٥).

[٢٧٦] بوخاری (٣٤)و موسليم (٥٨).

**عەبدوللای کوڕی عەمر** (رەزای خودایان لێ بێ) **لە حەزرەتەوە دەفەرموێ** (دروودی خوای لەسەر بێ):
**هەرکەسێ خوو بگرێ بەم چوار شتەوە ئەوە موونافیقو ناپاکی تەواوە، وە هەرکەسێ خوو بگرێ بەیەکێ لەم چوارەوە ئەوە رەگێکی ناپاکیی و نیفاقی تیادایە تا وازی لێ دێنێ، یەکەم کاتێ بوو بە ئەمینداروو گزیی و ناپاکی بکا، دووەم کاتێ قسەو گفتوگۆ دەکا درۆ دەکا، سێیەم کاتێ پەیمان دەدا بەکەسێ دەیشکێنێ و بێ پەیمان دەردەچێ، چوارەم کاتێ داوایەکی هەبوو لەسەر کەسێ ناهەقی لێ دەکاو بەهەق رازیی نابێ و بەهەقو ناهەق دەیەوێ قسەی خۆی سەرکەوێ! (ش).**

**زاناکان دەفەرموون: موسوڵمان بەکردنی هیچ تاوانێ کافر نابێ لە دائیرەی ئیمان دەرناچێ، بەلام مەبەست لەم جۆرە هەڕەشەیە زۆر شتە، بەپێی شوێن حیکمەتی هەڕەشەکە، زۆر یان کەم، دەردەکەوێ، وەلێ دەشێ ئەوەشمان لەبیر نەچێ درۆی شەرعی جیایە لە درۆی لوغەوی، بۆنموونە ئەگەر کەسێ بەمناڵەکەی بلێ: وەرە بەخوا بێیت دینارێکت دەدەمێ و مناڵەکەی بچێ و ئەو دینارەکەی نەداتێ، ئەمە بەپێی زمان و دەستووری ناو کۆمەڵ درۆی کردووە لەگەڵ مناڵەکەی. بەلام پێی ناگوترێ درۆزن، هەروەها بەر ئەودرۆیەش ناکەوێ کە فەرموودەو قورئان هەڕەشەیان لەخاوەنەکەی کردووە، وەك ئەم فەرموودەیەی بەردەستمان، یان وەك ئەم ئایەتەی سورەتی موجادەلەیە کە دەفەرموێ: {وَيَحْلِفُونَ عَلَى الْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ - ١٤/المجادله}.**

**هەروەها زاناکان دەفەرموون: بۆ ئەوەی عەوام سڵ بکا لەتاوان و ترسی لێ نەشکێ باش وایە ئەم کوڵك و مووەی بۆشی نەکرێتەوە، وەلێ لەم رۆژگارەی ئێمەدا کە دوژمنی دینمان بەدەستو بەزمان و بەقەڵەمو بەماڵ کنە لە بناغەی ئایینەکەمان دەکەن و بەخەیاڵی خاوی خۆیان دەیانەوێ ریشەکەنی بکەن، هەرچی ببێ بەهۆی روون کردنەوەی دین و دەفعی ئیشکالی ناحەزانی، ئەوە ئەرکێکی پیرۆزی سەرشانی هەموو موسوڵمانێکە، بەتایبەتی زاناکانمان،** (رەزای خودایان لێ بێ) (*)

(*) دکتۆر موحەممەد شەریفی وەکیلی وەزیری ئەوقاف گێڕایەوە گوتی: جارێ لەسەفەری قاهیرە بووم، کتێبێکی جوانی چاکم بۆ باوکم کڕی بەناوی (دحض شبهات حول القران) کاتێ بە خزمەتی باوکم گەیشتم، وەك موژدەیەکی خۆش و کورتکی بەئەمەك، عەرزیم کرد: بابەگیان! دیارییەکی زۆر نایاب و جوانم لەم سەفەرەمدا بۆ هێناوی، کە بریتیە لەکتێبێ لەبارەی قورئانی پیرۆزەوە، فەرمووی: باشە

**چونکه هەموو زەمانێ دەستوورو چەك‌و یاسای تایبەتی خۆی هەیە، چەکی دەستی موسوڵمان بەپێی کات‌و شوێن دەگۆڕێ، ئەوەی لەبەر چاوە ئەمڕۆ زۆر کەس بڕوای بەزۆربەی نامە ئایینیەکان نەماوە، باوەڕی بەمەعنەویات کەم بووە، چونکە ئیعتیمادی کوللی لەسەر ماددەیە، نەخۆشێ دەچێتە لای پزیشکێ دەرزییەکی بۆ دەنووسێ، دەیدەن لەلا ڕانی بەقەد دووپشکێ دەئێشێ، حەبێکی بۆ دەنووسێ بەئاویش بۆی قووت ناچێ، شەرابێکی بۆ دەنووسێ لەگوژاڵك تاڵترە، یەك تۆسقاڵ هەڵە لەدکتۆرەکەو دەرمانەکەی ناگرێ بەوپەڕی سوپاسەوە پارەو پولیش دەدا، ئەمە بۆ؟! چونکە باوەڕی بەماددیات هەیە، وەلێ کە فەرموودەیەکی صەحیحی بوخاری‌و موسلیم** (رەزای خودایان لێ بێ) **دەبینێ، بێ شەرمانە دەڵێ: ئەمە واو ئەوە وا، لەراستیدا ئەم جۆرە قسانە تاوانێکی گەلێ گەورەیە، لە موسوڵمانی ساخ شتی وا ناوەشێتەوە، ئەم نامەو کتێبە پیرۆزانە پلەی پیرۆزی‌و دەرەجەی قودسییەتیان لە پلەی دووەمدایە، لەدوای قورئانی پیرۆز ئەوانن. کەواتە برای موسوڵمان! تۆ خۆت لەم دارەتە مەدە، هەمیشە بەچاوی قەدرو ڕێزەوە تەماشای فەرموودەی ساخی حەزرەت بکە، چۆن لەرووت دێ بەچاوی رەخنە تەماشای فەرموودەی حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەکەی، کەچی ناوێری رەخنە لە پزیشکێکی ناتەواوی وەك خۆت بگری! خودای گەورە لەم جۆرە ئایەتانەدا هەڕەشە لەو جۆرە کەسانە دەکا، کە**

---

ئادەی بیهێنە بۆم، کە دامە دەستی‌و هەر کە سەیری ناوەکەی کردو عینوانەکەی خوێندەوە ڕێك دایەوە دەستم‌و فەرمووی: کوڕم ئەمە ببەخشە بەکەسێکی تر، چونکە بەخودا من هیچ ئیشکالێکم لەراستی قورئاندا نییە تا بەم کتێبە دەفعی بکەم! بەڵێ مامۆستا مەلا شەریف (رەحمەتی خودای لێ بێ) ئەو قۆناغەی بڕیبوو!

جارێ لەماڵی دکتۆر موحەممەدی کوڕی، لەبەغدا، بەخزمەتی گەیشتم، عەرزیم کرد: قوربان! تۆ صەفای رۆحیت هەیە، رابەرییەکم بفەرموو، خەریکی عیلمی ومفقم بەڵکوو إجازەیێ، إفادەیەکم پێ بگەیەنی؟ فەرمووی: پێت بڵێم ئەگەر ببی بەئیمامی غەزالیش (رەزای خودای لێ بێ) لەم عیلمەدا هیچی لێ نابەستیتەوە هەتا خۆڵ‌و زێڕت لەلا چوون یەك نەبێ، کەواتە ئیتر بۆ چیتە؟ ئیتر منیش لەسەر فەرمایشتەکەی ئەو وازم لێ هێنا، وەلێ لەدڵەوە هەر بەتەمام - خودا یار بێ — مەکتەبەی کوردی بەکتێبێکی ومفق دەوڵەمەند بکەم، چونکە عیلم گاڵتە نییە نەخوازەلا عیلمی ومفق، ئیتر بەتەمای خودا. (وەرگێڕ).

بەبێ بەڵگەی ڕۆشن و شایستەیی دەم لەقسەی مەترسیدار دەکوتن، بە عەقڵە کوێتی خۆیان دەمە دەدمێ لەگەڵ خوداو پێغەمبەر دەکەن، کە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: {وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمٌ – النور/١٥}. واتە: بەخەیاڵی خۆیان ئەو قسەیە بەقسەیەکی ئاسان دەزانن، کەهیچ قەیدی نەبێ، بەڵام قسەی وا کە مەبەست لێی تانەو تەشەردانە لەناموسی موسوڵمانان و لەئایینی پیرۆزی ئیسلام تاوانێکی گەلێ گەورەیە لەلای خودای گەورە.

ئازیزەکەم! بەشەهادەو شتی وا مەنازەو لەخۆت بایی مەبە، زانستی تۆ لەچاو زانستی خودادا وەك دەرزی بەدەیا وایە، ئەگەر ڕاستە کە تۆ کە شەهادەت هەیەو زانای دەبێ داناش بیو ڕوو لەخودا بی. ڕاستە کە تۆ پسپۆڕی ئەندازیارییت، یان پسپۆڕی ئابووریت، بەڵام تۆ شەهادەی مەلایەتیت نییە، حافظێکی قورئانخوێن لەتۆ باشتر قورئان دەزانێ، کوتە مەلایەکی کوێرە دێیەك لەتۆ باشتر ئایین دەزانێ، دین گاڵتە نییە، مەلا هەروا بەهەوانتە نابێ بە مەلا، مەلایەتیش (وەك هەموو پایەیەکی بەرزی تر) هەوڵی گەرەکە، شەونخوونی دەوێ، سەرەڕای ئەوەیش وەرع و تەقواو طاعەت و لەخوداترسان و ڕەوشتی بەرزی دەوێ، برالە! کورت و پوخت پێت بڵێم: تۆ شوێن قسەی ئەو خوێڕییانە مەکەوە کە دەڵێن: مەلا نەزانەو حاجی سوو خۆرەو شێخ قۆڵبڕەو دەروێش دەسبڕەو سۆفی دواکەوتەیەو، نوێژو ڕۆژو خووەو، بەمێزەرو شاڵ و کەشیدەو ریش و پرچ نییەو، دڵ حلێبەو بەس! ئەگەر ئەم گوتەیە ڕاست بێ و سەفسەطە نەبێ ئەی دەبێ کێ موسوڵمانی ڕاست و دروست بێ؟ بەم قسەیە بێ دیارە ئارەقخۆرو قومارچی و بێ دینەکان موسوڵمانی چاك و پاك بن!

کاکەی موسوڵمان! بزانە دینی ئیسلام دینی خودایە، پەیوەندیی تایبەتی بەمەوە نییە، دیفاع و بەرگری لێی وەك شێخی نەوەوی دەبێ (رەزای خودای لێ بێ) زۆر بە ئەدەب و ڕێزەوە دەوری جزمێ بۆ تەوجیهی ئیشکالێکی نەحوی دەنووسێ، کە لەناو مەتنی فەرموودەیەکدا بەرچاو دەکەوێ، یان پەنا بەهەزارو یەك ئیحتیمال و ڕێتێچوونی لاوازو بێ هێز دەبا، بۆ ڕاستکردنەوەی ڕستەیێ، بەڵام خوانەخواستە زمانی لاڵ ببێ قسەیەکی نابەجێ لە شەرحی فەرموودەدا ناکا، بەتایبەتی ئەو فەرموودە ساغانەی کە لە کتێبە عومدەو بڕواپێکراوەکاندا جێی خۆیان کردۆتەوە، گەلی ئیسلام بەوپەڕی ڕەزامەندییەوە وەریان گرتووە، فەرموودەی حەزرەت (دروودی

خوداى گەورەى لەسەر بێ) گەوهەرو ئەڵماسە، ئەوەى كە بەنەزانىو نەفامى شەنوكەوى دەكا سەرى خۆى لەبەرد دەدا، براكەم! من رووى دەمم لەتۆيە كە خۆت بەرووناكبيرێكى موسوڵمانى دڵسۆز دەزانى، بەلاّم بەناوى رۆشنبيرىو ئازاديى راو بيرەوە رێزى بەستەكانى ئيسلام دەشكێنى، وەك ئەوەى كە بەرگوێمان دەكەوێ هەندێ لاوى موسوڵمان دەڵێن: باوى ئەم جۆرە فەرموودانە نەماوە، ئەمرۆ چەرخى كارەباو لێزەرو رۆبۆتو كۆمپيوتەرە، براكەم! بزانە خزمەتى ئيسلام گەورەترين بەهرەيە، ئيسلاميش ئەوەيە كە لە قورئانو ئەم كتێبە فەرموودانەدا هەيە، ئايين هەوێنى ژينە، مەرهەمى سەربرينە، تيشكى خۆرى زێرينە، دەدا لەم سەرزەمينە، مەلاو مزگەوتو پياوانى خودا گوڵن بۆ دڵو كلن بۆ چاوو هێزن بۆ هەناوو گيانن بۆ ژيان، شيرازەى كۆمەڵ بەمانەوە بەندە، خوانەخواستە ئەمانە نەمێنن كۆمەڵگە دەبێ بە كۆمەڵگا.

رەحمەت لەو كەسەى كە لە مەدحو وەسپى راستو دروستى ئەم زاتانەدا ئەم چامەيەى داناوە، كە وەك بەحرى كەمالى ئەوان لەبەحرى كاميلە:

بِسْمِ اللّٰه الرَّحْمَن الرَّحيم

بحَقِّ ذي الْجَلالِ وَالإكْرم — غَمَرَ الوجودَ ذي الإنعامِ
نعَمُ الإلهِ علَى العِبادِ عَديدَةٌ — وأجلّهنّ ديانَةُ الإسْلامِ
قَامَ بهَا نبِيُّنا مُحَمَّدٌ — عَلَيْه خَيْرُ تَحيَّةٍ وَسَلامِ
مِن بَعْده قَامَ بهَا القَطاحلُ الْ — أفْذاذُ مِن عُلمائنا الأعْلامِ
فالْقَائمونَ بهَا يَحُوزُونَ العُلَى — وَبسَبْقهمْ فَازُوا بخَيْرِ مُقامِ
فَصاحبُ الْبُسْتان قَبْلَ غَيْره — ليَذُوقَ مِنْ باكورَة الشَّمّامِ
ألْعُلَماءُ لَقَدْ رَقَوا ذرى المُنى! — برَفْرَف الْقِرطاس والأقْلامِ!
عُلمائُنا هُمْ كالنُّجوم، فَكلُّهُمْ — عَلَمُ الْهُدَى في قُمَم الأعْلامِ
وَعُلومُهُمْ أنْوارُ أقْمارِ الهُدَى — أضاءَت الْوِهادَ كالآكامِ
فَبأيّهِمْ تَقْتَدي أنْتَ سائرٌ — على هدى أحمد خير أنام
عليه أزكى الصلوات وأفضل ال — سلام والإجلال والإكرام
فالعالمون وعلمهم نور على — نور لمحو ظلمة الأصنام
لعلومهم في صدرهم قد أشبهت — أوراد روض داخل الأكمام

إن ظهـرت بهـرت عيـون النـاظر
نـور ونـوار و زهـر وخضـارٌ
غمـر المكـان والزمـان والقلـوبَ
قـل واثقـا: لمثـل هـذا المنظـر
ممـن حبـاهم الإلـه بفضـله
طـوبي لظهـر حامـل أرواحهـم
طـوبى لنـا — إخـوة ديـن محمـد —
لقـد اهتـدى مـن اقتـدى بـأيهم!
وبعضـنا في غفلـة، وكـأنهم
بـل هـم أضـل وهـم أقـل درايـة
أعمـى قلوبنـا الـذنوب فـلا نـرى
إن الألى تنـورت أبصـارهم
بمشـيئة الله تـدول دولـة
فتشـرق الأرض بنـور ربهـا،،
فاجعـل عبيـدك نوريـا يـا ربنـا
وبقـارني انصـر ديـن أحمـد النبي
ومـا نـراه مـن بشـائر ديننـا،
واغفـر لنـا ذنوبنـا، وآتنـا،،،

أو سـحرت حـس ذوي الإشمـام
في صـفانه مثـل حـب غمـام
وأعـين الأنـام والأقـوام!
رنـت عيـون أجنـة الأرحـام
بأرومـة الأخـوال والأعمـام
ولـبطن حاملـة بـذي الأجسـام
إن لنـا جيشـا مـن العـلام
فكفـاه عطـرا مـس مسـك ختـام
— ونعـوذ بـالله — مـن الأنعـام،،
مـن الأمـاعز أرذل الأنعـام
نـور الهـدى المبيـد للأوهـام
يتفـاءلون بـدورة الأيـام
يعلـو بهـا إسـلامنا بسـلام
وبإذنـه تنهـي بيـوم ظـلام
للعلمـاء خـادم الإقـدام
واكتـب لنـا الحظـوة بـين أنـام
حققـه ربـي كـرؤى الإلهـام!
حسـنات دنيانـا وحسـن ختـام!

(المترجم)

٣/ ٦٩١[٢٧٧]— وعن جابر (رضي اللّه عنه)قال : قال لي النَّبيّ (صَلّى اللهُ عليْهِ وسلّم): (لو قدْ جاءَ مالُ الْبَحْرَيْن أعْطَيْتُكَ هكَذا وهكذا وَهَكَذا) فَلَمْ يَجيءْ مالُ الْبحْرَيْن حَتَّى قُبِضَ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)، فَلَمَّا جَاءَ مَالُ الْبَحْرَيْن أَمَرَ أَبو بَكْرٍ (رضي اللّه عنه)فَنَادى : مَنْ كَانَ لَهُ عنْدَ رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)عِدَةٌ أَوْ دَيْنٌ فَلْيأْتِنا. فأَتيتُهُ وقُلْتُ لَهُ : إنَّ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال لي كَذَا، فَحثَى لي حَثْيَةً، فَعددْتُها. فَإذا هِيَ خَمْسُمِائَةٍ، فقال لي : خُذْ مِثْلَيْهَا. متفقٌ عليه.

[٢٧٧] بوخارى (٢٦٨٣)و موسليم (٢٣١٤).

**جابير** (رەزای خودای لێ بێ) **فـەرمووی: پێغەمبـەر** (درووودی خوای لەسەر بێ) **فـەرمووی پـێم: ئەگـەر ماڵی بەحرەین هات ئەوەندەو ئەوەندەو ئەوەندەت دەدەمێ، ئیتر وا رێکـەوت مـاڵی سەرانەی بەحرەین هەر نەهات هەتا پێغەمبەر** (درووودی خوای لەسەر بێ) **گیـانی پـاکی سپارد، بـەڵام کاتـێ مـاڵی بـەحرەین گەیشـت، ئەبوبـەکر** (رەزای خودای لێ بێ) **بـوو بـوو بەجێنشـین، فەرمانی فەرموو، جارچی جارپیدا: هەرکەسـێ بـەڵێنی، یـا قـەرزێکی هەیـە لەسـەر پێغەمبـەر** (درووودی خوای لەسەر بێ) **بابـێ بـۆ لای ئێمـە، منـیش چووم بـۆ لایو عـەرزیم کـرد: پێغەمبـەر** (درووودی خوای لەسەر بێ) **واوای بەمن فەرموو. ئەویش لاگوێلێکی لـە ماڵەکـە داپـێم، کە ژمـاردم پێـنج سـەد بـوو، فـەرمووی: دوو ئەوەنـدەی تـریش هـەڵبگرە بـۆ خـۆت (ش).**

### ٨٧- کەسێ خووی گرت بە چاکەیەکەوە واباشە لەسەری بڕوا
### باب الأمر بالمحافظة على ما اعتاده من الخير

قال اللّٰه تعالى: { إن اللّٰه لا يغير ما بقوم حتى يغيروا ما بأنفسهم} (الرعد/١١).

**واتە: هەتا کۆمەڵ رەوشتو رەفتاری خۆیان نـەگۆڕن خـودا بـارودۆخی ژیانیـان ناگۆڕێ،کۆمــەڵی بــێ رەوشــتی لــەگوناها نوقمبــووی دواکــەوتووی ژێرکــەوتووی ژێردەستەی لەخودا دوور،هەتا واز لە بێ رەوشتی نەهێنن و لەخودا نزیك نەبنەوە، خودا لەخۆیەوە نەپێشیان دەخاو نە سەریان دەخاو نە لەژێر دەستی زاڵم رزگاریان دەکا، هەروەها کۆمەڵی باشی بەڕەوشتی خوداناسی سەرکەوتوو هەتا دەست نەکەن بە خراپەو گوناهو بێ وێڵی خودا لەخۆیەوە خراپیان ناکاو ژێرکەوتوویان ناکا.**

وقال تعالى: {ولا تكونوا كالتي نقضت غزلها من بعد قوة أنكاثاً}.

وقال تعالى: {ولا تكونوا كالذين أوتوا الكتاب من قبل فطال عليهم الأمـد فقسـت قلوبهم}.

وقال تعالى: { فما رعوها حق رعايتها }.

١/٦٩٢[٢٧٨]- وعن عبد اللّٰه بن عمرو بن العاص رضي اللّٰه عنهما قال : قال لـي رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): يا عَبْدَ اللّٰه، لا تَكُنْ مِثل فُلانٍ، كَانَ يقُوم اللّيْلَ فَترَك قِيامَ اللّيْل، متفقٌ عليه.

---

(٢٧٨) بوخاری (١١٥٢)و موسلیم (١٨٥).

**عەبدوڵڵای کوڕی عەمر** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **پێی فەرمووم: ئەی عەبدوڵڵا! وەکوو فیسارە کەس مەبە، کە جاران شەونوێژی دەکرد، بەڵام ئێستا وازی لێ هێناوە! (ش).**

**٨٨- باسی سوننەتی ڕووخۆشیو قسەخۆشی لەکاتی بەیەك گەیشتندا**
**باب استحباب طيب الكلام وطلاقة الوجه عند اللقاء**

قال اللّٰه تعالى: {واخفض جناحك لمن اتبعك من المؤمنين}.

وقال تعالى: {ولو كنت فظاً غليظ القلب لانفضوا من حولك} (آل عمران/١٥٩).

**واتە: ئەی خۆشەویست! هۆی ئەوەی کە گەلی موسوڵمان لەدەوری تۆ کۆبوونەتەوەو وەك پوورەی هەنگ پوورەیان لەدەور داوی هۆی ئەوەیە کەتۆ ڕووخۆشو نەرمونیانو ڕەوشت بەرزی،دەنا خوانەخواستە، ئەگەر مۆنو ڕووگرژو دڵڕەقو بەدخوو بوویتایە، هەموو لەدەورت دەتەکینەوەو پشتیان چۆڵ دەکردی.**

**١/٦٩٣- لەباسی (بيان كثرة طرق الخير)دا فەرموودەی (اتقوا النار ولو بشق تمرةٍ). بڕوانە: (١٣٩/٢٣از - ١٣).**

**٢/٦٩٤- فەرموودەی (كُلُّ سُلامى مِنَ النَّاسِ عليه صدقةٌ... تاد)، بڕوانە هەمان باس (١٢٢/٦از - ١٣)..**

**٣/٦٩٥- دیسان ئەمیش لەهەمان باسدا رابورد، فەرموودەی (لا تحقرنَّ من المعْرُوفِ شَيْئاً). بڕوانە هەمان باس: (١٢١/٥از - ١٣).**

**٨٩- سوننەتە قسە ڕوون بکرێتەوەو ئەگەر پێویست بێ دووبارە بکرێتەوە، هەتا گوێگر بەجوانی لێی حاڵی ببێ**
**استحباب بيان الكلام وإيضاحه للمخاطب وتكريره ليفهم إذا لم يفهم إلا بذلك**

١/٦٩٦[٢٧٩]- عن أنس (رضي اللّٰه عنه)أن النَّبِيّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)كانَ إذا تَكَلَّم بِكلِمَةٍ أعَادها ثَلاثاً حَتَّى تُفْهَم عَنهُ، وإذا أتَى عَلَى قَوْمٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ سَلَّمَ عَلَيْهِمْ ثَلاثاً. رواه البخاري:

---

[٢٧٩] بوخاری (٩٤).

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە گوتەیەکی دەفەرموو، سێ جار دووبارەی دەکردەوە، هەتا بەباشی لێی تێ بگەن (بەڵام هەموو کاتێ نا بەڵکوو بەپێی حاڵو مەقام) هەروەها گەلێ جار کە دەچوو بۆ لای کۆمەڵێ، ئەگەر پێویستی بکردایە سێجار سڵاوی لێ دەکردن (ب).

٦٩٧/٢[٢٨٠]- وعن عائشة رضي اللّٰه عنها قالت : كان كلامُ رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم) كلاماً فَصْلا يفْهَمُهُ كُلُّ مَن يَسْمَعُهُ. رواه أبو داود:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: قسەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ڕاستو دروستو ڕەوان بوو، بێ پێچو پەنا بوو، ئەوی گوێی لێ دەبوو بەباشی تێی دەگەیشت (د).

**٩٠- باسی گوێ ڕاگرتنی هاونشین لەقسەی هاونشینی، بەمەرجێ قسەکەی حەرام نەبێ، وەبێ دەنگ کردنی ئامادەبووانی کۆڕی زاناو ئامۆژگاری خوێن**

**إصغاء الجليس لحديث جليسه الذي ليس بحرام واستنصات العالم والواعظ حاضري مجلسه**

٦٩٨/١[٢٨١]- عن جَرير بن عبدِ اللّٰه (رضي اللّٰه عنه)قال : قال لي رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم)في حجَّةِ الْوَدَاع : (اسْتَنْصِتِ النَّاسَ) ثمَّ قال : (لا ترْجِعُوا بعْدِي كُفَّاراً يضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَاب بَعْضٍ) متفقٌ عليه:

جەریری کوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە حەجی ماڵئاواییدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی بەمن: خەڵکەکە بێ دەنگ بکە، با گوێ لە گوتارەکە بگرن، ئەوجا فەرمووی: لەپاش مەرگی من پاشگەزمەبنەوەو لەناوخۆتاندا وەك کافرەکان دەدەن لە گەردنی یەکتری ئاوا لە گەردنی یەکتری مەدەن (ش). بڕوانە: (٢٠٥/٣ز - ٢٦).

**٩١- باسی تەمێو ئامۆژگاریی لەسەر شێوەیەکی مەیانەکار**

**الوعظ والاقتصاد فيه**

قال اللّٰه تعالى: { ادع إلى سبيل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة} (النحل/١٢٥).

٦٩٩/١[٢٨٢]- وعن أبي وائِلٍ شَقِيقِ بن سَلَمَةَ قال : كَانَ ابْنُ مسْعُودٍ (رضي اللّٰه عنه)يُذكِّرُنا في كُل خَمِيسٍ مرة، فَقَالَ لهُ رَجُلٌ : يَا أَبَا عبْدِ الرَّحْمنِ لوددْتُ أَنَّكَ ذَكَّرْتَنَا

---

[٢٨٠] ئەبو داود (٤٨٣٩).

[٢٨١] بوخاری (١٢١)، موسلیم (٦٥).

كُلَّ يَوْمٍ، فقال : أما إنَّهُ يَمنعني مِنْ ذلكَ أني أكْرَهُ أنْ أمِلَّكُمْ وإنِّي أتَخَوَّلُكُمْ بالمَوْعِظَةِ. كَما كَانَ رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يَتَخَوَّلُنا بها مَخافَةَ السَّآمَةِ علَيْنَا. متفقٌ عليه:

**ئەبو وائیل** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود** (رەزای خودای لێ بێ) **دەستووری وابوو هەموو رۆژی پێنج شەموانێ تەمێو ئامۆژگاریی دەكردین، رۆژێ پیاوێ پێی گوت: ئەی باوكی ئەورەحمان! خۆزگەم هەموو رۆژێ ئەم تەمێو ئامۆژگارییەت دەكردین، فەرمووی: ئەدی من لەبەرئەوە واناكەم چونكە حەزناكەم وەڕستان بكەم، منیش وەك جارانی پیغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **چۆن ئەو ناو بەناو پەندی دادەداین و ئامۆژگاری دەكردین نەبادا ئەگەر هەموو رۆژێ پەندمان دابدا جاڕس ببین، منیش ئێستا لەگەڵ ئێوەدا ئاوا دەكەم و چاو لەو دەكەم (ش).**

٧٠٠/٢[٢٨٣]– عن أبي الْيَقظان عَمَّار بن ياسر رضي اللّٰه عنهما قال : سَمِعْتُ رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يقول : (إنَّ طُولَ صلاةِ الرَّجُلِ، وَقِصر خُطْبته، مِئنَّةٌ مِنْ فقهِه. فَأَطِيلوا الصَّلاةَ،وَأَقْصِروا الخُطْبَةَ). رواه مسلم:

**ئەبو یەقظان فەرمووی: لە حەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو: نوێژی درێژو وتاری كورتی پیاو نیشانەی ئەوەیە كەپیاوێكی زاناو شارەزایە كەواتە درێژە بە نوێژ بدەن و وتار كورت بكەنەوە (م).**

٧٠١/٣[٢٨٤]– عن مُعاوِيَةَ بنِ الحَكم السُّلَمِيِّ (رضي اللّٰه عنه)قال : (بينما أَنا أصَلِّي مَع رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، إذْ عطسَ رجُلٌ مِنْ القَوْمِ فَقُلْتُ : يرْحَمُكَ اللّٰه، فَرَماني القوم بابصارِهِمْ، فقلت : وا ثكل أُمِّيَاه ما شأنكم تنظرون إليَّ ؟ فجعلوا يضربون بأيديهم على أفخاذهم فلما رأيتهم يُصَمِّتُونني لكني سكت، فَلَمَّا صلى رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، فَبابي هُوَ وأُمِّي، مَا رَأَيْتُ مُعَلِّماً قَبْله وَلا بَعْدَه أَحْسَنَ تَعْلِيماً مِنْه، فَوَاللّٰه ما كَهَرَني ولا ضَرَبَني وَلا شَتَمَني، قال : (إنَّ هَذِهِ الصَّلاةَ لا يَصْلُحُ فيها شَيْءُ مِنْ كَلام النَّاسِ، إِنَّمَا هِيَ التَّسْبِيحُ والتَّكْبِيرُ، وقِراءَةُ الْقُرآن) أو كما قال رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم). قلت : يا رسول اللّٰه، إني حديث عهْدٍ بجَاهِلية، وقدْ جاءَ اللّٰه بالإسْلامِ، وإنَّ مِنَّا

---

[٢٨٢] بوخاری (٧٠)، موسلیم (٢٨٢١).

[٢٨٣] موسلیم (٨٦٩).

[٢٨٤] موسلیم (٥٣٧).

رجالاً يَأْتُونَ الْكُهَّانَ ؟ قال : (فَلا تأْتِهِمْ) قلت : وَمِنَّا رجال يَتَطيَّرونَ؟ قال : (ذَاكَ شَيْءٌ يَجِدونَه في صُدورِهِم، فَلا يصُدَّنَّهُمْ). رواه مسلم:

موعاوييەی کوڕی حەکەمی ئەلسەلەمی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەپشتی پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر بێ) بەکۆمەڵ نوێژمان دەکرد، پیاوێ لە کۆمەڵ پژمی، منیش گوتم: (یرحمك الله: خودا رەحمت پێ بکا). کەچی نوێژکەران خێسەیان لێ کردم، منیش گوتم: ئای ببم بەکۆستی دایکم، ئەوە چیتانە کەوا سەیری من دەکەن؟ بەڵام بەدەستیشیان ماڵییان بەرانیاندا هەتا بێ دەنگم بکەن، کە دیم وا دەکەن ئیتر بێ دەنگ بووم، کاتێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) نوێژەکەی تەواو کرد فەرمووی: بەڕاستی ئەم نوێژە بەکەڵکی قسەی دونیایی نایێ، چونکەنوێژە هەر دەبێ بریتی بێ لەتەسبیحاتو ئەڵلاهو ئەکبەر کردنو باسی ستایشو گەورەیی خودا کردنو قورئان خوێندن، گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) یا ئاوای فەرموو، یا فەرمایشتێکی لەم بابەتەی فەرموو. وەڵێ بەباوکمو بەدایکمەوە بەقوربانی بم، هیچ مامۆستایەکم نەدیوە نە بەر لە ئەوو نە لەدوا ئەو کە ئاوا وەك ئەو بە جوانیی مەردووم فێر بکا، دەسا بەخودا نە پیاما هەڵشاخا، نە سەرزەنشتی کردمو نە لێی دامو نە جوێنی پێدام، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من نۆ موسوڵمانمو تازە لەسەردەمی نەزانی دابڕاوم، خودایش ئەم ئایینە نازدارەی ئیسلامی بۆمان رەخساندووە، زویر مەبە ئەگەر پرسیارت لێ بکەم وەك ئەم پرسیارە: پیاوی وامان هەیە هامشۆی کوڵەنانییەکان دەکەن ئەوە چۆنە، تۆ بۆ ئەمە دەفەرمووی چی؟؟ فەرمووی: تۆ هامشۆیان مەکە. گوتم: هەندێ کەسیشمان هەیە نوقلانە لێ دەدەن ئەی ئەوە چییە؟ فەرمووی: ئەوە شتێکە دێ بەدڵتاناو خوو عادەتتان پێوە گرتووە بەڵام بایەخی نییەو دەربەستی مەیەنو لەبڕیاری خۆتان ساردتان نەکاتەوە (ن).

٤/٧٠٢[٢٨٥]– وعن العِرْباض بن سَاريةَ (رضي اللّه عنه)قال : وَعظَنَا رسول اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم) مَوْعِظَةً وَجِلَتْ مِنهْا القُلُوب. لەباسی (الأمر بالمُحافَظةِ على السُّنَّةِ)دا رابورد. بڕوانە: (١٥٧/٢ز –١٦).

---

[٢٨٥] بڕوانە: (١٥٧/٢ز ١٦).

## ٩٢- باسی سەلاری‌و هێدیتی - باب الوقار والسكينة

قال اللّٰه تعالى: {وعباد الرحمن الذين يمشون على الأرض هوناً، وإذا خاطبهم الجاهلون قالوا سلاماً}.

واتە: بەندە خوداپێداوەكانی خودای میهرەبان كە هەمیشە سەرگەرمی بەندەیی خودان ئەو كەسە بەڕێزو بەقەدرو سەلارانەن كە بە هێدی‌و هێمن‌و سەلاریی لەسەر زەوی بەشێنەیی دەڕۆن، تا بڵێی قسەیان شیرینەو گوتاریان جوانە، یادو زیكرو فیكرو بیری خودا هەمیشە لەناو دڵ‌و لەسەر زاریانە تەنانەت ئەگەر نەفامێ قسەیێ رەق بە روویان بدا نەفامانەو بێ وێلانە وەڵامی نادەنەوەو قسەیێ دەكەن كە پاك‌و بێ گەرد بێ.

١/٧٠٣[٢٨٦]- وعن عائشة رضي اللّٰه عنها قالت: مَا رَأَيْتُ رسول اللّٰه (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم) مُسْتَجْمِعاً قَطُّ ضَاحِكاً حَتَّى تُرى مِنه لَهَوَاتُه، إنَّما كانَ يَتَبَسَّمُ. متفقٌ عليه.

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: مـن بـەش بـەحاڵی خـۆم قـەت نەمدیوە كـە حـەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) بەتـەواوی پێبكـەنێ‌و وەهـا دەم دابپچڕێ كـە زەمانـە بچكۆلەی دەربكەوێ، وەلێ زەردەخەنەی دەكرد (ش).

## ٩٣- سوننەتە مرۆ بەشێنەیی‌و بەسەلاریی بڕوا بۆ نوێژو كۆڕی زانست‌و شتی وا
## باب الندب إلى إتيان الصلاة والعلم ونحوهما من العبادات بالسكينة والوقار

قال اللّٰه تعالى: { ومن يعظم شعائر اللّٰه فإنها من تقوى القلوب}.

١/٧٠٤[٢٨٧]- وعن أبي هريرة (رضي اللّٰه عنه)قال: سمعتُ رسول اللّٰه (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم)يقول: (إذا أُقِيمَتِ الصَّلاة، فَلا تَأْتُوهَا وأنْتُمْ تَسْعَوْنَ، وأْتُوهَا وَأَنْتمْ تَمْشُونَ، وعَلَيكم السَّكِينَة، فَما أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا) متفقٌ عليه. زاد مسلم في رواية له: (فَإنَّ أحدَكُمْ إذا كانَ يعمِدُ إلى الصلاةِ فَهُوَ في صلاةٍ).

ئەبو هورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی حەزرەتم بیست دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەر بێ) تەنانەت لەو كاتەیشدا كە قامەتی نوێژ دەكرێ بەپەلەپەل مەچن بۆی‌و هەڕا مەكەن، بەڵام بەشێنەیی‌و بەسەلاریی بچن بەلای

---

[٢٨٦] بوخاری (٢٤٢٨)و موسلیم (٨٩٩).

[٢٨٧] بوخاری (٩٠٨)و موسلیم (٦٠٢)و (١٥٢).

نوێژەوە، جا ئەوەی بەجەماعەت فریای کەوتن بیکەن‌و ئەوەیشی پیادا نەگەیشتن خۆتان تەواوی بکەن (ش) موسلیم (رەزای خودای لێ بێ) ئەمەی پتر کردووە: چونکە هەرکامێ لە ئێوە کە بەویستی دڵ چوو بەلای نوێژەوە ئیتر بەنوێژ حلێبە بۆی!

٢/٧٠٥[٢٨٨]- وعن ابن عباس رضي اللّٰه عنهما أَنَّهُ دَفَعَ مَعَ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يَوْمَ عرَفَةَ فَسَمع النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)وَرَاءه زَجْراً شَدِيداً وَضَرْباً وَصوْتاً للإبلِ، فَأَشار بِسَوْطِهِ إِلَيْهِمْ وقال: (أَيُّهَا النَّاسُ عَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ فَإِنَّ الْبِرَّ لَيْسَ بِالإِيضَاعِ) رواه البخاري، وروى مسلم بعضه.

ئیبنو عەبباس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: رۆژی عەرەفە کە لە خزمەتی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەر بێ) لە عەرەفەوە رۆیشتین بۆ موزدەلیفە، لەوێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) گوێی لێ بوو هەندێ کەس دەی یان لە ولاخ دەکردو بەتوندی تێیان دەخورین‌و لێیان دەدان، جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەقامچییەکەی ئاماژە (ئیشارەت)ی بۆ کردن‌و فەرمووی: ئەی موسوڵمانینە! لەسەر خۆبن، پەلەپەل باش نییە! (ب/م).

## ٩٤- باسی ڕێزگرتنی میوان - باب إكرام الضيف

قال اللّٰه تعالى: ﴿ هل أتاك حديث ضيف إبراهيم المكرمين، إذ دخلوا عليه فقالوا سلاماً، قال سلام قوم منكرون. فراغ إلى أهله فجاء بعجل سمين، فقربه إليهم قال: ألا تأكلون؟ ﴾ (الفرقان/٦٣).

واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! ئایا داستانە سەیرەکەی میوانە بەڕێزەکانی ئیبراهیم پێغەمبەری باپیرە گەورەی خۆتت پێ نەگەیشتووە؟ کە دەستەیە فریشتە لەگەڵ جوبرائیلدا چوون بۆ سەردانی‌و سڵاویان لێ کردو ئەویش بەجوانی وەڵامی سڵاوەکەی دانەوەو فەرمووی: نەبێ بە بێ وێڵی ناتان ناسم! جا نەیهێشت ئەوان پێی بزانن، چوو بۆ ماڵەوە گوێرەکەیەکی ناسکی قەڵەوی سەربڕی‌و برژاندی‌و بۆی بردن‌و بەڕێزەوە لەبەردەمیاندا دایناو فەرمووی: نافەرموون بخۆن؟

---

[٢٨٨] موسلیم (١٢٨٢).

وقال تعالى: { وجاءه قومه يهرعون إليه، ومن قبل كانوا يعملون السيئات! قال: يا قوم هؤلاء بناتي هن أطهر لكم، فاتقوا اللّه ولا تخزون في ضيفي، أليس منكم رجل رشيد؟!} (هود/٧٨).

واته: كاتێ فريشته فروستادەكانى ئێمه لەشێوەيەكى جوانكيلانەدا چوونه لاى لوط پيغەمبەر (دروودى خواى لەسەر بێ) خەمى لێ نيشتو تەنگى پێ هەڵچنراو، بوون بەبار لەسەر دڵىو فەرمووى: ئاى لەم رۆژە رەشە، بەڕاستى رۆژێكى دژوارو ناهەموارە، ئيتر هۆزەكەى بەهەڕاكردن رۆيشتن بۆ ماڵى لوط، بۆ گيانى ميوانەكانى، بەنيازى پيسى خۆيان، ئەو هۆزە بەدبەختە لەمێژەوە خوويان بەو خووە بۆگەنەوە گرتبوو، شەرمو شكۆيان لەم بارەيەوە نەمابوو. لوط لەناچاريداو لەشەرمانداو، بۆ رێزى ميوانەكانىو بۆ نەهێشتنى خراپتر بەخراپ، فەرمووى: خزمينە! شەرمێ لەخودا بكەن، لەخودا بترسن، پارێز لەبێ فەرمانى ئەو بكەن، ئابڕووى منو ميوانەكانم مەبەنو تەريقمان مەكەنەوە، ئەگەر هەر بەقسەم ناكەن هيچ نەبێ واز لەريسواكردنى ميوانەكانم بێننو چار نييە ئەوە كچەكانى خۆمتان لەتوڵەى ئەواندا دەدەمێ، چييان لێ دەكەن بيكەن، هەرچۆن بێ ئەمان بۆ ئەو ئيشە بۆگەنە لەبارترنو كەمتر پيسن، ئەوە بۆپياوێكى مەردى فاميدەتان تيادا نييە! تا لەم قسانەى من تێبگاو ئێوەى پێ قايل بكا.

١/٧٠٦- فەرموودەى: (مَنْ كانَ يُؤمنُ بِاللّه واليَومِ الآخِرِ فَلْيُكرِمْ ضَيفَهُ) لەباسى (حق العباد)دا رابورد، بڕوانه (٣٠٨/٦) + ٣٠٩/٧ز - ٣٩,

٢/٧٠٧[٢٨٩]- وعن أبي شُرَيْح خُوَيلِدِ بن عمرو الخُزَاعِيِّ (رضي اللّه عنه)قال: سَمِعتُ رسول اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يقول: (مَنْ كان يؤمِنُ باللّه واليوْم الآخِر فَلْيُكرمْ ضَيفَهُ جَائِزَتَهُ) قالوا: وما جَائِزَتُهُ يا رسول اللّه؟ قال: (يَومُه ولَيْلَتُه. والضِّيافَةُ ثَلاثَةُ أيّام، فما كان وَرَاءَ ذلكَ فهو صَدَقَة عليه) متفقٌ عليه. وفي روايةٍ لمسلم: (لا يحِلُّ لِمُسلمٍ أن يُقِيم عند أخِيهِ حتى يُؤثِمَهُ) قالوا: يا رسول اللّه. وكَيْف يُؤثِمُهُ؟ قال: (يُقِيمُ عِنْدَهُ ولا شَيءَ لَهُ يَقْرِيهِ بِهِ)

[٢٨٩] بوخارى (٦١٣٥)، موسليم (١٣٥٢/٣)، (١٤)و (١٥).

**ئەبو شورەیح خووەیلیدی کوڕی عەمری ئەل- خوزاعی** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لە پیغەمبەرم بیست دەیفەرموو:** (دروودی خوای لەسەر بێ) **ئەوەی کە بەساغی باوەڕی بەخوداو بە رۆژی دوایی هەیە با قەدری میوانی خۆی بگرێو خەلاتی بکا، یاران گوتیان: ئەی پیغەمبەری خودا! میوان کامەیە؟ فەرمووی: ئەوەیە کە لە شەوو رۆژی یەکەما زیادە خزمەتی بکا، لەراستیشدا میوانداریی سێ رۆژە، لەوە زیاتر خێر پێ کردنە (ش) لەگێڕانەوەیەکی موسلیمدا: دروست نیە بۆ هیچ موسولمانێ کە بە میوانی لەلای برای موسولمانی دایبکوتێ هەتا گوناهباری دەکا، گوترا: ئەی پیغەمبەری خودا! چۆن چۆنی تووشی گوناهی دەکا؟ فەرمووی: لەلای دایبکوتێ هەتا هیچی نەمێنێ بۆی بکا بەمیوانداریی** (*)

## ٩٥- مژدەی خۆشو پیربۆزبایی لەکاری خێردا سوننەتە
## باب استحباب التبشير والتهنئة بالخير

قال اللّٰه تعالى: {فبشر عباد الذين يستمعون القول فيتبعون أحسنه} (الزمر/١٧-١٨).

**واتە: ئەی خۆشەویست! مزگێنی خۆش بەو بەندە باشانەی من بدە، کە شایستەی نازناوی پیرۆزی (بەندە باشەکانی خۆم)ن، کە ئەو کەسانەن کە گوێ بۆ قسەی رەوا شل دەکەن، بەتایبەتی بۆ قورئانی پیرۆزو فەرمایشتی شەریعەت، ئەوجا کە بەباشی لێی حالی بوون بەجوانیی پەیڕەوی فەرمایشتە جوانەکانی دەکەنو بگرە بەووەشەوە ناوەستن هەتا باشتر وەستابێ بەلای کەمێ باشدا ناچن.**

وقال تعالى: { يبشرهم ربهم برحمة منه ورضوان، وجنات لهم فيها نعيم مقيم} التوبة/٢١.

**واتە: ئەو خودا پێداوانەی کە بەسەرو بەماڵ بۆ خودای خۆیان لێ بڕابوونو حالیان ئاوابوو کە لەپێشەوە روون کرایەوە، ئادەمیزاد ئەوانە خودا بۆخۆی مزگێنی خۆشیان دەداتێ،لەرۆژی قیامەتا بانگیان دەکاو موژدەیان دەداتێ، یا لەسەر زمانی فریشتەکانی، یا لەجیهاندا لەسەر زمانی پیغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **یا بەهۆی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزەوە، مزگێنی ئەوەیان دەداتێ کە رەحمەتی گەورەو نازو**

---

(*) کورد دەڵێ: کشە کشە پۆپنە رەشە، میوان شەوێ دوو شەو خۆشە، قسەی نەستەقی کوردیو پەندی پێشینان زۆریان لەشەرعو فەرمایشتی مەلاکانمان وەرگیراون. (وەرگێڕ).

بەهرەو نیعمەتو بەخششی جوانی خۆی چاوەڕێیانە، لەگەڵ چەند بەهەشتێ کە هی خۆیانەو پڕە لەنازو نیعمەتی نایابی نەبڕاوە!

وقال تعالى: {وأبشروا بالجنة التي كنتم توعدون}.

وقال تعالى: {فبشرناه بغلام حليم} الصافات/١٠١.

واتە: مژدەی کوڕێکی سەلارو هێمنی باشمان دا بە ئیبراهیم.

وقال تعالى: {ولقد جاءت رسلنا إبراهيم بالبشرى} هود/٦٩.

وقال تعالى: {وامرأته قائمة فضحكت فبشرناها بإسحاق، ومن وراء إسحاق يعقوب} هود/٧١.

واتە: فریشتە بەڕێزەکانی ئێمە مژدەی خۆشی دوو منداڵی ڕەحمەتیان برد بۆ ئیبراهیمو سارەی خێزانی، ئیبراهیم کاتێ کە فریشتەکان مژدەی ئەمانو ئاسایشیان بە ئیبراهیم دا سارە لەوێ وەستابوو لەخۆشی ئەوە پێکەنی.

وقال تعالى: {فنادته الملائكة وهو قائم يصلي في المحراب أن اللّٰه يبشرك بيحيى} آل عمران/٣٩.

واتە: زەکەریيا پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەناو میحرابا بەپاوە ڕاوەستابوو، نوێژی دەکرد، لەوکاتەدا جوبرائیل بانگی کردو پێی فەرموو: ئەی زەکەریيا! مزگێنیت لێ بێ‌نزاکەت گیرابوو، خودا موژدەت دەداتێ کوڕێکتان دەداتێ، ناوی یەحیایە!

وقال تعالى: { إذ قالت الملائكة يا مريم إن اللّٰه يبشرك بكلمة منه اسمه المسيح } آل عمران/٤٥.

واتە: ئەی خۆشەویست! لەم قورئانە پیرۆزەدا،کە یادنامەی ناوی خودا پێداوانە باسی ئەوکاتە پیرۆزە بکە کە جوبرەئیلی هێمن (ئەمین) بەمەریەمی فەرموو: ئەی مەریەم! خودای گەورە موژدەت پێ دەدا بە کوڕێکی جوانی جوانمەرد کە بەفەرمانی تایبەتی لەتۆ دەبێ، کە لەسەر فەرموودەی خودا بە وشەی (كن فيكون) ببە، ئیتر دەبێ دروست دەبێ، کە لەلایەنی خودا خۆیەوە دەگوترێ، نازناوی مەسیحە، واتە: پیرۆزو دڵسافو پاك، ناوی ڕاستی عیسایە، ناوبانگ بە کوڕی مەریەم دەردەکا.

والآيات في الباب كثيرة معلومة، وأما الأحاديث فكثيرة جداً وهي مشهورة في الصحيح. منها:

١/٧٠٨[٢٩٠]- عن أبي إبراهيمَ وَيُقَالُ أبو محمد ويقال أَبو مُعَاوية عبدِ اللَّه بن أبي أَوْفي (رضي اللَّه عنه)أَنَّ رسول اللَّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)بَشَّرَ خَدِيجَةَ، رضي اللَّه عنها، ببيْتٍ في الجَنَّةِ مِنْ قَصَبٍ، لاصَخبَ فِيه ولا نَصب. متفقٌ عليه:

**عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **مژدەی ئەوەیدا بە خەدیجە کە خودا لەبەهەشتا کۆشکێکی بۆ داناوە، لە مرواری هۆڵۆڵ دروستکراوە، نە دەنگە دەنگو قرە قرِی تیایەو نە نارِەحەتیوشەکەتی!** (ش).

٢/٧٠٩[٢٩١]- وعن أبي موسى الأشعريِّ (رضي اللَّه عنه)، أَنَّهُ توضَّأَ في بيتهِ، ثُمَّ خرَجَ فقال: لأَلْزَمَنَّ رسول اللَّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، ولأَكُونَنَّ معَهُ يومِي هذا، فجاءَ المَسْجِدَ، فَسأَلَ عَن النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فقَالُوا : وَجَّهَ ههُنَا، قال : فَخَرَجْتُ على أَثرِهِ أَسأَلُ عنْهُ، حتَّى دَخَلَ بِئْرَ أريس فجلَسْتُ عِنْدَ الْباب حتَّى قَضَى رسولُ اللَّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)حاجَتَهُ وتوضَّأَ، فقُمْتُ إِلَيْهِ، فإذا هُو قَدْ جلَس على بئر أَريس، وتَوسطَ قفَّها، وكَشَفَ عنْ ساقَيْهِ ودلاهمَا في البِئر، فَسلَّمْتُ عَلَيْهِ ثُمَّ انْصرفتْ، فجَلسْتُ عِند الباب فَقُلت: لأَكُونَنَّ بوَّاب رسُول اللَّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)اليوْم، فجاءَ أَبُو بَكْر (رضي اللَّه عنه)فدفع الباب فقُلْتُ : منْ هَذَا ؟ فَقَالَ : أَبُو بكرٍ، فقُلْت : على رِسْلِك، ثُمَّ ذَهَبْتُ فَقُلتُ : يا رسُول اللَّه هذَا أَبُو بَكْرٍ يسْتَأْذِن، فَقال: (ائْذَنْ لَه وبشِّرْه بالجَنَّةِ) فَأَقْبلْتُ حَتَّى قُلت لأبي بكر : ادْخُلْ ورسُولُ اللَّه يُبشِّرُكَ بِالجنةِ، فدخل أَبُو بَكْرٍ حتَّى جلَس عنْ يمِين النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)معَهُ في القُفِّ، ودَلَّى رِجْلَيْهِ في البئِرِ كما صنَعَ رَسُولُ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، وكَشَف عنْ ساقَيْهِ، ثُمَّ رَجَعْتُ وجلسْتُ، وقد تركْتُ أَخِي يتوضأُ ويلْحقُني، فقُلْتُ : إنْ يُردِ اللَّه بِفُلان يُريدُ أَخَاهُ خَيْراً يأْتِ بِهِ، فَإِذا إِنْسانٌ يحرِّكُ البابَ، فقُلت : منْ هَذَا ؟ فَقال : عُمَرُ بنُ الخطَّابِ : فقُلْتُ: على رِسْلِك، ثُمَّ جئْتُ إلى رَسُول اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، فَسلَّمْتُ عليْهِ وقُلْتُ : هذَا عُمرُ يَسْتَأْذِنُ ؟ فَقَالَ: (ائْذنْ لَهُ

---

[٢٩٠] بوخاری (٣٨١٩)و موسلیم (٢٤٢٣).

[٢٩١] بوخاری (٣٦٧٤)و موسلیم (٢٤٠٣)و (٣٩).

وبشِّرْهُ بِالجَنَّةِ) فَجِئْتُ عمر، فَقُلْتُ : أَذِنَ أُدخلْ وَيُبَشِّرُكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)بِالجَنَّةِ، فَدَخَل فجَلَسَ مَعَ رسُول اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)في القُفِّ عَنْ يسارِهِ ودَلَّى رِجْلَيْهِ في البِئْر، ثُمَّ رجعْتُ فَجلَسْتُ فَقُلْت : إن يُرِدِ اللَّه بِفلان خَيْراً يعْني أَخاهُ يأْت بِهِ، فجاء إنْسانٌ فحركَ الباب فقُلْتُ : مَنْ هذَا ؟ فقَال : عُثْمانُ بنُ عفانَ. فقلْتُ : علَى رسْلِكَ، وجئْتُ النَّبيّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، فَأْخبرْتُه فقَالَ : (ائْذَن لَهُ وبَشِّرْهُ بِالجَنَّةِ مع بَلْوى تُصيبُهُ) فَجئتُ فَقُلتُ : ادْخلْ وَيُبشِّرُكَ رسُولُ اللَّه (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)بالجَنَّةِ مَعَ بَلْوَى تُصيبُكَ، فَدَخَل فَوَجَد القُفَّ قَدْ مُلِئَ، فَجَلَس وُجاهَهُمْ مِنَ الشَّقِّ الآخرِ. قَالَ سَعِيدُ بنُ المُسَيَّبِ : فَأَوَّلْتُها قُبُورهمْ. متفقٌ عليه. وزاد في روايةٍ : (وأمَرني رسولُ اللَّه (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)بِحِفْظِ الباب وَفِيها : أَنَّ عُثْمانَ حِينَ بشَّرهُ حمِدَ اللَّه تعالى، ثُمَّ قَال : اللَّه المُسْتعَانُ.

ئەبوو مووسای ئەشعەری (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ دەسنوێژم گرتو لەماڵەوە دەرچووم‌و گوتم: ئەمڕۆ لەخزمەتی حەزرەتدا دەبم لێی جیانابمەوە، ئەوجا چووم بۆ مزگەوت‌و پرسیاری پێغەمبەرم کرد، گوتیان: رووی کردە ئێرەوەو بەرەو ئێرە رۆیشت، ئیتر بەشوێنیا رۆیشتم‌و بە پرسیار دوای کەوتم تا چووە باخەکەی‌بیری ئەریس، ئیتر من لەبەر دەرگاکەدا دانیشتم تا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستی بەئاو گەیاندو دەستنوێژی گرت، ئەوجا هەڵسام‌و چوومە خزمەتی، کە تەماشام کرد وابۆ خۆی لەسەر ئاخڵەی بیرەکە دانیشتووە لەناوەڕاستەکەیداو هەردوو لاقی هەڵماڵیوەو شۆڕی کردوونەتە خوارەوە بەناو بیرەکەدا، منیش سڵاوم لێ کردو سڵاوەکەی سەندمەوەو بەشوێنی خۆما گەڕامەوەو لەبەر دەرگاکە دانیشتم‌و گوتم: ئەمڕۆ دەبم بە دەرکەوانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ)، دوا بەدوای ئەوە ئەبوبەکر هات‌و دەستی نا بەدەرگاکەوە کە بیکاتەوە، گوتم: ئەوە کێیە؟ فەرمووی: ئەبوبەکرە، گوتم: هێواش بە. جا چووم گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە ئەبوبەکرە هاتووە داوای رێگەپێدانەدەکا کەبێتە ژوورەوە، فەرمووی: رێگەی پێ بدەبایێ‌و مژدەی بەهەشتیشی بدەرێ، جا چوومەوە بۆ لای‌و پێم گوت: فەرموو وەرە ژوورەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) موژدەی بەهەشتت دەداتێ، ئەبوبەکر هاتە ژوورەوەو لەلای راستی پێغەمبەرەوە دانیشت، لەسەر ئاخڵەکەو قاچەکانی داهێشتە ناو بیرەکەو ئەویش وەك پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هەردوو لاقی خۆی هەڵماڵی هەتا

پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەئیسراحەتی خۆی دابنیشێو بەهۆی هاتنی ئەوەوە وەزعی لێ تێك نەچێ؟ ئینجا گەڕامەوە بۆ شوێنەکەی خۆمو لەبەر دەرگاکەدا دانیشتم، کاتێ لەماڵ دەرچووم براکەم خەریك بوو دەستنوێژی دەگرت، بەنیازی ئەوە کە بەشوێنما بێ بۆلام، جا گوتم: ئەگەر خودا خواستی لەسەر ئەوەبێ کە فیسارە کەس – واتە: براکەی – تووشی خێر بکا ئەوا دەیهێنێ بۆ ئێرە، تا لەم خێرو بێرەی بەربکەوێ، لەم خەیاڵانەدا بووم لەوکاتەدا مرۆڤێکی تریش دەرگاکەی جووڵانەوە، گوتم: ئەوە کێیە؟ گوتی: عومەری کوڕی خەتتابە، گوتم: هێواش بە، چوومەوە خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ)و سڵاوم لێ کردەوەو عەرزیم کرد: ئەوە عومەرە هاتووە داوای ڕێگەپێدان دەکا کەبێتە ژوورەوە، فەرمووی: ڕێگەی پێ بدە بابێو، مژدەی بەهەشتیشی بدەرێ! چوومەوە بۆلای عومەرو پێیم گوت: فەرموو وەرە ژوورەوە، پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) مـوژدەی بەهەشتت دەداتێ، ئەویش هاتە ژوورەوەو لەگەڵ پیغەمبەردا، لەلای چەپییەوە لەسەر ئاخڵەی بیرەکە دانیشتو هەردوو قاچی داهێشتە ناو بیرەکە، دیسان چوومەوە لەشوێنەکەی خۆم دانیشتمەوەو گوتمەوە: ئەگەر خودا خواستی خێری بە براکەم هەبێ ئەوا ئێستا دەیهێنێ بۆ ئێرە، لەم دەمەدا مرۆڤێکی تریش دەرگاکەی جووڵاندەوە، گوتم: ئەوە کێیە؟ گوتی: عوسمانی کوڕی عەففانە، گوتم: تۆزێ هێواشکە، چوومەوە خزمەتی حەزرەتو هەواڵەکەم پێی ڕاگەیاند، فەرمووی: ڕێگەی پێ بدەو مژدەی بەهەشتی پێ بدە، گەرچی تووشی مەینەتو بەڵایەکیش دەبێ، چوومەوە بۆ لایو پێیم گوت: فەرموو وەرە ژوورەوە، پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) موژدەی بەهەشتت دەداتێ، وەلێ تووشی مەینەتو بەڵایەکیش دەبی، ئەویش هاتە ژوورەوە، ڕوانی ئاخڵەکە پڕبووەو کەسی تر ناگرێ، ئیتر بەرابەری ئەوان لەلایەکەی تری بیرەکەوە دانیشت. سەعیدی کوڕی موسەییەب دەفەرموێ: ئەم چۆنێتیی دانیشتنەیانم لێکدایەوە بەچۆنێتیی شوێنی گۆڕەکانیان، کە ئەبوبەکرو عومەر لەگەڵ حەزرەتدا لە گوومەزە سەوزە (قویبەتولخەضرا)کەدا لەمەدینەی پیرۆز نێژراون، وەلێ عوسمان لەوان جیابۆتەوەو لە گۆڕستانی بەقیع نێژراوە(ش)، لەگێڕانەوەیەکا ئەمەی پترە، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی پێ فەرمووم کە ئاگاداریی دەرگاکە بکەم هەر لەم گێڕانەوەیەدا دەفەرموێ: کاتێ ئەبو مووسا مژدەکە دەدا بە عوسمان سوپاسو ستایشی خودا

دەکـاو دەفـەرموێ: (الله المستعان) هـەر خودایـە کـە داوای یارمـەتی لێ دەکـرێو بەتەمای خودا.

٣/٧١٠- فەرموودەی (كُنَّا قُعُوداً حَوْلَ رسول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم، وَمعَنا أبُو بكْرٍ وعُمَرُ رضي اللّٰه عنهما) لەباسی (الرجاء)دا رابورد. بروانە: (١٣/٤٢٤ز -٥١).

٤/٧١١[٢٩٢]- وعن ابنِ شُماسَةَ قال: حَضَرْنا عَمْرَو بنَ العاص (رضي اللّٰه عنه)، وَهُوَ في سِيَاقَةِ المَوْتِ فَبَكى طَوِيلاً، وَحَوَّلَ وَجْهَهُ إلى الجِدَار، فَجعَلَ ابْنُهُ يَقُولُ: يا أبَتاهُ، أمَا بَشَّرَكَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)بكَذَا ؟ أَما بشَّرَكَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)بكَذَا؟

فَأقْبَلَ بوَجْهِهِ فَقَالَ: إنَّ أَفْضَلَ مَا نُعِدُّ شَهَادَةُ أَنْ لاَ إلهَ إلاَّ اللّٰه، وأَنَّ مُحمَّداً رسُول اللّٰه إنِّي قَدْ كُنْتُ عَلى أَطْبَاقٍ ثَلاثٍ : لَقَدْ رَأَيْتُني وَمَا أَحَدٌ أَشَدَّ بُغْضاً لرَسُول اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)مِنِّي، وَلا أَحبَّ إليَّ مِنْ أنْ أَكُونَ قَدِ استمْكَنْت منْهُ فقَتلْتهُ، فَلوْ مُتُّ على تِلْكَ الحال لَكُنْتُ مِنْ أَهْلِ النَّار.

فَلَمَّا جَعَلَ اللّٰهُ الإسْلامَ في قَلْبي أَتيْتُ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فَقُلْتُ : ابْسُطْ يمِينَكَ فَلأُبَايعْكَ، فَبسَطَ يمِينَهُ فَقَبضْتُ يَدِي، فقال: (مالـك يـا عمرو؟) قلـت: أَرَدْتُ أَنْ أَشْتَرِطَ قَالَ: (تَشْتَرِطُ ماذَا؟) قُلْتُ أَنْ يُغْفَرَ لي، قَالَ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ الإِسْلام يَهْدِمُ ما كَانَ قَبلَهُ، وَأَن الهِجرَةَ تَهدِمُ ما كان قبلَها، وأَنَّ الحَجَّ يَهدِمُ ما كانَ قبلَهُ ؟)

وما كان أَحَدٌ أَحَبَّ إليَّ مِنْ رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، وَلا أَجَلّ في عَيني مِنْه، ومَا كُنتُ أُطِيقُ أَن أَملأَ عَيني مِنه إجلالاً له، ولو سُئِلتُ أَن أَصِفَهُ ما أَطقتُ، لأَنّي لم أَكن أَملأ عَيني مِنه ولو مُتُّ على تِلكَ الحَال لَرَجوتُ أَن أَكُونَ مِنْ أَهْلِ الجَنَّة. ثـم وُلِّينـا أَشْياءَ ما أَدري ما حَالي فِيهَا ؟ فَإِذا أَنا مُتُّ فلا تصحَبنِّي نَائِحَةٌ ولا نَارٌ، فـإذا دَفنتمـوني، فشُنُّوا عليَّ التُّرَابَ شَنًّا، ثم أَقِيمُوا حولَ قَبري قَدْرَ ما تُنحَرُ جَزورٌ، ويُقْسَمُ لَحمُهَا، حَتَّى أَسْتَأْنِس بكُمْ، وأنظُرَ ما أُرَاجِعُ بِهِ رسُلَ ربي. رواه مسلم.

ئیبنو شەماسە (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: لەسـەرەمەرگا بـە دیـاری عـەمری کوڕی عاصەوە بووین، زۆر گریاو رووی کردە دیوارەکە، کوڕەکەشی هـەر دەیگوت: ئـبابـە! بۆ وادەکەی؟ خۆ تـۆ پێغەمبـەری (درودی خوای لەسەر بێ) مـژدەی ئـەمـەو ئـەوەی پێت داوە.

---

[٢٩٢] موسلیم (١٢١).

گوتی: ئەویش رووی تێکردین و گوتی: گەورەترین شت کە ئامادەمان کردووەو جێگەی ئومێدمانە شایەتی دانە بەمە: (أشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله)، من بەم سێ حاڵەدا تێپەڕیوم: لەپێشدا وابووم کەس وەك من وا زۆر رقی لە پێغەمبەر نەبوو، لەوەم لەلا خۆشتر نەبوو کە چنگم لێی گیر ببێ و بیکوژم، ئەگەر خوانەخواستە لەسەر ئەو حاڵە بمردمایە بێگومان دۆزەخی دەبووم، کاتێکیش کە خودا ئیسلامەتیی نایە ناو دڵمەوە بەپێی خۆم چوومە خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) عەرزیم کرد: دەستی راستت بێنە هەتا بەیعەت و پەیمانت بدەمێ، جا کە ئەو دەستی خۆی درێژکرد من دەستی خۆمم کێشایەوە. فەرمووی: ئەی عەمر! ئەوە چیتە بۆ وادەکەی؟ عەرزیم کرد: دەمەوێ مەرج دابنێم! فەرمووی: مەرجی چی دادەنێی؟ عەرزیم کرد: کە خوا لێم خۆش بێ، فەرمووی: ئەدیی نازانی کە ئیسلامەتی هەرچی گوناهێ لەپێش خۆیەوە بووبێ دەیرمێنێ، هەروا کۆچ و رەوکردنیش لەوڵاتی کوفرەوە بۆ وڵاتی ئیسلام هەرچی گوناهو تاوانی پێش خۆیەتی دەیرِوخێنێ، هەروەها حەجکردنیش هەرچی گوناهێ لەپێشیەوە بووبێ دەیسرِێتەوە، ئیتر لەوەودوا کە موسوڵمان بووم کەسی تر وەکوو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئاوا خۆشەویست و نازادار نەبووە لەبەرچاوم، ئەوەندە نازدارو بەقەدرو بەرێزو بەسامو شکۆ بوو پرکێشیم نەدەکرد کە پڕ بەدڵ تێرو پڕ سەیری بکەم! تەنانەت ئەگەر کەسێ داوام لێبکا کە ناونیشانی هەڵبدەم ناتوانم بۆم هەڵنادرێ، چونکە لەبەر خۆشەویستی و سامو شکۆی، زاتم نەدەکرد بەوردیی سەرنجی بدەم،ئەگەر لەسەر ئەم حاڵە بمردمایە ئەوە هیوام وابوو کە بەهەشتیی بوومایە، وەلێ لەدوای ئەوە بووین بەسەرکارو کاربەدەست لەسەر هەندێ شت، لەماوەی ئەوکاربەدەستییەدا نازانم حاڵم چۆن دەبێ، جا کە مردم نە سەردۆلکەبێژ (نائیحە: ژنی شیوەنکەر) نەئاگرو بخوردم لەگەڵ دا نەیەت بۆسەر گۆڕخانە، وەلەکاتی ناشتنم دا خۆڵ و گڵەکە کەمە کەمە بکەن بەسەرما، لەپاش دا ئەوەندە لەدەوری گۆڕەکەم بوەستن کە وشترێ سەربڕێ و گۆشتەکەی دابەش بکرێ، هەتا هۆبگرم پێتانەوەو بەزاتی ئێوەوە سامم بشکێ و بیرێ بکەمەوە کە چۆن وەرامی فروستادەکانی پەروەردگارم بدەمەوەو چی بە نەکیرو مونکەر بڵێم! (ئیمامی موسلیم رەحمەتی خودای لێ بێ- گێڕاویەتییەوە).

**باسی بەڕێکردنی هاوڕێو ئامۆژگاری خێرکردنی لەسەفەرو لەکاتی لەیەك بڕان دا.
وەنزاکردن بۆیو داوای نزاکردن لێی**

**٩٦- باب وداع الصاحب ووصيته عند فراقه لسفر وغيره والدعاء له وطلب الدعاء منه**

قال اللّه تعالى:{ ووصى بها إبراهيم بنيه ويعقوب: يا بني إن اللّٰه اصطفى لكم الدين فلا تموتن إلا وأنتم مسلمون، أم كنتم شهداء إذ حضر يعقوب الموت إذ قال لبنيه ما تعبدون من بعدي؟ قالوا: نعبد إلهك وإله آبائك إبراهيم وإسماعيل وإسحاق إلهاً واحداً، ونحن له مسلمون – البقرة/١٣٢ – ١٣٣}.

واتە: باوكی پێغەمبەران ئیبراهیم كە دۆستو خەلیلو پێغەمبەری خودایە، هەروا پێغەمبەری گەورەو بەڕێز یەعقوب، ئەم ئامۆژگاریو راسپێرییەی جوانەیان بۆ كوڕەكانی خۆیان كرد: رۆڵەكانم! كوڕە شیرینەكانم! گوێ بۆ تەمێو ئامۆژگاری باوكی دڵسۆزی خۆتان شل بكەن، بزانن یەزدانی مەزن ئایینی ئیسلامی پیرۆزی بۆ ئێوە هەڵبژاردووە، هەتا مردن لەم ئایینە پاكە واز مەهێنن‌و بە موسوڵمانی بژین‌و بە موسوڵمانی بمرن هەتا بە موسوڵمانیش زیندوو دەكرێنەوە، دیارە ئێوە بە دیار یەعقوبەوە نەبوون لەسەرەمەرگا، لەبەر ئەوە ناشزانن كە چی راسپێرییەكی كوڕەكانی كردووە، بەڵام ئێمە ئاگامان لە هەموو شتێكە، فەرمووی بەكوڕەكانی: لەو كاتی جیابوونەوەدا: لەپاش مەرگی من چی دەپەرستن؟ فەرموویان: هەر ئەوخودایە دەپەرستین كەهەتا ئێستا لەگەڵ تۆدا پەرستوومانە، كەخودای خۆت‌و خودای باوباپیرانتە، كە خودایەكی تاك‌و تەنیایە، ئێمەیش وەك خۆت‌و باوباپیرەكانت – كە ئیبراهیم‌و ئیسماعیل‌و ئیسحاقن – لەسەرە ئایینی پیرۆزی ئیسلامین‌و موسوڵمانی ساغی خوداین!

وأما الأحاديث فمنها:

٧١٢/١- بڕوانە: (٣٤٦/١ز -٤٣). فەرموودەی زەیدی كوڕی ئەرقەم كەلە باسی (إكرام أهل بيت رسول الله)دا رابورد.

٧١٣/٢[٢٩٣]- وعن أبي سُلَيْمَانَ مَالك بن الحُوَيْرِثِ (رضي اللّٰه عنه)قال: أَتَيْنَا رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)ونَحْنُ شَبَبَةٌ متَقارِبُونَ، فَأَقمْنَا عِنْدَهُ عِشْرينَ لَيْلَةً، وكانَ رسولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)رَحِيماً رفِيقاً، فَظَنَّ أَنَّا قَدِ اشْتَقْنَا أَهْلَنَا. فسَأَلَنا عَمَّنْ

---

[٢٩٣] بوخاری (٦٢٨)و موسلیم (٦٧٤).

تَرَكْنَا مِنْ أَهْلِنَا، فَأَخْبَرْنَاهُ، فقال: (ارْجعُوا إلى أَهْلِيكم فَأَقِيمُوا فِيهِمْ، وَعلِّموهُم وَمُرُوهُمْ، وَصَلُّوا صَلاةَ كَذا في حِين كَذَا، وَصَلُّوا كَذَا في حِين كَذَا، فَإذَا حَضَرَتِ الصَّلاةُ فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ أَحَدُكُمْ، وَلْيؤمَّكُم أَكبَرُكُم) متفقٌ عليه. زاد البخاري في رواية له: (وَصَلُّوا كمَا رَأَيتُمُوني أُصَلِّي).

**مالیکی کوڕی حووەیرث** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: دەستەیەکی لاو بووین، لەیەك تەمەندا بووین، چووینە خزمەتی پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **بیست شەو لە خزمەتیدا ماینەوە، پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **گەلێ رەحمو دڵسۆز بوو بۆمان، لەوماوەیەدا گەلێ شت لە حەزرەتە وە فێربووین، حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **بەدڵسۆزی خۆی هەستی کرد کە یادو بیرو تاسەی کەس‌وکارمان دەکەین لەم بارەیەوە پرسیاری لێ کردین کە کێمان لەوڵاتی خۆمان هەیە، ئیمەیش عەرزیمان کرد: فەرمووی: دە بگەڕێنەوە بۆ ناو کەس‌وکاری خۆتان‌و لەناویانا بمێننەوەو فێری شەریعەتیان بکەن‌و فەرمانیان پێ بکەن بەخوداپەرستی‌و، ئەو نوێژە لەو کاتەدا بکەن‌و، ئەو نوێژەی تریش لەو کاتەی تردا بکەن، هەرکاتێ نوێژ بوو باکەسێ لەخۆتان بانگتان بۆ بداو کامتان بەتەمەن لەهەمووتان گەورەتر بوو ئەوە بەرنوێژییەکەتان بۆ بکا! (ش) بوخاری (رەحمەت لەگۆڕی نازداری) لەگێڕانەوەیەکی تایبەتی خۆیدا ئەمەی پتر کردووە: تەماشای خۆم بکەن چۆن نوێژ دەکەم ئێوەیش ئاوا نوێژ بکەن!**

٣/٧١٤[٢٩٤]– وعن عُمَرَ بنِ الخطاب (رضي اللّٰه عنه)قال : اسْتَأْذَنْتُ النَّبيَّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)في الْعُمْرَةِ، فَأَذِنَ، وقال : (لا تنْسنَا يَا أخيَّ مِنْ دُعَائِك) فقالَ كَلِمَةً ما يَسُرُّني أَنَّ لي بهَا الدُّنْيا. وفي رواية قال : (أَشْرِكْنَا يَا أخَيَّ في دُعَائِكَ) رواه أبو داود، والترمذي وقال : حديث حسن صحيح.

**عومەری کوڕی خەططاب** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: داوای ڕێپێدانم لە پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **کرد، کەبچم بۆ عەمرە، حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **ڕێگەی پێدام‌و فەرمووشی ئەی براله!.. هەتا کۆتایی. لەزنجیرە چل‌و پێنجدا لەباسی (زيارة أهل الخير)دا رابورد. بڕوانە: (١٤/٣٧٣ز ٤٥).**

---

[٢٩٤] ئەبو داوود (١٤٩٨)، تیرمیذي (٣٥٥٧).

٧١٥/٤(٢٩٥)- وعن سالم بن عَبْدِ اللّٰه بن عُمَرَ أَنَّ عبدَ اللّٰه بن عُمَرَ رضي اللّٰه عنهما كَانَ يَقُولُ لِلرَّجُلِ إِذَا أَرَادَ سفراً : ادْنُ مِنِّي حَتَّى أُوَدِّعَكَ كمَا كَانَ رسولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يُودِّعُنَا فيقُولُ: أَسْتَوْدِعُ اللّٰه دِينَكَ، وَأَمانَتَكَ، وخَوَاتِيمَ عَمَلِكَ، رواه الترمذي، وقال: حديث حسن صحيح.

سالیمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودای مەزن لەخۆیو بابو باپیری) فەرمووی: دەستووری عەبدوڵڵای کوڕی عومەر وابوو پیاوێ دەیویست بچێ بۆ سەفەرێ پێی دەفەرموو: لێم نزیك بەرەوە با بەپێی ڕێبازو سوننەتی پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەڕێت بکەم، وەك چۆن جاران پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئێمەی بەڕێ دەکرد، کە دەچووین بۆ ڕێبوارییی ئاوا، دەیفەرموو: (دروودی خوای لەسەر بێ): (أَسْتَوْدِعُ اللّٰه دِينَكَ، وَأَمانَتَكَ، وخَوَاتِيمَ عَمَلِكَ): دینو ئایینو ماڵو منداڵو کەسوکارتان – کەسپاردەی خودان لەلای ئێوە –و سەرەنجامی سەربەخێری هەموو کاروفرمانێکتانم ئەسپارد بەیەزدانی پاك. (ت:ح/ح/ص).

٧١٦/٥(٢٩٦)- وعن عبدِ اللّٰهِ بن يزيد الخَطْمِيِّ الصَّحَابِيِّ (رضي اللّٰه عنه)قال : كَانَ رسولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذا أَرَادَ أَنْ يُوَدِّعَ الجَيْش قالَ : (أَسْتَوْدِعُ اللّٰه دِينكُمْ، وَأَمَانَتكُم، وَخَوَاتِيمَ أَعمَالِكُمْ).حديث صحيح، رواه أبو داود وغيره بإسناد صحيح.

عەبدوڵڵای کوڕی یەزیدی خەطمی کەهاوڕێی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) بوو، فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستووری وابوو، کەسوپایەکی بەڕێ دەکرد بۆ غەزا پێی دەفەرموون: (أَسْتَوْدِعُ اللّٰه دِينَكُمْ، وَأَمَانَتكم، وَخَوَاتِيمَ أَعمَالِكُمْ): دینو ئایینو ماڵو منداڵو کەسوکارتان – کەسپاردەو ئەمانەتی خودان لەلای ئێوە – سەرەنجامی سەربەخێری هەموو کارو ئیشێکی ئێوەم سپارد بەخودا کەچاوی خێری لێتان بێ! (د – ح/ص).

٧١٧/٦(٢٩٧)- وعن أَنسٍ (رضي اللّٰه عنه)قال: جَاءَ رَجُلٌ إلى النَّبيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فقال: يا رسُولَ اللّٰه، إِني أُرِيدُ سَفَراً، فَزَوِّدْني، فَقَالَ: (زَوَّدَكَ اللّٰه التَّقْوَى). قال:

---

(٢٩٥) تيرميذي (٣٤٣٩).

(٢٩٦) ئەبو داوود (٢٦٠١).

(٢٩٧) تيرميذي (٣٤٤٠).

زِدْني، قال: (وَغَفَرَ ذَنْبَكَ) قال: زِدْني، قال: (وَيَسَّرَ لكَ الخيْرَ حَيْثُمَا كُنْتَ) رواه الترمذي وقال: حديث حسن.

**ئەنەس** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرموی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **گوتی: ئەی پیغەمبەری خودا! نیازی سەفەرم هەیە، دەمەوێ بچم بۆ رێبوارییی، دەی بفەرموو بەم بۆنەیەوە توێشوویەکم بدەرێو نزایەکی خێرم بۆ بکە، فەرمووی: خودا لەتوێشووی لەخوداترسیو تەقوا بەشت بدا، کەخۆی لەم ئایەتە پیرۆزە دایناوە بەباشترین توێشوو: کە دەفەرموێ: {وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى — البقرة/١٩٧}(*) گوتی قوربان! دووعایەکی تریشم بۆ بکە، فەرمووی: وەلە گوناهیشت خۆش ببێ، گوتی: باوكو دایکم بەقوربانت بن، نزایەکی تریشم بۆ بکە، فەرمووی: یاخودا لەهەرکوێ ببی خودا خێرو بێرو خۆشیت بۆ بڕەحسێنێ! هەمیشە باشت بۆ بکا! (ت:ح/ح)**

**بەپێی فەرمانی ئەم فەرموودەیە، دەقێکی تری نزای بەرێ کردنی رێبوار ئاوایە** (زودك الله التقوى، وغفر ذنبك، ويسر لك الخير حيثما كنت) **خودا لە تۆشەی تەقوا بەشت بداو لەگوناهت خۆش بێو هەمیشە چاکت بۆ بکا.**

**٩٧- راوێژ پێ کردنو نزای نیشاندانی خێر - باب الاستخارة والمشاورة**

قال اللّه تعالى: {وشاورهم في الأمر —آل عمران/١٥٩}.

**واتە: ئەی خۆشەویست! تۆ لەرەحمەتی خوداوە، بەنەرمونیانی لەگەڵیاندا دەجوڵێیتەوەو بەنەرمی دەیان لاوێنی، دیارە خوانەخواستە ئەگەر مۆنو رووگرژو**

---

(*)

ئەی کاکەی رێبوار! لەسەفەری ژین
تۆشە هەڵبگرە بەپێی ئەمری دین!
تۆشەبەری دڵ پڕبکە لەتەقوا،،
گەنجی گەوهەرت بدەرە دەس خوا
کورە! لەگۆڕا کۆڕی لێ دەگرین
زادمان پێ نەبێ لەبرسا دەمرین!!

(وەرگێر).

دڵڕەق‌و بەدخوو بوویتایە، هەموو لەدەورت دەتەکێنەوەو پشتیان چۆڵ دەکردی، دەی عەفوو چاوپۆشی لەهەڵەیان بکە بەپیشەی هەمیشەت‌و سەرەڕای ئەوەیش لەخودایش داوای لێبووردن‌و لێخۆشبوونیان بۆ بکە، رێزی رایان بگرەو لەکاروباری جەنگ‌و لەئیش‌و فەرمانی جیهانیدا راوێژێکی جوانیان پێ بکەو بەوە دڵیان رابگرە، جا لەپاش گفتوگۆو راوێژکردن لەناو خۆتاندا چیتان بڕیارداوە رای جەماوەر لەسەر چی یەکی گرت بەبێ خاوەخاوو ڕاڕایی ئەوە بکەن‌و ورەتان بەرزبێ‌و عەزمتان نەشکێ‌و بۆ دڵنیایی‌و زیادە پشتەستووری پشت بەیاریدەی خودا ببەستن.

وقال تعالى: { وأمرهم شورى بينهم – الشورى/٣٨}.

واتە: وە ئەو بەشە باشە وابەلای خوداوە بۆ ئەو کەسانەیشە کە فەرمانی خودا بەجوانی بەجێ دێنن‌و نوێژەکان بەپوختەیی دەکەن‌و ئیش‌وکاری گرنگیان بەراوێژە، پرس‌و راو لێکدانەوە ئەنجام دەدەن‌و لەو ماڵی رەحمەتەیش کەخودا پێی داون چاکەو خێرو پیاوەتی لێ دەکەن.

١/٧١٨[٢٩٨]– عن جابرٍ (رضي اللّه عنه)قال : كانَ رسولُ اللّـه (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم)يُعَلِّمُنَا الاسْتِخَارَةَ في الأُمُور كُلِّهَا كالسُّـورَةِ مـنَ القُـرْآن، يَقُـولُ إذا هَـمَّ أَحَـدُكُمْ بالأمر، فَلْيَركعْ رَكعتَـيْنِ مِـنْ غَيْـرِ الفريضَـةِ ثـم ليقُـلْ: اللّهُـمّ إنـي أَسْـتَخِيرُكَ بعِلْمِـكَ، وأستقدِرُكَ بقُدْرتك، وأَسْأَلُكَ مِنْ فضْلِكَ العَظِيم، فإنَّكَ تَقْدِرُ ولا أَقْدِرُ، وتعْلَمُ ولا أَعْلَـمُ، وَأَنتَ علاّمُ الغُيُوبِ. اللّهُمَّ إنْ كنْتَ تعْلَمُ أَنَّ هذا الأمرَ خَيْرٌ لي في دِيني وَمَعَاشي وَعَاقِبَـةِ أَمْرِي) أَوْ قالَ: (عَاجِلِ أَمْري وَآجِله، فاقْدُرْهُ لي وَيَسِّرْهُ لي، ثمَّ بَارِكْ لي فِيهِ، وَإن كُنْـتَ تعْلَمُ أَنَّ هذَا الأَمْرَ شرٌّ لي في دِيني وَمَعاشي وَعَاقبةِ أَمْري) أَو قال: (عَاجِل أَمري وآجِلـه، فاصْرِفهُ عَني، وَاصْرفني عَنهُ، وَاقدُرْ لي الخَيْرَ حَيْثُ كانَ، ثُـمَّ رَضِّـني بـهِ) قـال: ويسـمِّي حاجته. (فَيقولُ: أللّهُمَّ إنْ كُنتَ تَعْلَمُ أَنَّ حَجّي في هذا الْعام مَثَلاً – دَليلُ الفـالحِين) رواه البخاري.

---

[٢٩٨] بوخاری (١١٦٢).

**جابیر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەستووری وابوو، بۆ هەموو کارو فەرمانێ فێری دوعاو نوێژی ئیستخارەی دەکردین، وەك چۆن فێری سوورەتەکانی قورئانی دەکردین، ئاوا بەرەوانییو روونی وشە بەوشە نزاکەی فێر دەکردین، دەیفەرموو: ئەگەر یەکێکتان نیازی کارێکی هەبوو، وە نەیدەزانی باشە یان خراپە با لەپێشا دوو رکات نوێژی سوننەت بکا، ئینجا بڵێ:** (اللّٰهُم إني أَسْتَخِيرُكَ بعلْمِكَ، وأستقدِرُكَ بقُدْرتك، وأَسْأَلُكَ مِنْ فضْلِكَ العَظِيم، فإنَّكَ تَقْدِرُ ولا أَقْدِرُ، وتعْلَمُ ولا أَعْلَمُ، وَأَنتَ علاَّمُ الغُيُوبِ. اللّٰهُمَّ إنْ كنْتَ تعْلَمُ أَنَّ هذا الأمرَ خَيْرٌ لي في دِيني وَمعَاشي وَعَاقِبَةِ أَمْري) **یان فەرمووی:** (عَاجِلِ أَمْري وَآجِله، فاقْدُرْهُ لي وَيَسِّرْهُ لي، ثُمَّ بَارِكْ لي فِيهِ، وَإن كُنْتَ تعْلَمُ أَنَّ هذَا الأَمْرَ شرٌّ لي في دِيني وَمَعاشي وَعَاقبةِ أَمري) **یان فەرمووی:** (عَاجِلِ أَمري وآجِلِهِ، فاصْرِفهُ عَني، وَاصْرفني عَنهُ، وَاقدُرْ لي الخَيْرَ حَيْثُ كانَ، ثُمَّ رَضِّني بِهِ) **ئەی خودایە! داوات لێ دەکەم کە بەعیلمو زانستی خۆتو بەدەسەڵاتو توانایی خۆت چاکەو خێرم نیشان بدەو ئەوەی باشە بۆم بەسەرکردنیا زاڵم بکە، وە داوای بەشو بارو بەخششی گەورەی خۆتت لێ دەکەم، چونکە تۆ توانای هەموو شتێکت هەیەو، من بێ دەسەڵاتمو توانام نییە، تۆ هەموو شت دەزانیو من نازانم، وە هەر خۆت داناو زانای بەهەموو نهێنیو ئاشکرایەك، پەروەردگارم تۆ دەزانی ئەگەر ئەمکارە باشە بۆ من باشە بۆ دینو ئاییینمو باشە بۆ ژیانمو بۆ سەرەنجامی کارم، یان فەرمووی: باشە بۆ ئێستامو بۆ پاشەڕۆژم، ئەوا لەچارەمی بنووسەو ئاسانی بکە بۆمو لەپاشیشا پیتو بەرەکەتی تێ بخە بۆم، وەتۆ دەزانی ئەگەر ئەم ئیشە خراپە بۆ من، خراپە بۆ دینو ئاییینمو خراپە بۆ گوزەرانمو بۆ سەرەنجامی کارم، یان فەرمووی: خراپە بۆ ئێستامو بۆ پاشەڕۆژم ئەوا ئەو لەمن لادەو منیش لەو لادە، وەچی چاکە ئەوەم لەچارە بنووسە، لەپاشا رازیم بکە پێی! حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: وە ناوی نیازەکەیش بهێنێ، واتە: لەوێدا کە دەڵێ: تۆ دەزانی ئەم کارە... بڵێ: ئەم کارە کە حەجە، یان ژنهێنانە، یان خانوو کڕینە، یان ئەمەیە، یان ئەوەیە باشە بۆ م.. تاد.(بوخاری—خ).**

**٩٨- باسی سوننەتی چۆنیتی چوون بۆ جەژنو سەردانی نەخۆشو حەجو غەزاو بۆ سەر تەرمو مامەندی ئەمانە وەك جومعەو جەماعەت. سوننەتە رێ گۆرکێ بکا. واتە لەرێیەکەوە بڕواو لەرێیەکی ترەوە بگەرێتەوە هەتا شوێنی عیبادەت زۆر بێ**

**باب استحباب الذهاب إلى صلاة العيد والرجوع من طريق آخر**

٧١٩/١(٢٩٩)- عن جابرٍ (رضي الله عنه)قال: كانَ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)إذا كَانَ يَوْمُ عِيدٍ خَالَفَ الطَّرِيقَ. رواه البخاري.

**جابیر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لەرۆژی جەژندا عادەتی پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **وابوو: کە دەردەچوو بۆ نوێژی جەژن لەرێگەیەکەوە دەڕۆی، کە دەیش گەرایەوە لەرێگەیەکی ترەوە دەگەرایەوە (ب).**

٧٢٠/٢(٣٠٠)- وعن ابنِ عُمَرَ رضي اللّه عنهما أن رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)كانَ يَخْرُجُ مِنْ طَرِيقِ الشَّجَرَةِ وَيَدْخلُ مِنْ طَرِيقِ الْمُعَرَّسِ، وإذَا دَخَلَ مَكَّةَ دَخَلَ مِنَ الثَّنِية العُلْيَا وَيَخْرُجُ مِنَ الثَّنِية السُّفْلى متفقٌ عليه.

**ئیبنو عومەر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **کاتێ لەمەدینەوە دەردەچوو لەرێگەی ئەلشەجەرەوە دەردەچوو، کاتێ دەهاتەوە بۆی لەرێگەی مزگەوتی موعەرریسەوە دەهاتەوە، کەتەشریفی دەچوو بۆ مەککە لەلای سەرووەوە، لەثەنییەتولعولاوە دەچووە ناو شارەوە، کە لێی دەردەچوو لەلای خوارووەوە لە ثەنییەتولسوفلاوە لەشار دەردەچوو، هەموو جارێ ئاوا رێگۆرکێی دەکرد (ش. رەزای خودایان لێ بێ)(*)**

---

(٢٩٩) بوخاری (٩٨٦).

(٣٠٠) بوخاری (١٥٣٣)و موسلیم (١٢٥٧).

(*) عند ذكر الصالحين تنزل الرحمه: ذیکری صاڵحان رەحمەتی وابێ، کەفەقێ بووم، لەمامۆستاکانی خۆمم بیستووە، دەیانفەرموو: خەطیبی کۆنی سلێمانی ماڵی لەخوار سەرشەقامەوە بوو، کە تەشریفی دەچوو بۆ جومعە لەناو شارەوە دەڕۆیشت، لەچکێکی سپی دەکردو مێزەرێکی سپی لەسەر دەبەست. شێوەی ئەوەندە شیرینو ئێسکی ئەوەندە سووك بوو، دەتگوت فریشتەی ئاسمانەو لەسەرە رووی زەوی دەڕوا، ئیتر هەر کە لەماڵ دەردەچوو هەتا دەگەیشتە ناومیحرابەکە خەڵکی گوزەرو گەرەك پۆل پۆل لەبەری هەڵدەسانو رێزیان لێ دەگرت، ئەویش سڵاوی لێ دەکردنو زۆر جاریش دڵی پڕ دەبوو لەگریانو دەگریا. وەلێ کە دەگەرایەوە بۆ ماڵەوە لەدەرەوەی شارەوە، لەلای قۆریەشکاوەوە دەگەرایەوە.

**٩٩- لەكاتی دەستپێكردنی هەمووكارێكی بەڕێزدا سوننەتە لای ڕاست پێش بخرێ**
**باب استحباب تقديم اليمين في كل ما هو من باب التكريم**

كالوضوءِ وَ الغُسْلِ والتَّيَمُّمِ ولبس الثوب والنعل والخف والسراويل ودخول المسجد والسواك والاكتحال وتقليم الأظفار وقص الشارب ونتف الإبط وحلق الرأس والسلام من الصلاة والأكل والشرب والمصافحة واستلام الحجر الأسود والخروج من الخلاء والأخذ والعطاء وغير ذلك مما هو في معناه ويستحب تقديم اليسار في ضد ذلك كالامتخاط والبصاق عن اليسار ودخول الخلاء والخروج من المسجد وخلع الخف والنعل والسراويل والثوب والاستنجاء وفعل المستقذرات وأشباه ذلك.

ئەوانیش وەك دەستنوێژو خۆشۆردنو تەیەمومو لەبەركردنی جلوبەرگو لەپێ كردنی پێلاو كاڵەو خوففو شەرواڵو دەرپێو چوونە ناو مزگەوتو سیواك كردنو چاوڕشتنو نینۆك كردنو سمێڵ كورت كردنەوەو مووی بنباخەڵ هەڵكێشانو سەرتاشینو سڵاودانەوەی نوێژو خواردنو خواردنەوەو تەوقەكردنو دەستهێنان بە حەجەرولئەسوەدداو دەرچوون لەئاودەستو شت وەرگرتنو شت دان بەكەسێكی ترو شتی تری لەم بابەتە، بەڵام سوننەتە پێشخستنی لای چەپ لەپێچەوانەی ئەمانەدا، وەك: لووت سڕین بەدەستی چەپو تف ڕۆكردن لەلای چەپەوەو چوونە ناو ئاودەستەوەو دەرچوون لەناو مزگەوتو داكەندنی خوففو كاڵەو پێلاوو جلوبەرگو تارەتگرتن بەدەستی چەپو كاری قێزاوی تری وێنەی ئەمانە.

قال الله تعالى: { فأما من أوتي كتابه بيمينه فيقول: هاؤم اقرءوا كتابيه...الآيات – الحاقة/١٩ – ٢٤ }.

---

دەیفەرموو: لەرووم نایە زیاتر زەحمەتی خەڵكی شارەكە بدەم! وادەزانم – ئەگەر باش لەبیرم مابێ – ئەو خەطیبە (رەحمەتی خودای لێ بێ) ناوی شێخ موحییەدین بووە!

خاسانی خودا مەردی مەیدانن شمشێری رووتی دەستی یەزدانن!
تا لەجیهانن هەر لەزیندانن چونكە خەریكی بەندیی بەندانن!!
لەناو گۆڕیشا گوڵو گوڵدانن لەبۆ هیممەتیش دوو سەد چەندانن

واتــه: ئەوكەسـانەی کـه دەفتـەری کردەوەیـان دەدریٚ بەدەسـتی راسـتیانەوە، لەخۆشـیاندا قریـوەی لیٚ دەکـەن‌و دەڵێن: بفـەرموو ئەمـە نامـەی کـردەوەی منـە، لەسـایەی خـوداوە مایــەی ســەربەرزی‌و ســەرفرازی منــە، وەرن وەری بگــرن‌و بیخوێننەوە، مـن خـۆم دەمزانـی کـە ئـەم حیسـاب‌و لێپرسینەوەیەم لەپێشـەوەیەو دەگەم بەم رۆژەو بەم حسێبە، ئیتر ئەم جۆرە کەسانە دەکەون بەسەر خێرو بێـرو نازو نیعمەت‌و گوزەرانی خۆشدا، وان لەناو بەهەشتی بەرزی بەرِێزدا، میوەو بـەری دارەکـانی وان لەبەردەسـتیاندا، تەنانــەت بەدانیشتنیشــەوە دەسـتیان پێـی دەگـا، فیریشتەکان پێیان دەفەرموون: بخۆن‌و بخۆنەوە، بەنۆشی گیانتان بـیٚ، ئەمـە بـەری رەنجەشـانی خۆتانــەو خـەرمانی ئـەو کشـتەیەو بـەری ئەوباخەیـە کـە لـەجیهانی رابوردوودا چاندبووتان.

وقال تعالى: { فأصحاب الميمنة ما أصحاب الميمنة، وأصحاب المشأمة مـا أصـحاب المشأمة} الواقعة/٨ – ٩.

واته: کاتیٚ قیامەت قەوما ئێوە دەبـن بەسـیٚ دەسـتە، دەسـتەی خـودا پێـداوان، مەگەر خودا هەر بۆخـۆی بزانـیٚ کـە چـەندە پیرۆزو سـەرکەوتوو بـەرِێزو نـازدارو بەهرەدارن، کە ئەمانە نامەی پیرۆزی کـرداری شـیرینی خۆیـان بەدەسـتی راسـتیان وەردەگرن، دەستەی کۆمەڵەی خـاوەنی شـوومی‌و نەگبـەتی بیٚ پایەو مایە مەگـەر هەر خودا بزانیٚ چەندە بەدبەختن.

١/٧٢١[٣٠١] – وعن عائشة رضيَ اللّه عنها قالَتْ : كَانَ رسولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يُعْجِبُهُ التَّيمُّنُ في شأنِه كُلّه : في طُهُورِهِ، وَترجُّلِهِ، وَتنَعُّلِه. متفقٌ عليه.

**عائیشه** (رەزای خودای لیٚ بیٚ) **فـەرمووی: پیغەمبـەر** (دروودی خوای لەسەر بیٚ) **لەهـەموو کاروبـارێکی گرنگی خۆیدا حەزی لەوەبوو کە لای راستی پێشبخات. وەك دەسنوێژ شۆردن‌و قـژ شانەکردن‌و پێلاو لەپێکردن.**

٢/٧٢٢[٣٠٢] – وعنها قالتْ : كانَتْ يَدُ رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)، اليُمْنى لِطَهُورِهِ وطَعَامِه، وكَانَتْ اليُسْرَى لِخَلائِهِ وَمَا كَانَ منْ أَذىً، حـديث صـحيح، رواه أبـو داود وغيره بإسناد صحيحٍ:

---

[٣٠١] بوخاری (١٦٨)، موسلیم (٢٦٨) (٦٧).

دیسان فەرمووی: حەزرەت (درووودی خوای لەسەر بێ) بەدەستی راستی دەسنوێژی دەگرتو خۆی دەشۆردو هەر بەدەستی راستی نانو ئاوی دەخوارد، وەلێ بەدەستی چەپی تارەتی دەگرتو پیسایی‌و شتی وای لەخۆی دوور دەخستەوە (د-ح/ص-س/ص).

٧٢٣/٣[٣٠٣]- وعن أم عَطِيةَ رضي اللّٰه عنها أن النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قـالَ لَهُنَّ في غَسْلِ ابْنَتِهِ زَيْنَبَ رضي اللّٰه عنها : (ابْدأْنَ بِميامِنِهَا وَمَواضِعِ الوُضُوءِ مِنْها) متفـقٌ عليه:

ئوممو عـەطییـە (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درووودی خوای لەسەر بێ) بـۆ شـۆردنی تەرمی زەینەبی کچی فەرمووی پێمان: لە ئەندامەراستەکانییەوە لـە ئەندامـەکانی دەستنوێژەوە دەست پێبکەن بەشۆردنی (ش).

٧٢٤/٤[٣٠٤]- وعن أبي هُريرة (رضي اللّٰه عنه) أَنَّ رسـول اللّٰـه (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم)قال : (إِذا انْتعَلَ أَحدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ باليُمْنى، وَإِذا نَزَعَ فَلْيَبْدأْ بِالشِّـمالِ. لِـتَكُنِ اليُمْنـى أَوَّلَهُما تُنْعَلُ، وآخِرَهُمَا تُنْزَعُ) متفقٌ عليه:

ئـەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: کاتـێ کە پێڵاو لەپێ دەکەن لەپێشا بیکەنـە پێـی راسـتان، لـەکاتی داکەندنیشدا لەپێشدا پێـی چـەپ داکـەنن، بـا قاچـی راسـت یەکـەمبێ لـەکاتی لـەپێ کردنـداو دواهـەمبێ لەکاتی داکەندندا (ش).

٧٢٥/٥[٣٠٥]- وعـن حَفْصَـةَ رضـي اللّٰـه عنهـا أَنَّ رسـول اللّٰـه (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم)كان يَجْعَلُ يَمينَهُ لطَعَامِهِ وَشَرَابِهِ وثيابه ويَجعَلُ يَسارَهُ لما سِوى ذلكَ رواه أبو داود والترمذي وغيره.

حەفصە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) بەدەستی راستی نانو ئاوو خواردنو خواردنەوەی دەخـواردو لەجل‌وبەرگیشدا لەپێشدا لای راستی لەبەر دەکرد، بۆ شتی تریش دەستی چەپی بەکاردەهێنا (د/ت — س/ص).

---

[٣٠٢] ئەبوداوود (٣٣).

[٣٠٣] بوخاری (١٦٧) موسلیم (٢/٦٤٨) رقم (٤٣)(٤٣).

[٣٠٤] بوخاری (٥٨٥٦)، موسلیم (٢٠٩٧).

[٣٠٥] ئەبو داوود (٣٢).

٧٢٦/٦[٣٠٦]- وعن أبي هريرة (رضي اللّه عنه)أنَّ رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْه وسَلّم)قال : (إذا لَبِسْتُمْ، وَإِذا تَوَضَّأْتُم، فَابْدؤُوا بِأَيَامِنكُمْ) حديث صحيح. رواه أبو داود والترمذي بإسناد صحيح.

ئەبو هورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ شت لەبەردەکەن‌و کاتێ دەستنوێژ دەگرن بەلای ڕاستتان دەست پێ بکەن (د/ت/ح/ص – س/ص).

٧٢٧/٧[٣٠٧]- وعن أَنس (رضي اللّه عنه)أَن رسولَ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)أتى مِنًى: فَأَتَى الجَمْرَةَ فَرماهَا، ثُمَّ أَتَى مَنْزِلهُ بِمنًى، ونَحَرَ، ثُمَّ قَالَ لِلحَلاّقِ (خُذْ) وَأَشارَ إِلى جَانِبِهِ الأيمنِ، ثُم الأيسَرِ ثُمَّ جعَلَ يُعطِيهِ النَّاسَ. متفقٌ عليه. وفي روايةٍ: لَمَّا رمى الجَمْرةَ. ونَحر نُسُكَهُ وَحَلَقَ: نَاوَلَ الحلاقَ شِقَّهُ الأَيْمنَ فَحلقَه، ثُمَّ دعَا أَبَا طَلحةَ الأَنصاريَّ (رضي اللّه عنه)، فَأَعطَاهُ إِيَّاهُ، ثُمَّ نَاوَلَهُ الشقَّ الأَيْسَرَ فقال: (احْلِقْ) فَحلقَهُ فَأَعْطاهُ أَبا طلحة فقال: (اقسِمْهُ بَيْنَ النَّاس).

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ڕۆیشت بۆ میناو چوو بۆ کۆگا بەردەکەی عەقەبەو بەردی بۆ فڕێدا، ئینجا هاتەوە بۆ بارەگاکەی خۆی لەمینا، لەوێ قوربانی کرد، ئەوجا بە سەرتاشەکەی فەرمووی: سەرم بتاشەن، وەپێی گوت کە لەپێشا لای ڕاستی سەری بتاشی، ئینجا لای چەپی، لەپاشا فەرمانی دا بۆ مووفەڕك‌و بۆ یادگاریی پیرۆزی قژە سەرەکەیان بەسەر خەڵکەکەدا دابەش کرد (ش) لەگێڕانەوەیەکا: ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە لە مینا بەردی فڕێدا بۆ کۆگا بەرەکەی عەقەبەو ئاژەڵی قوربانی‌و دیاریی سەربڕی، ئیتر لەسەر ئەم شێوەیە سەری خۆی تاشی: لای ڕاستی سەری کردە سەرتاشەکە، ئەویش ئەو لایەی تاشی‌و ئەوجا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەبو طەڵحەی بانگ کردو مووەکەی داپێی، ئەوجا لای چەپیشی تێ کرد، سەرتاشەکە ئەویشی تاشی‌و مووی ئەویشی دا بە ئەبو طەڵحەو پێی فەرمووی: بەسەر خەڵکەکەدا دابەشی بکە. لەگێڕانەوەیەکی تاجولئوصولدا: ئەویش تەڵەتەڵەو دوو تەڵتەڵ دابەشی کرد بەسەر مەردوومەکەدا. (وەرگێڕ).

---

[٣٠٦] ئەبو داوود (٤٤١)، تیرمیذي (١٧٦٦).

[٣٠٧] بوخاری (١٧٠)و موسلیم (١٣٠٥).

## نامەی دەستووری نان خواردنو خۆراك خواردن

### ١٠٠- باسی ناوی خودا هێنان لەسەرەتاوەو سوپاسو ستایش كردنی خودای گەورە لەدوایی دا

### كتاب أدب الطعام - باب التسمية في أوله والحمد في آخره

١/٧٢٨[٣٠٨]- فەرموودەی (سَمِّ اللّٰه وكُلْ بِيمِينكَ)، بڕوانە: (٢/٢٩٩ز -٣٨).

٢/٧٢٩[٣٠٩]- وعن عَائشة رضي اللّٰه عنها قالَتْ: قالَ رسولُ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (إذا أكل أَحَدُكُمْ فَلْيَذْكُر اسْمَ اللّٰه تعالى، فإنْ نسي أَنْ يَذْكُرَ اسْمَ اللّٰه تَعَالَى في أَوَّلِه، فليَقُلْ: بِسْمِ اللّٰه أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ). رواه أبو داود، والترمذي، وقال: حديث حسن صحيح.

**عائیشە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: كەنان دەخۆن ناوی خودا بهێنن، ئەگەر لەسەرتاوە لەبیرتان نەبوو، وەناوی خوداتان نەهێنا، كەی یادتان كەوتەوە بڵێن بِسْمِ اللّٰه أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ: بەپیرۆزی ناوی خودا لەبەرو دوایەوە (د/ت:ح/ح/ص).**

٣/٧٣٠[٣١٠]- وعن جابر، (رضي اللّٰه عنه)قال: سَمِعتُ رسولَ اللّٰه يقولُ: (إذا دخل الرَّجُل بيْتَهُ، فَذَكَرَ اللّٰه تعَالَى عِنْد دُخُولِهِ وعِنْدَ طَعامِهِ، قال الشَّيْطانُ لأَصحَابِهِ: لا مبيتَ لَكُمْ ولا عشاءَ، وإذا دخَل، فَلَم يَذكُر اللّٰه تَعَالى عِنْد دخُولِهِ، قال الشَّيْطَانُ: أَدْركتمُ المبيت، وإذا لَم يَذْكُرِ اللّٰه تعَالى عِنْد طَعامِهِ قال: أَدْركْتُمُ المبيتَ وَالعَشاءَ) رواه مسلم.

**جابیر** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: بۆخۆم بەگوێی خۆم ژنەوتم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەری گەورە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: پیاو كەدەچێتەوە بۆماڵەوە، ئەگەر لەكاتی چوونە ماڵو لەكاتی نان داناندا ناوی خودا بهێنێ ئیتر شەیتان بەدەستەو بەستەی خۆی دەڵێ: نەجێی شەوو نەشێوەتان لێرە بۆنەماوە، بەلاَم ئەگەر لەكاتی چوونە ماڵدا یادی خودا نەكا، شەیتان دەڵێ: هەم جێگەی شەوو شێوتان دەست كەوت! (م). بۆ ئەم جۆرە بابەتە — وەك دەلیلولفالحین دەفەرموێ: ژنیش مانەندی**

---

[٣٠٨] بڕوانە: (٢/٢٩٩ز -٣٨).

[٣٠٩] ئەبو داوود (٣٧٦٧)و (١٨٥٩).

[٣١٠] موسلیم (٢٠١٨).

پیاوه، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (النساء شقائق الرجال: ژن مانەندی پیاوه) (وەرگێر).

٧٣١/٤[٣١١]- وعن حُذَيْفَةَ (رضي اللّٰه عنه)قال: كنَّا إذا حضَرْنَا مع رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)طَعَاماً، لَم نَضَعْ أَيدِينَا حتَّى يَبْدأَ رسولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَليْهِ وسَلَّم)فَيضَعَ يدَه. وَإنَّا حَضَرْنَا معهُ مَرَّةً طَعاماً، فجاءَت جارِيَةٌ كأَنَّهَا تُدْفَعُ، فَذَهَبتْ لِتضعَ يَدهَا فِي الطَّعامِ، فَأَخَذَ رسولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)بِيدِهَا، ثُمَّ جَاءَ أَعْرابِيٌّ كأَنَّمَا يُدْفَعُ، فَأَخَذَ بِيدِهِ، قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (إنَّ الشَّيْطانَ يَسْتَحِلُّ الطَّعامَ أنْ لا يُذْكَرَ اسمُ اللّٰهِ تَعَالَى عليه. وإنَّهُ جاءَ بهذهِ الجاريةِ لِيسْتَحِلَّ بِها، فَأَخَذتُ بِيدِهَا، فجَاءَ بهذا الأَعْرَابِيِّ لِيستَحِلَّ بِهِ، فَأَخَذْتُ بِيدِهِ، والذي نَفسي بِيَدِهِ إنَّ يدَهُ في يَدي مَعَ يَديْهِما) ثُمَّ ذَكَرَ اسم اللّٰهِ تعالى وأكَل. رواه مسلم.

حوذەیفە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران کە لەخزمەتی حەزرەتدا (دروودی خوای لەسەر بێ) نانیان بۆمان دادەنا، دەستان بۆی نەدەبرد هەتا پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستی پێ نەکردایە، جارێ لەخزمەتیدا بووین، نانیان دانا، لەوکاتەدا کچێ هات دەتگوت بەپاڵ دەیهێنن، کچەکە ویستی دەست ببا بۆ نانەکە بەڵام پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) توند دەستی گرتو نەیهێشت، لەپاشا عەرەبێکی دەشتەکیش هات، ئەویش دەتگوت بەپاڵ دەیهێنن، ویستی لەنانەکە بخوات، پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستی ئەویشی گرتو فەرمووی: هەر خواردەمەنیو نانێ ئەگەر ناوی خودای لەسەر نەبرێ شەیتان بەحەڵاڵی دەزانێ، ئەوە بۆیە لەپێشا ئەم کچۆڵەی هێنا تا نانەکەی پێ حەڵاڵ بکا، بۆیە منیش دەستیم گرت، ئینجا ئەوەبوو لەپاشا ئەم عەرەبە دەشتەکییەی هێنا تا بەو حەڵاڵی بکا، ئەوەبوو دەستی ئەویشم گرت، بەو کەسە کەگیانی منی بەدەستە دەستی شەیتان وا لەناو دەستی ئەم کچۆڵەیەو ئەم کابرایەدا، کەدەستیان وان لەناو هەردوو دەستی مندا، ئەوجا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) ناوی خودای هێناو دەستی کرد بەنۆشکردنی نانەکە (م).

---

[٣١١] موسلیم (٢٠١٧).

٥/٧٣٢[٣١٢]- وعن أُميَّةَ بن مَخْشِيّ الصَّحابيِّ (رضي اللّٰه عنه)قال: كان رسُولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)جالساً، ورَجُلٌ يأْكُلُ، فَلَمْ يُسمِّ اللّٰه حَتَّى لَمْ يبْقَ مِنْ طَعَامِهِ لُقْمةٌ، فلمَّا رَفَعها إلى فِيهِ، قال: بسم اللّٰهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ، فَضَحِكَ النَّبيّ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم، ثم قال: (مَا زَالَ الشَّيْطَانُ يَأْكُلُ مَعَهُ، فَلمَّا ذَكَر اسمَ اللّٰهِ استْقَاءَ مَا في بَطنِهِ). رواه أبو داود، والنسائي.

**ئومییەی کوڕی مەخشی** (رەزای خودای لێ بێ) **کەخۆی لەیارانی حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **بووە، دەفەرموێ: رۆژێ پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **تەشریفی دانیشتبوو، پیاوێکیش نانی دەخواردو ناوی خودای نەهێنا، تا یەك پارووی مایەوە،کە ئەو پاروەی برد بۆ دەمی لەو کاتەدا گوتی: (بِسْمِ اللّٰه أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ: بەناوی خودا لەسەرەتایەوە هەتا کۆتایی). جا پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **پێکەنیو فەرمووی: شەیتان لەسەرتاوە هەر دەیخوارد لەگەڵیدا، هەتا ناوی خودای هێنا، ئیتر هەرچی لەسکیابوو هەمووی هەڵهێنایەوە! (د/ن).**

٦/٧٣٣[٣١٣]- وعن أبي أُمامة (رضي اللّٰه عنه)أنَّ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)كانَ إذا رَفَعَ مَائِدَتَهُ قال: (الحَمْدُ للّٰه حمداً كَثيراً طَيِّباً مُبارَكاً فِيه، غَيرَ مَكْفِيٍّ وَلا مُسْتَغْنًي عَنْهُ رَبَّنا) رواه البخاري.

**ئەبو ئومامە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لەپاش نانخواردن کە سفرەکە هەڵدەگیرا پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەیفەرموو:** (الحَمْدُ للّٰه حمداً كَثيراً طَيِّباً مُبارَكاً فِيه، غَيرَ مَكْفِيٍّ وَلا مُسْتَغْنًي عَنْهُ رَبَّنا: **سوپاسو ستایشو حەمدێکی زۆری پاكو پیرۆز بۆخودای پەروەردگارمان، نەکەس جێگەی ئەو دەگرێتەوەو نە ئەو زاتە پشگوێ دەخرێ، وەکەس نییە کەلەخواد بێ نیاز بێ). ئەو خودای ئێمەیە (بوخاری — رەحمەت لەگۆڕی).**

٧/٧٣٤[٣١٤]- وعن عائشةَ رضيَ اللّٰه عنها قالَتْ: كانَ رسولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يأْكُلُ طعَاماً في سِتَّةٍ مِنْ أَصحَابِهِ، فَجَاءَ أَعْرابيٌّ، فَأَكَلَهُ بلُقْمَتَيْنِ فقال رسولُ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (أَما إنَّهُ لوْ سَمَّى لَكَفَاكُمْ). رواه الترمذي، وقال: حديثٌ حسنٌ صحيحٌ.

---

[٣١٢] **ئەبو داوود (٣٧٦٨)، مونذيري دەفەرموێ: نەسائیش لە (السنن الكبرى)یدا گێڕاویەتیەوە.**

[٣١٣] **تیرمیذي (٥٤٥٨).**

**عائیشە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: جارێ حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەگەڵ شەش کەس لەیارانیدا نانی دەخوارد، لەولاوە عەرەبێکی دەشتەکی هات نانەکەی کرد بەدوو تیکەو بەدوو پارو خواردی! جا حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەدی ئەم کابرایە ناوی خودای بهێنایە نانەکە بەشی دەکردین! (ت:ح/ح/ص).**

٨/٧٣٥[٣١٥]- وعن مُعَاذِ بن أَنسٍ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: قال رسُولُ اللّٰـه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: منْ أَكَلَ طَعَاماً فقال: الحَمْدُ للّٰهِ الذي أَطْعَمَني هذا، وَرزَقْنِيهِ مِـنْ غيْـرِ حَـوْلٍ مِنِّي وَلا قُوّةٍ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ) رواه أبو داود، والترمذي وقال: حدِيثٌ حسنٌ.

**موعاذی کوڕی ئەنەس** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: کەسێ لەپاش نانخواردن بلێ (الحَمْدُ للّٰهِ الذي أَطْعَمَني هذا، وَرزَقْنِيهِ مِنْ غيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلا قُوّةٍ: سوپاس بۆ خودا، کە بەم دەستەوسانییەی خۆم ئەم ڕۆژیی و خۆراکەی پێ بەخشیوم). فەرمووی: کەسێ لەپاش نانخواردن ئاوا بلێ خودا لەگوناهی لەوەبەری خۆش دەبێ (د/ت:ح/ح).**

### ١٠١- باسی ئەوە نابێ نەنگ و خراپە لەخواردەمەنی بگیرێ، بەڵکوو سوننەتە باسی چاکەی بکرێ - باب لا يعيب الطعام واستحباب مدحه

١/٧٣٦[٣١٦]- عن أبي هُريرة (رضي اللّٰه عنه)قال: (ما عَابَ رسُولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)طَعَاماً قَطُّ، إن اشْتَهَاه أَكَلَهُ، وإِنْ كَرِهَهُ تَرَكَهُ) متفقٌ عليه.

**ئەبو هورەیرەوە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **هەرگیز خراپەی لەخواردن و نان نەدەگرت، حەزی لێی بوایە دەیخوارد، ئەگەر بەدڵیشی نەبوایە وازی لێ دەهێنا. (ش)**

٢/٧٣٧[٣١٧]- وعن جابرٍ (رضي اللّٰه عنه)أَنَّ النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم)سَـأَلَ أَهْلَهُ الأُدُمَ فقالوا: ما عِنْدَنَا إلاَّ خَلٌّ، فَدَعَا بِهِ، فَجَعل يَأْكُلُ ويقول: (نِعْمَ الأُدُمُ الخلُّ، نِعْـمَ الأُدُمُ الخَلُّ) رواه مسلم.

---

[٣١٤] بوخاری (١٨٥٠).

[٣١٥] ئەبو داوود (٤٠٢٣)، تیرمیذي (٣٤٥٤).

[٣١٦] بوخاری (٥٤٠٩)و موسلیم (٢٠٦٤).

[٣١٧] موسلیم (٢٠٥٢).

**جابیر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: جارێ پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **داوای پێخۆری لەخێزانی کرد، عەرزیان کرد: بەس سرکەمان هەیە، فەرمووی: کە بیهێنن، جادەستی کرد بەخواردنیو دەیفەرموو: سرکە پێخۆری چاکە، سرکە پێخۆری چاکە** (م).

**١٠٢- باسی ئەوە: کەسێ بەرۆژو بێو لەسەر خواردەمەنی ئامادە بێ چی بلێ باشە ئەگەر نەی شکاند - باب ما يقوله من حضر الطعام وهو صائم إذا لم يفطر**

١/٧٣٨[٣١٨]– عن أبي هُريرة (رضي اللّٰه عنه)قال: قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (إذا دُعِيَ أَحَدُكُمْ، فَلْيُجِبْ، فَإِنْ كان صائماً فَلْيُصلِّ، وَإِنْ كانَ مُفْطَراً فَلْيَطْعَمْ) رواه مسلم. قال العُلَماءُ: مَعْنى. (فَلْيُصَلِّ) فلْيدْعُ ومعنى (فَلْيطْعَمْ) فلْيَأْكُلْ.

**ئەبو هورەیرەوە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەگەر یەکێکتان خوڵك کران بۆ نان خواردنو بۆسەر نانی شایو شتی وا بابچێ، جا لەوێ ئەگەر بەرۆژوو بوو ئەوە با نزای باشیان بۆ بکا، ئەگینا ئەوە با نانی خۆی بخوا** (م).

**١٠٣- کەسێ خۆی بانگ کرابوو بۆسەر نانخواردنو کەسێکی تر لەخۆیەوە شوێنی بکەوێ چی بلێ باشە - باب ما يقوله من دعي إلي طعام فتبعه غيره**

١/٧٣٩[٣١٩]– عن أبي مسعودِ البَدْرِيِّ (رضي اللّٰه عنه)قال: دَعا رجُلٌ النَّبيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)لِطعَامٍ صَنعَهُ لَهُ خَامِس خَمْسَةٍ، فَتَبِعهُمْ رَجُلٌ، فَلمَّا بَلَغَ الباب، قال النَّبيّ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (إنَّ هذا تَبِعَنا، فإنْ شئت أَنْ تأْذنَ لَهُ، وإنْ شِئتَ رَجَعَ) قال: بل آذنُ لَهُ يا رسولَ اللّٰهِ. متفقٌ عليه.

**ئەبو مەسعوود** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پیاوێ ناوی ئەبو شوعەیب بوو غولامێکی گۆشت فرۆشی هەبوو، پێی گوت: نانی پێنج کەسم بۆ دروست بکە، پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **رەنگی برسێتی لێ نیشتبوو، جا کە نانەکەی دروست کرد، ناردی بەشوێن هەر پێنجیاندا، کە کەوتنە رێ پیاوێ شوێنیان کەوت بانگ**

---

(٣١٨) موسلیم (١٤٣١).

(٣١٩) بوخاری (٥٤٣٤)و موسلیم (٢٠٣٦).

نــەكرابوو كــە پێغەمبــەر (درودی خـوای لەسـەر بـێ) گەیشــتە بــەردەرگای ماڵەكــە بــەخاوەن ماڵەكەی فەرموو: ئـەم پیـاوە شـوێنمان كـەوتووە، كـە تـۆ خولكت كـردین ئـەومان لەگەڵ نەبوو، ئەگەر ڕێی دەدەی ئـەوا دێتـە ژورەوە، ئەگـەر حـەزیش دەكـەی ئـەوا دەگەڕێتــەوە؟ خانەخوێكــەیش گــوتی: ئــەی پێغەمبــەری خــودا! ڕێگــەی دەدەم بــا بفەرمووێ لەگەڵتانا (ش).

**١٠٤- سوننەتە نان خۆر لەبەردەمی خۆیەوە بخوات، وەتەمیّو ئامۆژگاری ئەو كەسە بكا، كەنازانیّ بەجوانی نان بخوات - باب الأكل مما يليه ووعظه وتأديبه من يسيء أكله**

١/٧٤٠- فەرموودەی: (كُنتُ غلاماً في حِجْرِ رسول اللّه)، بڕوانە: (٢٩٩/٢ز -٣٨)

٢/٧٤١- (كُلْ بِيَمِينكَ قال: لا أَسْتَطِيعُ)، بڕوانە: (١٥٩/٤ز -١٦).

**١٠٥- نەی كردن لەوە كەكەسیّ جووت جووت خورماو شتی وەك خورما بخوات، ئەگەر لەگەڵ كۆمەڵدا دەیخوارد مەگەر هاوڕێكانی ڕێگەی پیّ بدەن**
**باب النهي عن القران بين تمرتين ونحوهما إذا أكل جماعة إلا بإذن رفقته**

١/٧٤٢[٣٢٠]- عن جبَلَةَ بن سُحَيْم قال: أَصابَنا عامُ سَنَةٍ مـعَ ابْـنِ الزُّبَيْـرِ، فرُزِقْنـا تَمْراً، وَكانَ عَبْدُ اللّٰه بنُ عمر رضي اللّٰه عنهما يمُر بنا ونحْنُ نأْكُلُ، فيقولُ: لا تُقارِنُوا، فإن النَّبـيّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)نَهى عنِ الإقرانِ، ثم يقولُ: (إلاَّ أَنْ يَسْـتَأْذِنَ الرَّجُـلُ أَخـاهُ) متفقٌ عليه.

جەبەلەی كوڕی سوحەیم (ڕەزای خودای لیّ بیّ) فـەرمووی: سـاڵێكیان تووشـی قـاتو قـڕی بووین، ئەو ساڵە بوو كە عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیر لەمەككە فەرمانڕەوامان بوو، جا لـەباتی موچـە خورمـای پێمـان دەدا، جـاری وابـوو كـە لـەو خورمایـەمان دەخـوارد، عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لیّ بیّ) دەیدا بەلاماندا دەیفەرموو دوو دوو مـەیخۆن چونكە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) نـەیی دەكـرد لـەوە كـە پیـاو دوو دەنـك دوو دەنـك خورما پێكەوە بخوا، مەگەر بەمەرجێ هاوڕێكانی ڕێگەی ئەوەی بدەن (ش/تاج).

---

[٣٢٠] بوخاری (٢٤٥٥)و موسلیم (٢٠٤٥).

### ١٠٦- کەسێ کەهەر دەخواو تێر ناخوا چی بلێ باشە، یان چی بکا باشە
### باب ما يقوله ويفعله من يأكل ولا يشبع

٧٤٣/١[٣٢١]- عن وَحْشيِّ بنِ حرب (رضـي اللّـه عنـه)أن أَصـحابَ رسـول اللّـه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قالُوا: يا رسولَ اللّهِ، إِنَّا نَأْكُلُ ولا نَشْبَعُ؟ قال: (فَلَعَلَّكُمْ تَفْتَرِقُـونَ) قالُوا: نَعَمْ. قال: فَاجْتَمِعُوا عَلى طَعَامكُمْ، وَاذْكُرُوا اسْمَ اللّهِ، يُبَارَكْ لَكُـمْ فيـه) رواه أبـو داود.

وەحشی کوڕی حەربی حەبەشی، کەبکوژی ئیمامی حەمزەی مامی پیغەمبەرە، دروودی خـودا لەسـەر پیغەمبـەرو رەزای خـودا لـەوان بـێ، فـەرمووی: دەسـتەیێ لـەیارانی حـەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) گوتیـان: ئـەی پیغەمبـەری خـودا! ئێمـە کـەنان دەخۆین تێر نابین؟ فەرمووی: رەنگ بێ بەجیاجیا نان بخۆن؟ گوتیان بـەلێ وایـە، فەرمووی: بەکۆمەڵی نان بخۆنو ناوی خودای لێ بێنن ئیتر پیتو فەڕی تێدەکەوێ بۆتان (د).

### ١٠٧- فەرمان کردن بەخواردن لەقەراغی دەورییەوەو نەیی کردن لەخواردن لەناوەڕاستی دەورییەوە
### باب الأمر بالأكل من جانب القصعة والنهي عن الأكل من وسطها

فەرمووده (كل مما يلى) لەم شوێنەدا رابورد: بڕوانە: (٢٩٩/٢ز ـ٣٨).

٧٤٤/١[٣٢٢]- عن ابـن عبـاس رضـيَ اللّـه عنهمـا عـن النَّبـيِّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم)قال: (الْبَرَكَةُ تَنْزِلُ وَسَطَ الطَّعَام فَكُلُوا مِنْ حَافَّتَيْهِ ولاَ تَأْكُلُوا مِن وَسَطِهِ) رواه أبـو داود، والترمذي، وقال: حديثٌ حسنٌ صحيحٌ.

ئیبنو عەبباس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: پیـتو فەڕ لەناوەڕاسـتی خۆراکـەوە دێتـە خـوارەوە، جا لەبـەر ئـەوە لـە لـەملاو لاکەیـەوە بخۆنو لەناوەڕستەکەیەوە مەخۆن! (د/ت!ح/ح/ص).

٧٤٥/٢[٣٢٣]- وعن عبدِ اللّه بن بُسْر (رضي اللّه عنه)قال: كان لِلـنبيِّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَصْعَةٌ يُقالُ لها: الْغَرَّاءُ، يَحْمِلُهَا أَرْبَعَةُ رِجالٍ، فَلَمَّا أَضْـحوا وَسَـجَدُوا الضُّـحى

---

[٣٢١] ئەبو داوود (٣٧٦٤).

[٣٢٢] ئەبو داوود (٣٧٧٣)، تیرمیذي (١٨٠٦).

[٣٢٣] ئەبو داوود (٣٧٧٣).

أُتِي بتَلْكَ الْقَصْعَةِ، يعني وقد ثُرِدَ فيها، فالتَفُّوا عليها، فَلَمَّا كَثُرُوا جثا رسولُ اللّٰه (صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فقالَ أَعرابيٌّ: ما هذه الجِلْسةُ؟ قال رسولُ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: إنّ اللّٰه جَعَلني عَبْداً كَرِيماً، ولَمْ يجْعَلْني جَباراً عَنيداً، ثمَّ قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (كُلُوا مِنْ حَوَالَيْهَا، وَدَعُوا ذِرْوَتَهَا يُبَارَكْ فيها) رواه أبو داودٍ بإسناد جيد.

**عەبدوڵڵای کوڕی بوسر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لەگەنێکی پیغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **هەبوو ناوی غەڕرا بوو، واتە: لەگەنە مارۆ، بەچوار پیاو هەڵیان دەگرت، کاتێ جێشتنگاو دەبوو، نوێژی جێشتنگاویان، بەکۆمەڵ یان بەجیاجیا دەکرد، ئەوجا ئەو لەگەنەیان پڕ دەکرد لەتریتی مەرگەو دەیانهێناو دەورەیان لێ دەدا، جا جارێ کەزۆر بوونو جێیان پێ تەنگ بوو، پیغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **هات بەچۆکاو لەسەر چۆکی دانیشت، عارەبێکی دەشتەکی گوتی: ئەم دانیشتنە چییە، ئەوە بۆ وا دادەنیشی؟ حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: لەسایەی خوداوە من بەندەیەکی سەلارو بەڕێزو بێ هەوام، لەخودا بەزیاد بێ کە نەی کردووم بەزەلامێکی ملهوڕی سەرکەشی سەربزێو!، ئەوجا فەرمووی** (دروودی خوای لەسەر بێ)**: لەتەنیشتو قەراغەکانییەوە بخۆنو لەپۆپەو تەوقە سەرەکەیەوە مەخۆن، ئیتر پیتو فەڕی تێ دەکەوێ (د — سند جید).**

## ١٠٨- خواردن بەپاڵەوە خراپە - باب كراهية الأكل متكئا

١/٧٤٦[٣٢٤]- عن أبي جُحَيْفَةَ وهبِ بنِ عبد اللّٰه (رضي اللّٰه عنه)قال: قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (لا آكُلُ مُتَّكِئاً) رواه البخاري.

**ئەبو جوحەیفە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: من بەپاڵەوە شت ناخۆم (ب).**

٢/٧٤٧[٣٢٥]- وعن أنسٍ (رضي اللّٰه عنه)قال: رَأَيْتُ رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)جالساً مُقْعِياً يَأْكُلُ تَمْراً، رواه مسلم.

**ئەنەس** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پیغەمبەرم دی** (دروودی خوای لەسەر بێ) **بەچیچکانەوە دانیشتبوو خورمای دەخوارد (م).**

---

[٣٢٤] بوخاری (٥٣٩٨).

[٣٢٥] موسلیم (٢٠٤٤).

**١٠٩- ئەم شتانە پەسەندن: خواردن بەسێ پەنجە، پەنجە لستنەوە، لەپێش لستنەوەدا خراپە بیسڕێتەوە، هەروەها پەسەندە دەوریش بلێسرێتەوە، هەروەها ئەو پارووەی دەکەوێتە خوارەوە سوننەتە هەڵی بگرێتەوەو پاکی بکاتەوەو بیخوات، دروستە لەپاش لستنەوە پەنجە بەباسکو قاچو دەستو شتی وا بسڕێ**

**باب استحباب الأكل بثلاث أصابع واستحباب لعق الأصابع وكراهة مسحها قبل لعقها واستحباب لعق القصعة وأخذ اللقمة التي تسقط منه وأكلها وجواز مسحها بعد اللعق بالساعد والقدم وغيرهما**

١/٧٤٨[٣٢٦]- عن ابن عباسٍ رضي اللّٰه عنهما قال: قال رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّم: (إذا أَكلَ أَحدُكُمْ طَعَاماً، فَلاَ يَمسحْ أَصابِعَهُ حتى يلعقَهَا أَو يُلْعِقَها) متفقٌ عليه.

ئیبنو عەبباس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کەنان دەخۆن دەستی خۆتان مەسڕن، هەتا خۆتان دەی لێسنەوە، یان یەکێکی تر بۆتانی دەلێسێتەوە (ش).

٢/٧٤٩[٣٢٧]- وعن كعْبِ بنِ مالك (رضي اللّٰه عنه)قال: رَأَيْتُ رسولَ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّم)يأْكُلُ بثلاثِ أَصابعَ فَإِذا فَرغَ لَعِقَها. رواه مسلم.

کەعبی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەتم دی (درودی خوای لەسەر بێ) نانی دەخوارد، بەسێ پەنجە نانەکەی دەخوارد، وە بەر لەوە دەستی خۆی بسڕێ بەزمان لستییەوە (م/تاج).

٣/٧٥٠[٣٢٨]- وعن جابرٍ (رضي اللّٰه عنه)أَنَّ رسولَ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّم)أمر بِلَعْقِ الأَصَابعِ والصَّحْفَةِ وقال: (إِنَّكُمْ لا تَدرُونَ في أَيِّ طعَامِكم البَركةُ) رواه مسلم.

جابیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی دەدا بەلستنەوەی دەستو پەنجەو دەوریو قاپو شتی وا، دەیفەرموو: چونکە ئێوە نازانن کەپیتو بەرەکەتی خواردەمەنییەکەتان بەکامەوەیەتی! (م).

٤/٧٥١[٣٢٩]- (إذا وقعت لُقمَةُ أَحدِكُمْ) بڕوانە: (٩/١٦٤ ز/١٦).

---

[٣٢٦] بوخاری (٥٤٥٦)و موسلیم (٢٠٣١).

[٣٢٧] موسلیم (٢٠٣٢).

[٣٢٨] موسلیم (٢٠٣٣).

[٣٢٩] موسلیم (٢٠٣٣) (١٣٤).

**٧٥٢/٥**[٣٣٠]- وعنه أَن رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال: (إن الشَّيْطَانَ يَحضرُ أَحدَكُم عِند كُلِّ شَيءٍ مِنْ شَأْنِهِ، حتى يَحْضُرَهُ عِنـدَ طعَامِـهِ، فَإذا سَقَطَتْ لُقْمَةُ أَحَدِكم فَلِيَأْخذْهَا فَلْيُمِطْ ما كانَ بها مِن أَذى، ثُمَّ لِيَأْكُلْهَا ولا يَدعها للشَّيْطَان، فإذا فَرغ فَلْيلْعَقْ أَصابِعهُ فإنَّه لا يدري في أَيِّ طعامِهِ البرَكَةُ) رواه مسلم.

**ديسان جابير** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: شەیتان بۆ هەموو کاروبارێکتان دێتە لاتان، تەنانەت لەکاتی نان خواردنیشدا دێت بۆلاتان، جا ئەگەر تیکەی کەسێکتان کەوتە خوارەوە با لەئازارو شتی وا پاکی بکاتەوە ئینجا بیخواتو نەی هێڵێتەوە بۆ شەیتان، کە لەنان خواردن لێبوۆوە با پەنجەکانی بلێسێتەوە، چونکی کەس نازانێ کەپیتو بەرەکەتی خواردەمەنییەکەی بەکامەوەیەتی (م، لەگێڕانەوەیەکی تاجدا دەفەرموێ: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمایشتی پێ کردین کە دەورییەکەیش بە پەنجە دالێسین، وە فەرمووی** (دروودی خوای لەسەر بێ)**: چونکە ئێوە نازانن کەپیتو بەرەکەتی خواردەمەنییەکەتان لەکامەیدایە.**

٧٥٣/٦- (أمر بعلق الأصابع والصفحة)، بروانة: (٩/١٦٤ز - ١٦٦).

**٧٥٤/٧**[٣٣١]- وعن سعيد بنِ الحارث أَنّه سَأَل جابراً (رضي اللّه عنه)عن الوضوءِ مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ، فقال: لا، قد كُنَّا زمنَ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)لا نجدُ مثلَ ذلك الطعامِ إلاّ قلِيلاً، فإذا نَحنُ وجدناهُ، لَم يَكُنْ لَنَا مَنَادِيلُ إلا أَكُفُّنَا وسَوَاعدنَا وأَقْدامنَا، ثُمَّ نُصَلِّي وَلا نَتَوَضَّأُ. رواه البخاري.

**سەعیدی کوڕی حاریث** (رەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: لەجابیرم پرسی: ئایا خواردنی ئەو خواردەمەنییانەی کە بەئاگر پوختە دەکرێن وەك کولێرەو چێشتو گۆشتی برژاوو مریشکی سوورەوە کراو دەبێ بەهۆی پێویست بوونی دەستنوێژ یانا؟ فەرمووی: نەء نابێ، چونکە لەسەردەمی ژیانی پیرۆزی حەزرەتدا** (دروودی خوای لەسەر بێ) **کەمتر شتی کولاوو برژاوو بەئاگر پوختەکراومان دەست دەکەوت، لەگەڵ ئەوەشدا جاروبار کەشتی وامان دەست دەکەوت دەمانخواردو دەستنوێژمان تازە نەدەکردەوەو نوێژمان دەکرد، ئەو سەردەمەیش دەستەسڕمان نەبوو کەچەوری و**

[٣٣٠] موسليم (٢٠٣٣) (١٣٥).

[٣٣١] بوخاری (٥٤٥٧).

ملّتەی خواردنەکەی پێ بسڕین، وەلێ لەباتی خاولی‌و دەستەسڕ بەناو لەپو باسك‌و پێی خۆمان دەمانسڕی (ب).

**١١٠- نان خواردن بە جەماوەریی - باب تكثير الأيدي على الطعام**

٧٥٥/٨[٣٣٢]– فەرموودەی:(طَعَامُ الإثنين كافي الثَّلاثَةِ...) بڕوانە: (٢/٥٦٥ز - ٦٢).

٧٥٦/٩[٣٣٣]– فەرموودەی:(طَعامُ الوَاحِدِ يَكْفِي الإِثْنَيْنِ) بڕوانە: (٢/٥٦٥ز - ٦٢).

**١١١- باسی دەستوورەکانی شت خواردنەوە، سوننەتە سێجار هەناسەدان لە دەرەوەی جامەکەدا، کە جامەکە بەلای راستی ئەو کەسەدا کە یەکەمجار دەخواتەوە چەرخە بکات باب أدب الشرب واستحباب التنفس ثلاثاً خارج الإناء وكراهة التنفس في الإناء واستحباب إدارة الإناء على الأيمن فالأيمن بعد المبتدئ**

٧٥٧/١[٣٣٤]– عن أنسٍ (رضي اللّه عنه)أن رسول اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)كانَ يتنَفَّسُ في الشرَابِ ثَلاثاً. متفقٌ عليه:

**ئەنەس** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **بەسێ بین شتی دەخواردەوە، هەموو بینێ لەدەرەوەی جامەکە هەناسەی دەدا (ش).**

٧٥٨/٢[٣٣٥]– وعن ابنِ عباسٍ رضي اللّه عنهما قال: قال رسول اللّه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (لا تَشْرَبُوا واحِداً كَشُرْبِ البَعِير، وَلكِنِ اشْرَبُوا مَثْنى وثُلاثَ، وسَمُّوا إِذا أَنْتُمْ شَرِبْتُمْ، واحْمدوا إذا أَنْتُمْ رَفعْتُمْ) رواه الترمذي وقال: حديث حسن:

**ئیبنو عەبباس** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: وەك وشتر بەیەك بین بینی پێوە مەنێن، بەڵام بەدوو بین یان بەسێ بین شت بخۆنەوە، لەپێشەوە ناوی خودا بهێنن‌و لەپاشیشەوە سوپاس‌و ستایشی خودا بکەن (ت:ح/ح).**

٧٥٩/٣[٣٣٦]– وعن أبي قَتَادَةَ (رضي اللّه عنه)أَنَّ النَّبـيّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)نَهى أن يُتَنَفَّسَ في الإناءِ متفقٌ عليه.

---

[٣٣٢] بڕوانە: (٢/٥٦٥ز ٦٢).

[٣٣٣] بڕوانە: (٢/٥٦٥ز ٦٢).

[٣٣٤] بوخاری (٥٦٣١)، موسلیم (٢٠٢٨).

[٣٣٥] تیرمیذي (١٨٨٦).

[٣٣٦] بوخاری (٥٦٣٠)، موسلیم (٢٦٧).

**ئەبو قەتادە** (رەزای خودای لێ بێ) **پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: کەشت دەخۆنەوە لەناو جامەکەدا هەناسە مەدەن (ش) لەگێڕانەوەیەکی شەرحی تاجدا دەفەرموێ: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **جڵەوگیریی دەکرد لەوەکەلە ئاستی کەلاییو شکاویی شت بخۆنەوە.**

٧٦٠/٤[٣٣٧]- وعن أنس (رضي اللّٰه عنه)أَن رسول الّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم)أُتِي بِلَبَنٍ قد شِيب بماءٍ، وعَنْ يمِينِهِ أَعْرابي، وعَنْ يَسارِهِ أَبو بَكرٍ رضي اللّٰه عنه، فَشَرِبَ، ثُمَّ أَعْطَى الأَعْرَابيَّ وقال: (الأَيْمَنَ فالأَيمن) متفقٌ عليه.

**ئەنەس** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: جامێ شیریان هێنا بۆ پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەوکاتەدا عارەبێکی دەشتەکی لەلای ڕاستی پێغەمبەرەوە بوو** (دروودی خوای لەسەر بێ) **وە ئەبوبەکریش لەلای چەپییەوە بوو، جا پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لێی خواردەوە، عومەر** (رەزای خودای لێ بێ) **مەترسی ئەوەی هەبوو کە پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **جامەکە بدا بە ئەعرابییەکە لەبەر ئەوە عەرزی کرد: بفەرموو بیدە بە ئەبوبەکر، بەڵام پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **جامەکەی دا بە عەرەبە دەشتەکییەکەو فەرمووی: لای ڕاست لەپێشترە، کەواتە دەبێ جامەکە بەلای ڕاستدا بگێڕدرێ (ش).**

٧٦١/٥-(أُتِيَ بشرابٍ، فشرِبَ مِنْهُ...) برِوانة: (١/٥٦٩ز - ٦٣).

## ١١٢- خراپە دەمپێوەنانی هەنگڵی کوندەو شتی وا، بەڵام حەرام نییە
## باب كراهة الشرب من فم القربة ونحوها وبيانٍ أنه كراهة تنزيه لا تحريم

٧٦٢/١[٣٣٨]- عن أبي سعيدٍ الخدْريِّ (رضي اللّٰه عنه)قال نَهَى رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم)عنِ اخْتِنَاثِ الأَسْقِيَةِ. يعني: أَنْ تُكسَرَ أَفْوَاهُها، ويُشْرَب منها. متفقٌ عليه.

**ئەبو سەعید** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **نەهی دەکرد لەوە کەدەمو هەنگڵی کوندەو مەشکەو جەوەندەو شتی وا هەڵپێچ بکرێو ئینجا دەمی پێوە بنرێو ئاوی لێ بخورێتەوە (ش).**

٧٦٣/٢[٣٣٩]- وعن أبي هريرة (رضي اللّٰه عنه)قال : نَهَى رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم)أَن يُشْرَبَ مِنْ في السِّقاءِ أَو القِرْبةِ. متفقٌ عليه.

---

[٣٣٧] بوخاری (٥٦١٩)، موسلیم (٢٠٢٩).

[٣٣٨] بوخاری (٥٦٢٥)، موسلیم (٢٠٢٣).

ئـەبو هـورەیرەوە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەری خـودا (دروودو سڵاوی خودای گەورەو مەزنی لەسەر بێ) نەهی کردووە لەوە کە لەدەمو هەنگڵی کونـدەو مەشکەو جەوەندەوە بەدەم ئاو بخورێتەوە (ش).

٣/٧٦٤[٣٤٠]– وعن أُمِّ ثابتٍ كَبْشَةَ بِنْتِ ثَابتٍ أُخْتِ حَسَّان بْنِ ثابت (رضـي اللّـه عنه)وعنها قالت: دخَل عليَّ رسولُ اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْـهِ وسَـلّم)، فَشَـرِبَ مِـن في قِرْبَةٍ مُعَلَّقةٍ قَائماً. فَقُمْتُ إلى فِيهَا فَقطَعْتُهُ، رواه الترمذي. وقال: حديث حسن صحيح. وَإِنَّمَـا قَطَعَتْها: لِتَحْفَظَ موْضِعَ فَم رسول اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسلّم). وَتَتَبَرَّكَ بِهِ، وَتَصُـونَهُ عَـن الابتِذال، وَهذا الحَدِيثُ مَحْمُول على بَيَـانِ الجـوازِ، والحـديثان السـابقان لبيـان الأفضـل والأَكمل واللّه أعلم.

کەبشەی کچی ثابیتی حەسسانی کوڕی ثابیت (ڕەزای خودا لەخۆیو حەسسانی برای) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) تەشریفی هـات بـۆ دێنـی ئێمـە، لـەدەمی کوندەیەکی هەڵواسراو بەپێوە بەدەم ئاوی خواردەوە، منیش چووم دەمەکەیم بڕی.

(ت:ح/ح/ص) دانـەری ڕیـاض – کەشـێخی نـەوەوییـە، (ڕەزای خـودای لێ بێ) دەفـەرموێ: بۆیـە کەبشە دەمی کوندەکەی بڕیوە، بۆموفەڕکیو پیرۆزی چونکە شوێن دەمـی پیرۆزی پێغەمبەر (دروودی خـوای لەسـەر بێ) بـووە، هـەتا هـەڵی بگرێو لەفـەوتان بیپـارێزێو نـەهێڵێ ببێت بەرەشۆکیو رەمەکیو هەر کەس هەڵسێ دەمی پێوە بنێ!

هـەروا نـەوەوی (ڕەزای خـودای لێ بێ) دەفـەرموێ: ئـەم فەرموودەیـە کـە ئـەوەی تیادایـە: حـەزرەت خـۆی (دروودی خـوای لەسـەر بێ) بەسـەر پێـوە، بـەدەمی خـۆی لـەدەمی کونـدە ئـاوی خواردۆتەوە بـۆ ڕوونکردنـەوەی دروسـتبوونی ئـەم کارانـەیـە، وەڵێ دوو فـەرموودەی پێشتر بۆ ڕوونکردنەوەی لایەنی هەرەباشی تـەواو تـەواوە. خـودا بۆخـۆی لەهـەموو کەسێ باشتری لێ دەزانێ.

---

[٣٣٩] بوخاری (٥٦٢٧) محققی ئەسڵەکە مامۆستا محی الدین مستو لێرەدا دەفـەرموێ: (ئـەم فەرموودەیـەم لەصەحیحی موسلیمدا بۆنەدۆزرایەوە). (وەرگێڕ).

[٣٤٠] تیرمیذي (١٨٩٣).

## ١١٣- فووكردن لەخواردنەوە خراپە - باب كراهة النفخ في الشراب

١/٧٦٥[٣٤١]- عن أبي سعيدٍ الخدريِّ (رضي اللّٰه عنه)أنَّ النَّبيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)نَهَى عَنِ النَّفخِ في الشَّرابِ فقال رَجُلٌ : القَذَاةُ أَراها في الإناءِ ؟ فقال : (أَهْرِقْهَا) قال : فإني لا أَرْوَى مِنْ نَفَسٍ وَاحِدٍ ؟ قال : (فَأَبِنْ القَدَحَ إذاً عَنْ فِيكَ) رواه الترمذي وقال : حديث حسن صحيح.

**ئەبو سەعیدی خودری** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **نەیدەهێشت کە لەکاتی شت خواردنەوەدا فووی لێ بکرێ، پیاوێ گوتی: ئەی ئەگەر پووشەکەیەکم بەسەر ئاوەکەوە لەناو جامەکەدا دی چۆن بکەم؟ فەرمووی: لێوی جامەکە خواربکەرەوەو بەلێوی جامەکە بیرێژە. گوتی: باشە. ئەی ئەگەر بەیەك بێن تێرم نەخواردەوە چی بکەم؟ فەرمووی: جامەکە لەدەمت دووربکەرەوەو ئەوسا هەناسە بدەو، دیسانەوە تێ هەڵچۆرەوە تا تێر دەخۆیتەوە (ت:ح/ح/ص).**

٢/٧٦٦[٣٤٢]- وعن ابن عباس رضي اللّٰه عنهما أن النبي (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)نَهَى أَن يُتنَفَّسَ في الإِنَاءِ، أَوْ يُنْفَخَ فِيهِ، رواه الترمذي وقال: حديث حسن صحيح.

**ئیبنو عەبباس** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **جڵەوگیری لەوە دەکرد کە کەسێ شت دەخواتەوە لەناو جامەکەدا هەناسە بدا، یان فوو لەخواردنەوەی ناوی بکا (ت:ح/ص).**

## ١١٤- باسی ئەوە خواردنەوە بەسەر پێوە دروستە بەڵام بەدانیشتنەوە باشترو چاکترە
## باب بيان جواز الشرب قائما وبيان أن الأكمل والأفضل الشرب قاعدا

فيه حديث كبشة السابق (انظر الحديث رقم ٧٦٤/٣).

١/٧٦٧[٣٤٣]- وعن ابن عباس رضي اللّٰه عنهما قال : سَقَيْتُ النَّبيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)مِنْ زَمْزَمَ، فَشَرِبَ وَهُوَ قَائِمٌ. متفقٌ عليه.

**ئیبنو عەبباس** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: بەدەستی خۆم لەئاوی زەمزەمم دا بە پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **بەڕاوەستانەوە خواردیەوە (م).**

---

[٣٤١] تیرمیذي (١٨٨٨).

[٣٤٢] تیرمیذي (١٨٨٩).

[٣٤٣] بوخاری (٥٦١٧)، موسلیم (٢٠٢٧).

٧٦٨/٢(٣٤٤)- وعن النَزَّال بن سبْرَةَ (رضي اللّٰه عنه)قال : أَتَى عَلِيٌّ (رضي اللّٰه عنه)باب الرَّحْبَةِ فَشَرب قائماً، وقالَ : إِنِّي رَأَيْتُ رَسولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فعل كما رَأَيْتُمُوني فَعَلْتُ، رواه البخاري.

نەززالی کوڕی سەبرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەبەر دەرگای حەوشەی مزگەوتی کووفەدا ئاویان هێنا بۆ عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) بەڕاوەستانەوە ئاوەکەی خواردەوەو گوتی: هەندێ کەس حەزناکەن بەڕاوەستانەوە شت بخۆنەوە، بەلاّم من بەچاوی خۆم پیغەمبەرم دیوە (دروودی خوای لەسەر بێ) ئاوا وەك ئێستای من بەڕاوەستانەوە شتی خواردەوە (ب/تاج).

٧٦٩/٣(٣٤٥)- وعن ابن عمر رضيَ اللّٰه عنهما قال: كنّا نَأْكُلُ عَلى عَهدِ رسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)ونَحْنُ نَمْشي، ونَشْرَبُ وَنَحْنُ قيامٌ. رواهُ الترمذي، وقال: حديث حسن صحيح.

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) خۆیدا ڕێ دەکەوت بەدەم ڕۆیشتنەوە شتمان دەخوارد، جاری واش هەبوو بەسەر پێوە شتمان دەخواردەوە (ت:ح/ح/ص).

٧٧٠/٤(٣٤٦)- وعن عمرو بن شعيب عن أَبيهِ عن جدِّه (رضي اللّٰه عنه)قال: رَأَيْتُ رسُول اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يشربُ قَائماً وقَاعِداً. رواه الترمذي وقال: حديث حسن صحيح.

لەعەمری کوڕی شوعەیبەوە لەباوکییەوە لەباپیرییەوە (ڕەزای خودای گەورەیان لێ بێ) فەرمووی: بەچاوی خۆم دیومە کە پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هەم بەدانیشتنەوەو هەم بەڕاوەستانەوە شتی دەخواردەوە (ت:ح/ح/ص).

٧٧١/٥(٣٤٧)- وعن أَنس (رضي اللّٰه عنه)عن النبي (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)أَنهُ نهَى أَنْ يشربَ الرّجُلُ قَائماً. قال قتَادة : فقلْنَا لأَنس : فالأَكْلُ ؟ قال : ذلكَ أَشَرُّ أَو أَخْبَثُ رواهُ مسلم.

---

(٣٤٤) بوخاری (٥٦١٥).

(٣٤٥) تیرمیذي (١٨٨١).

(٣٤٦) تیرمیزی (١٨٨٤).

(٣٤٧) موسلیم (٢٠٢٤) (١١٣).

**ئەنەس** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **نەهی دەکرد لەوە کەپیاو بەپێوە شت بخواتەوە، قەتادە فەرمووی: گوتمان بەئەنەس: ئەی خواردن بەپێوە چۆنە؟ فەرمووی: ئەو خراپترە، یان فەرمووی: ئەو پیسترە، (م) لەگێڕانەوەیەکی تری موسلیمدا: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **سەرزەنشتی ئەو کەسەی دەکرد کەبە راوەستانەوە شت بخواتەوە.**

٦/٧٧٢[٣٤٨]- وعن أبي هريرة (رضي اللّٰه عنه)قال: قَالَ رسُولُ اللّٰـه (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (لاَ يشْرَبَن أَحدٌ مِنْكُمْ قَائماً، فَمَنْ نَسِيَ فَلْيَسْتَقيءْ) رواهُ مسلم.

**ئەبو هورەیرەوە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: کەستان بەپێوە شت مەخۆنەوە، ئەگەر لەبیرتان نەبوو شتتان بەسەر پێوە خواردەوە خۆتان بڕشێننەوە! (م).**

## ١١٥- سوننەتە ئاوگێڕەکە خۆی لەپاش هەمووان بخواتەوە
## باب استحباب كون ساقي القوم آخرهم شربا

١/٧٧٣[٣٤٩]- عن أبي قتادة (رضي اللّٰه عنه)عن النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال: (سَاقي القَوْمِ آخِرُهُمْ) يعنى: شرْباً. رواه الترمذي، وقال: حديث حسن صحيح.

**ئەبو قەتادە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئاوگێڕ لەناو کۆڕدا خۆی لەپاش هەموویانەوە ئاو دەخواتەوە (ت:ح/ح/ص).**

## ١١٦- دروستە خواردنەوە لەهەموو دەفرێکی پاکدا، زێڕو زیو نەبێ، دروستە بینج نان بەچەمو کانیو ئاوی ڕەوانەوە، بەبێ جام، بەدەم دەمیان تێنێ، بەلاّم بەکارهێنانی دەفری زێڕو زیو بۆ خواردنەوەو خواردن درووست نییەو نارەوایە. هەروەها بۆ پاك کردنەوەو دەستنوێژو هەموو بەکارهێنانێکی تریش نارەوان
## باب جواز الشرب من جميع الأواني الطاهرة غير الذهب والفضة وجواز الكرع وهو الشرب بالفم من النهر وغيره بغير إناء ولا يد، وتحريم استعمال إناء الذهب والفضة في الشرب والأكل والطهارة وسائر وجوه الاستعمال

١/٧٧٤[٣٥٠]- عنْ أَنس (رضي اللّٰه عنه)قال: حَضَرَتِ الصَّلاةُ، فَقَامَ منْ كانَ قَريب الدَّارِ إِلَى أَهْلِهِ، وبقِي قَوْمٌ فَأَتَى رسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)بِمِخْضَب مِن حِجَارَةٍ،

---

[٣٤٨] موسليم (٢٠٢٦).

[٣٤٩] تيرميذي (١٨٩٥).

[٣٥٠] بوخارى (١٩٥)و موسليم (٢٢٧٩).

فَصغُرَ المِخْضَبُ أَن يبْسُطَ فِيهِ كَفَّهُ، فَتَوَضَّأَ القَوْمُ كُلُّهُمْ. قَالُوا: كَم كُنْتُمْ؟ قَالَ: ثَمَانِين وزِيادةً. متفقٌ عليه. هذه رواية البخاري.

وفِي رواية له ولمسلم: أَنَّ النَّبِيّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)دَعا بِإناءٍ مِنْ ماءٍ، فأُتِيَ بِقَدحٍ رَحْرَاحٍ فِيهِ شَيءٌ مِنْ مَاءٍ، فوَضَعَ أَصابِعَهُ فِيهِ. قَالَ أَنس: فَجعَلْتُ أَنْظُرُ إِلى المَاءِ يَنْبُعُ مِنْ بَيْنِ أَصابِعِه، فَحزَرْتُ منْ تَوَضَّأَ ما بيْنَ السَّبْعِينَ إِلى الثَّمَانِينَ.

**ئەنەس** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: ڕۆژێ نوێژ داهات، ئەوەی ماڵی نزیك بوو هەڵسا چوو بۆ ماڵەوە، لەوێ دەستنوێژی گرت. دەستەیەکیش لەخزمەتی حەزرەتدا** (دروودی خوای لەسەر بێ) **مانەوە، جا کۆچەڵەیەکی بەردینیان بۆ حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **هێنا، لەبەر بچکۆلەیی کۆچەڵەکە جێی تیادا نەدەبۆوە کە حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **بەباشی دەستی خۆی تیادا بڵاوبکاتەوە، جا ئاو لەنێوانی پەنجەکانییەوە هەڵدەقوڵا، ئیتر خەڵکەکە هەموویان لەو کوچەڵەیە دەستنوێژیان گرت، گوتیان: چەند کەس دەبوون؟ فەرمووی: هەشتا کەسێ دەبووین، بگرە پتریش دەبووین. (ش).**

**لەگێڕانەوەیەکی شەیخەیندا: ئەنەس** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پیغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەدەفرێکا داوای ئاوی کرد، جامێکی دەم پەلیان بۆ هێنا، کەمێ ئاوی تیابوو، پیغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **پەنجەکانی تێ خست، ئەنەس دەیگوت: کە سەیری ئاوەکەم کرد لەنێوانی پەنجەکانی پیغەمبەرەوە هەڵدەقوڵا، ئەنەس دەیگوت: ئەوانەی کە دەستوێژیان لەو جامە گرت حەفتا هەشتا کەسێك دەبوون.**

٧٧٥/٢[٣٥١]- وعن عبد اللّه بن زيدٍ (رضي اللّه عنه)قال : أَتانَا النَّبِيّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)، فَأَخْرَجْنَا لَهُ مَاءً فِي تَوْرٍ مِنْ صُفرٍ فَتَوَضَّأَ. رواه البخاري.

**عەبدوڵڵای کوڕی زەیدا** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: جارێ پیغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **هات بۆلامان لە جامۆڵکەیەکی مسدا هەنێ ئاومان بۆ هێنا دەستنوێژی پێ گرت (ب).**

٧٧٦/٣[٣٥٢]- وعن جابر (رضي اللّه عنه)أَنَّ رسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)دَخَلَ على رَجُلٍ مِنَ الأَنْصارِ، ومَعهُ صاحبٌ لَهُ، فقالَ رسُولُ اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (إِنْ كَانَ عِنْدَكَ مَاءٌ بَاتَ هَذِهِ اللَّيْلَةَ فِي شَنَّةٍ وَإِلاَّ كَرعْنا) رواه البخاري.

---

[٣٥١] بوخاری (١٩٧).

جابیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) خۆی و یەکێ لەهاوڕێیانی چوون بۆلای پیاوێ لەیاریدەدەران (ئەنصار) باخی ئاو دەدا، فەرمووی: ئەگەر ئاوی وات هەیە کە ئەم شەو لەکوندەدا بووبێ و، بۆمانی بێنە، ئەگینا خۆمان دەمی تێ دەنێین و بەدەم لە جۆگەلەکە دەخۆینەوە، گوتی: بەڵێ ئاوی شەویی و کوندەم هەیە (ب/تاج).

٧٧٧/٤[٣٥٣]- وعن حذيفة (رضي اللّه عنه)قال : إنَّ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)نَهَانَا عَنِ الحَرير والدِّيبَاجِ والشُّرْبِ في آنِيَةِ الذّهَب والفِضَّةِ، وقال : (هِيَ لَهُمْ في الدُّنْيا، وهى لَكُمْ في الآخِرَةِ) متَّفقٌ عليه.

حوذەیفە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نەهی لێ کردووین لەپۆشینی ئاوریشم و دێباج و لەخواردنەوەلەدەفری زێڕ و زیودا، دەیفەرموو پێمان: ئەمانە لەژیانی جیهاندا بۆ ئەوانە – واتە: بۆ ناموسوڵمانانە، بەلام لەدواڕۆژدا بۆ ئێوەیە، واتە: بۆ موسوڵمانانە (ش).

٧٧٨/٥[٣٥٤]- وعن أُمِّ سلمة رضي اللّه عنها أَنَّ رسُولَ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال: (الذي يَشْرَبُ في آنِيَةِ الفِضَّةِ إنَّما يُجرْجِرُ في بَطْنِهِ نَارَ جَهَنَّمَ) متفق عليه.

وفي رواية لمسلم: (إنَّ الذي يَأْكُلُ أَوْ يَشْرَبُ في آنِيَةِ الفِضَّةِ والذَّهَبِ).

وفي رواية لَه: (مَنْ شَرِبَ في إناءٍ مِنْ ذَهَبٍ أَوْ فضةٍ فَإنَّما يُجرْجِرُ في بَطْنِهِ نَاراً مِنْ جَهَنَّمَ).

ئوممو سەلەمە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوەی لەحاجەتی زیودا شت بخواتەوە، ئەوە قلّپەقلّپ ئاگری سووری دۆزەخ دەرژێنێتە ناو سکی خۆیەوە (ش). لەگێڕانەوەیەکی موسلیمدا دەفەرموێ: ئەوەی لەحاجەتی زیوداو زێڕدا شت بخوا، یان شت بخواتەوە، لەگێڕانەوەیەکی تری موسلیمدا دەفەرموێ: هەرکەسێ لەحاجەتی زێڕدا یان لەحاجەتی زیودا شت بخواتەوە ئەوە قلّپە قلّپ ئاگری سووری دۆزەخ دەرژێنێتە ناو سکی خۆیەوە.

---

[٣٥٢] بوخاری (٥١٦٣).

[٣٥٣] بوخاری (٥٦٣٣)و (٥٨٣٠)، موسلیم (٢٠٦٧).

[٣٥٤] بوخاری (٥٦٣٤)و موسلیم (٢٦٥).

## ١١٧- نامەی پۆشەنیو پۆشاك

### سوننەتە جلوبەرگ سپی بێ، جلی سوورو، سەوزو زەردو رەشیش دروستە، دروستە جل لەلۆکەو پەمووو کەتانو مووو خوریو ئەم جۆرە شتانە دروست بکرێ، تەنیا ئاوریشمی لێ دەرچێ

### كتاب اللباس - باب استحباب الثوب الأبيض وجواز الأحمر والأخضر والأصفر والأسود وجوازه من قطن وكتّان وشعر وصوف وغيرها إلا الحرير

قال اللّه تعالى: {يا بني آدم قد أنزلنا عليكم لباساً يواري سوآتكم وريشاً، ولباس التقوى ذلك خير – الأعراف/٢٧}.

**واتە: ئەی نەوەی ئادەم! ئێوە لەلای خودا خاوەن رێزو پلەو پایەن ئەوەتا خودا بەرەحمەتی خۆی پۆشەنی باش کەشەرمو عەورەتتان دابپۆشێو جلوبەرگی جوانو رازاوەی وا کەهۆی خۆشی ژیانی جیهانە، بۆی ئامادەکردوون هۆی ئەوەی بۆ رەخساندوون، لەهەمووی باشتریش کاڵای لەخوداترسانە، کەعابای جوانی سەرشانی خوداناسانە، دەی ئازاو مەردو هۆشیاربنو خەڵاتی خودا رەدد مەکەنەوەو ئەم کاڵا باشەی خودا مەگۆڕنەوە بەهەڵگرتنی ئاڵای خودانەناسی.**

وقال تعالى: {وجعل لكم سرابيل تقيكم الحر وسرابيل تقيكم بأسكم}.

**خودای گەورە دەفەرموێ: خودا پۆشەنی جۆراوجۆری بۆ ئێوە دروستکردووە، وەکوو کەواو کراسو دەرپێو شتی وا کەلە سەرماو گەرما دەتانپارێزێ، هەروا جۆرە پۆشاکێکی تری بۆتان دروستکردووە، وەکوو زرێو کڵاوزرێو شتی لەم بابەتانە، کەلە زەبرو زەنگی یەکتری دەتانپارێزێ.**

١/٧٧٩[٣٥٥]– وعن ابنِ عبَّاس رضيَ اللّه عنْهُما أنَّ رسُولَ اللّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم)قال: الْبسُوا مِنْ ثِيَابِكُمُ البَيَاضَ، فَإِنَّهَا مِن خَيْرِ ثِيابِكُمْ، وَكَفِّنُوا فِيها مَوْتَـاكُمْ) رواهُ أبو داود، والترمذي وقال: حديث حسن صحيح.

**ئیبنو عەبباس** (رەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: جلوبەرگی سپیش لەبەر بکەن، چونکە ئەویش گەلێ جلی چاکە بۆ ئێوە، وە هەروەها بیکەن بەکفنیش بۆ مردووەکانیشتان (د/ت:ح/ح/ص).**

[٣٥٥] ئەبو داوود (٣٨٧٨)، تیرمیذی (٩٩٤).

٧٨٠/٢(٣٥٦)- وعن سَمُرَةَ (رضي اللّٰه عنه)قال : قالَ رسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (الْبَسُوا البَيَاضَ، فَإِنها أَطْهَرُ وأَطيَبُ، وكَفِّنُوا فِيها مَوْتَاكُمْ) رواهُ النسائي، والحاكم وقال: حديث صحيح.

**سەمووره** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەری خودا** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: کاڵای سپی بپۆشن، چونکە چڵك هەڵناگرێ، وەکی تریش پیرۆزەو کەمتر دەبێ بەهۆی فیزو دەعیەو کەشخە، وە مردووشتانی تیا کفن بکەن. (ن/حاکم:ح/ص).**

٧٨١/٣(٣٥٧)- وعن البراءِ (رضي اللّٰه عنه)قال: كانَ رسولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)مَرْبُوعاً وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ في حُلَّةٍ حَمْراءَ ما رأَيْتُ شَيْئاً قَطُّ أَحْسَنَ مِنْهُ. متّفقٌ عليه.

**بەرائی کوڕی عازیب** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **پیاوێکی باڵا ناوەندی بوو،سینگی پان بوو، قژە سەری زۆرو پڕبوو، دەیدا لەنەرمایی گوێچکەی، جارێ دیم دەستێ جلی سووری لەبەردا بوو، هەرگیز لەژیانی خۆما شتی وا جوانو نازدارم وەکوو ئەو دەمەی حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **نەدیوە (ش).**

٧٨٢/٤(٣٥٨)- وعن أبي جُحَيْفَةَ وهْبِ بنِ عبدِ اللّٰهِ (رضي اللّٰه عنه)قال : رَأَيْتُ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)بمَكَّةَ وَهُوَ بالأَبْطَحِ في قُبَّةٍ لَهُ حَمْراءَ مِنْ أَدَمٍ فَخَرَجَ بِلالٌ بِوَضوئِهِ، فَمِنْ نَاضِحٍ ونَائِلٍ، فَخَرَجَ النبى (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)وعَلَيْهِ حُلَّةٌ حَمْرَاءُ، كَأَنّي أَنْظُرُ إِلى بَيَاضِ ساقَيْهِ، فَتوضَّأَ وَأَذَّنَ بِلالٌ. فَجَعَلْتُ أَتَتَبَّعُ فَاهُ هٰهُنَا وهٰهُنَا، يقولُ يَميناً وشِمَالاً: حَيَّ عَلَى الصَّلاةِ، حيَّ على الفَلاَحِ. ثُمَّ رُكِزَتْ لَهُ عَنَزَةٌ، فتَقدَّمَ فصَلّى يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ الكَلْبُ وَالحِمَارُ لاَ يُمْنعُ. متَّفقٌ عليه.

**ئەبوجوحەیفە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لەمەککە لە ئەبطەح پێغەمبەرم دی** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەناو چادرێکی سووری چەرمیندا بوو، کەهی خۆی بوو، بیلال** (رەزای خودای لێ بێ) **ئاوی دەستنوێژی بۆ بردە دەرەوە، کە حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەستی کرد بە دەستنوێژ گرتن، یاران پەلاماری ئاوەچۆڕی دەسنوێژەکەی حەزرەتیان دا، هەبوو ئەوەندەی بەردەکەوت دەستی خۆی پێ تەڕ دەکردو دەیسووی لەخۆی، هەیش بوو پتری دەست دەکەوت!**

---

(٣٥٦) **نەسائی (٢٠٥/٨)، حاکم لە موستەدرەکا (١٨٥/٤).**

(٣٥٧) **بوخاری (٥٨٤٨)، موسلیم (٢٣٣٧).**

(٣٥٨) **بوخاری (٣٧٦)، موسلیم (٥٠٣).**

كه حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لەچادرەكه هاتە دەرەوە دەستێ جلی سووری لەبەردابوو، زۆرباش لەیادمە، دەڵێی ئێستایە، بریقەی‌سپیایی لاقەكانیم هەر لەبەرچاوە، ئیتر ئاوا دەسنوێژەكەی تەواو كرد، بیلالیش بانگی فەرموو، لەوكاتەدا سەرنجی دەمیم دا، بەدەم بانگدانەكەوە دەخولایەوەو ئەملاو لای دەكردو دەمی خۆی بەڕاستو بەچەپا دەسوڕاند، وە دوو پەنجەی خۆشی نابوونە ناو هەردوو كونە گوێی خۆی، تا دەنگی تەواو بەهێزبێو بەهەر چوارلادا بگا، كاتێ گەیشتە سەر (حَيَّ عَلى الصَّلاةِ) ئەستۆی خۆی بەلای راستا بادا، وەكاتێ گەیشتە سەر (حيَّ على الفَلاحِ) ئەستۆی خۆی بەلای چەپا بادا، بەڵام سینگی نەدەسووڕاند لەگەڵیا، بەڵكوو سینگی بەرابەر قیبلە راگرتبوو، ئینجا بیلال لەبەردەمییەوە رۆیشت نێزەیەكی پێ بوو، لە زیخەڵانەكەی بەطحادا دایچەقاندو كردی بە بەربەست (سوترە) بۆ نوێژەكە، ئیتر حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) بەرەو ئەو نێزەیە نوێژی دابەست، جا لەودیو نێزەكەوە سەگو كەرو ئاژەڵو ماڵاتو خەڵك بەبەر نوێژەكەیدا ئامووشۆیان دەكردو قەدەغە نەدەكران (ش/تاج).

٧٨٣/٥ [٣٥٩]– وعن أبي رِمْثة رفاعَةَ التَّمِيْمِيِّ (رضي اللّٰه عنه)قال : رأَيت رسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وعلَيْه ثوبان أَخْضَرانِ. رواهُ أَبو داود، والترمذي بِإِسْنَادٍ صحيحٍ:

ریفاعەی تەیمی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەچاوی خۆم پیغەمبەرم دی (درووی خوای لەسەر بێ) دوو بەرگی سەوزی لەبەردا بوو.(د/ت:س/ص).

٧٨٤/٦ [٣٦٠]– وعن جابر (رضي اللّٰه عنه)، أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)دَخلَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ وعَلَيْهِ عِمامةٌ سوْداءُ. رواهُ مسلم:

جابیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودو سڵاوو رەحمەتو پیتو فەڕو بەرەكەتی خودای گەورەی لەسەربێو سەرو ماڵو مناڵ بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی نازداری بێ) لەڕۆژی ئازادكردنی شاری مەككەدا كە تەشریفی هاتە ناو شاری مەككەوە مێزەرێكی رەشی بەسەرەوە بوو (م).

[٣٥٩] ئەبوداوود (٤٠٦٩). تیرمیذي (٢٨١٣).

[٣٦٠] موسلیم (١٣٥٨).

٧٨٥/٧[٣٦١]- وعن أبي سعيد عمرو بن حريث (رضي اللّٰه عنه) قال : كأَنى أَنظر إِلى رسولِ اللّٰه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ قدْ أَرْخَى طَرَفيها بَيْنَ كتفيْـه. رواه مسلم: وفي روايةٍ له : أَن رسول اللّٰه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)خَطَـبَ النَّـاسَ، وعَلَيْـهِ عِمَامَة سَودَاءُ:

**ئەبو سەعید: عەمری کوڕی حورەیث** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: زۆربـاش لەیادمـە، دەڵێـی ئێسـتایە، بەچـاوی خـۆم حـەزرەتم دی** (دروودی خـوای لەسـەر بێ) **مێزەرێکـی ڕەشـی بەسـەرەوە بـوو، چـمکەکەی بەناوشـانیا شـۆڕکردبوو. (م) لـە گێڕانەوەیـەکی تـری موسـلیمدا دەفـەرموێ: حـەزرەت دوانێکـی خوێنـدەوە بـۆ مـەردووم، لەوکاتـەدا مێزەرێکی ڕەشی بەسەرەوە بوو.**

٧٨٦/٨[٣٦٢]- وعن عائشة رضي اللّٰه عنها قالت : كُفِّـنَ رسـول اللّٰـه (صَـلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)في ثلاثة أَثْوَابٍ بيضٍ سَحُولِيَّةٍ مِنْ كُرْسُفٍ، لَيْسَ فيهَا قَمِيصٌ وَلا عِمامَةٌ. متفقٌ عليه:

**عائیشە (خودای گەورەی لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەسێ لۆ جلی یەمەنی سپی خاوێنی لۆکەدا کفن کرا، نە کراسو نـە مێزەریـان تیانـەبوو! (ش) سەحوول گوندێ بوو لە یەمەنی جاران ئەو جۆرە تەنراوەی لێ دروست دەکرا.**

٧٨٧/٩[٣٦٣]- وعنها قالت : خَرَجَ رسول اللّٰه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَـلَّم)ذات غـداةٍ وَعَلَيْهِ مِرْطٌ مُرَحَّلٌ منْ شَعْرٍ أَسود رواه مسلم:

**دیسـان فـەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبـەر** (دروودی خـوای لەسـەر بێ) **تەشـریفی چـووە دەرەوە، شاڵینەیەکی پێچابوو بە بەرکۆشیەوە، بە وێنەی کۆپانە وشتر نەخشابوو، لـەمووی ڕەش دروستکرابوو (م).**

١٠/٧٨٨[٣٦٤]- وعن المُغيرةِ بن شُعْبَةَ (رضي اللّٰه عنه)قال : كُنْتُ مع رسول اللّٰـه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)ذاتَ ليلَة في مسيرٍ، فقال لي : (أَمعَكَ مَاء ؟) قلت : نَعَمْ، فَنَزَلَ عن

---

[٣٦١] موسلیم (١٣٥٩)و (٤٥٣).

[٣٦٢] بوخاری (١٢٦٤)، موسلیم (٩٤١).

[٣٦٣] موسلیم (٢٠٨١).

[٣٦٤] بوخاری (٥٧٩٨)، موسلیم (٢٧٤) (٧٧)و (٧٩).

راحِلتِهِ فَمَشى حتى توَارَى في سَوادِ اللَّيْلِ ثم جاءَ فَأَفْرَغْتُ عليْهِ مِنَ الإدَاوَةِ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ وَعَلَيهِ جُبَّةٌ مِنْ صُوفٍ، فلم يَسْتَطِعْ أَنْ يُخْرِجَ ذِراعَيْهِ منها حتى أخْرَجَهُمَا مِنْ أَسْفَلِ الجُبَّةِ، فَغَسَلَ ذِرَاعيْهِ وَمَسَحَ برأْسِه ثُمَّ أَهْوَيْت لأَنزِعَ خُفَّيْهِ فقال : (دعْهمَا فَإِني أَدخَلْتُهُما طَاهِرَتَين) وَمَسَحَ عَلَيْهما. متفقٌ عليه. وفي روايةٍ: وعَلَيْهِ جُبَّةٌ شامِيَّةٌ ضَيقَةُ الْكُمَّيْنِ. وفي روايةٍ: أَنَّ هذِه القصةَ كانت في غَزْوَةِ تَبُوكَ:

**موغیرەی کوڕی شوعبە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: شەوێ لەسەفەرێکا لەخزمەتی پیغەمبەردا بووم** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئاوت پێیە؟ گوتم: ئا پێمە، جا لە وڵاخەکە دابەزیو دوورکەوتەوە، تا لەبەر تاریکیی شەوەکە لێم ون بوو، لەپاشا کە دەستی بەئاو گەیاند هاتەوە، منیش لە جەوەندەیێ ئاوم کرد بەدەستیا، جا روخسارو هەردوو دەستی خۆی شۆرد، جبەیەکی خوری لەبەردابوو، قۆڵەکانی تەسك بوون، ویستی باڵی هەڵماڵێ، بەڵام لەبەر تەسکیی قۆڵی جبەکە نەیتوانی بە هەڵماڵین باڵی لێوە دەربێنێ، جا لەژێر جبەکەوە هەردوو قۆڵی خۆی دەرهێناو هەردوو باسکی خۆی شۆرد، ئینجا دەستی تەڕی هێنا بەسەریدا، منیش دانەویمەوە کە کاڵە (خوففە)کانی لەپێ دابکەنم فەرمووی: لێیان گەڕێ، لەسەر پاکیی لەپێم کردوون، واتە: بەدەسنوێژەوە لەپێم کردوون، ئیتر قاچەکانی نەشۆردو لەجیاتی ئەوە دەستی تەڕی هێنا بەسەرخوففەکانیدا. (ش) لەگێڕانەوەیەکا: جبەیەکی شامیی قۆڵ تەسکی لەبەردابوو، لەگێڕانەوەیەکی تردا: ئەم رووداوە لەغەزای تەبووکدا بوو.**

## ١١٨- کراس سوننەتە - باب استحباب القميص

١/٧٨٩[٣٦٥]- عن أُمِّ سَلمةَ رضي اللّه عنها قالت : كان أَحَبَّ الثِّيـابِ إلى رسـول اللّه (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)القَميصُ. رواه أبو داود، والترمذي وقال : حديث حسن:

**ئوممو سەلەمەی هاوسەری حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: بۆ جلو بەرگ پیغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **لەهەموو شتێ زیاتر حەزی لەکراس بوو. (د/ت:ح/ح).**

[٣٦٥] ئەبوداوود (٤٠٢٥)، تیمیذي (١٧٦٢).

## ١١٩- باسى چۆنێتيى درێژيى كراس و سەرقۆڵ و دەرپێ و لفكەى مێزەرو باسى ئەوەيش كە شۆڕكردنەوەى ئەمانەپتر لە ئەندازەى خۆيان بۆ كەشخەيى و هەوا نارەوايە. بەبێ ئەوەيش هەر باش نييە

## باب صفة طول القميص والكمّ والإزار وطرف العمامة وتحريم إسبال شيء من ذلك على سبيل الخيلاء وكراهته من غير خيلاء

١/٧٩٠– فەرموودەى (كان كُمُّ قمِيصِ رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) إلى الرُّسُغِ). بڕوانە: (٢/٥١٩ز - ٥٦).

٢/٧٩١[٣٦٦]– وعن ابن عمر رضي اللّٰه عنهما أنّ النبى (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قال : (مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلاءَ لَمْ يَنْظُر اللّٰه إليهِ يَوْم القِيامَةِ) فقال أَبو بكر : يارسول اللّٰه إن إزاري يَسْتَرْخي إلا أَنْ أَتَعاهَدَهُ، فقال له رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (إنَّكَ لَسْتَ مِمَّنْ يَفْعَلُهُ خُيَلاءَ). رواه البخاري، وروى مسلم بعضه:

**ئيبنو عومەر** (رەزاى خودايان لێ بێ) **فەرمووى: پێغەمبەر** (دروودى خواى لەسەر بێ) **فەرمووى: هەركەسێ بۆ فيزو دەعيە جلى خۆى بەكێش بكاو لەزەوى بخشێنێ، لەڕۆژى قيامەتا خودا بەچاوى مەرحەمەت و ميهرەبانى تەماشاى ناكاو رووى نازى ناداتێ. ئەبوبەكريش** (رەزاى خوداى لێ بێ) **فەرمووى: قوربان! ئەى پێغەمبەرى خودا! خۆ من لايەكى بەرگۆش (إزار)ەكەم شل دەبێ و شۆڕدەبێتەوە، مەگەر هەموو كاتێ ئاگام لێى بێ. فەرمووى: تۆ لەوە دووريت و لەو كەسانە نيت كە شتى وا دەكەن بۆ فيزو دەعيە (ب/م).**

٣/٧٩٢[٣٦٧]– وعن أبي هريرة (رضي اللّٰه عنه) أَنَّ رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قال : (لا يَنْظُرُ اللّٰه يَوْم القِيامة إلى مَنْ جَرَّ إِزارَهُ بَطراً) متفقٌ عليه:

**ئەبو هورەيرە** (رەزاى خوداى لێ بێ) **فەرمووى: پێغەمبەر** (دروودى خواى لەسەر بێ) **فەرمووى: هەركەسێ بۆ فيزو دەعيەو ڕۆح زلى جلى خۆى بەكێش بكاو بيخشێنێ لەزەوى، خودا بەچاوى ميهرەبانيى تەماشاى ناكا (ش).**

٤/٧٩٣[٣٦٨]– وعنه عن النبى (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قال : (مَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ مِنَ الإِزار ففي النَّار) رواه البخاري:

---

[٣٦٦] بوخارى (٣٦٦٥) و موسليم (٢٠٨٥).

[٣٦٧] بوخارى (٥٧٨٨) و موسليم (٢٠٨٧).

[٣٦٨] بوخارى (٥٨٨٧).

**دیسان لەوەوە، لە حەزرەتەوە دەفەرموێ** (درودی خوای لەسەر بێ)**: ئەو جلو بەرگەی لەخوار قولەپێوە بێو بۆ فیزو دەعیە بێ جێیەکەی لەناو ئاگری دۆزەخدا دەبێ! (ب).**

٥/٧٩٤[٣٦٩] – وعن أبي ذرّ (رضي اللّه عنه)عن النبي (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال : (ثلاثةٌ لا يُكَلِّمُهُمُ اللّهُ يَوْمَ القِيَامةِ، ولا يَنْظُرُ إلَيْهم، وَلا يُزَكّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ) قال : فقرأها رسولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)ثلاثَ مِرَار. قال أبو ذرّ: خابُوا وخسِرُوا مَنْ هُمْ يا رسول اللّه ؟ قال : (المُسبِلُ، والمَنَّانُ وَالمُنْفِقُ سِلْعَتَهُ بِالحَلفِ الكاذِبِ) رواه مسلم. وفي روايةٍ له : (المُسْبِلُ إزَارَهُ).

**ئەبو ذەڕ** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **سێ جار لەسەر یەك فەرمووی: لەرۆژی قیامەتدا ئەم سێ دەستەیە خودا نەلەڕووی لوتفەوە وسپیان دەکاو سەرەڕای ئەوەیش سزایەکی بەسوێو پڕ ئازاریشیان بۆ دەبڕێتەوە. ئەبو ذەڕ فەرمووی: کە سێ جار ئەمەی فەرمووی: عەرزیم کرد: ئەی پیغەمبەری خودا! ئەم خانەخراپو زیانبارانە کێن؟ فەرمووی: کەسێ بەفیزو هەوا داوێنی جلی خۆی دەخشێنێ لە رێگەوە کەسێ هەرچی چاکەیێ دەکا دەیداتەوە بە چاوداو کەسێ شمەکی فرۆتەنی بەسوێندی درۆ ساخ دەکاتەوە (م).**

٦/٧٩٥[٣٧٠] – وعن ابن عمر رضي اللّه عنهما، عن النبي (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال : (الإسْبَالُ في الإزارِ، والقَمِيصِ، وَالعِمَامةِ، منْ جَرَّ شَيئا خُيَلاءَ لَم يَنظُرِ اللّه إليهِ يوْمَ القِيَامةِ) رواه أبو داود، والنسائي بإسنادٍ صحيح.

**ئیبنو عومەر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: شۆڕکردنەوەی نادروست تەنیا بۆ بەرکۆش (ئیزار)و کراسو لفکەی مێزەرەوەو بەس، جا هەرکەسێ بۆ فیزو دەعیە یەکێ لەم شتانە بەکێش بکا، لەرۆژی قیامەتا خودا بەچاوی بەزەیی پیاهاتنەوە تەماشای ناکا (د/ن – س/ص).**

٧/٧٩٦[٣٧١] – وعن أبي جُرَيّ جابر بن سُلَيم (رضي اللّه عنه)قال : رَأَيتُ رَجلاً يصْدُرُ النَّاسُ عَنْ رَأْيهِ لاَ يَقُولُ شَيئاً إلاَّ صَدَرُوا عنه، قلتُ : من هذا ؟ قالوا : رسول اللّه

---

[٣٦٩] موسلیم (١٠٦).

[٣٧٠] ئەبو داوود (٤٠٩٤)، نەسائی (٨/٢٠٨).

(صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم). قلتُ: عَليكَ السَّلامُ يا رسولَ اللّٰه مَرَّتَيْنِ قال : (لا تَقُل عليك السَّلامُ، علَيكَ السلامُ تحِيَّةُ الموْتى قُل : السَّلامُ عليك) قال : قلتُ : أَنتَ رسول اللّٰه ؟ قال : (أَنَا رسول اللّٰه الذي إذا أَصابَكَ ضرٌّ فدعَوْتَهُ كَشفَهُ عنْكَ، وإذا أَصابَكَ عامُ سنَة فَدَعوْتَهُ أَنبتَهَا لك، وإذا كُنتَ بِأَرْضٍ قَفْرٍ أَوْ فلاةٍ، فَضَلَّت راحِلَتُكَ، فدعوْتَه رَدَّهَا عليك) قال : قلت : اعْهَدْ إليَّ. قال : (لا تَسُبَّنَّ أحداً) قال : فما سببْتُ بعْدهُ حُرّاً، ولا عبداً، وَلا بَعِيراً، وَلا شَاةً (وَلا تَحقِرنَّ مِنَ المعروفِ شَيْئاً، وأَنْ تُكَلِّمَ أَخاك وأَنتَ مُنْبسِطٌ إليه وجهُكَ، إنَّ ذلك مِنَ المعرُوفِ. وارفَع إزارَكَ إلى نِصْفِ السَّاق، فَإن أبيتَ فإلى الكَعبين، وإياكَ وإسْبال الإزارِ فَإنَّهَا مِن المخِيلةِ وإنَّ اللّٰه لا يحبُّ المَخِيلة، وإن امْرؤٌ شتَمك وعَيَّرك بمَا يَعْلَمُ فيكَ فلا تُعيِّرهُ بما تَعلَم فيهِ، فإنَّمَا وبالُ ذلكَ عليهِ) رواه أبو داود والترمذي بإسنادٍ صحيحٍ، وقال الترمذي: حديثٌ حسن صحيح.

**جابیری کوڕی سولەیم** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: تەماشام کرد وا پیاوێ دیارە، ئەو خەڵکە چاویان لەدەمیەتی، هەرچی دەفەرموێ ئەوان لەدەمی دەقۆزنەوەو جێبەجێی دەکەن، گوتم: ئەم پیاوە کێیە؟ گوتیان: ئەوە پێغەمبەرە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **منیش دووجار گوتم عليك السلام: لەسەر تۆ بێ. سڵاو ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: مەڵێ: عليك السلام، چونکە دەستووری سەردەمی نەزانی وایە سڵاو لەمردوو بەم شێوە دەکرێ، بەڵام بڵێ: السلام عليك: سڵاو لەسەر تۆ بێ. گوتم ئایا تۆ پێغەمبەری خودای؟ فەرمووی: بەڵێ من پێغەمبەری ئەو خودایەم کەکاتێ تووشی تەنگانەیێ دەبیتو هاواری بۆ دەبەیت دێت بەهاوارتەوەو دەرووت لێ دەکاتەوە، وەکاتێ تووشیساڵی نەهاتی دەبیو هاواری لێ دەکەی دێ بەهاوارتەوەو باران دەبارێنێو شینایی سەوز دەکات بۆت، وەکاتێ لەشوێنێکی چۆڵدا یان لەبیابانێ وڵاخەکەت ون دەبێو لێی دەپاڕێیتەوە وڵاخەکەت پێ دەداتەوە. گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئامۆژگاریم بفەرموو: فەرمووی: جنێو بەکەس مەدە. گوتی: ئیتر لەو ساکەوە هەتا ئێستا جمێنم بەهیچ نەداوە: نە بەئازادو نە بە بەندەو نە بە وشترو نە بە مەڕو نە بە هیچی تر، فەرمووی: ئەوەی چاکە بێ قەت بەکەمی مەگرەو بەسووکی مەزانە، قسەکردن لەگەڵ برای خۆتا بەرووی خۆشەوە ئەویش**

---

(٣٧١) **ئەبو داوود (٤٠٨٤)، تیرمیزی (٢٧٢٢).**

**هەر لە چاکەیە، جلەکانیشت هەتا نیوەی لاقت بێ، ئەگەر بەوە قایل نابیت هەتا قاپە رەقەڵەکان بێ، خۆت بگرە لەشۆڕکردنەوەو بەردانەوەی جل‌وبەرگ، چونکە شتی وا فیزو دەعیەیەو لەخۆبایی بوونە، خودا خۆشی لەشتی وا نایێ، ئەگەر کەسێ جنێوێکی پێ دایت، یان تانوتێکی لێ دایت وەلحاڵ جنێوو تانووتەکەی لەتۆدا هەبوو بەرپەرچی مەدەرەوە بەجنێوو تانووتێ کە لەودا هەبێو تۆ ئاگات لێ بێ، ئیتر ئۆباڵی ئەوە بەئەستۆی ئەوە (د/ت — س/ص-؛ح/ظن).**

٧٩٧/٨[٣٧٢]– وعن أبي هريرة (رضي اللّه عنه)، قال : بينما رَجُل يُصَلّي مُسْبِلٌ إزارَه، قال له رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (اذهَب فَتوضأْ) فَذهَب فَتَوضَّأَ، ثم جاءَ، فقال: (اذهبْ فَتوضَّأْ) فقال له رجُلٌ : يا رسول اللّه. مالكَ أَمرْتَهُ أَن يَتَوَضَّأَ ثم سَكَتَّ عنه ؟ قال : (إنه كانَ يُصلّي وهو مُسْبلٌ إزارهُ، إن اللّه لا يقْبلُ صلاةَ رجُلٍ مُسبِلٍ). رواه أبو داود بإسنادٍ على شرط مسلم.

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: جارێ پیاوێ بەرکۆشەکەی شۆڕکردبۆوە لەسەر زەوی دەخشا، پیغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **پێی فەرموو: برۆ دەستنوێژێ بگرە، پیاوەکە رۆیشت دەستنوێژی گرتو لەپاشا هاتەوە، حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرموویەوە: بچۆ دەستنوێژێ تر بگرەوە، پیاوێکیش بە حەزرەتی گوت: قوربان! ئەوە بۆ دووجار پێیت فەرموو کە دەستنوێژ بگرێو ئیتر دەنگت نەکرد؟ فەرمووی: چونکە کە نوێژی دەکرد جلەکەی شۆڕێکی نادروست بوو، خودایش نوێژی ئەو کەسانە گیرا ناکات کە لەسەر ئەو شێوەیە نوێژ دەکەن. (دە — س/ص).**

٧٩٨/٩[٣٧٣]– وعن قَيسِ بن بشرٍ التَّغْلِيِّ قال : أَخْبَرني أبي وكان جليساً لأبي الدَّرداءِ قال : كان بِدِمشقَ رَجُلٌ من أَصحاب النبي (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يقال له سهلُ ابنُ الحنظَلِيَّة، وكان رجُلاً مُتوحِّداً قَلَّمَا يُجالسُ النَّاسَ، إنَّمَا هو صلاةٌ، فَإذا فرغَ فَإنَّمَا هو تسبيحٌ وتكبيرٌ حتى يأْتيَ أهْلَهُ، فَمرَّ بِنَا ونَحنُ عِند أبي الدَّرداءِ، فقال له أَبو الدَّرداءِ : كَلِمةً تَنْفَعُنا ولا تضرُّكَ. قال : بَعثَ رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)سريَّةً فَقَدِمَتْ، فَجَاءَ رَجُلٌ مِنهم فَجلَسَ في المَجْلِس الذي يَجلِسُ فِيهِ رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)،

---

[٣٧٢] ئەبو داوود (٤٠٨٦).

[٣٧٣] ئەبو داوود (٤٠٨٩).

فقال لرجلٍ إلى جَنْبِهِ : لَوْ رَأَيتنَا حِينَ التقَيْنَا نَحنُ والعدُو، فَحمَـل فـلانٌ فطَعـن، فقـال : خُذْهَا مِنِّي. وأَنَا الغُلامُ الغِفَارِيُّ، كَيْفَ تَرى فِي قوْلِهِ ؟ قال: مَـا أَرَاهُ إلا قَـدْ بَطَـل أَجـرُهُ. فَسَمِعَ بِذلكَ آخَرُ فقال : مَا أَرَى بِذَلَكَ بأْساً، فَتَنَازعا حَتى سَمِعَ رسول اللّـه (صَـلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)فقال: (سُبْحان اللّه؟ لا بَأس أَن يُؤْجَرَ ويُحْمَد) فَرَأَيْتُ أَبا الدَّرْدَاءِ سُرَّ بِذلك، وجعلَ يَرْفَعُ رأْسَه إِلَيهِ وَيَقُولُ : أَأَنْتَ سَمِعْتَ ذَلكَ مِنْ رسول اللّه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسـلّم،؟ فيقول : نعَمْ، فما زال يعِيدُ عَلَيْهِ حتى إِنّي لأَقولُ لَيبرُكَنَّ على ركْبَتَيْهِ.

قال : فَمَرَّ بِنَا يَوماً آخَرَ، فقال له أَبُو الدَّرْدَاءِ : كَلِمَةً تنفعُنا ولا تَضرُّكَ، قـال: قـال لَنَا رسول اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (المُنفِـقُ عَلـى الخَيْـلِ كالبَاسِـطِ يَـدَهُ بالصَّـدَقة لا يَقْبِضُهَا). ثم مرَّ بِنَا يوماً آخر، فقال له أَبو الدَّرْدَاءِ : كَلِمَةً تَنْفَعُنا وَلا تَضرُّكَ، قال : قـال رسول اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (نِعْمَ الرَّجُلُ خُرَيْمٌ الأَسَدِيُّ، لولا طُولُ جُمته وَإِسْبَالُ إِزَارِه) فَبلَغَ ذلك خُرَيماً، فعجَّلَ فَأَخَذَ شَفرَةً فَقطَعَ بهـا جُمتَـهُ إلى أُذنيْـه، ورفـعَ إِزارَهُ إِلى أَنْصَاف سَاقَيْه. ثُمَّ مَرَّ بنَا يَوْماً آخَرَ فَقَالَ لَهُ أَبُو الدَّرْدَاءِ : كَلِمةً تَنْفَعُنَا ولا تَضـرُّكَ قَـالَ : سَمِعْتُ رسُولَ اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يقُولُ : (إنَّكُمْ قَادمُونَ عَلى إِخْوانِكُمْ. فَأَصْلِحُوا رِحَالَكُمْ، وأَصْلحوا لبَاسَكُمْ حتى تَكُونُـوا كَـأَنَّكُمْ شَـامَةً في النَّـاسِ، فَإنَّ اللّـه لا يُحِبُّ الفُحْشَ وَلاَ التَّفَحُش). رواهُ أَبو داود بِإِسنادٍ حسنٍ، إِلاَّ قَيْسَ بن بشر، فَاخْتَلَفُوا في توثيقِهِ وتَضْعفيه، وقد روى له مسلم.

قەیسی کوڕی بیشری تەغلیبی فەرمووی: باوکم – کە هاونشینی ئەبو دەرداء بوو، ئەبو دەرداء خوای لەهاوڕێ ناودارەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بوو، گوتی پێم: پیاوێ لەهاوڕێیانی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لەدیمەشق بوو، پێیان دەگوت: ئیبنو حەنظەلییە، بەڕاستی پیاوێکی لەخودا ترسی گۆشەگیر بوو، حەزی لەتەنیایی بوو، زۆر کەم لەگەڵ خەڵك دادەنیشت مەگەر چۆنها، هەر خەریکی نوێژ بوو، کە لەنوێژیش دەبۆوە هەر خەریکی یادو ذیکری خودا بوو، وەك تەسبیحاتو تەکبیر کردن، ئیتر هەتا دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە بۆلای کەس‌وکاری ئەمە کاری بوو. ڕۆژێ لە خزمەتی ئەبو دەرداء بووین ئەو پیاوە کەناوی سەهل بوو ناودار بوو بە ئیبنو حەنظەلییە هات بۆلامان، ئەبو دەرداء (ڕەزای خودای لێ بێ) پێی فەرموو: وشەیەکمان پێ بڵێ: سوودی بۆ ئێمە دەبێ‌و زیانی بۆ تۆ نابێ. فەرمووی: جارێ حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لقێ سوپای نارد بۆ غەزایێ، کە گەڕایەوە پیاوێکیان هات وەکجارانی خۆی

لەکۆڕی دانیشتنی حەزرەتدا (درودی خوای لەسەر بێ) دانیشت، پیاوێ لەتەنیشتیەوە بوو پێی گوت: خۆزگایە چاوت لێمان دەبوو لەو حەلەدا کە لەگەڵ دوژمن بەرەنگاری یەك بووین، کەچۆن فیسارەکەسمان هەڵمەتی شێرانی بردو دەستی خۆی وەشاندو گوتی بەوەی کە رمەکەی لێدا: ها بگرە لەدەستم، من فیسارى رۆڵەی غیفارم! جا تۆ بۆ ئەم خۆهەڵکێشانەیەی چی دەڵێیو رات چۆنە؟ هاونشینەکەی گوتی: من وادەزانم ئەمە خۆهەڵکێشانو خۆپەسەندییەو شتی وا نارەوایەو پاداشەکەی پووچ دەکاتەوە، نەدەبوو شتی وا بڵێ. پیاوێکی تریش گوێی لەم گفتوگۆیە بوو گوتی: بەڵام من وادەزانم کە ئەوە قەیدی نییە چونکە بۆ زەندەق بردنی دوژمنە نەك بۆ خۆهەڵکێشانی رووت، ئیتر لەسەر ئەمە بوو بە دەمەقاڵێو مقۆمقۆیان، تا گەیشت بە پیغەمبەرو ئەویش قسەی ژنەوت فەرمووی: سوبحانەڵڵا لەم سەیرە! قەیدی نییە: با پاداشی باشیش وەربگرێو ستایشی جوانیشی بکرێ! روانیم: ئەبو دەرداء (رەزای خودای لێ بێ) لەم فەرموودەیە ئەوەندە شادومانو کەیف خۆش بوو، خەریك بوو لەخۆشیانا دەفڕی، تەواو گەردنی بەرزکردەوە بۆ لایو فەرمووی: ئایا تۆ بە خودی خۆت ئەم وشەیەت لەزاری پیرۆزی پیغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بیست؟ ئەویش گوتی: بەڵێ. ئیتر ئەبو دەرداء ئەم قسەیەی لێ دووبارە دەکردەوەو جار لەگەڵ جاردا، وەك فەقێیەکی بەرێز لە خزمەتی مامۆستای بەرزی خۆیدا، باشتر دەهات بەچۆکا. گوتی: رۆژێکی تریش هات بۆلامان، ئەبو دەرداو پێی فەرموو: وشەیەکمان پێ بفەرموو، سوودی بۆ ئێمە دەبێو زیانی بۆ تۆ نابێ، فەرمووی: پیغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرمووین:هەرکەسێ وڵاخی بەرزە بەخێو بکاو مەسرەفی بکاو ئامادی بکا بۆ تێکۆشان لەرێی خودادا وەك ئەو کەسە وایە کە سەرومڕ دەستی بەخێوکردنەوە بێو قەت دەستی لێ نەکێشێتەوە. رۆژێکی تریش دیسان هاتەوە بۆ لامان هەمدیس ئەبو دەرداء پێی فەرموو: وشەیەکمان پێ بفەرموو، سوودی بۆ ئێمە دەبێو زیانی بۆ تۆ نابێ، فەرمووی: پیغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خورەیمی ئەسەدی پیاوی چاکە، بریا کاکۆڵەکەی درێژ نەدەبوو جلەکەیشی شۆڕنەدەبۆوە، گوتی: هەر ئەم فەرمایشتەی حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) گەیشتەوە بەخورەیم بەزوویی خێرا موسێکی هێنا لەئاستی هەردوو گوێی کاکۆڵەکەیی خشت بڕی، جلەکەشی هەڵکرد هەتا ناوەڕاستی هەردوو لاقی، رۆژێ تریش هەمدیسان

هاتەوە بۆ لامان ئەبو دەرداء هەمدیسانەوە پێی فەرموووەوە: وشەیەكمان پێ بفەرموو سوودی بۆ ئێمە دەبێ‌و زیانی بۆ تۆ نابێ. فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: ئێوە وا لەم سەفەری غەزایە سبەینێ دەگەڕێنەوە بۆ ناو برادەرانی خۆتان، دەی ولآخەكانی ژێرتان ڕێكبخەن‌و هەروەها جل‌و بەرگەكەی بەریشتان ڕێك‌و پێك بكەن‌و لەسەرە شێوەیەكی لەبارو سەلار بچنەوە ناویان، ئەوەندە قنج‌و ڕێك‌و پێك‌و پاك‌و تەمیز بن لەناو خەڵكی تردا وەك نیشانە چۆن بەلەشەوە دیارە ئێوەش ئاوا دیار بن! چونكە بەڕاستی خودای گەورە حەزی لەمرۆڤی ناڕێكی شڕو شێواو هەرزەگۆ نییە (د).

١٠/٧٩٩[٣٧٤]– وعن أبي سعيدٍ الخدْريِّ (رضي اللّٰه عنه)قـال: قَـالَ رسُـولُ اللّٰـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) (إزرَةُ المُسلِمِ إلى نصْفِ السَّاق، وَلاَ حَرَجَ أَوْ لا جُنَـاحَ فيمـا بَيْنَـهُ وَبَيْنَ الكَعْبَيْنِ، فَمَا كانَ أَسْفَلَ منَ الكَعْبَينِ فَهوُ في النَّارِ، ومَنْ جَرَّ إزارهُ بَطَراً لَمْ يَنْظرِ اللّٰه إِلَيْهِ). رواهُ أَبو داود بِإسنادٍ صحيح.

عەبدولڕەحمان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بۆ ئەندازەی شۆڕیی جل‌وبەرگ لە ئەبو سەعید پرسیارم كرد: فەرمووی: باش بوو لەكەسێكی شارەزات پرسی، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: شۆڕیی كاڵای پیاوی موسوڵمان هەتا نیوەی لاقە، لەوە خوارتریش هەتا قاپەڕەقەڵەكانە قەیدی نییە، یان فەرمووی: گوناهی نییە، بەڵام ئەوەی لەخوار قولەپێوە بێ‌و بۆ فیزو دەعیە بێ، جێگەی لەناو ئاگری دۆزەخدا دەبێ! هەر كەسێكیش جل‌وبەرگی خۆی بۆ هەوا بەسەر زەویدا بەكێش بكا، خودا بەچاوی رەحمەت تەماشای ناكا (د – س/ص –تاج).

١١/٨٠٠[٣٧٥]– وعن ابنِ عمر رضيَ اللّٰه عنهما قال : مَـرَرْتُ عَلـى رسُـول اللّٰـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وَفي إزاري اسْتِرْخَاءٌ. فَقَالَ : (يا عَبْدَ اللّٰهِ، ارْفَعْ إزارَكَ) فَرفعتهُ ثُـمَّ قَالَ : (زِدْ)، فَزِدْتُ، فَمَا زِلْتُ أَتَحرَّاها بَعْدُ. فَقَالَ بَعْـض القَـوْمِ : إلى أَيْـنَ ؟ فقَـال : إلى أَنْصاف السَّاقَيْنِ). رواهُ مسلم.

---

[٣٧٤] ئەبو داوود (٤٠٩٣).

[٣٧٥] موسلیم (٢٠٨٦).

ئیبنو عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆلای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) جلەکەم هەنێ شۆڕ بوو، فەرمووی: ئەی عەبدوڵلای! جلەکەت هەڵکیشە، منیش کەمێك هەڵم کێشا، فەرمووی: زیاتریش، منیش زیاترم کرد، ئیتر هەر چاوەڕوان بووم کەبزانم تاکوێ هەڵی بکێشم تا پیاوێ لەیارانی گوتی: قوربان! هەتا کوێ؟ فەرمووی: هەتا نیوەی هەردوو لاق! (م).

٨٠١/١٢[٣٧٦]– وعنه قال : قالَ رسُولُ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (مَنْ جَرَّ ثَوبَه خيلاءَ لَمْ يَنْظُرِ اللّه إلَيْهِ يَوْمَ القيامةِ) فقالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ : فَكَيْفَ تَصْنَعُ النِّسَاءُ بِذُيُولِهنَّ، قالَ : (يُرْخينَ شِبْراً). قالَتْ: إذن تنكشفُ أَقْدامُهنَّ. قال : (فيُرْخِينَهُ ذِراعاً لاَ يَزِدْنَ).قال : حديث حسن صحيح.

دیسان فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوکەسەی بەفیزو دەعیە جلوبەرگی خۆی بەسەر زەویدا بەکێش بکا، خودا لەرۆژی قیامەتدا بەچاوی میهرو سۆز تەماشای ناکا، ئوممو سەلەمەی هاوسەری (رەزای خودای لێ بێ) عەرزی کرد: قوربان: ئەی ئافرەتان چی لەداوێنیان بکەن، خۆ ئەوان فەرمانیان پێ کراوە کە داوێنیان بەربدەنەوە؟ فەرمووی: یەك بست شۆڕی بکەن، فەرمووی: ئاخر بستێ بەش ناکا، قاچیان دەردەکەوێ، فەرمووی: دەی با یەك باڵ شۆڕی بکەن و نابێ لەوەزیاتری بکەن! (د/ت –ح/ح/ص).

**١٢٠- سوننەتە - بۆ بێ هەوایی و خاکیتی - مرۆڤ تەرکی جلوبەرگی قۆز بکا**
**باب استحباب ترك الترفع في اللباس تواضعاً**

بڕوانە: باسی (فضل الجوع وخشونة العيش) فەرموودەی (أخرجت عائشة كساء) (٤٩٩/٩ز –٥٦).

فەرموودەی (لقد رأيت سبعين من أهل الصفة ما منهم)، بڕوانە: (٤٦٩/١٣ز –٥٥).

فەرموودەی (لقد رأيت سبعين من أهل الصفة ما منهم)، بڕوانە: (٥٠٦/١٦ز–٥٦).

فەرموودەی (كنا جلوسا...) بڕوانە: (٥٠٨/١٨ز – ٥٦).

فەرموودەی (إن البذاذة من الايمان)، بڕوانە: (٥١٧/٢٧ز – ٥٦).

فەرموودەی (كم قميص رسول الله إلى الرسغ)، بڕوانە (٥١٩/٢٩ز – ٥٦).

[٣٧٦] ئەبو داوود (٤١١٩)، (١٧٣٦).

١/٨٠٢(٣٧٧)– وعن معاذِ بن أَنسٍ (رضي اللّه عنه)أَنّ رسُولَ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال : (مَنْ تَرَكَ اللّباس تَواضُعاً للّه، وَهُوَ يَقْدِرُ علَيْهِ، دعاهُ اللّهُ يَوْمَ القِيامَةِ علَى رُؤُوسِ الخَلائِقِ حتى يُخيِّره منْ أَيِّ حُلَلِ الإِيمان شَاءَ يلبَسُها). رواهُ الترمذي وقال: حديث حسن.

موعاذی كوڕی ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ – بۆ بێ هەوایی‌و خاکێتی – واز لەجل‌وبەرگی قۆز بێنێ‌و مەبەستی ساغ رەزای خودا بێ‌و لەبەر رەزیلی نەبێ، لەهەمان کاتدا لەتوانایشیدا هەبێ کە بیکا، ئەوە لە رۆژی قیامەتدا خودا لەبەرچاوی ئەو هەموو دروستکراوانەی خۆی، دەستی رێزو قەدری لێ دەنێ‌و بانگی دەکاو دەیکا بەسەرپشك، کە بەدڵی خۆی کام قاتەی بەدڵە، لەو قاتانەی کە خەڵاتی خاوەن ئیمانەکانن، لەبەری بکا (ت:ح/ح).

**١٢١- سوننەتە پۆشاك ناوەندی بێ، نابێ شتێکی وابێ کە ببێ بەهۆی رەخنەو نەنگ لێ گرتنی خەڵك، مەگەر لەبەر ناچاریی یان لەبەر مەبەستێکی رەوا**

**باب استحباب التوسط في اللباس ولا يقتصر على ما يزري به لغير حاجة ولا مقصود شرعي**

١/٨٠٣(٣٧٨)– عن عمرو بن شُعْيبٍ عن أَبيه عَنْ جدِّهِ (رضي اللّه عنه)قَالَ : قالَ رسُولُ اللّهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (إن اللّه يُحِبُّ أَنْ يُرى أَثَرُ نِعْمَتِهِ عَلى عبْده) رواهُ الترمذي وقال: حديثٌ حسن.

عەمری کوڕی شوعەیب لەباوکییەوە لەباپیرەیەوە (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خودا حەزدەکا نیشانەی نازو نیعمەت‌و چاکەی خۆی بەبەندەی خۆیەوە دیار بێ. (ت:ح/ح).

**١٢٢- بۆ پیاوان پۆشینی ئاوریشم نارەوایە، دانیشتنیشیان لەسەری هەر نادروستە. پشت پێوەدانیشی هەروەها، بەڵام بۆ ژن پۆشینی دروستە**

**باب تحريم لباس الحرير على الرجال وتحريم جلوسهم عليه واستنادهم إليه وجواز لبسه للنساء**

١/٨٠٤(٣٧٩)– عن عمر بن الخطّاب (رضي اللّه عنه)قال: قالَ رسُولُ اللّهِ(صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (لاَ تَلْبَسُوا الحرير، فَإنَّ مَنْ لَبِسهُ في الدُّنْيا لَمْ يَلْبَسْهُ في الآخرةِ) متفقٌ عليه.

---

(٣٧٧) تيرميذي (٢٤٨٣).

(٣٧٨) تيرميذي (٢٨٢٠).

**عومەر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەی پیاوەکان! ئاوریشم لەبەر مەکەن، چونکە هەرکەسێ لەپیاوان لەم جیهانەدا ئاوریشم لەبەر بکا لەو جیهان لەبەری ناکا (ش).**

٢/٨٠٥[٣٨٠]- وعنه قال: سمِعتُ رسُولَ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يقولُ: (إنَّما يلبَسُ الحريرَ منْ لا خَلاق لَهُ) متفقٌ عليه. وفي روايةٍ للبُخاريَ: (مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ في الآخِرة). قولُهُ: (مَنْ لا خَلاَقَ لَهُ) أَيْ: لاَ نَصيبَ لَهُ.

**دیسان فەرمووی: ژنەوتم لە حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: کەسێ ئاوریشم لەبەر دەکا کەبەشی بەو جیهانەوە نەبێ (ش) لەگێڕانەوەیەکی بوخاریدا: تەنیا ئەو کەسانە ئاوریشم لەبەر دەکەن کە بەشی باشیان لەدوارۆژدا نییە.**

٣/٨٠٦[٣٨١]- وعن أنس (رضي اللّه عنه)قال : قالَ رسُولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (منْ لَبِسَ الحرير في الدُّنْيا لَمْ يَلْبسْهُ في الآخرَةِ) متفقٌ عليه.

**ئەنەس** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: هەرپیاوێ لەم جیهانەدا ئاوریشم لەبەر بکا، لەو دونیا لەبەری ناکا (ش).**

٤/٨٠٧[٣٨٢]- وعن عليّ (رضي اللّه عنه)قال : رأَيْتُ رَسُولَ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)أَخذَ حَرِيراً، فَجعلَهُ في يَمينه، وَذَهَباً فَجَعَلَهُ في شِمالِهِ، ثُمَّ قَالَ : (إنَّ هـذَيْنِ حرَامٌ عَلى ذُكُورِ أُمَّتي) رواهُ أبو داود بإسنادٍ حسن.

**عەلی** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: بەچاوی خۆم چاوم لێ بوو پیغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **پارچەیێ ئاوریشمی بەدەستی راستی هەلگرتو پارچەیێ زێڕیشی بەدەستی چەپی هەلگرتو فەرمووی: ئەم دوو شتە لەسەر نێرینەی گەلی من حەرامن (د — س/ح).**

٥/٨٠٨[٣٨٣]- وعن أبي مُوسى الأشْعريِّ (رضي اللّه عنه)أنَّ رسُولَ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال: (حُرِّم لِباسُ الحَرِيرِ وَالذَّهَب على ذُكُورِ أُمَّتي، وَأُحلَّ لإنَاثِهِم) رواهُ الترمذي وقال حديثٌ حسن صحيح.

---

[٣٧٩] بوخخاری (٥٨٣٠)، موسلیم (٢٠٦٩) (١١).

[٣٨٠] بوخاری (٥٨٣٥)، موسلیم (٢٠٦٨).

[٣٨١] بوخاری (٥٨٣٢)، موسلیم (٢٠٧٣).

[٣٨٢] ئەبو داوود (٤٠٥٧).

ئەبو مووساى ئەشعەرى (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەرى خودا (دروودى خواى لەسەر بێ) فەرمووى: پۆشینى ئاوریشمو زێڕ بۆ نێرینەى گەلى من نادروستە، وەلێ بۆ مێینەیان درووستە (ت:ح/ح/ص).

٨٠٩/٦[٣٨٤]- وعن حُذَيْفَةَ (رضي اللّٰه عنه)قال: نَهَانَا النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أنْ نَشْرب في آنِيةِ الذَّهب وَالفِضَّةِ، وَأنْ نَأْكُل فِيهَا، وعَنْ لُبْسِ الحَرِيرِ وَالدِّيبَاج وأنْ نَجْلِس عَلَيْهِ. رواه البخاري.

حوذيفە (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خواى لەسەر بێ) قەدەغەى كردووە لێمان كە لەدەفرى زێڕو زیودا شت بخۆینەوە یان شت بخۆین، لەوەیش كە لەسەر كەلوپەلى ئاوریشمو دێباج دابنیشین (ب).

## ١٢٣- كەسێ ئالۆش‌و خورووى هەبێ پۆشینى ئاوریشمى بۆ دروستە
## باب جواز لبس الحرير لمن به حكّة

١/ ٨١٠[٣٨٥]- عن أنس (رضي اللّٰه عنه)قال: رَخَصَ رسُولُ اللّٰهِ(صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) للزبير وعبْد الرَّحْمنِ بنِ عوْفٍ رضي اللّٰه عنهما في لبْسِ الحَرِيرِ لِحكَّةٍ بهما. متفقٌ عليه.

ئەنەس (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خواى لەسەر بێ) رێگەى زوبەیرى كوڕى عەووامو عەبدوڕڕەحمانى كوڕى عەوفى دا كە ئاوریشم لەبەر بكەن، چونكە ئالۆش‌و خورووكەیێ لە لەشیاندا هەبوو (ش).

## ١٢٤- نەهى كراوە لەراخستنى كەوڵى پڵنگ‌و كردنى بە نەرمەزین‌و شتى ووا بۆ سواریى
## باب النهي عن افتراش جلود النمور والركوب عليها

١/ ٨١١[٣٨٦]- عنْ مُعاويةَ (رضي اللّٰه عنه)قالَ : قال رسُولُ اللّٰهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم:(لاَ تَرْكَبوا الخَزَّ وَلاَ النِّمارَ) حديث حسن، رواهُ أَبو داود وغيره بإسنادٍ حسنٍ.

---

[٣٨٣] تيرميذي (١٧٢٠).

[٣٨٤] بوخارى (٥٦٣٢).

[٣٨٥] بوخارى (٥٨٣٩)و موسليم (٢٠٧٦).

[٣٨٦] ئەبو داوود (٤١٢٩).

**موعاوييه** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: نە لەسەر سەرزینی ئاوریشمەوە سواری وڵاخ ببن‌و نە کەوڵی پڵنگ بکەن بە سەرزین (د – س/ح).**

٢/٨١٢[٣٨٧]– وعن أبي المليح عن أَبيهِ، (رضي اللّٰه عنه)،أنَّ رسُول اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)نَهَى عنْ جُلُودِ السِّباعِ. رواهُ أبو دَاود، والترمذي، والنسائي بأَسَانِيد صحاح.
وفي روايةِ الترمذي : نهَى عنْ جُلُودِ السِّباعِ أنْ تُفْتَرَشَ.

**ئەبو مەلیح لە باوکییەوە** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: پیغەمبەری خودا** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: سواری کەوڵ‌و پێستی دڕندە مەبن (د/ت/ن – أسانيد صحيحة) لەگێڕانەوەیەکی تیرمذیدا: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **نەهی کردووە لە ڕاخستن‌و داخستنی کەوڵ‌و پێستی دڕندە.**

## ١٢٥- لەدوا لەبەرکردنی پۆشاك‌و پێڵاوی نوێ چی بڵێی باشە
## باب ما يقول إذا لبس ثوباً جديداً أو نعلاً أو نحوه

١/٨١٣[٣٨٨]– عن أبي سعيد الخُدْري (رضي اللّٰه عنه)قال : كانَ رسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)إذا استَجَدَّ ثَوْباً سَمَّاهُ باسْمِهِ عِمامَةً، أَوْ قَمِيصاً، أَوْ رِدَاءً يقُولُ : (اللّٰهُمَّ لكَ الحَمْدُ أَنْتَ كَسَوْتَنِيهِ، أَسْأَلُكَ خَيْرَهُ وَخَيْرَ ما صُنِعَ لَهُ، وأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ وشَرِّ ما صُنِعَ لَهُ) رواهُ أبو داود، والترمذي وقال : حديث حسن.

**ئەبو سەعید** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پیغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **کە کاڵایەکی تازەی لەبەر دەکرد بەناوی خۆیەوە ناوی دەهێنا، وەك مێزەر، یان کراس، یان لەشپۆش ئەمجا دەیفەرموو:** (اللّٰهُمَّ لكَ الحَمْدُ أَنْتَ كَسَوْتَنِيهِ، أَسْأَلُكَ خَيْرَهُ وَخَيْرَ ما صُنِعَ لَهُ، وأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ وشَرِّ ما صُنِعَ لَهُ) **خودایە ستایش هەر بۆ تۆیە، تۆ ئەم پۆشاکەت بەمن بەخشیوە، داوات لێ دەکەم کەبەشم بدەیت لەخێری ئەم پۆشاکەو لەخێری ئەو شتەیش کە ئەم پۆشاکەی بۆ دروستکراوە، وە پەنا دەگرم بەتۆ لەشەڕی ئەمەو لەشەڕی ئەو شتەیش کە ئەمەی بۆ دروستکراوە (د/ت –ح/ح).**

---

[٣٨٧] ئەبو داوود (٤١٣٢)، تیرمیذي (١٧٧١)، نەسائی (١٧٦/٧).

[٣٨٨] ئەبو داوود (٤٠٢٠)، تیرمیذي (١٧٦٧).

**١٢٦- لەکاتی جل لەبەرکردن سوننەتە لای راست پێش بخرێ**
**باب استحباب الابتداء باليمين في اللباس**

هذا الباب قد تقدم مقصوده وذكرنا الأحاديث الصحيحة فيه.

**تەماشای باسی (استحباب تقديم اليمين) بکە، فەرموودەی یەکەمو دووەمو چوارەمو پێنجەم. بڕوانە: زنجیرە /٩٩ ژمارە: (١/٧٢١ هەتا ٧/٧٢٧).**

**١٢٧- نامەی دەستوورەکانی نووستنو راکشانو دانیشتنو کۆڕی دانیشتنو هاونشینو خەوبینین - باب آداب النوم والاضطجاع والقعود والمجلس والجليس والرؤيا**

١/٨١٤[٣٨٩]- عن الْبَراءِ بن عازبٍ رضيَ اللَّه عنهما قال : كَانَ رسول اللَّه (صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)إذا أَوَى إلى فِرَاشِهِ نَامَ عَلى شِقِّهِ الأَيمن، ثُمَّ قال : (اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسِي إلَيْكَ، وَوجَّهْتُ وَجْهي إلَيْكَ، وفَوَّضْتُ أَمْري إلَيْكَ، وَأَلجَأْتُ ظَهْري إلَيْكَ، رَغْبَةً ورهْبَةً إلَيْكَ، لا مَلْجأ ولا مَنْجى مِنْكَ إلاَّ إلَيْكَ، آمَنْتُ بِكتَابِكَ الذي أَنْزلتَ، وَنبيِّكَ الذي أَرْسَلْتَ). رواه البخاري بهذا اللفظ في كتاب الأدب من صحيحه.

**بەڕای کوڕی عازیب** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **کە دەچووە سەرنوێنی نوستنەکەی لەسەر لای ڕاست رادەکشاو دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسِي إلَيْكَ...) تاکۆتای فەرموودەکە، کە لەبەرگی یەکەمدا لەباسی (في اليقين والتوكل)دا رابورد. بڕوانە: (٨٠/٧ز ٧-).**

٢/٨١٥- بڕوانە: (٨٠/٧ ز-٧).

٣/٨١٦[٣٩٠]- وعن عائشةَ رضيَ اللَّه عنها قالتْ : كَانَ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يَصلّي مِن اللَّيْلِ إحْدَى عَشَرَةَ رَكْعَةً، فَإذا طلَع الْفَجْرُ صَلّى ركْعَتيْن خَفِيفتيْن. ثُمَّ اضْطَجَعَ على شِقِّهِ الأَيمن حَتَّى يَجِيءَ الْمُؤَذِّنُ فيُوذِنَهُ، متفق عليه.

**عائیشە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **بەشەو یازدە رکات نوێژی سوننەتی دەکرد، کە شەبەقی دەدا دووو رکات نوێژی سووکەڵەی پێش نوێژی بەیانی دەکرد، ئەمجار لەسەر لای راستی رادەکشا، هەتا بانگدەرەکە دەهاتو**

---

[٣٨٩] بوخاری (٦٣١٥).

[٣٩٠] بوخاری (٦٣١٠)و موسلیم (٧٣٦).

**ئاگاداری دەکردەوە، کەنوێژکەرەکان لەمزگەوت کۆبونەتەوە هەتا تەشریفی بڕوا بەرنوێژییەکەیان بۆ بکا (ش).**

٨١٧/٤[٣٩١]– وعن حُذَيْفَةَ (رضي اللّه عنه)قال : : كان النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلّم)إذا أَخَذَ مَضْجَعَهُ مِنَ اللَّيْلِ وَضَعَ يَدهُ تَحْتَ خَدِّهِ، ثمَّ يَقُولُ: (اللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أمُوتُ وَ أَحْيَا) وإذا اسْتَيْقَظَ قَالَ: (الحَمْدُ للّهِ الّذي أَحْيَانَا بعْدَ مَا أَمَاتَنَا وإليه النُّشُورُ). رواه البخاري.

**حوذيفه** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: گەلێ جار حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **کە بە شەو دەچووە سەر پێخەفەکەی، دەستی ڕاستی دەنایە ژێر کوڵمی ڕاستیو دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أمُوتُ وَ أَحْيَا) خودایە! بەپیرۆزی ناوی تۆ دەژیمو دەمرم. کە لە خەویش خەبەری دەبۆوە دەیفەرموو: (الحَمْدُ للّهِ الّذي أَحْيَانَا بعْدَ مَا أَمَاتَنَا وإليه النُّشُورُ) سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە لەم خەوە خەبەری کردینەوە لەپاش ئەوە کە خەوی لێ خستین، لەئەنجاما دەچینەوە بەر دیوانی خۆی! (ب – ڕەحمەت لەگۆڕی نازداری).**

٨١٨/٥[٣٩٢]– وعن يعِيشَ بنِ طفخة الغِفَارِيَّ رضي الله عنهما قال : قال أبي (بينما أنَا مضْطَجِعٌ فِي الْمسجِدِ عَلَى بَطْنِي إذا رَجُلٌ يُحَرِّكُنِي بِرِجْلِهِ فقال (إنَّ هذِهِ ضَجْعَةٌ يُبْغِضُهَا اللهُ) قال : فَنظَرْتُ، فإذا رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)رواه أبو داود بإسنادٍ صحيح:

**یەعیشی کوڕی طیفخەی غیفاری** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: باوکم فەرمووی: جارێ لە مزگەوت، لەبەر ژانەسیی لەسەر سك ڕاکشابووم، ڕوانیم وا پیاوێ بەقاچی ڕامدەوەشێنێو دەفەرموێ: خودا ڕقی لەم جۆرە پاڵکەوتنەیە، فەرمووی: جا کە تەماشایم کرد پیغەمبەر بوو (د – س/ص - تاج).**

٨١٩/٦[٣٩٣]– وعن أبي هريرة رضي الله عنه عن رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال : (مَنْ قَعَدَ مَقْعَداً لَمْ يَذْكُرِ الله تعالى فِيهِ كَانَتْ عَلَيهِ مِنَ الله تعالى تِرةٌ، وَمَنِ

[٣٩١] بووخاری (٦٣١٢).

[٣٩٢] ئەبوداوود (٥٠٤٠).

[٣٩٣] ئەبوداوود (٤٨٥٦).

اضْطَجَعَ مُضْطَجَعاً لاَيَذْكُرُ اللهَ تعالى فِيهِ كَانَتْ عَلَيه مِن اللهِ تِرةٌ) رواه أبو داود بإسنادٍ حسن:

ئـەبو هـورەيرەوە (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: هەرکەسێ لەهەر شوێنێ، دابنیشێو ذیکرو یادی خودای تێدا نەکا لەرۆژی قیامەتدا خودا بۆی دەکا بەداخو خەفەت، هەروەها هەر کەسێ لەهەر جێگایەکا رابکشێو ذیکرو یادی خودای تێدا نەکا، لەرۆژی قیامەتدا خودا دەیکا بەداخو خەفەت بۆی (د – س/ح).

**١٢٨- ئەم شتتانە دروستن: راکشان لەسەر پشتو لنگ لەسەر لنگنانو قاچ لەسەر قاچ دانان، بەمەرجێ شەرمگای دەرنەکەوێ، هەروەها هەموو جۆرە دانیشتنێکی تریش دروستە، وەکی چوارمەشقیو دەستەئەژنۆ**

**باب جواز الاستلقاء على القفا ووضع إحدى الرجلين على الأخرى إذا لم يخف انكشاف العورة وجواز القعود متربعاً ومحتبياً**

١/٨٢٠[٣٩٤]- عن عبدِ اللهِ بن يزيد رضي الله عنه أنه رأى رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)مُستَلقِياً في المسَجْدِ وَاضعاً إحْدَى رِجْلَيْهِ عَلى الأُخْرىَ متفق عليه:

عەبدوڵڵای کوڕی زەید (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دی (درودی خوای لەسەر بێ) لەناو مزگەوتا لەسەر پشت راکشابوو، لنگی نابووە سەر لنگ (ش).

٢/٨٢١[٣٩٥]- وعن جابر بن سمرة رضي الله عنه قال: (كان النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)إذَا صَلَّى الْفَجرَ تَربَّعَ فِي مَجْلِسِهِ حتَّى تَطْلُعَ الشَّمسُ حَسْنَاء) حديث صحيح. رواه أبو داود وغيره بأسانيد صحيحة.

جابیری کوڕی سەموورە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کەنوێژی بەیانی دەکرد، لەشوێنی خۆیدا، لەسەرجێ نوێژەکەی، چوارمەشقی دادەنیشت، هەتا خۆر بەجوانیی دەکەوت، لەوماوەیەدا یان ذیکرو یادی خودای دەکرد، یان دەستی دەکرد بەقسەو گفتوگۆ لەگەڵ هاوڕێیانیدا (د – ح/ص).

---

[٣٩٤] بوخاری (٥٩٦٩)، موسلیم (٢١٠٠).

[٣٩٥] ئەبوداوود (٤٨٥٠).

٨٢٢/٣[٣٩٦]- وعن ابن عمر رضي الله عنهما قال : رأيت رسـول الله (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلِّم)بفناء الكَعْبَة مُحْتَبياً بِيَدَيْهِ هكَذَا، وَوَصَفَ بِيَدِيه الاحْتِباء، وَهُوَ القُرفُصَاء رواه البخاري.

**عەبدوڵلای کوڕی عومەر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لەحەوشەی کابەدا پیغەمبەرم دی** (دروودی خوای لەسەر بێ) **بەچیچکانەوە دانیشتبوو، دەستی گرتبوو بە بەرئەژنۆیەوە، ئاوەهای کردبوو، راوی دەفەرموێ: ئیبنو عومەر بەدەستی چۆنێتی دەستگرتنەکەی حەزرەتی دەستنیشان کرد، کەبریتی بوو لە کرووشکە کردنو هەڵترووشکان، کە ئەویش ئاوایە کەسێ لەسەر قنگ دابنیشێو ئەژنۆکانی بنووسێنێ بەسنگیەوەو هەردوو دەستی تێك پەڕێنێ بە بەرئەژنۆیا (ب).**

٨٢٣/٤[٣٩٧]- وعن قَيْلَةَ بِنْت مَخْرَمَةَ رضي الله عنها قالت : رأيتُ النَّبِـيّ (صَـلّى اللهُ عليْه وسَلِّم)وهو قَاعِدٌ القُرفُصَاءَ فلما رأيتُ رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلِّم)المُتَخَشِّعَ في الجِلْسةِ أُرْعِدتُ مِنَ الفَرَقِ. رواه أبو داود، والترمذي.

**قەیلەی کچی مەخرەمە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: جارێ حەزرەتم دی** (دروودی خوای لەسەر بێ) **بەچیچکانەوە ترووشکەی کردبوو، کەسەرەنجم دا حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **وا بەملکەچیو گەردنکەچی دانیشتووە، لەترسانا لەرزم لێ هات (د/ت).**

٨٢٤/٥[٣٩٨]- وعنِ الشَّريد بن سُوَيْدٍ رضي الله عنه قال : مر بي رسولُ الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلِّم)وأنا جَالس هكذا، وَقَدْ وَضعتُ يَدي اليُسْرَى خَلْفَ ظَهْرِي وَاتَّكأْتُ عَلَى إلْيَة يَدِي فقال : أتقْعُدُ قِعْدَةَ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ؟ رواه أبو داود بإسناد صحيحٍ.

**شەریری کوڕی سووەید** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: جارێ پیغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەلامەوە رەت بوو، ئاوەها دانیشتبووم: دەستی چەپم لەپشتمەوە دانابوو، خۆم دابوو بەسەر قنگەپاژنەی دەستمدا، پیغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەوە چۆن ئاوا دادەنیشیت، وەك دانیشتنی ئەو کەسانە کە بەر قارو قینی خودا کەوتوون، کە جوولەکەکانن (د ـ س/ص).**

---

[٣٩٦] بوخاری (٦٢٧٢).

[٣٩٧] ئەبوداوود (٤٨٤٧)، تیرمیذي (٢٨١٥).

[٣٩٨] ئەبوداوود (٤٨٤٨).

## ١٢٩- باسی دەستووورەکانی کۆڕی دانیشتنو هاونشین
## باب في آداب المجلس والجليس

٨٢٥/١[٣٩٩]- عن ابنِ عمر رضي الله عنهما قال : قال رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)(لايُقِيمَنَّ أحَدُكُمْ رَجُلاً مِنْ مَجْلسهِ ثم يَجْلسُ فِيه ولكِنْ توسَعُّوا وتَفَسَّحوا) وكَان ابنُ عُمَرَ إذا قامَ لهُ رَجُلٌ مِنْ مجْلِسه لَمْ يَجلِسْ فِيه. متفق عليه.

**ئیبنو عومەر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: کەس کەس لەجێی خۆی هەڵنەسێنیو خۆی لەجێگەکەی ئەو دابنیشێ، بەڵام تەکە تەك بکەنو جێگەی یەکتری بکەنەوە، یاسای ئیبنو عومەر وابوو: ئەگەر پیاوێ جێگەکەی خۆی بۆ چۆڵ بکردایە تیادا دانەدەنیشت! (ش).**

٨٢٦/٢[٤٠٠]- وعن أبي هريرة رضي الله عنه أن رسول لله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال: (إذا قَام أحَدُكُمْ منْ مَجْلسٍ ثُمَّ رَجَعَ إلَيْهِ فَهُوَ أحَقُّ به) رواه مسلم.

**ئەبو هورەیرەوە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەگەر کەسێ لەجێگەی خۆی هەڵسا، لەپاشا گەڕایەوە بۆی، خۆی لەپێشترە پێی(م).**

٨٢٧/٣[٤٠١]- وعن جابر بنِ سَمُرَةَ رضي اللّه عنهما قال: (كُنَّا إذا أتَيْنا النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)جَلَسَ أحَدُنَا حَيْثُ يَنْتَهي). رواه أبو داود. والترمذي وقال: حديث حسن.

**جابیری کوڕی سەموورە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: دەستوورمان وابوو، کەدەچووین بۆ خزمەتی حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **ریزی کۆڕەکە تاکوێ گەیشتبوو لەوێدا دادەنیشتین! (د/ت:ح/ح).**

٨٢٨/٤[٤٠٢]- وعن أبي عبدِ الله سَلْمان الفارسي رضي الله عنه قال : قال رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (لاَ يَغْتَسِلُ رَجُلٌ يَوْمَ الجُمُعة وَيَتَطهّرُ ما اسْتطاعَ مِنْ طُهر وَيدَّهنُ منْ دُهْنِهِ أوْ يَمسُّ مِنْ طيب بَيْته ثُمَّ يَخرُجُ فَلاَ يُفرِّقُ بَيْنَ اثْنينْ ثُمَّ يُصَلّي ما كُتِبَ لهُ ثُمَّ يُنْصِتُ إذا تَكَلَّمَ الإمامُ إلا غُفِرَ لهُ ما بَيْنَهُ وَبَيْن الجمُعَةِ الأُخْرَى) رواه البخاري.

---

[٣٩٩] بوخاری (٦٢٦٩)و (٦٢٧٠)، موسلیم (٢١٧٧).

[٤٠٠] موسلیم (٢١٧٩).

[٤٠١] ئەبوداوود (٤٨٢٥)و (٢٧٢٦).

[٤٠٢] بوخاری (٨٨٣).

سـەلمانی فارسـی (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەری خـودا (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) دەفەرموێ: ئەو پیاوەی لە ڕۆژی هەینیدا خۆی بشۆرێو تا بۆی دەکرێ خۆی پاکو خاوێن ڕابگرێو سەرو ڕیشی خۆی شانە بکاو لـەڕۆنی قژ ڕۆنیـان لێ داو لـەو بۆنـە خۆشەی کە لەماڵەوە هەیانە خۆی بۆنخۆش بکا، ئـەوجا لـەماڵ دەرچـێو بچـێ بـۆ نوێژی هەینیو لەوێ نەبێ بە زەحمەت بۆ کەسو خۆی نەترنجێنێتـە نێـوانی دوو کەسەوەو سەخڵەتیان بکـا، ئینجا ئەوەنـدەی کـە خـودا لەچارەی نووسیوە نوێـژی سوننەت بکا، وەکاتێ کە پێشنوێژ دەست دەکا بەقسەو دوان ئەو بێ دەنگ بێو گوێ لەقسەکانی بگرێ، ئەو پیاوەی ئەمە بکا بێگومـان کـەخودا خـۆش دەبـێ لـەگوناهی نێوانی هەینی پێشووی‌و ئەم هەینیەی (بوخاری ـڕەحمەت لەگۆڕی نازداری).

٥/٨٢٩[٤٠٣]– وعن عمرو بن شُعَيْب عن أبيه عن جده رضي الله عنه أن رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال: (لايَحِلُّ لِرَجُل أن يُفرِّقَ بَيْنَ اثْنيْنِ إلا بإذْنِهمَا) رواه أبو داود، والترمذي وقال: حديث حسن. وفي رواية لأبي داود: (لايَجلِسُ بَيْنَ رَجُليْن إلا بإذْنِهمَا).

لـە عـەمری کـوڕی شـوعەیبی کـوڕی موحـەممـەدی کـوڕی عەبـدوڵلای کـوڕی عـەمری کـوڕی عاصـەوە، لـەباوکی عـەمرەوە، لـەباپیرەی بـاوکی عـەمرەوە، لـە پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: دروست نیە بۆ کـەس دوو کـەس لەیـەکتری جیابکاتـەوەو خـۆی لەنێوانیانـدا دابنیشـێ، مەگـەر بـەڕەزای خۆیـان (د/ت:ح/ح) لەگێڕانەوەیەکی ئەبوداوودا: لەنێوانی دوو پیاودا بەرەزامەندیی خۆیان نەبێ نابـێ دابنیشی.

٦/٨٣٠[٤٠٤]– وعن حذيفة بن اليمان رضي الله عنه أن رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم) لَعَنَ مَنْ جَلَسَ وَسَطَ الحَلْقَةَ. رواه أبو داود بإسناد حسن.

حوذیفە کوڕی یەمان (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەر زمانی موحەممـەد (دروودی خوای لەسەر بێ) نەفرینو لەعنەت لەوکەسە کراوە کەلە ناوەڕاستی ئەڵقەدا دادەنیشێت (د – س/ح).

---

[٤٠٣] ئەبوداوود (٤٨٤٥)، تیرمیذي (٢٧٥٣).

[٤٠٤] ئەبوداوود (٤٨٢٦)، تیرمیذي (٢٧٥٤).

وروى الترمذي عن أبي مِجلز أن رَجُلاً قَعَدَ وَسَطَ حَلقْة فقال حُذَيْفَةُ: مُلْعُونٌ عُلَى لِسَانِ مُحَمَّدٍ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)أوْ لَعَنَ اللهُ عَلَى لِسَانِ مُحَمَدٍ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)مَنْ جَلَسَ وَسَطَ الْحَلْقةِ. قال الترمذي: حديث حسن صحيح.

ئەبو میجلەز (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هات لەناوەڕاستی ئەڵقەی کۆڕەکەدا دانیشت، حوذەیفەی کوڕی یەمانیش (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەر زمانی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) نەفرین‌و لەعنەت لەو کەسە کراوە کە لە ناوەڕاستی ئەڵقەدا دادەنیشت، یان فەرمووی: خودا – لەسەر زمانی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) – نەفرینی لەو کەسە کردووە کە لە ناوەڕاستی ئەڵقەدا دادەنیشێت (ت:ح/ح/ص).

٨٣١/٧[٤٠٥]– وعن أبي سعيد الخدريِّ رضي الله عنه قال سمعت رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يقول: (خَيْرُ الْمَجَالِسِ أوْسَعُهَا) رواه أبو داود بإسناد صحيح على شرطِ البخاري.

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە حەزرەتم ژنەوت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: کۆڕی دانیشتن تا گەورەتر بێ باشترە (د –س/ص).

٨٣٢/٨[٤٠٦]– وعن أبي هريرة رضي الله عنه قال : قال رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (مَنْ جَلَسَ في مَجْلس فَكثُرَ فيهِ لَغطُـهُ فقـال قَبْـلَ أنْ يَقُـومَ مـنْ مجلْسـه ذلـك : سبْحانَك اللّهُمّ وبحَمْدكَ أشْهدُ أنْ لا إله إلا أنْت أسْتغْفِركَ وَأتوبُ إلَيْك: إلا غُفِـرَ لَـهُ مـا كانَ في مجلسه ذلكَ) رواه الترمذي وقال: حديث حسن صحيح.

لە ئەبو هورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ لەکۆڕێکا دابنیشێت‌و گاڵەگاڵێکی زۆر بکا، بەڵام پێش ئەوەی کە لەو کۆڕی دانیشتنە هەڵبسێ بڵێ: (سبْحانَك اللّهُـمّ وبحَمْـدكَ أشْـهدُ أنْ لا إلـه إلا أنْـت أسْتغْفِركَ وَأتوبُ إلَيْك) خودایە! تۆ خودایەکی پاک‌و پیرۆزو بێ گەردی‌و سوپاس‌و ستایشی تۆ دەکەم، شایەتی دەدەم کە هەر خۆت خودای ڕاست‌و دروستیت، داوای لێ بوردن‌و لێخۆشبوونت لێ دەکەم، تەوبە بێ لەهەموو گوناهێ بەشایەتی تۆ! ئیتر کە

---

[٤٠٥] ئەبوداوود (٤٨٢٠).

[٤٠٦] تیرمیذي (٣٤٢٩).

**ئەمـەی گـوتو لەدڵـەوە بەڕاسـتی بـوو، خـودا خـۆش دەبـێ لێـی، واتـە: لـەو وردە گوناهانەی کە لەناو ئەو کۆڕی دانیشتنەدا تووشی بووە. (ت — ح/ح/ص).**

٨٣٣/٩[٤٠٧]– وعن أبي بَرْزَةَ رضي الله عنه قال : كـان رسـول (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم)يقولُ بآخرة إذا أرادَ أنْ يَقُومَ مِنَ الْمَجلسِ (سُبْحَانَكَ اللّٰهُمَّ وبحَمْدكَ أشْـهدُ أنْ لا إلهَ إلا أنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وأتُوبُ إلَيْكَ) فقال رَجُلٌ يارسول الله إنَّكَ لَتقُولُ قَوْلاَ ماكُنْتَ تَقُولُهُ فِيما مَضَى ؟ قال: (ذلكَ كفَّارَةٌ لِماَ يَكُونُ في الْمجلِسِ) رواه أبو داود، ورواه الحاكم أبو عبد الله في المستدرك من رواية عائشة رضي الله عنها وقال :صحيح الإسناد.

**ئەبو بـەرزە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فـەرمووی: دەسـتووری حـەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **وابـوو، لـەدوا تەمەنیـدا، کاتـێ دەیویسـت لـەکۆڕ هەڵبستـێ دەیفـەرموو: (**سُـبْحَانَكَ اللّٰهُـمَّ وبحَمْدكَ أشْهدُ أنْ لا إلهَ إلا أنْتَ أَسْـتَغْفِرُكَ وأتُـوبُ إلَيْـكَ**) پیـاوێ عـەرزی کـرد: ئـەی ڕەوانـەکراوی خـودا! ئـەم فەرمایشـتەی کـە ئێسـتا دەیفـەرمووی لەمەوبـەر نـەیت دەفـەرموو، فـەرمووی** (دروودی خوای لەسەر بێ)**: ئـا ئـەو گوتەیـە دەبـێ بەکـەفارەتی ئـەوەی لەدانیشتنـەکەدا ڕوودەداتو دای دەپۆشێ! (د/حاکم: س/ص).**

١٠/ ٨٣٤[٤٠٨]– وعن ابن عمر رضي الله عنهما قال: قَلَّمَا كان رسول الله (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يقوم من مَجْلس حتى يَدعُوَ بهؤلاَءِ الْدعوَاتِ (الّلهمَّ اقْسِم لَنَا مِنْ خَشْيَتِكَ ما تَحُولُ به بيْننا وبينَ مَعْصِيتِك، ومن طَاعتِكَ ماتُبَلِّغُنا به جَنَّتَكَ، ومِنَ الْيَقِين مـاتُهوِّنُ بـه عَلَيْنا مَصائِبَ الدُّنيا. الّلهُمَّ مَتِّعْنا بأسْمَاعِنَا، وأبْصَارنا، وقُوّتِنا ما أحييْتَنَا، واجْعَلْهُ الـوَارِثَ منّا، واجعل ثأرَنا عَلى مَنْ ظَلَمَنَا، وانْصُرْنا عَلى مَنْ عادَانَا، وَلا تَجْعلْ مُصِـيبَتنا في دِينِنـا، ولا تجْعلِ الدُّنيا أكبرَ همِّنا ولا مبلغ عِلْمِنا، وَلا تُسَلِّط عَلَينا مَنْ لا يرْحَمُنَا) رواه الترمذي وقال حديث حسن:

**عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودای گەورە لەخۆیو بابی) فـەرمووی: کـەم وادەبـوو کـە پێغەمبـەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لـەکۆڕێ هەڵسـێ، هـەتا ئـەم نزایـەی نەخوێندایەوە، دەیفـەرموو: (**الّلهمَّ اقْسِم لَنَـا مِـنْ خَشْـيَتِكَ مـا تَحُولُ بـه بَيْنَنـا وبَـينَ مَعْصِيتِك، ومن طَاعتِكَ ماتُبَلِّغُنا به جَنَّتَكَ، ومِنَ الْيَقِين ماتُهوِّنُ به عَلَيْنـا مَصَـائِبَ الـدُّنيا.

---

[٤٠٧] ئەبوداوود (٤٨٥٩)، حاکم (٥٣٧/١).

[٤٠٨] تیرمیذي (٣٤٩٧).

اللّهُمَّ مَتِّعْنا بأسْمَاعِنَا، وأبْصَارنَا، وقُوّتِنا ما أحييْتَنَا، واجْعَلْهُ الوَارِثَ منَّا، واجعَل ثأرَنَا عَلى مَنْ ظَلَمَنَا، وانْصُرْنا عَلى مَنْ عادَانَا، وَلا تَجْعلْ مُصِيبَتنا في دِينِنا، وَلا تَجعَلِ الدُّنْيا أكبَر همِّنا ولا مبلغ عِلْمِنَا، وَلا تُسَلِّط عَلَيْنَا مَنْ لا يَرْحَمُنَا) خودايه! ئەوەندە بەشمان لەترس و سامی خۆتمان بۆ دابنێ کە دوورمان بخاتەوە لەبێ گوێیی و نافەرمانی تۆ، وەلە طاعەت و فەرمانبەریی خۆشت ئەوەندە بەشمان بدە کەپێی بگەینە بەهەشتی تۆ، وە لەیەقین و دڵنیایی و متمانەیش ئەوەندەمان پێ بدە کە گوێ بەوەی و چورتم و قۆرتی جیهان نەدەین و لەکاتی قەومانی دەردو بەڵادا خۆگر بین و ورە بەرنەدەین، خودایە! گوێمان و چاومان و هێزو هەناومان هەتا سەر پێ رەوا ببینە، وەلەپاش مردنیشمان بیانکە بەمایەی سوودو قازانج بۆمان، وەهەر کەس زۆروستەممان لێ دەکات تۆڵەی ئێمەی لێ بسێنە، وەهەر کەسێ دوژمنایەتیمان تێ دەبەستێ سەرمان بخە بەسەریا، ئایین و دینمان گرفتاری وەی و موصیبەت مەکە، وە دونیا مەکە بەهومێدی هەرە گەورەمان و بەئەوپەڕی ئاواتمان! وە ئەو کەسانەیشمان بەسەردا زاڵ مەکە کەبەزەییان نایەتەوە پیامانداا. (ت:ح/ح).

١١/٨٣٥[٤٠٩]- وعن أبي هريرة رضي الله عنه قال : قال رسول (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)(مَا مِنْ قَوْمٍ يَقومونَ منْ مَجْلسٍ لا يَذكُرُون الله تعالى فيه إلا قَاموا عَنْ مِثلِ جيفَةِ حِمَارٍ وكانَ لَهُمْ حَسْرَةً) رواه أبو داود بإسناد صحيح.

ئەبو هورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکۆمەڵێ چ پیاو چ ژن، لەکۆڕێکا دابنیشن و هەتا بڵاوەی لێ دەکەن یادو ذیکری خودای گەورەی تیا نەکەن، کاتێ هەڵدەسن و کۆڕەکە چۆڵ دەکەن وەك لەسەر کەلاکی بۆگەنی کەری تۆپیو هەڵبسن ئاوایە، وەلە رۆژی قیامەتا دەبێ بەداخی سەر دڵ بۆیان! (د — س/ص).

١٢/٨٣٦[٤١٠]- وعنه عن النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال: (مَا جَلَسَ قَوْمٌ مَجْلِساً لم يَذْكرُوا اللهَ تَعَالَى فيه ولم يُصلُّوا على نَبِيِّهم فيه إلاَّ كانَ عَلَيهِمْ تِرةٌ، فإنْ شاءَ عَذَّبَهُم، وإنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُم) رواه الترمذي وقال حديث حسن.

---

[٤٠٩] ئەبوداوود (٤٨٥٥).

[٤١٠] تيرميذي (٣٣٧٧).

**دیسان فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: هەر کۆمەڵێ لەشوێنێکا دابنیشنو یادی خودای مەزنی تیادا نەکەنو صەڵاوات لەدیاری پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **نەدەن، ئەوە دەبێ بەداخو خەفەت بۆیانو دەکەوێتە دەست خودا، ئەگەر ئارەزوو بکا سزایان دەدا ئەگەر ئارەزووش بکا لێیان خۆش دەبێ (ت —ح/ح).**

## ١٣٠- باسی بابەتی خەوبینین[*] – باب الرؤيا وما يتعلق بها

قال اللّٰه تعالى: { ومن آياته منامكم بالليل والنهار– الروم/٢٣} .

**واتە: هەندێکی تر لەو نیشانە گەورانەی کە دەبن بە بەڵگەیەکی رۆشن لەسەر خودایەتیو یەکێتی خودا ئەم خەوتنەی ئێوەیە کە لەشەودا یان لەرۆژدا روو دەدا.**

١/٨٣٨[٤١١]– وعن أبي هريرة رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلِّم)يقول: (لَم يَبْقَ مِنَ النُبوَّة إلا المُبَشِّراتُ) قالوا: وَمَا المُبشِّراتُ؟ قال: (الرُؤيَا الصَّالِحةُ) رواه البخاري.

**ئەبو هورەیرەوە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: ژنەوتم لە حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: لەپاش من سروشو وەحی کۆتای دێ، بەڵام مژدەدەرەکان هەر دەمێنن، ئەو هاوڕێیانەش کەلەوێ بوون عەرزیان کرد: قوربان! مژدەدەرەکان چین؟ فەرمووی: خەونی باشە (ب).**

٢/٨٣٩[٤١٢]– وعنه أن النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلِّم)قال: (إذَا اقتَربَ الزَّمَانُ لَمْ تَكَدْ رُؤيَا المُؤمن تَكذبُ، وَرُؤيَا المُؤمِنِ جُزْءٌ منْ ستَّةٍ وَأرْبَعينَ جُزءًا مِنَ النُبوةِ) متفق عليه. وفي رواية: (أَصْدَقُكم رُؤيَا: أصْدُقكُم حَديثاً).

**دیسان لەوەوە لە حەزرەتەوە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: کاتێ شەوو رۆژ بەرابەربوون (وەك کاتی ناوەڕاستی وەرزی پایزو کاتی ناوەڕاستی وەرزی بەهار) لەوکاتەدا دوور نییە کەخەونی موسوڵمان هەڵەی نەبێو راست دەرچێ، خەونی موسوڵمانیش یەك بەشە لە چل‌وشەش بەشی پێغەمبەرایەتی. (ش).**

---

[*] بۆ زیادە بەهرەو حاڵی بوونی تەواو لەبابەتی خەو بڕوانە (تاج بەکوردی ب/١ز – ال – ٣هەتا ز – ٧ل ٢٣) سلێمانی ٢٠٠٠/٥/١٧ (وەرگێڕ).

[٤١١] بوخاری (٦٩٩٠).

[٤١٢] بوخاری (٧٠١٧)، موسلیم (٢٢٦٣).

لەگێڕانەوەیەکدا: ئەو کەسەیشتان خەونی زۆر ڕاستو دروستە کە خۆی زۆر ڕاستگۆیە.

٨٤٠/٣[٤١٣]– وعنه قال: قال رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (مَنْ رآني في المَنامِ فَسَيَرَاني في اليَقَظَةِ أوْ كأنَّمَا رآني في اليَقَظَةِ لايَتمثَّلُ الشَّيْطانُ بي). متفق عليه.

دیسان فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ بەخەو من ببینێ ئەوە بەهۆشیاریش لەبەهەشتا بەچاوی سەر من دەبینێ یان حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوە وەك ئەوە وایە کەبەچاوی سەر من ببینێ چونکە شەیتان قەت خۆی بۆ ناکرێ بەمنو ناتوانێ خۆی بگۆڕێو بچێتە شێوەو شکڵی منەوە (ش).

٨٤١/٤[٤١٤]– وعن أبي سعيد الخدريِّ رضي الله عنه أنه سمع النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يقول : (إذا رَأى أَحدُكم رُؤيَا يُحبُّهَا فإنَّما هي من الله تعالى فليَحْمَدِ الله عَلَيها وَلْيُحُدِّثْ بِها وفي رواية : فَلا يُحدِّثْ بها إلا مَنْ يُحِبُّ وَإذا رأى غَيرَ ذلك مما يكرَهُ فإنَّما هي منَ الشَّيْطانِ فَليَسْتَعِذْ منْ شَرِّهَا وَلا يَذكُرها لأحد فإنها لا تضُرُّه) متفق عليه.

ئەبو سەعید (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە حەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەر بێ): ئەگەر کەسێکتان خەونێکی دیو خەونەکەی پێ خۆش بوو، ئەوە لەخوداوەیە، با حەمدو سوپاسی خودای لەسەر بکاتو بیگێڕێتەوە بۆ زاناو دۆست. لەگێڕانەوەیەکدا: با نەی گێڕێتەوەبۆ کەس، مەگەر بۆ دۆستو خۆشەویستی خۆی، بەڵام ئەگەر خەونێکی وای دی کەبە دڵی نەبوو، ئەوە لەشەیتانەوەیە، با پەنا بگرێ بەخودا لەشەڕی ئەو خەونەو ئیتر باسی نەکا بۆ کەس، ئیتر زیانی پێ ناگەیەنێ! (ش).

٨٤٢/٥[٤١٥]– وعن أبي قتادة رضي الله عنه قال : قال النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (الرّؤيا الصَّالَحِةُ وفي رواية الرُّؤيَا الحَسَنَةُ منَ الله، والحُلُم مِنَ الشَّيْطَان، فَمَن رأى شَيْئاً يَكرَهُهُ فَلْيَنْفُثْ عَن شِمَاله ثَلاثاً، ولْيَتَعَوَّذْ مِنَ الشَّيْطان فَإنَّها لا تَضُرُّهُ) متفق عليه.

ئەبو قەتادە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خەونی باش لەگێڕانەوەیەکدا: خەونی چاك لەخوداوەیە، خەونی خراپیش لەشەیتانەوەیە،

---

[٤١٣] بوخاری (٦٩٩٣)، موسلیم (٢٢٦٦).

[٤١٤] بوخاری (٦٩٨٥)، موسلیم (٢٢٦٢).

[٤١٥] بوخاری (٦٩٨٤)و موسلیم (٢٢٦١).

دەی ئەگەر کەسێ خەونێکی ناخۆشی دی، با لای چەپیەوە سێ تف رۆ بکاتو پەنا بگرێ بە خودا لەشەڕی شەیتانو لەشەڕی ئەو خەونەو ئیتر بۆکەسی نەگێڕێتەوە، ئیتر زیانی نابێ بۆی. (ش).

٨٤٣/٦[٤١٧]- وعن جابر رضي الله عنه عن رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال: (إذا رَأى أحَدُكُم الرُّؤيا يَكْرَهُها فلْيبصُقْ عَن يَسَارِهِ ثَلاثَـاً، ولْيَسْتَعِذْ بـالله مِـنَ الشَّيطانِ ثلاثا، وليَتحوَّل عَنْ جَنْبِهِ الذي كان عليه) رواه مسلم.

لەجابیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ: (دروودی خوای لەسەر بێ) کاتێ کەسێ لەئێوە خەونێکی ناخۆشی دی بەدڵی نەبوو با لەلای چەپیەوە سێ تف رۆ بکاو پەنا بگرێ بەخودا لەوەزەنو زیانی شەیتان، وەك ئەوە سێ جار بڵێ: (أعوذ بالله من الشيطان) پەنا دەگرم بەخودا لە زیانی شەیتان ئەوجا با ئەم دیواودیە بکاو وەرچەرخێ لەسەر ئەو تەنیشتەی کەوا لەسەریەتی (م).

٨٤٤/٧[٤١٧]- وعن أبي الأسقع واثلة بن الأسقع رضي الله عنه قال : قال رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (إنَّ من أعظَم الفَرى أن يَدَّعِي الرَّجُلُ إلى غَيْرِ أبِيـه، أوْ يُـري عَيْنهُ مَالم تَرَ، أوْ يقولَ على رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)مَا لَمْ يَقُلْ) رواه البخاري.

ئەبو ئەسقەع وائیلەی کوڕی ئەسقەع (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەلاتێکی گەورەو بوختانێکی فرە زلە: کە کەسێ خۆی بکا بەکوڕی غەیری باوکی خۆی، یان بڵێ: لەخەوما ئەوەو ئەوەم دیوەو نەیشی دیبێ، یان درۆ بەدەم پیغەمبەرەوە هەڵبەستێ! (م).

## ١٣١- نامەی سڵاوو رۆژباشی
## باسی گەورەیی سڵاوو فەرمانکردن بە بڵاوکردنەوەی
## كتاب السلام - باب فضل السلام والأمر بإفشائه

قال اللّه تعالى: {يا أيها الذين آمنوا لا تدخلوا بيوتاً غير بيوتكم حتى تستأنسوا وتسلموا على أهلها –النور/٢٧}.

[٤١٧] بوخاری (٣٥٠٩).

[٤١٧] بوخاری (٣٥٠٩).

واته: ئەی کەسانێ باوەڕتان هەیە بە ئیسلام! کاتێ دەڕۆن بۆ ماڵێ – ئەگەر ماڵی خۆتان نەبوو – یەکسەر خۆتان مەکەن بەژووردا، بەڵکوو لەپێشا داوای ڕێپێدان بکەن‌و سلاو لەدانیشتوانی ئەو ماڵە بکەن.

وقال تعالى: { فإذا دخلتم بيوتاً فسلموا على أنفسكم تحية من عند اللّه مباركة طيبة – النور/٦١}.

واته: کاتێ دەچن بۆ ماڵی لەماڵی ئەو کەسانە کە لەم ئایەتەدا باس کران بۆتان، سلاوو ڕۆژباشی لەدانیشتووەکانی بکەن، کە خزم‌و کەس‌وکاری خۆتانن‌و برای ئایینی خۆتانن، ئەو سلاوو ڕۆژباشییە بەفەرمانی خودا لەسەرتان دانراوەو دەبێ بەمایەی خێرو خۆشی‌و پیرۆزی بۆتان، هەروەك دەبێ بەهۆی ڕووخۆشی‌و دڵ پێ کرانەوەی سلاو لێ کراوەکان.

وقال تعالى: { وإذا حييتم بتحية فحيوا بأحسن منها أو ردوها – النساء/٨٦}.

واته: کاتێ کەسێ ڕۆژباشیتان لێ دەکا بەجوانتر لەسلاوەکەی خۆی ڕۆژباشی لێ بکەن، یان وەك خۆی وەلامی بدەنەوە.

وقال تعالى: {هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ الْمُكْرَمِينَ، إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلَامًا قَالَ سَلَامٌ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ – الذاريات/٢٤ – ٢٥}. لەم شوێنەدا رابورد، بڕوانە: سەرەتای زنجیرە نەوەدو چوار.

١/٨٤٥[٤١٨]– بڕوانە: (٧/٥٥٠ز – ٦٠).

٢/٨٤٦[٤١٩]– وعن أبي هريرة رضي الله عنه عن النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال (لما خَلَقَ الله آدم (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال: اذْهَبْ فَسَلِّمْ عَلَى أُولئِكَ نَفر مِنَ المَلائكة جُلُوسٌ فاستمعْ ايُحَيُّونَكَ فَإنَّها تَحيَّتُكَ وَتَحِيَّةُ ذُرِّيَّتِك. فقال: السَّلام عَلَيْكُمْ، فقالوا: السَّلامُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ الله، فَزادُوهُ: وَرَحْمَةُ الله) متفق عليه.

ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ کەخودا ئادەمی دروست کرد پێی فەرموو: بچۆ بۆلای ئەو کۆمەڵە فریشتەیە کە ئەوەتان ئا ئەلەوێ، دانیشتوون سلاویان لێ بکە، گوێ بگری چۆن ڕۆژباشیت لێ

---

[٤١٨] بڕوانە: (٧/٥٥٠ز -٦٠).

[٤١٩] بوخاری (٣٣٢٦)، موسلیم (٢٨٤١).

دەکەن، چونکە ئەوە رۆژباشی خۆت‌و رۆژباشی نەتەوەکەت دەبێ، ئادەم (دروودو صەلات‌و سەلامی خودای گەورەی لەسەر بێ) چوو پێی فەرموون گوتیان: (السلام عليكم: سڵاوتان لێ بێ)، فریشتەکانیش فەرموویان: (السلام عليك ورحمه الله: سڵاوو رەحمەتی خوداتی لێ بێ)، فریشتەکان وشەی رەحمەتی خودایان لە وەڵامەکەیاندا بۆ ئادەم پتر کرد! (ش).

٨٤٧/٣[٤٢٠]- فەرموودەی بەرائی کوڕی عازیب (أمرنا رسولُ الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)بِسَبعٍ...تاد) لەباسی (تعظيم حرمات المسلمين)دا رابورد، بڕوانە: (١٨/٢٣٩ز - ٢٧).

٨٤٨/٤[٤٢١]- وعن أبي هريرة رضي الله عنه قال : قال رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) (لا تَدْخُلُوا الجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا وَلا تُؤمِنوا حتى تَحَابُّوا، أَوَلا أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيءٍ إذا فَعَلْتُمُوهُ تَحابَبْتُم ؟ أفْشُوا السَّلام بَيْنَكُم) رواه مسلم.

ئەبو هورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ناچێتە بەهەشت هەتا باوەڕ بەخودا نەکەن، باوەڕی تەواویش ناهێنن هەتا یەکتریان خۆش نەوێ، دەی با پێتان نیشان بدەم کەچی دەبێ بەهۆی ئەوەی کە یەکتریتان خۆش بوێ‌و ئەگەر بیکەن دەبێ بەهەوێنی خۆشەویستی لەنێوانتاندا، ئەو شتە ئەوەیە کە سڵاو لەناو خۆتاندا بڵاوبکەنەوە! (م) بڕوانە: (٤/٣٧٨ز - ٤٦).

٨٤٩/٥[٤٢٢]- وعن أبي يوسف عبد الله بن سلام رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يقول (يَا أَيُّهَا النّاسُ أفْشُوا السَّلام، وَأَطعِمُوا الطْعَامَ، وَصِلُوا الأَرحامَ، وَصَلُّوا والنَّاس نيامٌ، تَدْخُلوا الجُنَّة بسلام) رواه الترمذي وقال: حديث حسن صحيح.

عەبدوڵڵای کوڕی سەلام (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە حەزرەتم بیست دەیفەرموو: (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەی مەردووم! لەنێوانی خۆتاندا سڵاو بڵاوبکەنەوەو نان بدەن‌و

[٤٢٠] بوخاری (١٢٣٩)، موسلیم (٢٠٦٦).

[٤٢١] موسلیم (٥٤).

[٤٢٢] تیرمیذي (٢٨٤٧).

خزمو کەسوکاری خۆتان بەسەر بکەنەوەو خزم دۆست بن کاتێ کە مەرووم لەگەرمەی خەودان ئێوە چاکی مەردایەتی لێ بکەن بەلاداو هەلسن بۆ شەونوێژ، دەی ئەگەر ئەم کارە جوانانە بکەن ئەوە بەخێرو خۆشی دەچنە بەهەشتێ! (ت:ح/ص).

٨٥٠/٦(٤٢٣)– وعن الطفيل بن أبي بن كعب أنه كان يأتي عبد الله بن عمر فيغدو مَعَهُ إلى صاحب بيعَة وَلا مسْكين وَلا أحد إلا سَلّم عَليه، قال الطُّفيلُ: فَجِئْتُ عبد الله بن عُمرَ يَوْماً فاستَتبعني إلى السُّوق فقُلْت لَهُ: ماتَصْنعُ بالسوق وأنْتَ لا تَقِفُ عَلى البَيْع وَلا تَسْأَلُ عَن السلع وَلا تَسُومُ بها وَلا تَجلسُ في مجالس السّوق؟ وأقولُ اجْلسْ بنا هُهنا نَتَحدَّث، فقال يا أبا بُطْن. وَكانَ الطُّفَيلُ ذَا بَطْن إنَّما نَغْدو منْ أجْل السَّلام نُسَلِّمُ عَلى مَنْ لَقِيناهُ، رواه مالك في المُوطَّإ بإسناد صحيح.

طوفەیلی کوڕی ئوبەیی کوڕی کەعب فەرمووی: گەلێ جار دەچووم بۆ خزمەتی عەبدوللای کوڕی عومەر (رەزای خودای لێ بێ) لەخزمەتیدا دەچووم بۆ بازاڕ، فەرمووی: کە دەگەیشتینە بازاڕ ئیتر بە وردەوالەفرۆش بگەیشتینایەو بەهەژار بگەیشتینایەو بەهەر کەس بگەیشتینایە عەبدوللا سلاوی لێ دەکرد. طوفەیل فەرمووی: ڕۆژێ چووم بۆ خزمەتی داوام لێ کرد کە لە خزمەتیدا بچم بۆ بازاڕ،منیش عەرزیم کرد: چی دەکەی لەبازاڕ؟ خۆ تۆ نەشتێ دەکڕیتو نەلە کالایێ دەپرسیتو نە سەودای شتێ لەبازاڕ دەکەیتو نە لەناوکۆڕی دانیشتنی ناو بازاڕدا دادەنیشیت؟ کەواتە من دەلێم با لێرەدا دابنیشینو بۆ خۆمان قسەو کفتوگۆ بکەین. فەرمووی: ئەی ورگن! (طوفەیل خۆی ورگن بوو) لەبەر سلاو کردن دەچین، هەرکێمان تووش بوو سلاوی لێ دەکەینو سلاو پەخش دەکەینەوە! (مالیك – س/ص).

## ١٣٢- باسی چۆنیتی سلاو - باب كيفية السلام

شێخی نەوەوی کە دانەری ئەم (ریاض)ە پیرۆزەیە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەو کەسەی کە لە پێشەوە سلاو دەکا سوننەتە بلێ: (السلام عليكم ورحمة الله وبركاته، سلاوو سۆزو فەڕی خوداتان لەسەر بێ) ئاوا بەم شێوەیە راناوی کۆمەل بەکاربێنێ،

(٤٢٣) الموطأ: ٢/٩٦٢،٩٦١.

**با سلاو لێ کراوەکەیش یەك کەس بێ، ئەو کەسەیش سلاو دەسێنێتەوە بڵێ (وعليكم السلام ورحمة الله وبركاته) دوعام لەسەر دوعات بێو سلاوو سۆزو فەڕی خودا لەسەر ئێوەیش بێ! ئاوا واوی عەطف لەگەڵ (عليكم)دا بڵێ:**

١/٨٥١[٤٢٤]- عن عِمران بن حصين رضي الله عنهما قال: جاءَ رجُل إلى النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فقال: السَّلامُ عَلَيكُم، فَرَدّ عَلَيْهِ ثم جَلَسَ، فقال النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (عَشْرٌ) ثم جَاءَ آخَرُ فَقَالَ: السَّلامُ عَلَيكُم وَرَحْمَةُ الله، فَرَدّ عليهِ فَجَلَسَ، فقال: (عِشْرون) ثم جَاءَ آخَرُ فَقَالَ: السَّلامُ عَلَيكُم وَرَحْمَةُ الله وَبَرَكَاتُهُ، فَرَدّ عليهِ فَجَلَسَ، فقال: (ثَلاثُونَ). رواه أبو داود والترمذي وقال: حديث حسن.

**عیمرانی کوڕی حوصەین** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **سلاوی کرد گوتی: (السلام علیکم: سلاوتان لێ بێ) پیغەمبەریش** (دروودی خوای لەسەر بێ) **وەلامی دایەوە، پیاوەکە دانیشت، حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەمە دە چاکەی بۆ هەیە چونکە دوعای خێری چاکەیەو چاکەیش یەك بە دەیە، دوای ئەو پیاوێ تر هات سلاوی کردو گوتی: (السلام عليكم ورحمة الله: دروودورەحمەتی خوداتان لەسەر بێ) حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **وەلامی دایەوەو پیاوەکەیش دانیشتو حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەمەیش بیست چاکەیە (چونکە دوو نزایە، نزای داوای دروودو نزای داوای رەحمەت)، ئەوجا پیاوێکی تریش هات سلاوی کرد گوتی: (السلام علیکم ورحمە الله وبرکات: سلاوو رەحمەتو پیتو فەڕەکانی خوداتان لێ بێ) حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **وەلامی دایەوە، پیاوەکەیش دانیشت، حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەمەیش سیی چاکەیە (د/ت:ح/ح).**

٢/٨٥٢[٤٢٥]- وعن عائشة رضي الله عنها قالتْ: قال لي رسولُ الله صلى الله عليه وسلم: (( هذا جبريلُ يَقرأُ عَلَيْكِ السَّلَامَ)) قالَتْ: قُلتُ: (وَعَلَيْهِ السَّلامُ ورحْمَةُ الله وَبَرَكَاتُهُ)) متفقٌ عليه.

---

[٤٢٤] ئەبوداوود (٥١٩٥)، تیرمیذي (٢٦٩٠).

[٤٢٥] بوخاری (٣٧٦٨)، موسلیم (٢٤٤٧).

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: ئایشێ! ئەمە جوبرەئیله سڵاوت لێ دەكا، منیش گوتم: (وَعَلَيْهِ السَّلامُ ورحْمَةُ الله وَبَرَكَاتُهُ: سڵاو رەحمەتو پیتو بەرەكەتەكانی خودا لەسەر ئەویش بێ) (ش).

٨٥٣/٣[٤٢٦]- بروانة: (١/٦٩٦ز -٨٩).

٨٥٤/٤[٤٢٧]- وعن الْمقْدَاد رضي الله عنه في حَدِيثه الطويل قال: كُنَّا نَرْفَعُ للنبي (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) نَصِيبهُ مِنَ الّلبَن فَيَجِيءُ مِنَ اللَّيلِ فَيُسَلِّمُ تسليماً لايوقظُ نَائِماً وَيُسمِعُ اليَقَظان فَجَاء النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)فَسَلَّمَ كما كان يُسَلمُ، رواه مسلم.

میقداد (رەزای خودای لێ بێ) فەرموودەیەكی درێژی هەیە، ئەمە بەشێكیەتی كە دەفەرموێ: گەلێ جار كە شیرمان دەدۆشی، بەشی حەزرەتمان بۆی هەڵدەگرت، كە شەو دەهاتەوە سڵاوێكی بەئەسپایی دەكرد، خەوتووی خەبەر نەدەكردەوە، بەڵام ئەوەی بەخەبەر بوو گوێی لێ بوو، جا شەوێ لەسەر یاسای جارانی تەشریفی هاتەوە، لەسەر شێوەی جارانی سڵاوی كردەوە (م).

٨٥٥/٥[٤٢٨]- عن أسماء بنتِ يزيد رضي الله عنها أن رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)مَرَّ في المَسْجِد يوْماً وَعصْبَةٌ مِنَ النِّساء قُعودٌ فألوْي بِيده بالتسليم.

رواه الترمذي وقال: حديث حسن. وهذا محمول على أنه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)جَمَعَ بَين اللّفظ والإشارة، ويُؤيِّدُهُ أن في رِواية أبي داود: (فَسَلَّم عَلَيْنا).

ئەسماء (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: رۆژێكیان كۆمەڵێ ئافرەت بووین، لە مزگەوت دانیشتبووین، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) هات بۆ مزگەوت لەلامانەوە رەت بوو، بەدەست سڵاوی لێ كردین (ت:ح/ح).

٨٥٦/٦[٤٢٩]- وعن أبي جُرَيٍّ الهجُيْمِيِّ رضي الله عنه قال: أتيت رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)فقلْت: عَلْيك السَّلامُ يا رَسول الله. فقال: لاتَقُلْ عَلَيْكَ السَّلامُ، فإن

---

[٤٢٦] بوخاری (٩٤).

[٤٢٧] موسلیم (٢٠٥٥).

[٤٢٨] تیرمیذي (٢٦٩٨)، ئەبوداوود (٥٠٢٤).

[٤٢٩] تیرمیذي (٢٧٢٢)، ئەبوداوود (٤٠٨٤).

عَلَيْكَ السّلامُ تَحيَّةُ الموتى) رواه أبو داود، والترمذي وقال: حديث حسن صحيح. وقد سبق بِطولِه. بڕوانه: (٧٩٦/٧ز - ١١٩).

## ١٣٣- دەستووری سلاّوکردن - باب آداب السلام

١/٨٥٧[٤٣٠]- وعن أبي هريرة رضي الله عنه أن رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال : (يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي، وَالْماشي عَلَي القَاعِدِ، والقليلُ على الكَثِيرِ) متفق عليه. وفي رواية البخاري : والصغيرُ على الْكَبِيرِ).

**ئەبو هورەیرەوە** (رەزای خودای لێ بێ) **لە حەزرەتەوە** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: با سوار سلاّو لەپیادە بکا، پیادە سلاّو لەدانیشتوو بکاو، کەم سلاّو لە زۆر بکا (ش) لەگێڕانەوەیەکی بوخاریدا: وە بچووك سلاّو لە گەورە بکا.**

٢/٨٥٨[٤٣١]- وعن أبي أُمامة صُديِّ بن عجلان الباهِلِي رضي الله عنه قال: قال رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (إنَّ أوْلَى النّاس بالله مَنْ بَدأهم بالسَّلاَم)).رواه أبو داود بإسنادٍ جيدٍ، ورواه الترمذي:

**ئەبو ئومامە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: شایانترین کەس بەچاودێریی خودای گەورە ئەو کەسەیە کە لەپێشدا سلاّو لەخەڵك دەکا (د — س/جید ـت).**

ورواه الترمذي عن أبي أُمامةَ رضي الله عنهُ قِيلَ يارسولَ الله، الرَّجُلانِ يَلْتَقيان أيُّهُمَا يَبْدأُ بالسَّلامِ، قال أوْلاهُمَا بالله تعالى، قال الترمذي: حديث حسن.

**ئەبو ئومامە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: عەرزی حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **کرا: ئەی پێغەمبەری خودا! دوو پیاو کاتێ بەیەکتر دەگەن کامیان لەپێشدا سلاّو لەکامیان بکا؟ فەرمووی: کامیان لەتاعەتو فەرمانداریی خوداوە نزیکترن ئەوەیان سلاّو لەویتریان بکا (ت:ح/ح).**

---

[٤٣٠] بوخاری (٦٢٣١)و موسلیم (٢١٦٠).

[٤٣١] ئەبوداوود (٥١٩٧)، تیرمیذي (٢٦٩٥).

**١٣٤- دووبارەکردنەوەی سلاو سوننەتە، لەو کەسەی زوو زوو پێی بگاتەوە، وەك ئەوە بچێتە دەرەوەو گورج بچێتەوە ژوورەوە یان بەدەوری دیوارێکا خول بخواتەوە:**

**باب استحباب إعادة السلام**

**على من تكرَّر لقاؤه على قرب بأن دخل ثم خرج ثمِّ دخل في الحال، أو حال بينهما شجرة ونحوها**

٨٥٩/١[٤٣٢]- عن أبي هريرة (رضي اللّه عنه)في حديث المسِيءِ صَلاتُه أنَّـهُ جـاء فَصَلّى ثُمَّ جاء إلى النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) فَسَـلَّمَ عَلَيْـهِ فـرَدّ عَلَيْـهِ السَّـلام فقـال: (ارجع فَصَلِّ فَإنَّكَ لم تُصَلِّ) فَرَجَعَ فَصَلّى، ثُمَّ جاء فَسَـلَّمَ عَلَـى النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم)حَتّى فَعَل ذلكَ ثَلاثَ مَرَّاتٍ. متفق عليه.

**ئەبو هورەیرەوە** (رەزای خودای لێ بێ) **لەو فەرموودەیەدا کەباسی پیاوە نوێژنارِەوانەکان دەکا — دەفەرموێ: پیاوێ هاتە ژوورەوەو نوێژی کردو چوو بۆ لای پیغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ)**و سلاوی لێی کرد، ئەویش سلاوەکەی سەندەوەو فەرمووی: بچۆرەوە نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە ئەوە نوێژ نەبوو کە تۆ کردت، تا سێ جار پیاوەکە نوێژەکەی دەکردەوەو دەهاتەوە بۆ لای حەزرەتو حەزرەت وەلامی سلاوەکەی دەسەندەوەو دیسان هەروای پێ دەفەرمووەوە (ش).**

٨٦٠/٢[٤٣٣]- وعنه عن رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال: (إذا لقيَ أحـدُكُمْ أخاه فَلْيُسَلِّمْ عَلَيْهِ، فَإنْ حالَتْ بَيْنَهُمَا شَجَرَةٌ أو جِدَارٌ أوْ حَجَرٌ ثُمَّ لَقِيَهُ فَلْيُسَلِّمْ عَلَيْه) رواه أبو داود.

**دیسان فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: کاتێ کەسێکتان بە برادەرێکی خۆی گەیشت با سلاوی لێ بکا، تەنانەت ئەگەر چەرخەیەکی کرد بەگردی درەختێکا یان دیوارێکا، یان تاوێرێکا وە دیسان بەیەکتر گەیشتنەوە با سلاوی لێ بکاتەوە (د).**

**١٣٥- سوننەتە کە چووەوە بۆ ماڵەوەی سلاو بکا**

**باب استحباب السلام إذا دخل بيته**

قال اللّه تعالى: { فإذا دخلتم بيوتاً فسلموا على أنفسكم تحية من عنـد اللّـه مباركـة طيبة — النور/٦١}.

[٤٣٢] بوخاری (٧٥٧)و موسلیم (٣٩٧).

[٤٣٣] ئەبوداوود (٥٢٠٠).

١/٨٦١[٤٣٤]- وعن أنس رضي الله عنه قال: قال لي رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)(يابُنَيّ، إذا دَخَلْتَ عَلى أهْلِكَ فَسَلِّمْ يَكُنْ بَركةً عَلَيْكَ وَعَلَى أهلِ بَيْتِكَ) رواه الترمذي وقال : حديث حسن صحيح.

**ئەنەس** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **پێی فەرمووم: رۆڵەکەم!** کاتێ دەچیتەوە بۆ ماڵی خۆتان سڵاو لەکەس‌وکاری خۆت بکە، ئەو سڵاوە دەبێ بەمایەی پیت‌و فەڕ، هەم بۆ خۆت‌و هەم بۆ کەس‌وکارەکەت (ت:حەزرەت/ح/ح/ص).

## ١٣٦- سڵاوکردن لە منداڵان - باب السلام على الصبيان

١/٨٦٢[٤٣٥] فەرموودەی (مَرَّ عَلى صِبْيان فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ...) بڕوانە: (٣/٦٠٤ز/٧١).

## ١٣٧- سڵاوکردنی پیاو لەژنی خۆی‌و لەئافرەتی خۆیی لەتاقە ژنێکی بیانی‌و لەچەند ژنێکی بیانی، بەمەرجێ مەترسی ئاژاوەی نەبێ، ئافرەتیش (بەهەمان مەرج) سوننەتە سڵاو لەپیاوی بیانی بکا
## باب سلام الرجل على زوجته والمرأة من محارمه وعلى أجنبية وأجنبيات لا يخاف الفتنة بهن وسلامهن بهذا الشرط

١/٨٦٣[٤٣٦]- عن سهل بن سعد رضي الله عنه قال: كانَتْ فينا امْرَأةٌ وفي رواية: - كانَتْ لَنا عَجُوزٌ تأْخُذُ منْ أصُول السِّلْقَ فتطْرَحُهُ في القِدْرِ وَتُكَرْكِرُ حَبّاتٍ منْ شَعِيرٍ، فإذا صَلَّيْنا الجُمُعَةَ وانْصَرَفْنَا نُسَلِّمُ عَلَيْها فَتُقدِّمُهُ إلَيْنَا رواه البخاري.

**سەهلی کوڕی سەعد** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: ئافرەتێکمان تیادا بوو،** لەگێڕانەوەیەکدا: پیرەژنێکمان هەبوو لاسکی سڵقی دەهێنا دەیکردە مەنجەڵێکەوەو کەمێ جۆی دەهاڕی‌و دەیکردە بەری، کەنوێژی هەینیمان لە پشت پێغەمبەر دەکرد، لە خزمەتیدا دەچووین بۆ لای ئەو داپیرەیە، سڵاومان لێ دەکرد، ئەویش ئەو سڵقاوەی بۆمان دادەنا، ئێمەیش دەمانخوارد (ب/تاج).

---

[٤٣٤] تیرمیزی (٢٦٩٩).

[٤٣٥]

[٤٣٦] بوخاری (٦٢٤٨).

٨٦٤/٢[٤٣٧]- وعن أُم هانئ فاختَةَ بِنتِ أبي طَالب رضي الله عَنْهَا قَالت : أتيت النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يَوْمَ الفَتْح وَهُو يَغْتسِلُ وَفاطِمةُ تَسْتُرهُ بِثَوْبٍ فَسَلَّمْتُ. وذَكَرَت الحديث. رواه مسلم:

**ئوممو هانیء فاختیەی کچی ئەبو طالیب** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: رۆژی ئازاد کردنی شاری مەکە چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **خەریك بوو خۆی دەشۆرد فاطیمەی کچی بە پارچەیێ جل پەردەی بۆی کردبوو، تا کەس چاوی لێی نەبێ کەچووم سلاوم لێ کرد... ئەوجا ئوممو هانی فەرموودەکەی بەتەواوی گێڕایەوە (م).**

٨٦٥/٣- بڕوانە: (٨٥٥/٥ز - ١٣٢).

## ١٣٨- سلاوکردنی خۆمان لەسەرەتاوە لەبێ بڕوا نادروستە، چۆنێتیی سەندنەوەی سلاوی بێ بڕوا، بەلام ئەگەر کۆڕی تێکەڵ بوو لە موسوڵمانو بێ بڕوا سوننەتە سلاویان لێ بکەین

## باب تحريم ابتدائنا الكفار بالسلام وكيفية الرد عليهم واستحباب السلام على أهل مجلس فيهم مسلمون وكفار

٨٦٦/١[٤٣٨]- وعن أبي هريرة رضي الله عنه أن رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال: (لاتَبْدَأوا اليَهُودَ ولا النَّصَارى بالسَّلام، فإذا لَقِيتُم أحَدَهُم في طَرِيق فَاضطَرُّوهُ إلى أضْيَقِهِ) رواه مسلم:

**لە ئەبو هورەیرەوە حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: ئێوە لەپێشدا سلاو لە جوولەکەو گاور مەکەن، ئەگەر لەرێگەی تەنگەبەریش تووشیان بوون خۆتان لەسەر چەقی رێگەکەوە بڕۆنو ئەوان ناچار بکەن کە بکەونە تەنگەبەرییەکەوە! (م).**

٨٦٧/٢[٤٣٩]- وعن أنسٍ رضي الله عنه قال : قال رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (إذا سَلَّمَ عَلَيكُم أهلُ الكتاب فَقُولُوا: وعَلَيْكُمْ) متفق عليه.

---

[٤٣٧] موسليم (٣٣٦).

[٤٣٨] موسليم (٢١٦٧).

[٤٣٩] بوخاری (٦٢٥٨)و موسليم (٢١٦٣).

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ خاوەن نامەکان سلاّویان لێتان کرد، لەوەلاّمیاندا ئاوا بلێن: (وەعلیکم) لەوەی خۆتان گوتتان لەسەر خۆشتان بێ (ش). لە غایەتولمەئموولی شەرحی تاجولئوصوولدا دەفەرموێ: ئەگەر گوێمان لێ بوو دەیانگوت بەئێمە: (السلام علیکم) ئەوە پێویستە لەسەرمان کە وەلاّمیان بسێنینەوە، چونکە بەپێی شەرعی خۆمان: چی مافێ بۆ ئێمە هەیە بۆ ئەوانیش هەیە، وەچی ئەرکێ لەسەر ئێمە هەیە لەسەر ئەوانیش هەیە (وەرگێڕ).

٨٦٨/٣[٤٤٠]- وعن أُسامه رضي الله عنه أن النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)مَرَّ عَلَى مَجْلس فيه أخلاطٌ من المُسلِمِينَ والمُشرِكِين عَبَدةِ الأوثانِ واليَهُودِ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم). متفق عليه.

ئوسامە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) بەلای کۆڕێکی دانیشتندا ڕۆیشت، کۆمەڵێ بوون تێکەڵ بوون لە موسوڵمانانو بتپەرستانو جوولەکە، پێغەمبەر سلاّوی لێ کردن (ش).

## ١٣٩- کاتی هەڵسان لەکۆڕ سلاّوکردن سوننەتە، هەروەها کاتی جیابوونەوە لە هاونشین
## باب استحباب السلام إذا قام من المجلس وفارق جلساءه أو جليسه

١/٨٦٩[٤٤١]- وعن أبي هريرة رضي الله عنه قال : قال رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): إذا انْتَهى أحَدُكُم إلى المَجْلسِ فَلْيُسَلِّمْ، فإذَا أرَادَ أنْ يَقُومَ فَلْيُسَلِّمْ، فَليسْت الأُولى بأحَقِّ من الآخِرَة) رواه أبو داود، والترمذي وقال: حديث حسن.

ئەبو هورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ دەچنە ناو کۆڕێکەوە سلاّو بکەن، کاتێکیش ویستتان لەمەجلیس هەڵبسن دیسان سلاّو بکەنەوە، چونکە سلاّوی دوایی لە سلاّوی پێشەوە هیچی کەمتر نییەو هەردوولایان دووعای خێرن (د/ت:ح/ح).

[٤٤٠] بوخاری (٦٢٥٤)، موسلیم (١٧٩٨).

[٤٤١] ئەبو داوود (٥٢٠٨)، تیرمیذي (٢٧٠٧).

**١٤٠- باسی دەستووری ڕێخواستن - باب الاستئذان وآدابه**

قال اللّٰه تعالى :{ يا أيها الذين آمنوا لا تدخلوا بيوتاً غير بيوتكم حتى تستأنسوا وتسلموا على أهلها – النور/٢٧}.

وقال تعالى: {وإذا بلغ الأطفال منكم الحلم فليستأذنوا كما استأذن الذين من قبلهم – النور/٥٩}.

**واته: کاتێ منالەکانتان گەورە بوونو گەیشتنە سەرو حەدی بالقی، ئیتر با لەکاتی هاتنە ناو مالدا ڕێخوازی بکەن، دەق وەك ڕێخوازی بالقەکانی پێش خۆیان.**

١/٨٧٠[٤٤٢]- وعن أبي موسى الأشعري رضي الله عنه قال: قال رسول الله صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (الاستِئْذانُ ثَلاثٌ، فَإِنْ أُذِنَ لَكَ وَ إلاَّ فَارْجِع، متفق عليه.

**ئەبو مووسای ئەشعەری** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پیغەمبەری خودا** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: ڕێخوازی سێ جارە، جا ئەگەر سێ جار داوای ئەوەتان کرد کە ڕێتان بدەنو ڕێگەیان دان ئەوە بڕۆنە مالەوە، دەنا بگەڕێنەوە (ش).**

٢/٨٧١[٤٤٣]- وعن سهلِ بنِ سعد رضي الله عنه قال : قال رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) (إنَّمَا جُعِلَ الاستئذَانُ منْ أَجْلِ البَصَر) متفق عليه.

**سەهلی کوڕی سعد** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: جارێ پیاوێ لەدرزی دەرگاکەی مالی پیغەمبەرەوە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **سەرەتاتکێی دەکرد، پیغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **شانەیەکی ئاسنی بەدەستەوە بوو، سەری خۆیی پێ دادەهێنا، فەرمووی: ئەگەر دەمزانی تۆ تەماشای ناوەوە دەکەی، ئەم شانەیەم دەکرد بەناو چاوتا، چونکە خودا لەبەرچاو، ڕێخوازی (ڕێپێدانی) داناوە (ش/تاج).**

٣/٨٧٢[٤٤٤]- وعن رِبْعِيِّ بن حِرَاشٍ قال حدَّثنا رَجُلٌ من بَنِي عَامرٍ أنَّهُ استأذَنَ على النَّبيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وهو في بيتٍ فقال: أألِج؟ فقال رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)لخادِمِهِ: (أُخرُج إلى هذا فَعَلِّمْهُ الإستئذَانَ فَقُل لَهُ قُل: السَّلامُ عَلَيكُم، أأدْخُلُ؟) فَسَمِعهُ الرَّجُلُ فقال : السَّلام عَلَيكم، أأدخُلُ؟ فَأذن له النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فَدَخَلَ. رواه أبو داود بإسناد صحيح.

---

[٤٤٢] **بوخاری (٦٢٤٥)و موسلیم (٢١٥٣).**

[٤٤٣] **بوخاری (٦٢٤١)و موسلیم (٢١٥٦).**

[٤٤٤] **ئەبوداوود (٥١٧٧).**

رەبیعی کوڕی حراش فەرمووی: پیاوێکی بەنی حاریثی بۆمانی گێڕایەوە گوتم: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەماڵەوە بوو، رێخوازیم لێ کرد کە بچم بۆ خزمەتی گوتم: ئەرێ بێمە ژوورەوە؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەخزمەتکارەکەی فەرمووو: بچۆ بەدەم ئەو کابرایەوە، فێری داوای روخسەتخواستنی بکە، پێی بڵێ: کە بڵێ: سلاوتان لێ ئەرێ بێمە ماڵەوە؟ گوتی: خۆم گوێم لێ بوو: گوتم: السلام علیکم، ئەرێ بێمە ماڵەوە؟ ئیتر حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) رێگەی پێدامو چوومە ژوورەوە. (د — س/ص).

٨٧٣/٤[٤٤٥]- عن كلدة بن الحنبل رضي الله عنه قال: أتيت النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فَدَخَلْتُ عَلَيْه ولم أُسَلِّم فقال النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (ارْجِعْ فَقُلْ السَّلامُ عَلَيكُم أَأَدْخلُ؟) رواه أبو داود، والترمذي وقال: حديث حسن.

کلیدەی کوڕی حەنبەل (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) راستەوخۆ چوومە ژوورەوەو سلاوم لێ نەکرد، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بگەڕێرە دواوە بڵێ: السلام علیکم، ئەرێ بێمە ماڵەوە؟ (د/ت:ح/ح).

## ١٤١- سوننەتە ئەو کەسەی کە رێخوازی دەکا، کە گوتیان: تۆ کێیت؟ یان ناوی خۆی، یان نازناو کەسناوی خۆی بڵێ: باش نییە لەوەلاما بڵێ: منم، یان ئێمەین، یان شتێ وا کەنەبێ بەهۆی ناسینی

## باب بيان أن السنة إذا قيل للمستأذن: من أنت؟ أن يقول : فلان فيسمي نفسه بما يعرف به من اسم أو كنية وكراهة قوله أنا ونحوها

٨٧٤/١[٤٤٦]- عن أنس رضي الله عنه في حديثه المشهور في الإسراء قال: قال رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، (ثُمَّ صَعِدَ بي جِبْرِيلُ إلى السّماء الدُّنيا فاستفتح) فقيل: مَنْ هذا؟ قال: جبْريلُ، قِيلَ: وَمَنْ مَعَك؟ قال: مُحمَّدٌ. ثمَّ صَعِدَ إلى السَّماء الثّانية فاستفتح، قيل: مَنْ هذا؟ قال: جبريلُ، قيل: وَمَنْ مَعَكَ؟ قال: مُحَمدٌ) والثالثة والرَّابعة وَسَائرهنَّ وَيُقالُ في باب كل سَماء: مَنْ هذا؟ فَيقُولُ: جبريل متفق عليه.

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) لە فەرموودە ناودارەکەیدا، کە لەبارەی ئیسراو شەوڕەویی پێغەمبەرەوەیە، فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوجا جوبرائیل

[٤٤٥] ئەبوداوود (٥١٧٦)، تیرمیذي (٢٧١١).

[٤٤٦] بوخاری (٣٨٨٧)و موسلیم (١٦٢).

سەری خستم بۆ ئاسمانی یەکەم، لەوێ جوبرائیل داوای کردنەوەی دەرگای کرد، گوترا: ئەوە کێیە؟ فەرمووی: جوبرائیلم، گوترا: کێت لەگەڵدایە؟ فەرمووی: موحەممەد، ئەوجا سەری خستم بۆ ئاسمانی دووەم‌و سێیەم‌و چوارەم‌و پێنجەم‌و شەشەم‌و حەوتەم، لەبەردەرگای هەموو ئاسمانەکاندا دەیانفەرموو: ئەوە کێیە؟ ئەویش دەیفەرموو: جوبرائیلم (ش).

٢/٨٧٥[٤٤٧]- وعن أبي ذرٍ رضي الله عنه قال: خَرجَتُ لَيْلة من اللّيالي فإذا رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يمشي وحْدَهُ، فجَعلتُ أمشي في ظلِّ القمَر، فالتفت فرآني فقال: (مَنْ هذا؟) فقلتُ أبو ذرٍ، متفق عليه:

ئەبو ذەڕ (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: شەوێ لەشەوان دەرچووم، کەڕوانیم وا پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەتەنیا خۆی دەڕوا، منیش بەسێبەری مانگە شەوەکەدا رۆیشتم، واتا: لەتاریکییەکەوە لەو شوێنەوە کە مانگەشەوەکە نەیدەگرتەوە، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) ئاوڕی دایەوە چاوی پێم کەوت فەرمووی: ئەوە کێیە؟ گوتم: ئەبو ذەڕم. (ش). ئەبو ذەڕ کەسناوی بوو، ناوی جوندوبی کوڕی جەنادەیە (وەرگێڕ).

٣/٨٧٦- بڕوانە: (٨٦٤/٢ ز - ١٣٧).

لێرەدا لەدواکەیەوە ئەمەی پترە، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوە کێیە؟ گوتم: منم ئوممو هانیئم، واتە: دایکی هانیئم.

٤/٨٧٧[٤٤٨]- وعن جابر رضي الله عنه قال: أتَيتُ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) فَدَقَقْتُ الباب فقال: (من هذا؟) فقلت، أنا، فقال: (أنا أنا؟) كأنهُ كَرهَهَا، متفق عليه:

جابیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆ لای پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە لە دەرگاکەم دا فەرمووی: ئەوە کێیە؟ گوتم: منم، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) وەك پێی ناخۆش بێ فەرمووی: منم، منم؟ (ش).

---

[٤٤٧] بوخاری (٦٤٤٣)و موسلیم (٩٤)و (٦٨٨/٢).

[٤٤٨] بوخاری (٦٢٥٠)و موسلیم (٢١٥٥).

## ١٤٢- سوننەتە ئەگەر پژمیو ستایشی خودای کرد نزای چاکی بۆ بکەی، بەڵام ئەگەر سوپاسی نەکرد باش نییە نزای بۆ بکا، هەروەها باسی روونکردنەوەی دەستوورەکانی نزای پژمینو باوێشك

## باب استحباب تشميت العاطس إذا حمد الله تعالى وكراهية تشميته إذا لم يحمد الله تعالى وبيان آداب التشميت والعطاس والتثاؤب

١/٨٧٨[٤٤٩]- عن أبي هريرة رضي الله عنه أن النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (إن الله يُحِبُّ العطاسَ وَيَكْرَهُ التَّثاؤبَ، فَإِذَا عَطَس أحَدكُم وحمد الله تعالى كانَ حقًّا على كل مسلم سمعهُ أن يقول له يرحمك الله وأما التّثاوب فإنما هـو مـن الشـيطان، فـإذا تثاءب أحدكم فليردُّهُ ما استطاع، فإن أحدكم إذا تثاءب ضَحِكَ منه الشيطان) رواه البخاري.

**ئەبو هورەیرەوە** (رەزای خودای لێ بێ) **لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ:** (درودی خوای لەسەر بێ) **خودا پژمەی خۆش دەوێ، بەڵام باوێشکی پێ خۆش نییە، دەی ئەگەر یەکێکتان پژمیو سوپاسی یەزدانی کرد، ئەوە دەبێ بەماف و هەق لەسەر هەموو موسوڵمانێ کە گوێی لێیەتی پێی بڵێ: (یرحمك الله: خودا رەحمەت پێ بفەرمووێ) بەڵام باوێشك لەشەیتانەوەیە، جا ئەگەر کەسێکتان باوێشکی هات با هەتا دەتوانێ بەری بگرێو بیداتەوە دواوە، چونکە کاتێ ئێوە باوێشك دەدەن شەیتان لەخۆشیاندا پێتان پێ دەکەنێ (ب).**

٢/٨٧٩[٤٥٠]- وعنه عن النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (إذا عطس أحدكم فليقل: الحمد لله، وليقل له أخوه أو صاحبه: يرحمك الله، فإذا قال له: يرحمك الله فليقل: يهديكم الله ويصلح بالكم) رواه البخاري.

**دیسان لەوەوە لە حەزرەتەوە دەفەرموێ:** (درودی خوای لەسەر بێ) **کاتێ کەسێکتان دەپژمێ با بڵێ: (الحمدلله: سوپاس بۆ خودا) برادەرەکەشی با ئاوا وەڵامی بداتەوە: (یرحمك الله: رەحمەتی خودات لێ بێ) ئەوکاتە با پژمیوەکەیش بەو بڵێتەوە: (یهدیکم الله ویصلح بالکم) یاخوا خودا شارەزایی رێی حەقتان بکاو هیدایەتتان بداو هەموو کاروبارێکتان بەباشی بۆ بسازێنێ (ب).**

---

[٤٤٩] بوخاری (٦٢٢٣).

[٤٥٠] بوخاری (٦٢٢٤).

٣/٨٨٠[٤٥١]- وعن أبي موسى رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يقولُ (إذا عَطَس أحدُكُم فحمد الله فشمتوه، فإنْ لم يحمد الله فلا تُشمتوه) رواه مسلم.

**ئەبو مووسا** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری حەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو: کاتێ کەسێکتان پژمیو حەمدو ستایشی خودای کرد، ئێوەیش نزای خێری بۆ بکەن، دەنا ئەگەر پژمیو ستایشی نەکرد، ئەوە نزای پژمیوی بۆ مەکەن (م).**

٤/٨٨١[٤٥٢]- وعن أنس رضي الله عنه قال: عطس رجلان عند النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فشمت أحدهما ولم يشمت الآخر، فقال الذي لم يشمته: عطس فُلانٌ فَشَمَّتهُ وَعطستُ فَلَم تُشَمتني؟ فقال: (هذا حمد الله، وإنَك لم تحمد الله). متفق عليه.

**ئەنەس** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لە خزمەتی پێغەمبەردا دوو پیاو پژمین، پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **نزای بۆ یەکێکیان کردو نزای بۆ ئەوی تریان نەکرد، جا ئەوەیان کە نزای بۆ نەکرد، گوتی: بۆ ئەو پژمی نزات بۆی کرد، کەچی من پژمیم نزات بۆ نەکردم؟ فەرمووی: چونکە ئەو لەپاش پژکینەکەی سوپاسی خودای کرد، بەڵام تۆ سوپاسی خودات نەکرد (ب).**

٥/٨٨٢[٤٥٣]- وعن أبي هريرة رضي الله عنه قال : كان رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)إذَا عَطَسَ وَضَعَ يَدَهُ أوْ ثَوبَهُ عَلى فيهِ وَخَفَضَ أوْ غَضَّ بَها صَوْتَهُ.شك الراوي رواه أبو داود،والترمذي وقال حديث حسن صحيح.

**ئەبو هورەیرەوە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەستووری وابوو، کە دەپژمی دەمو لووتی خۆی بەدەستی، یان بە جلەکەی دادەپۆشیو دەنگی خۆی پێ کپ دەکرد (د/ت:ح/ح/ص).**

---

[٤٥١] موسلیم (٢٩٩٢).

[٤٥٢] بوخاری (٦٢٢٥)و موسلیم (٢٩٩١).

[٤٥٣] ئەبو داوود (٥٠٢٩)و تیرمیذي (٢٧٤٦).

٦/٨٨٣[٤٥٤]- وعن أبي موسى رضي الله عنه قال: (كان الْيَهُـودُ يَتَعَاطسُـونَ عِنْـدَ رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يَرْجُونَ أنْ يَقولَ لَهم يَرْحَمُكُم الله، فيقولُ : يَهدْيكُمُ الله ويُصلحُ بالكم) رواه أبو داود، والترمذي وقال حديث حسن صحيح.

**ئەبو مووسا** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: گەلێ جار جوولەکەکان کە لەلای پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەبوون، کە دەپژمین بەتەمای ئەوە بوون کە پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **پێیان بفەرمووێ: یرحمکم الله: خودا رەحمتان پێ بکا، بەلام پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەکاتی وادا پێی دەفەرموون: (یهدیکم الله ویصلح بالکم: خودا شارەزای رێگەی راستتان بکاو کارتان بسازێنێ. (د/ت:ح/ح/ص).**

٧/٨٨٤[٤٥٥]- وعن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه قال: قال رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): إذا تَثاءَبَ أحَدُكُمْ فَلْيُمسكْ بَيده على فيه فإنَّ الشيطان يدْخل) رواه مسلم.

**ئەبو سەعیدی خودری** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: کاتێ کەسێکتان دەپژمێ با دەست بگرێ بەبان دەمیەوە، چونکە شەیتان دەیەوێ لەناو دەمیەوە بچێتە ناو لەشی ئادەمیزادەوە (م).**

## ١٤٣- لەکاتی بەیەك گەیشتندا تەوقەکردن پەسەندە، هەروەها رووخۆشیو هەروەها دەست ماچ کردنی پیاوی باش، وە ماچ کردنی منالی خۆی لەبەر خۆشەویستی، وە دەست لەمل کردنی ئەو کەسەی کە لەسەفەر دەگەڕێتەوە، بەلام خۆچەماندنەوە باش نییە

## باب استحباب المصافحة عند اللقاء وبشاشة الوجه وتقبيل يد الرجل الصالح وتقبيل ولده شفقة ومعانقة القادم من سفر وكراهية الانحناء

١/٨٨٥[٤٥٦]- عن أبي الخطاب قتادة قال: قلت لأنس: أكَانتِ المُصافَحةُ في أصْحابِ رسول الله صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم؟ قال: نَعَمْ. رواه البخاري.

**ئەبو خەططاب قەتادە دەفەرموێ: عەرزی ئەنەسم کرد: ئایا تەوقەکردن لەناو هاوڕێکانی پێغەمبەردا هەبووە؟ فەرمووی: بەلێ هەبوو (ب)(*)**

---

[٤٥٤] ئەبو داوود (٥٠٣٨)و تیرمیذي (٢٧٤٠).

[٤٥٥] موسلیم (٢٩٩٥).

[٤٥٦] بوخاری (٦٢٦٣)، تیرمیذي (٢٧٣٠).

٨٨٦/٢[٤٥٧]– وعن أنس رضي الله عنه قال : لَمَّا جَاءَ أَهْلُ اليَمنِ قال رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (قَدْ جَاءَكُمْ أَهْلُ الْيَمَنِ، وَهُمْ أولُ مَنْ جَاءَ بالْمُصَافَحَة) رواه أبو داود بإسناد صحيح.

**ئەنەس** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: کاتێ خەڵکی یەمەن هاتن بۆ مەدینە بۆ خزمەتی پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەوا خەڵکی یەمەن هاتوون بۆ لاتان، ئەوان یەکەم کەسن کە تەوقەکردنیان داهێناوە (د – س/ص).**

٨٨٧/٣[٤٥٨]– وعن البراء رضي الله عنه قال : قال رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (ما مِنْ مُسْلِمَيْن يَلْتَقِيَان فَيَتَصافَحَانِ إلا غُفر لَهما قبل أن يفترقا) رواه أبو داود.

**بەڕاء** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: هەردوو موسوڵمانێ کاتێ بەیەکتری دەگەن لەگەڵ یەکتردا تەوقە بکەن، بێگومان لەپێش ئەوەدا کە لەیەکتری جیاببنەوە خودا لەهەردوو لایان خۆش دەبێ (د).**

٨٨٨/٤[٤٥٩]– وعن أنس رضي الله عنه قال : قال رجل : يا رسول الله، الرَّجُلُ مِنَّا يَلْقَى أخَاه أوْ صَدِيقَهُ أيَنْحني لَهُ ؟ قال : (لا) قال : أفَيلتزمه ويقبله ؟ قال : (لا) قال : فَيَأْخُذُ بِيَده وَيُصَافِحُهُ ؟ قال : (نَعَم) رواه الترمذي وقال : حديث حسن.

---

(*) بسم الله الرحمن الرحيم الحمد لله والصلاه والسلام على رسول الله.

خودا بەڕەحمەت فریشتەی فریا　　فریامان کەوێ لەهەردوو دنیا
ئاگری غەضەب، لەبەر، لەدەریا　　ئاوێکی رەحمەت بکەی بەسەریا
لەبەر خاتری پێغەمبەر خوایە!　　پەنامان بدەی لەهەموو لایە
ئێمە کەتەنیا تۆمان مەولایە　　هەمیشە لوتفی تۆمان هیوایە
هەمیشە هەوڵی مەردانەم داوە　　وردم بەقەومان قەت نەڕووخاوە
گشت جارێ هەتا تینم تیا ماوە　　بەپشتی خودا هەناوم ناوە!
دوایش هەرچی هات لەلای خوداوە　　خەڵاتی خودایە جێگەی سەرچاوە

١٩٩١/١/١٦ سەعات یەك و نیوی شەو (وەرگێڕ)

(٤٥٧) ئەبو داوود (٥٢١٣)

(٤٥٨) ئەبو داوود (٥٢١٢).

(٤٥٩) تیرمیذي (٢٧٢٩).

**ئەنەس** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پیاوێ گوتی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! کاتێ پیاوێ لەئێمە دەگا بە برادەرێکی خۆی، یا بە خۆشەویستێکی خۆی، ئایا بچەمێتەوە بۆی؟ فەرمووی: نەء، گوتی: ئەی دەست بکاتە ملی‌و ماچی بکا؟ فەرمووی: نەء، گوتی: ئەی دەست بخاتە ناو دەستی‌و تەوقەی لەگەڵ بکا؟ فەرمووی: بەڵێ (ت:ح/ح).**

٥/٨٨٩(٤٦٠)– وعن صَفْوان بن عَسَّال رضي الله عنه قال : قال يَهُودي لِصَاحبه اذْهب بنا إلى هذا النَّبيّ فأتيا رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَسَألاه عن تسْع آيات بينات فَذَكرَ الْحَديث إلى قَوْله : فقَبَّلا يَدَهُ وَرِجْلَهُ وقالا : نَشْهَدُ أنَّكَ نبي. رواه الترمذي وغيره بأسانيد صحيحة:

**صەفوانی عەسسال** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: دوو جوولەکە دەبن یەکێکیان دەڵێ بەهاوڕێکەی: هەستە با بڕۆین بۆلای ئەو پێغەمبەرە، دوایی هاتنە لای پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لە مەعناو مەبەستی ئەم ئایەتە پرسیاریان لێ کرد** {وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى تِسْعَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ} **جا فەرموودەکەی بەتەواوی گێڕایەوە تا ئەوێ کە دەفەرموێ: جا هەردووکیان هەستان هەردوو دەست‌و هەردوو پێی حەزرەتیان ماچ کردو گوتیان: ئێمە شایەتی دەدەین کەتۆ پێغەمبەری خودای (ت:س/ص).**

٦/٨٩٠(٤٦١)– وعن ابن عمر رضي الله عنهما قصة قال فيها : فَدَنَوْنا من النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فقَبَّلْنا يده. رواه أبو داود:

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خودای لێ بێ) **داستانێکی گێڕایەوە لەو داستاندا فەرمووی: ئیتر پەلاماری دەستی پێغەمبەرمان داو ماچمان کرد (د).**

٧/٨٩١(٤٦٢)– وعن عائشة رضي الله عنها قالت : قَدم : زَيْدُ بنُ حَارثة المدينة ورسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) في بَيْتي فأتَاهُ فَقَرَعَ الباب. فَقَام إليهْ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يَجُرُّ ثوْبَهُ فاعتنقه وقبله) رواه الترمذي وقال : حديث حسن:

---

(٤٦٠) تیرمیذي (٢٧٢٤)، ئیبنو ماجه (٣٧٠٥).

(٤٦١) ئەبو داوود (٥٢٢٣).

(٤٦٢) تیرمیذي (٢٧٣٣).

**عائيشه** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: زەیدی کوڕی حاریثە هات بۆ مەدینەو هات بۆلای پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەوکاتەدا لەماڵی من بوو، کەهات لەدەرگای دا، حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **هەڵسا چوو بەپیرییەوە، لەخۆشیا ئەوەندە بەپەلە چوو بەپیرییەوە فریا نەکەوت کە جلەکەی رێك بخا، بەدەم رێگەوە بەکێشی دەکرد، ئەوجا دەستی کردە ملیو ماچی کرد (ت:ح/ح).**

٨٩٢/٨- **فەرموودەی** (لاتحقِرَنَّ مِنَ المعْرُوف شَيْئاً...) **بڕوانە: (١٢١/٥ز-١٣).**

٨٩٣/٩- **فەرموودەی** (قَبَّل النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)الحسن بن على) **بڕوانە: (٢٢٥/٤ز - ٢٧).**

## نامەی سەردانی نەخۆش و بەڕێکردنی مردوو، باسی نوێژکردن لەسەری و نامادەبوونی ناشتنیو وەستان لەسەر گۆڕەکەی لەپاش ناشتنی
## كتاب عيادة المريض وتشييع الميت، والصلاة عليه،وحضور دفنه، والمكث عند قبره بعد دفنه

### ١٤٤- باسی سەردانی نەخۆش - باب عيادة المريض

٨٩٤/١- **فەرموودەی** (أمَرَنَا رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بِعيَادةِ المَريض، واتّبـاع الجنازة...) **بڕوانە: (٢٣٩/١٨ز-٢٧).**

٨٩٥/٢- **فەرموودەی** (حَقُّ الْمُسلِمِ عَلَى الْمُسلِمِ خَمْسٌ...) **بڕوانە: (٢٣٨/١٧ز ٢٧).**

٨٩٦/٣[٤٦٣]- وعنه قال قال رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): إنَّ الله عـزَّ وجـل يَقُولُ يَوْمَ القيَامَة : (يَا ابْنَ آدَمَ مَرضْتُ فَلَم تَعُدْني، قال : يارِبِّ كَيْفَ أعُودُكَ وأنْت رَبُّ العَالَمين ؟ قال : أمَا عَلْمتَ أنَّ عَبْدي فُلاَناً مَرِضَ فَلَمْ تَعُدْهُ، أمَا علمـتَ أنَّـك لـو عُدْتـه لوجدتني عنده ؟ يا ابن آدم اطعمتك فلم تطعمني، قال : يا رب كيف أطعمك وأنت رب العالمين، قال : أما علمت أنه استطعمك عبدي فلان فلم تطعمه أما علمت أنك لو أطعمته لوجدت ذلك عندي ؟ يا ابن آدم استسقيتك فلم تسقني، قـال : يـارب كيـف اسـقيك وأنت رب العالمين ؟ قال : استسقاك عبدي فلان فلم تسقه، أما علمت أنك لو سقيته لو جدت ذلك عندي ؟) رواه مسلم:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەری خودا** (دروودی خودای گەورەی لەسەر بێ) **فەرمووی: لەڕۆژی قیامەتا خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزاد! من**

[٤٦٣] موسلیم (٢٥٦٩).

نەخۆش بووم کەچی تۆ نەهاتی بۆ سەردانم، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! تۆییە کە خودای هەردوو جیهانی، ئیتر من چۆن چۆنی بێم بۆ سەردانت؟ خودا دەفەرموێ: تۆ دەتزانی کەکاتی خۆی فیسارە بەندەی من نەخۆش بوو، بۆچی سەرت لێ نەدا، ئەدی نەتدەزانی ئەگەر سەرت لێ بدایەو سەرخۆشیت لێ بکردایە لەوکاتەدا من لەوێ لەلای بووم. ئەی ئادەمیزاد! داوای نانو خۆراکم لەتۆ کرد کەچی بەشت نەدام، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! تۆییە کەخودای هەموو لایەکی ئیتر من چ رادەیەکم دەکەوێو چۆن چۆنی نانو خۆراکت پێ بدەم؟! دەفەرموێ: تۆ دەزانی کەکاتی خۆی فیسارە بەندەم لە فیسارە رۆژدا لەجیهاندا داوای نانو خواردەمەنی لێ کردیت کەچی بەشت نەدا، ئەدیی نەتدەزانی بەشیت بدایە ئێستاکە پاداشی ئەوەت لەلای من هەبوو، ئەی ئادەمیزاد! من توونیم بوو، داوای ئاوم لێ کردی، کەچی تۆ بەشت نەدام، دەڵێ: پەروەردگارا! تۆییە کەخودای هەمووانی من چ رادەم هەیەو چۆن چۆنی ئاوت بدەمێ؟ دەفەرموێ: فیسارە بەندەی من لەجیهانا داوای ئاوی لێ کردیت، کەچی تۆ بەشیت نەدا، ئەدیی ئەگەر ئەو ئاوەت پێ بدایە ئێستا پاداشی باشی ئەو چاکەیەت لەلای من بوو! (م).

٨٩٧/٤[٤٦٤]– وعن أبي موسى رضي الله عنه قال : قالَ رسولُ اللهِ، صلى الله عليه وسلم: ((عُودُوا المَرِيضَ، وَأَطْعِمُوا الجَائِعَ، وفُكّوا العَاني)) رواه البخاري:

ئەبو مووسا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: سەر لەنەخۆش بدەنو نان بەبرسی بدەنو دیل بەرەڵڵا بکەن (ب).

٨٩٨/٥[٤٦٥]– وعن ثوبان رضي الله عنه عن النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قال : (إنّ المسلم إذا عاد أخاه المسلم لم يزل في خُرْفَةِ الجنة حتى يرجع) قيل : يا رسول الله وما خُرْفَةُ الجنة ؟ قال : (جَنَاها) رواه مسلم:

ثەوبان (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: کاتێ موسوڵمان دەچێ بۆ هەواڵ پرسینی برای موسوڵمانی نەخۆشی، ئەوە دەچێت بۆ رنینی میوەی بەهەشت هەتا دەگەڕێتەوە، گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! مەبەست

[٤٦٤] بوخاری (٥٦٤٩).

[٤٦٥] موسلیم (٢٥٦٨).

لەم رنینی میوەیە چییە؟ فەرمووی: یانی بەری باخی بەهەشت دەرِنیٚ‌و ئەم ئیشە باشەی دەبیٚ بەمایەی چوونە بەهەشتی (م).

٦/٨٩٩[٤٦٦]- وعن علي رضي الله عنه قال : سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول : ما من مسلم يعود مسلماً غدوة إلا صلى عليه سبعون ألف ملك حتى يمسي، وإن عاده عشيةً إلا صلى عليه سبعون ألف ملكٍ حتى يصبح، وكان له خريف في الجنة) رواه الترمذي وقال : حديث حسن:

عەلـەی (رەزای خـوای لیٚ بیٚ) فـەرمووی: بـەگویٚی خـۆم لـەزاری حـەزرەتم ژنـەوت دەیفـەرموو (دروودی خـوای لەسـەر بیٚ): هـەر موسـوڵمانیٚ، سـەرلەبەیانی بچیٚ بـۆ سـەردانی موسوڵمانیٚکی نەخۆش حـەفتا هـەزار فریشـتە، تـا ئیٚـواریٚ نـزای باشـی بـۆ دەکـەن‌و رەحمەتی بۆ دەنیٚرن، وەئەگەر سەر لەئیٚواریٚ بچیٚت بـۆ سـەرلیٚدانی حـەفتا هـەزار فریشتە تا سبەینیٚ بەیانی بۆی دەپاڕیٚنەوەو رەحمەتی لیٚ دەکـەن‌و دەبیٚ بەمایـەی چوونە بەهەشتی‌و لەبەری باخی بەهەشت دەخوا (ت:ح/ح).

٧/٩٠٠[٤٦٧]- وعن أَنسٍ، (رضي اللّه عنه)، قال : كانَ غُلامٌ يَهُودِيٌّ يَخْدُم النَّبـيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، فمرضَ فأَتَاهُ النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يعُودهُ، فقَعَدَ عِنْدَ رأْسِهِ فقالَ لَهُ : (أَسْلِمْ) فنَظَرَ إِلى أَبِيهِ وهُو عِنْدَهُ؟ فقال : أَطِعْ أَبا الْقاسِمِ، فَأَسْلَم، فخَرَجَ النَّبـيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، وَهُوَ يقولُ : (الحَمْدُ للّهِ الّذي أَنْقذهُ مِنَ النَّارِ). رواه البخاري:

ئەنـەس (رەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: کوڕە جوولەکەییٚ خزمـەتی پیغەمبـەری دەکـرد، کوڕەکـە نـەخۆش کـەوت، حـەزرەت (دروودی خـوای لەسـەر بیٚ) تەشـریفی چـوو بـۆ سـەردانی‌و لەسەرینییەوە دانیشت‌و پیٚی فـەرموو: موسـوڵمان ببـە، کوڕەکـەیش سـەیری بـاوکی کـرد، باوکیشی پیٚـی گـوت: بـەگویٚی ئەبولقاسـم بکـە، جـا ئـەویش موسـوڵمان بـوو، پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بیٚ) کە هەڵسا فەرمووی: سوپاس بۆ خـودا کـە لـەئاگری دۆزەخ رزگاری کرد (ب).

---

[٤٦٦] تیرمیذي (٩٦٩).

[٤٦٧] بوخاری (١٣٥٦).

## ١٤٥- باسی نزاکردن بۆ نەخۆش - باب ما يدعى به للمريض

١/٩٠١[٤٦٨]- عن عائشة، رضي اللّٰه عنها، أَن النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)كَانَ إِذا اشْتكى الإِنْسانُ الشَّيءَ مِنْهُ، أَوْ كَانَتْ بِهِ قَرْحَةٌ أَوْ جُرْحٌ، قال النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، بِأُصْبُعِهِ هكذا، ووضع سُفْيانُ بْنُ عُيَيْنَة الرَّاوي سبابتَهُ بِالأَرْضِ ثُمَّ رَفَعَهَا وقال : بِسْمِ اللّٰهِ، تُربَةُ أَرْضِنا، بِرِيقَةِ بَعْضِنَا، يُشْفَى بِهِ سَقِيمُنَا، بِإِذْنِ رَبِّنَا) متفقٌ عليه:

عائیشه (خۆشنوودی خودای مەزنی لەسەر بێ) فەرمووی: پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کاتێ کەسێ، ئێشێ، ئازارێکی ببوایە، یاخود برینێ یا زامێکی پێوە بووایە، پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بە پەنجەی پیرۆزی ئاوای دەکردو ئینجا هەڵی دەگرتەوەو دەیفەرموو: (بِسْمِ اللّٰهِ، تُربَةُ أَرْضِنا، بِرِيقَةِ بَعْضِنَا، يُشْفَى بِهِ سَقِيمُنَا، بِإِذْنِ رَبِّنَا: بە پیرۆزیی خودای گەورە دوعات بۆ دەکەم: ئەمە خاکی زەوی خۆمانە، لەگەڵ تەڕایی دەمی موسوڵمانێ لەخۆمان، بەفەرمانی پەروەردگارمان دەبێ بەچارەو دەرمان بۆ نەخۆشمان) سوفیانی کوڕی عویەینە (کە یەکێکە لەگێڕەرەوەکانی ئەم فەرموودە پیرۆزەیە) پەنجەی شایەتوومانی خۆی لەسەر زەوییەکە دادەناو کەمێ رادەوەستاو ئەوجا بەرزی دەکردەوەو دوعاکەی حەزرەتی دەخوێند (ش) ئیمامی نەوەوی (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەنگوستی شایەتومانی بەتفی خۆی تەڕ دەکردو دەینایە سەر خاكو پەنجەی هەندێ خۆڵی پێوە دەلکا، ئەوجا پەنجەی بەخۆڵو تەڕاییەکەی دەمییەوە دەهێنا بەسەر شوێنی ئازارەکەداو لەوکاتەدا نزاکەی دەخوێند. (وەرگێڕ)

٢/٩٠٢[٤٦٩]- وعنها أَن النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)كَانَ يعُودُ بَعْضَ أَهْلِهِ يَمْسَحُ بيدِهِ اليُمْنى ويقولُ : (اللَّهُمَّ ربَّ النَّاسِ، أَذْهِب الْبَأسَ، واشْفِ، أَنْتَ الشَّافي لا شِفَاءَ إِلاَّ شِفَاؤُك، شِفاءً لا يُغَادِرُ سقَماً) متفقٌ عليه:

دیسان عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە دوعای بۆ یەکێ لە کەسوکاری خۆی دەکرد، دەستی راستی دەهێنا بەسەر جەستەی نەخۆشەکەداو دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ ربَّ النَّاسِ، أَذْهِب الْبَأسَ، واشْفِ، أَنْتَ الشَّافي لا

[٤٦٨] بوخاری (٥٧٤٥)و موسلیم (٢١٩٤).

[٤٦٩] بوخاری (٥٧٤٣)و موسلیم (٢١٩١).

شِفَاءَ إِلاَّ شِفَاؤُكَ، شِفاءً لا يُغَادِرُ سقَماً) ئەی خودای من! ئەی پەروەردگاری هەرچی ئادەمیزادە! ئەم ئێش و ئازارە لابەرە، شیفای بدەو خۆش و چاکی بکەرەوە، شیفادەری بەڕاستی هەر خۆتیت و خۆشبوونەوە هەر بەدەستی تۆیە، بێجگە لەتۆ شیفادەری تر نییە، چارەساز هەر خۆتی، چاککەرەوە هەر تۆی، ئەگەر خواستی تۆی لەسەر نەبێ دەرمان و نوشتە پارە ناکاو دەرمانی هیچ دەردێ ناکا، شیفایەکی تەواوی وا کە هیچ دەردێ نەهێڵێ (ش).

٩٠٣/٣[٤٧٠]- وعن أنسٍ (رضي اللّه عنه)أنه قال لِثابِتٍ رحمه اللّه : ألا أَرْقِيكَ بِرُقْيَةِ رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)؟ قال : بَلى. قال : اللّٰهُمَّ رَبَّ النَّاسِ، مُذْهِبَ البَأسِ، اشْفِ أَنتَ الشَّافِي، لا شافِيَ إلاَّ أَنْتَ، شِفاءً لا يُغادِرُ سَقَماً. رواه البخاري:

ثابیت (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) بە ئەنەسی فەرموو (ڕەزای خودای لێ بێ): نەخۆشم، ئەویش پێی فەرموو: دەبا بەدوعاکەی پێغەمبەر خۆی (درودی خوای لەسەر بێ) دوعات بۆ بکەم، عەرزی کرد: بفەرموو: ئەنەس فەرمووی: اللّٰهُـمَّ رَبَّ النَّـاسِ، مُـذْهِبَ البَـأسِ، اشْفِ أَنتَ الشَّافِي، لا شافِيَ إلاَّ أَنْتَ، شِفاءً لا يُغادِرُ سَقَماً. (ب).

٩٠٤/٤[٤٧١]- وعن سعدِ بن أَبي وَقَّاصٍ (رضي اللّه عنه)قال : عَادَني رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)فقال : (اللّٰهُمَّ اشْفِ سعْداً، اللّٰهُمَّ اشْفِ سَعْداً، اللّٰهُمْ اشْفِ سَعداً) رواه مسلم:

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆ سەرلێدانم، چونکە نەخۆش بوو، سێ جار لەسەریەك فەرمووی: (اللّٰهُمَّ اشْفِ سعْداً، اللّٰهُمَّ اشْفِ سَعْداً، اللّٰهُمْ اشْفِ سَعداً) خودایە! دەرمانی دەردی سەعد بدەو شیفای بفەرموو (م)[*]

---

[٤٧٠] بوخاری (٥٧٤٢).

[٤٧١] موسلیم (١٦٢٨) (٨).

[*] لەبەر پەرێشانیی دڵ هەڵەی قەڵەم زۆر دەکەم، بەم بۆنەیەوە دەڵێم:

٩٠٥/٥[٤٧٢]- وعن أَبي عبد اللّٰهِ عثمانَ بنِ العَاصِ، (رضي اللّٰه عنه)أنـه شَـكا إلى رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وَجعاً يجِدُهُ في جَسدِهِ، فقال له رسـول اللّٰـه (صَـلّى اللّٰه عَلَيْهِ وسَلَّم): (ضَعْ يَدَكَ عَلى الذي يَأْلَمُ مِن جَسَدِكَ وَقـلْ : بِسـمِ اللّٰـهِ ثلاثـاً وَقُـلْ سَبْعَ مَرَّاتٍ : أَعُوذُ بِعِزَّةِ اللّٰهِ وَقُدْرَتِهِ مِن شَرِّ مَا أَجِدُ وَأُحاذِرُ) رواه مسلم:

**عوسمانی کوڕی ئەبولعاس** (ڕەزای خودای لیٚ بێ) **عەرزی پیغەمبـەری کـرد** (درودی خوای لەسەر بێ)**: کە ئەوەتی موسوڵمان بووم ئازاریٚ لەجەستەمدا پەیدا بووە، پیغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **پێی فەرموو: دەستت دانیٚ لەسەر ئەو شوێنەی لەشت کە دێشیٚو سیٚجار بڵیٚ: بِسمِ اللّٰهِ، وە حەوت جار بڵیٚ: (أَعُوذُ بِعِزَّةِ اللّٰهِ وَقُدْرَتِهِ مِن شَرِّ مَـا أَجِـدُ وَأُحـاذِرُ) پـەنا دەگرم بە گەورەیی خوداو بە تەواناییی ئەو لەزیانی ئـەم ئـازارەی کە هەستی پیٚ دەکەمو مەترسیم لێی هەیە (م).**

٩٠٦/٦[٤٧٣]- وعن ابن عباس، رضي اللّٰـه عنهمـا، عـن النَّبــيّ (صَـلّى اللّٰه عَلَيْـهِ وسَلَّم)قال : (مَنْ عَادَ مَرِيضاً لَمْ يَحْضُرْهُ أَجَلُهُ، فقالَ عِنْدَهُ سَبْعَ مَرَّات : أَسْأَلُ اللّٰه الْعَظِيمَ رَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ أَنْ يَشفِيَك : إلاَّ عَافَاهُ اللّٰه مِنْ ذلكَ المَرَضِ) رواه أبو داود والترمذي وقال : حديث حسن، وقال الحاكِم : حديث صحيح على شرطِ البخاري:

**ئیبنو عەبباس** (ڕەزای خودایان لیٚ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: کەسیٚ بچیٚ بـۆ سـەرلێدانی نەخۆشیٚ، کە ئەجـەل (ئاکـام)ی نـەهاتبیٚ، لـەلای ئـەم نزایـە حەوت جار بڵیٚ: (أَسْأَلُ اللّٰـه الْعَظِـيمَ رَبَّ الْعَـرْشِ الْعَظِـيمِ أَنْ يَشـفِيَك) داوا لـەخودای گەورە دەکەم، کە خاوەنی عەرشی مەزنە کە دەرمانی دەردت بکا، حەزرەت** (درودی خوای

---

ئـەی دڵ! دەزانم چـون عـەماری خـار ... سـاڵ دوانـزە مانگـەت بـووە بـە (ئـازار)
زریکەی پوڵەنگ، زیـرەی گـورگی هـار ... نـەرەی شـێری نـەڕ، فیشـکوهوڕی مـار
خۆشـترە سـەدجار لـە شـووتی ئینـزار ... کـە وەك نـەفخی صـوور قـڕ دەخاتـە شـار
سـەرماو نەخۆشـیو قـاتیو گرانـی ... بـۆ مـەردووم بوونـە بـەرگی زسـتانی!
ئەگـەر ئەمانـەت تـۆ هـەموو زانـی ... ئەوسـا دەزانـی هـۆی پەرێشـانی

١٩٩١/١/٢١ (وەرگێڕ)

[٤٧٢] موسلیم (٢٢٠٢).

[٤٧٣] ئەبو داوود (٣١٠٦)، تیرمیذي (٢٠٨٤)، حاکم (٣٤٢/١).

لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم نزایەی حەوت جار لەلا بخوێنێ مسۆگەر خودا لەو نەخۆشییە چاکی دەکاتەوە. (د/ت:ح/ح – حاکم: ح/ص).

٩٠٧/٧(٤٧٤) – وعنه أَنَّ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)دَخَل على أَعرابيّ يَعُودُهُ، وَكانَ إذا دَخَلَ عَلى مَن يَعُودُهُ قال : (لا بَأْس، طَهُورٌ إن شَاء اللّه) رواه البخاري:

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) چوو بۆ سەردانی پیاوێکی عەرەبی دەشتەکی نەخۆش، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستووری وابوو کە دەچوو بۆ سەردانی نەخۆشێ پێی دەفەرموو: (لا بَأْس، طَهُورٌ إن شَاء اللّه) قەیدی نییە، خودا حەزکا کەففارەی گوناهو پاکەوەکەری نەنگە (ب).

٩٠٨/٨(٤٧٥) – وعن أَبي سعيد الخُدْريِّ (رضي اللّه عنه)أَن جِبْريلَ أَتى النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فقال : يَا مُحَمدُ اشْتَكَيْتَ ؟ قال : (نَعَمْ) قال : بِسْمِ اللّهِ أَرْقِيك، مِنْ كُلِّ شَيْءٍ يُؤْذِيكَ، مِنْ شَرِّ كُلِّ نَفْسٍ أَوْ عيْنِ حَاسِدٍ، اللّهُ يشْفِيك، بِسْمِ اللّهِ أَرْقِيك) رواه مسلم:

ئەبو سەعید (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جوبرائیل (دروودی خوای لەسەر بێ) هاتە لای حەزرەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرموو: ئەی محمد! نەخۆشیت؟ فەرمووی: بەڵێ نەخۆشم، پێی فەرموو: (بِسْمِ اللّهِ أَرْقِيكَ، مِنْ كُلِّ شَيْءٍ يُؤْذِيكَ، مِنْ شَرِّ كُلِّ نَفْسٍ أَوْ عيْنِ حَاسِدٍ، اللّهُ يشْفِيك، بِسْمِ اللّهِ أَرْقِيكَ) بە پیرۆزی ناوی خودا نزات بۆ دەکەم، کە پەنات بدات لە ئێشو ئازاری هەموو شتێ کە ئازارت دەدا، وەبت پارێزێ لە زیانی هەموو کەسێ، وەبێ چاوێنیی بیت لەچاوی پیسی حەسوود! خودا شیفات دەداو چارەی دەردت دەکا، بە پیرۆزیی ناوی خودا نووشتەو دۆعات بۆ دەکەم (م).

٩٠٩/٩(٤٧٦) – وعن أَبي سعيد الخُدْريِّ وأَبي هريرة رضيَ اللّه عنهما، أَنهُما شَهِدَا على رسول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)أنه قال : (مَنْ قال : لا إلهَ إلاَّ اللّهُ واللّهُ أَكْبرُ، صدَّقَهُ رَبَّهُ، فقال : لا إله إلاّ أَنَا وأَنا أَكْبرُ. وَإِذَا قال : لا إلهَ إلاَّ اللّهُ وحْدهُ لا شَرِيكَ لَهُ، قال : يقول : لا إله إلاّ أَنَا وحْدِي لا شَرِيك لي. وإذا قال : لا إلهَ إلاَّ اللّهُ لَهُ المُلْكُ وَلَهُ

---

(٤٧٤) بوخاری (٥٦٥٦).

(٤٧٥) موسلیم (٢١٨٦).

(٤٧٦) تیرمیذي (٣٤٢٦).

الحَمْدُ، قال : لا إلهَ إلاَّ أَنَا لي المُلْك وَلَى الحَمْدُ. وإذا قال : لا إله إلاَّ اللَّـهُ وَلا حَـوْلَ ولا قَوَّةِ إلاَّ باللَّهِ، قال لا إله إلاَّ أَنَا وَلا حَوْلَ ولا قوَّةَ إلاَّ بـي) وَكـانَ يقـولُ : (مَـنْ قالهَـا في مَرَضِهِ ثُمَّ ماتَ لَمْ تَطْعَمْهُ النَّارُ) رواه الترمذي وقال : حديث حسن.

ئـەبو سـەعیدی خـودریو ئـەبو هـوڕەیرە (ڕەزای خـودای گـەورەیان لێ بـێ) فەرموویان: شایەتی دەدەین کە پێغەمبەر (درودی خودای گەورەی لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ بڵێ: لا إلهَ إلاَّ اللَّهُ واللَّـهُ أَكْبَـرُ: هـەر خـودا خودایـەو بـەس، خـودا لەهـەموو کەسێ گەورەترە، خودای پەروەردگار بۆی مۆردەکاو دەفـەرموێ: لا إلـه إلاَّ أَنَـا وأَنـا أَكْبَرُ: ڕاستە وایە، هەر خۆم خودامو بەس، من لەهەموو کەسێ گەورەترم. وەکاتێ دەڵێ: لا إلهَ إلاَّ اللَّهُ وحْدهُ لا شَرِيكَ لَهُ: هەر خودا خودایەو بەس، تاكو تەنیایەو هاوبەشی نییە. خودایش دەفەرموێ: لا إله إلا أَنَا وحْدِي لا شَرِيك لي: ڕاستـە وایـە هـەر خـۆم خودای بەڕاستیمو بەس، خودایەکی تاكو تەنیامو هیچ هاوبەشو هـاوەڵو وێنـەم بۆ نییە. وەکاتێ دەڵێ: لا إلهَ إلاَّ اللَّهُ لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ: هـەر خـودا خودایـەو بـەس، پادشاییو خاوەنێتی، لەگەڵ سوپاسو ستایش لەڕاستیدا هەر بۆ خودایە، خـودایش دەفـەرموێ: لا إلهَ إلاَّ أَنَا لي المُلْـك وَلَى الحَمْـدُ: هـەر خـۆم خـودامو بـەس، پادشـاییو خاوەنێتی لەگەڵ سوپاسو ستایشدا لەڕاستیدا هەر بۆ منەو بەس، وەکاتێ دەڵێ: لا إله إلاَّ اللَّهُ وَلا حَوْلَ ولا قَوَّةِ إلاَّ باللَّهِ: هـەر خـودا خودایـەو بـەس، هێـزو تـەواناییش هەر بەدەستی خودایەو بەس، خودایش دەفەرموێ: لا إله إلاَّ أَنَا وَلا حَوْلَ ولا قوَّةَ إلاَّ بـي: هـەر خـۆم خـودامو بـەس، هێـزو تـەواناییش هـەر بەدەسـتی خۆمـەو بـەس، دەیانفەرموو: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دەیفـەرموو: هەرکەسـێ لـە نەخۆشـیدا ئەمـە بخوێنێ، ئەگەر لەو نەخۆشینەدا بمرێ ئاگری دۆزەخ چەشكەی ناكا (ت:ح/ح).

### ١٤٦- سوننەتە پرسیاری حاڵی نەخۆش لە کەسوکاری بکرێ
### بابُ استحباب سؤال أهل المريض عَنْ حاله

١/ ٩١٠[٤٧٧]- عن ابن عباسٍ، رضي اللَّهُ عنهما، أَنَّ عليَّ بنَ أَبـي طالـبٍ، (رضـي اللَّه عنه)خرجَ مِنْ عِنْدِ رسول اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)في وجَعِهِ الذي تُوُفِّيَ فِيـهِ، فقـال

[٤٧٧] بوخاری (٦٢٦٦).

النَّاسُ : يا أَبَا الحسنِ، كَيفَ أَصْبَحَ رسولُ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال : أَصْبَحَ بِحمْد اللّٰهِ بَارِئاً. رواه البخاري:

**ئیبنو عەبباس** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: لەو نەخۆشینەی حەزرەتدا کە تیادا گیانی پاکی سپارد، عەلی کوڕی ئەبو طالیب لەلای بوو، کە هاتە دەرەوە خەڵکەکە پێیان گوت: ئەی باوکی حەسەن! پێغەمبەر چۆنە** (دروودی خوای لەسەر بێ)**؟ فەرمووی: لەسایەی خوداوە چاکەو بەدیمەن حاڵی باشە (ب).**

**١٤٧- کەسێ دەست لەژیانی خۆی بشۆرێ ئەمە بڵێ باشە**
**باب ما يقوله من أيس من حياته**

١/٩١١(٤٧٨)- عن عائشة رضيَ اللّٰهُ عنها قالت : سَمِعْتُ النَّبيّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وهُوَ مُسْتَنِدٌ إِليَّ يَقُولُ : (اللّٰهُمَّ اغفِرْ لي وَارْحَمْني، وَأَلحِقني بالرَّفِيقِ الأَعْلَى) متفق عليه:

**عائیشە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لەکاتی سەرەمەرگا، پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەباوەشما بوو، پاڵی دابوو پێمەوە، سەری نابوو بە سینگمەوە، لەوکاتەدا گوێم لێی بوو دەیفەرموو: (اللّٰهُمَّ اغفِرْ لي وَارْحَمْني، وَأَلحِقني بالرَّفِيقِ الأَعْلَى) ئەی خودای خۆم! لێم خۆشبەو میهرەبانیم لەگەڵدا بنوێنەو بەزەییت بێتەوە پیامداو بمبەرەوە بۆ ناو یارانی پایە بڵندو، شادم بکەرەوە بە کاروانی یارانی ئازیز (ش).**

٢/٩١٢(٤٧٩)- وعنها قالت : رأَيْتُ رسولَ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وهُوَ بالموتِ، عِندهُ قدحٌ فِيهِ مَاءٌ، وهُو يدخِلُ يدهُ في القَدَحِ، ثم يمسَحُ وجهَهُ بالماءِ، ثم يقول : (اللّٰهُمَّ أَعِنِّي على غمرَاتِ الموْتِ وَسَكَراتِ المَوْتِ) رواه الترمذي:

**دیسان عائیشە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لەکاتی گیانەڵادا، پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **جامێ ئاوی لەبەردەستدا بوو، خۆش خۆش دەستی دەکرد بە ئاوەکەداو دەیهێنا بەڕووی خۆیداو گەرمیی (تا)یەکەی پێ فێنك دەکردەوەو دەیفەرموو: (اللّٰهُمَّ أَعِنِّي على غمرَاتِ الموْتِ وَسَكَراتِ المَوْتِ) خودایە! یاریدەم بدە بەسەر گێژاوی ئەم سەرەمەرگەدا، بەسەر ئەم سەختیو سەخڵەتیی گیانەڵادا کە ڕۆح بێهۆش دەکا (ت:**

(٤٧٨) بوخاری (٥٦٧٤)و موسلیم (٢٤٤٤).

(٤٧٩) تیرمیذي (٩٧٨).

حديث غريب). هێنانەوەی ئەم دوو فەرموودەیە، لەم جێگەیەداو بەم بۆنەیەوە، لەلایەنی ئیمامی نەوەوەییەوە (رەزای خودای لێ بێ) مەعنای وایە کە سوننەتە بۆ هەموو موسوڵمانێ، لەکاتی سەرەمەرگا، ئەم دوو نزا پیرۆزمیە بۆ خۆی بکا، خودا بەڕەحمەتی خۆی لە سەرەمەرگا ڕەحممان پێ بکاو ئیمانمان بەنصیب بکا. ئامین. (وەرگێڕ)

**١٤٨- سوننەتە کەسوکاری نەخۆش و ئەوکەسەی کە خزمەتی دەکا ئامۆژگاری بکرێن: کە باش بن لەگەڵی و ئەرکی بکێشن و بە حەوسەڵەبن بەگەڵیا، هەروەها ئامۆژگاری خێری کەسوکاری ئەو کەسەیش سوننەتە، کە مردنی نزیکبۆتەوە بەهۆی داری حەددو تۆڵە سەندن و شتی واوە**

**باب استحباب وصية أهل المريض ومن يخدمه بالإحسان إليه واحتماله والصبر على ما يشق من أمره وكذا الوصية بمن قرب سبب موته بحد أو قصاص ونحوهما**

١/٩١٣- باسی تەوبە، فەرموودەکەی عیمرانی کوڕی حوصەین.. (أَن امرأَةً مِنْ جُهَيْنَةَ أَتَتِ رسول الله...) بڕوانە: (٢٢/١٠ز - ٢).

**١٤٩- دروستە نەخۆش بڵێ: ئازارم هەیە، یا زۆر سەخڵەتم، یا تادارم، یا ئای سەرم و شتی وا، بەمەرجێ بۆ نارەزایی و بێزاری نەبێ**

**باب جواز قول المريض: أنا وجع، أو شديد الوجع أو موعوك أو وارأساه ونحو ذلك وبيان أنه لا كراهة في ذلك إذا لم يكن على التسخط وإظهار الجزع**

١/٩١٤- فەرموودەکەی ئیبنو مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ): (دَخَلتُ عَلى النَّبيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وهُو يُوعكُ...) بڕوانە: (٣٨/١٤ز - ٣).

٢/٩١٥- فەرموودەکەی سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص: (جَاءَني رسولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يعودُني...) بڕوانە: (٦/٦ز ١).

٣/٩١٦[٤٨٠]- وعن القاسم بن محمدٍ قال: قالَتْ عائشَةُ رضي اللّهُ عنها: وارأْسَاهُ. فقال النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (بلْ أَنَا وارأْسَاهُ). وذكر الحديث. رواه البخاري:

قاسیمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: عائیشەی میمکم دەفەرموێ: ئای سەرم! پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: بەڵکوو من ئای سەرم! هەتا کۆتایی فەرموودەکە (ب).

[٤٨٠] بوخاری (٥٦٦٦).

**١٥٠- ئەوكەسەی لەحاڵی گیانەڵادا بێ سوننەت وایە وشەی پیرۆزی (لا إله إلا الله) بخرێتە سەر زاری (باب تلقين المحتضر : لا إله إلا الله)**

٩١٧/١[٤٨١]- عن معاذٍ (رضي اللّه عنه)قالَ : قال رسُولُ اللّهِ (صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلّم): (منْ كَانَ آخِرَ كلاَمِهِ لا إِلهَ إلاّ اللّه دَخَلَ الجَنَّةَ) رواه أبو داود والحاكم وقال : صحيح الإسناد.

**موعاذی کوڕی جەبەل** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: هەرکەسێ دوا قسەی (لا إله إلا الله) بێ دەچێتە بەهەشت (د/حاکم، حاکم فەرموویەتی: سەنەدەکەی صەحیحە).**

٩١٨/٢[٤٨٢]- وعن أَبي سعيد الخُدْرِيِّ (رضي اللّه عنه)قال : قال رسُولُ اللّه (صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلّم): (لَقِّنُوا موْتَاكُمْ لا إِله إلاّ اللّهُ) رواه مسلم.

**ئەبو سەعیدی خودری** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەو کەسانەتان کەوان لە سەرەمەرگدا (لا إله إلا الله)یان بەگوێدا بدەنو ئەم وشە پیرۆزەیان لەوکاتە ناسکەدا یاد بخەنەوەو لەبەرچاویان بیلێن: سا بەشکوو ئەوانیش چاو لەئێوە بکەنو لەدوا ئێوەوە بیلێنو بەر ئەو فەرموودە پیرۆزەیە بکەون کە دەفەرموێ: (منْ كَانَ آخِرَ كلاَمِهِ لا إِلهَ إلاّ اللّه دَخَلَ الجَنَّةَ) (م).**

**١٥١- کاتێ چاوی مردوو لێك دەنێ چی بڵێ باشە**
**باب ما يقوله بعد تغميض الميت**

٩١٩/١[٤٨٣]- عن أُمِّ سَلمةَ رضيَ اللّهُ عنها قالت : دَخلَ رسُولُ اللّهِ (صلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلّم)على أَبي سلَمة وَقَدْ شَقَّ بصرُهُ، فأَغمضَهُ، ثُمَّ قال : (إنَّ الرُّوح إذا قُبِضَ، تبعَه الْبصَرُ) فَضَجَّ نَاسٌ مِنْ أَهْلِهِ فقال : (لا تَدْعُوا عَلى أَنْفُسِكُم إلاَّ بخَيْر، فإنَّ المَلائِكَةَ يُؤمِّنُون عَلى ما تَقُولونَ) ثمَّ قالَ : (اللَّهُمَّ اغفِر لأبي سَلَمَة، وَارْفَعْ درَجتَهُ في المَهْدِيِّينَ، وَاخْلُفْهُ في عَقِبِهِ في الْغَابِرِين، واغْفِرْ لَنَا ولَه يَاربَّ الْعَالِمِينَ، وَافْسحْ لَهُ في قَبْرِهِ، وَنَوِّرْ لَهُ فيه) رواه مسلم.

---

[٤٨١] ئەبو داوود (٣١١٦)، حاکم (٣٥١/١).

[٤٨٢] موسلیم (٩١٦).

[٤٨٣] موسلیم (٩٢٠).

ئوممو سەلەمە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) هات بۆلای ئەبو سەلەمە، گیانی سپاردبوو، وە چاوی داچەقابوو، جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) چاوەکانی لێکنان‌و فەرمووی: کاتێ گیان دەکێشرێ چاو شوێنی دەکەوێ تا بزانێ بۆ کوێ دەچێ‌ن جا لەم کاتەدا هەندێ کەس لە کەس‌و کارەکەی کردیان بە قیژەو هەراو، نزای خراپیان لەخۆیان کرد. حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: نزای باش بکەن نزای خراپ لەخۆتان مەکەن، چونکە ئێوە هەرچی بڵێن فریشتە ئامینی لەسەر دەکەن، ئینجا فەرمووی: اللّٰهُمَّ اغْفِر لأبِي سَلَمَة، وَارْفَعْ درَجَتهُ في المَهْدِيِّينَ، وَاخْلُفْهُ في عَقِبِهِ في الْغَابِرين، واغْفِرْ لَنَا وله يَاربَّ الْعَالِمِينَ، وَافْسحْ لَهُ في قَبْرِهِ، وَنَوِّرْ لَهُ فيه:

ئەی خودایە! لەئەبو سەلەمە خۆش بەو پلەو پایەی – لەناو ئەوکەسانەدا کە خۆت رێگەی راستت نیشان داون – بەرزبکەرەوە، وە خۆت سەرەوکاری ئەو کەس‌و کارەی بکە کە لەپاشی بەجێماون، وە لە ئێمەیش‌و لەویش بە میهرەبانیی خۆت خۆش بە، ئەی پەروەردگاری جیهانیان! وە گۆڕەکەشی گوشادکەو پڕی بکە لە نوور بۆی (م).

### ١٥٢- باسی گوتەی کن مردوو، گوتەی ئەو کەسەی کە مردووی مردبێ
### باب ما يقال عند الميت وما يقوله من مات له ميت

٩٢٠/١[٤٨٤]- عن أُمِّ سلَمَةَ رضي اللّه عنها قالت : قالَ رسُولُ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (إذا حَضرْتُمُ المريضَ، أَوِ المَيِّتَ، فَقُولُوا خيْراً، فَإنَّ الملائِكَةَ يُؤمِّنونَ عَلى ما تقُولُونَ، قالت: فلمَّا مَاتَ أَبو سَلَمَة، أَتَيْتُ النَّبيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فَقُلْتُ : يا رسُولَ اللّه، إنَّ أبا سلَمَة قَدْ مَاتَ، قالَ : (قُولي : اللّٰهُمَّ اغْفِرْ لي وَلَهُ، وَأَعْقِبْني مِنْهُ عُقبى حسنةً) فقلتُ : فأَعْقَبني اللّهُ منْ هُوَ خَيْرٌ لي مِنْهُ : مُحمَّداً (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم). رواه مسلم هكذا : (إذا حَضَرْتُمُ المَريضَ) أَو (الميِّت)على الشَّكِّ، رواه أبو داود وغيره:(الميِّت)بلا شَكّ:

ئوممو سەلەمە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کە دەچن بۆلای نەخۆش، یا فەرمووی: بۆلای مردوو، قسەی باش بکەن‌و قسەی خراپ مەکەن، چونکە ئێوە هەرچی بڵێن فریشتەکان ئامینی لەسەر دەکەن! ئوممو

[٤٨٤] موسلیم (٩١٩)، ئەبو داوود (٣١١٥).

سەلەمە فەرمووی: جا کە ئەبو سەلەمەی مێردم مردو ئەمری هەقی بەجێ هێنا، چوومە لای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەبو سەلەمە مرد. فەرمووی: بڵێ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لي وَلَهُ، وَأَعْقِبْنِي مِنْهُ عُقبى حسنةً: ئەی خودایە! لەمنیش و لەویش خۆشبەو تۆڵەیەکی باشم بۆ بکەرەوە، گوتی: منیش وام گوت، ئەوەبوو خودا لەشوێنی ئەو موحەممەدی پێم داوە، کە زۆر زۆر لە ئەبو سەلەمە باشترە بۆم، بۆ دین و دنیام. ئیمامی موسلیم (رەزای خودای لێ بێ) ئاوای دەگێڕێتەوە: فەرمووی: کە دەچن بۆلای نەخۆش یا فەرمووی: کە دەچن بۆ لای مردوو ئاوا بە گومانەوە دەیگێڕێتەوە، بەلام ئەبو داوودو کەسانی تر بەبێ گومان ئاوای دەگێڕنەوە: کە دەچن بۆ لای مردوو.

٢/٩٢١[٤٨٥]- وعنها قالت : سمعتُ رسول اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يقول : (مَا مِنْ عبدٍ تُصيبُهُ مُصِيبَةٌ، فيقولُ : إِنَّا للَّهِ وَإِنَّـا إليـهِ رَاجِعُـونَ : اللَّهـمَّ أجرنـي في مُصِـيبَتي، وَاخْلُف لي خَيْراً مِنْهَا، إلاَّ أَجَرَهُ اللَّهُ تعالَى في مُصيبتِهِ وَأَخْلَف له خَيْراً منْهَا. قالت : فَلَمَّا تُوُفِّيَ أَبُو سَلَمَة، قلتُ كما أَمَرني رسولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) فَأَخْلَفَ اللَّهُ لي خَيْراً مِنْهُ رسولَ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم). رواه مسلم.

دیسان ئوممو سەلەمە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەزاری حەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو (درودی خوای لەسەر بێ): هەر بەندەیێ کاتێ تووشی ناخۆشییەك دەبێ بڵێ: إِنَّا للَّهِ وَإِنَّا إِلَيهِ رَاجِعُونَ: ئێمە هەموو دەسنێژی خوداین لاریمان نییە لە ئاستی فەرمانی، وە لەودنیا دیسانەوە دەچینەوە بەر دیوانی خۆی، اللَّهمَّ أجرني في مُصِيبَتي، وَاخْلُـف لـي خَيْـراً مِنْهَـا: ئەی خودایە! لەهۆی ئەم ناخۆشییەوە کە بەهۆی ئەم وەی و موسیبەتەوە بەسەرم هاتووە پاداشی باشم بدەرەوە، وەبە وەجەڵێکی باشتر تۆڵەیم بۆ بکەرەوە. هەر بەندەیێ لەکاتی ئاوادا ئەم نزایە بە باوەڕی دڵ بکا، ئەڵبەت کە خودای گەورەو مەزن لەهۆی ئەو ناخۆشییەوە، پاداشی باشی دەداتەوە. فەرمووی: جا کاتێ ئەبو سەلەمەی مێردی پێشووم عەمری خودای کردو ئەمری هەقی بەجێ هێنا، فەرمانەکەی پێغەمبەرم بەجێ هێناو ئەو نزایەی خۆی پێی گوتم خوێندم، ئیتر ئەوەبوو کە خودا لەوەجەڵی ئەودا بە موحەممەد (درودی خوای لەسەر بێ) تۆڵەیەکی

---

[٤٨٥] موسلیم (٩١٨) (٤).

**باشـتری بـۆم کـردوه، کـهبۆ هـهردوو جیهـانم لـه ئـهبو سـهلهمه باشـتره، چـونکه موحهممهد پیغهمبهری خودایه (م)[*]**

٩٢٢/٣[٤٨٦]– وعن أَبي موسى (رضي اللّٰه عنـه)أنَّ رسـولَ اللّٰـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم)قال : (إذا ماتَ وَلَدُ العبْدِ قال اللّٰهُ تعالى لملائِكَتِهِ : قَبضْتُم وَلَدَ عَبْدِي ؟ فيقولُونَ : نعَم، فيقولُ : قَبَضتُم ثمَرَةَ فُؤَادِهِ؟ فيقولونَ : نَعم. فَيَقُولُ : فَمَاذَا قال عبْدِي ؟ فيقُولُونَ : حِمدكَ واسْتَرْجعَ، فيقولُ اللّٰهُ تعالى: ابْنُوا لعبدِي بَيتاً في الجَنَّة، وَسَمُّوهُ بيـتَ الحمـدِ) رواه الترمذي وقال: حديث حس:

**ئەبو مووسا** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پیغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: کاتێ کـه بەنـدەیێ منـاڵێکی دەمـرێ، خـودا بـه فریشـتەکانی دەفـەرموێ: گیـانی منـداڵی بەندەکەمتان کێشا؟ دەڵێن: بەڵێ، دەفەرموێ: جگەر گۆشەکەیتان لێ سەندو بەش‌و بارەی دڵتان لێ وەرگرت؟ دەڵێن: بەڵێ، جا دەفـەرموێ: ئـەی بەندەکـەم چـی گـوت؟ دەفەرموون: حەمدو سوپاسی تۆی کردو گوتی: (إِنَّا لِلّٰهِ وَإِنَّـا إِلَيـهِ رَاجِعُـونَ)، ئـەوجا خودای گەورە دەفەرموێ: کۆشکێ لـه بەهەشـتا دروسـت بکـەن بـۆ ئـەو بەندەیـەم‌و ناوی لێ بنێن کۆشکی حەمدو سوپاس (ت:ح/ح).**

٩٢٣/٤– **فەرموودەی** (ما لعَبْدِي المؤْمِن...) **بڕوانە: (٣٢/٨ز-٣).**

٩٢٤/٥– **فەرموودەی** (أَرْسَلَتْ بنت النبي...) **بڕوانە: (٢٩/٥ز-٣).**

## ١٥٣- گریان لەسەر مردوو دروستە، بەمەرجێ بە لاواندنەوەو شینو زارییەوە نەبێ
## باب جواز البكاء على الميت بغير ندب ولا نياحة

أما النياحة فحرام، وسيأتي فيها باب كتاب النهي إن شاء اللّٰـه تعـالى. وأمـا البكـاء فجاءت أحاديث بالنهي عنه، وأن الميت يعذب ببكاء أهله. وهي متأولة محمولة علـى مـن

---

[*] إِنَّا لِلّٰهِ وَإِنَّا إِلَيهِ رَاجِعُونَ : اللّهمَّ أجرني في مُصيبتي، وَاخلُف لي خَيراً مِنهَا، الحمد لله على كل حال، سوى الكفر والضلال.

تەمـەن بـەرەو شەسـت تێپـەڕبوو وەك خـەو     سـەرتاپا تاریـك، وەك تاریکـە شـەو
قۆنـاخ بـه قۆنـاخ لـەدەس ئـەمو ئـەو     لـەم لا دەکـەم رەو، بـۆ ئـەولا وەك کـەو
سـەخڵەتییەکی وا، بـێ وێنـە بـێ ئـەو     رەوێ بـوو وەك خـەو کردمـان بـە شـەو!

١٩٩١/٥/٢٧ (وەرگێڕ)

[٤٨٦] تیرمیذي (١٠٢١).

أوصى به، والنهي إنما هو عن البكاء الذي فيه ندب أو نياحة. والدليل على جواز البكاء بغير ندب ولا نياحة أحاديث كثيرة منها:-

١/٩٢٥[٤٨٧]- عن ابنِ عُمرَ رضي اللّه عنهما أنَّ رسُولَ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)عاد سَعْدَ بنَ عُبَادَةَ، وَمَعَهُ عَبْدُ الرَّحمنِ بنُ عَوفٍ، وسعْدُ بْنُ أَبي وَقّاص، وعبْدُ اللّهِ بن مَسْعُودٍ رضي اللّه عنهم، فَبكى رسولُ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)، فلمَّا رَأى القوْمُ بُكاءَ رسولِ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)، بَكَوْا، فقال : (أَلا تَسْمَعُونَ ؟ إنَّ اللّه لا يُعَذّبُ بِدمْعِ العَيْنِ، وَلا بِحُزْنِ القَلْبِ، وَلكِنْ يُعَذّبُ بِهذاَ أَوْ يَرْحَمُ) وَأَشَارَ إِلى لِسَانِهِ.متفقٌ عليه:

**ئیمامی نەوەوی** (رەزای خودای گەورەی لێ بێ) **دەفەرموێ: دیارە کە گریەو زاریو شینو شەپۆڕ ناڕەوایەو نادروستە خوا یاربێ لە (کتاب النهی)دا باسێ لەم بابەتەوە دێت. بەڵام گریانی رووت چەند فەرموودەیێ هەیە رێگەی نادا، وەك ئەوە کە دەفەرموێ: هەندێ مردوو سزای دەدرێ بەهۆی هەندێ لەو گریانەوە کە کەسو کارەکەی لەسەری دەگرین، ئەڵبەت مەبەست لەم جۆرە فەرموودەیە، رواڵەتی دەرەومیان نییەو مەبەست لێیان شتێکی ترە، وەك ئەوە ئەمە بۆ کەسێ وایە کە خۆی رابسپێرێ کە بۆی بگرین، یا مەبەست ئەو گریانەیە کە لاواندنەوەو شینو شەپۆڕی تیابێ، چونکە گەلێ فەرموودە هەیە کە دەبن بە بەڵگە لەسەر دروست بوونی گریان بەبێ لاواندنەوەو گریەو زاری وەك ئەمەی کە دەفەرموێ:**

**ئیبنو عومەر** (رەزای خودایان لێ بێ) **دەفەرموێ: جارێ سەعدی کوڕی عوبادە نەخۆش بوو، پیغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **رۆیشت بۆ سەردانی، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفو سەعدی کوڕی ئەبو وەققاصو عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودیشی لەگەڵدا بوون، کە پیغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **رۆیشتە ژوورەوە بۆ لای روانی وا بووراوەتەوەو پەلو پۆی شکاوەو کەسوکارەکەی دەورەیان لێ داوە، جا فەرمووی: ئایا ماوە یا مردووە؟ گوتیان: ئەی پیغەمبەری خودا! هێشتا ماوە، ئیتر پیغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەستی کرد بەگریان، کە خەڵکەکەیش دییان وا پیغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەگری ئەوانیش گریان، ئەویش فەرمووی** (درودی خوای لەسەر بێ)**: گوێتان لێ بێ: خودا لەسەر فرمێسکی چاوو لەسەر خەمو پەژارەی دل ئازارو سزاتان نادا، بەڵام بەهۆی ئەم زمانەوە**

---

[٤٨٧] بوخاری (١٣٠٤)و موسلیم (٩٢٤).

سزاتان دەدا، ئەگەر شیوەنو ناسوپاسیی پێ بکەن، یا رەحمتان پێ دەکا، ئەگەر لەکاتی سەختیو قۆرتو کۆستدا قسەی باشی پێ بکەن، وەك ئەوە بڵێن: إِنَّا للّٰهِ وَإِنَّا إِلَيهِ رَاجِعُونَ (١٥٦/٢): ئێمە هەمووو دەستنێژی خوداینو دیسانەوە دەچینەوە بەر دەستی خۆی (ش/تاج).

٩٢٦/٢- فەرموودەی (أرسلت بنت النَّبيّ صلى إن ابني قد احتضر...) بڕوانە: (٢٩/٥ز-٣).

٩٢٧/٣[٤٨٨]- وعن أَنسٍ (رضي اللّٰه عنه)أَنَّ رسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)دَخَلَ عَلى ابْنه إبَراهِيمَ (رضي اللّٰه عنه)وَهُوَ يَجودُ بَنفسِه فَجعلتْ عَيْنا رسول اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)تَذْرِفَان. فقال له عبدُ الرَّحمن بنُ عوفٍ: وأَنت يا رسولَ اللّٰه ؟، فقال : (يا ابْنَ عوْفٍ إِنَّها رَحْمَةٌ) ثُمَّ أَتْبَعَها بأُخْرَى، فقال: (إِنَّ الْعَيْنَ تَدْمَعُ والقَلْب يَحْزَنُ، وَلا نَقُولُ إِلا ما يُرضي رَبَّنا وَإِنَّا لفِرَاقِكَ يا إِبْرَاهيمُ لَمَحْزُونُونَ). رواه البخاري، وروى مُسلمٌ بعضَه، والأَحاديث في الباب كثيرة في الصحيح مشهورة.

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پیغەمبەردا (درووودی خوای لەسەر بێ) چووین بۆ ماڵی ئەبو سەیفی ئاسنگەر، کە مێردی دایەنەکەی ئیبراهیمی کوڕی پیغەمبەر بوو (درووودی خودایان لێ بێ)، واتە: باوکی شیرینی ئیبراهیم بوو، پیغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) ئیبراهیمی هەڵگرتو گرتیە باوەشو تێر تێر ماچی کردو بۆنی کرد، لەپاشان چووینەوە بۆ ماڵیان ئەم جارە کەچووین ئیبراهیم (درووودی خوای لەسەر بێ) گیانی دەدا، جا چاوەکانی پیغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) هۆن هۆن فرمێسکیان پیا دەهاتە خوارەوە، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف پێی گوت: ئای! قوربان! ئەوە تۆیش دەگریت؟ ئەی پیغەمبەری خودا! خۆتۆ خۆت ڕێگەی ئەمەت نەدەدا، فەرمووی: ئەی کوڕی عەوف! ڕێگەی رەحم ناگیرێ، ئەمە نیشانەی رەحمو میهرەبانییە، ئینجا، فرمێسکێکی تری بەشوێنا ڕێژاو فەرمووی: چاو پڕدەبێ لە ئەسرو دڵ کەیل دەبێ لە خەمو خەفەت، بەڵام بە زمان ئەوەی رەزای خودای پەروەردگارمانی لەسەر نەبێ نایڵێین، لەڕاستیدا ئەی ئیبراهیم! ئێمە لەدووریی تۆ خەمگینو خەمبارینو بە کۆچی بێ

[٤٨٨] بوخاری (١٣٠٣)و موسلیم (٢٣١٥).

وەختت پەرۆشین! (ب) موسلیمیش هەندێکی لێ گێڕاوەتەوە، لە تاجدا دەفەرموێ: بوخاری‌و موسلیم‌و ئەبو داوودو تیرمیذي ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە.

## ١٥٤- واباشە خراپەو نەنگی مردوو باس نەکرێ
## باب الكف عما يرى في الميت من مكروه

١/٩٢٨[٤٨٩]- عن أَبي رافِعٍ أَسْلم مولى رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)أَنَّ رسول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال: (مَنْ غَسَّل ميّتاً فَكَتَمَ عَلَيْه، غَفَرَ اللّٰهُ لـه أَرْبعِينَ مرَّةً) رواه الحاكم وقال: صحيح على شرط مسلم.

ئەبو رافیع (کە بەندەی ئازاد کراوی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بوو، کە ناوی ئەسلەم بو) فەرمووی: (رەزای خودای لێ بێ) حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کەسێ مردوویێ بشۆرێ‌و سرو عەیبی بپۆشێ، خودا چل جار لێی خۆش دەبێ (حاکم) ڕەحمەت لەو کەسەی دەڵێ:

خودا سرپۆشە ئەتۆش سرپۆش بە    بێ گلەو ڕازبەو بەهۆش‌و گۆش بە

## ١٥٥- باسی نوێژی مردوو بەڕێکردنی تەرمەکەی‌و ئامادەبوونی ناشتنی، بەڵام شوێن کەوتنی تەرم لە لایەنی ئافرەتەوە ناباش‌و ناپەسەندە
## باب الصلاة على الميت وتشييعه وحضور دفنه وكراهة اتباع النساء الجنائز

وقد سبق فضل التشييع: باسی گەورەیی بەڕێکردنی تەرم لە (باب تعظيم حرمات المسلمين)دا رابورد. فەرموودەی حەڤدەو هەژدە، بڕوانە: (٢٣٨/١٧ز - ٢٧)و (٢٣٩/١٨ز - ٢٧).

١/٩٢٩[٤٩٠]- وَعن أَبي هُريرةَ (رضي اللّٰه عنه)قال : قال رسول اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (مَنْ شَهِدَ الجنَازَةَ حَتَّى يُصَلِّي عَلَيها فَلَهُ قِيراطٌ، وَمَنْ شَهدَهَا حَتَّى تُدْفَنَ فَلَهُ قِيراطَانِ) قيلَ وما القيراطَانِ؟ قال: (مِثْلُ الجَبلَيْنِ العَظِيمَيْنِ) متفقٌ عليه.

---

[٤٨٩] حاكم لە موستەرەکدا ٣٥٤/١و ٣٦٢.

[٤٩٠] بوخاری (١٣٢٥)، موسلیم (٩٤٥).

ئـەبو هـورەیرەوە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پیغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: هەرکەسێ ئامادەی سەرتەرمێ بێو لەگەڵیدا بێ هەتا نوێژی لەسەر دەکا قیراطیکی بۆ هەیە، وە هەرکەسێ لەگەڵیا بێ تا دەنێژرێ ئەوە دوو قیراطی بـۆ هەیـە، گوترا: قوربان ئەی پیغەمبەری خودا! ئەو دوو قیراطە چەند دەبن؟ فەرمووی: بەقەد دوو کێوی گەورە دەبن (ش).

٢/٩٣٠[٤٩١]- وعنه أَنَّ رسول اللَّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال: (مَـن اتَّبـعَ جَنَـازَةَ مُسْلمٍ إِيمَاناً واحْتِسَاباً، وَكَانَ مَعَهُ حَتَّى يُصَلِّي عَلَيها ويَفْرُغَ مـن دَفنِهـا، فَإِنَّـهُ يَرْجـعُ مِـنَ الأَجرِ بقِيراطَين كُلُّ قيرَاط مِثلُ أُحُدٍ، ومَنْ صَلّى عَلَيهَا، ثم رَجَعَ قبل أَن تُدْفَنَ، فَإِنَّهُ يرجعُ بقِيرَاط) رواه البخاري.

دیسان دەفەرموێ: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ شوێن تـەرمی موسوڵمانێ بکەوێ، بەئیمانو باوەڕەوە لەبەر ڕەزای خودا، وە لەگـەڵیابێ تـا نوێـژی لەسەر دەکرێو لەناشتنی دەبنەوە، ئەوە بەدوو قیراط پاداشەوە دەگەڕێتـەوە، هـەر قیراطەی بەقەد کێوی ئوحود دەبـێ، وەلێ کەسـێ کـە نوێـژی لەسـەر کـرد، بەرلـەوە بەخاك بسپێردرێ بگەڕێتەوە ئەوە بەیەك قیراطەوە دەگەڕێتەوە (ب).

٣/٩٣١[٤٩٢]- وعن أُمِّ عطِيَّةَ رضي اللَّه عنها قَالَتْ: نُهينَـا عـن اتِّبَـاعِ الجَنـائز، وَلَم يُعزَمْ عَلَيْنَا) متفقٌ عليه. (ومعناه) ولَمْ يُشدَّد في النَّهي كما يُشدَّدُ في الُمحَرَّمَات.

ئوممو عەتییە (خۆشنوودی یەزدانی مـەزنی لێ بـێ) فـەرمووی: حـەزرەت (درووی خوای لەسەر بێ) جڵەوگیری کرد، لەئێمەی ژنان کە لەگەڵ تـەرمی مـردوودا بـڕۆین بۆسـەر قەبران، بەڵام بەحەرامی دانەنا، لەبەر ئەوە زۆر بەتوندی بەجەخت جڵەوگیری لێ نەدەکردین (ش).

---

[٤٩١] بوخاری (٤٧).

[٤٩٢] بوخاری (١٢٧٨)، موسلیم (٩٣٨).

**١٥٦- وا جوانه ژمارەی نوێژکەرەکانی سەر تەرمەکە زۆر بکرێنو ریزکانیشیان لەسێ کەمتر نەبن - باب استحباب تكثر المصلين على الجنازة وجعل صفوفهم ثلاثة فأكثر**

١/٩٣٢(٤٩٣)- عَنْ عائشةَ رضي اللَّهُ عنها قَالَتْ: قال رسولُ اللَّهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: ما مِنْ ميِّتٍ يُصلِّي عليهِ أُمَّةٌ مِنَ المُسْلِمِينَ يبلُغُونَ مئَة كُلُّهُم يشْفَعُونَ له إلا شُفِّعُوا فيه) رواه مسلم.

**عائیشە** (رەزای خوای لێ بێ) **دەفەرموێ: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: هەر مردوویێ کە کۆمەڵێ موسوڵمان ژمارەیان بگاتە سەد کەس نوێژی لەسەر بکەن، وە هەموویان تکای بۆ بکەن، بێ گومان کەخوا تکاکەیان گیرا دەکات (م).**

٢/٩٣٣- فەرموودەی: (مَا مِنْ رَجُلٍ مُسْلِمٍ يَمُوتُ)، بڕوانە: (١٩/٤٣٠ز-٥١).

٣/٩٣٤(٤٩٤)- وعن مَرْثَدِ بن عبدِ اللَّه اليَزَنِيِّ قال : كانَ مالكُ بنُ هُبَيْرَةَ (رضي اللَّه عنه)إذا صلَّى عَلى الجنَازَةِ، فتقَالَّ النَّاسَ عَليها، جزَّأَهُمْ عَلَيْهَا ثلاثَةَ أَجْزَاءٍ ثم قال : قالَ رَسُولُ اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (مَنْ صَلَّى عليهِ ثلاثةُ صُفُوف، فَقَدْ أَوْجَبَ). رواه أبو داود، والترمذي وقال : حديث حسن:

**مەرثەدی کوڕی عەبدوڵلای یەزەنی** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: مالیکی کوڕی هوبەیرە** (رەزای خوای لێ بێ) **دەستووری وابوو، کاتێ لەسەر تەرمێ نوێژی دەکرد، ئەگەر نوێژکەرەکان لەبەرچاوی کەمیان بنواندایە، دەیکردن بەسێ بەشەوەو هەر بەشێکی دەکرد بەریزێ، لەپاشا دەیفەرموو: من بۆیە وا دەکەم چونکە حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: هەر موسوڵمانێ بمرێو سێ ریز لە موسوڵمانان نوێژی لەسەر بکەن، بێ گومان بەهەشت بۆ خۆی دەردەست دەکا (د/ت:ح/ح).**

**١٥٧- باسی ئەوەی لەنوێژی مردوودا دەخوێنرێ - باب ما يقرأ في صلاة الجنازة**

يكبر أربع تكبيرات. يتعوذ بعد الأولى ثم يقرأ فاتحة الكتاب، ثم يكبر الثانية، ثم يصلي على النَّبيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّم فيقول: اللهم صل على محمد وعلى آل محمد. والأفضل أن يتممه بقوله: كما صليت على إبراهيم إلى قوله حميد مجيد، ولا يفعل ما يفعله كثير من العوام من قولهم: { إن اللَّه وملائكته يصلون على النَّبيّ } الآية (٥٦

---

(٤٩٣) موسلیم (٩٤٧).

(٤٩٤) ئەبو داوود (٣١٦٦)، تیرمیذي (١٠٢٨).



الأحزاب) فإنه لا تصح صلاته إذا اقتصر عليه، ثم يكبر الثالثة ويدعو للميت وللمسلمين بما سنذكره من الأحاديث إن شاء اللّٰه تعالى، ثم يكبر الرابعة ويدعو. ومن أحسنه: اللهم لا تحرمنا أجره، ولا تفتنا بعده، واغفر لنا وله. والمختار أنه يطول الدعاء في الرابعة خلاف ما يعتاده أكثر الناس" لحديث ابن أبي أوفى الذي سنذكره إن شاء اللّٰه تعالى (انظر الحديث رقم ٩٣٧) فأما الأدعية المأثورة بعد التكبيرة الثالثة فمنها:

٩٣٥/١[٤٩٥]- عن أبي عبدِ الرحمنِ عوفِ بن مالكٍ (رضي اللّٰه عنه)قال : صلّى رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَلى جَنَازَةٍ، فَحَفِظْتُ مِنْ دُعائِهِ وَهُو يَقُولُ : (اللّٰهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، وارْحَمْهُ، وعافِهِ، واعْفُ عنْهُ، وَأَكرِمْ نزُلَهُ، وَوسِّعْ مُدْخَلَهُ واغْسِلْهُ بِالماءِ والثَّلْجِ والْبرَدِ، ونَقِّه منَ الخَطَايَا، كما نَقَّيْتَ الثَّوب الأبْيَضَ منَ الدَّنَس، وَأَبْدِلْهُ دارا خيراً مِنْ دَارِه، وَأَهْلاً خيّراً منْ أهْلِهِ، وزَوْجاً خَيْراً منْ زَوْجِهِ، وأدْخِلْه الجنَّةَ، وَأَعِذْه مِنْ عَذَابِ القَبْرِ، وَمِنْ عَذَابِ النَّار) حَتَّى تَمَنَّيْتُ أَنْ أَكُونَ أنَا ذلكَ المَيِّتَ. رواه مسلم:

نوێـژی مـردوو بـەم شـێوەیەیە: نوێژكەرەكـە بـە دەسـنوێژەوە بـەرەو قیبلـە رادەوەستێ، تەرمەكە لەبەردەمیدا دەبێ، ئینجا ئاوا نیێت دادەبەستێ: یەكسەر دەڵێ: أعوذ بالله من الشیطان الرجیم، ئەوجا سوورەتی فاتیحـە دەخوێنـێو لەپاشا هـەردوو دەستی بەرزدەكاتەوەو بۆ جاری دووەم دەڵێ: أللهم صَلّى على محمد وعلـى آل محمـد كما صليت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم، وبـارك علـى محمـد وعلـى آل محمـد كمـا باركـت علـى إبـراهيم وعلـى آل إبـراهيم إنـك حميـد مجيـد: ئـەی خودایـە! برژێنـە میهرەبـانیی‌و رەحمـەت بـۆ سـەر موحەممـەدو كەسـوكاری موحەممـەد، وەك ئـەو میهرەبانیی‌و رەحمەتەی كە رژاندووتە بەسەر ئیبراهیم‌و كەسوكاری ئیبراهیمدا، وە پیت‌و فەڕو بەرەكەت برژێنـە خـودا! بەسـەر موحەممـەدو بنەماڵـەی موحەممـەدا، وەك ئـەو پیـت‌و فـەڕو بەرەكەتـەی كـە ڕژاندوتـە بەسـەر ئیـبراهیم‌و بنەماڵـەی ئیبراهیمدا، بەڕاستی تۆ ئەی خودایە! شایستەی هـەموو ستایش‌و سوپاسێكیت، وە تۆ خودایەكی گەڵێ گەورەو پیرۆزیت. ئینجـا دەسـتەكانی بەرزدەكاتـەوەو بـۆ جـاری سێیەم دەڵێ: الله اكبر، ئینجا نزای باش بۆ مردووەكەو كۆمەڵەی موسـوڵمانان دەكـا، وە بەیەكێ لەم نزا بیسراوانە، كـە بەپشـتی خـودا لـەم فەرموودانـەی دواوە باسـیان

[٤٩٥] موسليم (٩٦٣).

دەكەین، نزایان بۆ دەكا، واباشە بەم شێوە نزای بۆ بكا: اللهم هذا عبدك وإبن عبدك خرج من روح الدنيا وسعتها، ومحبوبه وأحبائه فيها، إلى ظلمة القبر وما هو لاقيه، كان يشهد أن لا إله إلا أنت وأن محمدا عبدك ورسولك وأنت أعلم به، أللهم إنه نزل بك وأنت أكرم الأكرمين، وضيف الكرام لا يضام وأنت خير منزول به، وأصبح فقيرا إلى رحمتك وأنت غني عن عذابه، وقد جئناك راغبين إليك شفعاءَ له، أللهم إن كان محسنا فزد في إحسانه وإن كان مسيئا فتجاوز عنه ولقه برحمتك رضاك وقه فتنة القبر وعذابه، وافسح له في قبره وجاف الأرض عن جنبيه، ولقه برحمتك الأمن من عذابك حتى تبعثه إلى جنتك يا أرحم الراحمين:

خودایە! خۆت دەزانی، ئەمە هەم خۆی هەم باو باپیری پشتاو پشت بەندەی خۆتن، زادەو دەسنێژی دەستی خۆتن، ئەوا بەتاقی تەنیا، بەدەستی بەتاڵەوە ئەم جیهانە بەرینە پڕ لەنازو نیعمەتو خۆشییەی بەجێ هێشت، دڵخوازو دۆستو خۆشەویستانی خۆی هەموو لەدەست چوو، بەرەو گۆڕی تاریكو نووتەك سەری نایەوە، ئاوقەدی چارەنووسی خۆی بوو، ئێمە شایەتی بۆ دەدەین كەتۆی بەحەق دەزانیو باوەڕی ساغی وابوو كە جگە لەتۆ خودای بەهەقی تر نییەو موحەممەدی كوڕی عەبدوڵلاَیش بەندەو پیغەمبەرو رەوانەكراوی نازداری تۆیە، خودایە! خۆت لەهەموو كەسێ باشتر دەیناسیو ئاگات لەحاڵیەتی، خودایە! میوانەو بەردەرگای پێت گرتووە، ئەتۆیش خانەخوێی چاكیو بە سەخێتیو بەخشندەیی بێ وێنەی، خۆت سەرگەورەی دەستەی بەخشندەو سەخییەكانی، خانەخوێ خاوەن قۆناغو بەڕێزو بەخشندەكانیش زۆر ناهەقی لەمیوانی خۆیان ناكەنو رێزیان لێ دەگرن، خودایە! قۆناغ قۆناغی تۆیەو بەس، ئەوا ئەم هەژارەیش رووی تێ كردووەو بەتەمای رێزەی رەحمەتی تۆیە، ئەمەیش لەكاتێكدا كەتۆ بێ نیازی لەسزای ئەو هیچ كارێكت بە ئازاردانی ئەو نییە، ئەوا ئێمەیش بە حەزی خۆمان هاتووین بۆ خزمەتی تۆ، تكا بۆ ئەم برایەمان دەكەین، بەتەمای ئەوەین كە نائومێدمان نەكەیت، خودایە! ئەگەر خۆی باشە باشتری بۆ بكە، ئەگەر خراپیشە چاوپۆشی لێ بكە، وە بەرەحمەتی خۆت شادی بكە بە رەزامەندیی خۆت وە لەئاژاوەو سزای گۆڕ بیپارێزە، وە گۆڕەكەی بۆ خۆشو گووشاد بفەرموو، وە لاتەنیشتەكانی لە رەقیو زەقی زەوی دوور بخەرەوەو لەناو گۆڕەكەیدا مەیترنجێنە بەسەریەكا! خودایە



بەرەحمەتی خۆت ئاسایش و ئاسوودەیی پێ ببەخشەو لەسزای خۆت بێ ترس و ئەمنی بکەرەوە، تا ئەو دەمەی لەخاك راستی دەکەیتەوەو گیانی دەکەیتەوە بەبەرداو دەیبەیت بۆ ناو بەهەشتی خۆت، ئەمە تکاو هیوای ئێمەیە لەلای تۆ، تۆیش ئەڵبەت خودایەکی ئەرڕحەم و ڕراحیمینی لەهەموو بەرەحمێ بەرەحم تری.
واباشە لەپێش ئەم نزایەشەوە ئەم نزایە بۆ تێکرای موسوڵمانان بکا: (اللّٰهُمَّ اغْفِرْ لِحَيِّنَا وَمَيِّتِنَا وَشَاهِدِنَا وَغَائِبِنَا وَصَغِيرِنَا وَكَبِيرِنَا وَذَكَرِنَا وَأُنْثَانَا اللّٰهُمَّ مَنْ أَحْيَيْتَهُ مِنَّا فَأَحْيِهِ عَلَى الإِسْلاَمِ وَمَنْ تَوَفَّيْتَهُ مِنَّا فَتَوَفَّهُ عَلَى الإِيمَانِ، اللّٰهُمَّ هذا عبدك وابن عبدك... تا.
ئەوجا هەردوو دەستی تا ئاستی هەردوو شانی هەڵبڕێ و تەکبیرەی چوارەم بکاو بڵێ: ئەڵڵاهو ئەکبەر. لەپاش ئەڵڵاهو ئەکبەری چوارەمیش بڵێ: (اللهم لاتحرمنا اجره ولا تفتنا بعده واغفر لنا وله) خودایە! لەپاداشتی باشی لەدەست چوونی ئەم برایەمان بێ بەشمان مەفەرموو، وە لەئێمەیش و لەویش خۆشبە. ئەوجا بەلای راستا سلاو بداتەوەو بلێ: (السلام عليكم ورحمة الله)، ئەمجار بەلای چەپیشدا سلاو بداتەوەو هەمان گوتە بلێتەوە. نزا بیسراوەکانیش کە دەماو دەم لەپێشینانەوە رەوان کراون زۆرن، جێگەیان پاش ئەڵلاهو ئەکبەری سێیەمە. وەك:

عەوفی کوری مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەسەر تەرمێ نوێژی دەکرد، ئەمەم لەنزاکەی لەبەرکرد: : (اللّٰهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، وارْحَمْهُ، وعافِهِ، واعْفُ عنْهُ، وَأَكرِمْ نزُلَهُ، وَوسِّعْ مُدْخَلَهُ واغْسِلْهُ بِالماءِ والثَّلْجِ والْبرَدِ، ونَقِّه مِنَ الخَطَايَا، كما نَقَّيْتَ الثَّوب الأبْيَضَ منَ الدَّنَس، وَأَبْدِلْهُ دارا خيراً مِنْ دَارِه، وَأَهْلاً خَيّراً مِنْ أهْلِهِ، وزَوْجاً خَيْراً منْ زَوْجِهِ، وأدْخِلْه الجنَّةَ، وَأَعِذْه منْ عَذَابِ القَبْرِ، وَمِنْ عَذَابِ النَّار):

خودایە! پەروەردگارا! لێی خۆشبەو رەحمی پێ بکەو سەر ئاسوودەیی هەردوو جیهانی بکەو، سەرفرازو سەربەرزی لای خۆتی بکەو، لێی ببورەو میوانەو هاتووەو بەردەرگای پێ گرتووی، دەی رێزی بگرەو میوانداریی بۆ بکەو گۆری گووشادکەو بە ئاوو بەفرو تەرزە بیشۆرەو لەگوناه پاك پاکی بکەرەوە، وەك چۆن جلێکی سپی پاك رابگرێ و لەچلك دووری بگرێ ئاوا، وەماڵێ لە ماڵەکەی خۆی باشترو خێزانێ لەخێزانەکەی خۆی باشترو هاوسەرێ لە هاوسەرەکەی خۆی باشتری بدەرێ، بیبەرە بەهەشت و پەنای بدە لەسزای گۆرو لەسزای ئاگری دۆزەخ. عەوف گوتی: تەنانەت ئەم نزایەم ئەوەندە بەدل بوو خۆزگەم خوارد کەمن ئەو مردووە بوومایە (م).

٩٣٦/٢(٤٩٦)- وعن أبي هُريرة وأبي قَتَادَةَ، وأبي إبْرَاهيمَ الأشْهَليَّ عنْ أبيه، وأبوه صَحَابيٌّ رضي اللّه عنهم، عَنِ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)أنّه صلَّى عَلى جَنَازَة فقال : (اللَّهم اغفر لِحَيِّنَا وَميِّتنا، وَصَغيرنا وَكَبيرِنَا، وذَكَرِنَا وَأُنْثَانَا، وشَاهِدِنا وَغائِبنَا. اللَّهُمَّ مَنْ أَحْيَيْتَه منَّا فأَحْيِه على الإسْلامِ، وَمَنْ توَفَّيْتَه منَّا فَتوَفَّهُ عَلى الإيمان، اللَّهُمَّ لا تَحْرِمْنا أَجْرَهُ، وَلا تَفْتِنَّا بَعْدَهُ) رواه الترمذي من رواية أبي هُرَيْرةَ والأشهَليِّ، ورواه أبو داود من رواية أبي هريرة وأبي قَتَادَةَ. قال الحاكم : حديث أبي هريرة صَحيحٌ على شَرْطِ البُخاريِّ ومُسْلِمٍ، قال الترْمِذي قال البخاريُّ : أَصحُّ رواياتِ هذا الحديث روايةُ الأَشْهَليِّ. قال البخاري : وَأَصَحُّ شيء في هذا الباب حديث عوْفِ بن مالكٍ:

ئەبو هورەیرەو ئەبو قەتادەو ئەبو ئیبراهیمی ئەشهەلی لەباوکیەوە (کە باوکی هاوڕێی پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بووە) ئەم زاتانە (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموون: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) جارێ لەسەر تەرمێ نوێژی دەفەرموو، فەرمووی: (اللَّهم اغفر لِحَيِّنَا وَميِّتنا، وَصَغيرنا وَكَبيرِنَا، وذَكَرِنَا وَأُنْثَانَا، وشَاهِدِنا وَغائِبنَا. اللَّهُمَّ منْ أَحْيَيْتَه منَّا فأَحْيِه على الإسْلامِ، وَمَنْ توَفَّيْتَه منَّا فَتوَفَّهُ عَلى الإيمان، اللَّهُمَّ لا تَحْرِمْنا أَجْرَهُ، وَلا تَفْتِنَّا بَعْدَهُ):

ئەی خودایە! لەزیندوو مردوومان خۆشبە، هەروەها لە گچکەو گەورەمانو لەنێرو مێمان، پەروەردگارا! ئەوەی لەئێمە دەیژێنی لەسەر ئیمانو باوەڕ بیژێنەو ئەوەی لەئێمە دەیمرێنی لەسەر ئیسلامەتی بیمرێنە، خودایە! لەپاداشی باشی لەدەستچوونی ئەم برایەمان بێ بەشمان مەکە، وەلەپاش کۆچی دوایی ئەویش دووچاری ئاژاوەو ئاشووبمان مەفەرموو (ت/د).

٩٣٧/٣(٤٩٧)- وعن أبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّه عنه)قال : سمعتُ رَسُول اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يقول : (إذ صَلَّيْتُم عَلى المَيِّت، فأَخْلِصُوا لهُ الدُّعاءَ) رواه أبوداود:

ئەبو هوڕەیڕە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پیغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ نوێژ دەکەن لەسەر مردوو، بەدڵسۆزی بەدڵێکی پاك بۆی بپاڕێنەوە! (د).

---

(٤٩٦) تیرمیذي (١٠٢٤)، ئەبو داوود (٣٢٠١).

(٤٩٧) ئەبو داوود (٣١٩٩).

٩٣٨/٤(٤٩٨)- وعَنْهُ عَنِ النَّبيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)في الصَّلاةِ عَلى الجَنَازَة : (اللّٰهُمَّ أَنْت ربُّهَا، وَأَنْتَ خَلَقْتَها، وأَنْتَ هَديْتَها للإسلامِ، وَأَنْتَ قَبَضْتَ رُوحَهَا، وَأَنْتَ أَعْلَمُ بِسِرِّها وَعَلانيتِها، جِئْنَاكَ شُفعاءَ لَهُ فاغفِرْ لهُ). رواه أبو داود:

دیسان فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) لەسەر تەرمێ نوێژی دەكرد، لەناو نوێژەكەیدا فەرمووی: (اللّٰهُمَّ أَنْت ربُّهَا، وَأَنْتَ خَلَقْتَها، وأَنْتَ هَديْتَها للإسلامِ، وَأَنْتَ قَبَضْتَ رُوحَهَا، وَأَنْتَ أَعْلَمُ بِسِرِّها وَعَلانيتِها، جِئْنَاكَ شُفعاءَ لَهُ فاغفِرْ لهُ). خودایە! تۆ خۆت خاوەن‌و خودای ئەم مردووەی‌و خۆت ئەوت لەنەبوون دروست كردووەو، خۆت ڕێگەی ڕاستیی ئیسلامەتیت نیشانداوەو، خۆت گیانیت كێشاوەو خۆت زۆر چاك ئاگات لە نهێنی‌و ئاشكرای هەیە، لەهەموو كەسێ تر زیاتر، ئەوا ئێمە لەبەر ڕەزای تۆ هاتووین‌و تكا كارین‌و تكای لەتۆ بۆ دەكەین، دەسا تۆیش بە بەخشندەیی‌و میهرەبانیی خۆت دەست بەڕوومانەوە مەنێ‌و بە میهرەبانی بێ پایانی خۆت لێی خۆشبە (د).

٩٣٩/٥(٤٩٩)- وعن واثِلة بنِ الأسقعِ (رضي اللّٰه عنه)قال : صَلّى بِنَا رسولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)عَلى رجُلٍ مِنَ المُسْلِمينَ، فسمعته يقولُ : (اللّٰهُمَّ إنَّ فُلانَ ابْنَ فُلان في ذِمَّتِكَ وحَلَّ بجوارك، فَقِهِ فِتْنَةَ القَبْر، وَعَذَابَ النَّارِ، وَأَنْتَ أَهْلُ الوَفاءِ والحَمْدِ، اللّٰهُمَّ فاغفِرْ لهُ وَارْحَمْهُ، إنكَ أَنْتَ الغَفُور الرَّحيمُ. رواه أبو داود:

واثیلەی كوڕی ئەسقەع (خۆشنوودی خودای لێ بێ) فەرمووی: پیغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەسەر تەرمی پیاوێ لە موسوڵمانان بەرنوێژیی بۆ كردین، گوێم لێی بوو دەیفەرموو: اللّٰهُمَّ إنَّ فُلانَ ابْنَ فُلان في ذِمَّتِكَ وحَلَّ بجوارك، فَقِهِ فِتْنَةَ القَبْر، وَعَذَابَ النَّارِ، وَأَنْتَ أَهْلُ الوَفاءِ والحَمْدِ، اللّٰهُمَّ فاغفِرْ لهُ وَارْحَمْهُ، إنكَ أَنْتَ الغَفُور الرَّحيمُ: پەروەردگارا! ئەی خودا! ئەوا فیسارە كەسی كوڕی فیسارە كەس وا لەپەناپەیمانی تۆداو بە كەمەندی هاوسایی تۆ خۆی شەتەك داوە، دەسا تۆیش لەئازاوەی سزای گۆڕ بیپارێزە، ئەوا بەپێی فەرمایشتی: {وَأَوْفُواْ بِعَهْدِي أُوفِ بِعَهْدِكُمْ – البقرة/ ٤٠} – ئێوە پەیمانی من ببەنە سەر تامنیش پەیمانی ئێوە ببەمەسەر، ئەوا ئەم بەپێ

---

(٤٩٨) ئەبو داوود (٣٢٠٠).

(٤٩٩) ئەبو داوود (٣٢٠٢).

ئەم پەیمانە هاتۆتە بەر ئاستانەی تۆ، تۆش خاوەن ئەمەکی ستایش هەتا سەر هەر بۆ تۆیە، ئەی خوایە، لێی خۆشبەو بەزەییت پیادا بێتەوە، چونکە تۆ خودایەکی خاوەن لێبووردنیو خودایەکی میهرەبانی (د).

٦/٩٤٠[٥٠٠]- وعن عبد اللّٰه بن أبي أوْفى رضي اللّٰه عنهما أنَّهُ كبَّر على جَنَازَةِ ابْنَةٍ لَهُ أرْبَعَ تَكْبِيراتٍ، فقَامَ بَعْدَ الرَّابِعَةِ كَقَدْرِ مَا بَيْنَ التَّكْبِيرتَيْن يَسْتَغفِرُ لَهَا وَيَدْعُو، ثُمَّ قَال : كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يَصْنَعُ هكذَا وفي رواية : (كَبَّرَ أرْبعاً فمكث سَاعةً حتَّى ظَنَنْتُ أنَّهُ سيُكَبِّرُ خَمْساً، ثُمَّ سلَّمَ عنْ يمينهِ وَعَنْ شِمالِهِ، فَلَمَّا انْصَرَف قُلْنا لَـهُ : مَا هذا ؟ فقال : إنِّي لا أزيدُكُمْ عَلى مَا رَأَيْتُ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يَصْنَعُ، أوْ : هكذا صَنَعَ رسولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم). رواه الحاكم وقال : حديث صحيح.

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا (رەزای خودایان لێ بێ) لەسەر تەرمی کچێکی خۆی نوێژی مردووی کرد، چوار ئەڵڵاهو ئەکبەری تیادا کرد، لەپاش ئەڵڵاهو ئەکبەری چوارەمیشەوە بەقەد نێوانی ئەڵڵاهو ئەکبەری سێیەمو چوارەم راوەستاو دەپاڕایەوەو نزای باشی بۆی دەکرد، لەپاشا فەرمووی: جاران پیغەمبەر خۆشی (دروودی خوای لەسەر بێ) ئاوای دەکرد.

لەگێڕانەوەیەکا: لەناو نوێژەکەیدا چوار ئەڵڵاهوئەکبەرەکەی کرد، کەچی لەپاش ئەڵڵاهوئەکبەری چوارەمیش تاوێ مایەوە، هەر نزای بۆ دەکرد، تەنانەت من وامزانی کە ئەڵڵاهوئەکبەری پێنجەمیش دەکا، بەڵام بەلای راستو بەلای چەپیدا سڵاوی دایەوە، کە تەواوی کرد عەرزیمان کرد، ئەمە چی بوو بۆ وات کرد؟ فەرمووی: لەوەپترم نەکردووە بۆتان، کە بەچاوی خۆم دیومە حەزرەت لەنوێژی مردوودا کردوویەتی. یا ئاوای فەرموو: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) خۆشی نوێژی مردووی ئاوادەکرد (حاکم:ح/ص).

### ١٥٨- باسی بەرێ کردنی تەرم زووبەزوو - باب الإسراع بالجنازة

١/٩٤١- عن أبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّٰه عنه)عَن النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَـلّم)قـال : (أَسْرِعُوا بِالجَنَازَةِ، فَإنْ تَكُ صَالِحَةً، فَخَيْرٌ تُقَـدِّمُونها إلَيْـهِ، وَإنْ تَـك سِـوَى ذلِـك، فَشَـرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ) متفقٌ عليه. وفي روايةٍ لُمسْلِمٍ : (فَخَيْرٌ تُقدِّمُونَهَا عَلَيْه).

---

[٥٠٠] حاكم لە موستەدرەکدا ١/٣٦٠.

ئـەبو هـورەيرە لـە حەزرەتـەوە دەفـەرموێ (درودی خوای لەسەر بێ): دەسـتو بـرد لـە بەڕێكردنی تەرم بكەنو زوو بەزوو بیبەن بۆ گۆڕستانو لەڕێ خێرا بڕۆن، چونكە ئەگەر خۆی مرۆڤێكی باش بێ ئەوە ئێوە دەیبەن بەسەر خێرو خۆشیدا، وە ئەگەر خۆی مرۆڤێكی باش نـەبێ ئـەوا شـەڕێكەو لـە كۆڵی خۆتـانی دەكەنـەوە. (ش) لـە گێڕانەوەیەكی موسلیمدا:

... ئەوا ئێوە دەیبەن بۆ خێرو خۆشی.

٩٤٢/٢- فەرموودەی (إذا وُضِعَتِ الجِنَازَةُ...). بڕوانە: (٢/٤٤٤ز-٥٣).

تلـــهو وتمـــرح وتفـــرح كمـــن ... يخلـد في الـدنيا علـى مـر الـزمن
ياغارقـــا في الـــنعم إلى الـــذقن ... إعلـم أمامـك الكـروب والفـتن
كيـف تكـون إن وقعـت في المِحَـن ... أو قلـب الـدهر لـك ظهـر المجـن
كالفرخ في البيض درجت في الكفـن ... ثـم حشـرت بـين أضـيق السـكن
واحســرتا، يــا أســفا، يــا للحــزن! ... لمفلـــس وهـــو ينـــادي بـــالعلن:
يــا قادمــا مــن وطــن إلى وطــن ... قـبض الجنـان مـن هنـا أيـن الـثمن؟

(المترجم)

**١٥٩- دانەوەی قەرزی سەر مردوو بەزوویی هەروا بەزوویی تفاق دەكرێن مەگەر بەمەرگی كوتوپڕ مردبێ (باب تعجيل قضاء الدين عن الميت والمبادرة إلى تجهيزه إلا أن يموت فجأة فيترك حتى يتيقن موته)**

١/٩٤٣[٥٠٣]- عن أَبي هريـرة (رضـي اللّـه عنـه)، عـن النَّبـيّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم)قال : (نَفْسُ المُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ حَتَّى يُقْضَي عَنْـهُ).رواه الترمـذي وقـال : حـديث حسنٌ.

ئەبو هـورەيرە (رەزای خودای لێ بێ) لـە پێغەمبـەرەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: گیـانی موسوڵمان لەپاش مردنی بەندو گیرۆدەی دەستی ئەو قەرزەیە كەوا لەسەری، هەروا دەمێنێو پایەی بەرزی بەڕێزی خۆی لێ قەدەغە دەكرێ هەتا قەرزەكەی سەری بـۆ دەدرێتەوە (ت:ح/ح).

٢/٩٤٤[٥٠٤]- وعن حُصَيْن بن وحْوَحٍ (رضي اللّه عنـه)أنْ طَلْحَـةَ بـنَ الْبـراءِ بـن عازب رضِي اللّه عنْهما مَرِض، فَأَتَاهُ النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يَعُودُهُ فَقَـالَ : إنّـي لا

[٥٠٣] تيرميذي (١٠٧٨)و (١٠٧٩).

أُرَى طَلْحةَ إلاَّ قدْ حَدَثَ فِيهِ المَوْتُ فَآذِنُوني بِهِ وَعَجِّلُوا بِهِ، فَإنَّهُ لا يَنْبَغِي لجِيفَةِ مُسْلِمٍ أنْ تُحْبَسَ بَيْنَ ظَهْرَانَيْ أَهْلِهِ). رواه أبو داود:

حوصەینی کوڕی وەحوەح (خوشنوودی خودای لێ بێ) فەرمووی: طەلحەی کوڕی بەڕائی کوڕی عازیب (رەزای خودایان لێ بێ) نەخۆش بوو، تەواو کەشەنگ بوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) چوو بۆ سەرلێدانی، فەرمووی: وادەزانم کە طەلحە مردن سەری لێ داوە، کە فەرمانی هەقی بەجێ هێنا ئاگادارم بکەنەوە، وەزوو بەزوو بەڕێی بکەن، چونکە لاشەی موسوڵمان تا بمێنێتەوە بۆن دەکا، کەواتە نابێ لەناو کەس‌و کاریا گل بدرێتەوە (د).

### ١٦٠- باسی ئامۆژگاری‌و وەعظ خوێندنەوە لەسەر گۆڕ
### باب الموعظة عندا لقبر

١/٩٤٥[٥٠٥]- عن عليّ (رضي الله عنه) قال : كُنَّا في جنَازَةٍ في بَقِيعِ الْغَرْقَد فَأَتَانَا رَسُولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، فقَعَدَ، وقعدْنَا حَوْلَهُ وَمَعَهُ مِخْصَرَةٌ فَنَكَسَ وَجَعَلَ يَنْكُتُ بِمِخْصَرتِهِ، ثم قال: ما مِنكُمْ مِنْ أَحَدٍ إلاَّ وَقَدْ كُتِبَ مقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ ومَقْعَدُهُ مِنَ الجنَّة) فقالوا : يا رَسُولَ اللّهِ أَفَلاَ نَتَّكِلُ على كتابنا ؟ فقال : (اعْمَلُوا، فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ) وذكر تمامَ الحديث، متفقٌ عليه:

عەلی (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لە گۆڕستانی بەقیعولغەرقەد، لە مەدینە خەریکبووین تەرمێکمان بەڕێ دەکرد، حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) تەشریفی هێنا بۆ ناومان، تەشریفی دانیشت ئێمەیش لەدەوری دانیشتین، حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) گۆچانێکی بەدەستەوە بوو، سەری خۆی دانەواندبوو، رامابوو، نووکی گۆچانەکەی لەزەوی دەخشاند، لەپاشا فەرمووی: هەرکەسێ لەئێوە بگری هەر لەسەرەتاوە، لە ئەزەلەوە، چارەنووسی بۆ دیاریی کراوە، ئەگەر دۆزەخی بێ جێگەی لەناو ئاگری دۆزەخدا بۆ دیاریی کراوە، ئەگەر بەهەشتی بێ شوێنی لەناو بەهەشتا بۆ دیاری کراوە، یارانیش فەرموویان: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! جا کەواتە بۆ خۆمان ماندوو بکەین، لەپای چی کاربکەین، بیکەین‌و نەیکەین جێگەمان لەوەپێش لەنامەی چارەنووسماندا بۆ دیاریی کراوە، کەوابێ با پشت بە نووسراوی ناو ئەو

---

[٥٠٤] ئەبو داوود (٣١٥٩).

[٥٠٥] بوخاری (١٣٦٢)و موسلیم (٢٦٤٧).

نامەی چارەنووسی خۆمانە ببەستین، هەر کەسەی خۆی‌و بەختی خۆی!؟ حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: نا، شتی وا مەکەن، فەرمانەکانی شەرع بەجێ بێنن، بە ئەرکی سەرشانی خۆتان هەڵسن، چونکە هەرکەسێ لە ئەزەلدا، لە عیلمی خودادا بۆ کوێ دروستکرابێ ڕێگەی ئەو شوێنە دەگرێ، جا لەسەر ئەم بنیاتە بەختیار ڕێگەی چاکە دەگرێ‌و بەدکار ڕێگەی خراپە دەگرێ، بەم پێیە کاری باش نیشانەی بەهەشتەو کاری خراپ نیشانەی دۆزەخە! تا کۆتایی فەرموودەکە (د).

**کارو کردەوەش وەک ڕەنگ‌و بۆیە نیشانەی باشی‌و ناباشیی تۆیە!**

**١٦١- باسی نزاکردن‌و پاڕانەوە بۆ مردوو لەپاش ناشتنی، تاوێکیش لەکن گۆڕەکەی دانیشتن بشە، بۆ نزاکردن‌و قورئان خوێندنیش لەسەری**

**باب الدعاء للميت بعد دفنه والقعود عند قبره ساعة للدُّعاء له والاستغفار والقراءة**

٩٤٦/١[٥٠٦]- عن أبي عَمْرو وقيل: أبو عبد اللّٰه، وقيل: أبو لَيْلى عُثْمَانُ بن عَفَّانَ (رضي اللّٰه عنه)قال: كانَ النَّبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) إذا فرَغَ من دفـن المَيِّـتِ وقَـفَ علَيهِ، وقال: (استغفِرُوا لأخِيكُم وسَلُوا لَهُ التَّثبيتَ فإنَّهُ الآن يُسأَلُ).رواه أبو داود.

عوثمانی کوڕی عەففان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە لەناشتنی مردوو لێ دەبوۆوە، لەلای گۆڕەکەیدا ڕادەوەستاو دەیفەرموو: ئادەی بپاڕێنەوە بۆ ئەم برایەتان‌و، داوای دامەزران‌و ڕاگیرکردن لەسەر ئیمان‌و باوەڕی بۆ بکەن، چونکە ئێستاکە فریشتە دێنە لای‌و پرسیاری لێ دەکەن خودات کێیە؟ پێغەمبەرت کێیە؟ ئایینت چییە؟ (د).

٩٤٧/٢- حديث عمرو بن العاص وهو في سياق الموت يبكي طويلا. بروانە: (٤/٧١١ز-٩٥).

قال الشَّافِعِيُّ رَحِمهُ اللّٰه : ويُسْتَحَبُّ أن يُقرَأَ عِنْدَهُ شيءٌ مِنَ القُرآنِ، وَإن خَتَمُوا القُرآن عِنْدهُ كانَ حَسناً.

واتە: ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: ئیمامی شافیعی (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: واپەسەندە هەندێ قورئانی لەسەر بخوێنرێ‌ن خۆ ئەگەر خەتمەیەکی قورئانی بەتەواوی لەسەر بکرێ ئەوە کارێکی زۆر جوانە.

---

[٥٠٦] ئەبوداوود (٣٢٢١).

# فەهرەسی باسەکا

**بەپشتیوانی خودا بەرگی دووەم تەواو بوو چاوەڕێی بەرگی سێیەم بن.**